

# هەزار و یەک شەو



سولەیمان ئیبڕاهیمزادە

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

بەرگی دووەم

# هەزار و یەک شەو

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیمزادە



بەرگی دووەم

منتدى إقرأ الثقافي

ADIBAN

**ناوەندی رۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، قولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندیی رۆژهەلاتی کوران.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

ناسنامەی کتێب

ناونیشان: هەزار و یەک شەو.

کۆکردنەوەی: عەبدول لەتیف تەسووجی.

بابەت: گێڕانەوە.

ژانر: کۆمەڵە چیرۆکی ئەفسانەیی فارسی، عەرەبی و هیندی.

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیم‌زادە.

پێداچوونەوە: جووتیار قارەمان.

بەخشانگە: ناوەندی رۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق و بەرگ: ئارام مەلا محەمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٥٦٩) ساڵی (٢٠٢٠) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیریی ئەدیبانە،

# که شەوی سەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە کەشتییەکە وەرگەڕا، هەرکەسەی لە بیر خۆیدا بوو. مەرزوانیش شەپۆل بردی هەتا بەردەم کۆشکی شەهرمانپاشا کە قەمەروززەمانیش لەوێ بوو. بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە فەرماندە و وەزیرانیش لەوێ بوون. شەهرمانپاشا سەری قەمەروززەمانی لەسەر کۆشی دانابوو. خزمەتکارێک قەمەروززەمانی باوەشێن دەکرد. دوو ڕۆژ بوو قەمەروززەمان نە هیچی خواردبوو نە هیچی خواردبووەوە. قسەشی نەدەکرد. وەزیر لە خوار قاچی قەمەروززەمانەوە ڕوو بە دەریا ڕاوەستابوو. کە وەزیر جوان سەرنجی دا، مەرزوانی دیت لە دەریادا بە دەم شەپۆلانەوە کەلەلا بووە و چی وای نەماوە بخنکێ.

"وەزیر دڵی بۆی سووتا و سەری بردە بن گوێی سوڵتان و گوتی: 'ڕێم بدە با بچمە دەرێ و دەرکی کۆشک بکەمەوە و ئەو کەسە ڕزگار کەم وا خەریکە بخنکێ، بەشکو بە بۆنەی ئەوەشەوە بێ خودا ڕەحم بە قەمەروززەمان بکا و چاک بێتەوە.' پاشا گوتی: 'هەر شتێک کە بەسەر ئەو کوڕەی من هاتووە، هەمووی لە تۆوە بووە. ئێستاش بچۆ ئەو کەسە ڕزگار بکە بەشکو ئەو کەسە بێت و لە دەردی کوڕەکەم بگات. بەڵام بە خودا ئەگەر بێتو ئەو کەسە ڕزگار بکەیت و ئەویش بێ قەمەروززەمان ببینێ و بچێ لە دەرێ باسمان بکا، ئەوە لە بەرچاوی ئەو تۆ دەکوژم، چونکە ئەوەی لە سەرەتاوە تا ئێستا بەسەرمان هاتووە تەواوی لەبن سەری تۆدا بووە. ئێستا بڕۆ چۆنت پێ باشە بیکە.'

"وەزیر هەستا چووە حەوشە و دەرگای کۆشکی کردەوە. بیست پێپلیکان چووە خوارێ و گەیشتە سەر دەریاکە. دەستی درێژ کرد و مووی سەری گرت و بە یارمەتی غوڵامەکانی کێشایە پێشێ و پاشان هێنایە دەرێ. لە ئاویلکەداندا بوو. سکی پڕ لە ئاو و چاوی زەقزەق ببووەوە. نخوونیان کردەوە و کەمێکیان سنگ و شتی گوشار دا و ئاوی سکیان خاڵی کرد. ڕاوەستان تۆزێک پشووی هاتەوە بەر، ئینجا جل و شتیان لێ گۆڕی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، وەزیر فریای مەرزوان کەوت و لە خنکان ڕزگاری کرد. ئینجا پێی گوت: 'ئەوەندە بزانە من تۆم لە نوقمبوون و خنکان ڕزگار کرد، بەڵام تۆ کارێک نەکەی کە من لەناو ببەی.' مەرزوان گوتی: 'مەبەســتت لەو قســەیە چییە؟' وەزیر گوتی: 'ئێســتا تۆ دەبەمە کۆشــکەوە، کە چوویە بارەگای پاشــا لەوێ فەرماندە و وەزیر و شــتی وای لێیە، هەموو مات و بێدەنگ دانیشــتوون. لەبەر قەمەروززەمانی کوڕی شــەهرمانپاشــا قســە ناکەن.' کە مەرزوان ناوی قەمەروززەمانی بیست، ناسی. چونکە لە شاران زۆری لە بارەوە بیستبوو.

"ئیدی مەرزوان گوتی: 'قەمەروززەمان کێیە؟' وەزیر گوتی: 'کوڕی شــەهرمانپاشــایە، نەخۆش و کەلەلایە. لە ژوورێدا کەوتووە و شــەو و ڕۆژ ئارام و قەراری نییە. ئەوەندە لەڕ و لاواز بووە خەریکە گیانی دەرچێ. ئێمە تەواو دەســتمان لێ شــۆردووە. نەچی چاوی لێ بکەی. ئەتۆ دەبێ هەر چاو لە بەرپێی خۆت بکەی. دەنا منیش و خۆشت بە کوشت دەدەی.' مەرزوان گوتی: 'بیکە بۆ خاتری ئەو خودایە پێم بڵێ ئەو لاوە بۆ ئاوای لێ هاتووە؟' وەزیر گوتی: 'ئەمن هۆکارەکەی نازانم، هەر ئەوەندە نەبێ سێ ســاڵ لەمەوبەر بابی ویســتی ژنی بۆ بێنێ و ئەویش بە قســەی باوکی نەکرد. پاشــاش فەرمووی بەندیان کرد. ڕۆژێک بەیانی کە لە خەو هەڵدەســتێ، پێی وا دەبێ کە شــەو لە جێخەوەکەیدا کچێکی شــەنگ و شــەپالی چاوڕەش و کەزییە ڕەشــــی لەگەڵدا خەوتووە. بە ئێمەی دەگوت ئەنگوســـتیلەی کچەم لە قامکی دەرهێناوە و ئەنگوســتیلەکەی منیش لە قامکی ئەو کەنیشــکەدایە. جا ئێســتا کوڕی چاک، کە دەچینە کۆشک، ئەتۆ چاو لە کوڕی پاشا مەکە، چونکە زۆرم لێ بە قینە.'

"مەرزوان کە ئەو بەســەرهاتەی بیســت، بە خۆی گوت: 'ئەوەی من دەمهەوێ ڕاســت ئەوەیە.' ئیدی مەرزوان بەدوای وەزیردا چووە ناو کۆشــکەوە و چوونە بارەگای پاشــا. وەزیر چوو لە خوار لاقی قەمەروززەمانەوە دانیشـــت، بەڵام مەرزوان چوو ڕووبەڕووی قەمەروززەمان ڕاوەستا و چاوی تێ بڕی. وەزیر ترسی ڕێ نیشت و لە ترسان خەریک بوو گیانی دەرچێ. بەردەوام ئاماژەی پێ دەکرد کە مەرزوان بڕواتە دەرێ، بەڵام مەرزوان چاوی لەسەر قەمەروززەمان هەڵنەدەگرت، چونکە دەیزانی نێچیری ئەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی پێ هات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، مەرزوان زانی کە ئەوەی ئەو بە دواوەیەتی، ئەوەیە. گوتی: 'پاکە ئەو خودایەی کە قەد و بالا و چاو و ڕوخســـاری ئەو لاوەی وەک شـــازادە بێدوور ئافراندووە. ئەمە لەگەڵ ئەو و ئەو لەگەڵ ئەمە تـای یەکن.' ئیتر قەمەروززەمـان چـاوی کردەوە و گوێی لە مەرزوان ڕاگرت. کاتێک مەرزوان زانی کە قەمەروززەمـان گوێی لەو ڕاگرتووە، ئەو شێعرەی بۆ گوت:

جوانی جوانـان، بسـكی كـام سـونبول ئـالاوە لە لاقـت؟
گیـــــــــرۆدەیی عەشقی تۆ، نییە هــــــــــێزی قول و قاچت
خەم هـێـزی چـنـیـویـت و نەمـاوە ئەو ڕەوتـی كەوت
لە كـام ڕێگەوە چـــــوویـت وا پەلـی خەمـت وە پێ كەوت؟
بڵێ پێـــــــــــم شـــــای جوانان، گراوی كام بەختەوەری؟
بۆ ســـــــەدان شـــۆخی دیكە ئەتۆ مـانـــــگی خەزەڵوەری

"کاتێک مەرزوان ئەو شـــێعرەی خوێندەوە، هەناوی بەجۆشـــی قەمەروززەمان فێنک بووەوە و سڵامەتی ڕووی تێ کردەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کە مەرزوان ئەو شـــیعرەی خوێندەوە، قەمەروززەمان ئاوری دڵی دامرکا و گیانی هاتەوە بەر و زمانی وە گۆ کەوت. بە دەســـت پاشـــای تێگەیاند کە ڕێی ئەو لاوە بدەن لە لای من دانیشێ. کاتێک سوڵتان ئەو ئاماژە و جووڵانەوەیەی لە قەمەروززەمان دیت، ســـەرەڕای ئەوە ئەو هەمووەی ڕق لە مەرزوان هەســـتابوو و بە تەمای کوشـــتنی بوو کەچی بۆخۆی هەستا و دەستی گرت و لە پەنا کوڕەکەی داینا. ڕووی تێ کرد و گوتی: 'لە کام شـــــارەوە هاتووی؟ مەرزوان گوتی: 'لە دوورگەکانەوە هاتووم کە بەشـــێکە لە وڵاتی غەیوورپاشای خاوەنی دوورگە و کۆشکی حەوتەوانە.'

"شـــەهرمانپاشـــا پێی گوت: 'هیوادارم دەرمانی دەردی ئەو کوڕەم لە لای تۆ بێ.' مەرزوان سەری بردە بن گوێی و پێی گوت: 'ئاسوودە بە و نیگەران مەبە، چا و دڵت ڕوون ئەو کیژە مانگڕوخســـارەی تۆ لە ســـوێیانی تووشـــی ئەو ڕۆژە بووی، ئەویش لە تاوی تۆ خراپتریشـــی لێ بەســـەر هاتووە، بەڵام تۆ نهێنی خۆت نەدرکاندووە و نەخۆش کەوتووی و ئەو دەریخستووە و شێت بووە. ئێستا ئەو پەریزادە لە کۆت و زنجیردایە و بەستراوەتەوە. ئەگەر خودا بیهەوێ چارەی دەردی تۆ و ئەو لە دەســـــتی مندایە.' قەمەروززەمان کە ئەو قســـەیەی بیســـت، وەخۆ هاتەوە و تۆزێک دڵی هێزی هاتەوە بەر. بە ئاماژە بابی تێگەیاند هەڵیسێنێتە سەر قوون.

"پاشـــا خۆشـــحاڵ بوو کوڕەکەی هەســـتاند. فەرماندە و وەزیرانی ناردە دەرەوە. قەمەروززەمان دانیشـــت و پاڵی بە باڵنجێکەوە دا. پاشـــا فەرمووی شـــاریان ڕازاندەوە. بە مەرزوانی گوت: 'ڕۆڵەگیان، شوکور وا دیارە پێوقەدەمت بە خێرە.'

بەخـت لەو دەرکەوە دێ کە تـۆی پـێـدا بـێ
دیـداری تـۆ پـیـرۆزە و بـای هـاتە وا دێ

"پـاشـــا زۆری ڕێز لە مەرزوان گرت و فەرمـانی دا خواردنیـان بۆ هێنـا. مەرزوان خواردنەکەی خوارد. قەمەروززەمانیش کەمێکی لەگەڵ خوارد. ئەو شـــەوە مەرزوان لە پەنا قەمەروززەمان نووست. پاشاش لە خۆشیان لە لایان خەوت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا لە خۆشیان لە لای ئەوان خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، مەرزوان پێی گوت: 'من ئەو کەنیشکە پەریپەیکەرە دەناسم کە تۆ عاشقی بووی. نێوی شازادە بیدوورە و کچی غەیوورپاشایە.'

"دوای ئەوە ئەوەی بەسەر شازادە بیدووردا هاتبوو لە سیرەوە تا پیازی بۆ گێڕاوە. تێی گەیاند کە خۆشەویستی ئەو بۆ قەمەروززەمان زیاتریشە. بۆ قەمەروززەمانی گێڕاوە: 'ئەوەی تۆ لەگەڵ بابت باست کردووە و بەسەرت هاتووە، ئەویش تەواوی ئەوانەی بەسەر هاتووە. هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەتۆ گێرۆدەی ئەوی و ئەویش گراوەکەی تۆیە. بێخەم و ئاسوودە بە. خۆت ساز کە، ئەمن پێکتان دەگەیەنم. هیوادارم کە ئێوە بە مرادی دڵ بگەن، وەک شاعیر دەڵێ:

رۆژی هات و یار لەولاوە هات
دوای شەوی درێژ وا خۆریش هەلات
بەدرێژایی شەو، عاشق هەر گریا
نۆرەی شادیيە و گریانیش بڕیا

"مەرزوان بەردەوام دڵخۆشی قەمەروززەمانی دەداوە تا ئەو جێیەی قەمەروززەمان دەستی کردەوە بە خوردوخۆراک و عەیش و نۆش و گیانی هاتەوە بەر. مەرزوانیش هەر شتی بۆ دەگێڕاوە، شێعری بۆ دەخوێندەوە، دڵخۆشی دەداوە و پێکەوە دادەنیشتن. هەتا قەمەروززەمان تەواو چاک بووەوە و چووە گەرماو. شەهرمانپاشای بابی کەیفی زۆر ساز و دڵخۆش بوو. فەرمانی دابوو شاریان لە گوڵ دابوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا ئەوەندە خۆشحاڵ بوو فەرمانی دا شار برازێننەوە و خەڵات بە خەڵک و خێر بە فەقیر و هەژاران بدەن و بەندییەکانی بەندیخانە ئازاد بکەن.

"مەرزوان بە قەمەروززەمانی گوت: 'ئەمن هەر لەبەر ئەوەیە لە لای شازادە بێدوورەوە هاتووم بۆ ئەوەی تۆ ببینمەوە و پێت ڕاگەیەنم کە شـــازادە بێدوور لە تاوی ئەوینی تۆ تووشـــی ئازار و مەینەت بووە. بەو شـــێوەیە لەو دەرد و ئازارە ڕزگاری کەم. بەڵام بۆ ئەوەی بچینە لای شـازادە بێدوور، دەبێ فێڵێک سـاز کەین، چونکە بابت ناتوانێ لێت دوور کەوێتەوە و مۆڵەت نادا تۆ بێی بۆ وڵاتێکی دیکە. سبەینێ مۆڵەت لە باوکت وەرگرە کە بچی بۆ ڕاو. جا کە پاشـا مۆڵەتی دا، تێرێک پڕ کە لە زێڕ و زیو و لەسـەر باشـترین ئەسـپی هۆزی دانێ. ئەسـپێکیش زین کە و لەگەڵ خۆت بیهێنە و منیش هەر وا دەکەم. ئەوجا بە باوکت بڵێ ئەمن بە تەمام بچم بۆ ڕاو و کەمێک بگەڕێم و بحەسێمەوە و شەوێک لە دەرێ دەمێنمەوە و سـبەینێکەی بۆ ئێوارە دێمەوە، نیگەرانی من مەبە زوو دەگەڕێمەوە.' قەمەروززەمان کەیفی بە بیرۆکەکەی مەرزوان ساز بوو. چوو بۆ لای باوکی و مۆڵەتی لێ وەرگرت کە بچێ بۆ ڕاو. هەر ئەو قسـانەی مەرزوان پێ گوتبوو، بە بـابی گوت. شـەهرمانپاشا ڕێی دا بچێ. پێشـی گوت: 'لە شـەوێک زیاترت پێ نەچێ و بەیانی وەرەوە، چونکە بێ تۆ هەڵنـاکەم. بۆخۆت دەزانی من بـاوەڕم نەدەکرد تۆ چـاک بییەوە.' ئیـدی شەهرمانپاشا ئەو شێعرەی بۆ گوت:

لە تۆ دووربوون بـــــــــــۆ من مەحاڵە، مەحاڵ
لە کەس ناچـــــــــــــــی ژیان بێ تۆ تاڵە، تاڵ
ڕۆح و گـیـان و دڵـم هەمـووی هـی تـۆیە
لە دووریـت دڵ گـڕوو دەگـرێ وەک منـاڵ

"دوای ئەوەی کەلوپەلی قەمەروززەمان و مەرزوانیان ساز کرد. شـەهرمانپاشا گوتی: 'یەکی ئەسـپێک و یەخترمەیەکیان[1] بۆ دەرکەن. تۆشـە و ئاویان بۆ لەسـەر وشـترێک دابەسـتن.' قەمەروززەمان گوتی: 'کەسـمان ناوێ لەگەڵمان بێ.' باوکی لە ئامێزی گرت و ناوچاوانی ماچ کرد. پێی گوت: 'لە شـەوێک زیاتر خەوم لێ حەرام مەکە و لێم دوور مەکەوە.' ئیدی شەهرمانپاشا ئەوەی گوت و دەستی کرد بە گریان. ئەو شێعرەی گوت:

---

١. یەخترمە: ئەسپی یەدەکی زینکراو کە لەدوای سوارەوە دەڕوا.

خەریکە گیانم دەردەچێ
لە تاوی چوونە دەری گیان
ئەمن دەستم لەو شۆردبوو
ئەویش گیانی شیرینمی سان
بە سێ سالاَن پیری کردم
گەڕیدەی چەپگەردی زەمان
کۆم بووەوە سەلوی جەستەی من
لە سوێی کۆچی سۆمای چاوان

"ئینجا قەمەروززەمان و مەروزان سوار بوون و هەوساری یەخترمەکانیان گرت و وشترەکەی شتەکانیان لێ نابوو لەگەڵ خۆیان برد و لە بێروونیان دا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەدەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشسکۆ، قەمەروززەمان و مەرزوان ڕوویان لە بێروون کرد و یەکسەرە هەتا شەو ڕۆیشتن. دوای ئەوە لایان دا. نان و چایان خوارد و حەسانەوە و پاشان وەڕێ کەوتنەوە و ئیدی سێ شەو و سێ ڕۆژ ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە چوارڕێیانێکی پان و بەرین و بەربڵاو کە دەوروبەرەکەی بێشە و قامیشەڵانێکی چڕ بوو. لەوێش لایان دا. مەرزوان وشتر و ئەسپێکی گرت و سەری برین و لەت و کوتی کردن. کراس و پێچکڵاوی قەمەروززەمانی هێنا دڕدڕی کرد و بە خوێنی ئەسپ و وشترەکە خوێناوی کرد و لەوێ فڕێی دا.

"دوای ئەوە نان و ئاویان خوارد. قەمەروززەمان هۆکاری ئەو کارانەی پرسی. مەرزوان گوتی: 'قەمەروززەمان، ئەگەر تۆ شەوێک نەچییەوە و بۆ شەوی دوایە هەر نەچییەوە، ئەوە شەهرمانپاشای بابت سوار دەبێ و لەگەڵ فەرماندەکانی وە دوامان دەکەون و تیژ بەرەو ئێرە دێن. تا دەگەنە ئێرە. کە هاتنە ئێرە و ئەو خوێن و کارەساتە و کراسی خوێناوی تۆیان دیت، ئیدی پێیان وا دەبێ کە لە لایەن ڕێگر و دڕندە و چەتە و شتی واوە تێدا چوویت. ئیتر دەستت لێ دەشۆن. شوێنمان ناکەون و بەو شێوەیە ڕزگارمان دەبێ لە دەستی و بە ئاوات دەگەین.' قەمەروززەمان گوتی: 'کارێکی باشت کرد.' دوای ئەوە چەند مانگێک بە ڕێوە بوون. قەمەروززەمان بەردەوام دەگریا. هەتا ڕۆژێک مەرزوان گوتی: 'مزگێنیم دەیە! ئیدی لێرەوە وڵاتی گراوەکەت دەردەکەوێ.' قەمەروززەمان کە سەیری کرد، دوورگەگەلی غەیوورپاشا وەدەرکەوت و خۆشحاڵ بوو. ئەو شێعرەی گوت:

ئەو بۆنە گیانپەروەرە هی کەرەکی یارە دێ
سۆزی هەناسەی مسکین بۆی دڵدارە واوە دێ
بۆنی بەهەشتە کە دێ یا شنەی گراوی من؟
کاروانکوژەی بەیانییە یا تیشکی یاری من
عوودە وا دەیسووتێنن لەسەر ڕێی ڕەوتی بادا
یا ئەو ئاو و گڵە خۆی وا بۆنی عەنبەر دەدا

"دوای ئەوە سوپاسی مەرزوانی کرد بۆ ئەو دڵسۆزی و زەحمەتانەی لە پێناو ئەویندا کێشاوییە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان سوپاسی دڵسۆزییەکانی مەرزوانی کرد. دوای ئەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شارەکەی ئەوان. مەرزوان ئەوی بردە کاروانسەرایەک. سێ ڕۆژ لەوێ حەســـانەوە. ئینجا قەمەروززەمانی بردە گەرماو و جلی بازرگانانی لە بەر کرد. تەختەڕەڵمێکی[1] زێڕینی بۆ درووست کرد و ئوستوورلابێکی زێڕینیشی بۆ هێنا. ئەوجا بە قەمەروززەمانی گوت: 'هەســتە بچۆ لە بەردەرکی کۆشــک وەرە و بچۆ و هاوار بکە: 'من ژمارزان و ئەستێرەناسم. کێ کارێکی هەیە دەنگ بکا؟' کاتێک پاشا گوێی لە دەنگی تۆ بێ، بانگت دەکا و دەتنێرێتە لای کەنیشـــکەکەی کە گراوەکەی خۆتە. کچی پاشـــاش تۆ ببینێ، چاک دەبێتەوە و بابیشی بە چاکبوونەوەی کچەکەی خۆشحاڵ دەبێ و کچەکەیت لێ مارە دەکا. دەســـت دەکا بە بەخشـــینی ماڵ و ســـامان و نیوەی وڵاتەکەی بە تۆ دەدا. چونکە ســـوێندی خواردووە و بەڵێنی داوە. ئیدی قەمەروززەمان بە قســـەی مەرزوانی کرد و لە کاروانســـەرا چووە دەرێ. تەختە و ئوســـتوورلابی لەگەڵ خۆی برد. چوو لە بەردەرکی کۆشـکی غەیووڕپاشـا ڕاوەسـتا و قاوی کرد: 'ژمارەزانین، ئەسـتێرەناسـین، ونبووتان بۆ دەدۆزینە و پەردە لەسـەر نهێنییەکان لا دەبەین. کێ کاری پێمە؟' مەمنا خەڵکی شار لە مێژ بوو فاڵگریان نەدیتبوو هاتن تێی ئاڵان و تەماشـــایان دەکرد. ســـەریان لە جوانچاکی و خوێنشیرینییەکەی سـوور مابوو. هۆشیان لای خۆیان نەمابوو. هاتن بە قەمەروززەمانیان گوت: 'کاکە گیان، تۆ خودا تەماعی کچی پاشـــا نەتگرێ و دەســـت هەڵگرە و چاوێک لەو سەرە هەڵواسراوانە بکە. خاوەنی ئەو سەرانە هەموو لەو ڕێیەدا تێدا چوون و تەماعی ئەو کارە بە هیلاکی دان.'

"قەمەروززەمان گوێی بە قســـەی کەس نەبزووت و گازی کرد: 'من ئەســـتێرەناســـم و داخوازی داخوازان وەدی دێنم.' خەڵک لێی تووڕە بوون."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. تەختەڕەڵم: تەختەیەک بوو کە فاڵیان لەسەر دەگرتەوە.

## که شەوی دووسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان گوێی بە قسەی کەس نەبزووت. ئیدی خەڵک لێی تووڕە بوون و پێیان گوت: 'ئەتۆ گەنجێکی ملهوڕ و خێلەسەر و نەزانی. بۆ بەزەییت بەو هەموو جوانچاکی و گەنجییەی خۆتدا نایە؟'

"قەمەروززەمان لە جاری پێشوو توندتر هاواری کرد: 'ئەمن پەردە لەسەر نهێنییەکان هەڵدەدەمەوە. ئەوەی ماڵی دزراوە بۆی دەدۆزمەوە؟ کێ کاری پێمە لە خزمەتی دام.'

"کورتی کەینەوە، هەر قەمەروززەمان هەرای دەکرد و خەڵک لە مەترسی کارەکەی ئاگاداریان دەکردەوە و دەنگیان دەدا. هەتا ئەو دەنگە بە گوێی غەیوورپاشا گەیشتەوە. بە وەزیرەکەی گوت: 'برۆ ئەو ئەستێرەناسە بێنە لای من.' وەزیر خێرا چوو قەمەروززەمانی هێنا. کە قەمەروززەمان گەیشتە لای پاشا، کڕنۆشی برد و ئەو شێعرەی گوت:

دەستی زەمانەت بەستووە لە دادگەریدا
لە دەهەندەییتەوە دادی بەخشینت دا
ئازادم لە دەستی غەم من کە کۆیلەی تۆ بم
ئازادی چییە، گەورەم، من لە دەرکی تۆ بم؟

"کە غەیوورپاشا چاوی پێی کەوت، ئەوی لە پەنا خۆی دانا و ڕووی تێ کرد و گوتی: 'ڕۆڵە، تۆ ئەو خودایە نێوی ئەستێرەناس لەسەر خۆت دامەنێ. ئەمن هەڵوێستێکە و گرتوومە، ناچارم ئەوەی بچێتە لای کچەکەم و بۆی تیمار نەکرێ، دەیکوژم و سەرەکەی لە کۆشک هەڵداوەسم. بەڵام ئەگەر بۆشی چارەسەر کرێ، ئەوە کچەکەی خۆمی لێ مارە دەکەم. هەر بۆیە بە جوانچاکی خۆت لە خۆت دەرمەچۆ. بە خودا قەسەم، دیسان بە خودا قەسەم، ئەگەر بۆت چار نەکرێ، ئەوە دەتکووژم!' قەمەروززەمان گوتی: 'پاشام، ئەمن ئەو مەرجەی جەنابتم قەبووڵە'.

"وا بوو غەیوورپاشا شایەد و شتی لێ ئاگادار کردەوە و لەگەڵ خزمەتکارێکدا ناردی و گوتی: 'بیبە بۆ لای خاتوونەکەت.' ئینجا خزمەتکارەکە دەستی قەمەروززەمانی گرت و چوونە دالانێکەوە. قەمەروززەمان بە پەلە لەپێش خزمەتکارەکەوە دەڕۆیشت. خزمەتکارەکە پێی گوت: 'چارەڕەش، پەلە مەکە! بە خودا تا ئێستا یەک ئەستێرەناسم نەدیوە ئەوەندەی تۆ لە مردنی خۆی بە پەلە بێ. بەڵام تۆ تاوانبار نییت، چونکە نازانی چت بۆ دێتە پێشێ و چت لێ دەکەن.' قەمەروززەمان بە بیستنی قسەکانی خزمەتکارە ناوچاوانی تێک نا ."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان لە قسـەکەی خزمەتکارەکەدا ڕووی گرژ کرد و ئەو شیعرەی گوت:

گوتیان: 'دەست هەڵـــــــــگرە باسی سەرە نەیکەی'
گوتم: 'لــــــــێم قەبووڵ کەن، با بیخەمە بەر پێی'
گوتیان: 'کەفــــوکـــــــوڵی لاوییەتییە، گەنجۆ'
گـــــــوتم: 'خۆمی فیدا دەکەم ئەوســـەرەکەی

"لە شـوێنێک خزمەتکارەکە قەمەروززەمانی لەپشـت پەردەیەک ڕاگرت. قەمەروززەمان بە خزمەتکارەکەی گوت: 'لەو دوو کارە پێت خۆشـە کامیان بکەم؟ هەر لێرە خاتوون چاک کەمەوە یان بچمە ژووریّ و لەو شێتییە ڕزگاری بکەم؟' خزمەتکارەکە سەری لەو قسـەیە سـوورِ ما و گوتی: 'ئەگەر بتوانی هەر لێرەوە چاکی کەیەوە ئەوە هونەرمەندی خۆت دەسەلمێنی.'

"ئیدی هەر لەڕێوە قەمەروززەمان دانیشــت و پێنووس و جەوهەری دەرهێنا و ئەو بەیتەی بۆ نووسی:

شەیدای ئەڤـــــــــــینم ئەوڕۆکە جۆرێکی دییە
گـراوم ســـلامەت بـێ، هـیـچ تـۆفـیـری نـیـیە
ئەو وتەی نەنـووســـراوی دڵـی دەخـوێـنـدەوە
لەپشــــتپەردەبـوونـیشـــم هـیـچ ئـیرادی نـیـیە

"دوای ئەوە ئەو نامەیەشـــی نووســـی: 'دڵ بە دیداری گراوی نەبێ چاک نابێتەوە. هەرکەس لە ڕێی خۆشەویستەکەی ئازاری چەشتبێ، خودا خۆی بە هانایەوە دێ. هەر کام لە ئێمە خیانەت بە یەکتر بکەین، بە کامی دڵمان ناگەین. شـایەنی عاشـقی مەینەت و ئازار چێشـتووش هەر مەعشـووقی وەفادارە ئەو نامەیە لە لایەن عاشـق و شـێت و شـەیدا و سـەرگەردانی خۆشـەویستی، سـووتاوی ئاوری بە تینی دووری، قەمەروززەمانی کوڕی شـەهرمانپاشـایەوەیە بۆ تاقانە و خۆری جوانان، مایەی ئیرەیی حۆریان، خاتوو بێدووری کچی غەیوورپاشا. خۆشەویستم پێم خۆشە بزانی، شەو و ڕۆژ خەو و خواردنم نییە. دەرد و ئازارم لە ڕادە بەدەرە و خۆشـەویستیم سنووری نییە دڵم پڕ لە داخە، چاوم پڕ لە ئاو.

گیرۆدەی ئەڤین و کوژراوی دابڕاویم. ئەویندای ئەویندارم، هاودەردی دەردەداریم. ئەمن ئەو شـەوبێدارەم کە خەو لە چاوی ناکەوێ. گریانێکم کە ئەسـرینی ناسـرەوێ. ئاوری دڵم دانامرکێ، کڵپەی حەزم حەشار نادرێ.'

دوای ئەوە لە پەڕاوێزدا نووسیی:

ئەســـریـن لـێـم نـاگەڕێ نـامە بـنـووســـم
دەخـــووســـــێ لەجـێـوە هەر کە دەیـنـووســـم

"دوای ئەو ئەو چەند بەیتەشی نووسی:

هاتبـــــــــووم هەتا ببینم چـــرۆی نەونەمامی تۆ
ئێســـتـا کە ڕێگەم نەدەی شــــاد بم بە دیـداری تۆ
عـــــــــــەودالی بالاکەی تۆ، ڕێی چیا دەگرمە بەر
دەژیـــــــــــم لەو شـاخ و دەرە بە یادی بالاکەی تۆ

"دوایە قەمەروززەمـان ئەنگوســـتیلەکەی خـاتوو بێدووری خســـتە نێو نـامەکەوە و پێچایەوە. مۆری کرد و لەپشتەکەیەوە ئەو بەیتەی نووسی:

تەمـای دیـداری تـۆیەتـی گـیـانـی خەریـکە دەرچـێ
چۆن دەفەرمووی وا دەکـا بێتە ژووری یـان دەرچێ

"ئینجا نامەکەی دا بە خزمەتکارەکە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان نامەکەی دا بە خزمەتکارەکە. خزمەتکارەکە نامەکەی لێ وەرگرت و بردی دای بە شـــازادە بێدوور. کە شـــازادە بێدوور نامەکەی وەرگرت و کردییەوە و ئەنگوســـتیلەکەی خۆی تێدا دیت، بێهۆش کەوت. دوای ئیســـتێک وە هۆش هاتەوە. بە لەز کاغەزەکەی خوێندەوە، زانی ئەوە خۆشـــەویســـتەکەی لەپشـــت پەردەکە ڕاوەستاوە. لە خۆشیان وەک شێتی لێ هات و خەم لە دڵیدا نەما و دەروونی پڕ پڕ بوو لە خۆشی و شادی و ئەو شێعرەی گوت:

گوڵێکی ســـیس و ژاکـاو بووم لە خەونـمـدا ئـاوم دەدیـت
دڵم بە خەو و شـــەو خۆش بوو، چون جار جارێک ئەوم دەدیت
گەرووم قـاقڕێکی ویشـــک، ســـیمـای ئـاوی لە بیر چووبوو
وا شـــوکـوور بـاران دابـاری، نەمـردم دیســـان ئەوم دیـت
ئەوەی هـات بـۆم نـامە نەبـوو، هەنـبـانەیەکـی پـڕ نـوور بـوو
لە ناو جەرگەی شـەوەزەنگدا خۆشـی و شـادمانی و سـروور بوو

"کە شـازادە بێدوور شـێعرەکەی تەواو کرد، زوو هەسـتا قاچی لە دیوارەکە توند کرد. هێزی دا خۆی و بە تەواوی هێزیەوە زنجیرەکەی پســـاند و لەپشـــت پەردە هاتە دەرێ و خۆی لە باوەشـــی قەمەروززەمان هاویشـت و دمی بە دمییەوە نا. پاشـان گوتی: 'ئازیزم، ئەوە خەونە دەیبینم یان بە خەبەرم کە تۆ دەبینم. بە دیتنت گوڵی ئاواتم دەچنم؟' دوای ئەوە خێراخێرا قەمەروززەمانی ماچ دەکرد و سوپاسی خودای دەکرد وا ئەوانی دوای ئەو هەمووە دوورییە پێک شاد کردەوە.

"کە خزمەتکارەکە ئەوەی بینی و ئەو قسانەی بیست، بە هەڵاتن چوو بۆ لای کۆشک و هەتا بارەگای پاشا ڕانەوەستا. کە گەیشتێ لەڕێوە کڕنۆشـی برد و گوتی: 'پاشـا، موژدەم دەیە! ئەو ئەسـتێرەناسـە لە تەواوی ئەسـتێرەناسـەکان شـارەزاترە، چونکە هەر لەپشـت پەردەڕا خانمی چاک کرد و نەچووە ژوورێ.'

"پاشـا بە خزمەتکارەکەی گوت: 'ئەوە بە ڕاسـتیتە؟' خزمەتکارەکە گوتی: 'هەسـتە وەرە چـاوی لێ بکە کە چۆن زنجیر و شـــتی پچڕانـدووە و لە خۆی کردووەتەوە و ئەستێرەناسەکەی لە ئامێز گرتووە و ماچی دەکا.' ئیدی لەڕێوە غەیووڕپاشا هەستا و چوو بۆ لای کچەکەی. کە شـازادە بێدوور پاشـای دیت، هەسـتا، سـەر و شـتی داپۆشـی و ئەو بەیتە شێعرەی گوت:

هـۆکـاری دەردی مـن ئەو و دەرمـانـیشـــی ئەوە
نەخۆشـــێـک ئەو بیبینێ تیمـار دەبێ لە ڕێوە

"بـاوکی کە کچەکەی دیت، لە ڕادەبەدەر خۆشـــحـاڵ بوو. تەوێڵی مـاچ کرد. ڕووی لە قەمەروززەمان کرد و هەواڵی پرســـی و پێی گوت: 'خەڵکی کام شـــاری؟' قەمەروززەمان خۆی پێ ناسـاند و ئەوەی کە لەنێوان ئەو و شـازادە بێدووردا ڕووی دابوو کە چۆناوچۆن ئەنگوســـتیلەی لە خاتوون وەرگرتووە و هی خۆی داوە بەو. موو بە موو گێڕایەوە. پاشـــا سـەری لەو قسـانە سـووڕ ما و پێی سـەیر بوو گوتی: 'ئەو چیرۆکەی ئێوە دەبێ لە کتێبدا بنووسرێ و بۆ وەچەکانی دواڕۆژ بخوێندرێتەوە.'

"دوای ئەوە پاشـا قازی و شـایەدیان بانگ کرد و خاتوو بێدووریان لە قەمەروززەمان مـارە کرد. ئینجـا پـاشـــا فەرمووی حەوت ڕۆژ جێژن بگرن و وڵات برازێننەوە. ئیدی سـفرەگەلێکی زۆر ڕاخران و خواردەمەنی جۆراجۆریان لەسـەر دانان. شـاریان ڕازاندەوە. سـوپایەکی زۆریان دەنگ دا و لە هەموو لایەکەوە هۆز و تیرەکان ڕوویان لە شـار کرد و پیرۆزباییان کرد. ئارایشـــتگەران و دەســـترەنگینان شـــازادە بێدووریان تیفتیفە دا و قەمەروززەمانیان هێنا بۆ لای. لە جوانی شـەنگ و شـەپالیدا تای یەک بوون. ئەو شـەوە قەمەروززەمـان لەگەڵ بێدوور خانمدا پێکەوە بوون، کۆڵوکۆیـان دامرکا و تـا بەیـانی لە ئـامێزی یەکـدا خەوتـن. لە ڕۆژی دووەمـدا خەڵـکی تەواوی دەرەوە و ژوورەوەی دوورگەکـانیـان بۆ خواردن و ئـاهەنگی زەمـاوەنـدەکە بـانـگ کرد. خوان و خواردەمەنی جۆراجۆر ڕیز کران. هەتا مانگێک بەو پێیە بوو. دوای ئەوە قەمەروززەمان کەوتەوە یادی بـاوکی و خەونی پێوە دیت کە بە قەمەروززەمـانی دەگوت: 'بۆچی ئەو پەنـدەت دامێ و بۆچی لە بیرت کردم؟' لە خەوەکەدا ئەو دوو بەیتە شێعرەی بۆ قەمەروززەمان گوت:

هەتـا کەی مـن خەریـکـی شـــیـن و ڕۆ بـم
بە دایـمە هـاودەمـی ئـازار و ســۆ بـم؟
دەبـێ هەر بەو دوو چـاوی پـڕ لە خـوێـنـم
بـڕێـژم ڕۆنـدکـی خـوێـن تـا بـمـێـنـم

"کە قەمەروززەمان ئەو خەونەی بە باوکییەوە دیت وا ئەو هەموو ئازارە دەچێژێ، زۆر ناڕەحەت بوو هەستا و شازادە بێدووری هەستاند."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان ناڕەحەت و پەرێشان لە خەو ڕابوو شازادە بیدووریشی هەستاند. ئیدی شازادە بێدوور لەگەڵ قەمەروززەمان هەستان چوون بۆ لای غەیوورپاشا و پێیان گوت کە خەونێکی ئاوای دیتووە و ڕوخسەتی سەفەریان خواست. پاشا ڕێی دا قەمەروززەمان بڕواتەوە. شازادە بێدوور گوتی: 'بابە من بەبێ ئەو ناتوانم هەلبکەم.' پاشا بە بێدووری گوت: 'ئەتۆش لەگەڵی برۆ. ساڵێک لەوێ بمێنەوە و دوایی وەرە ئێرە با چاومان پێک بکەوێتەوە.' شازادە بێدوور دەستی بابی ماچ کرد، قەمەروززەمانیش دەستی پاشای ماچ کرد. ئینجا پاشا فەرمانی دا کەلوپەل و پێداویستی سەفەریان بۆ ساز کردن. کەژاوەیان بۆ شازادە بێدوور لەسەر وشتر دابەست و بەڕێیان کردن.

"غەیوورپاشا خەلاتی زێڕین و گەهەری لەگەڵ خەزێنەیەکی زۆر دا بە قەمەروززەمان. پێشی گوت: 'ئەوە کچەکەم بە تۆ دەسپێرم. دەبێ ئاگات لێی بێت.' ئینجا چووە لای کچەکەی و یەکتریان لە باوەش گرت و ماڵاواییان لێک کرد. غەیوورپاشا گریا و ئەو شێعرەی گوت:

> ڕۆیشتی و هەزاران چاو و دڵ لە دووتە
> چۆن تاقەت بێنێ دڵم بەو کۆچەی کردووتە
> دەرناچی لە دڵ هەرچەند بڕۆی لە بەرچاوم
> چاو و دڵ قوربانی ئەو ڕێگەیەی گرتووتە

"دوای ئەوە پاشا لە لای کچەکەی چووە دەرێ و چووەوە لای قەمەروززەمان و تەوێڵی ماچ کرد و ماڵاوایی لێ کرد. ئیتر بە جێی هێشتن و گەڕاوە بۆ دوورگەکان. قەمەروززەمانیش لەگەڵ شازادە بێدووری ژنی و خزمەتکارەکان یەک مانگی تەواو بە لەز ڕۆیشتن. دوای ئەوە لە دەشتێکی سەرسەوز و مێرگزارێک لایان دا و تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا. خواردیان و خواردیانەوە و پشوویان دا. شازادە بێدوور خەوتبوو قەمەروززەمان هاتە خێوەتەکەیەوە سەیری کرد ئەوە بێدوور خەوتووە و قوماشێکی ئاوریشمی پێوەیە کە هەموو گیانی تێیدا دیارە. با جارجار توێ حەریرەکەشی لەسەر سک و مەمکی لا دەدا. قەمەروززەمان چاوی بە زگ و ناوک و مەمکی کەوت و هەستی بزووت. خۆشەویستی زیاتر بوو و ئەو شێعرەی گوت:

یارەکەم ئەو لەش و لارەت دڵ دەهەژێنێ
ڕەزای جوانت هێندە شیرنە هەست دەبزوێنێ
سینگ و مەمک و ناوک و جەستەت
تاڵی ئامێری موسیقی دڵ دەلەرێنێ

"قەمەروززەمان ئارەزووی بزووت و دەستی برد بۆ دۆخینەکەی بیکاتەوە. سەیری کرد نقیمێک بە پزووی ئاوەڵکراسەکەوەیەتی. کە تێی ڕاما، چەند ناوێکی لەسەر نووسرابوو، جوان نەدەخوێندرانەوە. قەمەروززەمان سەری لەو نقیمە سووڕ ما و بە خۆی گوت: 'ئەوە دەبێ حەتمەن شتێکی گرنگ بێ، دەنا شازادە ئەو گەوهەرەی لە وێی نەدەبەست و نەیدەشاردەوە. بڵێی ئەو نقیمە چ بێ و چ نهێنییەکی تێدا بێ؟ بۆچی لەوێی بەستووە؟ دوای ئەوە نقیمەکەی هەڵگرت و بردییە دەرێ لە بەر ڕووناکایی بیخوێنێتەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان نقیمەکەی هەڵگرت و بردییە دەرێ هەتا لە رووناکاییدا بیخوێنێتەوە. هەر کە ویستی چاوی لێ بکا، باڵندەیەک پڕی دایە و لە دەستی رفاند کەمێک فڕی و لەو لاوە نیشت. قەمەروززەمان نیگەرانی نقیمەکەی بوو و کەوتە شوێنی. باڵندەکەش بە قەرای چوونەپێشی قەمەروززەمان فڕی و دیسان نیشتەوە.

"بەو جۆرە هەر ئەو فڕی و ئەویش کەوتە شوێنی هەتا وای لێ هات دەشتاودەشت و تەپکاوتەپک بەدوایدا هەڵات هەتا بوو بە شەو و ودنیالات تاریک داهات. باڵندەکە چووە سەر دارێکی بەرز و لەوێ خەوت. قەمەروززەمانیش عەودال لەبن دارەکە راوەستا. ئەوەندە برسی و ماندوو بوو ترسی بوو بمرێ. کە ویستی بگەڕێتەوە، رێگەی دەرنەکرد. تەواو تاریک ببوو ناچار لەبن دارەکە نووست. کە ڕۆژ بووەوە و وە خەبەر هات، دیتی ئەوە باڵندەکەش خەبەری بووەتەوە. هەر کە قەمەروززەمانی دیت، هەڵفڕی. قەمەروززەمانیش کەوتە سەری. ئەو باڵندەیە وەک بە ئەنقەست وا بکا هەر کەمکەمە هەڵدەفڕی و دەنیشتەوە. قەمەروززەمان بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'سوبحانەڵلا، ئەو باڵندەیە ئەوڕۆ دەزانێ من ماندووم، ئەویش زۆرم لێ دوور ناکەوێتەوە و کەمکەم دەفڕێ، بە راستی سەیرە! دەبێ هەر وەدوای بکەوم، یان تێدا دەچم یان خێرێکی پێوەیە.'

"بەو شێوەیە باڵندە بە ئاسماندا و قەمەروززەمان بە زەویدا ڕۆیشتن. هەموو شەوێ باڵندەکە لەسەر دارێک و قەمەروززەمان لەبن دارەکەدا دەخەوتن. هەتا دە شەو و ڕۆژ ئەوە کاری بوو. لەو ماوەیەدا قەمەروززەمان بە گژوگیا و بنچکی داران بەڕێ دەچوو.

"دوای دە ڕۆژ گەیشتنە شارێکی خۆش و سەرسەوز. باڵندەکە وەک برووسکە خۆی بە شاردا کرد و خۆی ون کرد. قەمەروززەمان نەیزانی چوو بۆ کوێ و ئەو کارەی پێ سەیر بوو گوتی: 'سوپاس بۆ خودا کە بە سلامەتی گەیشتمە ئەو شارە.' ئەوجا چووە سەر کانییەک و دەست و دەموچاو و قاچی شۆرد. کەمێک حەساوە و گەورەیی خۆی کەوتەوە بیر و چاوی لە غەریبی و بەدبەختی ئێستای خۆی کرد و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

سەرم سووڕ ماوە لەو ڕۆژگارە
لە کاری چەوتی ئەو بەدکردارە
ئەڤینی پاک و بێخەوشی تۆی لەیل
بۆچی لە دەرد و مەینەت کردووە کەیل
عەشقێکی پاکی وەک ئاوی کانی

وای دەشـــڵەقێنێ خۆشت نازانی
ئەڤینی پاکت وەک ئاوی ڕەوان
عەودالی کردم لە دەشت و دەران
جار هەیە ئەڤین سەراپام دەگرێ
جارێ جیایی قەڵای دڵم دەگرێ
بڵێی ڕۆژێ بێ پێی شاد ببمەوە
لێوی سووری یار تێر هەڵمژمەوە؟

"کە قەمەروززەمان شێعرەکەی تەواو کرد، دڵی حەساوە و چووە نێو شار."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە قەمەروززەمان هەستا چوو بۆ نێو شار، نەیدەزانی بچێ بۆ کام لا. بە تەواوی شاردا گەڕا. هەتا لە دەروازەی ئەو سەری شارەوە کە ڕوو بە دەریا بوو چووە دەرێ. بەڵام تووشی کەسی ئەو شارە نەبوو. کەسی نەدی. کە لە دەروازەی ئەو سەری شار چووە دەرێ، بەرەو باخ و دارستانێک ڕۆیشت هەتا گەیشتە نێو دارەکان. لەوێوە بەرە و دەرکی باخێک ڕۆیشت. ڕوو بە دەرکی باخەکە ڕاوەستا. باخەوانەکە هاتە دەرێ و سڵاوی لە قەمەروززەمان کرد و گوتی: 'بە خێر بێی ئەتۆ کێی؟' قەمەروززەمان گوتی: 'غەوارەم و پەنام بۆ ئێرە هێناوە' باخەوانە گوتی: 'سوپاس بۆ خودا کە بە سلامەتی لەنێو ئەو خەڵکەوە ڕەد بوویت و ڕزگارت بووە. زوو وەرە ژوورێ با کەس نەتبینێ.' ئیدی قەمەروززەمان گورج خۆی بە ژووریدا کرد. باخەوانەکە وای ترساند لە ترسان خەریک بوو شێت بێ. ئینجا بە باخەوانەکەی گوت: 'ئەو خەڵکە بۆچی وا جێی مەترسین؟' باخەوانەکە گوتی: 'خەڵکی ئەو شارە مەجووسین. ئەتۆ پێم بڵێ چۆن گەیشتوویە ئێرە و چ کارێکت هەیە؟' ئیدی قەمەروززەمان تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. باخەوانەکە واقی وڕ ما و پێی گوت: 'ڕۆڵە، وڵاتی ئیسلام لێرەوە زۆر دوورە و بە دەریادا چوار مانگ و بە بەژدا ساڵەڕێیەکە. لەو دەریایەدا پاپۆڕی تێدایە ساڵێ جارێک بژیو دەبا بۆ سەر سنووری وڵاتی ئیسلام و هەروەها پاپۆڕ لێرەوە دەچێ بۆ دوورگەگەلی خالید کە پاشاکەی شەهرمانپاشایە.' قەمەروززەمان کە ئەو قسەیەی بیست، ماوەیەک ڕاما و زانی کە باشترین کار ئێستا مانەوەیەتی لە لای ئەو باخەوانە هەتا خودا دەرکی بەزەیی بە ڕوویدا دەکاتەوە. ئیدی بە باخەوانەکەی گوت: 'پیاوەتی بکە لێرە پەنام بدە و ئاگات لێم بێ.' باخەوانکە گوتی: 'بەسەر چاو.'

"لەو ڕۆژەوە باخەوانەکە قەمەروززەمانی فێری ئاوداشتن و هێندێک وردەکاری دیکە کرد. ئیدی بۆخۆی ئاوی دەداشت و وشکەڵ و چرپیوچاڵی نێو دارەکانی کۆ دەکردنەوە. بە ڕۆژدا هەر دارەکانی ئاو دەدا و فرمێسکی لە چاوان دەتکا. لە تاوی دابڕانی لە خۆشەویستەکەی حەجمینی نەبوو. لە سوێی شازادە بێدوور ئەو شێعرانەی دەگوت:

من گیرۆدەی مانگێک بووم، ئەوینی، منی کوشتووە
عاشقی بەژنی سەلوێک بووم وەک چیلکەم لێ هاتووە
کێ لە دنیادا لە سوێی، سەلو و هەیف مناسا
کز و باریک و درێژ کۆم و کووڕ و زەرد بووە؟!

"با قەمەروززەمان خەریکی ئاو داشـــتن بێ. بەڵام بزانین ژنەکەی، شـــازادە بێدووری کچی مالیک غەیوور، چی بەســـەر هات. شـــازادە بێدوور کە لە خەو هەســـتا، گازی قەمەروززەمانی کرد. یەک-دوو جار هەر گازی کرد و هیچ دەنگێک نەبوو. ســـەیری کرد پزووی ئاوەڵکراسـەکەی شل بووەتەوە و ئەو گرێیەی نقیمەکەی تێ خستبوو کراوەتەوە و نقیمەکەی تێدا نەماوە، پێی سەیر بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بڵێی خۆشـەویستەکەم چووبێ بۆ کوێ؟! ڕەنگە نقیمەکەی بردبێ و ڕۆیشتبێ. ڕەنگە نهێنی ئەو نقیمەی نەزانیبێ و شتێکی سـەیری بۆ هاتبێتە پێشـێ و ڕۆیشـبێ. دەنا ئەو قەت ناتوانێ لە من دوور کەوێتەوە. ئەو نقیمە بە زیاد نەبێ کە بۆتە هۆی ئەو کارە.'

"دوای ئەوە شازادە بێدوور لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەگەر خەڵکی بێگانە ئاگادار کەمەوە کە قەمەروززەمان ڕۆیشـــتووە، تەماعم تێ دەکەن. ناچارم دەبێ بیرێک بکەمەوە. ئیدی هەستا جلوبەرگی قەمەروززەمانی لە بەر کرد و کڵاوپێچەکەی لە سەری کرد و ڕوخساری داپۆشـــی. کەنیزێکی لە جێگاکەی خۆیدا خەواند و لە تاوڵەکە چووە دەرێ و ســـواری ئەسپەکەی بوو بانگی کۆیلەکانی کرد باریان لێ دا کەوتنە ڕێ. کاری شـازادە بێدوور بەوە باش بوو کە زۆر وەک قەمەروززەمان دەچوو. ئیدی شـەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە شـارێک لە قەراخ دەریا. شـازادە بێدوور لە دەرەوەی شـار باری خسـت و بۆ حەسـانەوە تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا. بێدوور ناوی ئەو شـارەی پرسـی. گوتیان: 'ئەو شـارە ناوی ئابنووسـە و سـوڵتانی ئەو شـارەش ئارمانووسـە. ئەو سـوڵتانە کچێکی هەیە ناوی حەیاتوننفووسە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که شازادە بێدوور لە دەرەوەی شاری ئابنووس لەنگەری گرت و تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا، ئارمانووسپاشا کەسێکی نارد هەواڵێک بێنێ. راسپاردە چوو سەروکوێیەک ئاو بدا، پێیان گوت: 'ئەوە شازادەیەکە و دەچێ بۆ دوورگەکەلی خالیدان بۆ لای شەهرمانپاشا. ئێستا رێیان هەڵە کردووە.' راسپادەکە گەڕاوە لای ئارمانووسپاشا هەواڵەکەی بۆ گێڕاوە. کە ئارمانووسپاشا ئەو قسەیەی بیست، لەگەڵ دەستەیەکی حوکوومەت هەستان چوون بۆ لایان. کە گەیشتنە خێوەت و تاوڵەکان، دابەزین. شازادە بێدوور لە خێوەتەکەی هاتە دەرێ، سڵاو و هەواڵپرسییان کرد. ئارمانووسپاشا بانگهێشتی کرد بۆ نێو شار و هەتا سێ رۆژان لەوێ میوانداری لێ کرد. دوای سێ رۆژ شازادە چووە گەرماو کە هاتە دەرێ، دەتگوت مانگی چواردەیە. پاشا پێی گوت: 'رۆڵە، من پیر بووم و لە منداڵدا خودا هەر کیژێکی داومێ کە لە قەد و باڵادا زۆر شێوی تۆ دەدا. ئەمنیش تاقەتی بەڕێوەبردنی وڵاتم نەماوە. ئایا حەز دەکەی لێرە بمێنیتەوە و کچەکەی خۆمت لێ مارە کەم و وڵاتیش بخەمە بەر دەستت؟' شازادە بێدوور سەری داخست و لە خەجاڵەتیدا تەوێڵی ئارەقەی کرد. بە خۆی گوت: 'ئەوە چۆن دەبێ، خۆ من پیاو نیم؟ ئەگەر لە فەرمانی دەربچم، رەنگە دوایە کە رۆیشتین سوارم وەدوو خا و بمکوژێ. ئەگەر قەبووڵیشی کەم، دوایە ئابڕووم دەچێ. ئەمن کە خۆشەویستەکەم ون کردووە، ئەوم بۆ نادۆزرێتەوە مەگین لێرە بمێنمەوە و بە قسەی بکەم بزانین خودا چمان بەسەر دێنێ.' ئیدی شازادە بێدوور سەری بەرز کردەوە و ملکەچی فەرمانی ئارمانووسپاشا بوو و گوتی: 'گوێڕایەڵ و بەرفەرمانتم.'

"ئارمانووسپاشا بەو وەڵامەی خۆشحاڵ بوو جاڕی دا کە لە دوورگەکانی ئارمانووس دەنگی تەپڵ و دەهۆڵی شادمانی هەڵبڕن و شار برازێننەوە. ئینجا پەردەدار و بریکار و فەرماندەکان و داروودەستەی حوکوومی و قازییەکانی شاری کۆ کردنەوە و خۆی لەسەر کار لا برد و دەسەڵاتی وڵاتی دا دەست شازادە بێدوور. جلوبەرگی پاشایانەی کردە بەری. فەرماندەکان یەکەیەکە هاتنە هەنتەشێ و هەمووش پێیان وا بوو کە لاوێکی جوانچاکە و کەس گومانی ئەوەی نەدەکرد کچ بێ.

"بە کورتی، کاتێک شازادە بێدوور لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت، ئارمانووسپاشا دەستی کرد بە سازکردنی کەنیشکەکەی خۆی. ئەوەندەی نەخایاند کە شازادە بێدووریان ناردە پەردەوە. ئەو جووتە دەتگوت قاشێ مانگێکن. یان دەتگوت مانگ و رۆژن لە لای یەکەوە هەڵاتوون. دەرگاکانیان لێ داخستن و پەردەکانیان لێ دادانەوە. لەو جەنگەیەدا

شازادە بێدوور لەگەڵ حەیاتوننفووس دانیشت و یادی قەمەروززەمانی خۆشەویستی خۆی کرد و دڵی ئەوەندەی دیکەش گیرا و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعری گوت:

بە لای مندا تێپەڕە ئەی شنەی بەیانی
لە منەوە بەرە سڵاوێک و بپرسە حاڵی
بێژە پێی لەو کاتەوە جێت هێشتووە وڵات
سەرگەردان و عەودال، دەگەڕێم دووی باڵات
لە باخی ئەویندا بنچکە گوڵێک بووم
زامی ناسۆری دووریت لە ڕەنگ و بۆنی کردووم
دڵم کردمیە گۆ لە دووی زولف و کەزیەکەت
بڵێ چەوگانی دڵ لە کوێیە گۆی دڵەکەت؟

"کاتێک شازادە بێدوور شێعرەکەی تەواو کرد، لە پەنا حەیاتوننفووس دانیشت و دەمی ماچ کرد. دوای ئەوە هەستا و دستنوێژی گرت و نوێژی کرد هەتا حەیاتوننفووس خەوی لێ کەوت. بەیانی کە حەیاتوننفووس دایک و بابی دیت، ئەوەی شەو ڕووی دابوو هەمووی بۆ گێڕانەوە، ئەو شێعرەی شازادە بێدوور گوتبووی، بۆی گێڕانەوە. حەیاتوننفووس بەو شێوە لەگەڵ دایک و بابی خەریکی وتووێژ بوو.

"شازادە بێدووریش لە ماڵ چووە دەرێ و چووە بارەگا و لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. فەرماندە و وەزیر و کاربەرەستانی وڵات و گەورەکانی سوپا هەموو هاتنە هەنتەشی و کڕنۆشیان برد و پیرۆزباییان لێ کرد. نزای خێریان بۆ کرد. وایان دەزانی کوڕە. بەو جۆرە شازادە بێدوور حوکمی دەکرد و بەندی ئازاد دەکرد و بەمی دەگوت ئەوە بکە و بەوی دیکەی دەگوت ئەو کارە مەکە. هەتا شەو لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. کە بوو بە شەو هەستا و چووەوە پەردە. تەمەشای کرد ئەوە حەیاتوننفووس دانیشتووە. هەنییەی ماچ کرد و لە پەنای دانیشت. بە لەبزی خۆش و دلۆڤانانە دواندی. ئەو شێعرەشی بۆ گوت:

بێ تۆ تاقەتم نییە دانیشم لەگەڵ هی دی
ناتوانم بێ تۆ بژیم لەسەر ڕەواڵێکی دی
بپرسە لە حاڵی من چۆن ڕادەبرێت ژینم
بە ڕۆژ تاکوو ئێوارە سەختی و تاڵی دەبینم
دوور لە باڵات ئەو ژینە بێشکێکی ئاگرینە
ڕادەژیم و دەسووتێم، تۆ خوا کەی ئەمە ژینە؟!

بەیـانیـان کە ڕۆژ هـــــەڵدێ چـاوەڕێم هەواڵێ بێ
بێت و زینـــــــدووم کـــاتەوە، شـاد بمەوە بە ودمێ
دەزانـم ئەو ڕۆژە دێ کەســـێـک بـێـنـێ هەواڵـێ
ســێڵاوی خـــــۆشـــبەختی بێ و نەگبەتی ڕابماڵێ

"دوای ئەوە شـازادە بێدوور هەسـتا و فرمێسـکەکانی سـڕی و دەسـنوێژی شـۆرد و دەستی کرد بە نوێژکردن هەتا خەو بەسەر حەیاتوننفووسدا زاڵ بوو. ئینجا شازادە بێدوور هات لە پەنا حەیاتوننفووسدا خەوت هەتا بەیانی. بەیانی هەستا. نوێژی بەیانی کرد و چووە دەرێ. لەســـەر تەختی دەســـەڵات دانیشـت و هەر وەک ڕۆژی پێشـــوو دەســـتی کرد بە دەوڵەتداری. ئاڕمانووسپاشـــا هاتە لای کچەکەی و هەواڵی پرســـی. حەیاتوننفووس چی ڕووی دابوو گێڕایەوە و ئەو شـــێعرەی شـــازادە بێدوور بۆی گوتبوو ئەویشـــی بۆ بابی خوێندەوە و گوتی: 'بابە، کەسـم وەک ئەو مێردەی خۆم نەدیوە ئەوەندە ژیر و شـەرمێون بێ. هەمیشە دەگری و دەناڵێنێ.' ئاڕمانووسپاشا گوتی: 'ڕاوەستە، هەر ئەوشەو کە شەوی سێیەمییەتی لەسەری ڕادەوەستم. ئەگەر ئەوشەو هاتە لات و لەگەڵت جووت بوو و کردتی بە حەڵاڵی خۆی، ئەوە باشە. دەنا دەسەڵاتی ولاتی لێ دەستێنمەوە و شاربەدەری دەکەم.' باب و کچ لەسەر ئەو بیرە کۆک بوون، بەڵام وەک نهێنییەک لای خۆیان پاراستیان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا لەگەڵ کچەکەی لەو قسەیەدا کۆک بوون. کە بوو بە شەو شازادە بێدوور لەسەر تەختی پاشایەتی هەستا و بەرەو کۆشک گەڕاوە و چووە پەردەوە. تەماشای کرد ئەوە حەیاتوننفووس مۆمی هەڵکردووە و دانیشتووە. ئیدی مێردەکەی خۆی بیر هاتەوە و ئەسرینی هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

ئەمن کەســـــــــم نەکردووە بە هـاودەمـی خـۆم
شـــەو و ڕۆژ و لەیـل و نەهــار هەر بە یـادی تــۆم
گەر بــاخـــــــەوان دەرگـا لە دەرویـش گـاڵە بــدا
شـــنە دێـــــنێ بۆنـی خـۆشـــی بـاخ بە لای ویـدا
ئەگەر ســـــروەی بـا ســـــۆزەیەک بـێـنـێ لە لای تـۆوە
پـێشـــکەشـــی دەکەم ســـەر و ســـــامـانـم لە ڕێـوە

"کە شێعرەکەی تەواو کرد ویستی هەستێ نوێژ بکا. حەیاتوننفووس ئاتەگی گرت و پێی گوت: 'گەورەم، مەگەر شـــەرم لە بابم ناکەی چەندی چاکە لەگەڵ کردووی، کەچی تۆ ئاوا پشت لە من دەکەی و بە هێندم ناگری؟' کاتێک شازادە بێدوور ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'خۆشەویستەکەم، ئەوە گوتت چی؟' حەیاتوننفووس گوتی: 'ئەمن دەڵێم کەسی بە قەد تۆ لەخۆباییم نەدیوە! بۆ ئەوانەی جوانن هەموویان ئاوا بە فیزن؟ ئەمن ئەوەم بۆیە پێ نەگوتی کە تا سەرنجت ڕاکێشم، بەڵکوو نیگەرانم ئارمانووسپاشا شتێکت لێ بکا. ئەو قسەیەم پێ گوتی هەتا بزانی کە ئەگەر ئەوشەو پەردەی کچێنیم لا نەدەی، سۆزی دەسەڵاتی وڵاتت لێ دەستێنێتەوە و دەرتدەکا و دەتنێرێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت. ڕەنگیشـــە ئەوەندە تووڕە و نارەحەت بێ بشـــتکوژێ. گەورەم، ئەمن خەمی تۆم بوو، دەنا چۆنت پێ خۆشـــە وا بکە.' شــازادە بێدوور کە ئەوەی بیســت، ســەری داخســت. گێژ بوو نەیدەزانی چی بڵێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر دژایەتی بکەم، دەکوژرێم. ئەگەر ملیش کەچ بکەم و هیچ نەڵێم، ئابڕووم دەچێ. باشترین کار ئەوەیە زووخاوی دڵم بۆ ئەو کیژە هەڵڕێژم. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئارمانووسپاشا دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی تەواوی ئەو کۆمەڵە دوورگانەی داوە بە من و منیش لێرە نەبێ کە کەوتووەتە لای دوورگەکانی خالیدیان، لە هیچ شـوێنێکی دیکە شـیانی دیتنەوەی قەمەروززەمـانم نییە، هەر بۆیە خۆم دەدەمە دەســـت خودا. چونکە هەر ئەو باشترین فریادڕەسە.'

"ئیدی شـــازادە بێدوور دەســـتی لە ملی حەیاتوننفووس کرد. تەوێڵی ڕاموســـی و

بەســەرهاتی خۆی لە ســەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە و ســفرەی دڵی بۆ هەڵڕشــت و پێی گوت: 'تکات لێ دەکەم، بیکە بە خاتری خودا ســڕم بپۆشــە و لای کەس باســی مەکە هەتا خودا من بە قەمەروززەمانی خۆشــەویســتم شــاد دەکاتەوە. دوای ئەوە ئەوەی دەبێ ببێ، دەبێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک شازادە بێدوور حەیاتوننفووسی لە بەسەرهاتەکەی خۆی ئاگادار کردەوە و داواشی لێ کرد لای کەس نەیدرکێنێ، حەیاتوننفووس سەری لەو کارەی ئەو سوورِ ما. بەزەیی پێیدا هات و نزای بۆ کرد لەگەڵ قەمەروززەمان پێک بگەنەوە. گوتیشی: 'خوشکم، لە هیچ مەترسە و نیگەران مەبە، دەست ڕادەگرین بەشکو خودا گرێ لە کارت بکاتەوە، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

یوسفی ونبوو هەمیسانیش دێتەوە کەنعان، خەم مەخۆ
کۆختی خەمانت ڕۆژێ دەبێتە گوڵستان، خەم مەخۆ
دڵەی کولۆڵم ڕۆژێ دێ بێخەم ببی، ڕەشبین مەبە
ئەهوەن و هێدی دەسرەوێ، ڕەشەبای ناخت، خەم مەخۆ

"کە دوو شێعرەکەی تەواو کرد، گوتی: 'سینگی جوامێران و شێرەژنان گۆڕی نهێنییەکانە؛ ئەرخەیان بە کە نهێنی تۆ دەپارێزم.' دوای ئەوە پێکەوە زۆریان قسە و گاڵتە و جەفەنگ کرد و خۆیان تێک هەڵسوو. دوایی لە ئامێزی یەکدا هەتا بەربەیان خەوتن. ئینجا حەیاتوننفووس مەلێکی هێنا سەری بڕی و خوێنەکەی بە پەڕۆیەکدا کرد. پاشان کەنیزەکانی بانگ کرد و پەڕۆکەی دانێ. کەنیزەکان دەستیان کرد بە دەفلێدان و شادی و ئاهەنگ و گۆرانی. لەو کاتەوە دایکی حەیاتوننفووس هەستا و هاتە دەرێ و دوای هەواڵەکەی کەوت. ئیدی هەتا شەو لە لای حەیاتوننفووس مایەوە، بەڵام شازادە بێدوور هەستا چووە گەرماو و خۆی شۆرد و نوێژی کرد و گەڕاوە کۆشکی سەرۆکایەتی، لەسەر تەخت دانیشت و دەستی کرد بە کاری بەڕێوەبەرایەتی.

"ئارمانووسپاشاش کە گوێی لە دەنگی خۆشی و شادی کەنیزەکان بوو پرسیاری کرد. پێیان گوت کە هەواڵی بوونە ژنی حەیاتوننفووسیان زانیوە. ئیدی پاشاش خۆشحاڵ بوو خەمی لە دڵدا نەما. هەتا ماوەیەکی باش شیرینی و خواردنی دا.

"با ئەوانە لێرە بەجێ بێڵین و سەرێکی شەهرمانپاشا بدەینەوە. شەهرمانپاشا دوای ئەوەی قەمەروززەمانی کوڕی لەگەڵ مەرزوان چوون بۆ ڕاو ئیدی دڵی هەر لای کوڕەکەی بوو. کە بوو بە شەو و قەمەروززەمان نەهاتەوە، شەهرمانپاشا کەوتە دڵەکوتە و نیگەرانی. ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوییەوە و هەزار بیری جۆراجۆر بە سەریدا دەهات. هەتا لای نیوەڕۆش هەر چاوەڕێ بوو و قەمەروززەمان هەر نەهاتەوە، بە دڵیدا هات کە تازە شتێکی لێ هاتووە. ئیدی دەستی کرد بە گریان و ئەوەندە گریا هەتا جلەکانی بەری تەڕ بوون. بە دڵێکی پڕ لە خەم و دەردەوە ئەو شێعرەی گوت:

هەر کە لە بـــــاوکت دوور کەوتـــــیتەوە
ئەو ڕۆژی خـــــــــــۆشی قەت نەدیتەوە
شـــەو و ڕۆژ لە ســـوێت حەجمینی نەبوو
یـان شـــین و ڕۆی بوو یـا فکری تۆی بوو
ئومێدی ڕۆژی تەنگانەی تۆ بـــــــــــووی
داخـــــــــــی گرانم ئەتۆش کە ون بووی

"کە شێعرەکەی تەواو بوو فرمێسکەکانی سڕین و دەنگی سوپای دا کە دوایان بکەون. سوپا هەموو سوار و ئامادە بوون. بۆخۆشـی بە دڵێکی پڕ خۆزگە و بریا و نیگەرانییەوە سوار بوو. سوپاکەی کردە چوار بەش و هەر بەشەی بەرەو لایەکی بەڕێ کرد و گوتی: 'دوای پشـــکنینی هەموو کەلێن و کەلەبەرێکی نـاوچەکە وەرنەوە لە چوارڕیـان یەک دەگرینەوە.' ئیدی ئەو چوار بەشەی سوپا لە چوار لادا هەتا تاریکانی شەو بڵاو بوونەوە و شـەویش هەتا بەیانی لای نیوەڕۆ هەر گەڕان و لە کۆتاییدا لە چوارڕیان یەکیان گرتەوە و کەس بۆی دەرنەکەوت کە قەمەروززەمان لە کام لاوە ڕۆیشتووە. هیچ سـۆراغێکی نەبوو. هەتا لە کۆتاییدا لە نزیک چوارڕیان چاویان بە هێندێک گۆشت و خوێن و جلوبەرگی دڕاو کەوت. کە شـەهرمانپاشـا ئەوانەی دیت، ناوکی کەوت و دەسـتی کرد بە شـین و گریان و هـاتوهـاوار. لە ســـەر و کوێلاکی خۆی دەدا و جلوبەرگی لەبەر خۆی دادڕی و بە کوڕەکەیدا هەڵدەگوت. سـوپاکەش لەگەڵی دەسـتیان کرد بە شـین و گریان. پاشـا بە دڵی برژاوەوە ئەو شێعرەی گوت:

بۆ ڕۆیشـــتی کوڕم، بۆ بەجێت هێشـــتم
نەتـدەزانـی پـیـر، دەشـــکـێ پشـــتـم
نەحەســـــایەوە لە بـــاخـــی فەنـــا
بوا زوو ڕۆیشـــتی بۆ مـــــــــاڵی بەقـا
هـێشـــتـا خـونـچـێکـی نەکـراوە بـووی،
کـاتـی مـردنـت نەبـوو بـۆ کـوێ چـووی
مـــردن دڕنـــدەیەکـــی مـــرۆخـــۆرە
دیـارە کەوتوویە چنـگ ئەو خـــــوێنخۆرە!

"کە شێعرەکەی تەواو کرد. بە گریانەوە بەرەو شار گەڕانەوە.'
لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که شەهرمانپاشا شێعرەکەی تەواو بوو به گریانەوە بەرەو شار گەڕانەوە و لێی سوور بوو، قەمەروززەمان نەماوە. وای زانی دز و ڕێگر یان دڕندە شتێکیان لێ کردووە، دوای ئەوە لە دوورگەکانی خالیدان جاڕیان دا، خەڵک بۆ ماتەمینی قەمەروززەمان بەرگی ڕەش لە بەر کەن. دیوێکیشیان بۆ پاشا درووست کرد کە ناوی ماتەمخانە بوو. پاشا لە حەوتوودا دوو ڕۆژ خەریکی کاروباری وڵات دەبوو ئەوەی دیکە لەو دیوەدا دادەنیشت و دەگریا و دەلالاوە و بە قەمەروززەمانیدا هەڵدەگوت. بۆ وێنە دەیگوت:

ڕۆڵە ڕۆیشتی، وادەی کۆچ نەبوو
عالەم ماتەمبار بۆت ڕەنجەڕۆ بوو
بۆی کزەی جەرگم وڵاتی داگرت
هەوری پەژارە بەری ڕۆژی گرت
سۆمای چاوەکەم حوکمی نەماوە
لەدوای کۆچەکەت پشتم شکاوە

"شەهرمانپاشا ئەوە کاری بوو. شازادە بێدووری کچی غەیوورپاشا کە بوو بە پاشای ئابنووس و خەڵک پێی وا بوو، زاوای ئارمانووسپاشایە، هەموو شەوێ لەگەڵ حەیاتوننفووس لە ئامێزی یەکتردا دەخەوتن و شازادە بێدوور هەر لە خەیاڵی قەمەروززەماندا دەژیا و لەگەڵ یادەکانی دەستەملان بوو.

"قەمەروززەمانیش ماوەیەکی زۆر لە لای باخەوان ماوە. شەو و ڕۆژ بیری لە ڕۆژانی ڕابردوو دەکردەوە. شێعر و شتی دەخوێندەوە و ئاخی سووتێنەری هەڵدەکێشا و دەستی دەکرد بە گریان. باخەوانیش دڵخۆشی دەداوە و دەیگوت: 'کۆتایی ساڵ کەشتی دەچێ بۆ وڵاتی موسوڵمانان.' قەمەروززەمان هەر لەو بیر و خەیاڵانەدا بوو هەتا ڕۆژێک سەیری کرد ئەوە خەڵکێکی زۆر لە شوێنێک کۆ بوونەوە. لەو جەنگەیەدا باخەوانەکەش هاتەوە و بە قەمەروززەمانی گوت: 'ڕۆڵە، ئەورۆ کار و شت وەلا نێ و دار و شت ئاو مەدە، چونکە ئەورۆ جێژنە و خەڵک یەکتر ماچ دەکەن و پیرۆزبایی لە یەکدی دەکەن. ئەتۆش ئەورۆ خەریکی خۆشی و شادی بە. منیش بەم زووانە کەشتیت بۆ پەیدا دەکەم و دەتنێرمەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان.' باخەوانەکە ئەوەی گوت و لە باخەکە چووە دەرێ. قەمەروززەمان نارەحەت و تەنیا لەوێ ماوە و دەستی کرد بە گریان. ئەوەندە گریا هەتا دڵی لە خۆ

بووەوە. پاش ئەوەی وە هۆش هاتەوە، نەرمنەرم ڕۆیشت بیری لەو ڕۆژگارە دەکردەوە کە چۆناوچۆن ئەو و خۆشەویستە گوڵڕوخسارەکەی لێک هەڵبڕی. وەک سەرخۆشان بە لادا دەهات و بەرپێی خۆی نەدەدی. هەتا لە پڕدا قاچی خزا و بە ڕووەوە کەوت. تەوێڵی بە بنەدارێکدا کەوت و بریندار بوو. خوێنی پێدا هاتە خوارێ. خوێن و فرمێسک تێکەڵ بوون. دەسرێکی پێ بوو تەوێڵی پێ بەست. خۆی پێی سەیر بوو. لەو جەنگەیەدا چاوی بە دوو باڵندە کەوت، شەڕیان بوو. یەکێک لەوان بەسەر ئەوەی دیکەدا زاڵ بوو لە پڕدا هەڕای کردێ و ئەوەندەی بە دندووک لێ دا هەتا سەری هەڵپچڕی. دوای ئەوە بە چنگ سەری ئەوەی دیکەی هەڵگرت و هەڵفڕی و لاشەکەشی لەوێ کەوت. ئینجا دوو باڵندە هاتن یەکیان لە لای سەری و ئەوەی دی لە لای خوارەوەی هەڵنیشت. ملیان درێژ کردەوە و باڵیان فش کردەوە. دەستیان کرد بە گریان. قەمەروززەمان کە دیتی ئەو باڵندانە بۆ هاوڕێکەی خۆیان دەگرین، ئەویش لە سوێی گراوەکەی دەستی کرد بە گریان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان لە سویّی یارەکەی دەستی کرد بە گریان. دوای ئەوە قەمەروززەمان سەیری کرد کە ئەو دوو باڵندە گەورەیە باڵندە کوژراوەکەیان لە قولکێک خست و بە چنگ و دندووک خۆڵیان بەسەردا کرد و بۆخۆیان هەڵفڕین. ماوەیەکیان پێ چوو دوای ئەوە گەڕانەوە سەر گڵکۆی هاوڕێکەیان و مەلە بکوژەکەشیان هێنا و لەسەر گڵکۆکە ئەوەندەیان بە چنگ و دندووک لێ دا هەتا کوشتیان. سکیان دڕی و جەرگ و ڕیخۆڵەیان هێنا دەرێ و خوێنەکەیان بەسەر گڵکۆی هاوڕێکەیاندا کرد. پێست و گۆشتەکەشیان پچڕپچڕ کرد. ئەوەی لە سکیدا بوو هەموویان هێنا دەرێ و بەملا و بەولادا فڕێیان دەدا. قەمەروززەمانیش ئەو کارەی ئەوانی زۆر پێ سەیر بوو. سەیری ئەو شتانەی دەکرد کە لە زگی ئەو باڵندەیە دەریانهێنابوو. لەپڕ سەیری کرد یەکێک لەو شتانە دەدرەوشێتەوە. قەمەروززەمان چووە پێشێ بزانێ چییە. کە چوو تەمەشای کرد ئەوە چیکڵدانەیە. هەڵیگرتەوە و قەڵەشتییەوە، سەیری کرد ئەو نقیمەی کە بووە هۆی جیابوونەوەی ئەو لە شازادە بێدوور، ئەوەتا لەوێدایە. کە نقیمەکەی جوان ناسییەوە، لە خۆشیان هۆشی لەسەر خۆی چوو و بە لادا کەوت. دوای ئەوەی وە هۆش هاتەوە، گوتی: 'لەوە دەچێ ئەوە هەواڵێکی خۆش بێ. مژدەدەری پێکشادبوونەوەمان بێ.' هەر بۆیە جوان سڕی و چاوی لێ کرد و لەسەر چاوی دانا. دوای ئەوە لە باسکی خۆی بەست و بە دڵخۆشی و دەماخەوە ڕۆیشت هەتا باخەوان ببینێتەوە. هەتا دەرنگانێک نەیدیتەوە. قەمەروززەمان ئەو شەوە هەر لەوێ ماوە. بەیانی هەستا. توێکڵی دارخورمای لە خۆی بەست و دەستی دا تەشوێ و دەستی کرد بە لێکردنەوەی وشکەڵ هەتا گەیشتە دارێکی کۆنی وشک. زۆری بە تەشوێ لە ڕیشە و شتەکەی دا و گڵەکەی لا دا. لە ناکاو دەرخۆنەیەکی دارینی دیتەوە. دەرخۆنەکەی هەڵگرت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، قەمەروززەمان کە دەرخۆنەکەی هەڵگرت، دەرگایەکی دیت. چووە ژوورەوە ســارداوێکی گەورە و کۆنی دیتەوە. کە هێمای چاخی ســەموود و عادی نیشــان دەدا. لەوێ کووپەگەلێکی زۆری تێدا بوو پڕ لە زێڕی ســـوور. ئیدی لە دڵی خۆیدا گوتی: 'سەختی و ئازێشە تەواو بوو نۆرەی خۆشی و شادییە.' ئینجا لەو شوێنە هاتەوە دەرێ و دەرخۆنەکەی لەســەر داناوە و وەک خۆی لێ کردەوە. بۆخۆی دەســتی کرد بە ئاوداشــتنی باغ و خەریکی کاری خۆی بوو هەتا بوو بە شـــەو. باخەوان هات و بە قەمەروززەمانی گوت: 'ڕۆڵە گیان، مژدە بێ کە کاتی گەڕانەوەت بۆ وڵات نزیک بووەتەوە. بازرگانەکان خۆیان بۆ سەفەر ساز کردووە. هەتا سێ ڕۆژی دیکە پاپۆڕ بەرەو شاری ئابنووس وەڕێ دەکەوێ. ئەوێ یەکەم شارە لە شارەکانی موسوڵمانان. کە بگەیتە ئەوێ، لەوێوە بە شەش مانگ دەگەیەوە دوورگەکانی خالیدان.' قەمەروززەمان بەو قسەی باخەوان خۆشحاڵ بوو، دەســـتی باخەوانی ماچ کرد. گوتی: 'باوەگیان، وەک تۆ ئەو مژدەیەت دا بە من، ئەمنیش مژدەیەکت دەدەمێ. ئیدی باســـی ســـاردئاو و زێڕەکانی بۆ کرد. باخەوانە خۆشـــحاڵ بوو گوتی: 'ڕۆڵە گیان، من هەشتا ساڵە لەو باخە دام شتی ئاوام نەدیوەتەوە. ئەوە کە لەو ماوە کەمەدا ئەوەت دیوەتەوە، ڕزقی خۆتە و هێمـای هـات و فەڕە؛ دەبێتە هۆکـاری پێـک گەیشتنەوەی ئەتۆ و گراو و وڵاتەکەتان.' قەمەروززەمان گوتی: 'ناکرێ، دەبێ بەشی کەین.' ئیدی باخەوانی لەگەڵ خۆی برد، چوو بۆ ساردئاوەکە و زێڕەکانی پیشان دا. بیست کووپە بوو. دە کووپەی هەڵگرت بۆ خۆی و دە کووپەشی دا بە باخەوانەکە. باخەوان گوتی: 'ڕۆڵە، بازرگانـان لێرەوە زەیتوون بۆ شـــــارەکانی دیکە دەبەن، چونکە زەیتوون هەر لێرە گیر دەکەوێ. منیش خیگەیەکی[1] زۆر دێنم زێڕەکانی تێ دەکەم و سەر زێڕەکانش زەیتوونی تێ دەکەم. زارکی خیگەکان دەبەستین و لە پاپۆڕیان دەدەین.

"ئیدی خێرا هەســتا و پەنجا خیگەی هێنا و زێڕەکانی بەســەر هەموویاندا دابەش کرد و زەیتوونیشی بەسەردا کردن. قەمەروززەمانیش نقیمەکەی لە یەکێک لە خیگەکاندا شاردەوە و تونـد زارکی خیگەکـانیـان بەســـتن. بـاخەوان و قەمەروززەمـان پێکەوە دەدوان و قەمەروززەمان لێی ســوور بوو بە ژنەکەی شــاد دەبێتەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'کاتێک بگەمە شــاری ئابنووس، لەوێوە دەڕۆمەوە بۆ شــارەکەی بابم. لەوێ دەکەومە پێوشــوێنی شـــازادە بێدوور کە یان لەوێیە یان چووەتەوە بۆ لای غەیووڕپاشـــای باوکی.' دوای ئەوە قەمەروززەمان سێ ڕۆژان چاوەڕوان بوو. شەڕی پەلەوەرەکانی چۆن بوو ئاوا بۆ باخەوان

---

١. خیگە: جۆرە مەشکەیەکە لە چەرم ساز دەکرێ.

گێڕاوه. باخه‌وان زۆری پێ سه‌یر بوو. پاشان هه‌تا به‌یانی خه‌وتن. باخه‌وان به ناساخی له خه‌و هه‌ستا. ڕۆژی دووه‌میش هه‌ر نه‌خۆش بوو ڕۆژی سێیه‌م ئیدی ئه‌وه‌نده نه‌خۆش بوو به هیوای خۆی نه‌بوو ده‌ستی له ژیان شۆرد. قه‌مه‌روززه‌مان به ناڕه‌حه‌تی له لای باخه‌وان دانیشتبوو که مه‌له‌وانه‌کان هاتن و هه‌واڵی باخه‌وانیان پرسی. قه‌مه‌روززه‌مان ئاماژه‌ی به نه‌خۆشی باخه‌وان دا. مه‌له‌وانان گوتیان: 'ئه‌و لاوه له‌کوێیه که به ته‌ما بوو له‌گه‌ڵمان بێ بۆ سه‌فه‌ر؟' قه‌مه‌روززه‌مان ده‌ستێکی له سنگی دا و گوتی: 'ئه‌وه‌یه، ئه‌و کۆیله‌یه که له خزمه‌تتاندا ڕاوه‌ستاوه.'

"ئیدی به مه‌له‌وانه‌کانی گوت: 'ئه‌و خیگانه به‌رنه ناو پاپۆڕه‌که.' ئه‌وان خیگه‌کانیان بردنه ناو پاپۆڕه‌که و به قه‌مه‌روززه‌مانیان گوت: 'ئه‌تۆش زوو وه‌ره هه‌تا بای دڵخواز دێ.' قه‌مه‌روززه‌مان پێی گوتن: 'به چاوان.' دوایی تۆشه‌ی ڕێگه‌شی برده ناو پاپۆڕه‌که و گه‌ڕاوه بۆ لای باخه‌وانه‌که هه‌تا ماڵئاوایی لێ بکا. که‌چی سه‌یری کرد ئه‌وه له ئاویلکه‌داندایه. له‌پشت سه‌ری دانیشت هه‌تا باخه‌وان مرد. ئیدی شۆردی و کفنی کرد و ناشتی. که چوو بۆ لای که‌شتییه‌که، سه‌یری کرد ئه‌وه چارۆکه‌کانی هه‌ڵداوه و وه‌ڕێ که‌وتووه. هه‌ر ڕاوه‌ستا و چاوی لێ کرد هه‌تا له چاو ون بوو. قه‌مه‌روززه‌مان سه‌رگه‌ردان و لێقه‌وماو گه‌ڕاوه باخ و له‌به‌ر ناڕه‌حه‌تی و چاره‌ڕه‌شیان خۆڵی وه‌سه‌ر خۆی ده‌کرد."

لێره‌دا بوو، ماوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشه‌ویش کۆتایی هات و شه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

# کە شەوی دووسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان کاتێک لە کەشتییەکە هیوابڕاو بوو بە دڵێکی پڕ لە خەم و پەژارەوە گەڕاوە باخەکە. باخەکەی بە کرێ گرت و دوو پیاوی گرت لە بەردەستیدا کار بکەن و یارمەتی بدەن. دوای ئەوە چووەوە بۆ لای ساردئاوەکە و دەرخۆنەکەی لا برد. چووە خواریّ پاشماوەی زێڕەکانی لە پەنجا خیگەکە کرد و زەیتوونی بەسەردا کردن و چوو پرسیاری کەشتی کرد. پێیان گوت: 'کەشتی ساڵێ جارێک زیاتر ناچێ بۆ وڵاتی موسوڵمانان.' ئیدی ئەوەندەی دی نارەحەت بوو. تووشی دوودڵی و دڵەڕاوکێ بوو. هەردەم نارەحەت بوو بە تایبەت خەمی ئەو نقیمەی بوو چونکە هی شازادە بێدوور بوو. هەر بۆیە شەو و ڕۆژ دەگریا و شیعری بەسەردا هەڵدەگوت. ئەوە کار و دۆخی قەمەروززەمان بوو.

"بەڵام کەشتیوانەکان بای دڵخۆاز هات گەیشتنە دوورگەی ئابنووس. بە ڕێکەوت شازادە بێدوور لە بەرجەوەندەکەی خۆی دانیشتبوو چاوی لە پاپۆڕەکە بوو هەتا گەیشتە قەراخ ئاوەکە. شازادە دڵی هەواڵی دابوو هەر دڵەڕاوکێی بوو و هەستا لەگەڵ فەرماندە و پەردەدارەکانی سوار بوون و چوونە ڕۆخ دەریا و لای پاپۆڕەکە ڕاوەستان. ئینجا بەرپرسی کەشتییەکەیان بانگ کرد و پرسیان: 'بارەکەت چییە؟' سەرۆکی کەشتییەکە گوتی: 'جا بڵێم چی؟! لە هەموو جۆرە شتێکمان پێیە. ئەوەندەمان شت پێیە کە بە هێستر و وشتر و شت هەڵناگیردرێ. بێجگە لەوە بۆنی جۆراجۆر و عوودی قاقلی و تەمری هیندی و زەیتوونی باڵندەگەلی[1] تێدایە کە لەو ناوچەیە کەمتر گیر دەکەون. شازادە ئارەزووی چووە زەیتوون، بە سەرۆکی کەشتییەکەی گوت: 'چەندت زەیتوون پێیە؟' گوتی: 'پەنجا خیگەم زەیتوون پێیە، بەڵام خاوەنەکەیمان لەگەڵ نییە.' شازادە گوتی: 'خیگە زەیتوونەکان داگرن با بیانبینم.' سەرۆک گازی مەلەوانەکانی کرد. خێرا پەنجا خیگە زەیتوونەکەیان داگرتن. شازادە سەری یەکیانی کردەوە و چاوێکی لێ کرد و گوتی: 'ئەمن ئەو پەنجا خیگە زەیتوونەم دەوێ. بایی چەندەشن نرخەکەیانتان دەدەمێ.' سەرۆک گوتی: 'ئەوانە نرخیان لەسەر دانانرێ، بەڵام خاوەنەکەی هەژارە و بەجێ ما.' ئیدی شازادە دەستووری دا خیگەکانیان بردنە کۆشک. کە بوو بە شەو خیگەیەکیان هێنا و سەرەکەیان کردەوە. جگە لەو و حەیاتوننفووس، کەسی دیکە لەوێ نەبوو. مەجۆعمەیەکیان هێنا زەیتوونەکەی لەسەر ڕۆکەن، کەچی کوڵێک[2] زێڕی سوور ڕژا سەری. کە ئەو زێڕەیان دیت، چوون ئەوانی

---

١. زەیتوونی باڵندە: دەبێ زەیتوونێکی تایبەت بێ.

٢. کوڵێک: مەبەست شتێکی زۆرە.

دیکەشیان هێنان و جگە لە زێڕ و ئەو نەختە زەیتوونەی سەرەوە، هیچی دیکەی تێدا نەبوو. بە هەموو ئەو خیگانەوە خیگەیەکیان زەیتوون تێدا نەبوو. هەر ئاوا کە خەریک بوون دەستیان لە زێڕەکان وەردەدا، لەپڕ شازادە بێدوور نقیمە جادووییەکەی خۆی لەو نێوەدا دیتەوە. هەڵیگرتەوە ورد تێی ڕاما. زانی ئەوە گەوهەرەکەی خۆیەتی کە لە پزووی ئاوەڵکراسەکەیدا بوو و قەمەروززەمان هەڵیگرتبوو. ئیدی لە خۆشیان قیژاندی و بێهۆش بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و پازدە هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە بێدوور کە نقیمەکەی دیت، ناسییەوە و لە خۆشیان دڵی لە خۆ بووەوە. حەیاتوننفووس کەمێکی گوڵاو بەسەردا هەڵپرژاند، دەستی تەڕی بە سەروچاویدا هێنا و هێنایەوە سەرخۆ. کە وە هۆش هاتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'هەر ئەوە بووە هۆی لێکدابڕانی من و قەمەروززەمان. لەوە دەچێ خێری پێوە بێ و نیشانەی کۆتایی ئەو دوورییە بێ.'

"ئیدی بە حەیاتوننفووسی گوت: 'دۆزینەوەی ئەو نقیمە مژدەی دیدارە.' کە ڕۆژ بووەوە، لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. ناردی سەرۆکی پاپۆڕەکەیان هێنا. سەرۆک هات و کڕنۆشی برد و پێی گوت: 'خاوەنی زەیتوونەکەت لەکوێ بەجێ هێشت؟' گوتی: 'پاشای جیهان، لە وڵاتی مەجووسان. ئەو لەوێ لە باخێک باخەوان بوو.' شازادە گوتی: 'ئەگەر نەچی نەیهێنی، زیانێکی زۆر لە خۆت و کەشتییەکەت دەدرێ.' ئیدی فەرمانی دا کەلوپەل و ماڵی نێو کەشتییەکەیان لە شوێنێک دانا و درۆشمیان[1] کردن و پێی گوت: 'قەرزم لەسەر خاوەنی ئەو زەیتوونەیە. ئەگەر ئەو نەهێنن، ئەوە تەواوی ئێوە و ماڵەکەتان بە تاڵان دەچێ.' ئیدی بازرگانەکە بەڵێنی دانی حەقدەستی بە کەشتیوانەکە دا و پێی گوت: 'بگەڕێوە باخەوانەکە بێنە.' بە گریان و پاڕانەوەوە گوتی: 'ئێمە لەو گرفتە ڕزگار بکە.' ئیدی کەشتیوان گەڕاوە سەر کەشتییەکەی و چاڕۆکەی هەڵدا و بای دڵخواز هات و کەشتییەکەی ئاژۆت. گەڕاوە دوورگەکە، لە کەشتییەکە دابەزی، چووە دەرکی باخەکە و لە دەرگاکەی دا. ئەو ماوەیە قەمەروززەمان لە تاوی خۆشەویستەکەی شەوانەش هەتا بەیانی هەر دانیشتبوو بیری لە چارەنووسی خۆی کردبووەوە و گریا بوو.

"کەشتیوان لە دەرگای باخەکەی دا. قەمەروززەمان هەستا و دەرگای کردەوە. کەشتیوان فەرمانی بە مەلەوانەکان کرد بێ سێ‌ودوو قەمەروززەمانیان برد و سواری کەشتییان کرد. چاڕۆکەیان هەڵدا و وەڕێ کەوتن. شەو و ڕۆژ لە ڕێدا بوون. قەمەروززەمان نەیدەزانی چ بووە و بۆ کوێی دەبەن و لەبەر چی. کە پرسیاری کرد، پێیان گوت: 'ئەتۆ قەرزباری پاشای دوورگەگەلی ئابنووسی کە زاوای ئارمانووسپاشایە. وادیارە تۆ ماڵەکەیت دزیوە.' قەمەروززەمان گوتی: 'بە خودا خۆ من لە تەواوی ژیانمدا نەچوومەتە ئەو شارە و نازانم لە کوێیە.' وا بوو کەشتی هەر ڕۆیشت و ڕێگای بڕی هەتا گەیشتنە دوورگەگەلی ئابنووس. کەشتیوانەکە دایبەزاند. قۆڵی گرت و بردی بۆ لای شازادە بێدوور.

---

١. درۆشمیان کرد: دیاریان کرد بۆ ئەوەی دەستی لێ نەدرێ. واتە ئەگەر شەقڵی شکا دیار بێ، لاک و مۆر کرا.

شــازادە بێدوور لە دوور ئەوی ناسـییەوە. خەریک بوو، هەسـتێ و ئامێزی پێدا بکا. ئەگەر واشــی کردبا حەتمەن بەلادا دەهات و بێهۆش دەبوو. بەڵام بەســـەر خۆیدا زاڵ بوو. خۆی ڕاگرت و فەرمانی دا، خزمەتکارەکان بیبەن بۆ گەرماو و جلوبەرگی شـــیاوی لە بەر کەن. ئیدی هێنای درۆشـمی لەسـەر ماڵی بازرگانەکە لا برد و کەشـتیوانەکەی خەڵات کرد. چوو بۆ لای شـازادە حەیاتونفووس و هەواڵی هاتنی قەمەروززەمانی پێ ڕاگەیاند و ڕاشـیسـپار جارێ لای کەس باسی نەکا.

"خزمەتکارەکان قەمەروززەمانیان بردە گەرما و جلوبەرگی پاشایانەیان لەبەر کرد. کە قەمەروززەمان لە گەرماو هاتە دەرێ، دووما و تەویڵی وەک ئەستێرە دەدرەوشاونە. داری سەلو و کاژ لە ئاست باڵای ئەو ئارەقیان دەکرد.

"کاتێک هێنایان بۆ کۆشک و شازادە چاوی پێی کەوت، خەریک بوو دەست و پێی خۆی ون کا و تاسێک بە سەریدا هات کە خەریک بوو گیانی دەرچێ، بەڵام زۆر ئازایانە بەسەر خۆیدا زاڵ بوو هەتا کارەکانی بە باشی جێبەجێ بێ. شازادە موڵک و خزمەتکار و وشتر و هێستر و گەنجێکی زۆری لە زێڕ و زیو دا بە قەمەروززەمان. بەردەوام پلە و پایەی دەبردە ســـەرێ و ڕێز و حورمەتی زیاتر دەبوو هەتا وای لێ هات کردی بە خەزێنەدار و تەواوی گەنجەکەی بەو ســـپارد و بەردەوام لە خۆیی نیزیک دەکردەوە. فەرماندەکانی تێدەگەیاندن کە ئەو پلەوپایەی لەسـەریە. کاربەدەسـتانی حوکوومەت هەموو ئەویان خۆش دەویسـت و شـــازادەش هەر دەیبردە ســـەرێ و قەمەروزەمانیش نەیدەزانی. قەمەروززەمان ئەوەندەی ماڵ و گەنج درابوویە، ئەویش بە ســـەر خەڵکدا بڵاوی دەکردە و گەورە و چکۆلەی خەڵات دەکرد. قەتیش ئارمانووسپاشـای لە بیر نەدەکرد و لە خزمەتکردنی خافڵ نەبوو. هەتا وای لێ هات جێی لە دڵی ئارمانووسپاشــاشـدا کردەوە. بە گشـتی تەواوی دەربار بە گەورە و چکۆلەوە ئەویان خۆش دەویست. گەورەکان سوێندیان بە سەری دەخوارد. سەرەڕای ئەوە قەمەروززەمان نەیدەزانی ئەو هەموو گرینگیپێدانە هی چییە و لە کوێوەیە. ســەری ســوور مابوو کە پاشـا بۆ ئەوەندەی ڕێز لێ دەگرێ. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'بە خودا لە خۆڕا نییە ئەو پاشـــایە ئاوام لەگەڵ دەجووڵێتەوە! وەک ئەوە دەچێ مەبەســـتێکی خراپی بێ. وا چاکە ڕوخسەتێک بخوازم و لەو شارە بڕۆم.'

"ئیدی قەمەروززەمان شەوێک دوای ئەوەی کاربەدەستانی حوکوومەت بڵاوەیان کرد و دەربار چۆڵ بوو لە دوور کڕنۆشــی برد و بە پاشـــای گوت: 'ئەتۆ زۆرت چاکە لەگەڵ من کردووە و ڕێزت لێ گرتووم و گەورەت کردووم، ئیدی بەســــە. هەمووی هی گەورەیی جەنابتە، دەنا من شـــــایانی ئەوە نیم. ئێســـتاش تکات لێ دەکەم ئەو ماڵەی داوتمێ، لێم وەرگرەوە.' شـــازادە بێدوور بزەیەکی هاتێ و گوتی: ' ئەوە چۆنە ســــەرەڕای ئەوەی کە بەخشش و گەورەیی و خۆشی لە ڕادەبەدەرت دراوەتێ، دیسانیش دەڵێی دەڕۆم و ئامادەی

ڕێگای سەختی سەفەر بگریتە بەر؟!' قەمەروززەمان گوتی: 'پاشام، ئەو جۆرە ڕێزلێنانە ئەگەر مەبەستێکی لەپشت نەبێ، جێی سەرسوورمانە! بە تایبەت ئەو پلەیەی داوتە بە من شیاوی کەسانی گەڕاوە و ژیر و دنیادیتووە، لە کاتێکدا من هێشتا منداڵ و هەرزەکارم.'

"ئیدی شازادە پێی گوت: 'بۆ ئەوەی قسەی دڵت بە تەواوی بکەی، وەرە ژوورەوە لای خۆم.' ئیدی بانگی کردە ژووری خەوگە و لە لای خۆی داینا و کەمێکی گاڵتە لەگەڵ کرد و دەستی بۆ برد و گوتی: 'بۆیە ئەمن هەر پلەوپایەی تۆم دەبردە سەرێ و ڕێزم لێ دەگرتی، لەبەر ئەو جوانی و شەنگی و شەپاڵییەت بوو. ئەمن خۆشم دەوێی و عاشقی ئەو سەر و کاکۆڵ و خاڵ و بەژن و بالایەت بووم. ئەوە بۆت شێت دەبم.' لە قەمەروززەمان وایە کە پاشا پیاوە. ئیدی قەمەروززەمان شەرمی دەکرد و لە ڕادەبەدەر ناڕەحەت بوو گوتی: 'قەت باوەڕم نەدەکرد ڕۆژێک بێ پاشا تا ئەو ڕادەیە بێشەرم بێ. ئێستا من بە ڕاستی هاتووم داوای ڕوخسەت دەکەم و تکایە ڕێم بدە بڕۆم.' ئیدی شازادە بێدوور دای لە قاقای پێکەنین و ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو بەپشتدا بکەوێ. بە قەمەروززەمانی گوت: 'خۆشەویستەکەم، چەندە زوو منت لە بیر چووەوە! ئەو شەوانەت لە بیر چوو کە لە ئامێزی یەکتردا دەخەوتین؟!' ئینجا تاج و ڕووپۆش و جلی پاشایانەی لا دا و خۆی نیشان دا.

"قەمەروززەمان کە زانی ئەوە خێزانییەتی و شازادە بێدووری کچی غەیوورپاشایە، واقی وڕ ما و ڕووبەڕووی ویشک بوو. پاشان هەڕای کردێ و توند بە باوەشییەوە گوشی. ئەویش ئەمی لە ئامێز گرت و تێریان یەکتر ماچ کرد. ئەوجا لە خەوگەی پێکگەیشتنیاندا خەوتن. وەک شاعیر دەڵێ:

خەو ئەمشەو لێرە نەماوە، کۆچی کردووە
هێشتا عاشقان تێر یەکتریان ماچ نەکردووە
جووت مەمکی لۆکەیی لەنێو بسکی لوولیدا
کارگی کەما لە ژێر ڕیحانە دەر کەوتووە
چاوی خراپکاران لە خەودایە دەرفەتە
ڕابە هەتا، تەمەنت بە فیڕۆ نەچووە
شەوانە کە لێو لەسەر لێو و چاو لە چاوییەتی
پەپوولەی عاشق ئارام لە سەر گوڵ نیشتووە

"دوای ئەوە شازادە بێدوور بەسەرهاتی خۆی بۆ قەمەروززەمان گێڕاوە. قەمەروززەمانیش تەواوی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە. کە ڕۆژ بووەوە، شازادە بێدوور کەسێکی ناردە لای ئارمانووسپاشای باوکی حەیاتوننفووس و ئەوی لە ڕاستی

هەموو شـــتێک ئاگادار کردەوە. باســـی چیرۆکی خۆی و قەمەروززەمانی بۆ کرد. هۆی جیابوونەوەکەی بۆ گێڕانەوە. هەروەها باســـی حەیاتوننفووســـی کرد کە هێشـــتا کچە و دەستی لێ نەدراوە. کاتێک ئارمانووسپاشا بەسەرهاتی شازادە بێدووری بیست، واقی وڕ ما و فەرمووی کە بە ئاوی زێڕ بینووســـنەوە. ئیدی ئارمانووسپاشـــا ڕووی لە قەمەروززەمان کرد و گوتی: 'پاشـــازادە، ئەگەر حەز دەکەی ببی بە زاوای من، ئەوە حەیاتوننفووســـی کچی خۆمت لێ مارە دەکەم.' قەمەروززەمان گوتی: 'پێویســـتە لەگەڵ شازادە بێدوور ڕاوێژێک بکەم.' قەمەروززەمان شتەکەی لەگەڵ شازادە بێدوور هێنا گۆڕێ، شـــازادە گوتی: 'زۆر باشـــە، بیرێکی چاکە. ئەتۆ زەماوەندی لەگەڵ بکە و ئەمنیش دەبمە کەنیزی، چونکە زۆری چاکە بۆ من بووە. بە تایبەت باوکی کە ئێمەی نوقمی چاکە و گەورەیی خۆی کردووە.' کاتێک قەمەروززەمان زانی کە شازادە بەو کارە ڕازییە و ئیرەیی بە حەیاتوننفووس نابا و لەگەڵی یەک دەنگە ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان و شازادە بێدوور لەسەر ئەوە کۆک بوون کە حەیاتوننفووسیش بێتە ژیانیانەوە. قەمەروززەمان ئەو قسەیەی کە شازادە بێدوور کردبووی، بۆ ئارمانووس‌پاشای گێڕاوە و گوتی: 'شازادە پێی خۆشە و دەڵێ ئەمن دەبمە کەنیزی حەیاتوننفووس.' کە پاشا ئەوەی بیست، زۆر خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە هاتە دەرێ و لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت و فەرماندە و وەزیر و پەردەدار و کاربەدەستانی حوکوومەتی کۆ کردنەوە. بەسەرهاتی قەمەروززەمان و شازادە بێدووری لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕانەوە و ئەوانیشی تێگەیاند بە تەمایە کچەکەی خۆی لە قەمەروززەمان مارە بکا و ئەو لە جێی خۆی بخاتە سەرتەختی دەسەڵات. ئەوان کە هەموویان قەمەروززەمانیان خوش دەویست، بەو کارە ڕازی بوون و بەڵێنیان دا کە خزمەتگوزاری قەمەروززەمان بن. ئارمانووس‌پاشا کەیفی ساز بوو. قازی و شایەد و هێندێک لە گەورە گەورەکانی دەرباری بانگ کردن و حەیاتوننفووسیان لە قەمەروززەمان مارە کرد. ئیدی پاشا خوانی ڕاخست و خەڵکێکی زۆری نان دا. خەڵاتی و دیاری بە دەوروبەریانی دا و یارمەتی و چاکەیەکی زۆری لەگەڵ هەژاراندا کرد. بەندییەکانی لە بەندیخانەکان ئازاد کردن. دوای ئەوە قەمەروززەمان لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. لارێیی و سەرەڕۆیی نەهێشت و ماڵ و سامانێکی زۆری بە مسکێن و سەربازەکانی دا. لەگەڵ ژنەکانی لە عەیش و نۆش و ڕابواردندا بوو. هەر شەوەی دەچووە لای یەکیان. هەتا ماوەیەکی زۆر ئاوا بوو. خەم و خەفەتی لە بیر نەما و شەهرمان‌پاشای بابی بە تەواوی لە بیر چووبووەوە. هەر باسیشی نەدەکرد.

"وای لێ هات خودای میری مەزن لە دوو ژنەکەی دوو منداڵی نێرینەی دایە. وەک دوو ئەستێرە دەدرەوشانەوە. شێوەی مانگ و خۆریان دەدا. گەورەکەیان لە شاژن بێدوور و ئەمجەد بوو. چکۆلەکەیان لە شاژن حەیاتوننفووس بوو ناوی ئەسعەد بوو. ئەسعەد لە ئەمجەدی برای خڕوخۆڵ و جوانتر بوو. ئەو کوڕانەیان بە خووخدەیەکی گەورانە و شاییبەخۆیانەوە گەورە کرد. فێری خەت و زانست و گەورەیی و ئەسپسوارییان کردن. ڕۆژ گەلەڵ ڕۆژیش جوانتر دەبوون. بە جۆرێک کە لە جوانی و چاکیدا تایان نەبوو. لە تەواوی شاردا دەنگیان دابووەوە و ژن و پیاو لە دیداریان تێر نەدەبوون. هەتا وای لێ هات تەمەنیان گەیشتە هەڤدەساڵ. هەمیشە پێکەوە بوون. خەو و خواردنیانیشیان هەر پێکەوە بوو. قەت لێک هەڵنەدەبڕان. تا ڕادەیەک خەڵک ئێرەییان پێ دەبردن.

"کاتێک بوونە پیاوێکی ڕێکوپێک، بابیان کە دەچووە سەفەر، وڵاتی بەوان دەسپارد.

هەتا هەر ڕۆژەی یەکیان دەســەڵاتی بە دەســت بێ و بەســەر خەڵکدا حوکومەت بکەن. ڕێکەوت وا بوو کە شاژن بێدوور عاشقی ئەسعەدی کوڕی شاژن حەیاتوننفووس و شاژن حەیاتوننفووسیش عاشقی ئەمجەدی کوڕی شاژن بێدوور بوو. هەر بۆیە هەر کام لەو دوو ژنە لەگەڵ کوڕی هەوێکەی خۆیدا شــۆخی و دەســـتبازی دەکرد و ئاوێزانی دەبوون. کاتێکیش کە دایکی یەکیان ئاوای دەدیت، وای دەزانی کە ئەوە هەر سـۆز و خۆشـەویسـتی دایکانەیە و وەک کوڕی خۆی چاو لێ دەکا. هەر ئاوا وردەوردە ئەوین بەســـەریاندا زاڵ بوو، تەواو هۆگری ئەو کوڕانە بوون. وای لێ هات نەیاندەتوانی لێیان جودا بنەوە. ئەوین و خۆشـەویسـتییەکەیان هەر هات و زیاتر دەبوو. مەمنا نەشـیاندەتوانی پێک بگەن، ناچار هەر لە هەناوی خۆیاندا پیشـــیان دەخواردەوە. تا ئەو جێیەی خەو و خواردنیان لێ بڕا. ڕۆژێک پاشـــا چوو بۆ ڕاو و شـــکار و کوڕەکانی لە جێی خۆی دانان و پێی گوتن: 'هەر ڕۆژەی یەکیان بە نۆرە وڵات بەڕێوە بەرێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و هەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، پاشـــا چوو بۆ ڕاو و بە کوڕەکانی گوت هەر وەک جاران هەر ڕۆژەی یەکیان وڵات بەڕێوە بەرێ. ڕۆژی یەکەم شـازادە ئەمجەدی کوڕی شـاژن بێدوور لە جێی باوکی لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. خەریک بوو فەرمانی دەدا ئەوەی بکەن و ئەوەی مەکەن و فلانی بچێتە سـەر فلانە کار و ئاوا و ئاوا. شـاژن حەیاتوننفووس، دایکی شازادە ئەسعەد، ویستی نامەیەکی بۆ بنووسێ و خۆی بە قوربان و سەدەقەی بکا و پێشی بڵێ کە شـــەیدا و ئەویندارێتی و دەیهەوێ ئاوێتەی بێ. ئیدی کاغەزێکی هەڵگرت و ئەوەی لەسـەر نووسـی: 'ئەوە نووسـراوەیەکە لە عاشـقێکی دڵبریندارى دەردەدارى دڵ بە خەم کە ئەوینی تۆ بڕسـتی لێ بڕیوە و ژیانی لە پێناو خۆشـەویسـتی تۆدا داناوە. شـەو و ڕۆژ حەجمینی نییە. ئەگەر بێتو باسـی ئەو شـەوە دوور و درێژانە بکەم کە لە دووری و گڕی خۆشەویستی تۆدا سووتاوم و تا بەیان لە تاو ئەوینی تۆ ناڵاندوومە، ئەوە نامەکەم ئەوەندە دوور و درێژ دەبێتەوە کە نە کاغەز هەڵگری چیرۆکێکی ئاوایە و نە قەڵەم توانای هەڵگرتنی ئەو ئەرکە قورسـەی هەیە و دەتوانی دەوام بێنێ[1]. هەر بۆیە لەوپەڕی کورتیـدا ئەو نووسراوەیەم نووسی هەتا پێت بڵێم خۆشەویستەکەم ئەرز و ئاسمانم پێ تەنگە و جگە لە گەیشتن بە تۆ هیچ خۆزگە و ئاواتێکی دیکەم نییە. لە دووریی تۆدا مردن بە ئاوات دەخوازم و لێم ڕوونە ئەگەر بە تۆ نەگەم، دەمرم. ئێسـتاش ئارەزووی گەیشـتن بە تۆ وەک خۆرە کەوتووەتە گیانم و لێم بووەتە دەردێک کە دەرمانەکەم هەر تۆی و جگە لە گەیشـتن بە تۆ بە هیچ شـتێک ئاگری ئەو ئازارە دانامرکێ.' دوای نووسـینی ئەوانە ئەو دوو بەیتە شێعرەشی نووسی:

ئەوەی دەردێکـی هەبێ و نەتوانێ بیدرکێنێ  
خەو ناچێتە چاویەوە و شەو تا ڕۆژ دەناڵێنێ  
گوێ ڕادێرە لە دەردی دڵی بەکوڵم دەنا  
فایدەی چی هەر با بێت و لە بەر گوێت بناڵێنی؟!

"ئینجا شـاژن حەیاتوننفووس قوماشـێکی ئاوریشـمینی گرانبایی لە نامەکەوە پێچا و میسـک و عەنبەری لێ دا، یەک-دوو تاڵی لە کەزییەی کە هەر تاڵێکی جیهانێکی تێک بەر دەدا، لەنێو قوماشـەکە خسـت و پێچایەوە و دای بە خزمەتکارەکەی و پێی گوت: 'ئەو نووسراوەیەم بۆ بگەیەنە دەست شازادە ئەمجەد.' "

---

[1]. دەوام هێنان: خۆڕاگری و تاقەت هێنان.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، حەیاتوننفووس نامەکەی دا بە خزمەتکارەکەی تا بیبا بیدا بە شازادە ئەمجەد. خزمەتکـارەکە وەرێ کەوت ،بەڵام نەیـدەزانی قەدەر بەرەو کوێی دەبـا. کە خزمەتکارەکە چووە لای شـــازادە، کڕنۆشـــی برد و پرێســـکەکەی دایە و کارەکەی خۆی جێبەجێ کرد. شـــازادە ئەمجەد پرێســـکەکەی لە خزمەتکارەکە وەرگرت و کردییەوە و نووسـراوەکەی دەرهێنا و خوێندییەوە. کە خوێندییەوە، تێگەیشـت باوەژنی خەریکە ناپاکی لە باوکی دەکا و کردوویەتی. ئیدی توورە بوو ڕقی لەو کارەی ژنان هەســـتا و گوتی: 'لەعنەتی خودا لە ژنانی ناپاک بێ کە لە عەقڵ و دیندا کەمیان هەیە.' دوای ئەوە هەڵیکێشـا شـیر و ڕووی لە کۆیلە ڕەشـە کرد و گوتی: 'ڕەشـی گلاو ئەو نامە پڕ لە شـتی پڕوپووچە چییە هێناوتە؟ ڕووڕەشـــی ناحەز، بە خودا ئەمن هیچ خێرێک لە بوونی تۆدا نابینم.' ئیدی شـیرێکی لێ ڕاکێشـا و سـەری پەڕاند، ئینجا نامەکەی لە پەڕۆ و شـتەکەی خستەوە و لە گیرفانی ناوە. پاشـان گەڕاوە لای دایکی خۆی و شـتەکەی بۆ گێڕاوە و جنێوی بە دایکی خۆشـی دا و گوتی: 'ئێوە ژنان یەک لە یەک گلاوترن. بە خودا ئەگەر لەبەر بابم و شـازادە ئەسعەدی برام نەبایە هەر ئێستا دەچووم سەری ئەو قەحبەی گلاوەشم وەک کۆیلەکەی لە لەشـــی جوێ دەکردەوە.' ئینجا شـــازادە ئەمجەد بەوپەڕی توورەییەوە لە لای دایکی هاتە دەرێ. بەڵام حەیاتوننفووس بیستییەوە کە شازادە ئەمجەد چی لە خزمەتکارەکەی کردووە، زۆری پێ ناخۆش بوو خەمی خزمەتکارکەی بوو. قســـەی پێ گوت و لە دڵە خۆیدا گوتی: 'بەڵێن بێ وای ناخۆی.[١]'

"شازادە ئەمجەدیش ئەو شەوە ئەوەندە توورە و ناڕەحەت بوو کە هەتا بەیان لە داخان خەو و خۆراکی نەبوو. کە ڕۆژ بووەوە، شازادە ئەسعەد هەستا چووە دەرێ و لە جێگاکەی بابی لەسـەر تەختی دەسـەڵات دانیشت. هەتا ئێوارە هەر خەریکی فەرماندان و چاودێری و لێپێچینەوەی کارەکان بوو.

"دایکی شـــازادە ئەمجەدیش پیرێژنێکی پیتۆڵی لێزان و چازانی جادووگەری بانگ کرد. ئەوەی لە دڵیدا بوو بۆی هەڵڕشـت، ئینجا کاغەزێکی هێنا بۆ ئەوەی نامەیەکی بۆ بنووسـێ. هەتا ئەو لە هاوار و ســکاڵای دڵی ئاگادار کاتەوە. ئیدی ئەو وشـــانەی بۆ نووســـی: 'ئەو نامەیە لە لایەن کەسـێکەوەیە کە حەز و تامەزرۆیی خەریکە دەیکوژێ، بۆ کەسـێک کە لە بیچمی چـاکترین و جوانترین و ڕێـکوپێکترین مرۆڤەکـانـدایە و لەبەر جوانی لە خۆی دەرچووە. خۆی دەبوێرێ لەو کەســـەی کە شـــەیدا و عەوداڵێتی و هەرکەس لە بەری

---

١. وای ناخۆی: واتە هەر وا بە ئاسانی بە سەرتەوە ناچم.

بپاڕێتەوە و خۆی بە قوربان و سەدەقەی بکا، ئەو بە هێندی ناگرێ. ئەو مانگڕوخسارە شازادە ئەسعەدی زوهرەتەوێڵ و ڕووگەش و کاکوڵڕەش و باڵاسەلوە. کە من لە سوێیانی جەرگ و دڵم برژاوە و هەناوم کولاوە. ئەوەندە بزانە کە ئیدی برستم نەماوە. سەرم سووڕ ماوە کە بۆچی وام؟! دایمە دڵتەنگ و لێوبەبارم، خەو و خواردنم نەماوە و ئارامم لێ براوە. نەخۆشی ڕووی تێ کردووم. گیانی خۆم بە قوربانت دەکەم و لە خودا دەپاڕێمەوە کە تۆ بپارێزێ و لە شەڕ و فیتنەت بە دوور کا.' دوایە ئەو چەند بەیتە شێعرەشی نووسی:

بەختی ئاوێنەشم نەبوو تۆ تێم بڕوانی
یا خۆڵی سەر ڕێگەکەت بم، پێم لەسەر دانێی
ئەوندە عاشقی ڕووت بووم خۆم دۆڕاندووە
ئەونە لە بیری خۆتدای، منت لە بیر چووە
دڵڕەقیش حەددێکی هەیە، ئاوڕێک بەرەوە
ئەو دڵ و لەشە ناسکەم ئارام کەرەوە
دڵم لە تاوت ئاورێکە دایم دەگرێ
دووریت قەلێکی بێ فەڕە و دایم دەقرێ
بەرگەی دووری تۆ ناگرم سەبرم نەماوە
عەشقت برستی لێ بڕیم، هێزم نەماوە

"دوای ئەوە شاژن بێدوور نامەکەی بە میسکی ئەزفەر بۆنخۆش کرد و بە تاڵی بسکی خۆی بەستی و دای بە پیرێژنەکە، پێی گوت: 'بیبە بۆ شازادە ئەسعەد.' ئیدی پیرێژن دەموەدەست چوو بۆ لای شازادە ئەسعەد. ئەو بە تەنێ دانیشتبوو. پیرێژنەکە نامەکەی دایە و ماوەیەک چاوەڕوانی وەڵامەکەی بوو. پاشا نووسراوەکەی خوێندەوە و لە مەبەستەکەی گەیشت. ئینجا نامەکەی بە تاڵە بسکەکە بەستەوە و زۆر تووڕە بوو. قسەی بە ژنانی خەیانەتکار گوت. ئەو جار هەستا و پیرێژنەی کوشت. بە دەم فکرەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە لای حەیاتوننفووس. سەیری کرد ئەوە دایکی نەخۆشە و لە جێدا کەوتووە. هۆی نەخۆشییەکەشی ئەو ڕووداوە بوو کە لە لایەن شازادە ئەمجەدەوە بەسەر خزمەتکارەکەیدا هاتبوو.

"شازادە ئەسعەد قسە و جنێوی سووکی بە دایکی دا و دۆعای لێ کرد. ئینجا وەدەر کەوت و چووە لای شازادە ئەمجەدی برای و تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە کە لەنێوان ئەو و شاژن بێدووری دایکی ئەمجەد دا ڕووی دابوو. پێشی گوت کە پیرێژنەکەشی کوشتووە. گوتیشی کە بە خودا ئەگەر لەبەر دڵی تۆ نەبایە هەر ئێستا دەچووم دایکیشتم دەکوشت.

"دوایە شازادە ئەمجەد گوتی: 'براکەم، دوێنێ کە من لەسەر تەخت بووم، ئەو ڕووداوەم بۆ هاتە پێشـێ کە بەسـەر تۆ هاتووە. دایکت نامەیەکی بۆ نووسـیبووم. براکەم، بە خودا منیش ئەگەر لەبەر تۆ نەبووایە ئەو پەندەی بەسەر کۆیلەکەییم هێنا، بەسەر ئەویشم دێنا.'

"ئەو دوو برایە ئەو شـەوە هەتا بەیانی پێکەوە بوون و قسـەیان بە ژنان دەگوت و شتیان دەگێڕاوە. وا بوو پێکەوە بڕیاریان دا کە شتەکە بشارنەوە و بێدەنگی لێ بکەن نەکا قەمەروززەمانی بابیان بزانێ و هەردووکیان بکوژێ. ئەو شـەوە زۆر ناڕەحەت بوون. کە ڕۆژ بووەوە، قەمەروززەمان لە ڕاو گەڕاوە، فەرماندە و کاربەدەسـتانی حوکومەت کە لەگەڵ قەمەروززەمـان چووبوون، چوونەوە بۆ مـاڵی خۆیـان و قەمەروززەمـان چووەوە کۆشـکەکەی خۆی. سـەیری کرد هەر دوو ژنەکەی لە جێدا کەوتوون. بێئاگا لەوەی ئەو دووانە ڕێک کەوتوون، لەبەر ئەوەی ئابڕوو و مانیان لە مەترسـی دایە، نەخشـەیەک دانێن بۆ ئەوەی ئەو دوو نەونەمامە بە دەسـتی پاشـا بە کوشـت بدەن. کە پاشـا ئەوانی لەو حاڵەتەدا دیت، لێی پرسـین: 'ئەوە چ بووە؟' ئیدی ئەوان لەڕێوە هەسـتان و خۆیان بەسـەر قاچی پاشادا دا و دەست و لاقیان ماچ کرد. شتەکەیان بە پێچەوانەوە بۆ گێڕاوە و گوتیان: 'پاشا، ئەو دوو کوڕە کە نان و ئاوی تۆ دەخۆن، خەیانەتیان بە نامووسی تۆ کردووە و بە چاوی تەماعەوە سەیری ژنەکانی تۆ دەکەن و ئابڕوویان بردی.' قەمەروززەمان کە ئەوەی لە ژنەکانی بیسـت، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. ئاور لە چاوی سـەری دەکرد. ئەوەندە تووڕە بوو گوتی: 'بۆم بگێڕنەوە چی بووە.'

شـاژن بێدوور گوتی: 'گەورەم، با ئەتۆش بزانی کە شـازادە ئەسـعەدی کوڕت لە مێژە نامە و شـتم بۆ دەنووسـێ و پێم دەڵێ. منیش هەر دەنگی دەدەم و جوابی دەکەم. کە چی دەستی هەڵنەدەگرت و گوێڕایەڵم نەدەبوو. کە تۆ چووی بۆ ڕاو شازادە ئەسعەد سەرخۆش بوو پەلاماری دامێ، شیرێکی بە دەستەوە بوو خزمەتکارەکەمی کوشت و منیش ترسام. لە ترسی ئەوەی منیش بکوژێ، دەستم نەکردەوە و ئەویش بە زۆر کاری خۆی لەگەڵ کردم. ئەگەر تۆ تۆڵەی من لەو نەکەیەوە، ئەمن خۆم دەکوژم، چونکە دوای ئەو ئـابڕووچوونە ئەمن ناتوانم بژیم.' حەیاتوننفووسـیش ڕاسـت هەر ئەو قسـەیەی کرد کە شـاژن بێدوور کردبووی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، حەیاتونئفووسیش ڕێک ئەوەی بۆ قەمەروززەمانی مێردی گێڕاوە کە شاژن بێدوور بۆی گێڕابووەوە. گوتی: 'بەسەرهاتی منیش لەگەڵ شازادە ئەمجەد وەک بەسەرهاتی شاژن بێدوورە.' ئەوەی گوت و دەستی کرد بە گریان و بە قەمەروززەمانی گوت: 'ئەگەر تۆڵەی من نەکەیەوە، ئەوە ناچارم بۆ ئاڕمانووسپاشای باوکمی بگێڕمەوە.' ئیدی ئەو دوو ژنە لەکن قەمەروززەمان دەستیان کرد بە شین و گریان و کرووزانەوە. قەمەروززەمان کە ئەو شین و گریانەی ئەوانی دیت، باوەڕی پێ کردن و لە ڕادەبەدەر تووڕە بوو. ئیدی بە مەبەستی کوشتنی کوڕەکانی دەستی دا شیر.

"لەو جەنگەیەدا باوکی حەیاتونئفووس بۆ دیتنی قەمەروززەمان هاتەماڵێ. سەیری کرد ئەوە قەمەروززەمان شیری ڕووتی بە دەستەوەیە و ئاوری لە چاوانی دەپڕژێ و ئەوەندە تووڕەیە کەس ناناسێ. ئاڕمانووسپاشا سڵاو و چاکوخۆشی لەگەڵ کرد، کەمێک ئارام بووە و پرسیاری لێ کرد: 'ئەوە چ بووە؟' قەمەروززەمانیش ئەوەی لە بارەی شازادە ئەمجەد و شازادە ئەسعەدەوە لە ژنەکانی بیستبوو هەمووی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'ئێستا ئەوە بە تەمام بچم بە جۆرێکی وا بیانکوژم هەتا ببێتە پەند بۆ هەموو دنیا.' ئاڕمانووسپاشا ڕقی لەو دوو منداڵە هەستا و بە قەمەروززەمانی گوت: 'ڕۆڵە گیان، کارێکی باش دەکەی کە بە تەمای بێژوو و ناپاکی ئاوا بکوژی، چونکە ئەوان شیاوی ئەو ژیانە نین. بەڵام ڕۆڵە، پێشینیان گوتوویانە: 'کەسێک ئاکام و دواڕۆژی کارەکانی لە بەرچاو نەگرێ، دنیا بە کامی ئەو نابێ.' ئەوان هەرچی بێ منداڵ و جگەر گۆشەی تۆن. باش نییە بە دەستی خۆت بیانکوژی، دەترسم پەشیمان بیەوە و تازە پەشیمانیش سوودی نییە. بەڵام یەکێک لە پیاوەکانت بنێرە لە بێروونێکدا بیانکوژێ با لە بەرچاوی تۆ نەبێ.'

"کاتێک قەمەروززەمان ئەو قسەیەی بیست، لای بیرێکی باش بوو شیرەکەی لە کالانەکەی ڕاکردەوە و چووەوە لەسەر تەختەکەی دانیشت. خەزێنەدارەکەی خۆی کە پیاوێکی بە تەمەنی دنیادیتوو و کارزان بوو بانگ کرد و پێی گوت: 'قۆڵی ئەمجەد و ئەسعەدی کوڕم توند ببەستە. یەکی بیانخە یەخدانێکەوە و لەسەر هێسترێکیان دانێ. بیانبە لە دەشتێکی دوور بیانکوژە و دوو شووشە لە خوێنەکەشیانم بۆ بێنەوە، بەڵام کەمێک پەلە بکە و وە درەنگی مەخە.' خەزێنەدار گوتی: 'بەسەر چاو هەر ئێستا'

"خەزێنەدار هەستا بە پەلە چووە دەرێ کە بچێ بۆ لای ئەمجەد و ئەسعەد. لە ڕێگا تووشیان بوو. جلوبەرگێکی شکۆداریان لە بەر کردبوو. لە کۆشک هاتبوونە دەرێ بچن بۆ لای باوکیان و بەخێرهاتنەوەی بکەن. کە خەزێنەدار ئەوانی دیت، گوتی: 'هەر وەک

بوخۆتان دەزانن، من کۆیلەیەکم و باوکتان دەستووری پێ داوم، ئایا ئێوە بە گوێی فەرمانی باوکتان دەکەن یان نا؟' گوتیان: 'بەڵێ، ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەوین.'

"خەزێنەدار خێرا چووە بەرەوە و قوڵبەستی کردن و خستنییە یەخدانێکەوە. یەخدانەکانی لەسەر هێستر دانا و لە شار بردنییە دەرێ و هەتا نیوەڕۆ بێ پشوودان ڕۆیشت. تا لە دەشتێکی وشک و بێئاو ڕاوەستا و یەخدانەکانی لە هێسترەکە داگرت و شازادە ئەمجەد و شازادە ئەسعەدی هێنا دەرێ. کە چاوی بەو هەموو جوانی و قۆزییەیان کەوت، دەستی کرد بە گریان و زۆر بە کوڵ گریا! دوای ئەوە شیری هەڵکێشا و پێی گوتن: 'پاشازادەکان، بە خودا لە بەرم گرانە کە ئەو کارەتان لەگەڵ بکەم و بتانکوژم، بەڵام چ بکەم من ڕاسپێردراوم. قەمەروززەمانی باوکتان فەرمانی پێ کردووم کە ئەمن ئێوە بکوژم.' ئیدی ئەوان گوتیان: 'ئەمیر چییان پێ گوتووی بیکە. خودا ڕەزای لەسەر ئەوە بووە و گەردنت خۆش و ئازاد بێ.'

"دوای ئەوە ئەو دوو برایە یەکتریان لە ئامێز گرت و ماڵاوییان لە یەکتر کرد. ئەسعەد بە خەزێنەداری گوت: 'ئەمیر بیکە بۆ خاتری خودا با ئەو داخەم نەکەوێتە سەر دڵ و مەرگی براکەم نەبینم. لە پێشدا من بکوژە.' ئەمجەدیش هەر ئەوەی بە خەزێنەدار گوت کە ئەسعەد گوتی. خەزێنەداری هاندا کە لەپێشدا خۆی بکوژێ و دوایی ئەسعەد. دەیگوت: 'براکەم لە من منداڵترە و با ئەمن مەرگی ئەو نەبینم، تاقەتی ئەوەم نییە.' ئیدی بە کوڵ دەستی کرد بە گریان بە جۆرێک کە خەزێنەداریش لەگەڵ ئەو دەستی کرد بە گریان. ئیجا هەردوو براکە دەستیان کرد بە گریان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، هەردوو براکە دەستیان کرد بە گریان و یەکتریان لە ئامێز گرت و مالاواییان لێکدی کرد. بە خۆیان گوت ئەو هەموو ڕۆژڕەشی و چارەڕەشییە لەژێر سەری مەکر و فێڵی ئەو خەیانەتکارانەدا بوو. ئەوەش پاداشی ئەو چاکانە بوو کە من لەگەڵ دایکی تۆ و تۆش لەگەڵ دایکی منت کرد.

"ئەوجا ئەسعەد دەستی لە ملی براکەی کرد و یەکبەخۆی گریا و ئەو دوو بەیتە شێعرەی گوت:

چاکە ئەفسانەیەک بوو وەک سیمورغ باوی نەما
گفت و بەڵێن دەڵێن هەیە و هەر قسەیە وەک کیمیا
خەیانەت دڵسۆزییە، گێژێتی زیرەکییە
دژمنی دۆستایەتی و جەور و ستەم دۆستییە

"ئەمجەدیش کە گریانی براکەی دیت، گریا و براکەی بە خۆیەوە گوشی و ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئەو کارە چ بوو کردی لەگەڵمان
چەرخی چەپگەردی دوژمنی ئینسان
وا بە قینە زەوی چی لێ دەوێین[1]؟
ڕەنگە لای وا بێ ئەستێرەی زوهرەین

"دوای ئەوە شازادە ئەمجەد لە بەر خەزێنەدار پاڕاوە کە لەپێشدا من بکوژە با ئاور نەگرم. شازادە ئەسعەدیش گریا و گوتی: 'لەپێشدا دەبێ من بکوژرێم.'

شازادە ئەمجەد گوتی: 'ئەگەر هەر وایە، ئەمن دەڵێم باوەش بە یەکدا دەگرین با شیرەکە یەک کەڕەت هەردووکمان بەیەکەوە بکوژێ.' ئیدی هەردووکیان یەکتریان لە باوەش گرت و درێژ بوون. خەزێنەدار هەردووکیانی بە گوریسێک بە یەکەوە بەستەوە و لەو کاتەدا دەشگریا. ئەو جار شیری هەڵکێشا و گوتی: 'گەورەکانم! بە خودا کوشتنی ئێوە بەلامەوە زۆر گرانە، بەڵام چ بکەم؟! ئێستا ئەگەر کارێک، وەسیەتێک، شتێکتان هەیە پێم بڵێن بۆتان جێبەجێ دەکەم.'

---

١. چی لێ دەوێین: چی لێمان دەوێ.

"ئەمجەد گوتی: 'ئەمن هیچ وەسیەتێکم نییە، بەڵام تکات لێ دەکەم ئەمن هەستێنە سەرەوە با ئەسعەد لەبنەوە بێ هەتا شیرەکە لەپێشدا وە من کەوێ و دوایە لە براکەم دری. کاتێکیش کە لە کوشتنی ئێمە بوویەوە و چوویەوە لای پاشا قەمەروززەمان، لێت دەپرسێ چیان گوت؟ پێی بڵێ کە کوڕەکانت سڵاویان لێ دەکردی و دەیانگوت کە ئەتۆ ئێمەت کوشت هەرچەندە نەتدەزانی کە تاوانبارین یان نا- بێ ئەوەی تاوانبار و بێتاوانت لێ زوون بێتەوە ئێمەت کوشت. بێ ئەوەی گوێمان لێ بگری. دوایە ئەو شیعرەشی بۆ بخوێنەوە:

لغاوی ئەقڵ بە دەست هەوەس بێ
ژن ئیدی بۆچی ژێردەستە دەبێ؟
دەبێتە ژن و ژێردەستەیی ژن
ئەو خوێڕیانەی وا لە ژن دەترسن
بە گوێیدا ناچێ پیاوی مردووی ژن
هەتاکو دەمرن ڕاستی نابیستن

"ئەمجەد گوتی: 'ئیدی ئێمە هیچی دیکەمان لە تۆ ناوێ، بەس ئەو شیعری بۆ بخوێنەوە.'"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی دووسەد بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە ئەمجەد بە خەزێنەداری گوت: 'ئێمە هیچی دیکەمان لە تۆ ناوێ، بەس ئەو شێعری بۆ بخوێنەوە. تۆ خودا کەمێکی دیکەمان مۆڵەت بدە با ئەو دوو بەیتەش بۆ براکەم بخوێنمەوە.' ئەوەی گوت و گریان و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

ئێمە ئەو ڕێگەیەمان هەر ها لە بەر
فەرق ناکا لەمسەرەوە یان لەو سەر
گوێی مەدەیە، پاش من و تۆش هەر ئاوا
لە بیر دەکرێ و پێشێل دەبێ حەقی وا

"کە خەزێنەدار ئەو قسەی لە ئەمجەد بیست، دەستی کرد بە گریانێکی سەیر. ئەوەندە گریا فرمێسک لە چەنەی دەتکا. شازادە ئەسعەدیش کە ڕۆندک بەسەر گۆنایدا دەهاتە خوارێ، ئەو دوو بەیتەی گوت:

ڕۆژگار، چ ڕۆژگارێکی بێبەزە و گلاوی!
وەکوو بازاڕی خورگە ئاڵۆز و شێواوی
ئەو کەسە دەسکورتر دەبێ تۆ دەستی بگری
ئەو کەسە سەرەوخوار دەبێ تۆ بخەی سەری

"دوای ئەوە هەر وا کە ئەسرینی دەباراند، ئەو شێعرەشی گوت:

پارێز، پارێز بکە ئەی بێخەبەر لەو ترساوایە
ڕابکە، ڕابکە لە دەستی ئەو خەڵکە دێوئاسایە
سەیرە وا دڵتەنگ نابن و تێک ناچن حاڵتان ئازیزان
لە بۆگەنیوی ئەو زەلکاوە و بۆگەنی ئەو هەوایە!
ئێستا ڕۆژی چەکچەکیلە و بازاڕی بێحەیاییە
نەماوە ڕۆژی ڕۆژی ڕوون، چون ئەوەتان لا ڕەوایە

"دوای ئەوە دیسان دەنگی هەڵێنا و بە گریانەوە ئەو چەند بەیتەشی گوت:

کەلاکی دونیا لەوێ کەوتووە
چەقەڵ و داڵاش دەوریان گرتووە

ئەمـــیـــان بە قەپـــاڵ، ئەویـــان بە دنـــدووک
هـــیـــچـــیـــان بـــۆ ژیـــان پـــێ نەهـــێشـــــــتووە
ئەویـــان بە کەڵـــپـــی بەشـــــــێـــک دەیـــپـــچـــڕێ
ئەمـــیـــان چـــنـــگـــاڵـــی لـــێ گـــیـــر کـــردووە
ڕۆژێ دەبـــیـــنـــی هـــیـــچـــیـــان نـــامـــێـــنـــن
کـــــــــــــــــــــــەلاکن لەوێ حەیران دەخوێنن

"کاتێک ئەســـعەد شـــێعرەکەی تەواو کرد. لەگەڵ براکەی وەهایان یەکتر لە ئامێز گرت، دەتگوت هەر لە ئەزەلەوە بە یەکەوە نووســـــاون و قەت لێک نەبوونەتەوە. خەزێنەدار شـــیرەکەی لە کالان دەرهێنا و هەڵیهێناوە ویســـتی لێیان دا. لەو جەنگەیەدا ئەســـپەکەی خەزێنەدار ســـڵەمییەوە و بەرەو دەشـــت هەڵات. ئەســـپەکەی بایی هەزار دینار بوو زینێکی ڕازاوەی لەسەر بوو. ئیدی شیرەکەی دانا و کەوتە دوای."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، خەزێنەدار کەوتە دوای ئەسـپەکەی و هەڵات تا بیگرێتەوە. وا بوو ئەسپەکە چووە نێو قامیشەڵانێکەوە. خەزێنەدار بەدوایدا چووە قامیشەڵانەکەوە. ئەسپەکەی لە نێوەڕاستی قامیشەڵانەکە ڕاوەستا و سمی لە زەوی دەکوتا و سمکۆڵی دەکرد. هەڵدەستا سـەر پاشـووان و دەیحیلاند و چنگی لە ئاسـمان دەدا. لەو قامیشـەڵانەدا شـێرێکی زل و ناحەزی تێدا بوو کە ئاوری لە چاویدا دابیسا. لەبەر زەبەلاحیان خەڵک لێی تۆقیبوون.

"لە ناکاو شـێرەکە بۆی هات و خەزێنەدار هیچی پێ نەکرا و نەیزانی ڕوو لەکوێ بکا. هیچ پەنایەک نەبوو ڕووی تێ بکا. شیریشی پێ نەبوو. گوتی: 'سوبحانەڵڵا، ئەوە هەر ئاهی ئەمجەد و ئەسعەدە ــ ئەو کارە هەر لە سەرەتاوە فەڕی نەبوو.' با جارێ خەزێنەدار لەگەڵ ئەو شێرە بێ.

"ئەمجەد و ئەسعەدیش گەرما تەوژمی بۆ هێنان و لێویان وشک هەڵگەڕا. تینوویان بوو. لە تاوان جەرگیان برژا و دەیانلاڵاند و هاواریان دەکرد و دەپاڕانەوە. بەڵام کەس نەبوو بە هانایانەوە بێ. دەیان گوت: 'خۆزگە کوژرابایین و ڕزگارمان بووبا. ئەو ئەسـپە هەڵات بۆ کام لا وا خەزێنەدار کەوتە شـوێنی؟! خۆزگە خەزێنەدار دەگەڕاوە و دەیکوشـتین؛ مردن زۆر لەو ئازارانە خۆشترە.'

"شـازادە ئەسـعەد گوتی: 'براکەم، خۆڕاگر بە. بەو زووانە خودا بە هانامانەوە دێ. هەڵاتنی ئەو ئەسـپەش ئەمن هەر بە ویسـتی خودای دەزانم. ئێسـتا خۆ تۆزە تینووبوونێک شتێک نییە.'

"ئەسعەد کەمێکی خۆ بەولاولادا بادا و گوریسەکە لە باسکی داماڵا. ئیدی خێرا دەستی دەرهێنا و دەستی ئەمجەدی براشی کردەوە. شمشیری خەزێنەداری هەڵگرت و بە براکەی گوت: 'بە خودا لێرە ناڕۆم هەتا نەزانم خەزێنەدار چی بەسەر هاتووە.'

"هەردوو براکە بە لەز کەوتنە پێوشـوێنی خەزێنەدار هەتا گەیشـتنە قامیشـەڵانەکە. وا بوو هەردووکیان بە یەکەوە گوتیان کە ئەسـپەکە و خەزێنەدار لەو دارسـتانە نەچوونەتە دەرێ. ئەسـعەد بە براکەی گوت: 'لێرە ڕاوەسـتە با من سـەرێکی قامیشـەڵانەکە بدەم و چاوێک بگێڕم.' شـازادە ئەمجەد گوتی: 'ناهێڵم بە تەنیا بچیە ناو قامیشـەڵانەکە و دەبێ پێکەوە بچین. ئەگەر بە ساغی دەرچووین، ئەوە پێکەوە دەردەچین و ئەگەر شتێکیشمان لێ هات، ئەوە با پێکەوە لێمان بێ.' ئیدی وێکڕا چوونە ناو دارسـتانەکە. سـەیریان کرد ئەوە شێرێک خەزێنەداری گرتووە و خەزێنەداری هەژار بە دەستییەوە وەک مەلیچک وایە. بەڵام

زۆر زەلیلانە لە بەر خودا دەپاڕێتەوە و چاوی لە ئاسمان بڕیوە.

"کە ئەمجەد ئەوەی دیت، شیرەکەی بە دەستەوە گرت و بۆ شێرەکە چوو. شیرێکی لێ دا و شێرەی کوشت. خەزێنەدار هەستاوە و سەری لەو کارە سووڕ ما. خۆی بەسەر لاقی ئەمجەد و ئەسـعەددا دا و گوتی: 'گەورەکانم! بە خودا کوشـتنی ئێوە سـتەمێکی گەورەیە. ئەوە کاری من نییە و ئەمن ئێوە ناکوژم. ئەمن خۆم فیدای ئێوە دەکەم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، خەزێنەدار بە ئەمجەد و ئەســعەدی گوت: 'ئەمن خۆم فیدای ئێوە دەکەم.' ئیدی خەزێنەدار پرســی: 'ئەوە چۆناوچۆن گوریســەکەتان کردەوە؟' ئەوان گوتیان: 'تینوویێتی زۆری بۆ هێنابووین، ئەوەندە جووڵاینە هەتا گرێکان دانەدانە بۆخۆیان کرانەوە و ئیدی پێ و شوێنی تۆمان هەڵگرت و هاتین بۆ ئێرە.'

"کە خەزێنەدار ئەو قسـەی بیست، سـوپاسی کردن و دەستخۆشـی لێ کردن. پاشـان پێکەوە لە قامیشـەڵانەکە هاتنە دەرێ. کە لە قامیشـەڵانەکە هاتنە دەرێ، گوتیان: 'ئەمیر، بابم چی پێ گوتی بیکە.' خەزێنەدار گوتی: 'ناوەڵڵا، ئەمن قەت کاری وا ناکەم، ئێش بە ئێوە بگەیەنم. هەر ئەوەندەم دەوێ جلکەکانم بدەنێ و ها ئەو شتە کۆنانەی من لە بەر بکەن. ئەو شـووشـەیەش پڕ دەکەم لە خوێنی ئەو شـێرە و دەیبەمەوە بۆ پاشـا و پێی ڕادەگەیەنم کە ئەوانم کوشتووە. ئێوەش بڕۆن بۆ شارێکی دوور. چ زۆرە وڵات بۆ ئێوەش. ئەوەش بزانن دوورکەوتنەوەی ئێوەم زۆر لەبەر گرانە.'

"خەزێنەدار و شـازادەکان دەسـتیان کرد بە گریان و جلەکانی سـەرەوەی خۆیان دا بە خەزێنەدار و ئەویش لە بوخچەیەکی خستن. دوو شووشـەشی لە خوێنی شێرەکە پڕ کرد. ماڵاوایی لە شـازادەکان کرد و سـواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو شـار گەڕاوە و چووە لای پاشـا و کڕنۆشـی برد. پاشـا سـەیری کرد ڕوخسـاری تێک چووە، ڕوخسـاری کە لە کاتی گیرکردن بە دەســت شــێرەکەوە تێک چوو بوو پاشــا وای زانی ئەوە لە کاتی کوشــتی کوڕەکانی وای لێ هاتووە. دڵی خۆش بوو بە خەزێنەداری گوت: 'کارەکەت جێبەجێ کرد یان نا؟' خەزێنەدار گوتی: 'بەڵێ، گەورەم.' ئینجا بوخچە و شـووشـەکانی لەپێش دانا. پاشـا لێی پرســـی: 'چیان گوت، وەســـییەتیان کرد؟' گوتی: 'ئەوان بە ویســـتی خودا و فەرمانی جەنابت قایل بوون و گوتیان: 'بابمان هۆکارێکی پێ شک هاتووە، ئێمە گەردنی بابمان ئازاد دەکەین و لێی خۆش دەبین.' گوتیشیان ئەو شێعرەش بۆ بابمان بخوێنەوە:

لـــغـــاوی ئەقـــڵ بە دەســــــت هەوەس بـــێ
ژن ئـــیـــدی بـــۆچـــی ژێـــردەســـــــتە دەبـــێ؟!
دەبێتە ژن و ژێـــــــــــــــــــــــردەستەیی ژن
ئەو خـــوێـــنڕیـــانەی وا لە ژن دەتـــرســـــن
بـــە گـــوێـــیـــدا نـــاچـــێ پـــیـــاوی مـــردووی ژن
هەتـــاکـــوو دەمـــرن ڕاســـــتـــی نـــابـــیـــســــتـــن

”كه پاشـا ئه‌و شـێعره‌ی له‌ خه‌زێنه‌دار بیسـت، ماوه‌یه‌كی زۆر سـه‌ری داخسـت. زانی كه‌ شـــێعری ئه‌و مندالانه‌ی ئه‌وه‌ ده‌رده‌خا كه‌ به‌ ناحه‌ق كوژراون. دوای ئه‌وه‌ هه‌ر وا بیری له‌ فروفێڵی ژنان ده‌كرده‌وه‌ و خه‌ریک بوو چاوی له‌ جلی كوڕه‌كانیشی ده‌كرد كه‌ له‌ بوخچه‌كه‌ ده‌ریهێنابوون و ئه‌مدیو و ئه‌ودیوی ده‌كردن و ده‌گریا.“

لێره‌دا بوو، ماوه‌ی چیرۆكی ئه‌مشه‌ویش كۆتایی هات و شه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆكه‌كه‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێكی دیكه‌.

# کە شەوی دووسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا قەمەروززەمان بوخچەی جلوبەرگی منداڵەکانی کردەوە و هەر وا خەریک بوو هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکردن و دەگریا. کاتێک کە جلەکانی شازادە ئەسعەدی، کوڕە چکۆلەکەی کردەوە و پشکنی، کاغەزێکی دیتەوە کە بە دەستنووسی شاژن بێدووری ژنی نووسرابوو. سەیری کرد بە تاڵی قژیشی بەستوویەتی. کاغەزەکەی کردەوە و خوێندییەوە. زانی چ باسە و شازادە ئەسعەد بە ناحەق کوژراوە. ئینجا جلکەکانی شازادە ئەمجەدی پشکنی، سەیری ئەویشی کرد کاغەزێکی تێدایە کە بە دەستنووسی حەیاتوننفووس نووسراوە و بە قژی بەستراوە. ئەو کاغەزەشی کردەوە و خوێندییەوە و زانی ئەویش هەر بە ناحەق کوژراوە. ئیدی دەستی پەشیمانی لێک هەڵسوو گوتی: 'سوبحانەڵڵا، ئەمن منداڵەکانی خۆمم بە ستەم و ملهوڕی خۆم کوشت.' ئەوجا دەستی کرد بە لەخۆدان و شین و زاری و گوتی: 'ئەی هاوار بۆ ئەو کوڕە جوانانەم! ئای لەو بەڵایە!' ئینجا فەرمووی لە دیوێکدا دوو گۆڕیان درووست کرد و کێلیان بۆ چەقاندن و ناویان نا ماتەمخانە. گوتی کە نێوی دوو کوڕەکەی لەسەر ئەو دوو کێلە بنووسن. ئیدی خۆی بەسەر گۆڕی ئەمجەددا کێشا و ئەو شێعرەی گوت:

چت لێ هات تیشکی چرای ماڵەکەم؟
بۆ کوێ چووی تەنیا خۆشی دڵەکەم؟
تازە کوڕی وا کوا دەبێتەوە؟!
وەجاخی ژینم هەڵنابێتەوە
لە تاوی کۆچت وا چەمامەوە
مەحاڵە، دوای تۆ من هەڵناستمەوە

"دوای ئەوە باوەشی بە کێلی ئەسعەددا کرد و دەستی کرد بە گریان و لاڵانەوە و سێڵاوی ئەسرین لە چاوی سەرڕێژ بوو گوتی:

پشتت شکاندم بەو کۆچەی کردت
دەستی گڵاوم سوور بوو بە خوێنت
ژیان رووناکی تیشکی رووی تۆ بوو
کە تۆ رۆیشتی، ژین رەنجەڕۆ بوو
خۆ هێشتا من تێر سەیرم نەکردبووی
گوڵی ژیانم بووی، بۆنم نەکردبووی

"کاتێک پاشا شیعرەکەی تەواو بوو ئیدی لە خەڵک دابڕا و لەو ماتەمخانەیەدا دانیشت. لە خزم و کەس و ژنەکانی دوور کەوتەوە و شەو و ڕۆژ بۆ کوڕەکانی خەریکی شین و ماتەم بوو. با قەمەروززەمان لێرە خەریکی شینگێڕی خۆی بێ.

"شازادە ئەمجەد و شازادە ئەسعەدیش بە کێو و بێروندا ڕۆیشتن. هەتا مانگێک هەر بنچکی گیا و گەڵای دارانیان خوارد و لە قوڵکاو و بەرداودا ئاویان دەخواردەوە هەتا گەیشتنە کێوێکی ڕەشی یەکپارچە بەرد کە لووتکەکەی بە دیارەوە نەبوو. لەوێوە ڕێگاکە لکێکی دیکەی لێ دەبووەوە. یەکیان بە داوێنی کێوەکەدا دەڕۆیشت و ئەوی دیکەیان بەرەو لووتکە دەچوو. شازادەکان بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتن کە بەرەو لووتکەکە دەچوو. هەتا پێنج ڕۆژ بەرەو لووتکە ڕۆیشتن. بەڵام لووتکەی کێوەکە هەر دەرنەکەوت. ئیدی ئەوان ماندوو بوون و هێزی پێیان نەما. لەوێ لەبن بەردێک دانیشتن و هەتا بەیانی خەوتن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە ئەسعەد و شازادە ئەمجەد کە زۆر ماندوو ببوون، لەبن بەردێک هەتا بەیانی پشوویان دا. بەیانی هەستان دیسان بە کێودا هەڵگەڕان و هەتا شەو یەکتەکان ڕۆیشتن. شازادە ئەسعەد پەکی کەوت و ماندوویی بڕستی لێ بڕی. بە براکەی گوت: 'کاکە، ئەمن هێزی ڕێگاڕۆیشتنم نەماوە.' براکەی گوتی: 'ئەسعەد گیان، هێز وەبەر خۆت بنێ و ئازا بە هەتا خودا بە ڕەحمی خۆی فریامان دەکەوێ و دەمان خاتە سەر ڕێی ڕزگاری.' ئیدی بە هەر جۆرێک بوو هەتا نیوەشەو ڕۆیشتن. تا وای لێ هات ئەسعەد بە حاڵ پشووی دەردەهات و تەواو هێزی لێ بڕا. گوتی: 'کاکە، بە خودا من هێزم لە بەردا نەماوە.' هەر ئەوەندەی گوت و کەوتە سەر زەوی و دەستی کرد بە گریان.

"شازادە ئەمجەد ناچار براکەی هەڵگرت و وردەوردە بە کێوەکە هەڵگەڕا هەر ماوەیەک دەڕۆیشت، کەمێک دادەنیشت و تاوێک دەحەساوە. هەتا بەیان هەر نەختەنەختە ڕۆیشت. بەیانی سەیریان کرد ئەوە لەسەر لووتکەی کێوکەن. لەوێ دار هەنارێک و کانییەکی لێ بوو. لە پەنا کانییەکە دانیشتن. ئاویان خواردەوە و هەناریان لە دارەکە کردەوە و خواردیان. هەتا ئێوارە خەوتن. ئێوارە هەستان بڕۆن. شازادە ئەسعەد نەیتوانی بڕوا. قاچەکانی ماسیبوون. ئیدی سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە و تەواو حەسانەوە. دوای ئەوە چەند ڕۆژ بەسەر کێوەکەدا ڕۆیشتن و لەبەر تینوویێتی خەریک بوو بمرن. لەو جەنگەیەدا لە دوور شارێک دەرکەوت. خۆشحاڵ بوون و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە نزیک شارەکە. لەوێ سوپاسی خودایان کرد. شازادە ئەمجەد بە شازادە ئەسعەدی گوت: 'براکەم، ئەتۆ لێرە دانیشە، ئەمن دەچمە نێو شار و باس‌وخواس دەپرسم و دێمەوە. بزانم خەڵکەکەی چۆنە و ئێمە هاتووینە کوێ و چەندمان ڕێگا بڕیوە. براکەم ئەگەر ئێمە بە شاخ و کێودا نەهاتباین، بە ساڵێک نەدەگەیشتینە ئێرە. ئێستا سوپاس بۆ خودا کە ساغ و سلامەتین.' شازادە ئەسعەد گوتی: 'کاکە گیان، بە خودا ناهێڵم ئەتۆ بچی. بۆخۆم دەچم. دەنا بە خودا دڵم ناحەسێتەوە. ئاخر بێتو تۆ بڕۆی و شتێکت لێ بێ لە تاوی تۆ دڵم دەتۆقێ و لە سەر دڵم دەبێ بە داخ.'

"شازادە ئەمجەد گوتی: 'باشە بڕۆ، بەڵام زوو وەرەوە. خۆت وە درەنگی نەخەی.' شازادە ئەسعەد چەند دینارێکی هەڵگرت و بەرەو شار داگەڕا. ئەمجەد لەوێ چاوەڕێی بوو. ئەویش ڕۆیشت هەتا گەیشتە شار. بە کۆڵانەکانی شاردا دەگەڕا تووشی پیاوێکی پیر بوو. ڕدێنی ئەوەندە زۆر بوو لە سینگی ڕەد ببوو. گۆچانێکی بە دەستەوە بوو. جلوبەرگێکی بەشکۆی لە بەردا و پێچوکڵاوێکی سووریشی لەسەر نابوو. کە شازادە ئەسعەد ئەوی دیت، سەری لەو جلوبەرگ و پێچوکڵاو و شتەی سووڕ ما. چووە پێشێ و سڵاوی لێ

کرد و گوتی: 'گەورەم، ڕێگای بازاڕ لە کام لاوەیە؟' کە پیاوەکە ئەوی بیســت، بە ڕوویەکی خوشەوە لێی پرسی: 'ڕۆڵە، دەڵێی غەوارەی؟' ئەسعەد گوتی: 'بەڵێ گەورەم، غەوارەم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەسعەد بە پیاوەکەی گوت: 'بەڵێ گەورەم، غەوارەم.' کابرا پیرە گوتی: 'ڕۆڵە، پێوقەدەمت خێرە. بڵێ بزانم لە بازاڕ دەتهەوێ چی بکڕی؟' ئەسعەد گوتی: 'مامە، من برایەکم لەگەڵە لە داوێنی هۆو کێوە بەجێم هێشتووە. لە وڵاتێکی زۆر دوورەوە هاتووین و سێ مانگە بەڕێوەین، بە شاخ و کێو و دەشت و دەردا هاتووین. هاتوومە ئەو شارە هەتا خواردەمەنی و شت بکڕم و بگەڕێمەوە لای براکەم.' پیاوە پیرە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئێمە ئاهەنگمان هەیە و چێشت و شتێکی زۆرمان بۆ میوانان ساز کردووە، خواردەمەنی هەمەجۆرە زۆرە، ئەوەندەی دڵت دەیبا هەیە. پێم خۆشە ئەتۆش لەگەڵ من بێیەوە و گەورەمان بکەی و ئەوەی دەشتهەوێ دەتدەمێ و پارەشت لێ ناستێنم. باسی چۆنییەتی شار و خەڵکەکەشیت بۆ دەکەم. ڕۆڵە گیان، سوپاس بۆ خودا جگە لە من تووشی کەسی دیکە نەبووی.' ئەسعەد گوتی: 'زۆر باشە، ماڵت ئاوەدان بێ، بەڵام ئەمن تۆزێک بە پەلەم و براکەم لەوێ هەم برسییەتی و هەم چاوەڕێی منە و نیگەرانە.'

"کابرا پیرە دەستی ئەسعەدی گرت و گێڕایەوە. چوونە کۆڵانێکی تەنگەوە لەگەڵی پێدەکەنی و دەیگوت: 'سوپاس بۆ خودا کە تۆی لە خەڵکی ئەو شارە ڕزگار کرد.' هەر وا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ماڵە گەورەکەی خۆی. ماڵەکەی حەوشەیەکی هەبوو کە چل کەسی پیری وەک خۆی لەدەوری ئاورێک کە لە نێوەڕاستیان بوو دانیشتبوون. ئەو پیرانە لە دەوری ئەو ئاگرە دانیشتبوون و کوڕیان بەستبوو، خەریکی پەرستنی بوو. ئەوان ئاگرپەرست بوون. سووژدەیان بۆ ئەو ئاورە دەبرد. کە شازادە ئەسعەد ئەوانی دیت، هێشتا نەشیناسیبوون، دەستی کردە لەرزین و دڵەکوتە.

"ئەو کابرا پیرەی ئەسعەدی لەگەڵ خۆی هێنابوو ڕووی لەوانی دیکە کرد و گوتی: 'ئاگرپەرستەکان، دەستەچیلەی پیرۆزم بۆ هێنان.' ئیدی هەرای کرد: 'غەزبان!' لەڕێوە کۆیلەیەکی ڕەشی ڕووگرژی لووتدرێژ و کەمێک کووڕ وەدەر کەوت. پیرەپیاوەکە پێی گوت: 'قۆڵی ئەو کوڕە ببەستە و بیبە سارداوەکە و بە فلانە کەنیز بڵێ ئازاری بدا.'

"ئیدی کۆیلەکە ئەسعەدی برد و کردییە سارداوەکەوە. سپاردییە دەست کەنیزەکە. کەنیزەکە دەستی کرد بە ئازاردانی و بەیانی لەتە کولێرەیەک و شەویش لەتە کولێرەیەکی دەدایە. بەیانیان و شەوانەش گۆزەڵەیەکی ئاوی سوێر دەدایە. پیرە ئاگرپەرستەکان دەیانگوت: 'ئەگەر ڕۆژی جێژنی ئاور بێ، دەیکوژین و دەیخەینە نێو ئەو ئاورەوە.'

"کەنیزەکە هات بۆ لای ئەسعەد و ئەوەندەی بە قامچی لێ دا هەتا هەموو گیانی خوێنی لێ هات و لە هۆش خۆی چوو. دوایی لەتە کولێرەیەک و گۆزەڵە ئاوە سوێرەکەی لە لا دانا

و ڕۆیشــت. نیوەشــەو بوو ئەســعەد وە هۆش خۆی هاتەوە. خۆی ئاوا بە بەســتراوەیی و گیانی بە بریندارى دیت و ناڕەحەت بوو. گەورەیی و شــکۆی پێشــووی خۆی کەوتەوە بیر و دەستی کرد بە گریان.“

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، کە ئەســعەد ڕۆژگاری پرشــکۆ و ڕێزی ڕابردووی هاتەوە بیر، دەستی کرد بە گریان و بە دەنگێکی بەرز و بە ناڵەوە ئەو شێعرەی گوت:

ڕۆژگـاری ســـپـڵە چـی لە مـنـی ســـەرگەردان دەوێ
بـــۆچ دەبـــێ هەدادانـــم نەبـــێ ڕۆژ و شـــەوێ
خـۆشـــبەخـتـی مەلـێـکـی کـۆچەر بـوو هـات و ڕۆیـی
دەبـــێ مەلاســـــا بـــفـــڕم لە دوای ڕوژ و شـــەوێ
چـاوی خـۆشـــبەخـتـی کـوێـر بـووە ئـێـتـر نـامـبـیـنـێ
دایـکـــی هـــیـــوام قســـــــر بـــووە و تـــازە قەت نـــازێ

"کە ئەو شێعرەی گوت، دەستی درێژ کرد لەپشت سەری لەتە کولێرەکەی هێنا خواردی و لەو ئاوە ســـوێرەش کەمێکی خواردەوە. هەتا بەیانی بە دەســـت کێچ و ئەســـپێوە شانەوشانی کرد. کە ڕۆژ بووەوە، کەنیزەکە هاتەوە سارداوەکە و جلەکانی لە بەر ئەسعەد داکەند. کراســـەکەی ژێرەوە کە خوێناوی بوو لە داکەندندا پێســـتی پێوە هات و ئەســـعەد یەکبەخۆی هاواری کرد و گوتی: 'خودایە، ئەگەر من شـــیاوی ئەوەم، ئەوە ئێش و ئازارم زیاتر کە! ئەگەر ئەوەش ستەمە لێم دەکرێ، لە ستەمکارم خافڵ مەبە!' دوای ئەوە دیســان ناڵاندی و ئەو شێعرەی گوت:

ئـــەی ڕزگـــارکـــەری خـــەڵک لـــە بەڵا
منیش ڕزگـار کە مەمـــــــــــــــخە بەر بەڵا!
تەنـگ و تـاریـکـی و بۆ برشـــی[1] زیـنـدان
وای پەرۆش کـــردووم بـــێـــزارم لە ژیـــان

"کە شــێعرەکەی تەواو بوو کچە دەســـتی کردەوە بە ئازاردانی، ئەوەندەی لێ دا هەتا دیســـان بووراوە و بێهۆش کەوت. کەنیزە لەتە کولێرە و ئاوە ســـوێرەکەی بۆ داناوە و بەجێی هێشـــت و هاتە دەرێ. ئەویش پاش ماوەیەک هۆشـــی هاتەوە بەرخۆی و بە هەر حاڵێک بوو هەســـتا دانیشـــت. کەوتەوە یادی براکەی و گەورەیی و بەختەوەری ڕۆژانی ڕابردووی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. برش: کەڕوو.

## که شەوی دووسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەســـعەد براکەی و گەورەیی و بەختەوەری ڕۆژانی ڕابردووی هاتەوە بیر. ناڵاندی و دەستی کرد بە گریان و ئەو چەند بەیتە شێعرەی گوت:

سـەیرە، کارەسـات سـەرم لەسـەر هەڵناگریٚ!
ڕۆژ نییە تـوووشـم نەکا کەند و سـەرەنگریٚ!
بێبەزەیە ڕۆژگـار پـێم دەچێـژیٚ تـاڵـی ژیـن
قەت نـاهـێڵـی ئـاسـوودە و بێخەم بم قەدەریٚ
گەر بـاڵـنجێکـی دڕکـێن بـخەنە ژێـر سـەر
پەکم پـێی نـاکەویٚ فـێرم، کۆسـپم بێتە ڕێ
سـەیرە دەمشـارێتەوە وەک کـیژی تـاوانـبار
کوڕی وەک من کە لە جیهـانـدا دەسـت نـاکەویٚ!
سـسـت و لاواز بووە جەسـتەم کەنەفت و بێهێز
بڵێی هیچی ترم لە ژیـان دەسـت نەکەویٚ؟!

"کە ئەسعەد شێعرەکەی خوێندەوە، زۆر گریا و پاڕاوە و لالاوە و هەر بیری لە ئەمجەد دەکردەوە کە بڵێی چ بکا. ئیدی بە ڕۆژدا ئەوە حاڵی ئەسعەد بوو.

"بەڵام شازادە ئەمجەدی برای هەتا نیوەڕۆ هەر لە داوێنی ئەو کێوە دانیشت و چاوەڕێی براکەی بوو. براکەی نەگەڕاوە و شـــازادە ئەمجەد نیگەران بوو. تووشـــی دڵەڕاوکێ و پەرۆشی بوو. لە تاوانی حەجمینی نەبوو و دەستی کرد بە گریان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، تا درەنگتر دەبوو شازادە ئەمجەد زیاتر نیگەرانی براکەی دەبوو، تا وای لیٚ هات تەواو لە هاتنەوەی بیٚ هیوا بوو. ئیدی بەدەم گریانەوە بەرەو شـــار داگەڕا. ڕۆیشت هەتا گەیشتە شار. چووە نێو شارەوە و زۆر گەڕا هەتا گەیشتە بازاڕ. پرسی: 'ئەو شـــارە کوێیە؟' گوتیان: 'ئێرە شـــاری مەجووســـانە و خەڵکەکەی ئاور دەپرســـتن و خودا ناناسن.' پرسی: 'شاری ئابنووس لەکوێوەیە؟' گوتیان: 'شاری ئابنووس بە وشکانیدا ڕێی ساڵێک لێرەوە دوورە و بە دەریاشدا شەش مانگ ڕێیە. پاشاکەشی ناوی ئاڕمانووسپاشایە کە ئێســـتا زاوایەکی لە جێی خۆی لەســـەر تەخت داناوە. زاوای ئاڕمانووسپاشـــا ناوی قەمەروززەمانە.' کە گوێی لە ناوی باوکی بوو چوو لەولاوە دەستی کرد بە گریان. شتێکی کڕی بوو چوو لە پەنایەک دانیشـــێ بیخوا، کەچی براکەی بیر هاتەوە و خواردنەکەی بۆ نەخورا. هەســـتا و بەنێو شـــاردا گەڕا بەدوای براکەیدا، بەشـــکو هەواڵێکی بزانێ. تووشـــی پیاوێکی موســـوڵمانی بەرگدروو بوو، لە دووکانێکدا کاری دەکرد. چوو لە لای دانیشـــت و ســـڵاوی کرد. باســـی خۆی و براکەی بۆ کرد. بەرگدرووە موســـوڵمانەکە گوتی: 'ئەگەر براکەت کەوتبێتە دەست مەجووسەکانەوە، تازە ڕزگاربوونی ئەستەمە و پێم وا نییە چاوت پێی بکەوێتەوە. هیوادام خودا فریای بکەوێ و پێکتان شاد بکاتەوە.'

"دوای ئیستێک بەرگدرووەکە پێی گوت:'برا گیان، پێت خۆشـە بێیە ماڵی ئێمە؟' ئەمجەد گوتی: 'بەڵێ، پێم خۆشـە.' بەرگدرووەکە خۆشـحاڵ بوو. لەگەڵ خۆی خست. شـەو و ڕۆژ دڵخۆشـی دەداوە و ورەی وەبەر دەنا. لە بەرەوە فێری دروومانیشـی دەکرد. هەتا بوو بە بەرگدروو. ڕۆژێک چووە قەراخ دەریا جلەکانی شـــۆرد و چوو بۆ گەرماو. کە لە گەرماو هاتەوە، جلی پاک و خاوێنی لە بەر کرد. چوو لە ناوشار کەمێک گەڕا. تووشی ژنێکی زۆر جوانی نەرم و نیان بوو دەتگوت پەرییە. ئەو ژنەش کە ئەمجەدی دیت، پەچەی لا دا و کەمێکی ناز و کرێشمە بۆ کرد و ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

شـــۆڕەلاو! لەبەر دڵانـــی
هەتـــا دڵ دەبـــا جـــوانـــی
بـــاوەشـــم بـــۆ گـــرتـــوویەوە
تـــا تـــێـــیدا بـــحەســـێـــیەوە
نەرم و گەرم بە کەیـــفـــی تـــۆ
خـۆم و جوانیـم پێشـــکەشـــی تۆ
ژیـــنـــم بـــۆ تـــۆ تەرخـــان دەکەم

تازە تۆی کەسوکارەکەم
دەمێک ساڵە چاوەڕوانم
گەنجێک بێتە ناو ژیانم
ڕێکوپێک و قۆز و لەبار
دڵ بە دیتنی بێ شێت و هار
تۆ ئەو کەسەی لێی دەگەڕێم
بە دڵ و گیان لەسەرت گەڕێم

"کە ئەمجەد ئەو شێعرەی لەو ژنە ڕووگەلاوێژە بیست، کەیفی ساز بوو دڵی بۆی بزووت و عاشقی خوێنشیرینی و لارولەنجە و خاڵ و زوڵفی بوو. ئاماژەی بۆ کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بێتو مانگی من ڕووبەند لا بدا
خۆر دەبێ ڕووبەند بە سەر خۆیدادا
دوو چاوی مەستی شێخ دەخاپێنێ
لە بن چارشێویش هەست دەبزوێنێ
بە یەکەم نیگات قسەم پێ نەما
منیش شەیدای تۆم، گوڵی بێهاوتا

"کە ئەو پەریسیمایە ئەو شێعرەی لە ئەمجەد بیست، ئاهێکی هەڵکێشا و ئاماژەی بۆ ئەمجەد کرد و ئەو شێعرەی گوت:

بە دیتنت ژیانم گۆمێکی شڵەژاوە
دڵم حەجمینی نەما ئارامیم لێ بڕاوە
گوڵێکی شلک و ناسک، کەوتوومە بەر هەڕەشە
بێتو بە هانام نەگەی، دەرم دێنێ لە ڕیشە
عەشقت ئەسپێکی تۆڕە، هەڵم دەدێرێ بە خودا
بێتو هەوساری نەکەی، سەرمان بە فیڕۆ دەدا

"شازادە ئەمجەد کە ئەو شێعرەی لەو بیست، گوتی: 'ئەمن بێم بۆ لای تۆ، یان تۆ دێی بۆ لای من؟' کیژە جوانەکە لە شەرمان بێدەنگ بوو. ماوەیەک سەری داخست. دواى ئەوە سەری هەڵێنا و ئەو وتەیەی پەروەردگاری خوێندەوە:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ ﴾ النساء: ٣٤

واتا: ﴿پیاوان بالا دەستن بەسەر ژناندا، پیاو لێپرساوی ئافرەتە، سەرۆکو بەرێوەبەریەتی، سەرپەرشتیارو پارێزەرو بەخێوکەریەتی، تێکۆشانو جیهاد لەسەر پیاوە، لەسەر ئافرەت نیە، پیاو دووچەندانەی ئافرەت میرات دەبا، چونکە پیاو بەرپرسیاری بەخێوکردنو بژێوی ئافرەتە. هۆی ئەم لێپرساوییە دوو شتی سەرەکییە:

یەکەمیان ئەو زێدە رێزو فەچلەی کە خودا خۆی داویەتی بە پیاو، کە لە بارەی فسیۆلۆجییەوە، لە پێکهاتنی جەستەو لەشو لاردا، زێدەی بەسەر ئافرەتدا هەیە، تەن قایمو دەمار گشتو ماسەلکە قەویو بیر تیژە، خۆڕاگرو عاقڵا ترو لەش ساغ ترە، لە سۆزو عاتیفەدا مامناوەندیو لەبەرامبەر کارەساتی رۆژگاردا بە پشوترە.

لە بارەی وەرەبەرزیو هۆشمەندیو هێزو تواناوە، پیاو زێدەی هەیە، بۆیە چەند پلەو پایەیەک هەیە، تایبەتە بە پیاو، وەکوو پێغەمبەرایەتیو فەرمانڕەوایی موسولْمانانو قازییەتیو بانگ دانو قامەت کردنو ووتار خوێندنەوەی رۆژی جومعە، تەڵاقیش بەدەست پیاوە، پیاو بۆی هەیە ئەگەر مەرجی خۆی تێدا هاتنە جێ. زیاد لە ژنێک مارە بکا تا چوار، شایەتیدانی قەزیەی جینایاتو تۆڵەستاندن تایبەتە بە پیاو، بەشە میراتیشی لە ژن زیاترە.

دووەم: بەهۆی ئەوەی کە پێویستە پیاو بژێوی خێزانی خۆیو ئاتاجی کەسو کاری خۆی وەکوو باوکو مامو باپیرەو دایکو خوشکو پورو نەنک بدا، هەروەها پێویستە پیاو مارەیی بدا بە ژن، وەکوو رێز لێنانێک بۆ ئافرەت. چاکانی ژنان ئەوانەن کە خوداپەرستو فەرمانبەردارو پارێزەری نامووسو حەیای خۆیانن. کاتێ مێردەکانیان لە ماڵا نەبن پارێزگاری خۆیانو ماڵاو منداڵیان بەو پەڕی دڵسۆزییەوە دەکەن، کاتێکیش مێردەکانیان لە ماڵا بن دیارە باشتر ئەرکی ژنیەتی خۆیان ئەنجام دەدەن ئەم پارێزگاری کردنەیان لە دیارو نادیار، بەهۆی ئەوەوەیە کە خودا ئەوانی پاراستووە، بەهۆی ئەوەوە: کە تەوفیقی پێداون کە فەرمانەکانی خودا لەم بارەیەوە جێبەجێ بکەن! جا لەبەر ئەم فیداکاریو پارێزگاریو خزمەتکردنەی ئافرەت بۆ مێردی، پێویستە مێردەکەی نەفەقەی بکێشێ، مارەیی بداتێ، هەڵسو کەوتی باشی لەگەڵدا بکاو رێزی لێ بگرێو، مافی پێشێل نەکا! خوداش مزگێنی داوە بە ئافرەتی پارێزگارو بەحەیا، وە هەڕشەی لە ئافرەتی داوێن پیسو خیانەتکار کردووە!! ئەو ژنانەی لە مێردەکانیان هەڵدەگەڕێنەوەو ناچیزە دەبن، یان دیاردەی

ناچیزە بوونیان لێ دیاری دەدا، ئەوە دەبێ بە گوێرەی پێویســت بەچەند قۆناغێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ:

١- ئامۆژگاری کردنو پەند دادان: وەکوو ئەوە نەصـــیحەتی بکاو پێی بڵێ: ئافرەت لە خودا بترسە، من مافم بەسەرتەوە هەیە، واز لە کەلەڕەقی خۆت بێنە، پێویستە بە گوێی من بکەی، خۆت گوناهباری دیوانی خوا نەکەی.

٢- لەگەڵا نەنووستن جێ لێ جیاکردنەوە:

بەم جۆرە لەگەڵی نەخەوێو، لەسـەر سـەرینێک لەگەڵیدا نەنوێ! بەڵام زیاد لە سێ ڕۆژ دروست نیە دەنگی لێ داببڕێ! ئەم هەڵسو کەوتە زۆر کاریگەرە لە دەروونی ژندا، لەوانەیە هەڵوێستی خۆی بگۆڕێو بیر لە دوارۆژی خۆی بکاتەوە، ئەمجار ئەگەر ئەوەش دادی نەدا، پەنا دەباتە بەر ڕێگا چارەی سێیەم.

٣- لێدان کە ئازاری پێ نەگەیەنێ: لێدانی بە ئەســپایی وەکوو ئەوە ســووک ســووک بەدەست لەسەر شانی بدا، یان بە سیواکێ، یان بە شوڵکێ بۆ تەمێ کردن لێی بدا، نەک بۆ ئێش پێگەیاندنو داخی دڵا پێ ڕشتن.

جا هەرچەندە لەکاتی ناچیزەبوون دا لێدان لە ئافرەت لەســەر ئەم شـێوەیە دروســتە، بەڵام زانایان پێیان وایە تەرک کردنی باشترە.

٤- جا ئەگەر ئەم ڕێگا چارانە کاریگەر نەبوون؛ پەنا دەبرێ بۆ ڕێگا چارەی چوارەم کە ئایەتی دواترە﴾.

پاشا بە ئایەتەکەدا لە مەبەستەکە تێگەیشت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە ئەمجەد بە ئاماژەی مانگرۆخسارەکەدا زانی مەبەستی ئەوەیە بە شازادە ئەمجەد بڵێ بۆ هەر کوێ دەچی، منیش لەگەڵ خۆتدا بەرە. بەڵام شازادە ئەمجەد پێی نەنگ بوو، ئەویش لەگەڵ خۆی بەرێتەوە بۆ ماڵی ئەو بەرگدرووە. ئیدی شازادە ئەمجەد رۆیشت و کیژەش بەدوایدا. لەو کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان و لەو گەڕەک بۆ ئەو گەڕەک رۆیشتن. تا وای لێ هات کەنیشکەکە شەکەت بوو. راوەستا و بە شازادە ئەمجەدی گوت: 'ماڵەکەت لە کام گەڕەکە؟' شازادە ئەمجەد گوتی: 'ماڵەکەم لەو نیزیکانەیە. کەمێکمان ماوە بگەینێ.' دوای ئەوە چوون لە کۆڵانێکی دیکەوە. بە کۆڵانەکەدا رۆیشتن هەتا گەیشتنە ئەوسەرێ. شازادە ئەمجەد سەیری کرد، کوێرە کۆڵانە و رێ نییە بچنە دەرێ! گوتی: 'لاحول ولا قوة الا بالله العلي العظیم.' ئینجا ڕوانییە ئەملا و ئەولای خۆی، چاوی بە دەرگایەک کەوت، دوو سەکۆی لەوبەرەوبەر بوو، دەرگاکەش داخرابوو. لەسەر یەکێک لە سەکۆکان دانیشت. کچەکەش لەسەر ئەوەی دیکەیان دانیشت و بە شازادە ئەمجەدی گوت: 'گەورەم، چاوەڕێی کێی؟' شازادە ئەمجەد ماوەیەک سەری داخست و هیچی نەگوت. دوای ئەوە سەری هەڵێنا و گوتی: 'چاوەڕێی کۆیلەکەمم. کلیلی دەرگاکە بەوە. پێم گوتبوو تا دێمەوە، خواردن ساز بکا. رەنگە ئێستا بێتەوە.' لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'بەشکو وردەوردە رۆژ درەنگ بێ و دوێتەکە بڕوا و بەو شێوە رزگارم بێ.'

"بە کورتی، شازادە ئەمجەد سەری لێ شێوابوو. تێدا مابوو. کە رۆژ درەنگ بوو دوێتە گوتی: 'گەورەم، کۆیلەکەت نەهاتەوە و ئێمەش هەر لە کۆڵانین.' ئیدی دەستی دا کوچکێک و بەربووە قفڵ و ئاڵقەرێزەکە. شازادە ئەمجەد گوتی: 'خانم، پەلە مەکە ئێستا کۆیلەکەم دێتەوە.' خانم گوێی نەدا قسەکەی شازادە ئەمجەد و هەر لێی دا هەتا شکا و درگا کراوە. شازادە ئەمجەد گوتی: 'ئەوە بۆ شکاند؟' کیژە گوتی: 'دەی جا چ بوو؟ مەگەر ماڵی خۆت نییە؟' شازادە ئەمجەد گوتی ماڵەکە؟ ماڵەکە هی خۆمە، بەڵام پێویستی بە دەرگاشکاندن نەدەکرد.' کچە چووە ژوورێ و ئەمجەد واقی وڕ ما. ترسی رێنیشت، نەیدەزانی دەبێ چ بکا.

"کچە گوتی: 'گەورەم بۆ نایەیتە ژوورێ؟' ئەمجەد گوتی: 'ئێستا دێم، بە چاوان. نیگەرانی ئەو کوڕەم، درەنگە و هەر نەهاتەوە. چاوێکی لەملا و ئەولا کرد و گوتی: 'نازانم ئەو شتانەی پێم گوتووە، کڕیونی یان نا.' ئەوەی گوت و بە ترس و نیگەرانییەوە هاتە ژوورێ. سەیری کرد ماڵێکی خۆش، چوار دیوی ڕوو بە یەکی هەیە و فەرشی ئاوریشم و دیبای لێ ڕاخراوە. حەوزێکی هەشتەلا لە نێوەڕاستی دیوەکانە و بە نقیمی گراندبایی

دەورەکەی ڕازاوەتەوە. لە چواردەوری حەوزەکە هەموو جۆرە میوە و گوڵ و ڕێحان و دەفری مەی داندراوە. کورسـی بە دەورەوە داندراوە. مۆمیان لەپێش داناون. کە ئەمجەد ئەوانەی دیت، سەری لە کاری خۆی سووڕ ما و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەکوژرێم. إنا لله و إنا اليه راجعون.' کیژەکە کە ئەوێی دیت، لەڕادەبەدەر خۆشـحاڵ بوو گوتی: 'گەورەم، خۆ غولامەکەت کەمکاری نەکردووە! تا ئێمە هاتین ئەو هەموو میوە و خواردن و شتێکی ساز کردووە. کاتێکی زۆر چاک هاتینەوە.' ئەمجەد چ ڕوویەکی وای نەدایە و لە ترسی خاوەنماڵ ڕووحی لە بەردا نەمابوو. کەنیشکەکە گوتی: 'گەورەم، ئەوە چ بووە وا مات و حەپەساوی؟' لەگەڵ ئەوەدا هاتە پێشـێ و ئەمجەدی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەم، ئەگەر جگە لە من گفتت بە کەسێکی دیکە داوە، نیگەران مەبە، ئەمن بەرهەڵبێنە لە خۆم دەدەم و خزمەت دەکەم.'

"ئەمجەد ئەوەندەی ڕق هەسـتابوو لە داخان پێکەنینی دەهات. ئینجا لە دیوەکە هاتە دەرێ و دانیشت. کچەش هات لە پەنای دانیشت. دەستی کرد بە دەسـتبازی و پێکەنین. بەڵام ئەمجەد مات و مەلوول، ناوچاوانی گرژ کردبوو. خەیاڵی دەکردەوە و دەیگوت: 'خاوەنی ئەو ماڵە ئێستا دێتەوە. ئەمن چی پێ بڵێم؟! خۆ بە خودا دەمکوژێ.'

"ئینجا کچە هەستا و قۆڵی لێ هەڵماڵی خواردن و شتی هێنا پێشێ و دەستی کرد بە خواردن و بە شازادە ئەمجەدیشی گوت: 'گەورەم، فەرموو بخۆ.' شازادە ئەمجەدیش چووە پێشێ و نانەکەی خوارد، بەڵام بە گیانی نەکەوت. هەر چاوی لە دالانەکە بوو.

"کیژەکە کە تێر بوو سـفرەکەی کۆ کردەوە. میوەی هێنا پێشـێ. گوزەڵە مەی لە نێوەڕاستی دانا. پیاڵەیەکی بۆ خۆی و یەکی بۆ شازادە ئەمجەد تێ کرد. جا ئەمجەد لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'حەییە حەی، ئێستا خاوەنماڵ بێتەوە چم لێ دەکا و ئەمن چی پێ بڵێم؟'

"کورتی کەینەوە، پیاڵە بە دەستییەوە و چاوی بە ماڵەکەدا دەگێڕا کە لە ناکاو خاوەنماڵ هاتەوە. خاوەنماڵ یەکێک لە فەرماندەکانی سـپا بوو. ناوی ئەو فەرماندەیە بەهادور بوو. ئەو ماڵەی بۆ عەیش و نۆشی خۆی تەیار کردبوو. هەر ڕۆژێک لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ژوانی هەبا، دەهاتە ئەوێ. ئەو ڕۆژەش ناردبووی لەدوای خۆشـەویسـتەکەی. ئەو ماڵ و سفرەیەی بۆ ئەو ڕازاندبووەوە. بەهادور پیاوێکی دەست و دڵکراوە و دەمەندە و چاکەکار بوو. کە لە ماڵەکەی نزیک بووەوە ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کە خاوەنماڵ نیزیک بووەوە، ســـەیری کرد دەرکی ماڵەکەی کراوەتەوە، بە ئەسپایی چووە بەرەوە. سەرێکی کێشا ژووری. ئەمجەدی دیت لەگەڵ کچێک دانیشتووە. سینییە میوە و مەی لەپێشیان داندراوە. هەر لەو کاتەشدا شازادە ئەمجەد پیاڵە بە دەستییەوە چاوی لە دەرگاکە بوو. کە چاوی بە چاوی خاوەنماڵەکە کەوت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و دەســـتی لەرزی. کە بەهادور دیتی ئەمجەد ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و تێک چوو، قامکی وستی لە سەر لێوی دانا و بە ئاماژە بانگی کرد بێتە دەرێ.

"ئەمجەد پیاڵەکەی دانا و هەســتا چوو بۆ لای بەهادور. کچە پرســی: 'بۆ کوێ دەچی؟' ئەمجەد ســـەرێکی لەقاند و گوتی: 'دەچم بۆ ئاودەســـت.' ئیدی هەر بە پێی پەتی چوو بۆ دالانەکە. کە بەهادوری دیت، زانی ئەوە خاوەنماڵە. بە لەز هەڕای کردێ و دەستی ماچ کرد. دوای ئەوە گوتی: 'گەورەم، پێش ئەوەی شـتێکم لێ بکەی، تو ئەو خودایە کەمێکم گوێ لێ ڕاگرە با بەســـەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.' ئیدی بەســـەرهاتی خۆی هەر لە ســـەرەتای ژیانییەوە بۆ گێڕاوە. پێی گوت کە بە ویســـتی خۆی نەهاتووەتە ئەوێ. تەنانەت کلۆمەکەش ئەو کچە شکاندوویەتی.

"بەهادور کە بەســـەرهاتی شـازادە ئەمجەدی بیســت و زانی پاشـازادەیە، بەزەیی پێیدا هات. بە ئەمجەدی گوت: 'کە وایە تۆش جوان گوێ لە من بگرە قســـەیەکت پێ دەڵێم، ئەگەر بە قســـەم بکەی، ئەوە ڕزگارت دەبێ. ئەگەر لە قســـەشـم دەرچی، ئەوە دەتکوژم.' ئەمجەد گوتی: 'چۆن دەفەرمووی وا دەکەم. ملکەچم، چونکە من ئازادکراوی تۆم.' بەهادور گوتی: 'ئەتۆ بچۆوە جێیەکەی خۆت دانیشـــە. ئەمنیش دێمە ژووری. نێوی من بەهادورە. کە هاتمە ژووری، ئەتۆ قسەم پێ بڵێ و لێم تووڕە بە. پێم بڵێ 'ئەوە بۆ وا درەنگ هاتییەوە؟ تا ئێستا لە کوێ بووی؟' گوێ مەدە بروبیـانووی من و بۆم هەســـتە لێم دە. ئەگەر وا نەکەی، دەتکوژم. کەوایە ئێستا بچۆوە جێگای خۆت. دەست بە عەیش و نۆشی خۆت بکە. ئەوەی بتهەوێ، من خێرا بۆت دێنم ئەو شـــەو چۆن دڵت دەیهەوێ ئاوای ڕابوێرە. بەیانییش بۆ کوێ دەچی بچۆ، چونکە تۆ غەریبی و منیش ڕێز لە غەریبان دەگرم خۆشم دەوێن.'

"ئەمجەد دەستی ماچ کرد و چووەوە لای کچەکە. وەک گوڵ گەشـابووەوە و بە ڕووی خۆش و کەیفسـازییەوە دەستی کرد بە قسـە و باس. بە کچەی گوت: 'ئەوشـەو شـەوێکی پیرۆزە وا تۆ هـاتوویە مـاڵەکەمەوە.' کیژەکە زۆری پێ ســـەیر بوو گوتی: 'ئەوە چۆنە پێکەنییت و ڕووت دامێ؟!' ئەمجەد گوتی: 'خانمەکەم، بە خودا ئەمن نیگەرانی ئەوە بووم کە بەهادوری کۆیلەم ئەو زێڕ و جەواهێراتەی کە هەر یەکی بە هەزار دینارم کڕیون، لەگەڵ

خۆی بردبێ و ڕۆیشتبێ. ئەمن لەبەر ئەوە هێندە نیگەران و پەشێو بووم، سەیر. ئێستا چووم سەرێکم لێ دان کە زانیم لە جێی خۆیانن، دڵم ئاسوودە بوو. کەیفم ساز بووەوە، بەڵام نازانم تا ئێستا لەکوێیە وا هەر نەهاتەوە! بێتەوە دەبێ بیرازی بکەم.'

"کچە دڵی حەساوە کە ئەو قسەیەی لە ئەمجەد بیست. ئیدی بە ئەرخەیانی دەستیان کرد بە عەیش و نۆش و دەستبازی و قانەقدیلە و مەیخواردنەوە. هەر ئاوا خەریک بوون تا بوو بە شەو. نوێژی شێوان بەهادور هاتەوە، بەڵام جلەکانی گۆڕیبوو و جلی غوڵامانەی لە بەردا بوو. بەهادور سڵاوی کرد و کڕنۆشی برد. دەستەونەزەر وەک تاوانباران ڕاوەستا و سەری داخست. ئەمجەد بە تووڕەییەوە تێی ڕوانی و گوتی: 'گڵاوی خوێڕی، ئەوە لەکوێ بووی؟' بەهادور گوتی: 'گەورەم، خەریکی شۆردنی جلەکان بووم، نەمزانی هاتوویەوە. چونکە بڕیار بوو بۆ شێو بێیەوە نەک بۆ فراوێن.' ئیدی ئەمجەد بە سەریدا گوڕاند و گوتی: 'گڵاو درۆش دەکەی؟!' ئینجا بۆی هەستا پاڵێکی بە بەهادورەوە نا و خستی. بە شووڵێک بە سووکی کەمێکی لێ دا. کەچی کچە هەستا و دارەکەی لە دەست ئەمجەد دەرهێنا. کەوتە گیانی ئەوەندەی لێ دا هەموو گیانی ڕەش و شین کردەوە. بەهادور دەگریا و دەپاڕاوە. هەر ئەمجەد دەنگی کچەی دەدا و دەیگوت: 'دەست ڕاگرە!' کچەش دەیگوت: 'لێم گەڕێ، زۆری لێ بە داخم، ئەوڕۆ ئەو خۆشییەی لێ تاڵ کردم!' ئیدی ئەمجەد دارەکەی لە دەست دەرهێنا و پاڵێکی پێوە نا و خستی.

"ئینجا بەهادور هەستاوە و فرمێسکەکانی سڕی و ماوەیەک دەستەونەزەر ڕاوەستا. دوای ئەوە چوو چلوورە و مۆمەکانی داگیرساندن. کاتێک بەهادور دەچووە دەرێ، کەنیشکەکە جوێنی پێ دا و دۆعای لێ کرد.

"ئەمجەد لە کیژەکە تووڕە بوو. پێی گوت: 'ئەو کۆیلەیەی من خووی بەو جۆرە هەڵسوکەوتانە نەگرتووە!' کەمێکی پێ چوو ئەمجەد و کیژە دەستیان کردەوە بە عەیش و نۆش و خواردن و خواردنەوە. تا وای لێ هات بەهادور ماندوو بوو هەر لەوێ خەوی لێ کەوت و دەستی کرد بە پرخەپرخ. کە کچەکە تەواو مەست بوو بە ئەمجەدی گوت: 'هەستە بەو شیرەی کە بەو دیوارەوەیە ئەو کۆیلەیە بکوژە. ئەگەر نەیکوژی کارێک دەکەم بۆخۆت تێدا بچی.' ئەمجەد گوتی: 'ئەگەر ئەو کۆیلەیەی من بکوژری، چ قازانجێکی بۆ تۆ هەیە؟' کچە گوتی: 'ئەگەر نەیکوژی، ناهێڵم دەستت وێم کەوێ. ئەگەر تۆش هەڵنەستی بیکوژی، بۆخۆم دەیکوژم.' ئەمجەد گوتی: 'بیکە بۆ خاتری خودا کاری وا نەکەی.' کچە گوتی: 'هەر دەیکوژم.' ئیدی شیری لە کالان دەرکێشا ویستی بەهادور بکوژێ، ئەمجەد لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو کابرایە گەورەیی لەگەڵ کردم. سڕی منی پۆشی. خۆی بە کۆیلە دانا. چۆن دەبێ بە کوشتنی پاداشی دەینەوە؟ قەت کاری وا ناکەم.' ئیدی بە کەنیشکەکەی گوت: 'ئەگەر هەر دەبێ بیکوژی، ئەوە من بکوژی شیاوترم.' ئیدی شیرەکەی لە دەستی دەرهێنا

و له ملی دا. لەرێوە سەری کچە پەڕی و کەوتە سەر بەهادور. بەهادور خەبەری بووەوە. هەستا دانیشت. چاوی هەڵێنا. سەیری کرد، ئەوە ئەمجەد بە پێوە وێستاوە و شیرێکی خوێناویشی بە دەستەوەیە. چاوێکی لە کچەکە کرد، دیتی کچە کوژراوە و لەوێ کەوتووە. لە ئەمجەدی پرسی: 'ئەوە چی بووە؟' ئەمجەد ڕووداوەکەی بۆ گێراوە، گوتی: 'خەریک بوو تۆ بکوژێ و بە گوێی منی نەدەکرد.'

"بەهادور هەستا تەوێڵی ئەمجەدی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەم، خۆزگە لێی خۆش بای! ئێستا کە ئاوای لێ هات، دەبێ پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە بیبەینە دەرێ.' بەهادور هەستا عەبایەکی لە کچەوە پێچا. خستییە نێو تەلیسێکەوە و بە شانیدا دا. بە ئەمجەدیشی گوت: 'ئەتۆ نامۆی، شارەزای هیچ کوێ نی. لێرە بە هەتا خۆر هەڵدێ و دێمەوە. ئەگەر هاتمەوە، زۆرت هاوکاری دەکەم، بەشکم بتوانین براکەت بدۆزینەوە. ئەگەر خۆر هەلات و من نەهاتمەوە، ئەوە بزانە کە من کوژراوم. ئەو دەم ئەو ماڵە و هەرچی تێیدایە بۆ تۆ.' دوای ئەو قسەیە تەلیسەکەی بە شانیدا دا و لە ماڵ وەدەر کەوت. لەنێو شار چووە دەرێ. ویستی بچێ بۆ قەراخ دەریا و بیخاتە دەریاوە. کە گەیشتە نزیک دەریا، داروغە و داروودەستەکەی دەوریان دا. کە ئەویان ناسییەوە، پێیان سەیر بوو. ئینجا کە تەلیسەکەیان کردەوە، تەرمێکی تێدا بوو. کە ئەوەیان دیت بەهادوریان گرت و زنجیریان لە دەست و پێی کرد. هەتا بەیانی ڕایانگرت. کە ڕۆژ بووەوە، ئەویان بەو تەلیسە تەرمەوە بردە لای پاشا. کە پاشا ئاوای دی، زۆر تووڕە بوو. بە بەهادوری گوت: 'ئەوە تا ئێستا هەر ئاوا خەڵکت کوشتووە و لە دەریات هاویشتوون و ماڵەکەیانت هەڵگرتووە بۆ خۆت؟' بەهادور سەری داخست."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، بەهادور لە لای پاشا سەری داخست. پاشا بەسەریدا گوڕاند و گوتی: 'کێ ئەو کیژەی کوشتووە؟' گوتی: 'پاشا، من کوشتوومە.' پاشا ڕقی لێی هەستا و فەرمانی کوشتنی دا. جەللاد لەڕێوە بە جارچی گوت کە لە شاردا جاڕی هەڵاوەسینی بەهادور، میری پاشا، لێ بدا. بەهادور ئاوای لێ بەسەر هات.

"شازادە ئەمجەدیش کە دیتی ڕۆژ بووەوە و خۆر هەڵات و بەهادور هەر دیار نەبوو گوتی: 'لاحول و لا قوة إلا بالله، خۆزگە دەمزانی ئەو فەقیرە چی بەسەر هاتووە.' هەر وا لە بیری ئەودا بوو کە لە پڕدا گوێی لە بانگەوازی جارچی بوو کە جاڕی دەدا: 'خەڵکینە ئاگادار بن! نیوەڕۆ بەهادوری میری پاشا لە دار دەدرێ.' کە ئەوەی بیست، دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'ئەو جوامێرە لەڕێی مندا خۆی بە کوشت دا لە کاتێکدا ئەو کچە من کوشتوومە. بە خودا ئەو کارە ئاوا نابێ.' ئیدی لەڕێوە لە ماڵێ هاتە دەرێ و دەرگای پێوە دا. یەکسەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە لا بەهادور، لەپێش جارچی ڕاوەستا و گوتی: 'گەورەم، بەهادور مەکوژن، ئەو بێگوناحە. بە خودا ئەو کچە من کوشتوومە.'

"داروغە کە ئەوەی بیست، ئەمجەدیشی گرت و لەگەڵ بەهادور بردنیە دیوانی پاشا. ئەوەی لە ئەمجەدی بیستبوو بۆ پاشای گێڕاوە. پاشا چاوێکی لە ئەمجەد کرد و گوتی: 'ئەتۆ ئەو کیژۆڵەیەت کوشتووە؟' ئەمجەد گوتی: 'بەڵێ، من کوشتوومە.' پاشا گوتی: 'هۆکارەکەی بگێڕەوە و ڕاستییەکەی بڵێ.'

"شازادە ئەمجەد ئەوەی لە سەرەتاوە بەسەری هاتبوو لەو ڕووداوانەوە بگرە کە لەگەڵ براکەی بەسەری هاتبوو هەتا کوشتنی کیژۆڵەکە، هەمووی موو بە موو گێڕاوە. پاشا سەری سووڕ ما. پێی گوت: 'وەم زانی بڕوبیانوو دێنیەوە. ئێستا پێت خۆشە ببی بە وەزیری من؟' ئەمجەد گوتی: 'بە دڵ و گیان.'

"ئیدی پاشا ئەمجەد و بەهادوری خەڵات کرد و ماڵێکی خۆش و شیاویشی دا بە ئەمجەد. کەلوپەلی ماڵ، لە قاپ و کەوچکەوە بگرە هەتا فەرش و پێداویستییەکانی دیکە، هەموویانی بۆ ئامادە کرد. فەرمانیشی دا بە شوێن شازادە ئەسعەدی برایدا بگەڕێن. بەو جۆرە ئەمجەد لە پلەی وەزیریدا دانیشت و دادگەرانە دەستی کرد بە کاروباری خۆی. جارچی لە شاردا بڵاو کردەوە. چەند ڕۆژێک جارچی بە گەڕەک و کۆڵانەکاندا سووڕانەوە، بەڵام هیچ هەواڵێک لە شازادە ئەسعەد نەبوو. ئەمجەد کاری بێرە گەیشت.

"شازادە ئەسعەدی بەدیلگیراو، هەتا ساڵێک ئازاریان دا. هەتا وا بوو جەژنی مەجووسان

نزیک بووەوە. بەهرامی مەجووس خۆی ساز کرد بۆ سەفەر و کەشتییان بۆ ئامادە کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، بەهرامی مەجووس ئامادەی سەفەر بوو. کەشتییەکیشی بۆ خۆی ساز کرد. ئینجا ئەسعەدی خستە سندووقێکەوە و دەرکی سندووقەکەی قایم کرد و خستە کەشتییەکەوە. بە ڕێکەوت لەو کاتەدا کە بەهرامی مەجووس سندووقەکەی لە کەشتییەکە دەخست، شازادە ئەمجەدیر لە پەنجەرەکەی خۆی ڕا سەیری دەریای دەکرد. چاوی لەو شتانە دەکرد کە دەیانهێنا نێو کەشتییەکەوە. وەک شتێک بە دڵیدا بێ، نیگەران بوو. بە غولامەکانی گوت، ئەسپیان هێنا و لەگەڵ تاقمێک سوار بوو. چوون بۆ قەراغ دەریا و لە نزیک کەشتییەکە ڕاوەستا. بە پیاوەکانی گوت: 'بچن ئەو شتانە بپشکنن. بەشکو ئەسعەد لەوێدا بێ.' پیاوەکان چوون کەشتییەکە گەڕان و هیچیان نەدیتەوە. ئەمجەد سوار بوو گەڕاوە بۆ کۆشک. دڵەڕاوکێ حەجمینی لێ بڕیبوو هەر چاوی لەوبەرەوبەر دەکرد. لەسەر دیوارێکی ماڵەکە ئەو بەیتە نووسرابوو:

دووری یار بڕستی لێ بڕیم خودایە
هەڵبێ ئەو خۆرەی لە ژێر هەورایە
لەشم دەلەرزێ بەبێ تینی ئەو
شەختە و سەرمایەکە لە باس نایە

"کە ئەمجەد ئەو شێعرەی خوێندەوە، یادی براکەی کرد و گریا.

"دوای ئەوە بەهرامی مەجووس هاتە نێو کەشتییەکە. بە مەلەوانەکانی گوت: 'چارۆکەکان هەڵدەن.' ئەوانیش زۆر بە پەلە چارۆکەکانیان هەڵدا. پاپۆڕەکە کەوتە ڕێ. شەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشتن. هەموو ڕۆژێ جارێک ئەسعەدیان لە سندووقەکە دێنا دەرێ و کەمێکیان نان و ئاو دەدایە. هەتا لە کێوی گڕکان نیزیک بوونەوە. لەو جەنگەیەدا بایەکی نەخوازراو هات. پاپۆڕەکەی بە لاڕێدا برد و ڕایدا. هەتا گەیشتنە شارێ کە لە قەراغ دەریاکە چێ کرابوو. ئەو شارە کۆشک و قەڵایەکی هەبوو دەیڕوانییە سەر دەریا. گەورەی ئەو شارە ژنێک بوو ناوی مەرجانە بوو. کەشتیوان بە بەهرامی مەجووسی گوت: 'ئێمە ڕێمان ون کردووە، ناچارین دەبێ لەو شارە لا دەین، کەمێ بحەسێینەوە. دوای ئەوەش بزانین چمان بەسەر دێنێ.' بەهرام گوتی: 'قسەکەی تۆ ڕاستە، با وا بکەین.' سەرۆکی کەشتییەکە گوتی: 'ئەی ئەگەر گەورەی ئەو شارە لێی پرسین ئێوە کێن و چکارەن؟ چییان وەڵام دەینەوە؟' بەهرام گوتی: 'جلی کۆیلانە لە بەر ئەو موسوڵمانە دەکەین وا لە سندووقەکە دایە. دەیبەینە دەرێ. بە گەورەی ئەو شارە دەڵێم ئێمە بازرگانین و کۆیلە دەکڕین و دەیفرۆشین. ئێستا

هەر ئەو کۆیلەیەمان پێ ماوە. ئەوانی دیکەمان فرۆشـتوون.' کەشـتیوان گوتی: 'دەی زۆر باشە. بیرێکی چاکە.'

"چارۆکەکانیان داداوە و گولمێخیان داکوتا. کەندرەکانیان بەسـت. کەشـتی ڕاوەسـتا. لەڕێوە مەرجان‌شا بە سوپایەکەوە گەیشتە سەر کەشتی. مەرجان‌شا پرسیاری کەشتیوانی کرد. کەشتیوان هاتە دەرێ، کڕنۆشی برد و کەوتە سەر چۆک. مەرجان‌شا لێی پرسی: 'ئەو کەشـتییە چی تێدایە و هاوڕێکانت چکارەن؟' کەشـتیوان گوتی: 'ئەی پاشـای جیهان، ئەمن پیاوێکی بازرگانم لەگەڵە، کاری کڕین و فرۆشتنی کۆیلەیە.' مەرجان‌شا گوتی: 'دا بانگی کە با بێتە لای خۆم.' کەشـــتیوان ئاماژەیەکی کرد و لەڕێوە بەهرام لە کەشـــتی هاتە دەرێ. ئەسعەدیش بە جلی کۆیلانەوە بەدوایدا هات هەتا گەیشتنە لای مەرجان‌شا و کڕنۆشی برد. مەرجان‌شـا لێی پرسـی: 'پیشـەی تۆ چییە؟' بەهرام گوتی: 'بازرگانی بە کۆیلەوە دەکەم.' مەرجان‌شا چاوێکی لە ئەسعد کرد و وای زانی کۆیلەیە، لێی پرسی: 'نێوت چییە؟' بە دڵێکی پڕەوە گوتی: 'ئەسعەد.' مەرجان‌شا گوتی: 'دەتوانی بنووسی؟' گوتی: 'بەڵێ، دەتوانم.' ئیدی شاژن فەرمانی دا قەڵەم و کاغەزیان بۆ هێنا و لەپێشیان دانا. مەرجارن‌پاشا گوتی: 'شتێک بنووسە.' ئەسعەد ئەو دوو بەیتەی نووسی:

نـــە کـــــونجێ بـــۆ حەسـانەوە
نـە سێبەرێ بـــۆ پشـــــــــوودان
مەلێکت لە ئاو نە کـــــــــــــردبێ
نەشـــتـدیـبێ خـۆشـــی لە ژیـان
پـێـم سـەیـرە بـۆچـی گەورەکـان
نـــاکـــــــــڕنەوە[1] زوو کۆیلەکان؟!

"کە پاشـا نووسـراوەکەی دیت، بەزەیی پێیدا هات. بە بەهرامی گوت: 'ئەو کۆیلەیەم پێ بفرۆشـــە.' بەهرام گوتی: 'پاشـــا، ئەو کۆیلەیە نافرۆشـــم، چونکە ئەوانی دیکەم هەموو فرۆشتوون. ئەوەم بۆ خۆم هێشتووەتەوە.' مەرجان‌شا گوتی: 'من ئەو کۆیلەیەم دەوێ، یان پێم دەفرۆشی، یان پێم دەبەخشی.' بەهرام گوتی: 'نە دەیفرۆشم و نە دەیبەخشم.' شاژن کە ئەوەی بیسـت، ئەسـعەدی لەگەڵ خۆی برد بۆ کۆشـک. بە بەهرامی ڕاگەیاند کە ئەگەر ئەمشـــەو لە وڵاتی من نەچێتە دەرێ، ماڵەکەی بە تاڵان دەچێ و کەشـــتییەکەشـــی تێک دەشکێنرێ. بەهرام کە ئەوەی زانی، مات بوو و گوتی: 'سەفەرێکی بێفەڕ بوو.' ئینجا هەستا و کەوتە بیری گەڕانەوە. پێداویستی ڕێگەیان تەیار کرد. بە هاوڕێکانی گوت: 'تۆشە و شتی

---

١. کڕینەوە: ڕزگار کرد.

پێویسـت دابین بکەن. لای بەیانی وەڕێ دەکەوین و دەگەڕێینەوە.' بەهرام ئاوای لێ بەسـەر هات.

"مەرجانشـا ئەسـعەدی لەگەڵ خۆی برد و چوونە سـەر قەڵا. شـوێنێکی زۆر خۆش و دڵگیر بوو. دەیڕوانییە دەریا و دەوروبەر. فەرمانی بە کەنیزەکانی دا، خواردەمەنی و شتیان بۆ هێنان. مەرجانشا ئەسعەدی تێر کرد. ئینجا گوتی: 'مەی بێنن.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەرجان‌شا فەرمانی بە کەنیزەکانی دا مەیان بۆ بێنن. لەگەڵ ئەسعەد دەستیان کرد بە بادەخواردنەوە. ئەسعەد لە دڵی مەرجان‌شا دا جێی خۆش کرد. پیاڵەی لە دەستی وەرگرت. مەرجان‌شا ئەوەندەی بادە دایە هەتا ئەسعەد سەرخۆش بوو، بۆ کاری ئاودەست چووە خوارێ. دەرگایەک لەوێ بوو. لە دەرگاکە چووە ژوورێ. ڕۆیشت هەتا گەیشتە باخێکی گەورە. باخەکە پڕ بوو، گوڵ و میوەیەکی زۆری تێدا بوو. ئەسعەد لەبن دارێک دانیشت و خۆی سووک کرد. پاشان هەستا. چوو بۆ لای حەوزێک کە لەنێو باخەکەدا بوو. لە پەنا حەوزەکەدا بە لادا هات و خەوی لێ کەوت. هەتا بوو بە شەو.

"کە بوو بە شەو بەهرامی مەجووس بانگی مەلەوانەکانی کرد: 'خێرا کەن با بڕۆین.' مەلەوانەکان گوتیان: 'باشە بە چاوان. ڕاوەستە با تونگە و شتەکانمان پڕ کەین لە ئاو جا چارۆکەکان هەڵدەدەین.' ئینجا مەلەوانەکان تونگەکانیان هەڵگرت. هاتنە دەوری قەڵا و بە شوێن ئاودا گەڕان. جگە لە دیوارەکانی قەڵا، ڕێگایەکیان نەدیتەوە پێیدا بێنە ناو قەڵاوە. بە دیوارەکان هەڵگەڕان و هاتنە نێو باخەکەوە. بە ڕێگەیەکدا ڕۆیشتن کە ڕاست دەهاتەوە لای حەوزەکە. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ئەوێ. سەیریان کرد ئەسعەد لەوێ کەوتووە. کە ناسییانەوە خۆشحاڵ بوون. خێرا تونگەکانیان پڕ کرد. ئەسعەدیشیان هەڵگرت و لە قەڵا چوونە دەرێ. بە لەز خۆیان گەیاندە کەشتییەکە و بردیانە لای بەهرام. گوتیان: 'مۆژدەمان دەیە کە دیلەکەت لەوێ لە پەنا حەوزەکە بوو. گرتمان و لەگەڵ خۆمان هێنامانەوە.' ئیدی ئەسعەدیان هێنا لەبەردەم بەهرام فڕێیان دایە سەر زەوی. کە بەهرام ئەوی دیت، لە خۆشیان خەریک بوو بفڕێ، کەیفی ساز بوو و هەموویانی خەڵات کرد. ڕۆیشتن بەرە و کێوی گڕکان. هەتا بەیان یەکسەرە ڕۆیشتن. کاری ئەمان بێرە گەیشت.

"لەو لاوە، دوای ئەوەی ئەسعەد چووە خوارێ و زۆری پێ چوو مەرجان‌شاش نیگەران بوو. هەر چاوەڕێ بوو نەهاتەوە. هەستا زۆری لێ گەڕا، نەیدیتەوە. ئیدی مۆمێکی هەڵکرد و بە کەنیزەکانی گوت: 'بۆی بگەڕێن.' خۆشی هاتە خوارێ سەیری کرد دەرکی باخ کراوەتەوە. زانی ئەسعەد چووەتە ناو باخەکەوە. مەرجان‌شا ڕۆیشتە نێو باخەکەوە. کەوشەکانی ئەسعەدی لەوێ لە لای حەوزەکەوە دیت. ئیدی تەواوی باخەکەیان سەنگ و سووژن دا، نەیاندیتەوە. هەتا بەیانی کەلێن و کولێن و بنپنچی ئەو باخە گەڕان، دیار نەبوو. دوای ئەوە مەرجان‌شا هەواڵی کەشتییەکەی پرسی. گوتیان: 'کەشتییەکە لە نیوەشەودا ڕۆیشتووە.'

"ئیدی مەرجان‌شا زانی کە هەر ئەوان ئەسعەدیان گرتووە و بردوویانە. ئەو کارەی زۆر بە لاوە ناخۆش بوو. لەسەر دڵی بوو بە داخ. تووڕە بوو خێرا فەرمووی: 'دە دانە

کەشـــتی جەنگی ســـاز کەن.' بە لەز کەشـــتی ئامادە بوون و بۆخۆشـــی لەگەڵ یەکێک لە کەشـتییەکاندا سـوار بوو. سـوپاکەشـی سـواری کەشـتییەکانی دیکە بوون. چارۆکەکانیان هەڵدان و وەڕێ کەوتن. بە کەشـتیوانەکانی گوت: 'ئەگەر کەشـتی مەجووسـەکان بگرینەوە، ئەوە هەمووتان خەڵات دەکەم. ئەگەر نەشیانگرینەوە، هەمووتان دەکوژم.' کەشتیوانەکان لە سەرێکەوە ترسیان ڕێ نیشت و لە سەرێکیشەوە خۆشی خەڵاتیان کەوتە دڵ. ئەو ڕۆژە و شەوەکەی، سبەینێ و دوو سبەکەی کەشتییان ئاژۆت هەتا کەشتی بەهرامی مەجووسییان لێ وەدەر کەوت. هێشـتا ڕۆژێ مابوو کە کەشـتییەکانی مەرجانشـا کەشـتی بەهرامی مەجووسـییان گەمارۆ دا. لەو جەنگەیەدا بەهرام ئەسـعەدی هێنابووە دەرێ و قامچیکاری دەکرد. هەر لێی دەدا و ئەســـعەد دەپاڕاوە. داوای یارمەتی دەکرد. کەس بە هانایەوە نەدەچوو. لەو کاتەدا کە لە ئەسعەدی دەدا، سەیری کرد. دەوریان بە کەشتی گیرا و گەمارۆ دران. ئیدی لێی ڕوون بوو کە دەکوژرێ. بە ناڕەحەتی و زەبوونییەوە بە ئەسـعەدی گوت: 'ئاخ لە دەست تۆ! تەواوی ئەو بەڵایانە لەبن سەری تۆ دان!'

"ئەوجا بە مەلەوانەکانی گوت: 'ئەسعەد فڕێ دەنە ناو دەریاوە.' پێی گوت: 'پێش ئەوەی من بکوژرێم، با تۆ بکوژم.' ئیدی لاقی ئەســـعەدیان گرت و لە دەریایان هاویشـــت، بەڵام چونکە ئەجەلی نەهـاتبوو چووە بن ئـاوەکەوە و هـاتەوە دەرێ. بە مەلە ڕۆیشـــت و شـــەپۆلەکانیش ڕایاندا هەتا گەیشـــتە قەراخ ئاوەکە. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە بە تەمای ڕزگاربوون نەبوو.

"ئەسـعەد کە گەیشـتە قەراخ دەریا، جلەکانی داکەند. چۆڕاندنییەوە و جوان گوشـینی. لە بەر تاوەکە هەڵیخسـتن و بۆخۆی بە ڕووتی دانیشـت و بیری لە چارەنووسـی خۆی و ئەو کێشانە کردەوە کە بە سەری هاتبوون. کەمێک گریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بێ ئـامـانج و بێ جێوڕێ کەس نـازانێ لەکوێ کەوتووم
ئای لەو ڕۆژگارە نامەردە، بە جارێ پەرێـــــوەی کردووم!
نە دێ دەنگی ئاشنایەک نە گوێیەک ببیستێ دەنـــــــگم
ســەر دەکا ئاخی گەرمی دڵ لەگەڵ هەر پشـوودانێـــــکم

"کە شـــێعرەکەی تەواو بوو، جلەکـانی لە بەر کردەوە. نەیـدەزانی بۆ کـام لا بچێ. سەرگەردان شەو و ڕۆژ دەڕۆیشت و گەڵای دار و بنچکە گیای دەخوارد. لە کانی و شتیش ئاوی دەخواردەوە. هەتا دواجار شـارێکی لێ وەدیار کەوت. ئەسـعەد لە خۆشـیان خەریک بوو بفڕێ، هەنگاوەکانی توندتر و خێراتر کردن. بەرەو شـــار ملی پێوە نا. کاتی شـــێوان گەیشتێ."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەسعەد کاتی شێوان لە دەروازەی شار نزیک بووەوە و دەروازە داخرا. ئەو شارە هەر ئەو شارە بوو کە ئەسعەد تێیدا زیندانی کرابوو. ئەمجەدی براشی پلەی وەزیری ئەو شارەی بوو. کە ئەسعەد زانی دەروازە داخراوە، گەڕاوە، چوو بۆ گۆڕستان. کە چووە ئەوێ، سەیری کرد ئەوە دەرکی قسنێک کراوەتەوە، چووە نێو قسنەکەوە و لەوێدا نووست.

"بەهرامی مەجووس بە فێڵ و کەڵک لە دەست سوپاکەی مەرجانشا ڕزگاری ببوو بە دەماخ و خۆشییەوە گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان. کە گەیشتنەوە، ئەویش لە کەشتییەکە دابەزی و ڕووی کردە گۆڕستانەکە. هەر بەڕێکەوت، ئەویش چاوی بە دەرکی ئەو قسنە کەوت کە ئەسعەد لەوێدا خەوتبوو. سەرنجی دایە دانەخرابوو. پێی سەیر بوو گوتی: 'ئەوە بۆ دانەخراوە؟ دەبێ چاوێکی لێ بکەم بزانم بۆ دانەخراوە.' کە چووە پێشێ و سەرنجی دایە، ئەسعەدی دیت لەوێدا خەوتووە. بەهرام سەری بردە ژووری و ناسییەوە. پێی گوت: 'ئەی موسوڵمانی گلاو ئەوە هێشتا هەر ماوی؟!' ئیدی گرتی و بردییەوە ماڵەکەی خۆی. ساردابوێکی هەبوو تایبەتی ئازاردانی موسوڵمانان. کچێکی هەبوو ناوی 'بوستان' بوو. هێنای ئەسعەدی کۆت و زنجیر کرد. بە کچەکەی گوت: 'شەووڕۆژ ئازاری بدە هەتا دەیکوژی.' ئینجا بۆ خوی بە قامچی ئەوەندەی لێ دا تا تەواوی گیانی خوێنی تێ زا. ئەوجا کلیلەکەی دا بە کەنیشکەکەی و بۆخۆی ڕۆیشت. کاتێک بوستانی کچی بەهرام بۆ ئازاردانی ئەسعەد هاتە ساردابوەکە، سەیری کرد ئەسعەد کوڕێکی ئارام، سیما پاک، قۆز، چاو و ڕەش و برۆی کەوانییە، دڵی چووە سەری. ڕووی لە ئەسعەد کرد و گوتی:

ئەی پەریزاد، نازانم چۆنە ڕێت ون کردووە؟!
کوڕی ئەوەندە جوانم تا ئێستا نەدیتووە
ڕاستت بوێ، ناتوانم هەستی دڵم وەشێرم
ئەوینت لە دڵمدا کارێکی وای کردووە

"دوای ئەوە بە ئەسعەدی گوت: 'ناوت چییە؟' گوتی: 'ناوم ئەسعەدە.' بوستان گوتی: 'ئەتۆ بەختەوەری و ئەو ڕۆژگارەش بەختەوەرە کە تۆی تێدای. بە ڕاستی تۆ شیاوی ئازاردان نیت. من هەر لە سەرەتاوە زانیم تۆ ستەمدیدەی.'

"بەو جۆرە بوستانی کچی بەهرام بە قسەی خۆش ئۆخژنی دەخستە دڵی ئەسعەدەوە و وردەوردە هۆگری دەبوو. دوای ئەوە دەست و پێی کردەوە و لە بارەی دینی ئیسلامەوە

پرســـیاری لێ کرد. ئەســـعەد گوتی: 'دینی ئیســـلام دینێکی ڕەوا و پتەوە. پێغەبەرەکەی موحەممەدە، درود و ســـڵاوی خودای لێ بێ. خاوەنی پەرجوو و ئایاتە. جا ئاور ناتوانێ چاکەی بۆ کەس هەبێ، فریای کەس بکەوێ یان زیان بە کەس بگەیەنێ.' بەو شـــێوە ڕێوشـوێنی دینی ئیســلامی بۆ بوســتان شــی کردەوە. بوســتان وردەوردە دڵی نەرم بوو خۆشەویستی ئەسعەد بووە هۆی ئەوە کە بوستان دەرکی زەین و دڵی بۆ ئیسلام بکاتەوە. وا بوو شــادەوئیمانی هێنا. هاتە ڕیزی بەختەوەرانی ڕێبازی هەقەوە. ئیتر نان و ئاوی دەدا بە ئەســعەد. پێکەوە نوێژیان دەکرد. خواردەمەنی وزەبەخشــی دەدایە هەتا ئەســعەد تەواو هاتەوە سەر خۆ و بووژاوە. ئیتر جەستەی خۆی گرتەوە و تین و گوڕی هاتەوە بەر.

"ڕۆژێک بوســتان لە لای ئەســـعەد هاتە دەرێ و لە بەردەرگا ڕاوەســتا بوو گوێی لە دەنگی جارچی بوو دەیگوت: 'هەرکەس لاوێکی بەو نـاو و نیشـــانە لە لا بێ و بە ئێمە ڕاگەیەنێ، هەرچی بوێ پاشـا دەیداتێ و خەڵاتی دەکا. بەڵام ئەگەر ئەو کەســەی لە لا بێ و بیشـــارێتەوە و دەنگ نەکا، کە پێمان زانی لە بەردەرگاکەی خۆی هەڵیدەواســـین. ماڵەکەی تاڵان دەکرێ و وەچەی دەبڕدرێتەوە.' ئەسـعەدیش تەواوی بەسـەرهاتی خۆی بۆ بوسـتان گێڕابووەوە. زانی کە ئەوە بەدوای ئەســـعەدەوەن. ئیدی خێرا چووەوە بۆ لای ئەســـعەد. قسەکانی جارچی بۆ گێڕاوە. ئەسعەدی لە ساردەوەکە هێنا دەرێ و ناردی بۆ ماڵی وەزیر. ئەسعد لە دوورەوە کە وەزیری دیت، ناسییەوە. گوتی: 'بە خودا ئەوە ئەمجەدی برامە.'

"ئەســـعەد چووە بارەگای وەزیر. هەرکە چاویان پێک کەوت، یەکتریان ناســـییەوە. باوەشـــیان پێکدا گرت. گریان و پێکەنینیان تێکەڵ ببوو. خزمەتکار و شـــتەکانیان دەوریان دان. هەردووکیـان لە هۆش خۆیـان چوون. مـاوەیەک بوورانەوە. گوڵاویـان بەســـەردا هەڵپرژاندن و هاتنەوە سەر خۆ. کە وە هۆش هاتنەوە، ئەمجەد ئەسعەدی بردە لای سوڵتان و بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕاوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و سێ و شەشم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ســـوڵتان فەرمانی دا بچن ماڵی بەهرامی مەجووس تاڵان بکەن. وەزیر تاقمێکی نارد بۆ تاڵانی ماڵەکە. پیاوەکانی وەزیر چوون ماڵەکەیان تاڵان کرد و هەر وەک وەزیر ڕایســپاردبوون، بوســتانی کچی وەزیریان هێنا بۆ لای وەزیر. ئەمجەد زۆری ڕێز لێ گرت. دوای ئەوە ئەمجەدیش بەســـەرهاتی خۆی لەگەڵ کیژۆڵەکە و بەهادور بۆ گێڕاوە. هەردووکیان ئەو دەرد و پەندانەی لە ماوەی دابڕانەکەوە بەســـەریان هاتبوو بۆ یەکتریان گێڕاوە. دوای ئەوە بەهرامی مەجووسـییان هێنا و فەرمانی کوشـتنیان دا. بەهرام گوتی: 'پاشـــا، هەر بە تەمای بمکوژی؟ پاشـــا گوتی: ئەرێ هەر دەتکوژم.' بەهرام گوتی: 'باشە دەرفەتێکم دەنێ.' ئەوەی گوت و سووژدەی بۆ برد. پاشان سەری بەرز کردەوە و شـەهادەتەینی هێنا و لەســەر دەسـتی سـوڵتان موسـوڵمان بوو. ئەو خەڵکەی لەوێ بوون هەموو دڵخۆش بوون. ئینجا ئەمجەد و ئەسعەد تەواوی بەسـەرهاتی خۆیان لە سـەرەتاوە تا کۆتایی بۆ بەهرام گێڕاوە. بەهرام پێی گوتن: 'گەورەکانم، ئامادە بن منیش لەگەڵتان دێم بۆ.'

"ئەمجەد و ئەسـعەد خۆشیان لە قسەکەی هات و دەستیان کرد بە گریان. بەهرام پێی گوتن: 'گەورەکان، مەگرین و هێور بن. نیگەران مەبن. بە خزم و کەسەکانتان شاد دەبنەوە. هەروەک چۆن نیعمەت و نیعەم پێک شـاد بوونەوە.' ئەمجەد و ئەسـعەد پرسـیان: ' ئەوانە کێن؟ دا توخودا بەسەرهاتی ئەوانیشمان بۆ بگێڕەوە.'

### بەسەرهاتی نیعمەت و نیعەم

"بەهرام گوتی: 'دەگێڕنەوە لە کووفە پیاوێکی لێ بوو لە گەورەکانی شـــار. کە پێیان دەگوت ڕەبیعی کوڕی حاتەم. پیاوێکی دەوڵەمەند و حەســاوە و خۆشـگوزەران بوو. خودا کوڕێکی دابوویێ کە ناوی نیعمەتوڵڵا بوو. ڕۆژێک ڕەبیع بە لای بازاڕی کەنیزفرۆشـــاندا ڕۆیشـت. چاوی بە کەنیزێک کەوت، هێنابوویان بیفرۆشـن. کیژۆڵەیەکی چکۆلەش لە پەنای ڕاوەستابوو. ڕەبیعی کوڕی حاتەم بە کەنیزفرۆشەکەی گوت: 'ئەو کەنیزە بە کچەکەیەوە بە چەندە؟' کەنیزفرۆش گوتی: 'بە پەنجا دینار.' ڕەبیع گوتی: 'بەڵێننامەکەی بنووســـە. نرخی خۆت وەرگرە و کەنیزەکەم ڕادەســـت کە.' بەو جۆرە ڕەبیع پارەکەی بۆ ژمارد و حەقی دەلالییەکەشـــی دایە. کەنیز و کچەی هێناوە ماڵی خۆی. کچە مامی ڕەبیع کە ئەو کەنیزەی دیت، گوتی: 'ئامۆزا، ئەو کەنیزەت بۆ چییە؟' ڕەبیع گوتی: 'ئەو کچەم زۆر پێ جوان بوو، بۆیە ئەو کەنیزەشـــم کڕی. ئەو کچە ئەگەر گەورە بێ، لە وڵاتی عەرەب و عەجەمدا شـــتی

ـەوەندە جوانی تێدا نابێ.' کچە مامەکەی بە کەنیزەکەی گوت: 'ناوت چییە؟ ناوی کچەکەت چییە؟' کەنیزە گوتی: 'ناوی خۆم تەوفیق و ناوی کچەکەشم سوعدایە.' گوتی: 'ڕاست ـدکەی ئەو سوعدایە و هەرکەس ئەوەشی کڕیوە سەعیدە.' دوای ئەوە گوتی: 'ئامۆزا، ناوی ـمنی چی؟' ڕەبیع گوتی: 'هەرچی تۆ پێت خۆش بێ.'

"کچە مامی ڕەبیع گوتی: 'نیعەم.' ڕەبیع گوتی: 'ناوێکی خۆشت بۆ دیتەوە.' ئیدی نیعەمی ـ ـروک لەگەڵ نیعمەتی کوڕی ڕەبیع لە ماڵێکدا پەروەردە کران. هەتا تەمەنیان بوو بە دە ـسال. هەردووکیان یەک لە یەک جوانتر و لەبەردڵانتر بوون. نیعمەت بە نیعەمی دەگوت ـ ـدە و ئەویش بە نیعمەتی دەگوت کاکە. دوای ئەوەی تەمەنی نیعمەت گەیشتە دە ساڵ[1]، ـوکی نیعمەت ڕەبیعی کوڕی حاتەم بە نیعمەتی گوت: 'کوڕەکەم، ئەوە خوشککی تۆ نییە، بەڵکوو ئەوە کەنیزتە. بۆ تۆم کڕیوە. لەمەو دوا ئەتۆ پێی مەڵێ دادە یان خوشکێ.'

"ئینجا نیعمەت چووە لای دایکی و ئەوەی لە دڵیدا بوو پێی گوت. دایکیشی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە کەنیزی تۆیە.' ئیدی نیعمەت و نیعەم پێکەوە گەورە بوون و یەکتریشیان زۆر خوش دەویست. نۆ ساڵیش بەسەر ئەوەدا تێپەڕی ئەوان ئاوا پێکەوە ژیان. لە کووفەدا کەنیزی ئەوەندە جوان و چاکی تێدا نەبوو. کەس لە جوانیدا بەو نەدەگەیشتەوە. قورئان و خۆشنووسی و زانستەکانی دیکە هەموو فێر ببوو. شەترەنج و یارییەکانی دیکەشی زۆر چاک دەزانی. لە دابونەریتی گۆرانی و ئامێرە مۆسیقییەکانیش شارەزاییەکی تەواوی هەبوو. بە جۆرێک کە لە زەمانی خۆیدا تای نەبوو. وا بوو ڕۆژێک لەگەڵ خاوەنەکەی، نیعمەت کوڕی ڕەبیع، دانیشتبوون خەریکی خواردنەوە بوون. نیعەم دەستی دا عوود و تارەکانی توند کردنەوە و ئەو دوو بەیتە شێعرەی گوت:

بڕوا مەکە ئەگەر بیستت بێجگە لە تۆ یارم هەیە
یان جگە لە فکر و خیاڵی تۆ فکری ترم هەیە
هەر ئەمن نیم کەوتوومە ناو ئاڵقەی داوی کەزیەتەوە
بە تاڵێک بسکی خۆتەوە هەزارانت بەستووەتەوە

"نیعمەت لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو بە نیعەمی گوت: 'تۆ گیانی من بە دەف و ئامێری شادیهێنەوە گۆرانیم بۆ بڵێ.' دوای ئەوە چەند ئاوازێکی زۆر خۆشی لێ دا و ئەو بەیتانەی گوت:

---

١. لە دیاری کردن تەمەنی ئەو منداڵانەدا سەرچاوەکان لەگەڵ یەک ناکۆکن.

که بڵێم من کـــــــارم به تـــۆ نەداوه
دار و دیوار هـــــــاوار دەکا: پێت داوه
که ســــەرکۆنەم بکەن و لێم بدەن تـانه
دەڵێم: تا تۆیان نەدیوه حەقـــــــیانه

"نیعمەت گوتی: 'نیعەم، خودا بتپـارێزێ.' ئیـدی خەریکی عەیش و نۆش بوون. تـا ناوبانگی کچه به گوێی حەجاج گەیشـــتەوه. مەمنا خەلیفەش داوای کەنیزی لێ کردبوو ڕۆژێک له دیوی کارەکەی خۆی دانیشـــتبوو به خۆی گوت: 'دەبێ ڕێگایەک ببینمەوه ئەو کەنیزەی نێوی 'نیعەم'ه بگرم و بینێرم بۆ لای خەلیفه عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان. چونکه له کۆشـــکی خەلیفەدا کەســـی ئەوەنده جوانی تێدا نییه. کەس دەنگ و ئاوازی ئەوی نییه.' دوای ئەوه کەوته بیرەوه. پیرێژنێک بوو له فڕوفێڵ و چاوبەســـتیدا دەســـتی شـــەیتانی لەپشـتەوه بەسـتبوو. ناردی ئەو پیرێژنه بێنن. پیرێژنەیان هێنا. حەجاج پێی گوت: 'دەچی بۆ ماڵی ڕەبیعی کوڕی حاتەم. لەگەڵ کەنیزەکەیدا خۆت ڕێک دەخەی. وردەورده کارێک دەکەی به فێڵێک بیهێنییه دەرێ تا بیگرین و بۆ خەلیفەی بنێرین، چونکه بیســـتوومه له دنیادا ئافرەتی ئاوا دەلالی تێدا نییه.' پیرێژنه بەڵێنی هاوکاری پێ دا. بۆ بەیانی جلوبەرگی خواپەرستانەی له بەر کرد. تەسبێحێکی هەزار دەنکی له ملی کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# که شەوی دووسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پیرێژنە تەسبیحی هەزار دەنکی بە ملیدا کرد. گۆچانی بە دەستەوە گرت و ڕۆیشت. لە بەر خۆیەوە هەر دەیگوت: 'سوبحانەڵڵا، ئەلحەمدولیلا، لائیلاهە ئیلەڵڵاهو ئەڵڵاهوئەکبەر.' ئیدی ئاوا بەردەوام ناو و یادی خودای لەســـەر دەم بوو. بە دڵیش هەر لە بیر فریودانی ئەم و ئەودا بوو. بەو جۆرە ڕۆیشت هەتا گەیشتە ماڵی نیعمەتی کوڕی ڕەبیع و لە دەرگـای دا. دەرکەوان دەرگـای کردەوە. بە پیرێژنەی گوت: 'چیـت دەوێ؟' گوتی: 'هەژار و بەندەیەکی خودام، کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، دەترســم نوێژەکەم بچێ. دەمەوێ لەو ماڵە بەفەڕەدا نوێژەکەم بکەم.' دەرکەوانەکە گوتی: 'خۆ ئێرە مزگەوت نییە دەسـت بکەی بە پاڕانەوە و لاڵانەوە.' پیرێژنە گوتی: 'دەزانم مزگەوت نییە، بەڵام هیچ جێگایەک بە قەد ماڵی نیعمەتی کوڕی ڕەبیع پاک و بەفەڕ نییە. ئەمن یەکێک لە دایەنەکانی دارولخەلافەم. هەر بۆ سـەیران و خوداپەرسـتی هاتوومەتە دەرێ.' دەرکەوان گوتی: 'ئەمن ناهێڵم بچیتە ژوورێ.' بەو جۆرە باسەکەیان لێ درێژ بووەوە. پیرێژنە بۆی چووە پێشێ و یەخەی گرت و گوتی: 'منێک کە دەچمە ماڵی ئەمیران و وەزیران، تۆ ناهێڵی بچمە ماڵی نیعمەتی کوڕی ڕەبیع؟' لەو جەنگەیەدا نیعمەت هاتە دەرێ و قسەی پیرێژنەی بیست. پێکەنی و گوتی: 'بەدوای مندا وەرە.' بۆخۆی ڕۆیشـت و پیرێژنەش بەدوایدا ڕۆیشـت هەتا گەیشـتنە لای نیعەم. پیرێژنە سڵاوی لێ کرد. سەری لە جوانی و ڕێکوپێکی نیعەم سوور ما.

"ئینجا پیرێژنە هەسـتا چوو دەسـنوێژی شـۆرد و دەسـتی کرد بە نوێژکردن. بەردەوام هەر خەریکی ڕکووع و سـووژدە و هەسـتانەوە بوو هەتا بوو بە شـەو. نیعەم گوتی: 'دایە، تۆزێک بحەسێوە و وەرە دانیشە.' پیرێژنە گوتی: 'ڕۆڵە، هەرکەس بە تەمای ڕۆژی پەسڵان بێ، دەبێ لەم دنیایە ڕەنجی بۆ بکێشـــێ. هەرکەس لەم دنیایە هیچ هەوڵی بۆ نەدا، ڕۆژی پەسڵان ناچێتە ڕیزی چاکەکارانەوە.' نیعەم هەستا چوو خواردەمەنی بۆ هێنا. لەپێشی داینا و پێی گوت: 'نـان بخۆ و دوعـام بۆ بکە کە خودا لە هەڵە و ئـاکاری خراپم خۆش بێ.' پیرێژنە گوتی: 'ڕۆڵە، ئەمن بەڕۆژووم، ئەتۆ کیژۆڵەیەکی تازەنەمامی، خواردن و خواردنەوە بۆ تۆ باشە. خودا لێت خۆش بێ و تۆبەت قەبووڵ کا.'

"بە کورتی، کەنیزە ماوەیەک لەگەڵ پیرێژنە دانیشـت و قسـەیان کرد. ئەوجا بە نیعمەتی گوت: 'گەورەم، دا تۆ خودا بە دایەپیرە بڵێ مـاوەیەک لە لای ئێمە بمێنێتەوە، ئـاخر هەر نووری ئیمانی لێ دەبارێ.' نیعمەت گوتی: 'دەی باشــە دیوێکی بۆ خاڵی کە با بۆخۆی هەر لەوێدا خەریکی خواپەرسـتی بێ. مەهێڵە کەس بچێتە لای و ســەرودڵی بگرێ، بەشــکوو بەبۆنەی ئەوەوە خودا ئێمەش لێک نەکا و ماڵمان لێ تێک نەدا.'

"ئیدی پیرێژنە ئەو شـــەوە هەتا بەیانی لەوێ مـاوە. جارێک نوێژی دەکرد، جارێک خەریکی قورئان خوێندن و زیکر و پاڕانەوە دەبوو. کە ڕۆژ بووەوە، پیرێژنە هەسـتا چوو بۆ لای نیعمەت و نیعەم. سـڵاو و بەیانیباشـی لێ کردن. ویسـتی ماڵاواییان لێ بکا. نیعەم پێی گوت: 'دایە، بۆ کوێ دەچی؟ ئەوە نیعمەت پێی گوتم کە دیوێکت بۆ تەرخـان بکەم، بۆخۆت لەوێدا خەریکی خوداپەرسـتی بی.' پیرێژنە گوتی: 'خودا خاوەنی تۆ لە شـــەڕی شـــەڕخوازان و چاوچنۆکان بپارێزێ و ڕۆزیتان زیاد کا. نەوەڵا بەس تکایەکم هەیە بە دەرکەوانەکەتان بڵێ ئەگەر جارێکی دیکە ویستم بێم، ڕێم لێ نەگرێ. ئەمن دەچم بۆ شوێنە پیرۆزەکان. لەوێ حەتمەن بۆتان دەپاڕێمەوە. دوای هەموو نوێژ و عیبادەتێکم دەپاڕێمەوە خودا لێتان خۆش بێ.' دوای ئەوە وەدەر کەوت. کەنیزە فەقیرەکە بۆی دەگریا نەیدەزانی لەبەر چی هاتووە و چ پیلانێکی گڵاوی لەبن سەردایە.

"دوایی پیرێژنە چووەوە لای حەججاج. حەججاج پێی گوت: 'شـێری یا ڕێوی؟' پیرێژنە گوتی: 'چوومە لای کەنیزەکە و دیتم، تا ئێسـتا هیچ دایکێک جوانی ئاوای لێ نەبووە.' حەججـاج گوتی: 'ئەگەر کـارەکەت جێبەجێ بێ، قـازانجێکی زۆری بۆ منیش و بۆ تۆش تێدایە.' پیرێژنە گوتی: 'مانگێکم دەرفەت لێت دەوێ.' گوتی: 'بڕۆ بە مانگێک جێبەجێی کە.' دوای ئەوە پیرێژنە بەردەوام هاتوچۆی ماڵی نیعمەتی دەکرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پیرێژنە هاتوچۆی ماڵی نیعمەت و نیعەمی دەکرد و ئەوانیش ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر لایان بەشکۆتر دەبوو و ڕێزیان زیاتر لێ دەگرت. پیرێژنە زۆر شەو و ڕۆژی لەوێدا بەسەر دەبرد. هەتاکو ڕۆژێک لەگەڵ نیعەم دووبەدوو مانەوە. پێی گوت: 'هەر کاتێک دەچمە شوێنە پیرۆز و پاکەکان، دوعات بۆ دەکەم و خۆزگە دەخوازم تۆشم لەگەڵ بایە هەتا لە نیزیکەوە بارەگای ئەو شێخ و مشایخانەی بە پلەی وساڵ گەیشتوون، ببینی و لەبەریان بپاڕێیەوە و ئەوانیش دوعات بۆ بکەن بەو ئاواتانەت بگەی کە لە دڵتدایە.' نیعەمیش گوتی: 'دایە، تۆ خودا منیش لەگەڵ خۆتدا بەرە.' پیرێژنە گوتی: 'ڕوخسەت لە خەسووت بخوازە، دەتبەم.' نیعەم چوو بە دایکی نیعمەتی گوت: 'دایە، بە نیعمەتی خاوەنم بڵێ مۆڵەتمان بدا ڕۆژێک من و تۆش لەگەڵ دایە بچینە دەرێ هەتا لە شوێنە پیرۆز و پاکەکان کەمێک نوێژ و عیبادەت بکەین.' وا بوو نیعمەت هاتەوە و دانیشت، پیرێژنە چووە بەرەوە و دەستی ماچ کا. نیعمەت نەیهێشت. ئیدی پیرێژنە نزای بۆ کرد و لە ماڵەکەی چووە دەرێ و ماڵاوایی کرد. بۆ ڕۆژی دوایی پیرێژنە هاتەوە. نیعمەت لە ماڵێ نەبوو. ڕووی لە نیعەم کرد و گوتی: 'دوێ شەو زۆرم دوعا بۆ کردی، ئێستا هەستە با کەمێک بچینە دەرێ. یەک-دوو شوێن دەچین و پێش ئەوەی خاوەنت بێتەوە، زوو دەتهێنمەوە.' نیعەم بە خەسووی گوت: 'دایە تۆ خودا ڕێم بدە با لەگەڵ داپیرەدا هەتا دەرەوە بچم. یەک-دوو شوێنی پاکم پیشان دەدا و پێش ئەوەی خاوەنم بێتەوە، زوو دێینەوە.' خەسووی گوتی: 'ئەمن لەوە دەترسم نیعمەت بتبینێ.' پیرێژن گوتی: 'بە خودا ناهێڵم دانیشێتە زەوی، هەر بە پێوە کەمێکی دەگێڕم و خێرا دەگەڕێینەوە.'

"پیرێژنە بەو کەڵەکە کەنیزەی هێنا دەرێ. بردی بۆ کۆشکی حەججاج. کە چوونە کۆشک، کەنیزەکەی لە دیوێک دانا. بۆخۆی چوو حەججاجی ئاگادار کردەوە. حەججاج هات و چاوی پێی کەوت. سەیری کرد لە دنیادا هاوتای نییە و نەبووە. نیعەم کاتێک حەججاجی دیت، ڕووی داپۆشی.

"حەججاج لەوێ دوور نەکەوتەوە و داوای کرد پەردەدار بێ و پەنجا سواریش لەگەڵ خۆی بێنێ. پەردەدار بە پەنجا سوارەوە هات. پێی فەرموو ئەو کەنیزە سواری ئەسپێک بکەن و بیبەن بۆ دیمشق و بیدەنە دەست خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان.' نامەیەکیشی بۆ نووسی و گوتی: 'ئەو نامەیەش بدە دەست خەلیفە. وەڵامەکەشیم بۆ بێنەوە. زووش بگەڕێنەوە.'

"پەردەدار کەنیزەی سواری ئەسپێک کرد. بەرەو دیمشق وەڕێ کەوت. کەنیزە لە تاوی

خاوەنەکەی بەردەوام دەگریا هەتا گەیشـــتنە دیمشـــق. پەردەدار چوو ڕوخســـەتی دیداری خەلیفەی خواســـــت و چووە لای. هەواڵی بردنی کەنیزەکەی دایە. خەلیفە کەنیزەی لە کۆشـــکێکدا دانا. دوای ئەوە چووە حەرەمســـەرا و بە خێزانی گوتی: 'حەججاج کەنیزێکی لە پاشـــاکانی کووفەوە بە دە هەزار دینار بۆ کڕیوم. ئەو نامەیەشـــی لەگەڵ ناردووە.' خێزانی خەلیفە پێی گوت: ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کاتێک خەلیفە باســـی ئەو کەنیزەی بۆ خێزانی کرد. خێزانی گوتی: 'خودا لە ڕەحمەتی خۆییت بێبەری نەکا.' دوای ئەوە خوشـکی خەلیفە چووە لای کەنیزەکە. کە ئەوی دیت، گوتی: 'بە خودا کڕیار ئەگەر سەد هەزار دیناریش بدا قەت زیان ناکا.' ئینجا کەنیزە گوتی: 'جوانێ، ئەو کۆشـکە هی کێیە و ئەم شـارە کوێیە؟' خوشـکی خەلیفە گوتی: 'ئەم شـارە دیمشـقە. ئەم کوشـکەش کۆشـکی خەلیفەی برام، عەبدلمەلیکی کوڕی مەروانە.' دوای ئەوە بە کەنیزەکەی گوت: 'بۆ تۆ ئەوەت نەزانیبوو؟!' گوتی: 'نـاوەڵلا خـانم، ئەمن بەوانەم نەزانیوە.' خوشـکی خەلیفە گوتی: 'ئەوەی تۆی فرۆشـت و پارەکەی تۆی وەرگرت، بە تۆی نەگوتووە کە خەلیفە تۆی کڕیوە؟' کاتێک نیعەم ئەوەی بیســـت، ڕۆندک لە چاوی هـاتە خوارێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خودا پیرێژنە کـاری خۆی کرد. ئێســـتـا ئەگەر قســـەیەکیش بکەم، باوەڕم پێ ناکەن. وا چاکە هەر بێدەنگ بم. بزانم خودا بۆخۆی بە ڕەحمی خۆی چیم لەگەڵ دەکا.' ئیدی تەریق بووەوە و ســـەری داخســـت. ســـەر گۆناکانی سوور هەڵگەڕان. دوای ئەوە خوشکی خەلیفە ڕۆیشت. ڕۆژێکی دیکە هاتەوە لای. جلی دیبا و ملبەندی گەوهەرنیشـانی بۆ هێنا. خەلیفەش هات لە پەنای دانیشـت. خوشـکی خەلیفە پێی گوت: 'چاو لەو کەنیزە کە چەندە جوان و لەبەردڵان و بێهاوتایە.' خەلیفە بە نیعەمی گوت: 'ئەو ڕووبەندەت لا دە.' نیعەم ڕووبەندەکەی لا نەبرد و خەلیفە چاوی پێی نەکەوت، بەڵام قامکەکانی دیت. خۆشـــەویســـتی ئەو لە دڵی خەلیفەدا کاری خۆی کرد. بە خوشـــکی گوت: 'ئەمن هەتا ســـێ ڕۆژان نایەمە لای تا تەواو هۆگری تۆ نەبێ.' دوای ئەوە خەلیفە هەســـتا. ڕۆیشـــت. کەنیزەکە ســـەری لەو کارەی خۆی ماســـیبوو. لە دڵی خۆیدا هەر داخموڕۆی نیعمەتی بوو. کە بوو بە شـــەو نەخۆش کەوت. یاو و نۆبەتێیەکی هاتێ، ســـەیر. نە هیچی دەخوارد و نە هیچی دەخواردەوە. ڕەنگی ڕەزد بوو. چوون بە خەلیفەیان ڕاگەیاند. خەلیفە زۆری پێ ناخۆش بوو. نۆژداریان هێنا سـەری. کەس لە دەردی نەدەگەیشـت. کەنیزە ئەوە لێرە ئاوای لێ هات.

"بەڵام نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی خاوەنی کە هاتەوە ماڵێ کەنیزەکەی نەدیت، گازی کرد. هیچ دەنگی نەبوو. خێرا هەستا و توند هەرای کرد، کەس بە هاوارییەوە نەهات. کەنیزەکانی دیکە هەمووی لە ترســـی خاوەنەکەیان خۆیان شـــاردەوە. ئیدی نیعمەت هاتە دەرێ و چوو بۆ لای دایکی. ســـەیری کرد ئەوە دایکی دانیشـتووە و دەسـتی کردووەتە کوڵەکەی چەنەی. گوتی: 'دایە، نیعەم چووە بۆ کوێ؟' گوتی: 'ڕۆڵە، لەگەڵ کەســـێک ڕۆیشـــتووە لە من جێی باوەڕتر و دڵســـۆزترە.' نیعمەت گوتی: 'ئەو کەســـە کێیە؟' دایکی وەڵامی داوە: 'ئەو کەســـە پیرێژنە ئـاکـارجوان و چـاکەکـارەکەیە. بردی بۆ لای هەژاران و زیـارەتی نەزەرگەی

پیاوچاکان و دەگەڕێتەوە.' ئیدی نیعمەت گوتی: 'ئاخر ئەو کەی کاری ئاوای کردووە؟ کەی چووەتە دەرێ؟' دایکی گوتی: 'لە بەیانییەوە چووەتە دەرێ.' نیعمەت بە دایکی گوت: 'تۆ بۆ هێشتت؟' دایکی نیعمەت گوتی: 'ڕۆڵە، ئەو بە ئارەزووی خۆی چوو.'

"ئیدی نیعمەت لە ماڵ چووە دەرێ. بەڵام لە خۆڕا چوو. چوو بۆ لای داڕۆغە و پێی گوت: 'ئەرێ تۆ فریوم دەدەی و بە فێڵ کەنیز لە ماڵەکەی من دەبەیتە دەر؟ منیش ناچارم هەستم لێرەوە بچم بۆ دیمشق بۆ لای خەلیفە شکایەت بکەم.' داڕۆغە گوتی: 'کێ کەنیزی تۆی بە فێڵ بردووەتە دەرێ؟' نیعمەت گوتی: 'ئەو پیرێژنەی ئاکاری ئاوائاوا و جلوبەرگی پەشمی لەبەر کردبوو و تەسبێحی هەزار دەنکی پێ بوو.' داڕۆغە گوتی: 'تۆ ئەو پیرێژنەم پیشان بدە، با کەنیزەکەتی لێ بستێنمەوە.' نیعمەت گوتی: 'جا کێ پیرێژنە دەناسێ؟' داڕۆغە گوتی: 'لایعلم الغیب الا الله.' داڕۆغە دەیزانی کە ئەو کارە کاری پیرێژنە جادووبازەکەی حەججاجە. نیعمەت پێی گوت: 'من هەر تۆ دەناسم. دەنا دەچم لە لای حەججاج شکایەت لێ دەکەم.' داڕۆغە گوتی: 'دەچیتە هەر کوێ بچۆ'. نیعمەت هەستا چوو بۆ کۆشکی حەججاج. بابی نیعمەت یەکێک لە گەورەگەورەکانی کووفە بوو. کاتێک چوو بۆ کۆشـــکی حەججاج، پەردەدار چووە لای حەججاج و بابەتەکەی بۆ گێڕاوە. حەججاج بە پەردەداری گوت: 'بیهێنە لای من.' کاتێک نیعمەتی کوڕی ڕەبیع چووە لای حەججاج، حەججاج گوتی: 'ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟' نیعمەت گوتی: 'شتێکی سەیرم بۆ هاتووەتە پێشێ.' پاشان ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. حەججاج گوتی: 'داڕۆغە بانگ کە بێتە ئێرە.' داڕۆغە هات و فەرمانی پێ دا بچێت پیرێژنە بێنێتە ئەوێ و گوتی: 'کەنیزی نیعمەتی کوڕی ڕەبیعم لە تۆ دەوێ.' داڕۆغە گوتی: 'لا یعلم الغیب الا الله.' حەججاج گوتی: 'چارە نییە، دەبێ سوار بی و تەواوی ڕێگاکانیش بگەڕێی و شار بپشکنی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، حەججاج بە دارۆغەی گوت: 'دەبێ سوار بی و تەواوی کۆڵان و کەرەک و ڕێگاوبانەکانی شار بگەڕێی و شار بپشکنی.' دوای ئەوە ڕووی کردە نیعمەت و گوتی: 'ئەگەر کەنیزەکەت نەدۆزرایەوە، من دە کەنیزی خۆم و دە کەنیزیش لە دارۆغە دەستێنم و دەتدەمێ.' ئینجا بە دارۆغەی گوت: 'بۆ ڕاوەستاوی؟! برۆ!' دارۆغە چووە دەرێ. نیعمەت تەواو مات و مەلوول و لە ژیان بێهیوا بوو. ئەو چواردەساڵان بوو هێشتا خەتی نەدابوو. ئیدی دەستی کرد بە گریان ڕۆیشتەوە ماڵ. وای لێ هات نەدەچووە نێو خەڵک هەر لە ماڵەوە دادەنیشت. پاشان بابی ڕووی تێ کرد و گوتی: 'ڕۆڵە، حەججاج بە فێڵ کەنیزەکەی بردووە، بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێ خودا پەردە لەسەر تاوانەکەیان هەڵدەداتەوە.'

"بە کورتی، خەم و پەژارە وای لە نیعمەت کرد تەواو کاسی کرد. ئەوانەی دەهاتنە لای، نەیدەناسینەوە. سێ مانگ بەو جۆرە ژیا. دوای ئەوە تەواو تێک چوو. بابی دەستی لێ شورد و نۆژدارەکان هاتنە سەری و گوتیان: 'جگە لە کەنیزەکەی، هیچ دەرمانێک کاریگەر نابێ.'

"ڕۆژێک لە ڕۆژان نۆژدارێکی عەجەم[1] کە لە کاری دەرمان و ئەستێرەناسیدا لەناو خەڵکدا ناسراو بوو، هاتە ئەو شارە. ڕەبیع بانگی کرد. نۆژدارەکە هات، ڕەبیع لە پەنا خۆی داینا و ڕێزی لێ گرت. دەستی قەدری لێ نا. پێی گوت: 'چاوێک لە کوڕەکەم بکە.' نۆژدار شواری گرت. چاوێکی لێ کرد، پێکەنی و گوتی: 'کوڕە وا دیارە تۆ نەخۆشی دەروونیت هەیە.' ڕەبیع گوتی: 'ڕاست دەفەرمووی، ئێستا فاڵێکمان بۆ بگرەوە و چی هەیە بە من بڵێ و هیچم لێ مەشارەوە.' نۆژدار گوتی: ' کەنیزێک ئاوری لە دڵی بەر داوە و ئەو کەنیزەش یان لە دیمشقە یان لە بەسرەیە. دەرمانی دەردی کوڕەکەشت جگە لە گەیشتن بەو کەنیزە هیچی دی نییە.'

"ڕەبیع گوتی: 'ئەگەر تۆ بتوانی ئەو دووانە بە یەک بگەیەنیتەوە، من ئەوەندەت ماڵ دەدەمێ کە هەتا ماوی بەشت بکا.' نۆژدارە عەجەمەکە گوتی: 'ئەو کارە کارێکی زۆر ئاسانە.' ئینجا ڕووی لە نیعمەت کرد و گوتی: 'هیوادار بە؛ شتێک نییە.' ئەوجا نۆژدارەکە بە ڕەبیعی گوت: 'چوارهەزار دینارم بدەیە.' ڕەبیع چوارهەزار دیناری زێڕی دەرهێنا و دای بە نۆژدارەکە.

"جا ئەوجار نۆژدارەکە بە ڕەبیعی گوت: 'بەس ئەوەم لێت دەوێ کە کوڕەکەت لەگەڵم

١. عەجەم: ناعەرەب، کە لە نەتەوەی عەرەب نەبێت.

بێت بۆ دیمشـق و ئیشـەڵڵا نایەینەوە هەتا کەنیزەکەش لەگەڵ خۆمان نەهێنینەوە.‘ پاشـان ڕووی لەو گەنجە کرد و گوتی: ’ناوت چییە؟‘ گوتی: ’ناوم نیعمەتە.‘ گوتی: ’نیعمەت، هەستە دانیشـە. وا دیارە خودا ئاگای لێتە و لەگەڵ ئەو کەنیزەش پێکتان شـاد دەکاتەوە.‘ نیعمەت هەسـتا دانیشـت. نۆژدار پێی گوت: ’ورەی خۆت بەرە سـەری. ئێمە بە تەمای سـەفەرین، دەبێ بە هێز بی. تێر بخۆ و بخۆوە. دڵت خۆش کە با هێز و توانای سـەفەرت هەبێ.‘ دوای ئەوە هەموو پێداویسـتییەکی سـەفەریان سـاز کرد. دەهەزار دیناریان لە باوکی نیعمەت وەرگرت. پێداویسـتییەکانیان لە وشـتران نا. ئینجا خواحافیزییان لە باوکی نیعمەت کرد و بەرەو حەڵەب کەوتنە ڕێ. لە حەڵەب هیچ هەواڵێکی کەنیزەیـان وەگیر نەکەوت. نـاچـار لە حەڵەب وەدەر کەوتن. چوون بۆ دیمشـق. سـێ ڕۆژ لەوێ حەسـانەوە. دوای ئەوە دووکـانێکیـان گرت. بەردی لاجوەرد و زێڕ و دەفری زێڕین و چینییـان تێدا ڕیز کرد. پەردەی زێڕینیان بەسـەردا دان. لەپێش ئەوانیشـەوە شـووشـە و ڕۆندانی بلوورینیان ڕیز کردن. ئوسـتورلابیان تێدا هەڵاوەسـی. جلی نۆژدارانی کردە بەری. نیعمەتی لەپێش خۆی ڕاگرت و پێی گوت: ’نیعمەت، لەمەو دوا تۆ لە جێی کوڕی منی و هەر کاتێک پێت خۆش بێ، دەتوانی پێم بڵێی بابە. منیش بە ڕۆڵە بانگت دەکەم.‘

”وردەوردە خەڵکی دیمشـق دەهاتنە دووکانی عەجەمە و چاویان لە شـتەکانیان دەکرد. چاویشـیان لە جوانی و کەشـخەیی نیعمەتیش دەکرد. نۆژدار بە فارسـی قسـەی لەگەڵ نیعمەت دەکرد و نیعمەتیش هەر بە فارسـی وەڵامی دەداوە، چونکە فارسـی باش دەزانی. بەو جۆرە نۆژدار لەنێو خەڵکی دیمشـق ناوبانگی دەرکرد و ناسـرا. هەموو کەسـێک بۆ نەخۆشـی و شـتی وا هەر دەهاتنە لای ئەو و باسـی نەخۆشـییەکەیان بۆ دەکرد، ئەویش دەرمانی دەدانێ. جاری وا بوو میز یان پاشـەڕۆی نەخۆشـەکەیان دێنا چاوی لێ دەکرد. دەیزانی چ نەخۆشـییەکی هەیە. بەو جۆرە لە شـاردا دەنگی داوە و ناوبانگی گەیشـتە ماڵی گەورەگەورەکانی شـار. ڕۆژێک دانیشـتبوو لە پڕدا پیرێژنێک هات، سـواری گوێدرێژێک ببوو. کورتانی ئەو کەرە لە دیبا چێ کرابوو. بە زێڕ و جەوهێرات ڕازاندبوویانەوە. لە بەر دووکانی عەجەمە کەرەکەی ڕاگرت و ئاماژەی بۆ کرد. نیعمەت دەسـتی گرت. پیرێژنە لە گوێدرێژەکە هـاتە خوارێ، گوتی: ’نۆژدارە عەجەمەکە تۆی؟‘ نۆژدار گوتی: ’بەڵێ، منم.‘ پیرێژنە گوتی: ’کچێکم نەخۆشـە.‘ ئیتر پاشـەڕۆکەی دەرهێنا. کاتێک نۆژدار چاوی لە پاشەڕۆکەکە کرد، بە پیرێژنەی گوت: ’دایە خانم، ئەو کیژە ناوی چییە؟ هەتا چاوێکی بۆ لێ بکەم. بزانم کەی دەرمـانەکـانی بخوا بـاشـە؟‘ پیرێژنە گوتی: ’براکەم، نـاوی ئەو کەنیزە نیعەمە.‘ “

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک نۆژدار زانی کە ناوی نیعمەیە، ناوی نووسی و چاوێکی بۆ لە نوسترلابەکەی کرد. گوتی: 'دایە پیرە، ئەوە خەڵکی کام وڵاتە؟ چونکە بە ئاو و هەوا فەرق دەکا، کەی و چۆناوچۆن دەرمانەکانی بخوا. ئاخر هەر ناوچەی دەرمانی خۆی لەگەڵ دەچارێ. ئێستا پێم بڵێ لە کوێ گەورە بووە و چەند ساڵی تەمەنە؟'

"پیرێژنە گوتی: 'چواردە ســاڵە و لە کووفەی عێراق گەورە بووە.' نۆژدار گوتی: 'چەند مانگە هاتووەتە ئەم شــارە؟' پیرێژنە گوتی: 'ئەوەندە نییە کە هاتووەتە ئێرە.' کە نیعمەت قســەی پیرێژنەکەی بیســت و زانی نێویشــی نیعمەیە، کەوتە دڵە کوتە. ئیدی نۆژدار بە پیرێژنەی گوت: 'ئەو دەرمانەی دەیە.' پیرێژنە دە دیناری دەرمانەکەی لەپێش نۆژدارەکە دانا.

"نۆژدار چاوێکی لە نیعمەت کرد و گوتی: 'ئەو دەرمانانەی بۆ بێنە.' پیرێژنە چاوی لە نیعمەت بڕیبوو دەیگوت: 'خودا بت پارێزێ، شــێوەت زۆر شــێوەی ئەو کیژە دەدا.' دوای ئەوە پیرێژنە بە نۆژداری گوت: 'ئەوە کوڕی خۆتە یان کۆیلەتە؟' نۆژدارەکە وەڵامی داوە: 'کوڕی خۆمە.' دوای ئەوە نیعمەت دەرمانەکانی دایە و کاغەزێکی هێنا و ئەو دوو بەیتەی لێ نووسی:

خەیاڵی گوڵی ڕوخســارت لە گشــت شــوێنێ لەگەڵمایە
مۆژدە بــــێ دڵ ئەو دەوایە شــادبوونەوەی بەدوادایە
بـــــــە شنەی بلاوێنت بڵێ: لەو مەڵبەندە هەڵوەدایەک
پەنــای هێنــاوە بۆ ئێرە، ســــازی کردووە هێلانەیەک
گڕی دووریــت ســــووتـانـدوویە پەڕوبــاڵی فڕینی ئەو
هــاتووە لەو خوارە کەوتووە، ڕێ بڕنــاکا بتگــاتێ ئەو

"دوایی کاغەزەکەی خستە توورەکە دەرمانەکەوە و مۆری کرد. لەســەر توورەکەکە بە خەتی کووفی نووســـیی: 'من نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی کووفیم' و توورەکەکەی دا بە پیرێژنەکە. پیرێژنە توورکە دەرمــانەکەی وەرگرت و مــاڵاوایی لە نۆژدارەکە کرد. بەرەو کۆشــکی خەلیفە گەڕاوە. چووە لای کەنیزەکە پێی گوت: 'خانم، نۆژدارێکی عەجەم هاتووە بۆ شـــارەکەمان، من تا ئێســـتا کەســـم لەو زاناتر نەدیوە. من ناوی تۆم بەو گوت و پاشەڕۆکەتم پێشــان دا. خێرا نەخۆشــییەکەتی زانی و بە کوڕەکەی گوت، فڵانە دەرمانی بۆ دانێ. کوڕەکەی دەرمــانەکانی بۆ پێچامەوە. بــاوەڕ کە کوڕی هێندەی کوڕی ئەو نۆژدارە

جوانم لەو دیمشقەدا نەدیوە. دووکانی وەکوو دووکانی ئەو نۆژدارە لەو شارەدا نییە.'

"نیعەم توورەکە دەرمانەکەی لێ وەرگرت. سەیری کرد ناوی خاوەنەکەی ئەوی بەسەرەوەیە. کە خەتەکەی دیت ڕەنگی تێک چوو گوتی: 'خاوەنی ئەو دووکانە لەبەر من هاتووە. ئینجا بە پیرێژنەی گوت: 'دا باسی ئەو کوڕەم بۆ بکە. دەنکێکی چۆن بوو؟' پیرێژنە گوتی: 'ناوی نیعمەتە. لە نێو بڕۆی ڕاستیدا خاڵێکی ڕەشی تێدایە و جلوبەرگی بە شکۆی لە بەر دایە. لە جوانیدا هیچی نەهێشتووەتەوە.'

"ئیدی کەنیزەکە دەرمانەکەی هەڵگرت و خواردی. ئینجا پێکەنی و گوتی: 'دەرمانێکی پیرۆزە' دوایی نێو توورەکەکە گەڕا. کاغەزەکەی تێدا دیتەوە و کردییەوە. کە خوێندییەوە، ئیتر تەواو دڵنیا بوو کە ڕاست خاوەنەکەی خۆیەتی ـــ نیعمەتە. خۆشحاڵ بوو. کە پیرێژنە دیتی ڕەنگ و ڕووی کراوە، گوتی: 'ئەمڕۆ ڕۆژێکی پیرۆزە.'

"نیعەم گوتی: 'دا خواردن و خواردنەوەم بۆ بێنن بزانم شتێک ناخۆم.' پیرێژنە فەرمانی بە کەنیزەکان دا سفرەیان بۆ ڕاخست و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی خۆشیان لەپێش دانا. نیعەم خەریک بوو، خواردنی دەخوارد کە لەو جەنگەیەدا عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان هات. کەنیزەکەی دیت ئەوە دانیشتووە خەریکی خواردنە. خەلیفە خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە پیرێژنەکە گوتی: 'خەلیفە، پیرۆزە چاک بوونەوەی نیعەمی کەنیزت. ئەوە نۆژدارێک هاتووەتە شارەکەمان کە لە هەموو کەس باشتر لە دەردی خەڵک دەگا. دەرمانی بۆ دەبینێتەوە و بووە هۆکاری چاکبوونی کەنیزەکەت. من چووم لە لای ئەو دەرمانم بۆ هێنا. جارێکی لەو درەمانە خوارد، زۆر گۆڕا.' خەلیفە گوتی: 'ئەو هەزار دینارەی بۆ ببە. ئاگاشت لە کەنیزەکە بێ تا تەواو چاک دەبێتەوە.'

"دوای ئەوە خەلیفە کەیفی ساز بوو. نیعەمی بەجێ هێشت و چووە دەرێ. پیرێژنەش هەزار دینارەکەی بۆ نۆژدار برد و دایێ. ئاگاداریشی کردەوە کە کچە نەخۆشەکە کەنیزی خەلیفەیە. ئەو کاغەزەی کە نیعەم دابوویە، بە نۆژداری دا. ئەویش دای بە نیعمەت. کە نیعمەت کاغەزەکەی کردەوە و خەتەکەی نیعەمی دیت، بێهۆش کەوت. کە هاتەوە سەر خۆ، کاغەزەکەی کردەوە و خوێندیەوە. لەو پەڕەدا نووسرابوو: 'ئەو نووسراوەیە لەلایەن هەڵخەتاوی جادووگەری هەڵخەڵەتێنەر و دوورخراوە لە خۆشەویست و پشت و پەنا و بێبەش لە نیعمەتی دەورانەوەیە. ویستم بزانی کە نووسراوەکەت گەیشت. دڵم کراوە و ئاوپڕژێن کرا. خەمم لە دڵدا نەما، لەبەر ئەوەی بە شوێنی یەکمان زانیوە. ئەو نامەیەت سوکنایی خستە دڵمەوە، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ڕووی ئەو پەڕەی بە دەستی تۆ ڕەش کراوە
سپیترە لە ڕووی سپی ئەو هەتاوە

پرشــــنگێـک بوو مـاڵی تـاریکمی ڕوونـاک کرد
ســـێلاوێـک بـوو بـێ هـیوایی لەگەڵ خـۆی بـرد
هەڵـوێســـــتێکە و مـن گـرتـوومە تـاکـو مـاوم
نــامە و خەتەت دەپـارێــزم وەکــوو چــاوم

"کە نیعمەت ئەو شـێعرەی خوێندەوە، ئەسـرین لە چاوی هاتە خوار. دایە پیرە گوتی: 'ئەوە بۆ دەگرییت؟ خودا چاوت بە خەم نەکا.' نۆژدار گوتی: 'دایە خانم، کوڕی من چۆن نەگری کە ئەو کەنیزە کەنیزی ئەوە. ئەوە خاوەنی ئەو کەنیزەیە، نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی کووفییە. ئەو کیژەش هەتا ئەو کوڕە نەبینێ، چاک نابێتەوە. لە تاوی ئەوە وای لێ هاتووە.'

-

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، نۆژدار گوتی: 'ئەو کچە هیچ دەردێکی جگە لە دەردی ئەوین و دووری ئەو لاوە نییە. ئێســـتا تۆ ئەو هەزار دینارە هەڵگرە بۆ خۆت، ئەوەندەش بزانە کە زۆر لەوە زیاتریشـــت دەدەمێ، بەس ئاگایەکت لێ مان بێ. بە دڵســـۆزی و بەزەییەوە کارەکانمان بۆ راپەڕێنە. ئێمەش جگە لە تۆ کەس شـــک نابەین.' پیرێژنە بە نیعمتی گوت: 'یانی تۆ خاوەنی ئەو کەنیزەی؟' نیعمەت گوتی: 'بەڵێ، من خاوەنی ئەوم.' پیرێژنە گوتی: 'ڕاســـتە، ئەویش تۆی لە بیر ناچێ.' ئیدی نیعمەت بەســـەرهاتی خۆی لە ســـەرەتاوە هەتا کۆتایی بۆ گێڕاوە. دایە پیرە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، تۆ ئەو کچەت لە من بوێ و کارت بە کەس نەبێ.' ئیدی پیرێژنە لەڕێوە ســواری گوێدرێژەکەی بوو. گەڕاوە بۆ لای کەنیزەکە. چاوێکی لێ کرد و پێکەنی. گوتی: 'کچێ، ئەگەر تۆ ئەو شیوەن و گریانەت بۆ گەورەی من، نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی کووفییە، جێی خۆیەتی.' نیعەم گوتی: 'پەردە لەســـەر ئەوەش لا درا و تۆش زانیت؟' پیرێژنە گوتی: 'خەمت نەبێ. بە ئاســـوودەیی دانیشـــە. بە خودا من کارێک دەکەم ئێوە پێک بگەنەوە، تەنانەت ئەگەر بشـــکوژرێم.' پیرێژنە گەڕاوە لای نیعمەت و پێی گوت: 'من چووم بۆ لای نیعەمەکەت، هەســـتم کرد ئەو لە تۆش زیاتر تامەزرۆی دیداری تۆیە. هەرچەندە خەلیفە دەیویســـت بچێتە لای، بەڵام ئەو خۆی بە دەســـتەوە نەدەدا. ئەگەر تۆ هیمەتت بێ و نەترس و بەجەرگ بی، ئەوە من خۆم دەخەمە مەترســـییەوە. بە هەر فێڵ و کەلەکێک بێ تۆ دەبمە کۆشـــکەوە. دەتبمە لای کەنیزەکەت.' نیعمەت گوتی: 'خوا پاداشـــت بداتەوە.' ئیدی پیرێژنە مـاڵاوایی لە نیعمەت کرد و چووەوە لای کەنیزەکە. پێی گوت: خاوەنەکەت ئەوەندەی نەمابوو لە تاوی تۆ دڵی بتۆقێ و گیانی دەرچێ. دەیەوێ هەرچۆنێک بێ، بێتە لای تۆ. تۆ دەڵێی چی؟' نیعەمیش گوتی: 'جا من لە خودام دەوێ، بەڵام چ بکەم.'

"لەو جەنگەیەدا بە زەینی پیرێژنەدا هـات، بوخچەیەک جلی ژنانە هەڵگرێ و بگەڕێتەوە بۆ لای نیعمەت. هەر واشـــی کرد. پێی گوت: 'کەمێکم کـار پێتە.' کونجێـک لەپشـــت دووکـانەکەوە بوو، لەگەڵ نیعمەت چوونە ئەوێ. پیرێژنە کەمێکی کەلوپەلی ئـارایشـــتی ژنانەی هێنابوو. دەستی کرد بە ئارایشـتی نیعمەت. بە سووراو و سپیاو و کل و شتی وا کارێکی کرد، کەس بیری بۆی نەچێ هەر کوڕیش بێ. بگرە کردی بە کیژێکی زۆر جوان. کراس و شـــتی ژنانەی لە بەر کرد. چارشـــێوێکی بەســـەردا دا. نیعمەت هێندە جوان بوو دەتگوت حۆرییە. پیرێژنە بۆخۆی کاتێک دیتی، بەخۆی نەبوو گوتی: 'تبارک الله أحســـن الخالقین.' ماشـــەڵڵا زۆر لە کچ جوانتری.' دوای ئەوە داپیرە گوتی: 'وەک ژنان لەپێشـدا بە لاقی چەپت هەنگاو بنێ، دوایی لاقی ڕاســـتت و بە حاڵ ســـمتیشـــت بادە.' ئیدی پیرێژنە بۆخۆی لەپێشـییەوە کەمێک ڕۆیشـت. ئەوجار، داپیرە چۆنی پێ گوتبوو نیعمەت لە لای ئەو

کەمیک ڕۆیشت. کاتێک داپیرە زانی تەواو فێری ڕۆیشتنی ژنانە بووە، پێی گوت: 'ڕاوەستە، شەو دێمەوە لە دوات. بە پشتیوانی خودا دەتبەم بۆ دارولخەلیفە. کاتێک تووشی پەردەدار و دەرکەوانان بووین، هیچ وەسەر خۆت مەهێنە و مەترسە، سەرت داخە و لەگەڵ کەس قسە مەکە.'

"کە کاتی دیاری کراو هات، پیرێژنە هاتەوە. ئەوی برد بۆ کۆشکی خەلیفە. پەردەدار ویستی نەهێڵێ بچێتە ژوورێ، داپیرە گوتی: 'نەفام، ئەوە کەنیزە نیعمە، کەنیزەی تایبەتی خەلیفەیە. چۆن ناهێڵی؟' دوایی گوتی: 'ڕۆڵە، وەژوور کەوە.' نیعمەت لەگەڵ پیرێژنە چوونە ژوورێ، بە دالانێکدا دەڕۆیشتن، داپیرە بە نیعمەتی گوت: 'لە هیچ شتێک مەترسە، بچۆ ناو کۆشکەوە. بە دەستی چەپەوە پێنج دەرگا بژمێرە و لە دەرکی شەشەمەوە بچۆ ژوورەوە. ئەو دیوە بۆ تۆ تەرخان کراوە. مەترسە، هەرکەس قسەی لەگەڵ کردی، تۆ قسەی لەگەڵ مەکە.' بەو جۆرە پیرێژنە ئەوی برد، هەتا گەیشتنە دەرگایەک کە دەچووە ناو کۆشکەوە، پەردەدار لەبەردەمیان ڕاوەستا و گوتی: 'ئەو کەنیزە کێیە؟' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پەردەدار لەبەردەم پیرێژنەدا ڕاوەستا، پێی گوت: 'ئەو کەنیزە کێیە و بۆ کوێی دەبەی؟ پیرێژنە گوتی: 'ئەو کەنیزە خاتوون داوای کردووە و دەیەوێ بیکڕێ.' پەردەدار گوتی: 'بەبێ مۆڵەتی خەلیفە کەس ناتوانێ بچێتە ژوور. ئەو کەنیزە بگێڕەوە، من ناهێڵم بێتە ژوور؛ ئەم فەرمانەیان بە من ڕاسپاردووە.' دایە پیرە بە دەرکەوانەکەی گوت: 'دەرکەوانی مەزن، ئەرێ تۆ دەڵێی چی؟ نیعەم خۆشەویسترین کەنیزی خەلیفە. لە نەخۆشییەک کە کەس بە تەمای نەبوو هەستاوەتەوە. ئێستا دەیەوێ چاوی بەو کەنیزە بکەوێ و بیکڕێ. لێی گەڕێ با بچێ نەکا بیبیستێتەوە و ڕقت لێ هەڵگرێ و بتکوژێ.' دوای ئەوەی پیرێژنە ئەو قسانەی بە دەرکەوان گوت، ڕووی لە نیعمەت کرد و گوتی: 'کەنیزەکە، تۆ گوێی مەدەرێ و بچۆ ژوور. بەڵام لە لای خاتوون مەڵێ دەرکەوان نەیدەهێشت بێمە ژوور.' نیعمەتیش سەری داخست و چووە کۆشکەوە. ویستی لا دا بۆ دەستی چەپ، لێی تێک چوو. ڕووی لە لای ڕاست کرد. لە جێی پێنج دەرگا، شەشی ژمارد. چووە دیوی حەوتەمەوە. بەسەر دیوێکدا کەوت کە پڕ پڕ لە فەرشی دیبا و پەردەی ئاوریشمی گوڵدار کە لە تاڵی زێڕ چنرابوون و هەڵواسرابوون. لەوێ لە ئاگردانەکەدا عوود و عەنبەر و میسکیان دانابوو بۆنێکی بلاوێن وڵاتی داگرتبوو. لە لای سەرەوە کورسییەکی شکۆداری ڕازاوە بە جەواهێرات داندرابوو. نیمعەت چوو لەسەری دانیشت. نەیدەزانی چارەنووسی بە کوێ دەگا.

"لەو جەنگەیەدا کە ئەو لەوێ دانیشتبوو بیری لە داهاتووی نادیاری خۆی دەکردەوە، خوشکی خەلیفە لەگەڵ کەنیزەکانی خۆی پەیدا بوو. کە ئەوی لەسەر کورسییەکە دیت، بە خەیاڵی خۆی کچە، چووە پێشێ و گوتی: 'کچەکە، تۆ کێی و چ کارەی؟ بۆ هاتوویتە ئێرە؟' نیعمەت هیچی نەگوت و وەڵامی نەداوە. خوشکی خەلیفە گوتی: 'کەنیزەکە، ئەگەر کەنیزی تایبەتی براکەمی و براکەم لێت توورە بووە، پێم بڵێ. پێی دەڵێم لێت خۆش بێ و بەزەیی پێتدا بێ.' دیسان نیعمەت هیچی نەگوت. ئینجا بە یەکێک لە کەنیزەکانی گوت: 'لەو بەردەرگایە بە، با کەس نەیەتە ژوور.' ئیدی لێی چووە پێشێ. لە جوانییەکەی ورد بووەوە و گوتی: 'کچەکە، خۆتم پێ بناسێنە، بزانم ناوت چییە و بۆ هاتوویتە ئێرە؟ من تا ئێستا تۆم لەو کۆشکەدا نەدیوە.' نیعمەت دیسان وەڵامی نەداوە. لەو جەنگەیەدا خوشکی خەلیفە توورە بوو سنگی نیعمەتی گرت. کەچی سەیری کرد مەمکی نییە. ویستی جلەکانی لە بەر داکەنێ و بۆی ڕوون بێتەوە چکارەیە، نیعمەت پێی گوت: 'خاتوون، من کۆیلەم، پەنام بۆ تۆ هێناوە و بمکرە.' خوشکی خەلیفە گوتی: 'مەترسە، بەس پێم بڵێ تۆ کێی و کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟' نیعمەت گوتی: 'ئەی شازادەی جیهان، من نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی کووفیم

ـِ بو نیعەمی کەنیزەم خۆم خستووەتە مەترسییەوە. حەججاج بە فێڵ ئەوی لێ ڕفاندووم و ـ‌ـزدوویە بۆ ئێرە.' شـــازادە گوتی: 'مەترســـە، کەس کاری پێت نییە.' ئینجا بە کەنیزەکەی خوی گوت: 'بڕۆ بۆ دیوەکەی نیعەم و بیهێنە بۆ ئێرە.' لەو جەنگەیەدا کە کەنیزەکە چوو بۆ ـلای نیعەم، دایە پیرەش لە لای نیعەم بوو پێی دەگوت: 'خاوەنەکەت هاتووە بۆ لات یان نا؟' ـیعەم گوتی: 'نـاوەڵلا.' داپیرە گوتی: 'ڕەنگە ئەو ڕێی هەڵە کردبێ و چووبێ بۆ دیوێکی ـیکە.' نیعەم گوتی: 'سـبحان الله! تازە ئەوەندەی پێ ناچێ تێدا دەچین.' ئیدی داپیرە و نیعەم ـانیشـــتبووم بیریان دەکردەوە چ بکەن، لە پڕدا کەنیزی خوشـــکی خەلیفە هاتە ژوورێ. ـــــلاوی لە نیعەم کرد و گوتی: 'خانم بانگهێشـــتی کردووی بۆ میوانییەک.' نیعەم گوتی: ـەســـەر چاو.' داپیرە گوتی: 'ئەگەر خاوەنەکەت لە لای خوشـــکی خەلیفە بێ، ئەوە تازە هەموو شتێک ئاشکرا دەبێ.'

"نیعەم گورج هەسـتا چوو بۆ لای خوشـکی خەلیفە. خوشـکی خەلیفە پێی گوت: 'ئەوە خاوەنی تۆیە لە لای من دانیشـتووە؟ وا دیارە بە هەڵە هاتووەتە ئێرە. مەترسـە کەس کاری ـە ئێوە نییە.' کە نیعەم ئەوەی بیسـت، ئەرخەیان بوو. چوو بۆ لای نیعمەت و نیعمەتیش لە ـەری هەستا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، نیعمەت که کەنیزەکەی دیت، هەســــتا. یەکتریان له ئامێز گرت و هەردووکیان بێهۆش بوون. پاش ماوەیەک که وە هۆش هاتنەوە، خوشــــکی خەلیفه گوتی: 'دانیشـن، بزانم ئەوە چوناوچۆنه وا لێک دابڕاون و بیرێکی بۆ بکەینەوە.' ئەوان دانیشـتن و گوتیان: 'ئێمه ملکەچی ئێوەین.' خوشــــکی خەلیفه گوتی: 'ئێوه بێخەم بن. کەس کاری پێتان نییه و ئازارتان پێ ناگا.' دوای ئەوە بە کەنیزەکەی گوت: 'خواردەمەنی و شــــەربیان بۆ بێنن.' که دایاننا، نان خورا و دەستیان کرد بە بادەنۆشی. پیاڵه لەنێوانیادا دەستاودەستی دەکرد هەتا خەم و پەژارەیان له بیر چووەوە.

"ئینجا خوشکی خەلیفه له نیعمەتی پرسی: 'ئەرێ نیعمەت خۆش دەوێ؟' نیعمەت گوتی: 'ئەوینی ئەو منی پەلکێشـی ناو ئەو مەترسـییه کردووە و گیانی خۆمم بۆ لەسـەر دەستم داناوە!' ئینجا خوشـکی خەلیفه له نیعمەی پرسـی: 'ئەی ئەتۆ خاوەنی خۆتت خۆش دەوێ؟' نیعمەم گوتی: 'جا بۆخۆتان ئاگادار بوون، له تاوان چیم بە سەر هات. خۆ ئەوەندەی نەمابوو دڵم بۆی بتۆقێ.' خوشـکی خەلیفه گوتی: 'ئێوه که هەردووکتان ئەوینداری یەکترن، یا خودا ئەو کەسەی ئێوەی لێک کردووە قەت خۆشی نەبینێ. بەڵام موژدە بێ و لەوە ئەرخەیان بن دەورانی لێکدابڕانتان کۆتایی هات و تازە لێک جیا نابنەوە.' ئیدی ئەوان دڵخۆش بوون و نیعەم داوای عوودی کرد. عوودیان بۆ هێنا. عوودەکەی وەرگرت و تاڵەکانی توند کردنەوە و بە ئاوازێکی خۆش ئەو شێعرەی گوت:

ســــەر و کاکۆڵی وەکوو شــــەوی قەترانی ڕەش
ڕەزا شـیرن و دەلال، سـیما جوان و ڕوو گەشـه
خونچەی هێشـتا نەپشـکووتووە، لێوی سـووری
پەســــنی جوانیت بە من نـاکرێ، لێم دەبووری

"دوای ئەوە نیعەم عوودەکەی دا بە نیعمەتی خاوەنی و پێی گوت: 'شـێعرێکمان بۆ بڵێ.' نیعمەت عوودەکەی لێ وەرگرت و چاکی کرد. بە دەنگێکی خۆش ئەو دوو بەیتەی گوت:

گەورە و چووکە دادەمێنێ، کـاتێ جوانیـت خۆ دەنوێنێ
بێ ڕحمه لافاوی عیشـــقت، ســـەر و ســـامانی دەســـتێنێ
که تۆی نەبێ ئـاشـــقی زار، ڕوو دەکـاتە شـــاخ و کێوان
دەست له گشت شتێکی دەشوا بۆ چییەتی و سـەر و سـامان

"کە شێعرەکەی تەواو کرد، نیعەم پیاڵەیەکی پڕ کرد و دایێ. نیعمەت پیاڵەکەی وەرگرت و خواردییەوە. دوای ئەوە پیاڵەیەکیشی دا بە خوشکی خەلیفە. ئەویش پیاڵەکەی خواردەوە. ئینجا دیسان نیعەم عوودەکەی وەرگرت و تاڵەکانی توند کردنەوە و ئەو شێعرەی گوت:

سۆزی سروەی باخی بەهەشتم بۆ دێ ئێستا
من و شەرابی بەتام و یاری خۆرئاسا
چیمەن سروودی مانگی گوڵان دەچڕێ
جێژنە وا بولبول لە خۆشی گوڵ لە خەو هەستا

"دوای ئەوە دیسان عوودەکەی داوە بە نیعمەتی کوڕی ڕەبیع. نیعمەت عوودەکەی وەرگرت، چاکی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

دڵ بە شەرابی کۆشک نەبەستی، هاکا
دنیا لە قوڕت کۆشک و سەرایەک چا کا
پارسەک بۆ خۆی بە پاشا نازانێ؟ چونکە
ژینی پێ سێبەری هەورە، ڕەنگە ڕاکا

"ئیدی ئاوا بەردەوام خەریکی شێعرخوێندنەوە و بادەنۆشی و عەیش و نۆش بوون کە لە پڕدا خەلیفە لێیان وەژوور کەوت. کە خەلیفەیان دیت، هەموو هەستان و کڕنۆشیان برد. خەلیفە چاوی لە نیعەم کرد خەریک بوو عوودی لێ دەدا. گوتی: 'نیعەم! ئەوە سوپاس بۆ خودا چاک بوویتەتەوە و عوود لێ دەدەی؟ نەخۆشییەکەت تەواو بوو؟' دوای ئەوە چاوێکی لە نیعمەت کرد و لە خوشکی پرسی: 'خوشکێ، ئەو کەنیزە کێیە؟' خوشکی گوتی: 'یەکێک لە کەنیزە تایبەتەکانی خۆتە ناوی ئەنیسە. کە نیعەم جگە لەو لەگەڵ کەس دانانیشێ و لەگەڵ ئەو نەبێ خواردن ناخوا.' خەلیفە گوتی: 'بە خودا ئەویش لە خوێنشیرینیدا لە نیعەم دەچێ. سبەینێ دیوێکی جیای بۆ تەرخان دەکەم لە پەنا دیوەکەی نیعەم. هەموو شتێکیشی بۆ تەیار دەکەم. لە نیعەمیشی زیاتر ماڵ دەدەمێ.' خوشکی خەلیفە فەرمانی دا خواردن بۆ خەلیفە بێنن. خواردنیان بۆ هێنا و دەستی کرد بە مەیخواردنەوە. پیاڵەیەکی خواردەوە و بە نیعەمی گوت: 'شێعرمان بۆ بخوێنەوە.' نیعەم عوودەکەی وەرگرت و یەک دوو پیاڵەی خواردەوە و دەستی کرد بە شێعرخوێندنەوە:

خواردنەوەی بەیانان زۆر کاریگەرە، پاشا
هەرکەسێ شادیخوازە دەکا ئەو کارە، پاشا
هەموو کاتێ بادە، شادیهێنەرە

بـەس شـەرابی شـەوەکی[1] شــــــاکــارە، پاشا

"خەلیفە کەیفی ســــاز بوو پیاڵەیەکی پڕ کرد و بە نیعەمی دا و فەرمووی: 'بیلێ.' نیعەم پیاڵەکەی لێ وەرگرت. خواردییەوە و بەدم عوودلێدانەو ئەو بەیتانەی گوت:

بەیانە و ئاونگ لەســـــــــــــەر پەڕکی گوڵانە
شــــەرابی خەســـــت دەرمـانی هەموو دەردانە
بنۆشـــــە بـادە هەر دەم ســــەری خەم دەخوا
خەم ســــەر هەڵدا لە نـاختدا ســــەرت دەخوا

"کاتێک خەلیفە گوێی لەو شـێعرە بوو، گوتی: 'ماشـــەڵڵا نیعەم، چەند زمانێکی ڕەوان و خۆشـت هەیە.' هەر ئاوا لە عەیش و نۆش و بادەخواردنەوەدا بوون هەتا نیوەشــەو. ئینجا خوشکی خەلیفە گوتی: 'من کتێبێکی چیرۆکم هەیە زۆر خۆشە.' خەلیفە گوتی: 'چیرۆکەکەی چییە؟' گوتی: 'چیرۆکەکە ئاوایە کە دەگێڕنەوە لە شـــاری کووفەدا لاوێک هەبوو نـاوی نیعمەتی کوڕی ڕەبیع بوو، کەنیزێکی هەبوو. ئەو دووانە یەکتریان زۆر خۆش دەویست. لەماڵێکیشـدا گەورە ببوون. کاتێک خۆیان ناسـی[2]، خۆشـەویسـتییان لە دڵی یەکدا جێگیر بوو. پاشــان ڕۆژگار سـتەمی لێ کردن و لێکی جیا کردنەوە. خراپکاران بە فڕوفێڵ کەنیزەکەیان لە ماڵ بردبووە دەرێ و دزیبوویان. دوای ئەوە بە دەهەزار دینار بە پاشایەکیان فرۆشتەوە. خاوەنەکەی کە کەنیزەکەی زۆر خۆش دەویســـــت، هەر بۆیە خزم و کەسوکاری بەجێ هێشت کەوتە شوێن کەنیزەکەی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. شەوەکی: بەری بەیان
٢. خۆناسین: بلووغ بوو. شەیتان پێکەنین.

# کە شەوی دووسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خوشکی خەلیفە بە خەلیفەی گوت: 'خاوەنی ئەو کەنیزە خزم و کەسی بەجێ هێشت، شارەوشار و گوندەوگوند گەڕا هەتا دیتییەوە. ئینجا دەستی لە گیانی خوی شۆرد. گیانی خۆی خستە مەترسییەوە و چووە ماڵی پاشا و خۆی گەیاندە کەنیزەکەی. هێشتا بە تەواوی باوەڕیان بە چاویان نەدەکرد کە یەکتریان دیوەتەوە، ئەو پاشایەی کەنیزەکەی کڕیبوو بە سەریاندا چوو. ئیدی بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، خێرا فەرمانی کوشتنی دان. خەلیفە، ئەو کارەت پێ چۆنە؟' خەلیفە گوتی: 'وەڵا کارێکی سەیرە، بەڵام ئەو پاشایە کە خاوەن دەسەڵات بوو دەبووایە لێیان خۆش بووبا، چونکە دەبووایە پاشا سێ شتی لە بەرچاو گرتبووایە. یەکەم، دەبوو ئەوەی لە بەرچاو گرتبا کە ئەوانە یەکتریان خۆش دەویست. دووەم، ئەوەی کە ئەوان لە ماڵی ئەو و لەبن باڵی ئەودا بوون. سێیەم، پاشا دەبێ لە بڕیارداندا لە سەرخۆ بێ. ئەویش لە وەها جەنگەیەکدا ئەو پاشایە کارێکی پاشایانەی نەکردووە.'

"خوشکی خەلیفە گوتی: 'براکەم، بیکە بە خاتری پیرۆزییەکانی ئاسمان و زەوی، بە نیعەم بڵێ شتێکم بۆ بڵێ و جوان گوێشی لێ ڕاگرە.' خەلیفە گوتی: 'نیعەم، دا بۆم بڵێ.' ئینجا نیعەم بە دەنگێکی خۆش ئاوای گوت:

سووک و ڕسوامان مەکە وا لێقەوماوین
دڵبریندار و هەڵوەدا و لێکدابڕاوین
لەگەڵمان بێبەزە مەبە، بەرگە ناگرین
هێند بە دەست چەرخی زەمان ئازاردراوین

"کە خەلیفە ئەو شێعرەی بیست، خوشکەکەی پێی گوت: 'هەرکەس قسەیەک بکا یان بەڵێنییەک بدا، دەبێ لەسەر قسە و بەڵێنی خۆی سوور بێ و پەشیمان نەبێتەوە.' ئینجا بە نیعمەت و نیعەمی گوت: 'هەستنە سەر پێ.' هەردووکیان هەستانە سەر پێ. خوشکی خەلیفە گوتی: 'ئەو نیعەمەی ئێستا لە بەر دەممانە، کەنیزە دزراوەکەیە. حەججاج کوڕی یوسفی سەقەفی دزیوییەتی و ناردوویە بۆ تۆ. ئەوەی کە لە نامەکەدا نووسیویە بە دەهەزار دینارم کڕیوە، درۆیەکی تەواوە و فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە. ئەو گەنجەی وا جلی ژنانەی لە بەر کردووە، نیعمەتی کوڕی ڕەبیعی کووفییە، خاوەنی کەنیزە نیعەمە. بیکە بە خاتری ڕۆحی پاکی باب و باپیرانت لێیان خۆش بە. بە یەکتریان ببەخشە. پاداشی ئەو چاکەیەشت لە خودا بوێ کە لەژێر چەتری پارێزگاری تۆدا خواردن و مەییان

خواردووەتەوە. ئەو تکایە لە من قەبووڵ بفەرموو.'

"دوای ئەوە خەلیفە گوتی: 'خوشکی، تۆ ڕاست دەکەی من وام گوت. لەسەر قسەی خۆشم ماوم و پاشگەز نابمەوە.' ئینجا خەلیفە بە نیعەمی گوت: 'ئەوە خاوەنتە؟' نیعەم گوتی: 'بەڵێ، خاوەنمە.' خەلیفە گوتی: 'ئێوە نیگەرانی هیچ مەبن و من ئێوەم بە یەکتر بەخشی.' ئەوجا بە نیعمەتی گوت: 'تۆ چۆن هاتوویتە ئێرە و کێ هێنایتی و ڕێنوێنی کردی؟'

"نیمعەت گوتی: 'خەلیفە، گوێت لە بەسەرهاتی من بێ، بەڵێن بێ هیچت لێ نەشارمەوە.' ئیتر تەواوی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. تەنانەت ئەوەی نۆژدارە عەجەم و داپیرە لەگەڵیدا کردبوویان هەمووی بۆ گێڕاوە. بۆی گێڕاوە چۆناوچۆن هاتووەتە نێو کۆشکەوە و دەرگای دیوەکانی لێ تێک چووە. خەلیفە پێی سەیر بوو داوای کرد نۆژدارەکەیان هێنا، خەڵاتی کرد و کردی بە یەکێک لە نیزیکانی خۆی. گوتی: 'چونکە ئەوەندە زانا و وریایە، دەبێ لەگەڵ خۆم بێ.' پاشان چاکەیەکی زۆری لەگەڵ نیعمەت و نیعەم کرد. دیاری دانێ و حەوت ڕۆژان لە کۆشکدا ڕای گرتن. میوانداری کردن. لە داپیرەش خۆش بوو. لەبەر ئەو کارە چاکەی خەڵاتی کرد. دوای حەوت ڕۆژەکە نیعمەت لەگەڵ کەنیزەکەی پێکەوە بەرەو کووفە گەڕانەوە و بە دایک و بابی شاد بووەوە و تا کۆتایی تەمەنیان لە خۆشی و کامەرانیدا ژیان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و چل و شەشەم هاتەوە

**درێژەی چیرۆکی قەمەروززەمان**

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک ئەمجەد و ئەسعەد چیرۆکەکەی بەهرامیان بیست، زۆریان پێ خۆش بوو بەو جۆرە ڕۆژیان کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، ئەسعەد و ئەمجەد سوار بوون ویستیان بچن بۆ لای پاشا. ڕوخسەتیان لە دەرکەوان وەرگرت و چوونە کن پاشا. پاشا زۆری بەخێرهاتن کردن. خەریکی وتووێژ بوون کە لە پڕ گوێیان لە هاتوهاوار و سکاڵای خەڵکی شار بوو. پەردەدار هاتە ژوورێ و گوتی: 'سوپایەک هاتووە و بە شیری ڕووتەوە دەوری شاری داوە. کەسیش نازانێ کێن و بە تەمای چین.' پاشا ئەوەی لە پەردەداری بیستبوو بە ئەسعەد و ئەمجەدی گوت. ئەمجەد گوتی: 'ئەوە دەچمە دەرێ بزانم چ باسە.' ئیدی ئەمجەد چووە دەرەوەی شار. سەیری کرد ئەوە سوپایەک لەدەوری شار ڕاوەستاوە. کاتێک ئەوان ئەمجەدیان دیت، زانیان ئەوە ڕاسپاردەی پاشایە. بە پیرییەوە هاتن. بردیانە لای سوڵتانەکەیان، ئەمجەد کە گەیشتە لای سوڵتانەکەیان، کڕنۆشی برد. سەیری کرد ژنێکە و دەمامکی بەستووە.

"سوڵتان بە ئەمجەدی گوت: 'ئێمە کارمان بە تۆ نییە، کۆیلەیەکی من هاتووەتە ئەم شارە و لێرەیە. ئەگەر بۆمان بدۆزنەوە و بماندەنەوە، ئەوە باشە. ئەگەر نەماندەنەوە، دەبێ خۆتان بۆ شەڕێکی قورس ساز کەن. من هەر لەبەر ئەوە هاتووم.' ئەمجەد گوتی: 'ناو و نیشانی ئەو کۆیلەیەی تۆ چییە؟' شاژن گوتی: 'ناوی ئەسعەدە و منیش ناوم مەرجانە. بەهرامی مەجووس ئەوی هێنا بۆ قەلاکەی من و ڕازییش نەبوو پێم بفرۆشێ، منیش بە زۆر لێم سەند. وا بوو کە شەوێ هاتبوو لێی دزیبوومەوە.'

"کاتێک ئەمجەد ئەوەی بیست، زانی مەبەستی ئەسعەدی برایەتی. گوتی: 'شاژنی جیهان، ئەو کۆیلەیە برای منە.' ئیدی چیرۆک و بەسەرهاتی خۆی و براکەی بۆ گێڕاوە. ئەوەی لە غەوارەیی بەسەریان هاتبوو هەمووی گێڕاوە. هۆی هاتنەدەریان لە دوورگەکانی ئابنووسی بۆ باس کرد. ئینجا شازادە ئەمجەد چوو شازادە ئەسعەدی هێنا بۆ لای مەرجانشا. مەرجانشا زۆری پێ سەیر بوو، بە دیداری شازادە ئەسعەد شاد بوو. مەرجانشا ئەمجەدی خەڵات کرد. هێشتا ئەوان لێک جودا نەبیبوونەوە کە تۆزێک بەری ئاسمانی گرت. ئەوەندەی پێ نەچوو تۆزەکە نیشتەوە. سوپایەک دەریاسا وەک نقیم دەوری شاری گرت و شیریان لە کالان دەرکێشا. ئەمجەد و ئەسعەد گوتیان: 'سبحان الله، ئەو سوپایە چییە؟! گومانی تێدا نییە ئەوە هێزی دوژمنە! ئەگەر بێتو لەگەڵ مەرجانشا یەک نەگرین، شارەکەمان لێ داگیر دەکەن و هەموومان دەکوژن. وا چاکە بچینە پێشێ بزانین

کێن و چیان دەوێ.' ناچار ئەمجەد هەستا چووە پێشێ، کە گەیشتە لایان، سەیری کرد ئەو سوپایە سوپای بابەگەورەیەتی—سوپای غەیوورپاشای باوکی شاژن بێدوورە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەمجەد گەیشتە لای سوپاکە و سەیری کرد ئەوە سوپای غەیوورپاشایە باوکی شاژن بێدوورە. کە ئەمجەد چووە لای پاشا و پرسیاری کرد کێن و چ دەوێ، پاشا گوتی: 'ناوم غەیوورپاشایە و ڕێبوارم. ڕۆژگار من و کچەکەمی لێک دابراندووە. نە کچەکەم گەڕاوەتەوە و نە خەبەرێکم لە کچەکەم و قەمەروززەمانی زاوام هەیە. هاتووم بزانم ئێوە هەواڵیان نازانن؟' کاتێک ئەمجەد ئەوەی بیست، ماوەیەکی باش سەری داخست. ئینجا سەر بەرز کردەوە و کڕنۆشی بۆ برد و پێی گوت کە ئەو نەوەیەتی و کوڕی شاژن بێدوورە. ئیدی یەکتریان لە ئامێز گرت و تێر گریان. دوایی کە ئەمجەد ئەوی لە ساغ و سلامەتی شاژن بێدوور و قەمەروززەمانیشا ئاگادار کردەوە، غەیوورپاشا سوپاسی خودای کرد. پێشی گوت کە لە شاری ئابنووسن. بە غەیوورپاشای گوت کە قەمەروززەمان ڕقی لە ئەمجەد و براکەی هەستاوە و فەرمانی کوشتنی داون، بەڵام خەزێنەدار بەزەیی پێیاندا هاتووە و ئازادی کردوون.

"غەیوورپاشا گوتی: 'من تۆ و براکەت دەبەمەوە بۆ لای قەمەروززەمان و ئاشتتان دەکەمەوە.' ئەمجەد کڕنۆشی برد. غەیوورپاشاش خەڵاتێکی باشی کرد. ئەمجەد بە بزەوە هاتەوە بۆ لای پاشا و ئەویشی لە ڕووداوەکەی غەیوورپاشا ئاگادار کردەوە. پاشا زۆری پێ سەیر بوو. کەلوپەلی میوانداری و پێشوازی لە غەیوورپاشا و مەرجانشای ئامادە کرد. تفاقی ئەسپ و هێستر و مەڕ و شتەکەی بۆ ناردن. شازادە ئەمجەد باسی غەیوورپاشای بۆ مەرجانشاش کرد و پێی ناساند. ئەویش گوتی: 'منیش بۆ ئاشتکردنەوەی نێوانی ئێوە و بابتان لەگەڵتان دێم.' ئەوان هێشتا قسەکەیان تەواو نەکردبوو کە تەپوتۆزێکی دیکەش لە دوور پەیدا بوو تۆزەکە ئەوەندە زۆر بوو بەری ئاسمانی گرت. دەنگی هاتوهاوار و گوڕەی سوار و حیلەی ئەسپەکانیان لە دوور دەهات. کە نزیک بوونەوە، تروسکەی شیر و نێزە و زەرگەکانیان دەرکەوت. کە هاتنە پێش و ئەو دوو سوپایەیان دیت، تەپڵیان لێ دا. پاشای شاری مەجووسان کە ئەو سوپایەی دیت، گوتی: 'بە خودا ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەیرە! باشە ئەم دوو سوپایە لێرەیە، خۆزگە ئەو سوپایەیش لە ئاشنایانی خۆمان بێ و دژمن نەبن.' ئەوجا بە ئەمجەدی گوت: 'ئەمجەد، لەگەڵ ئەسعەدی برات بچنە دەرێ بزانن ئەوانە کێن، چونکە من تا ئێستا سوپای ئەوەندە گەورەم نەدیوە.' هەردوو براکە لە شار هاتنە دەرێ و دەروازەی شاریشیان لە ترسان داخست. ئینجا چوون بۆ لای سوپاکە، کە چوونە بەرەوە سەیریان کرد ئەوە سوپای پاشای ئابنووسە و بابیشیان لەگەڵیانە. کە باوکیان دیت، خۆیان بەسەر لاقیدا دا. کڕنۆشیان بۆ برد و دەستیان کرد بە گریان. قەمەروززەمان ئەوانی لە ئامێز گرت و داوای لێبووردنی لێ کردن. ئیدی ئەوانیش لە خۆشیاندا ئەو هەموو

ئازارەیان لە بیر چووە و پێیان گوت کە غەیوورپاشاش لێرەیە. ئیتر قەمەروززەمان و دارودەستەکەی و ئەمجەد و ئەسعەد سوار بوون و چوون بۆ نێو سوپای غەیوورپاشا. لەپێشدا ڕاسپاردەیان نارد. غەیوورپاشایان لە هاتنی پاشا قەمەروززەمان ئاگادار کردەوە. غەیوورپاشا هاتە دەرێ بۆ پێشوازی پاشا قەمەروززەمان. هەموویان لە شوێنێک کۆبوونەوە. بۆخۆشیان سەریان لەو ڕووداو و ڕێکەوتە سوورِ مابوو. خەڵکی شار پێداویستی میوانداریيان لە خواردن و خواردنەوە و حەڵوا و میوە و شتەکانی دیکەیان بۆ خۆیان و سوپاکانیان بردە دەرەوەی شار.

"دوای ماوەیەک دیسان تەپوتۆزێکی دیکە لە دوور بەری ئاسمانی گرت. وڵاتی تاریک کرد. زرم و کوتی سمی ئەسپان زەوی وە لەرزە خست و دەنگی تەپڵیان وەک هەورەتریشقە دەنگی دەداوە، سوارەکان هەموو چەکوچۆڵی شەڕیان پێ بوو. بەڵام هەموویان بەرگی ڕەشیان لە بەردا بوو. پیرە پیاوێکیان لەگەڵ بوو ڕدێنی لە سینگی ڕەد ببوو. جلوبەرگی شینی لە بەردا بوو. خەڵک کە ئەو سوپایەیان دیت، بە پاشایان گوت: 'سوپاس بۆ خودا کە ئێوە هەموو لێرە کۆ بوونەوە و ناسیاوی یەکترین، بەڵام سەرمان لەو سوپا زۆرە سوورِ ماوە! نازانین چییە و پاشاکەیان کێیە!' پاشاکان بەمانیان گوت: 'ئێوە مەترسن، چونکە ئێمە سێ پاشاین و هەر پاشایەی سوپایەکی پێیە. ئەگەر نەیاریش بێ، هیچی لەگەڵ ئێمە پێ ناکرێ.' ئەوان لەو قسانەدا بوون کە دیتیان ئەوە ڕاسپاردەیەکیان بەرە و شار دێ.

"ڕاسپاردەکە هاتە لای غەیوورپاشا و قەمەروززەمان و مەرجانشا و پاشای شاری مەجووسان. کە هات، کڕنۆشی برد و گوتی: 'ئەو پاشایە لە پاشا عەجەمەکانە. لە مێژ ساڵە کوڕێکی ون کردووە و بۆی دەگەرێ.' قەمەروززەمان گوتی: 'ئەو پاشا عەجەمە ناوی چییە؟' گوتی: 'شەهرمانپاشای پێ دەڵێن کە خاوەنی کۆمەڵە دوورگەی خالیدانە.' کە قەمەروززەمان گوێی لە قسەکانی ئەو ڕاسپاردەیە بوو هاواری کرد و بێهۆش بوو. هەموو پێیان سەیر بوو. دوای ماوەیەک وە هۆش هاتەوە و دەستی کرد بە گریان. ئینجا بە ئەمجەد و ئەسعەدی گوت: 'ڕۆڵە، لەگەڵ خزمەتکارەکان بچن سڵاو لە باپیرتان بکەن. ئەوە شەهرمانپاشای باوکمە. موژدەی دەنێ کە من ماوەم و ئەوە لە تاوی من ئاوای لێ هاتووە. ئاوا پیر و خەمبارە و هێشتا جلی شینی لە بەردایە.' ئیدی تەواوی ئەوەی لەو ماوەیەدا بەسەری هاتبوو بۆ پاشاکانی گێڕاوە. کە ئەو پاشایانە ئەو بەسەرهاتانەیان بیست، هەموو سەریان سوورِ مابوو. دوای ئەوە باب و کوڕ چاویان پێک کەوت و هەردووکیان بێهۆش بوون. کە وە خۆ هاتنەوە، تەواوی پاشاکان سڵاویان لە شەهرمانپاشا کرد. ئیدی وا بوو دوایی مەرجانشایان لە شازادە ئەسعەد مارە کرد. پاشان بوستانی کچی بەهرامیان لە شازادە ئەمجەد مارە کرد. هەموویان گەڕانەوە بۆ شاری ئابنووس. قەمەروززەمان چوو

ـو لای پاشـــا ئارمانۆس و تەواوی ئەو بەســـەرهاتانەی بۆ گێڕاوە. پاشـــا ئارمانۆس بە ـیکشـادبوونەوەی منداڵەکانی پاشـا قەمەروززەمان خۆشـحاڵ بوو. سـوپاسـی خودای کرد. ـوای ئەوە غەیوورپاشـــا چوو بۆ لای شـــاژن بێدووری کچی. ماوەی مانگێک لە شـــاری ئابنووس ماوە. پاشان غەیوورپاشا لەگەڵ کچەکەی خۆی گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆیان.“

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، غەیوورپاشا لەگەڵ کچەکەی چوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ئەمجەدیشی لەگەڵ خۆی برد. کە چوونەوە، ئەمجەدی لە جێی خۆی دانا و دەسەڵاتی وا دا دایە. قەمەروززەمانیش ئەسعەدی لە جێی خۆی دانا و بۆخۆی لەگەڵ شەهرمانپاشای باوکی ڕۆیشتنەوە بۆ کۆمەڵە دوورگەی خالیدان. خەڵک شاریان ڕازاندەوە و هەتا مانگێک جێژن و ئاهەنگیان گێڕا و خەریکی شایی و خۆشی بوون. قەمەروززەمان لە جێی باوکی دانیشت و دەسەڵاتی گرتە دەست. هەتا تێکدەری شادی و هەڵوەشێنەری کۆمەڵەکان بەسەریاندا زاڵ بوو."

کاتێک بەسەرهاتەکە تەواو بوو پاشا شەهریار گوتی: "شەهرزاد، ئەو چیرۆکە زۆر خۆش بوو." شەهرزاد گوتی: "ڕاستە ئەو چیرۆکە خۆش بوو بەڵام لە چیرۆکی عەلائەددین ئەبووشامات خۆشتر نییە." خاوەنشکۆ، گوتی: "چیرۆکی عەلائەددین چۆناوچۆنە؟"

شەهرزاد گوتی: "خاوەنشکۆ ...

### بەسەرهاتی عەلائەددین ئەبووشامات

"دەگێڕنەوە سەردەمانی زوو لە میسر بازرگانێکی ڕووخۆش و ڕاستوێژی لێ بوو. بازرگانەکە ماڵێکی زۆر و کۆیلە و خزمەتکار و کەنیزی هەبوو. پێیان دەگوت 'شابەندەر شەمەسەددین.' لەگەڵ خێزانی نێوانیان زۆر خۆش بوو. هەردووکیان یەکتریان زۆر خۆش دەویست. بەڵام ئەو بازرگانە نە کوڕ نە کچی نەبوو. ڕۆژێک لە دووکان دانیشتبوو. سەیری کرد ئەوە دووکاندارەکانی دیکە هەمووی یەکی یەک-دوو کوڕ، بگرە زیاتریشیان هەیە. بە ڕێکەوت هەینییش بوو. شەمسەدین هەستا چوو بۆ گەرماو ئاوێک بە خۆیدا کا. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، لە بەر ئاوێنەی دەلاک چاوێکی لە سەروسەکوتی خۆی کرد. سڵاوەتی لە دیداری پێغەمبەر دا. ئینجا چاوێکی لە ڕیشی خۆی کرد. سپییەکەی بەسەر ڕەشەکەیدا زاڵ ببوو. دڵی گیرا و مردنی هاتە بەرچاو. ژنەکەشی دەیزانی کەی مێردەکەی دێتەوە. هەستا خۆی شۆرد و جوان خۆی بۆ تیفتیفە دا. شەمسەددین هاتەوە ماڵێ و ژنەکەی گوتی: 'شەو باش.' بازرگان گوتی: 'باشی چی؟! من قەت باش نابم.' دوای ئەوە بە ژنە کەنیزەکەی گوت کە نانی بۆ بێنێ. کە نانی دانا، شەمسەددین هیچی بۆ نەخورا و سفرەکەی وەلا نا. ژنە گوتی: 'ئەوە بۆ جۆرێکی؟ دەڵێی ناڕەحەتی؟' شەمسەددین گوتی: 'ناڕەحەتییەکانم هەمووی لەبن سەری تۆدایە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی دووسەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشكۆ، شەمسەددین بە خێزانی گوت: 'تۆ مایەی نارەحەتییەكانی منی.' خێزانی گوتی: 'بۆ؟ چی بووە؟ من بۆ بوومەتە هۆی نارەحەتی تۆ؟' شەمسەددین گوتی: ئەمرۆ كە دووكانم كردەوە، لە بیری ئەوەدا بووم كە تەواوی ئەو دراوسێدووكانانەم یەكی كوڕێك و دوو كوڕ و زیاتریشیان هەیە و لە جیاتی بابیان دێنە دووكان. كەچی تۆ هەر لە شەوی یەكەمەوە سوێندت دام كە من ژنی دیكە نەهێنم. بێجگە لە تۆ كەنیزی دیكەم نەبێ. كەنیزی حەبەشی و ڕۆمی نەهێنمە ماڵێ. شەوێك لە تۆ دوور نەكەومەوە. منیش بێبەڵێن نەبووم و لەسەر بەڵێنی خۆم بووم. تا ئاوام لێ هات. لەو دەمەوە لەگەڵ تۆ تا دەژیم، تازە بۆم ڕوون بووەتەوە كە تۆ منداڵت نابێ و نەزۆكی.' ژنە گوتی: 'وا نییە، خەتای تۆیە.' بازرگان ئەو شەوە ڕۆژی كردەوە. پێی ناخۆش بوو ژنەكەی سەركۆنە كردبوو. ژنەش هەر وا پەشیمان ببووەوە لەوەی كە دمبەدمەی كردبوو و خەتاكەی خستبووە ئەستۆی ئەو. كاتێك بازرگان چووە بازاڕی دەرمانفرۆشان، لە دەرمانفرۆشێكی پرسی: دەرمانی بەهێزكردنی باتووتان[1] هەیە؟' دەرمانفرۆش گوتی: 'هەمبوو تەواو بووە. بزانە ئەو دراوسێیەم نییەتی.' ئیدی بازرگان تەواوی دەرمانفرۆشەكان گەڕا و پرسیاری كرد. تەواویان پێی پێدەكەنین. دوای ئەوە گەڕاوە دووكان و دانیشت. كابرایەک بوو شێخ محەممەدی سمسمیان پێ دەگوت، كەیخودای دەڵاڵەكانی بازاڕ بوو. بەنگ و تریاک و شتی وای دەكێشا. پیاوێكی هەژار بوو زۆر ڕۆژ بەیانیان لای دەدا لای شابەندەر و سڵاوی لێ دەكرد. ئەو ڕۆژەش وەک ڕۆژان بەپێی خووی خۆی هات. سڵاو و هەواڵپرسی كرد. شەمسەددین وەڵامی سڵاوەكەی داوە، بەڵام بە تووڕەییەوە. شێخ محەممەد گوتی: 'گەورەم، بۆ ئاوا تووڕەی؟' شەمسەددین باسی گرفتەكەی نێوان خۆی و خێزانی كرد. گوتی: 'چل ساڵە من و ئەو زەماوەندمان كردووە و دووگیان نەبووە، كەچی ئەو بە منی دەگوت: 'هۆكارەكەی تۆیت و تۆوی باشت نییە و هێلكەكانت باش نیین.'زۆریش بۆ دەرمان و شت گەڕاوم، وەگیرم نەكەوتووە.' شێخ گوتی: 'ئەگەر كەسێك دەرمانێكت بۆ بێنێ و دوای ئەو چل ساڵە خێزانت دوو گیان بێ، شیرینییەكەی چی دەدەیتێ؟' بازرگان گوتی: 'جا وەڵا هەركەس گەورەیی وام لەگەڵ بكا، خەڵاتێكی باشی دەكەم.' شێخە گوتی: 'دینارێكم بەرێ.' بازرگان گوتی: 'ئەوە دوو دینار.'

"شێخ دوو دینارەكەی وەرگرت و چوو بۆ لای دەرمانفرۆشێك. نزیک پازدە مسقاڵی لە گیایەكی ڕۆمی و كوتراوەیەكی چینی و گوڵی مێخەک و زەنجەبیل و بیبەری سپی و

---

١. باتوو: هێلكە گون.

سـەقەنقوڕی[1] وشـککراوی کێوی کڕی و هەمووی پێکەوە جوان کوتان. لە ڕۆنی گوڵدا کوڵاندی و کەمێک ڕەشـکەشـی تێ کرد. هەموویانی لەگەڵ هەنگوین تێکەڵ کرد. لەسەر کەشـەفێکی دانا و هێنای بۆ بازرگان و گوتی: 'ئەوە بەهێزکەرەوەی گونە، دەبێ گۆشـتی بەران و کۆتری ماڵی بە هەزوێلەیەکی زۆرەوە بخۆی و جارجار لەو تێکەڵەیەش بخۆی. بادەی کۆن و تاڵیشی بەردەوام بەسەردا بخۆیتەوە.' بازرگان تەواوی ئەوانەی پەیدا کردن. دای بە خێزانی و گوتی: 'ئەوانە جوان بکوڵێنە و ئەو تێکەڵەش هەڵگرە هەر کاتێک داوام کرد، بمدەرێ.' ژنی بازرگانەکە ئەوەی بازرگان ڕایسـپاردبوو هەمووی بە وردی ڕاپەڕاند. شـەوێ کاتێک شـێویان کرد و بازرگان خواردنەکانی خوارد، داوای تێکەڵەکەی کرد. کەمێکیشـی لەو خوارد. ئەو شـەوە لەگەڵ خێزانی جووت بوو. وا بوو هەر ئەو شـەوە خێزانی دوو گیان بوو.

"دوای ئەوە نۆ مانگ و شـتێکی پێ چوو. خێزانی لە مانگ و ڕۆژی خۆیدا بوو. ڕۆژی خۆی ژانی هاتێ و کوڕێکی بوو. مامان و دایەن و ژنانی دەوروبەری دەسـتیان کرد بە زیقەزیق و قریوەقریوی شـادی. قوماشـێکی ئاوریشـمیان لە سـاواکەوە پێچا و بانگیان بە گوێیدا دا. ئینجا بە دایکیان سـپارد. دایکی مەمکی لە دەمی نا. ژەکی دایە و گۆشـی کرد. کۆرپەکە خەوی لێ کەوت. دایەن سێ ڕۆژان لە لایان خەوت. دوای سێ ڕۆژە حەڵوایان لێ نا و بۆ دەروجیران و شـتیان نارد. ڕۆژی حەوتەم خوێیان بە منداڵەکەدا کرد. ئەوجا شـەمسـەددین هات و سـڵاوی لە خێزانی کرد و پیرۆزبایی لێ کرد. لێشـی پرسـی: 'سـپاردەکەی خودا لە کوێیە؟' منداڵەکەیان بۆ برد. منداڵەکە حەوتڕۆژە بوو. بەڵام هەرکەس دیبای وەک یەکسـاڵی دەهاتە بەرچاو. کە بازرگان چاوی پێی کەوت، سـەیری کرد وەک مانگ دەدرەوشێتەوە. دوو خاڵی عەنبەراسای بە ڕوخسارەوەیە. بە خێزانی گوت: 'ناوت ناوە چی؟' خێزانی گوتی: 'ئەگەر کچ بووایە، من ناوم دەنا، بەڵام چونکە کوڕە، دەبێ هەر خۆت ناوی لێ بنێی.' ئەو دەم بە فاڵ ناویان بۆ منداڵ دەدۆزییەوە. باسـی ئەوە دەکرا کە یەکێک گوتی: 'با ناوی عەلائەددین بێ.' بازرگان گوتی: 'ناوی دەنێین عەلائەددین ئەبووشامات.' واتە عەلائەددینی خاوەن خاڵی عەنبەرین.

"دوای ئەوە چەند دایەنیان بۆ دیاری کرد. دوو سـاڵی تەواو شـیری درایە. پاشـان لە مەمکیان کردەوە و دەستی کرد بە هەڵدان و گەورەبوون هەتا تەمەنی گەیشتە حەوتساڵان. لە ترسی چاووزار لە ساردەوێکیان کردبوو. شەمسەددین گوتی: 'هەتا خەت نەدا، نابێ بێتە دەر.' نۆکەر و کەنیزیشـیان بۆ دیاری کرد. کەنیزە چێشـت و شـتی بۆ سـاز دەکرد. نۆکەرەکەی بۆی دەبرد. دوای ئەوە بازرگان خەتەنەی کرد. میوانییەکی گەورەی بۆ دا. پاشان مامۆستایەکی بۆ گرت. خوێندن و نووسین و قورئان و زانستەکانی دیکەی فێر کرد.

---

١. سەقەنقور: شتێکەوە وەک سەرمازەڵە دەچێ.

"بە ڕێکەوت ڕۆژێک نۆکەرەکەی کە نانی بۆ برد، لە بیری چوو سەری سەرداوەکەی ـنیتەوە. عەلائەددین لەوێ هاتە دەرێ. چوو بۆ لای دایکی، کۆمەڵێک لە ژنی گەورەکانی ـشار لە لای دایکی بوون. کاتێک عەلائەددین لە سارداوەکە هاتە دەرێ، ژنەکان هەموو ـرووی خۆیان گرت و گوتیان: 'ئەیڕۆ ئەوە پیاوە کێیە؟!' ژنی شەمسەددین گوتی: 'ئەوە ـبیگانە نییە و کوڕی خۆمە و کوڕی شابەندەر شەمسەددینە.' ژنەکان گوتیان: 'ئێمە قەت ـنەمانزانیوە ئێوە کوڕی ئاواتان هەیە.' ژنی شەمسەددین گوتی: 'چونکە باوکی دەترسا بە چاوەوە بێ، ئەوی لە سارداوەکەدا پەروەردە کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، دایکی عەلائەددین گوتی: 'باوکی لە سارداوەکەدا پەروەردەی دەکا بۆ ئەوەی بە چاوە نەبێ. ڕەنگە نۆکەرەکەی سەری سارداوەکەی دانەخستبێ و ئەویش هاتبێتە دەرێ. دەنا باوکی دەڵێ هەتا سمێڵی بۆر نەبێ، ناهێڵم بێتە نێو خەڵک.' ئیدی ژنەکان پیرۆزباییان لێ کرد. کوڕەکە لە لای ئەوان ڕۆیشت و چووە حەوشە. لەوێوە چووە دەرێ و لە بەردەرگا دانیشت. هەر لەوێ دانیشتبوو کە خزمەتکارەکان هاتنەوە و هێسترەکەی بابیان هێناوە. عەلائەددین گوتی: 'ئەوە ئەو هێسترە لەکوێ بوو؟' پێیان گوت: 'ئەوە بابت بەو هێسترە چووەتە دووکان و ئێمەش هێنامانەوە ماڵ.' عەلائەددین گوتی: 'باوکم چکارەیە؟' پێیان گوت: 'شابەندەری میسرە و یەکێک لە پیاوە گەورەکانی عەرەبە.'

"ئیدی عەلائەددین گەڕاوە لای دایکی و گوتی: 'دایە، باوکم چکارەیە؟' دایکی گوتی: 'ڕۆڵە، باوکت بازرگانە و شابەندەری بازرگانەکانی میسرە. گەورەی بەرەی عەرەبە. خەڵک لە کڕین و فرۆشتنی هەر شتێک کە نرخەکەی لە هەزار دینار بۆ سەرەوە بێ، دەبێ پرس بەو بکەن. لەوە خوارتر پرسیش نەکەن قەیناکا. ئەوەی دێتە نێو میسرەوە و لە میسرەوە دەچێتە دەرێ، هەمووی هی باوکتە. کوڕم، خودا ئاوا لە ڕادەبەدەری داوەتێ.' عەلائەددین گوتی: 'دایە، سوپاس بۆ خودا کە من کوڕی سوڵتان و گەورەی عەرەبم و بابم شابەندەری بازرگانەکانی میسرە. ئەی باشە بۆ منی لە سارداودا گەورە کردووە؟'

"دایکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، وەڵڵا لەبەر چاوی پیس نەبێ، لەبەر هیچ شتێک نەبووە.' عەلائەددین گوتی: 'ئاخر دایە، خۆ پێشی قەزا و قەدەر ناگیرێ. کەس ناتوانێ لە دەست چارەنووس هەڵێ. خۆ بابم لە باپیرم زیاتر نییە. ئەوەی بەسەر ئەو هات، بەسەر ئەویش دێ. مرۆڤ ئەمڕۆ هەیە و سبەینێ نابێ. ئەگەر هاتوو شتێکی ئاوا بێتە پێش، من بێمە دەر و بڵێم من عەلائەددینی کوڕی شەمسەددینم، لە کاتێکدا کەس منی نەدیوە، کێ باوەڕ بە من و تۆ دەکا؟ خێرا دەڵێن: 'ئێمە بە تەمەنی خۆمان نە دیتوومانە و نە بیستوومانە شەمسەددین کوڕ یان کچێکی هەبێ!' ئەو دەم ماڵەکەمان لێ زەوت دەکەن و دەیدەن بە بەیتولماڵ. ڕەحمەت لە دایک و باوکی ئەوەی گوتوویە: 'ئەگەر پیاوێک بمرێ، ماڵی لێ بڵاو دەبێتەوە و ژنەکەی یەکێک لە هەرە دوژمنەکانی دەیبا.' هەر بۆیە، دایە، بە باوکم بڵێ من بباتە بازاڕ و دووکانێکم بۆ دانێ و فێری کڕین و فرۆشتنم بکا.'

"دایکی عەلائەددین گوتی: 'ڕۆڵە، ئەگەر باوکت هاتەوە، ئەوانەی بۆ دەگێڕمەوە.' هەر بۆیە کاتێک شەمسەددین هاتەوە ماڵ، سەیری کرد ئەوە کوڕەکەی لەگەڵ دایکی دانیشتووە. شەمسەددین بە ژنەکەی گوت: 'ئەوە بۆ ئەو کوڕەت لە سارداوەکە هێناوەتە دەر؟' ژنەکەی

گوتی: 'من نەمهێناوەتە دەر. خزمەتکارەکان لە بیریان چووبوو دەرگاکە داخەنەوە. من ـەگەڵ ئەو ژنانە دانیشتبووم کە لە پڕدا عەلائەددین هاتە دەر.' دوای ئەوە ژنی شەمسەددین قسەکانی عەلائەددینی بۆ گێڕاوە. شەمسەددین گوتی: 'ڕۆڵە گیان، سبەینێ ئیشەڵڵا لەگەڵ خوم دەتبەم بۆ بازاڕ. بەڵام ڕۆڵە گیان، لە دووکان دەبێ ژیر و بەڕەوشت بی.'

"عەلائەددین ئەو شەوە لە خۆشی قسەکەی بابی هەتا بەیان خەوی لێ نەدەکەوت. کە ڕوژ بووەوە، بابی بردی بۆ گەرماو و جلوبەرگی گرانبایی و بەشکۆی لە بەر کرد. خۆی سواری هێسترێک و کوڕەکەشی سواری هێسترێکی دیکە، خۆی لەنواوە و عەلائەددین ـەدواوە ڕۆیشتن بۆ بازاڕ. خەڵکی بازاڕ سەیریان کرد ئەوە شابەندەر دێ و کوڕێکی وەک ـانگی چاردەش بەدوایدا دێ.

"یەکێک بە هاوڕێکەی گوت: 'سەیری ئەو کوڕە کە بەدوای شابەندەردا دێ! ئێمە شابەندەرمان پێ پیاوی چاک بوو چووزانین ئەوە مووی سپی و دڵی ڕەشە!' شێخ محەممەدی سمسمی کەیخودا کە لەپێشدا باسمان کرد، بە بازرگانەکانی گوت: 'ئێمە لەمەو دوا نە بە گەورەی دەزانین و نە بە شابەندەری دادەنێین.' جا دابی ئەو بازرگانانە ئاوا بوو: کاتێک کە شابەندەر لە ماڵەوە دەهات بۆ بازاڕ، لە بەر دەرگای دووکانەکەی ڕادەوەستا و کەیخودای بازاڕ و بازرگانەکان دەچوونە پێش و سڵاو و هەواڵپرسییان دەکرد، نزای کردنەوەی بازاڕیان دەخوێند. پاشان دەچوون بە لای دووکانەکانی خۆیانەوە.

"ئەو ڕۆژە شابەندەر لە بەر دووکانەکەی خۆی ڕاوەستا، بەڵام کەس لە بازرگانەکان نەهاتنە سڵاوی و نزایان نەخوێند. شابەندەر هەرای شێخی کرد و گوتی: 'ئەوە چ بووە بۆ هەموو لالووتن و نەهاتنە بەرەوە؟' شێخ گوتی: 'وەڵاهی، گەورەم، من ناتوانم قسە بشارمەوە. ڕاستییەکەی ئەوە بازرگانەکان بە تەمان تازە کاریان پێت نەبێ، نەیەنە سڵاوت و دۆعات لەگەڵ نەخوێنن!' شابەندەر گوتی: 'باشە بۆ؟ لەبەر چی؟' شێخ محەممەدی کەیخودا گوتی: 'ئەوە کێیە لەگەڵ خۆت دەیگێڕی؟ لە لای خۆی تۆ گەورەی بازرگانەکانی؟ ئەو کوڕە کۆیلەی خۆتە یان خزمی خێزانتە؟ وای تێ دەڕوانی و هۆشت بە لاوەیەتی دەڵێی حەزی لێ دەکەی و هۆگری بووی.'

"شابەندەر کە گوێی لەوە بوو بەسەریدا نەڕاند و گوتی: 'بێدەنگ بە، گڵاوی نەفام! ئەوە کوڕی خۆمە.' شێخ محەممەدی کەیخودا گوتی: 'ببوورە، خۆ ئێمە لە تەمەنماندا نەمانبیستووە تۆ کوڕت هەبێ!' شابەندەر گوتی: 'ئەی بۆخۆت گیراوەیەکت بۆ نەهێنام هەتا گونم بەهێز و کاریگەر بێ؟! هەر ئەو دەم خێزانم دووگیان بوو. ئیتر ئەو کوڕەمان بوو. بەڵام لە ترسی چاووزار گوتم کە ئەو لە ساردادوا پەروەدە بکەن. بە تەماش بووم هەتا سمێڵی بۆر نەبێ نەیهێنمە دەر، کەچی دایکی ڕازی نەبوو و داوای لێ کردم دووکانی بۆ

دانێم و ماڵ و سامان بخەمە بەر دەستی و فێری کڕین و فرۆشتنی بکەم.'

"دوایی شـێخی کەیخودا چووە لای بازرگانەکان و ڕاسـتییەکەی پێ گوتن و بۆی شـی کردنەوە. ئینجا هەموویان هەسـتان و لەگەڵ کەیخودا هاتنە لای شـابەندەر و نزایان خوێند و پیرۆزبایی کوڕەکەیان لێ کرد و پێیان گوت: 'هەژاری وەک ئێمە ئەگەر خودا منداڵێکمان بداتێ، ناچارین میوانی بگێڕین و خەڵک و دەوروبەریانمان بانگهێشـــت بکەین. ئەی تۆ بۆ وات نەکرد؟' ئیدی شـــابەندەر پێی گوتن: 'منیش هەمووتان بانگ دەکەم و لە باخ جێژنەکە دەگرین.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شابەندەر بەڵێنی میوانی پێ دان و گوتی: 'لە باخ کۆ دەبینەوە.' بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی، شابەندەر فەرش و کەلوپەلی پێویستی چێشتلێنانی ناردە باخ. دوو کوڕیان پێک هێنا، یەکیان بۆ میوانانی شەمسەددین و ئەویتریان بۆ میوانانی عەلائەددین. بابی بە عەلائەددینی گوت: 'ڕۆڵە گیان، ئەگەر گەنج و لاو هاتن، تۆ بەرەو پیرییان بچۆ و بیانبە کوڕەکەی خۆت. ئەگەر هی بەتەمەنیش هاتن، ئەوە خۆم پێشوازییان لێ دەکەم و دەیانبەمە دیوەکەی خۆم.' عەلائەددین گوتی: 'ئەو دوو کوڕە، یەکیان بۆ گەنجان و یەکیان بۆ پیران، چ نهێنییەکی تێدایە؟' شەمسەددین گوتی: 'لاوەکان شەرم لە پیرەکان دەکەن؛ ناتوانن بە دڵی خۆیان ڕابوێرن.'

"وا بوو کە بازرگانەکان دەهاتن، شەمسەددین دەچووە پێشوازییان و دەیبردنە کوڕەکەی خۆی. کە کوڕوکاڵیش دەهاتن، عەلائەددین دەچووە پێشوازییان و دەیبردنە کوڕەکەی خۆی. کە میوانەکان هاتن، خواردن داندرا. خواردنیان خوارد و خواردنەوەیان خواردەوە. کەیف و خۆشییان کرد. لەنێو پیاوەکاندا بازرگانێکی تێدا بوو ناوی مەحموودی بەلخی بوو. بە ڕواڵەت موسوڵمان و لە دڵەوە مەجووس بوو. ئەو چاوی بە عەلائەددین کەوت، لە دڵی خۆیدا خۆشی ویست و گیرۆدەی بوو. تەماعی تێ کرد. هەر بۆیە مەحموود هەستا چووە ئەو شوێنەی کوڕی بازرگانەکانی لێ بوو. ئەوان کە مەحموودی بەلخییان دیت، لەبەری هەستان. بە ڕێکەوت عەلائەددین لەو جەنگەیەدا کارێکی پێویستی هەبوو هەستا چووە دەرێ. مەحموود ڕووی لە کوڕەکان کرد و گوتی: 'ئەگەر ئێوە عەلائەددین ڕازی بکەن لەگەڵ من بێ بۆ سەفەرێک، من هەر یەکەی خەلاتێکی باشتان دەدمێ.' ئەوەی پێ گوتن و هەستا لە کوڕەکەی ئەوان هاتە دەرێ. چووەوە بۆ نێو پیاوەکان. دوایی عەلائەددین هاتەوە ژوور. کوڕەکان لە بەری هەستان. بردیانە لای سەرەوە. ئینجا یەکێک لە کوڕەکان بە ئاواڵەکەی خۆی گوت: 'کاک حەسەن، تۆ چەندت سەرمایە هەیە و چۆنت پەیدا کرد؟' حەسەن گوتی: 'من کە گەورە بووم، بە بابم گوت: 'بابە، پارەیەکی باشم بدەرێ، کاری پێوە دەکەم.' بابم گوتی: 'ڕۆڵە، من هیچم نییە، بچۆ کەمێک پارە لە کەسێک وەرگرە و کاری کڕین و فرۆشتنی پێوە بکە.' منیش چووم بۆ لای یەکێک لە بازرگانەکان بایی هەزار دینارم شت لێ کڕی و چووم بۆ شام. خێرەکەم یەک بە دوو بوو. ئیدی لەوێوە شتی دیکەم کڕی و لە شامەوە بردم بۆ بەغدا. شتەکەم فرۆشت دیسان سوودەکەی یەک بە دوو بوو. بەو جۆرە کارم بوو بە کڕین و فرۆشتن و سەفەری ئەم شارەوشار و سەفەری دووورودرێژ. هەتا سەرمایەکەم بوو بە دەهەزار دینار. هەر جارەی ئەو پرسیارە لە یەکێک لە بازرگانزادەکان دەکرا. هەتا نۆرە گەیشتە عەلائەددین. ئیتر ڕوویان لە

عەلائەددین کرد و گوتیان: 'کاکە تۆ چیت کردووە؟ گوتی: 'من لە سـاردداودا گەورە کراوم. هەفتەی پێشــوو هاتوومەتە دەر. دێمە دووکان و دەڕۆمەوە.' کوڕەکان گوتیان: 'تۆ خووت بەو دانیشــتنەی ماڵەوە گرتووە و نازانی ســەفەر چەندە خۆشــە. پیاوان پێویســتیان بە سەفەرە.' عەلائەددین گوتی: 'من پێویستیم بە سەفەر نییە. خۆشی و حەسانەوەش لە هەر کوێ هەر وەک یەک وایە.' یەکێک لە کوڕەکان گوتی: 'ئەو لە ماســی دەچێ، ئەگەر لە ئاوەکەی خۆی بێتەوە دەرەوە دەمرێ.' هێندێکیان پێکەنین. دوایی یەکیان بە عەلائەددینی گوت: 'کاک عەلائەددین، کوڕەبازرگان جگە لە سـەفەر هیچ شـتێکی نییە شـانازی پێوە بکا.' ئیدی عەلائەددین بە قسەکانی ئەوان ناڕەحەت بوو. هەستا هاتە دەر و سواری هێسترەکەی بوو و بە گریان بەرەو ماڵ بووەوە. دایکی ســەیری کرد ئەوە عەلائەددین زۆر ناڕەحەتە و دڵی پڕە و دەگری. گوتی: 'ڕۆڵە، ئەوە بۆ دەگرییــت؟' عەلائەددین گوتی: 'ئەو کوڕە بازرگانانە ســـەرکۆنەیان کردم و دەیانگوت: 'کوڕە بازرگان جگە لە ســـەفەر، هیچی نییە شانازی پێوە بکا.' "

لێرەدا ســوپای تاریکی کەوتە پاشــەکشــە و ڕۆژ دیاری دا و شــەهرزادیش درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلائەددین بە دایکی گوت: 'دایە، گوتیان: 'کوڕە بازرگان جگە لە ـــەفەر هیچی نییە شانازی پێوە بکا.' ' ئیدی دایکی بە عەلائەددینی گوت: 'ڕۆڵە، ئێستا تۆ ـە تەمای بچی بۆ سەفەر؟' عەلائەددین گوتی: 'بەڵێ، دەمەوێ بچم بۆ سەفەر.' دایکی گوتی: ـدچی بۆ کام شـــار؟' گوتی: 'دەمەوێ بچم بۆ بەغدا، چونکە لەوێ خەڵک یەک بە دوو ــــوود دەدەن.' دایکی گوتی: 'ڕۆڵە، باوکت ســـەرمایەیەکی زۆری هەیە. هەرچی بتەوێ ـدتداتێ. ئەگەر ئەویش نەتداتێ، من لە مـاڵی خۆم دەتـدەمێ.' عەلائەددین گوتی: 'دەی باشـــترین چاکە ئەوەیە کە پەلەی تێدا بکەی. ئەگەر دەتەوێ چاکە بکەی، ئێســـتا کاتی چاکەکارییە.' ئیدی دایکی عەلائەددین بانگی ئەو نۆکەر و خزمەتکارانەی کرد کە دەیانزانی بار و شت بپێچنەوە. پێی گوتن کە دە بار کاڵا کە لە بەغدا فرۆشی باشیان دەبێ، بپێچنەوە. دایکی عەلائەددین خەریکی ئەوانە بوو.

"باوکی ئەعلائەددینیش کە ئیســـتێک بوو عەلائەددینی وەبەر چاوی نەدەهات. هەســـتا ـــەرنجێکی ئەمبەر و ئەوبەریدا، نەیدی. هەواڵی پرسـی، گوتیان: 'سـوار بوو ڕۆیشـتەوە ماڵێ.' شابەندەریش سوار بوو بەدوای ئەودا ڕۆیشـتەوە. کەچی باری پێچراوە و ئامادەی دیت، پرسی: 'هی کێیە؟' خێزانی شەمسەددین ئەوەی بەسەر عەلائەددین هاتبوو، هەمووی بو گێڕاوە. شـــەمســـەددین بە عەلائەددینی گوت: 'ڕۆڵە گیان، هیوادارم خودا ســـەفەر هەڵگرێتەوە. پێغەمبەر درووود و سڵاوی خودای لێ بێ فەرموویەتی: 'یەکێک لە ڕەحمەتەکان ئەوەیە ڕزق و ڕۆزیت لە وڵاتی خۆت دەست کەوێ و سەفەر نەکەی.' پێشینیان گوتوویانە: 'خۆ لە سەفەر بپارێزە، ئەگەر زۆریش دوور نەبێ.' دوای ئەوە بە کوڕەکەی گوت: 'یانی تۆ هەر دەبێ ئەو سەفەرە بکەیت و بە تەما نییت لێی پاشگەز ببیتەوە؟' عەلائەددین گوتی: 'من هەر دەبێ ســـەرمایەیەک لەگەڵ خۆم بەرم و ســـەفەرێک بکەم بۆ بەغدا. ئەگەر نا جلی دەروێشان لە بەر دەکەم و شار بە شار دەگەڕێم.'

"شـەمسـەددین گوتی: 'خۆ من هەژار و دەسـتەنگ نیم. کەلوپەل و پێداویسـتی هەموو شـــارێکم هەیە. بۆ نموونە چل بارم هەیە کە هەر بارەی چلهەزار دیناری نرخ بۆ دیاری کراوە و لەسەری نووسراوە. ئەو چل بارە لەگەڵ ئەو بارەی دایکت بەرە و خودا ئاگادارت بێ. بەڵام کوڕی من، وریای دوو جێگا بە، یەکیان بێشـەیەکە پێ دەڵێن 'بێشـەی شـێران.' ئەوی دیکە بێروونێکە، 'بێروونی ســـەگەلی' پێ دەڵێن کە هەتا ئێســـتا زۆر کەس لەو دوو شـوێنە تێدا چوون و گەنج و لاوێکی زۆری تێدا کوژراوە.' عەلائەددین گوتی: 'لەبەر چی؟' شـەمسـەددین گوتی: 'ڕەوەندەیەکی چەتەی لێیە کە عەجلانی پێ دەڵێن، تەواوی ئەو کارانە

لەبن سەری ئەودان.' عەلائەددین گوتی: 'خوا پشتیوان بێ، زیانی بۆ من نابێ.'

"دوای ئەوە عەلائەددین لەگەڵ بابی ســـوار بوو چوون بۆ بازاڕی ئاژەڵان. لە پڕدا باربەستێک لە هێسترەکەی دابەزی و دەستی شابەندەری بازرگانی ماچ کرد و گوتی: 'لە مێژە ماڵ و کەلوپەلی تۆم نە پێچاوەتەوە و لەگەڵت نەهاتووم بۆ سەفەر.' شابەندەر گوتی: 'تازە من پیر بووم، بۆ سەفەر نابم. ئێستا نۆرەی سەفەری کوڕەکەمە.'

پەنجا و حەوت ســـاڵی تەمەنم هەروا ڕۆیی
خۆشـــی و نـاخۆشـــی نـازانم چـاوا ڕۆیی
دایمە لە شـــک و گومـانـدام لە تەمەنی خۆم
تـا ئێرە چۆن هـاتووم و لێرەوە چۆن دەڕۆم؟!

"باربەســت گوتی: 'خوا ئەو کوڕەت بۆ بێڵێ.' دوای ئەوە شـابەندەر کوڕەکەی خۆی بە باربەســت ســپارد و پێی گوت: 'ئەوە لە جێی کوڕی خۆتە.' پاشــان ســەد دیناری دایە و گوتی: 'ئەوەش بەسەر بەردەستەکانتدا دابەش کە.'

"شــابەندەر ئەوجار شــەســت وشــتری کڕی. بە عەلائەددینی گوت: 'ڕۆڵە، ڕاســتە من لەگەڵت نیم، بەڵام ئەو پیاوە وەک باوکی تۆ وایە و لە جێی منە. ئەوەی پێت دەڵێ، دەبێ بە گوێی بکەی.' دوای ئەوە هێســـتر و غولامەکانیان هێناوە ماڵێ. ئەو شـــەوە بارگە و بنەیان جوان پێچاوە و نان خورا. بەیانی زوو شابەندەر شەمسەددین دەهەزار دیناری زێڕیشی دا بە عەلائەددین و گوتی: 'کاتێک کە چوویتە بەغدا، ئەگەر شتەکانت باش فرۆشرا، بیانفرۆشە. ئەگەر باش نەفرۆشرا و بازاڕ خۆش نەبوو لەو زێڕانە بفرۆشە.' دوای ئەوە بارەکانیان لێ نا و ماڵاواییان کرد. لە شـــار وەدەر کەوتن. مەحموود بەلخیش خۆی ســـاز کردبوو بۆ سـەفەر. بارەکانیان هێنابووە دەرێ. شـەمسـەددین باوکی عەلائەددین هەزار دیناری لە لای مەحموودی بەلخی مابووەوە، هی مامەڵەی پێشوو بوو. مەحموودی بەلخی هەستا چوو بۆ لای شــابەندەر بۆ ماڵاوایی. شــەمەســەددین بە مەحموودی گوت: 'هەزار دینارە قەرزەکە بدەوە بە عەلائەددینی کوڕم. عەلائەددینیش بە تۆ دەســـپێرم. لە جێی کوڕی خۆتە.' بەو جۆرە عەلائەددین و مەحموود بەلخی پێکەوە بوونە هاوسەفەر."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلائەددین لەگەڵ مەحموودی بەلخی بوو بە هاوســـەفەر. ئیدی مەحموود بۆخۆی فەرمانی دا خواردن و خواردنەوە بۆ عەلائەددین و هـاورێکانی ئامادە بکەن. دوای ئەوە کەوتنە ڕێ. مەحموود بەلخی چوار ماڵی لە چوار شـاری وەک میسـر و شام و حەلەب و بەغدا هەبوو.

"عەلائەددین لەگەڵ مەحموودی بەلخی بە کێو و دەشـــت و بێروونددا ڕۆیشـــتن هەتا لە شـــام نزیک بوونەوە. مەحموودی بەلخی نۆکەرەکەی ناردە لای عەلائەددین. ســـەیری کرد عەلائەددین خەریکە نوێژ دەکـا. دوای نوێژەکە نۆکەرەکە چووە بەرەوە و دەســـتی عەلائەددینی ماچ کرد و پێی گوت: 'گەورەم ســـڵاوی دەگەیاندی و داوای لێ کردی میوانی بی.' عەلائەددین گوتی: 'هەتا پرس بە باربەستەکەم نەکەم، ناتوانم بێم، چونکە بابم منی بەو ســـپارد. لە جێی باوکمە.' ئیدی عەلائەددین لەگەڵ کەماڵەددین ڕاوێژی کرد. ئەو گوتی: 'مەچووە.'

"دوای ئەوە لە شـــامەوە بەرەو حەڵەب وەدەر کەوتن. کە گەیشـــتنە ئەوێ، لەوێش میوانییەکی ســـاز کرد و ناردی لەدوای عەلائەددین. عەلائەددین لەگەڵ کەماڵەددین ڕاوێژی کرد. گوتی: 'مەچووە.' لە حەڵەبەوە بەرەو بەغدا ڕۆیشـــتن. قۆناغێکیان مابوو بگەنە بەغدا، مەحموود لەوێش میوانییەکی دا و پیـاوی نـارد بەدوای عەلائەددینـدا. عەلائەددین بە باربەستەکەی گوت. باربەست گوتی: 'ئەمن پێم خۆش نییە. ئەو کابرایە پیاوێکی باش نییە و فاسـقە. قەت هاتوچووەی مەکە. ئەگەر لێی جودا ببینەوە، ئەوە گیانمان لە مەترسـیدایە، چونکە بارەکانمان لە یەک کارواندان.' عەلائەددین گوتی: 'جا ئەگەر وەک تۆ دەڵێی ئاوا بێ، من قەت هـاتوچووەی نـاکەم.' دوای ئەوە عەلائەددین بـارەکەی خۆی لێ داوە و لەگەڵ هاورێکانی بەنێو بێروونەکەدا ڕۆیشتن. کەماڵەددینی باربەست گوتی: 'ئێستا کە تۆ وات پێ باشە، لێرە لا نەدەی دەبێ لە ڕێگادا کەمێک پەلە بکەین. وا بێ پێش ئەوەی دەروازەی شار داخرێ بگەینە بەغدا، چونکە دەروازەی شـــار ئێوارە هەتا بەیانی دادەخرێ.' عەلائەددین گوتی: 'باوە گیان، خۆ من ئەو بارەم بۆ ســـوود و خێر نەهێناوە، من زیاتر لەبەر ســـەفەر و گەڕان بە دنیادا و کەیف و خۆشـــی هـاتووم.' کەمـاڵەددین گوتی: 'من نیگەرانی ڕێگرانی عەرەبم، دەترسم کێشەیەکت بۆ بنێنەوە.' عەلائەددین گوتی: 'تۆ فەرمانبەری یان فەرماندەر؟ من هەتا بەیانی ناچمە ناو بەغداوە بۆ ئەوەی کوڕەبازرگانەکان کاروانی من ببینن و من بناسن.' باربەست گوتی: 'من لەسەر ئەوەم ئامۆژگاریت بکەم. دەنا ئارەزووی خۆتە، چۆنت پێ خۆشە وا بکە.'

"عەلائەددین فەرمانی دا لا دەن و بارەکان بخەن. کۆیلەکان بارەکانیان داگرت. لە شوێنێک کۆ بوونەوە و هەتا نیوەشەو لەوێ بوون. ئینجا عەلائەددین کاری پێشاوی هەبوو. لەوان دوور کەوتەوە. لە دوور چاوی بە شەوقێک کەوت. کە گەڕاوە بە باربەستی گوت: 'ئەوە چییە لە دوور ترووسکەی دێ؟' باربەست کەمێک ڕاما و ورد تێی ڕوانی، سەیری کرد ئەوە شەوقی شیر و ڕمب و مەتاڵ و زەرگ و شتی وایە! کە هاتنە پێشێ، زانیان ئەوە سواری عەرەبن و سەرکردەکەشیان عەجلانە! عەرەبەکان لێیان نزیک بوونەوە و بارەکانیان دیت. بانگی یەکتریان کرد و گوتیان: 'هاوڕێیان، وەرن ئەمشەو شەوی دەسکەوتە.' کە گوێیان لەو دەنگە بوو باربەست چووە بەرەوە پێی گوت: 'کاکە، پیاوی چاک بە! دەست لەو کارانە هەڵگرە.' ئیدی شێخ عەجلان زەرگێکی لە سینگی دا. لە بڕبڕەی پشتی هاتەوە دەرێ. لە جێوە مرد و لە بەردەرگای تاوڵەکە کەوت. ئاوگێڕەکە گوتی: 'خوێڕی، ئەوە چیت کرد؟' ئەویشی بە شیر دووقاش کرد. عەلائەددین لە پەنایەک ڕاوەستابوو هەر سەیری دەکردن. دوای ئەوە عەرەبەکان دەهاتن و دەچوون و ئەوەی قسەی کردبا دەیانکوشت. وردەوردە کەس نەما، چەند کەسێک نەبێ. خەریک بوون بارەکانیشیان هەموو ڕادەدا. عەلائەددین لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر فریای خۆم نەکەوم، ئەو جلوبەرگە بە کوشتم دەدا.' خێرا جلەکانی هەمووی لە بەر خۆی داکەند و جگە لە کراس و دەرپێیەکی سادە، هیچی لەبەر خۆیدا نەهێشتەوە. گۆمیلەکە خوێنێکی هاوڕێکانی لەوێ بوو بە لەز خۆی تێدا گەوزاند. لەو لاوە درێژ بوو. ئەمڕۆ نەمردووە و سەد ساڵە مردووە. پشووی لە خۆی بڕی. عەجلانیش بە پیاوەکانی گوت: 'ئەرێ کوڕینە، ئەو کاروانە لە میسرەوە هاتووە یان لە بەغداوە؟'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی دوسەدد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەجلانی دەشتەکی پرسی: 'ئەو کاروانە لە میسرەوە دێ یان لە بەغداوە؟' وەڵام دراوە: 'لە میسرەوە دێ.' گوتی: 'ئەگەر وایە، بگەڕێنەوە بۆ لای کوژراوەکان. بە بڕوای من گەورەی ئەو کاروانە و خاوەنی ئەو ماڵە نەمردووە.' گەڕانەوە بۆ لای کوژراوەکان و بە نێزە و شیر دیسان لێیان دانەوە. هەتا گەیشتنەوە سەر عەلائەددین. کە خۆی لە خوێنەدا تلاندبووەوە و پشووی لە خۆی بڕیبوو. چونکە جل و شتی ئاسایی لە بەردا بوو نەیانناسییەوە و وەک ئەوانی دیکە سەرە ڕمبێکیان بۆ ڕاهێنایەوە. لەو تاریکییەدا دەستێکی نادیار سەرەڕمبەکەی لاڕێ کرد و لەوەی پەنای درا. دەشتەکییەکە پێی وا بوو کە سەرەڕمبەکەی لە سینگی ئەو چەقاندووە. ئینجا بارەکانیان برد و ڕۆیشتن. کە ئەوان ڕۆیشتن، عەلائەددین لەنێو کوژراوەکاندا هەستا. دەشتەکییەکە گوێی لە هەستێک بوو. ڕاوەستا و بە هاوڕێکانی گوت: 'ڕاوەستن، گوێم لە دەنگێک بوو.' یەکێک لە سوارەکان گەڕاوە. عەلائەددینی دیت کە هەڵدەهات. هەرای کرد: 'هەڵمەیە بێئاکامە، چونکە ئێمە بەدواتەوەین.' ئیدی عەرەبەکە کەوتە سەری. عەلائەددین گەیشتە حەوزێکی پڕ لە ئاو. خۆی تێ هاویشت. سەکۆیەک لەوێ بوو. لە حەوزەکە هاتە دەرێ. چوو لەسەر سەکۆکە درێژ بوو. گوتی: 'خودایە، پەنا بۆ تۆ دێنم! خۆت ڕزگارم کە! لەو جەنگەیەدا گوێی لە هاوارێک بوو کە دەیگوت: 'ئەی هاوار، دووپشک پێوەی دام! ئەی هاوار، دووپشک پێوەی دام!' وا دیار بوو ئەوەی دوای کەوتبوو دووپشک پێوەی دابوو. غەڵبەغەڵبێک پەیدا بوو. هاوڕێکانی هاتن بردیان و ڕۆیشتن. باش بوو لە تاریکی شەودا ون بوو.

"ئەوان ڕۆیشتن و عەلائەددین هەر لەوێ خەوی لێ کەوت. مەحموودی بەلخییش فەرمانی دا بارەکانیان لێ نا. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە 'بێشەلانی شێر.' کاتێک غوڵام و کۆیلەکانی عەلائەددینی لەوێ دیت، خۆشحاڵ بوو. هێسترەکەی زۆری تینوو بوو. ڕۆژ بوو و حەوزەکە لە دوور دیار بوو. چوو بۆ لای حەوزەکە هێسترەکەی ئاو بدا. سەری برد لە حەوزەکەدا ئاو بخواتەوە، تارمایی عەلائەددینی دیت. سەری هەڵهێنا چاوی بە عەلائەددین کەوت کە بە کراسێک و دەرپێیەکەوە لەوێ خەوتبوو. مەحموود بە عەلائەددینی گوت: 'ئەوە کێ وای لێ کردووی و ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوی؟' عەلائەددین گوتی: 'عەرەب ئاوای لێ کردین.' مەحموودی بەلخی گوتی: 'ڕۆڵە، تەواوی ئەو ماڵ و یەکسمەکانە بە قوربانی خۆت بێ، خۆت نارەحەت مەکە:

لەدوای ئارامی، ئاڵۆزی هەر دێت
بشێویش ڕۆژێ هەر ئارام دەبێت

" 'ڕۆڵە گیان، وەرە خوارێ و مەترســـە. نیگەران مەبە.' ئیدی عەلائەددین هاتە خوارێ. مەحموود بەلخی سواری هێسترێکی کرد و ڕۆیشتن هەتا شاری بەغدا. کە چوونەوە ماڵی مەحموودی بەلخی، مەحموود بە عەلائەددینی گوت بچێتە گەرمــاو. عەلائەددین چووە گەرماو. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، مەمنا لەو کابرایە بەدگومان بوو، پێی پیاوێکی ناپاک بوو نەچووەوە لای ئەو و ســـەری خۆی هەڵگرت و چووە ناو شـــار. بەو تارییکییە لەنێو کۆڵان و شـــەقامەکاندا دەســـووڕاوە هەتا گەیشـــتە بەردەرگای مزگەوتێک. بە دالانی مزگەوتەکەدا ڕۆیشتە ژوورێ. شوێنەکە ئارام و بێدەنگ بوو. چاوی بەملا و بەولادا دەگێڕا. شـەوقێک دیار بوو. کە ورد تێی ڕاما، دوو کۆیلە بوون فانۆسـێکیان بە دەسـتەوە بوو. دوو بازرگانیش بە شـــوێنیاندا دەهاتن. یەکیان پیاوێکی جوانچاک و خوێنشـــیرین و ئەوی دیکەشـیان لاوێکی قەد و باڵا سـەلو و گوڵعوزار. هاتنە مزگەوتەکەوە. عەلائەددین گوێی لێ بوو گەنجەکەیان بە بازرگانەکەی دەگوت: 'مامە، تۆ خودا ئەو کچەتم بدەوە.' بازرگانەکە گوتی: 'چەند جارم دەنگ داوی. تۆ قەبووڵت نەکرد. تۆ هەر تەلاقت خوارد.' بازرگانەکە ئەوەی گوت و چاوێکی لە لای ڕاسـتی خۆی کرد، کوڕێکی دیت کە لە سـووچێکی مزگەوت دانیشـــتووە و دەڵێی مانگی چواردەیە. ســـڵاوی لێ کرد. ئەویش وەڵامی ســـڵاوکەی داوە. پرســـی: 'تۆ کێی، کوڕی چاک؟' گوتی: 'من عەلائەددینی کوڕی شـــەمســـەددین شـــابەندەری بازرگانەکانی میســـرم.' کابرا گوتی: 'ئەی باشـــە بۆ لێرەی؟' عەلائەددین ناچار بۆی گێڕاوە: 'تکام لە بابم کرد سـەرمایەیەکم بداتێ و پەنجا باری کاڵای گرانبایی وەک سـەرمایە بۆ بار کرد کردم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلائەددین بەو بازرگانەی گوت: 'بابم وەک سەرمایە پەنجا باری ماڵ بۆ ساز کردم و دەهەزار دیناری زێڕی نەقدیشی دامێ و بەڕێی کردم. وابوو هاتم هەتا گەیشتمە ئەو شوێنەی بێشەی شێرانی پێ دەڵێن، لەوێ عەرەبان بە سەریاندا داین و تالانیان کردین. قسمەت وابوو، من بە هەر شێوەیەک بوو، خۆم ڕزگارم کرد و هەلاتم. ئێرەش نەمدەزانی ڕوو لە کوێ بکەم. وا بوو تووشی ئێرە بووم و پەنام بۆ ئێرە هێنا.' بازرگان گوتی: 'ڕۆڵە، دەڵێی چی من هەزار دینارە زێڕە نەقدەکەت و جلوبەرگە هەزار دینار باییەکەت بدەمەوە؟' عەلائەددین گوتی: 'ئەوانەم بە چ بۆنەیەکەوە دەدەیتێ؟' بازرگانەکە گوتی: 'ئەو کوڕەی ئێستا دەیبینی لە گەڵمە، برازای خۆمە. براکەم جگە لەو کوڕە کوڕی دیکەی نەبوو. منیش کچێکم هەیە جگە لەوە کچی دیکەم نییە. کچەکەم ناوی زبێدەی عودیەیە. لە جوانی و چاکیدا لەو شارەدا دەنگی داوەتەوە. من کچەم دایە. ئەو کوڕە کچەکەمی خۆش دەویست، بەڵام کچەکە بەوە ڕازی نییە و هەمیشە کێشەیانە. ئەو کوڕە سێ تەلاقەی خوارد و لێی جیا بووەوە. دوای ئەوە هەر ڕۆژەی کەسێک دەنێرێ کە من کچەکەمی بدەمەوە. منیش بۆ ئەوەی تەمبێ بێ، گوتم وا جوانترە و دەبێ شەوێک مارەبەجاش بکرێ[1]. ئیتر لەگەڵ برازاکەم ڕێک کەوتین لەسەر ئەوەی کە کەسێکی غەوارە ببێتە جاش و لێی مارە بکەین. ئاوا ئابڕووشمان ناچێ و کارەکەشمان جێبەجێ دەبێ. ئێستا چونکە تۆش غەوارەی، لەگەڵمان وەرە ئەو کچەت لێ مارە دەکەین هەتا بەیانی. تۆ ئەمشەو هەتا بەیانی لەگەڵی بە. بەیانییش کە ڕۆژ بووەوە، تەلاقی بدە. ئەو زێڕ و ماڵەی گفتم پێ دابووی، وەری گرە و دوای کاری خۆت بکەوە.' عەلائەددین لە دڵی خۆیدا گوتی: 'جا وەڵا شەوێک لەگەڵ کیژۆڵەیەکدا لە ماڵێکی گەرم و گوڕدا بەسەر بەرم، زۆر لەوە چاکترە لە کۆلان و دالانی مزگەوتدا بخەوم. هەر هیچیشم نەداتێ دەچم.' ئیدی هەستا و لەگەڵیان ڕۆیشت بەرەو ماڵی قازی.

"کە قازی چاوی لە عەلائەددین کرد، ئەوی وەک لاوێکی ژیر هاتە بەرچاو. بە باوکی کچەی گوت: 'دەتەوێ چ بکەی؟' بازرگان گوتی: 'دەمەوێ کچەکە مارەبەجاش بکەم. ئەمشەو لەو کوڕەی مارە بکەم. بەڵام دەهەزار دیناری وەک بارمتە لەسەر بنووسە، ئەگەر بەیانی تەلاقی نەدا، لەسەری بێ و دەبێ بیدا. ئەگەر ئەمشەو لە لای بوو و بەیانی تەلاقی دا، ئەوە هەزار دیناری پارە بدەمێ و دەستێک جلوبەرگی هەزار دینار بایی بۆ بکڕم.

---

١. یانی شەوێک ئافرەتەکە لە کەسێکی دیکە مارە بکرێ هەتا بەیانی. بەیانی ئەو کەسە تەلاقی بداتەوە، جا بچێتەوە لای مێردەکەی خۆی.

لەگەڵ هێسترێکی هەزار دینار بابی.'

"بەو شـــێوەیە کچەیان لە عەلائەددین مارە کرد. بابی کچە جوان عەلائەددینی تێگەیاند. چوون جلوبەرگیان لە بەر کرد و بردیان بۆ ماڵی کچە. بە کچەیان گوت: 'جوان بزانە ئەوە بە شـێوەیەکی کاتی لە کوڕێکی جوانچاک بە نێوی عەلائەددین ئەبووشـامات مارەکراوی.' ئیدی جوان تێیانگەیاند و عەلائەددینیان پێ سپارد و گەڕانەوە ماڵی خۆیان.

"ئـامۆزای کچەکە دایەنێکی هەبوو هـاتوچۆی مـاڵی زبێـدەی عودیەی دەکرد. بە دایەنەکەی گوت: 'دایە، زبێدە ئەو کوڕە جوانچاکە ببینێ تازە بە من ڕازی نابێ. تکات لێ دەکەم کارێک بکە دەســـتی پێی ڕانەگا. نەهێڵێ تخونی کەوێ'. دایەنەکە گوتی: 'بە جوانیت قەسـەم، ناهێڵم ئەو کوڕە دەسـنوێژی لێی بشـکێ.' ئینجا دایەنە هاتە لای عەلائەددین و پێی گوت: 'من لەڕێی خوادا شـتێکت پێ دەڵێم، بەڵام بە قسـەم بکە. لەو کچە نێزیک مەبەوە. لێی گەڕێ با تەنیا بخەوێ و دەسـتی لێ مەدە.' عەلائەددین گوتی: 'باشـە بۆ؟!' دایەنە گوتی: 'تۆ شوکری خودا کوڕێکی جوانچاک و ساغی. ئەو نەخۆشی گولی لەگەڵە. دەترسم وێی کەوی بیگرییەوە. حەیفە! من لەبەر خۆت دەڵێم، خەمی تۆمە. دەنا کەیفی خۆتە.' عەلائەددین گوتی: 'من کارم بە شتی ئاوا نییە.'

"دوای ئەوە دایەنەکە هەستا چووە لای کیژەکە. تەواوی ئەوانەی بە عەلائەددینی گوتبوو بەویشی گوت. کچەش گوتی: 'من خۆم لە شتی ئاوا نادەم. با ئەمشەو لە کونجێکدا بە تەنیا بخەوێ، تـا بەیـانی هەڵدەســـتێ و دەڕوا.' زبێدەی عودیە گـازی کەنیزەی کرد و گوتی: 'ســـفرەی بۆ ببەن با نانەکەی بخوا.' کەنیزە ســـفرەکەی بۆ ڕاخســـت. خواردنیان لەپێش عەلائەددین دانا. عەلائەددین هەتا تێر بوو خواردی. دوای ئەوە بە دەنگێکی خۆش دەســـتی کرد بە قورئانخوێندن و سـوورەتی یاسـینی خوێندەوە. کیژەکە گوێی لێ ڕاگرت، زۆری پێ خۆش بوو. هەســـتی کرد دەنگی لە دەنگی داوود دەچێ. لە دڵی خۆیـدا گوتی: 'خوا ئەو پیرێژنە لەنێو بەرێ وا بەو کوڕەی دەگوت گولە. کوا کەسێک نەخۆشی گولی هەبێ دەتوانێ ئاوا بە ئاســـانی و بەو دەنگ و ئاوازە قورئان بخوێنێتەوە؟! ئەو پیرێژنە لە بارەی ئەو کوڕەوە درۆ دەکا.' دوای ئەوە کچە دەســـتی دا عوودەکەی. تارەکانی توند کردنەوە. بە دەنگێکی خۆش و شادەوە ئەو شیعرەی وەها خوێندەوە کە مەلی لە ئاسمان ڕادەگرت:

ئـاســـمـان ئێرەییم پێ دەبـا، مـانـگ ئەمشـــەو میوانی منە
خۆشـــی و شـــادی هەموو دونیـا. کۆترێکە و لە لانی منە
دەنـگ و ئـاوازی شـــیـرینـی، دڵـی مـن ئـاوپـڕژێـن دەکـا
گـمەی دێ و بـۆ مـن دەخـوێـنـێ، مەلـی ئـاســـمـانـی مـنە

"کاتێک عەلائەددین گوێی لە شێعری کچەکە بوو، دەستی لە سوورەتی یاسین هەڵگرت. ئینجا بە دەنگ و ئاوازێکی خۆش ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دەنگی بلاوێنت بە گوێی دڵی شـەیدام دەچرپێنی
باوەشــی بۆت ئاواڵەیە، زووکە زەمان کورتی دێنی

ئیدی کچە سۆزی بۆی بزووت، هەستا پەردەکەی لا دا. کاتێک عەلائەددین ئەوی دیت، ئەو شێعرەی گوت:

تۆ لە هەر دەرکێکەوە بێی بەو هەموو شـۆخ و شـەنگییەوە
دەرکەیەکی خێر و بێرە بە ڕووی خەڵـکا دەیـکەیەوە

"دوای ئەوە کچە هەنگاوی نا. بە نیگایەک وا دڵی ژێروژوور کرد کە تیری موژەی کچە ئی عەلائەددینی پێکا. ئینجا عەلائەددین ئەو شێعرەی گوت:

ڕێکوپێک و لەبـارە لـەنجە و لاری شیرینت
کـار لـە دڵی پیـاو دەکـا گفتولفتی شیرینت
زۆر سـەیرە لەم شـارەدا خوداپەرەسـتێک مابێ
مەگین قەتی نەدیبێ بزە و خوێنی شـیرینت!

"ئیدی کاتێک کچە لە عەلائەددین چووە پێشێ و دوو هەنگاوێکی مابوو عەلائەددین ئەو بەیتەشی گوت:

دارێکی ڕێکی بەری هەموو میوێکت هەیە
چ بکەم بە تۆ ڕاناگا، دەسـتی نیازم قوڵەیە

"کاتێک کچە چوو لە پێش عەلائەددین ڕاوەستا، عەلائەددین گوتی: 'لێم دوور کەوە با ئەو نەخۆشـییەی تۆ نەگرمەوە.' کچە قۆڵی هەڵکرد و بازنی سـپی پیشـان دا. ئینجا کچە گوتی: 'تۆ دەبێ لاچی هەتا گولییەکەی تۆ بۆ من نەیە.' عەلائەددین گوتی: 'کێ بە تۆی گوتووە کە من نەخۆشـی گولیم هەیە؟' کچە گوتی: 'لە پیرێژنەکەم بیسـت.' عەلائەددین گوتی: 'هەر ئەو بە منیشی گوت تۆ گولی.'

"عەلائەددینیش کراسەکەی داکەند و لەشی وەک کافووری نیشانی ئەو دا. ئیدی کچە لە باوەشـی گرت و هەتا بەیانی لە بەزم و خۆشـیدا بوون. کە ڕۆژ بووەوە، عەلائەددین پێی

گوت: 'حەیف لەو هەموو خۆشییە بێبەری بم.' کچە گوتی: 'مەبەستت لەو قسەیە چ بوو؟' عەلائەددین گوتی: 'خانم، من هەرچەند سەعاتێکی دیکە لەگەڵ تۆ دەمێنمەوە. دەبێ لێک جودا ببینەوە.' کچە گوتی: 'ئەوە کێ قسەی وای کردووە؟' عەلائەددین گوتی: 'بابت دەهەزار دیناری وەک مارەیی تۆ خستووەتە پێی منەوە. ئەگەر تۆ تەڵاق نەدەم، دەبێ دەهەزار دینار لە لای قازی بدەم بە بابت. ئەگینا ئەمڕۆ قازی دەمخاتە زیندانەوە. ئێستا من درەمێکیش شک نابەم چ بگا بە دەهەزار دینار.' کچە گوتی: 'ژن هی تۆیە و تەڵاقدانی بە دەست تۆیە.' عەلائەددین گوتی: 'ڕاستە تەڵاقدان بە دەست منە، بەڵام من هیچ شتێکم نییە تا مارەیییەکەی تۆی پێ بدەم.' کچە گوتی: 'جێبەجێ دەبێ، خۆت نارەحەت مەکە و مەترسە. تۆ ئەو سەد دینارە لە من وەرگرە. ئەگەر جگە لەوەش شتێکی دیکەم هەبووایە، دەمدایتێ، بەڵام جگە لەو سەد دینارە هیچی دیکەم نییە. باوکم ئەوەندەی ئەو ئامۆزایەم خۆش دەوێ، تەواوی ماڵ و سامانەکەی بردووە لە لای ئەو دایناوە. تەنانەت زێڕ و زیوەکانی منیشی بردووەتە لای ئەو. ئەگەر سبەینێ بابم لە لای شەرعەوە کەسێکی نارد لەدوات ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە بە عەلائەددینی گوت: 'ئەگەر سبەینێ لە لایەن شەرعەوە کەسێکیان نارد لەدوات. بانگیان کردی و بابم و قازی گوتیان: 'ژنەکەت تەلاق بدە.' تۆ پێیان بڵێ: 'لە کام شەرعدا ئەوە ڕەوایە شەو ژنێکت لێ مارە بکەن و بەیانی پێت تەلاق بدەنەوە؟' دوای ئەوە دەستی قازی ماچ کە و دیارییەکی بدەیە. پاشان دەستی تەواوی هاوکارەکانی قازی ماچ بکە و یەکی دە دیناریان بدەیە. هەتا لە بەرژەوەندی تۆ دا قسە بکەن. ئەگەر کەسێک گوتی: 'جا بۆ تەلاقی نادەی کە هەزار دینار و هێستر و جلوبەرگی گرانبایی خۆت وەرگری؟!' تۆ بڵێ: 'من تاڵێک مووی ئەو کچە نادەم بە هەزار دینار و هێستر و شتی وا. قەت تەلاقی نادەم. زێڕ و هێستر و جلوبەرگیشم ناوێ.' ئەگەر قازییش پێی گوتی: 'مارەییەکەی بدەرێ.' بڵێ: 'ئێستا بە دەستمەوە نییە.' ئیدی قازی و شایەدەکان بەگەڵت دەسازێن و مۆڵەتت دەدەن.'

"عەلائەددین لەگەڵ کیژەکەدا خەریک بوون لەو بارەوە قسەیان دەکرد کە ڕاسپاردەکەی قازی لە دەرگای دا. عەلائەددین هاتە دەرێ. ڕاسپاردەی قازی گوتی: 'قازی کاری پێتە. خەزووریشت لەوێ لە لای قازی دانیشتووە.' عەلائەددین نیو دیناری لە مستی ڕاسپاردەکەی قازی نا و گوتی: 'لەکوێ دیوتە شەو ژن مارە بکرێ و بەیانی زوو تەلاق بدرێتەوە؟' ڕاسپاردەکە گوتی: 'وەڵا ئەوە لە لای ئێمەش ڕەوا نییە و ئەگەر تۆ لە شەرع ناگەی، ئێمە بکە بە پارێزەری خۆت.' ئەوجا هەر دووکیان هاتنە لای قازی. قازی بە عەلائەددینی گوت: 'ئەوە بۆ نایەی ژنە تەلاق بدەیت و بەپێی قەرار شتەکانت وەرگری؟' عەلائەددین چووە پێشێ و دەستی ماچ کرد و پەنجا دیناری لە دەستی نا و گوتی: 'سەروەرم قازی! بەپێی کام مەزهەب من دەبێ کاتی خەوتن ژن مارە بکەم و بەیانی زوو بێ ئەوەی پێم خۆش بێ تەلاقی بدەمەوە؟!' قازی گوتی: 'هەتا مێرد ڕازی نەبێ لە هیچ کام لە مەزهەبەکانی ئیسلامدا ژن تەلاق نادرێ.'

"ئیدی بابی کچە گوتی: 'ئەگەر تەلاقی نادەیتەوە، دەهەزار دینارەکە دانێ!' عەلائەددین گوتی: 'سێ ڕۆژم دەرفەت بدەنێ.' قازی گوتی: 'بە سێ ڕۆژ هیچت پێ ناکرێ و دەبێ دە ڕۆژ مۆڵەتی بدەیتێ.' لەگەڵ عەلائەددین بڕیاریان دا کە هەتا دە ڕۆژی دیکە یان مارەییەکەی بدا، یان تەلاقی بدا. بەو مەرجە لە لای قازی هاتنە دەر و گۆشت و برنج و ڕۆن و پێداویستی کڕی و چووەوە ماڵێ. قسەکانی بۆ کچە گێڕاوە. کچە گوتی: 'تۆ خەمت نەبێ. بزانین خودا کارەکان بە کوێ دەگەیەنێ و بەیانی ڕۆژگار چی بەسەر چییەوە دەبێ.'

حەولی خۆت بدە و بە خودای بسپێرە

جێبەجێش نەبێ حەتمەن وا خێرە
خودا خۆی دواڕۆژی کار دەبینێ
خێر و شەڕی کار هەڵدەسەنگێنێ

"دوای ئەوە کچە هەستا. خواردنی ساز کرد و خواردیان. ئینجا عەلائەددین داوای لە کیژە کرد بەزمێکی خۆش ساز کا. کیژە هەستا و دەستی دا عوودەکەی. وای دەژەنی تاڵەکانی عوودەکە دەنگ و ئاوازی داوودیان لێوە دەهات. ئەوان ئاوا لە ئاهەنگ و خۆشیدا بوون کە لە دەرگایان دا. کچە بە عەلائەددینی گوت: 'هەستە بزانە کێیە لە دەرگا دەدا؟' عەلائەددین هاتە دەرێ و دەرگای کردەوە. چوار دانە دەرویش لە بەردەرگا بوون. لێی پرسین: 'چیتان دەوێ؟' گوتیان: 'گەورەم، ئێمە دەرویش و غەوارەین. حەزمان لە مۆسیقا و شێعر و ئەوانەیە و ئەگەر ڕێمان بدەی، پێمان خۆشە ئەمشەو میوانی ئێوە بین و بە کەیف و خۆشی و ئاهەنگ ڕۆژ بکەینەوە. کە ڕۆژیش بووەوە، دوای کاری خۆمان دەکەوین. ئەو چەند کەسەشمان هەمووومان هۆگری شێعر و قەسیدە و غەزەلین.' عەلائەددین گوتی: 'دەبێ ڕاوێژێک بکەم.' ئیدی گەڕاوە بۆ لای کیژەکە و گوتی شتێکی ئاوایە تۆ دەڵێی چی؟ کەنیشکە گوتی: 'دەرگایان لێ بکەوە.' دەرگای لێ کردنەوە و هێنانییە ژوورێ. بەخێرهاتنی کردن. خواردنی لەپێش دانان. ئەوان نەیانخوارد و گوتیان:

ئەو سفرە بۆ برسییە، ئی تێر پێویستی پێی نییە
ڕووح و گیانی مە برسییە، مۆسیقی قووتی ئێمەیە

"دوای ئەوە یەکیان گوتی: 'گەورەم، ڕزقی ئێمە زیکری خودایە. سەما و چەنگ و بلوێرە لە دڵماندایە. ئێمە کە لێرە نیزیک بووینەوە، دەنگێکی خۆش هات و گیرساینەوە. گوێمان لە دەنگی عوود و سەما بوو. وابوو هاتین دەنگەکە برا.' عەلائەددین گوتی: 'ئەوە ئەو ژنەی من بوو ئاهەنگی دەگێرا.' ئەوجا بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە، گوتیشی کە خەزوورم دەهەزار دیناری مارەیی لێم دەوێ و دە ڕۆژی دەرفەت داومەتێ. یەکێک لە دەرویشەکان گوتی: 'خەمت نەبێ، خۆت ناڕەحەت مەکە. مەهێڵە جگە لە شادی و خۆشی هیچی دیکە لە دڵتدا جێ خۆش بکا. من شێخی تەکییەی دەرویشانم و چل دەرویشم لە بەردەستدان. پێیان دەڵێم، خێرا دەهەزار دینارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەن. ئێستا تۆ بەو کچە بڵێ ئاهەنگێکمان بۆ بگێڕێ با تۆزێک دڵمان لە خشت و خاڵی خەمان پاک بێتەوە، چونکە دەڵێن ئاهەنگ و سەما بۆ دەستەیەک جێی خواردن و بۆ دەستەیەک جێی دەرمان دەگرێتەوە.' ئەو چوار دەرویشە هاڕوونە ڕەشید، جەعفەری بەرمەکی وەزیر، ئەبوو نەواسی کوڕی حەسەن هانی و مەسرووری جەللاد بوون. هۆی هاتنەکەشیان بۆ ئەو ماڵە ئەوە بوو کە خەلیفە بێتاقەت و

دڵتەنگ بوو. بە وەزیری گوت: 'جەعفەر، با بچین لەنێو شـــار خولێک لێ دەین بەشـــکو کەمێک خەمی دڵم برەوێ.' ئیدی جلکی دەروێشانیان کردە بەر و بەنێو شاردا دەگەڕان کە ڕێیان کەوتە بەردەرکی ئەو ماڵە و گوێیان لە دەنگی ئەو عوودە بوو. ویســـتیان بزانن چ باسە.

"بەو جۆرە ئەو چوار دەروێشــە ئەو شــەوە تا بەیانی هەر خەریکی بەزم و خۆشــی و شـیعر و ســەما بوون. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە ســەد دیناری خســتە ژێر بەرماڵەکەیانەوە. زۆری دڵخۆشی عەلائەددین داوە و لەوێ هاتنە دەرێ.

"کە ژنە بەرماڵەکەی کۆ کردەوە، چاوی بە ســـەد دینارەکە کەوت. بە مێردەکەی گوت: 'هـا ئەو زێڕانە هەڵگرە، لەژێر بەرمـاڵەکەدا بوون. دەروێشـــەکـان خســـتوویـانەتە ژێر بەرماڵەکەوە.' عەلائەددین پارەکەی هەڵگرت و چوو لە بازاڕ چی پێداویستی ماڵ بوو کڕی. کە شــەو بووەوە، عەلائەددین مۆمی داگیرســـاند و بە خێزانی گوت: 'ئەو دەروێشـــانە ئەو پارەیەی بەڵێنیان دابوو نەیـانهێنا. خۆ ئەوانە ئەوەندەیـان نییە، چۆنی جێبە جێ دەکەن؟' ئەوان خەریک بوون قســـەیان دەکرد کە دەروێشـــەکان لە دەرگایان. کچە بە عەلائەددینی گوت: 'دەرگـــایـــان لێ بکەوە.' عەلائەددین دەرگـــای کردەوە. ئەوانیش هـــاتنە ژوورێ. عەلائەددین گوتی: 'دەهەزار دینارکەتان هێناوە؟' گوتیان: 'هێشـــتا بۆمان جێبەجێ نەبووە، بەلام نیگەران مەبە ســـبەینێ جێبەجێی دەکەین. جـارێ تۆ بە خێزانـت بڵێ ئـاهەنگێکی خۆشمان بۆ سـاز کا، چونکە ئێمە زۆر ناڕەحەت و بێتاقەتین و حەزمان لە سـاز و ئاواز و سەمایە.'

"ئیدی کچە دەســـتی دا عوودەکە. ئەو شــــەوەش بەزمێکی خۆشـــی بۆ گێڕان و دار و دیواری وە ســـەما هێنابوو ئەو شــەوەشــیان بە خێر و خۆشــی و بەزم و ســـەما ڕابوارد. بەیانی خەلیفە ســەد دیناری زێڕی دیکەی خســتە ژێر بەرماڵەکە و دڵخۆشـــی عەلائەددینی داوە و ڕازی کرد و ڕۆیشتن. بەو جۆرە هەتا نۆ شەو هەر ئاوا دەهاتنە لای عەلائەددین و بەیانی کە دەڕۆیشـتن ســەد دیناریان دەخســتە ژێر بەرماڵەکەی. بۆ شــەوی دەیەم نەهاتن، هۆی نەهاتنەکەشـــیان ئەوە بوو کە خەلیفە بازرگانێکی گەورەی بانگ کردبوو پێی گوت: 'پەنجا خیگە[1] شتومەکی میسری ئامادە بکە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. خیگە: جەوال.

## که شەوی دووسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە بە بازرگانی گوت: 'پەنجا خیگە شتومەکی میسری ئامادە بکە. وا بێ هەر خیگەیەی بایی هەزار دینار بێ و نرخەکەشیان لەسەر بنووسن.' غولامێکیشی بانگ کرد. وا بوو تەواوی ئەو بارەی کە خەلیفە داوای کرد بوو ساز و ئامادە کرا. خەلیفە بارەکانی بە غولامەکە سپارد. نامەیەکیشی نووسی و دایە دەستی. پێشی گوت: 'بچۆ فلانە گەڕەک لەوێ پرسیار بکە بڵێ ماڵی گەورە و خاوەنم عەلائەددینی ئەبووشامات لەکوێوەیە. خەڵک پێت دەڵێن. بچۆ خزمەتی و ئەو نامەیەی بدەرێ.'

"ئامۆزای کچەکەش ڕۆژی دەیەم کە دوایین ڕۆژی دەرفەتەکە بوو هەستا چووە لای مامی و پێی گوت: 'وەرە با بچینە لای عەلائەددین و ئامۆزاکەمی پێ تەلاق بدەین.' کە گەیشتنە بەردەرگای ماڵی عەلائەددین، سەیریان کرد ئەوە کاروانێکی پەنجا هێستری کە هەر هێسترەی خیگەیەکی کالای میسری لێ دراوە و غولامێک بەسەر هێستریکەوە لەوێ لە کۆلانەکەی ئەوان ڕاوەستاوە. بە غولامەکەیان گوت: 'ئەو بارانە هی کێن؟' غولامەکە گوتی: 'هی گەورە و خاوەنم، عەلائەددینە کە کاتێک باوکی ئەو دەنێرێ بۆ بازرگانی لە ڕێگا ڕێگرە عەرەبەکان تالانی دەکەن. ئەو هەواڵە بە گوێی باوکی، واتە شەمسەددین شابەندەر، دەگاتەوە. ئەویش ئەو سەرمایەیەی لە جیاتی بارەکەی پێشوو بۆ ناردووەتە بەغدا. ئەو هێسترەشی بە پەنجاهەزار دیناری زێڕەوە لەگەڵ ناردووە.'

"باوکی کچەکە گوتی: 'غولام خاوەنی تۆ زاوای منە، وەرە با ماڵەکەیت پیشان بدەم.' لەو کاتەدا عەلائەددین مات و مەلوول لە ماڵەوە دانیشتبوو کە لە پڕدا لە دەرگایان دا. عەلائەددین گوتی: 'زبێدە، ئەوە باوکت لە لای قازی یان لە لای حاکمی شارەوە پیاوی ناردووەتە سەرمان.' زبێدە گوتی: 'جارێ بچۆ بزانە چ باسە.' کە عەلائەددین دەرگای کردەوە، سەیری کرد ئەوە باوکی زبێدە شابەندەری بازرگانانی بەغدایە. غولامێکی گەنمڕەنگیش لەسەر هێسترێک لەو لاوە وەستاوە. هەر کە چاوی بە عەلائەددین کەوت، بە لەز بازیدا خوارێ و خۆی بەسەر لاقی عەلائەددیندا خست. عەلائەددین گوتی: 'چیت گەرەکە بۆ وا دەکەی؟' گوتی: 'قوربان، باوکی تۆ، شەمسەددین شابەندەری بازرگانانی میسر، بەو بارانەوە منی ناردووە بۆ لای تۆ.' دوای ئەوە نامەکەشی دا بە عەلائەددین. عەلائەددین نامەکەی وەرگرت کە تێیدا نووسرابوو:

بگەڕێوە ئازیزەکەم، ڕووحم لە دوای تۆ وەیلانە
باوەڕکە بەرگە ناگرێ، پەپوولێکی سەرگەردانە
گەر تەمەن مۆڵەتم بدا، ئەوجاریش دەستم پێت بگا

"پاش ئەوە نووسیبوویان: 'دوای سلاو و هەواڵپرسی و ڕێز لە لایەن شەمسەددین بۆ کوڕەکەی خۆی عەلائەددین. کوڕی خۆم، من هەواڵم هەیە کە تەواوی پیاوەکانت کوژراون و ماڵەکەت بە تالان براوە. ئەوە پەنجا بار شتومەکی میسریم بۆ ناردی. خەم مەخۆ، هەزار ئەوەندە ماڵی دنیا بە قوربانی تۆ بێ. کوڕەکەم، بیستوومە بۆ مارەیی زبێدەی کچی شابەندەری بەغدا کە بە جاش لێت مارەکراوە و ئێستا ناتانەوێ تەلاقی بدەیت و لێک جودا ببنەوە، پەنجا هەزار دیناریان پێوە بەستووە. ئەوە ئەو پەنجا هەزار دینارەشم بە غولامێک بە ناوی سەلیمدا بۆ ناردی. کوڕەکەم، ئەوە دایکت و ئەوان سلاوت لێ دەکەن و دوعای خێریان بۆت هەیە.'

"عەلائەددین کە نووسراوەکەی خوێندەوە، بارەکانی وەرگرت. بە خەزووری گوت: 'ئەو پەنجاهەزارەی مارەیی زبێدەم لێ وەرگرە. ئەو بارانەش ببە بیانفرۆشە، سوودەکەی هەڵگرە بۆ خۆت. سەرمایەکەش بدەوە بە خۆم.' خەزووری گوتی: 'ناوەڵڵا، هیچ وەرناگرم. بۆ مارەیی زبێدەش هی خێزانی خۆتە، چی لێ دەکەی بیکە. کەیفی خۆتە.'

"عەلائەددین لەگەڵ خەزووری هاتنە ژووری و فەرمانی دا بارەکان بێننە ژوورەوە. خۆشیان هاتنە لای زبێدە. زبێدە گوتی: 'بابە، ئەو بارانە هی کێن؟' باوکی گوتی: 'کچەکەم، ئەوانە هی عەلائەددینی مێردتن. باوکی لە جێی ئەو ماڵەی لێی بە تالان چووە، بۆی ناردووە. پەنجاهەزار دیناری زێڕی نەقدی بۆ ناردووە تا مارەییەکەی تۆی پێ بدا. ئیتر خۆشت دەزانی و کەیفی خۆتە کە وەری دەگری یان پێی دەبەخشی.'

"ئیدی عەلائەددین هەستا سندووقەکەی کردەوە. مارەییەکەی ژمارد. ئامۆزاکەی زبێدە گوتی: 'مامە، ژنەکەمی پێ تەلاق بدە.' باوکی زبێدە گوتی: 'کاری وا نابێ، تەلاق بە دەست مێردەکەیەتی.' ئیدی کوڕە مامەکەی بە ناڕەحەتی و مات و مەلوولی لێی دا ڕۆیشت. لە تاوان نەخۆش کەوت و ئەوەندەی پێ نەچوو مرد.

"عەلائەددینیش بارەکانی عەنبار کردن. چوو بۆ بازاڕ پێداویستی ماڵەوەی کڕی و هاتەوە. ئینجا بە زبێدەی گوت: 'چاو لەو دەروێشە درۆزنانە کە بەڵێنییەکەی خۆیان نەبردە سەر و درۆیان لەگەڵ کردین.' زبێدەش پێی گوت: 'تۆ کوڕی شابەندەر بووی و بۆ نیو درهەم دامابووی، ئیتر ئەو دەروێشە هەژارانە چۆناوچۆن دەهەزار دیناریان بۆ کۆ دەبێتەوە؟' عەلائەددین گوتی: 'ئێستا کە خودا ئێمەی لەو دەستەنگییە ڕزگار کرد، دەڵێی ئەم جارە بێنەوە دەرگایان لێ نەکەمەوە؟' زبێدە گوتی: 'تۆ بۆ ڕێزی ئەوان لە بەرچاو ناگری؟ ڕەنگە هەر خێر و بەرەکەتی ئەوان بێ لەو حاڵە هاتینە ئەم حاڵە. ئەوان بەو حاڵەوە

هەموو شـەوێ سـەد دیناریان لەژێر بەرماڵەکەدا بەجێ دەهێشت، بۆ بەوانە نازانی؟ ئەگەر ئەوان بێنەوە، دەبێ دەرگایان بۆ بکەینەوە و زۆر جوان پێشوازییان لێ بکەین.'

"کە شـــەو هاتەوە، مۆم و شـــتیان هەڵکرد. عەلائەددین بە زبێدەی گوت: 'دەســـت دە عوودەکە و چەند شـێعرێکم بۆ بڵێ.' لەو قسـانەدا بوون کە لە دەرگایان دا. زبێدە گوتی: 'دا بچۆ بزانە کێیە لە دەرگا دەدا؟' عەلائەددین چووە دەر و دەرگای کردەوە، ســــەیری کرد ئەوە دەروێشــەکانن. عەلائەددین گوتی: 'ســـڵاو درۆزنەکان! وەرنە ژووری.' ئەوان هاتنە ژووری و دانیشــتن. عەلائەددین ســفرەی ڕاخســت و خواردیان و خواردیانەوە و زۆریان بەزم و خۆشی کرد. دوای ئەوە گوتیان: 'بەڕێز عەلائەددین، ئێمە هەر لە بیری تۆدا بووین. بۆمان بگێڕەوە کە لەگەڵ خەزوورت چیت کرد؟' گوتی: 'خودا زۆر لەوە زیاتری نارد کە چاوەڕوانی بووین.' گوتیان: 'بە خودا ئێمە لە تاوی تۆ حەجمانمان نەبوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، دەرویشەکان بە عەلائەددینیان گوت: 'ئێمە هەر خەمی تۆمان بوو بەلام لەبەر دەستتەنگی هیچمان لە دەست نەهات.' عەلائەددین گوتی: 'خودا زوو فریام کەوت و باوکم پەنجاهەزار دینار و پەنجا باری شتومەکی میسری کە هەر بارەی بایی هەزار دینار بوو، بۆی ناردم. ئیدی نێوانی من و خەزوورم خۆش بوو پێکەوە ئاشت بووینەوە. سوپاس بۆ خودا ئاوا بوو.' دوای ئەوە خەلیفە هەستا چوو بۆ ئاودەست. جەعفەری بەرمەکی وەزیر بە عەلائەددینی گوت: 'عەلائەددین، بەئەدەب بە، تۆ لە هەنتەشی خەلیفەدای.' عەلائەددین گوتی: 'جا من چ بێئەدەبییەکم لە لای خەلیفە کردووە و خەلیفە کێیە؟' جەعفەری وەزیر گوتی: 'ئەوەی ئێستا قسەی لەگەڵ دەکردی و چووە دەرێ، ئەوە خەلیفە هاروونە ڕەشیدە. منیش جەعفەری وەزیرم. ئەوەش مەسروری جەللادە. ئەوەش ئەبوونەواسی کوڕی حەسەنی هانییە. بۆخۆت بە ژیری خۆت لێکی دەوە بزانە لە میسرەوە تا ئێرە چەندە دوورە؟' عەلائەددین گوتی: 'چل و پێنج ڕۆژەڕێیە.' وەزیر گوتی: 'لەو ڕۆژەوەی بارەکانی تۆیان تالان کردووە تا ئێستا دە ڕۆژە. دەی چۆن بەو دە ڕۆژە هەواڵەکەت بە باوکت گەیشتەوە و ئەویش ئەو هەموو بارەی پێچاوە و ناردییەوە ئێرە؟' عەلائەددین گوتی: 'گەورەم، پێم بڵێ ئەو ماڵ و زێڕە لەکوێوە هاتووە؟' وەزیر گوتی: 'ئەوە خەلیفە هاروونە ڕەشید ناردبوونی. لەبەر ئەوەی تۆی زۆر خۆش دەویست، ئەو چاکەیەی لەگەڵ تۆدا کرد.' ئەوان لەو قسانەدا بوون کە هاروونە ڕەشید هاتەوە ژوورێ. ئیدی عەلائەددین هەستا و کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد و گوتی: 'خوا پاداشی خەلیفە بداتەوە و تەمەن درێژ و بەردەوامی کا و بە گەورەیی بیهێڵێتەوە.'

"خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین، بە زبێدە بڵێ لە خۆشی ئەوەی کە لە دەست ئامۆزاکەی ڕزگاری بووە، بەزمێکمان بۆ ساز کا و بە دەنگ و ئاوازی عوودەکەیەوە چەند شێعرێکمان بۆ بڵێ، با دڵ و مێشکما زاخاو دا.' ئیدی زبێدە دەستی دا عوودەکەی. وای ژەنی، پیرێژنی بە قوونەوە هەڵدەپەڕاند. بەو جۆرە ئەو شەوەیان بە خۆشی بردە سەر. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە بە عەلائەددینی گوت: 'سبەینێ وەرە بۆ لام.' عەلائەددین گوتی: 'بەسەر چاو.' وا بوو ڕۆژی دوایی عەلائەددین دە مەجۆعمەی لە دیاری گرانبایی پڕ کرد و چووە هەنتەشی خەلیفە. کاتێک عەلائەددین چوو خەلیفە لەسەر کورسی خەلافەت دانیشتبوو. ئەو دوو بەیتەی بۆ خوێندەوە:

ئەسپی خۆشی و کەیف و شادیت هەمیشە زین کرا بێ
ڕۆح و جەستەی نەیارانت بە خەم دەوری درا بێ

خۆری تۆ لەسەر رووی زەوی و خاوەنی زەمانی تۆ
لەژێر پێی لەتمی زەماندا دژمنت ماڵ خرا بێ

"ئیدی خەلیفە سڵاوی لێ کرد. عەلائەددین گوتی: 'گەورەم خەلیفە، پێغەمبەر درووود و سڵاوی خودای لێ بێ دیاری وەرگرتووە و منیش ئەو دە مەجۆعمەیەم بە شتەکانی نێویانەوە بە دیاری بۆ هێناوی.' خەلیفە دیارییەکەی لێ وەرگرت. بە دیاری بەخشییەوە و ئەوی کرد بە شابەندەری بازرگانەکان. لە کۆشک جێی کردەوە. عەلائەددین لەوێ دانیشتبوو کە خەزووری هات. چاوی بە عەلائەددین کەوت کە لە جێی ئەو دانیشتووە، کەوای خەڵاتی لە بەر کردووە. بە خەلیفەی گوت: 'ئەی پاشای زەمان، ئەوە بۆ عەلائەددین لە جێگاکەی من دانیشتووە؟' خەلیفە گوتی: 'من کردوومە بە شابەندەری بازرگانان. مەگەر نەتبیستووە دەڵێن: 'پلە و پایە وەک هەوسارە، هەر رۆژەی لە ملی یەکێکدایە'؟ ئێستا تۆ لا براوی.' خەزووری عەلائەددین گوتی: 'ئەویش هەر لە خۆمانە. کارێکی باشت کردووە. زۆر کەمتەمەن گەورەی هۆزن.'

"دوای ئەوە ئاگاداری نووسی و دای بە والی شار و لە کۆشکیشدا بە هەمووانی ڕاگەیاند کە عەلائەددین شابەندەری بازرگانانە، بیسەر و پارێزەری نهێنییەکانی خەڵکە. قەدر و ڕێزی لەسەر شانی هەمووانە. بۆ رۆژی دوایی دووکانێکی بۆ نۆکەرەکەی کردەوە و خۆی سوار بوو چوو بۆ دیوانی خەلیفە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلائەددین ســـوار بوو. رووی کردە دیوانی خەلیفە بەپێی دابی پێشـــوو لە جێی خۆی دانیشـــت و هەموو رۆژێ بەو شـێوەیە چووە پێشـێ هەتا رۆژێک کەســـێک هەواڵی بۆ خەلیفە هێنا کە فلانە راوێژکارت تەمەنی خۆی دا بە جەنابت و خودا دەسەلاتی خەلیفە پایەدار کا.

"خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین ئەبووشـــامات لە کوێیە؟' عەلائەددین هاتە خزمەتی خەلیفە. کە خەلیفە چاوی پێی کەوت، خەڵاتی کرد و کردی بە راوێژکاری خۆی و مانگی هەزار دیناری بۆ برییەوە. بەو جۆرە عەلائەددین بوو بە راوێژکار و هاونشینی خەلیفە. هەر وا بە رێکەوت رۆژێک لە لای خەلیفە دانیشـــتبوو کە یەکێک لە گەورەگەورەکانی دەوڵەت هاتە خزمەتی خەلیفە و بە خەلیفەی گوت: 'سەرۆک سیتتین کۆچی دوایی کرد. خودا خەلیفەمان بۆ بپارێزێ.' ئیدی خەلیفە کەوای ئەو پۆستەشی بە شانی عەلائەددیندا دا و ئەوی کرد بە سەرۆک سیتتین. مەمنا سەرۆک سیتتینی پێشوو ژن و منداڵی نەبوو خەلیفە بە عەلائەددینی گوت بچۆ ســـەرۆک بنێژە و تەواوی ماڵ و ســـامانەکەشـــی بە ناوی خۆتەوە بکە. کاتێک کاروباری رۆژانەی دیوان تەواو دەبوو، سوار دەبوو. بەرەو ماڵ بێتەوە، ئەحمەدی دەنەف بە چوار کەس لە ژێردەســـتەکانییەوە کە ســـەرهەنگی راســـت و چەپی بوون لە خزمەتیدا بوون. ماوەیەکی زۆر ئاوا لە خزمەت خەلیفەدا بوو.

"رۆژێک لە رۆژان عەلائەددین لە دیوانەوە ســـوار بوو، بەرەو ماڵ بووەوە و ئەحمەد دەنەف و حەســـەن شـــوومان و پیاوەکانیشـــیان لەگەڵی بوون. عەلائەددین لەگەڵ زبێدەی عودییەی خێزانی دانیشـت و مۆمگەلێکیان داگیرسـاند. دوای ئەوە زبێدە کارێکی پێویسـتی بوو، هەسـتا و چووە دەرێ. عەلائەددینیش دانیشـتبوو کە هاوارێک هەسـتا. لەرێوە هەسـتا بزانێ ئەوە کێیە هاواری کرد. سـەیری کرد ئەوە خێزانییەتی لەوێ لەسـەر زەوی کەوتووە. کە دەســـتی لەســـەر دڵی دانا، نەمابوو. ماڵی باوکی زبێدەش لە پەنا ماڵی عەلائەددین بوو. ئەویش گوێی لە هاواری زبێدە ببوو. هات و بە عەلائەددینی گوت: 'ئەو هاوارە چی بوو؟' عەلائەددین گوتی: 'تۆ راوەستاو بی، زبێدە تۆ خۆش. زۆر نارەحەت و پرۆش بوون.'

"کە رۆژ بووەوە، زبێدەیان ناشت. عەلائەددین سەرەخۆشی لە خەزووری کرد. ئەویش سـەرەخۆشـی لە عەلائەددین کرد و دڵخۆشـی داوە. عەلائەددین جلی ماتەمی پۆشـی. خەم دایگرت و لە دیوانیش دابرا. خەمبار و لێوبەبار دانیشـــت. رۆژێک خەلیفە بە جەعفەری وەزیری گوت: 'ئەوە بۆ عەلائەددین تەرکی دیوانی کردووە؟' جەعفەری بەرمەکی وەزیر گوتی: 'عەلائەددین لە تاوی ژنەکەی لە ژووریدا چۆکی خەمی لە باوەش گرتووە.' خەلیفە

فەرمانی دا بانگی کەن. کە هاتە خزمەت خەلیفە. لە وەڵامی خەلیفەدا گوتی: 'لەوەتەی زبێدە مردووە، هێزی ئەژنۆم نییە. لەبەر ئەوە نەهاتوومەتە خزمەتت.' خەلیفە گوتی: 'ئەو خەم و پەژارەیە بخە لاوە. ئەوەی دەمرێ دەکەوێتە بەر ڕەحمی خوا. تازە خۆناڕەحەتکردن و ئەژنۆی خەم لەباوەشکردن دادی کەس نادا.' عەلائەددین گوتی: 'قەت لە بیرم ناچێتەوە هەتا ئەو کاتەی منیش نەمرم و لە پەنا ئەو نەمنێژن.' خەلیفە گوتی: 'خوا ڕەحمی زۆرە. جێیت بۆ پڕ دەکاتەوە. بە هیچ شێوەیەکیش پێشی مردن ناگیرێ.'

ژیان مەرگ و پیری نەبایە
بەهەشتێک دەبوو ئەم دنیایە
هەر چاو لەسەریەکدانێکە
ماوەی زۆر بێ یا کەم، هەر یەکە

"دوای ئەوە خەلیفە سەرەخۆشی لێ کرد و فەرمانی پێ دا بچێتەوە دیوان. کە لە لای خەلیفە هاتە دەرێ، گەڕاوە ماڵێ. ئەو شەوەش ڕۆژی کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، سوار بوو چوو بۆ دیوان و کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد. خەلیفە سڵاو و چاکوچۆنی لەگەڵ کرد. لە شوێنەکەی خۆی دایناوە. دوای تەواوبوونی کاتی کاری دیوان، خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین، ئەمشەو میوانی خۆمی.' شەو عەلائەددینی بردەوە ماڵی خۆی. بانگی کەنیزێکی کرد کە ناوی قووەتولقولووب بوو پێی گوت: 'عەلائەددین ژنێکی هەبوو ناوی زبێدەی عودیە بوو ئەوەندە ژنی چاک بوو کە خەمی لە دڵی عەلائەددیندا نەهێشت—سوکنایی خستبووە دڵییەوە. ئێستا زبێدە کۆچی دوایی کردووە. دەڵێم کەمێکی عوود بۆ بژەنی و شێعری بۆ بڵێی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، خەلیفە بە قووەتولقوولبی گوت: 'دەمەوێ بە ســـەما و ئاوازێکی خوش خەم و پەژارە لە دڵی عەلائەددین دەرکەی. ئیدی کەنیزە دەسـتی دا عوود و کارێکی کرد، بزەی دەهێنایە سـەر لێوی مردووش. خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین، دەنگ و ئاوازی ئەو کەنیزەت پێ چۆنە؟' عەلائەددین گوتی: 'دەنگی زبێدە لەوە خۆشـتر بوو و چاکتری دەگوت. بەڵام ئەم لە عوودژەنینەکەدا شارەزاترە.' خەلیفە گوتی: 'ئەو کەنیزەت کەوتووەتە بەر دڵ؟' عەلائەددین گوتی: 'بەڵێ، خەلیفەی زەمان. بە دڵمە.' خەلیفە گوتی: 'بە ڕۆحی باب و باپیرانم ئەوە ئەو کەنیزەم بە تەواوی خزمەتکارەکانیەوە پێشـــکەشـــی تۆ کرد.' عەلائەددین پێی وا بوو خەلیفە گاڵتەی لەگەڵ دەکا. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە چوو بۆ لای قووەتولقولووب و پێی گوت: 'تۆم داوە بە عەلائەددین.' قووەتولقولووب کە ئەوەی بیســـت، خۆشـــحاڵ بوو. چونکە ئەویش کاتێک عەلائەددینی دیبوو خۆشـــی ویســـتبوو. ئیدی خەلیفە فەرمانی دا قووەتولقولووب بە تەواوی ئەو شـــتانەیەوە کە هەیەتی، ببەن بۆ ماڵی عەلائەددین. کاتێک قووەتولقولووبیان برد بۆ کۆشکی عەلائەددین، دوو دانە پیاوی‌ماڵیشیان[1] دانا کە لە ڕاست و چەپی دەرکی کۆشـک ڕاوەسـتن و کاتێک عەلائەددین هات، دەسـتی ماچ کەن. پێی بڵێن: 'خانمەکەمان، قووەتولقولووب، چاوەڕێتە. خەلیفە ئەوی بە کەنیزەکانیەوە بە تۆ بەخشـیوە.' ئیدی خواجەکان چۆنیان پێ سپێردرابوو ئاوایان کرد.

"کاتێک عەلائەددین هاتەوە، دوو پیاوی‌ماڵی لە پیاوەماڵییەکانی خەلیفە لەمبەرەوبەری دەرگاکە دانیشـــتبوون. پێی ســـەیر بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە ماڵی من نەبێ، ئەگینا ئەوانە بۆ لێرەن؟!' هەر کە پیاوەماڵییەکان چاویان بە عەلائەددین کەوت، گورج ڕابوون. بە پیشـــوازییەوە چوون. دەســـتیان ماچ کرد. گوتیان: 'ئێمە کۆیلەی قووەتولقولووبین و ئەو ســـلاوت لێ دەکردی و فەرمووی: 'خەلیفە ئەوی بە تەواوی کەنیزەکانییەوە پێشـکەشـی تۆ کردووە.' ئێستا چاوەڕێی تۆیە.' عەلائەددین گوتی: 'لە لایەن منەوە سڵاوی قووەتولقولووب بگەیەنن و پێی بڵێن هەتا ئەو لەو کۆشـــکەدا بێ، من نایەمە ژوور، چونکە ماڵی خاوەن بۆ کۆیلە حەرامە. ئێوە لە قووەتولقولووب بپرســـن کە لە لای خەلیفە ڕۆژانە تێچووت چەند بوو؟' پیـاوەمـاڵییەکـان چوونەوە لای قووەتولقولووب و ڕووداوەکەیـان بۆ گێڕاوە. قووەتولقولووب لە وەڵامدا گوتی: 'تێچووی ڕۆژانەی من ســـەد دینارە.' عەلائەددین هەموو ڕۆژێ ســـەد دیناری بۆ دەنارد. هەتـا ڕۆژێـک لە ڕۆژان عەلائەددین لە دیوان دابڕا و نەدەچووەوە بۆ دیوان. خەلیفە گوتی: 'جەعفەر، من بۆیە قووەتولقولووبم دا بە عەلائەددین،

---

[1] پیاوی‌ماڵی: پیاوی خەساوی ناو ماڵ.

هەتا زبێدە لە بیر بکا، ئەهوەن بێتەوە و ناڕەحەت نەبێ. ئەوە دیســـان عەلائەددین بۆ دیار نییە بێتەوە دیوان؟!' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، ڕاستە دەڵێن: 'هەرکەس خۆشەویستانی ببینێ، هاوڕێکانی لە بیر دەچێتەوە.' ' خەلیفە گوتی: 'ڕەنگە لەبەر شـــتێک نەهاتبێتەوە. دەبێ بچین بزانین بۆ نەهــاتووەتەوە.' وا بوو خەلیفە لەگەڵ جەعفەر بە دزییەوە چوون بۆ لای عەلائەددین. عەلائەددین ئەوانی ناســـییەوە و هەســـتا کڕنۆشـــی بۆ خەلیفە برد. خەلیفە لە سـیمای ئەودا هەسـتی بە خەم و ماتەم کرد. پێی گوت: 'عەلائەددین، بۆ ناڕەحەتی؟ مەگەر لەگەڵ قووەتولقولووب ناژییت؟' عەلائەددین گوتی: 'گەورەم خەلیفەی مەزن، ئەوەی شایانی گەورانە، حەرامی کۆیلانە. من تا ئێستا نەچوومەتە لای ئەو. نازانم چۆناوچۆنیشـە.' خەلیفە گوتی: 'دەبێ چاوم بە قووەتولقولووب بکەوێ.' هەستا چوو بۆ لای قووەتولقولووب."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی دووسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، خەلیفە هەســـتا چوو بۆ لای قووەتولقولووب. قووەتولقولووب کە چاوی بە خەلیفە کەوت، لە بەری هەسـتا و کڕنۆشـی برد. خەلیفە لێی پرسـی: 'عەلائەددین هـاتووە بۆ لای تۆ یـان نـا؟' قووەتولقولووب گوتی: 'نەوەڵلا. خەلیفە، من نـاردووشـــمە بەدوایدا، کەچی نەهاتووە.' ئیدی خەلیفە ئەوی ناردەوە بۆ دارولخەلافە. بە عەلائەددینیشـی گوت: 'لێمـان دوور مەکەوەوە.' دوای ئەوە خەلیفە گەڕاوە بۆ دارولخەلافە. عەلائەددینیش شەو لە ماڵ بوو. کە ڕۆژ بووەوە، سوار بوو چوو بۆ دیوان. لەسەر جێی سەرۆک سنتین دانیشـــت. خەلیفە فەرمـانی بە خەزێنەدار دا کە دەهەزار دینـار بدا بە جەعفەری وەزیر. خەزێنەدار پارەی ســـاز کرد و هێنای. خەلیفە بە جەعفەری بەرمەکی گوت: 'دەمەوێ بچی لە بازاڕی کەنیزفرۆشـان بەو دەهەزار دینارە کەنیزێک بۆ عەلائەددین بکڕی.' وەزیر گوتی: 'بە چاوان.' ئیدی لەگەڵ عەلائەددین چوون بۆ بازاڕ. بە ڕێکەوت لەو ڕۆژەدا والی بەغدا، بە ناوی خالید، هاتبوو کەنیزێک بۆ کوڕەکەی بکڕێ. هۆیەکەشـــی ئەوە بوو کە خالید ژنێکی هەبوو ناوی خاتوون بوو. خاتوون کوڕێکی زۆر ناحەز و ناشـــیرینی هەبوو پێیان دەگوت: 'حەیزەلەم بێزازە' و ئەو کوڕە پازدە ســـاڵی تەمەن بوو کەچی نەیدەتوانی لەســـەر ئەسـپ خۆی بگرێ. باوکیشی یەکێک لە ئازا و چالاک و سوارچاکانی سەردەمی خۆی بوو.

"دایکی بە والی دەڵێ: 'ئاواتی من ئەوەیە کە ژن بۆ حەیزەلەم بێنی. کاتی ژنهێنانییەتی.' والی دەڵێ: 'ئەو کوڕە زۆر ناحەز و ناشـــیرینە و هیچ ژنێک حازر نابێ مێردی پێ بکا.' خێزانی بە والی دەڵێ: 'کەنیزێکی بۆ بکڕە.' بە ڕێکەوت هەر ئەو ڕۆژەی کە وەزیر لەگەڵ عەلائەددین هاتبوون بۆ بازاڕ. والییش لەگەڵ حەیزەلەمی کوڕی هاتنە بازاڕ. ئەوان لە بازاڕ بوون کە کـابرایەک کەنیزێکی هێنـا. جوانی و دلالییەکی تـایبەت و بەژن و بـالایەکی ڕێکی هەبوو. وەزیر بە دەلالی گوت: 'بە هەزار دینار قسـەم بۆ لەو کەنیزە بکە.' لەو جەنگەیەشـدا حەیزەلەمیش چـاوی بەو کەنیزە کەوت، چووە دڵییەوە و بە بـاوکی گوت: 'بـاوکە، ئەو کەنیزەم بۆ بکڕە.' والی ناوی کەنیزەکەی پرسی. کەنیزەکە گوتی: 'ناوم یاسەمینە.' ئینجا بە حەیزەلەمی گوت: 'ئەگەر دڵت گرتوویەتی، نرخەکەی بەرە سـەرێ.' حەیزەلەم بە دەلالەکەی گوت: 'چەندیان لەســـەر داناوە؟' دەلالە گوتی: 'هەزار دیناریان داوە.' حەیزەلەم گوتی: 'من هەزار و یەک دینار دەدەم.' دەلالە هاتەوە لای عەلائەددین. عەلائەددین دووهەزار دیناری دا. ئیدی بەو جۆرە هەتا کوڕی والی دینارێکی پێوە زیاد دەکرد، عەلائەددین هەزار دیناری زیاد دەکرد. دوایی کوڕی والی تووڕە بوو لە دەلالەکەی پرســـی: 'ئەوە کێیە نرخ لەســـەر نرخم زیاد دەکا؟' دەلالەکە گوتی: 'جەعفەری وەزیر دەیەوێ کەنیزێک بۆ عەلائەددین بکڕێ. ئێســـتا عەلائەددین نرخەکەی گەیاندووەتە دەهەزار دینار.' خاوەن کەنیزەکە بە دەهەزار

دینارەکە فرۆشتی. عەلائەددینیش کەنیزەکەی لەڕێی خوادا ئازاد کرد و لە خۆی مارەکرد و بردییەوە ماڵی خۆی.

"حەیزەلەمی کوڕی والی بە دڵێکی پڕ لە خەم و داخەوە گەڕاوە ماڵەوە. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کوڵ و کەسەر لەسەر دڵی کۆ بووەوە. تا وای لێ هات نەخۆشی لە جێدا خستی. لە خواردن و خواردنەوە کەوت و شەیدایی کاری خۆی کرد. کە دایکی ئاوای دیت، هۆکاری نەخۆشی و بێحاڵییەکەی پرسی. حەیزەلەم گوتی: 'دایکە، یاسەمینم بۆ بکڕە.' دایکی گوتی: 'ڕاوەستە با سەوزەفرۆشەکە بێرەدا بێ، چەپکێکت یاسەمینت بۆ دەکڕم.' حەیزەلەم گوتی: 'دایکە، گوڵی یاسەمین ناڵێم. بەڵکوو ئەو کەنیزەی ناوی یاسەمین بوو. باوکم بۆی نەکڕیم.' خێزانی والی بە مێردەکەی گوت: 'ئەوە بۆ ئەو کەنیزەت بۆ کوڕەکەم نەکڕیوە؟' والی گوتی: 'کەنیزێک کە عەلائەددینی سەرۆکی سیتتین کڕیاری بێ، کوا بە من دەکڕدرێ؟!'

"خەم و خەفەت ئەوکی حەیزەلەمیان گرت و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لەڕ و لاوازتریان کرد. لە خەو و خۆراک کەوتبوو. دایکی تووشی خەم و ماتەم بوو. هەتا ڕۆژێک لە ماڵەوە دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو. کە لە ناکاو پیرێژنێک هاتە ژوورەوە. دەیانگوت ئەو پیرێژنە دایکی ئەحمەدی قەماقیموسەڕاقە. ئەو ئەحمەدە بە گەنجی دز بوو. بە جۆرێک کە دەیانگوت تیشکی هەتاو و کلی لە چاو دەدزی. دوای ئەوە کردیان بە سەرۆکی دزگرەکان. جارێکیان والی ئەوی بە تاوانی گوناحێکی گەورە گرت و بردییە لای خەلیفە. خەلیفە فەرمانی کوشتنی دا. ئەویش پەنای بردە بەر وەزیر. خەلیفەش بێقسەیی وەزیری نەدەکرد و خاتری دەگرت. وا بوو ئەویش تکای بۆ کرد. خەلیفە بە وەزیری گوت: 'ئەوە چۆنە تکا بۆ کەسێک دەکەی کە گیان و ماڵی خەڵک بە دەستییەوە لە مەترسیدان؟!' وەزیر گوتی: 'قوربان، لە بەدیخانەدا بەندی کە، چونکە بەندیخانەش لە ڕووی حیکمەتەوە دروست کراوە. وەک دەڵێن بەندیخانە گۆڕی زیندووەکانە و دەمکوتی دژمنانە.' خەلیفە بۆی نووسی کە بیبەن بۆ بەندیخانە و ئاماژەشی بەوە کردبوو کە دەبێ هەتاهەتایە لە بەندیخانەدا بێ. دایکی ئەحمەد هاتوچۆی ماڵی والی دەکرد و دەچووە بەردەرکی بەندیخانە و چاوی بە کوڕەکەی دەکەوت و پێی دەگوت: 'ئاخر پێم نەگوتی خۆت لە شتی حەرام مەدە و ستەم لە خەڵک مەکە؟' ئەحمەد دەیگوت: 'ئەوە کارێک بوو لە چارەم نووسرابوو. بەڵام دایە، تۆ خودا کاتێک چووی بۆ لای خێزانی والی، پێی بڵێ بزانە کارێکم بۆ بکا. بزانێ لێم خۆش نابن.' کاتێک کە پیرێژنە چوو بۆ لای ژنی والی، دیتی ئەوە مات و مەلوولە. گوتی: 'خاتوونەکەم، ئەوە بۆ ئاوا مات و لێوبەباری؟' گوتی: 'لە تاوی کوڕەکەم خەریکە شێت بم، دەڵێی دڵم توقی.'

"ئیدی شتەکەی بۆ پیرێژنە گێڕاوە. پیرێژنە گوتی: 'کەسێک فێڵ و کەڵەکێک بۆ ڕزگاری کوڕەکەت بدۆزێتەوە، چی لەگەڵ دەکەی؟' ژنی والی گوتی: 'جا ئەوە کێیە دەتوانی فێڵ و

کەلەکێکی وا ساز کا.' پیرێژن گوتی: 'من کوڕێکم هەیە پێی دەڵێن ئەحمەد قەماقیموسەڕڕاق. ئیستا لە بەندداید. لە پسوولەکەیدا نووسراوە کە دەبێ هەتاهەتایە لە زینداندا بمێنێتەوە. ئیستا تو هەستە خۆت برازێنەوە و خۆت تیف‌تیفە بدە. بچۆ بۆ لای مێردەکەت. بە ڕوویەکی خوشەوە پێی بڵێ: 'کارێکم پێتە.' پێت دەڵێ: 'چ کارێکت پێمە؟' بڵێ: 'هەتا تەلاقم بۆ نەخۆی کە بۆم جێبەجێ دەکەی، پێت ناڵێم.' ئەگەر تەلاقی خوارد، پێی بڵێ: 'کەسێک بە ناوی ئەحمەد لە بەندیخانەدایە. دایکێکی لێقەوماو و هەژاری هەیە. منی کردووەتە تکاکار هەتا توش لە لای خەلیفە تکای بۆ بکەیت بەشکم ئازادی کا. خودا پاداش بداتەوە.' ژنە بە پیرێژنەی گوت: 'بەسەر چاو حەتمەن.' ئیدی وا بوو کاتێک کە والی هاتەوە لای ژنەکەی..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کاتێک شەوی دووسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک والی هاتەوە ماڵێ، ژنە ئەو قسانەی کە پیرێژنە فێری کردبوو بە مێردەکەی گوت و وای لێ کرد کە تەڵاقی بۆ بخوا و بە قســـەی بکا. کە ڕۆژ بووەوە، والی چوو بۆ زیندان. بە ئەحمەدی گوت: 'ئەرێ لە کرداری نەشـــیاوی خۆت پەشـــیمان بوویتەتەوە و تۆبەت کردووە؟' ئەحمەد گوتی: 'من گەڕاومەتەوە لای خودا و بە دڵ و بە زمان دەڵێم: اســتغفر الله.' بەو جۆرە والی ئەحمەدی لە بەندیخانە هێنا دەرێ. بەڵام کۆت و زنجیری هەر پێوە بوو. هەر وا بردی بۆ کۆشـــکی خەلیفە. لەوێ کڕنۆشـــی برد. خەلیفە گوتی: 'میر خالید، چ کارێکت هەیە؟' خالید چوو ئەحمەدی قەماقیموســـەڕاقی بە کۆت و زنجیرەوە هێنا خزمەت خەلیفە.

"خەلیفە گوتی: 'ئەوە قەماقیموســەڕاق هێشــتا هەر زیندووی؟!' ئەحمەد گوتی: 'جەنابی خەلیفە، چارەڕەشان تەمەنیان درێژە!' خەلیفە گوتی: 'میر خالید، ئەوەت لەبەر چی هێناوەتە ئێرە؟' خالید گوتی: 'خەلیفەی زەمان، ئەوە دایکێکی پیر و هەژار و لێقەوماوی هەیە کە جگە لەو کوڕە هیچ کەسێکی دیکەی نییە. ئەویش منی غوڵامتی کردووەتە تکاکار هەتا داوات لێ بکەم، لێی خۆش بی و ئازادی کەی. بیشیکەیەوە بە بەرپرسی گرتنی دزان کە لەپێشیشدا ئەو پلەیەی پێ درابوو. بەڵام بەو مەرجەی ئەو جار نەچێتەوە ســـەر کاری خراپ و تۆبە بکا.' خەلیفە بە ئەحمەد قەماقیمی گوت: 'ئایا لە کارە خراپ و دزێوەکانی خۆت پاشـــگەز بوویتەتەوە و تۆبەت کردووە یان نا؟' ئەحمەد گوتی: 'خەلیفە، گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا.' خەلیفە فەرمانی دا، ئاسنگەریان هێنا سەر، زنجیر و شتیان لێ کردەوە. ئەوجا خەلیفە پلە و پایەی دایە و کەوای بە شـــانیدا دا. پێی گوت: 'فەرموو ڕێی ڕاســـت بگرە بەر.' ئیدی ئەحمەدیش قاچی خەلیفەی ماچ کرد. لە کۆشک چووە دەرێ.

"مـاوەیەک تێپەڕی، ڕۆژێـک دایکی ئەحمەد هـاتە لای ژنی والی. ژنی والی پێی گوت: 'ســوپاس بۆ خودا وا کوڕەکەت لە بەند هاتە در و ڕزگاری بووە. ئێســتا بارودۆخی باشــە. ئەی بۆچی پێی ناڵێی بیرێ بۆ هێنانی یاســـەمین بۆ کوڕەکەی من بکاتەوە؟' دایکی ئەحمەد گوتی: 'هەر ئێســـتا دەچم پێی دەڵێم.' وای گوت و هەســـتا خێزانی والی بەجێ هێشـــت. یەکســـەر چووە لای ئەحمەد. کە چوو ئەحمەد مەست بوو. بە ئەحمەدی گوت: 'ڕۆڵە گیان، ئەوەی تۆی ڕزگار کرد کەس نەبوو جگە لە ژنەکەی والی. ئەویش لە تۆی دەوێ بیرێ بۆ کوشـــتنی عەلائەددین بکەیتەوە و یاســـەمینی کەنیزەکی ئەو بۆ 'حەیزەلەم بێزازە' بێنی.' ئەحمەد بە دایکی گوت: 'جا ئەوە کارێکی زۆر ئاسانە. هەر ئەمشەو فکرێکی بۆ دەکەمەوە.' ئەو شـــەوە مانگ تازە نوێ ببووەوە. خەلیفە خووخدەی وا بوو یەکەم شـــەوی هەموو

مانگێک لەگەڵ زبێدەدا ڕۆژی دەکردەوە. کاتێک دەچوو بۆ لای زبێدە، ئەو جلوبەرگ و مەندیلی خەلافەت و ئەنگوستیلە و شتەی پێوەی بوو هەمووی دادەکەندن و لەگەڵ تەسبێح و گەوهەر و شتەکەی لەسەر کورسییەکی دادەنا. خەلیفە چرایەکی زێڕینی هەبوو سێ دانە گەوهەری گرانبایی بە زنجیری زێڕەوە پێوەی هەڵواســـرابوو. ئەو چرایە لە لای ئەو زۆر پیرۆز و خۆشـــەویســـت بوو. هەر بۆیە خەلیفە پیاوەماڵییەکانی ڕاســـپاردبوو ئاگایان لەو جلوبەرگ و مەندیل و تەسبێح و چرایە بێ. خۆشی چوو بۆ کۆشکی زبێدە خانم. ئەحمەد قەماقیم ڕاوەســـتا هەتا شـــەو لە نیوە لای دا. ئەســـتێرەی ســـیوەیل هەڵات و هەموو کەس خەوتن. دوایی کەمەندی هەڵگرت و شـــیرێکی بە دەســـتەوە گرت و بەرەو کۆشـــکی خەلیفە هات. کەمەندی هاویشت و لە حەوشەی کۆشک سەرکەوت. چووە خوارێ. دەرکی هەیوانی کردەوە. پیاوەماڵییەکان خەوتبوون. دەرمانی بێهۆشـــی لەبەر لووتیان دانا و تەواو بێجووڵە بوون. ئینجا جلوبەرگ و مەندیل و زێڕ و خشڵ و ئەنگوستیلەکانی لەگەڵ چراکە هەڵگرت. هەر لەو شـــوێنەی کە لێی هاتبووە کۆشـــکەوە، چووەوە دەرەوە. یەکســـەر چوو بۆ ماڵی عەلائەددین. بە ڕێکەوت ئەو شـــەوە عەلائەددین و یاســـەمین لە ئامێزی یەکتردا خەوتبوون. قسمەت وا بوو ئەو شـــەوە یاســـەمین دوو گیان بێ. ئەحمەد قەماقیم لە دیوارەکەیان ســـەر کەوت و چووە حەوشـــــەی ماڵی عەلائەددینەوە. حەوشـــــەکە بە بەردی مەڕمەڕ بەردچن کرابوو تاشە بەردێکیانی لا دا و هێندێک لەو شتانەی ماڵی خەلیفەی وە بن گڵی ژێر تاشە بەردەکە دا. تاشـــــە بەردەکەی لە جێی خۆی داناوە. بەڵام چراکەی لەگەڵ خۆی برد و لە حەوشە ڕۆیشتە دەر. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو چرایە کاتێک دانیشتین بۆ بادەخواردنەوە، لەپێش خۆمی دادەنێم.'

"کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە چوو بۆ دیوان. سەیری کرد ئەوە پیاوەماڵییەکان هەموو لەوێ بە لادا کەوتوون. فەرمانی دا ئەوانیان وە هۆش هێناوە. ئینجا ســـــەیری کرد، جلوبەرگ و مەندیل و خشڵ و زێڕ و ئەنگوستیلە و چرا و شـتەکان نەماون. خەلیفە تووڕە بوو بەرگی ڕقی پۆشی و لە دیوان دانیشت. وەزیر هات. کڕنۆشی برد و پێچکەی دەسەڵاتی ماچ کرد و گوتی: 'چی بووە، خەلیفە؟' خەلیفە ڕووداوەکەی بۆ وەزیر گێڕاوە. لەو جەنگەیەشدا والی هات. ئەحمەدی قەماقیمیشـــــی لەگەڵ بوو. تەماشـــــای کرد خەلیفە تووڕەیە. کاتێک خەلیفە چاوی بە والی کەوت، گوتی: 'ئەی میر خالید، خەبەری بەغدا؟' والی گوتی: 'ئەلحەمدولیللا ئەمن و ئەمانە.' خەلیفە گوتی: 'درۆ دەکەی!' والی گوتی: 'خەلیفە، چی ڕووی داوە؟' خەلیفە شـــــتەکەی بۆ ئەویش گێڕاوە، گوتی: 'ئەو شـــــتانەم لە تۆ دەوێنەوە.' والی گوتی: 'خەلیفە، کرمی دار لە دارەکە درووســـت دەبێ. کەس ناتوانێ بێتە ئێرە.' خەلیفە گوتی: 'کارم بەوەوە نییە. ئەو شـتانە نەهێنیتەوە، تۆ دەکوژم.' والی گوتی: 'منیش پێش ئەوەی بکوژرێم، ئەحمەد قەماقیم دەکوژم. چونکە ئەو حەرامخۆرە بە کەس نابینرێتەوە جگە لە میری دزان.' ئیدی

ئەحمەدی قەماقیم پێچکەی کورسی دەسەڵاتی ماچ کرد و گوتی: 'دیتنەوە و هێنانی ئەو دزە لەسەر من. بەڵام خەلیفە دەبێ دوو کەسم لە قازییەکان و دووانیش لە والییەکان لەگەڵ بخا. چونکە ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە نە لە والی دەترسێ و نە لە خەلیفە.' خەلیفە گوتی: 'کێت پێ خۆشە با لەگەڵت بێ. بەڵام لەپێشدا کۆشکەکەی من بپشکنە و دوایی ماڵی وەزیر و ماڵی سەرۆکی سێتێن بگەڕێ. بە گیانی خۆم، هەرکەس ئەو کارەی کردبێ، دەیکوژم—ئەگەر کوڕی خۆشم بێ.' بەو جۆرە ئەحمەدی قەماقیم فەرمانی وەرگرت کە بچێتە ماڵەکانەوە و بیانپشکنێ."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشــکۆ، ئەحمەدی قەمـاقیم فەرمـانی وەرگرت کە بچێتە مـاڵەکـانەوە و بیانپشکنێ. ئیدی سێ شیشی مسی و ئاسن و پۆلای بە دەستەوە گرت. لە پێشدا دەستی کرد بە پشکنینی کۆشکی خەلیفە. دوای ئەوە ماڵی وەزیری پشکنی. پاشان ماڵی پەردەدار و منداڵانی خەلیفەش گەڕا. هەتا نۆرە گەیشــتە ماڵی عەلائەددینی ســەرۆکی ســیتتین. کە عەلائەددین گوێی لە دەنگی ئەوان بوو لە پاڵ یاســەمین هاتە دەرێ. والی دیت بەو هەموو خەڵک و دەســتوپێوەندەوە. لە والی پرســی: 'میر خـالید، چی بووە؟' والی تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. عەلائەددین گوتی: 'وەرنە ژوور، ماڵی منیش بگەڕێن.' والی گوتی: 'گەورەم، تۆ متمانەپێکراوی، چۆن دەتوانین گومانمان لە تۆ بێ؟ جوبرەئیلی ئەمانەتدار و دەستپیسی؟!' عەلائەددین گوتی: 'دەبێ بێن ماڵی منیش بگەڕێن.' ئیدی قازی و والی چوونە ژوور و ئەحمەد قەمـاقیمیش چووە پێش، چـاوی لە بەردچنە مەرمەڕەکـان دەکرد هەتـا گەیشتە ئەو شوێنەی کە شتەکانی لەژێر ئەواندا خستبووە بن گڵەکەوە.

"ڕاست لەسەر ئەو جێیە شیشی لێ دا و بەردەکەی شکاند. کە بەردەکەی شکاند، هەر بە دەســت نەختێک لە گڵەکەی لا دا. تروووسـکەی زێڕەکان هات. ئەحمەد گوتی: 'ماشــەڵلا، پیرۆقەدەمی بە فەڕی ئێمە گەنجێک وەدەر کەوت!' ئیدی قـازی و والی چوونە پێشــێ و چاویان لێ کرد. تەواوی شــتەکانیـان لە ماڵی عەلائەددیندا دۆزییەوە. ئینجا هەر لەوێ کاغەزیان نووســی. پێچوکڵاویان لەســەر عەلائەددین داگرت و قۆڵبەســتیان کرد. دەســتیان بەســەر تەواوی ماڵ و ســامانەکەشــیدا گرت. ئەحمەدی قەماقیم یاســەمینی کەنیزی عەلائەددینی گرت. یاســەمین دووگیان بوو. ئەوی برد بۆ لای دایکی و گوتی: 'ئەوەی بدە دەســت خاتوونی ژنی والی.' ئیدی پیرێژن دەســتی یاســەمینی گرت و بردی بۆ لای ژنی والی.

"هەر کە 'حەیزەلەم بێزازە' کەنیزەکەی دیت، هەر زوو چاک بووەوە. لە جێگاکەی هاتە دەر و خۆشـحاڵ بوو. هاتە لای یاسـەمین. یاسـەمین خەنجەرێکی بە دەسـتەوە گرت. گوتی: لێم دوور کەوەوە دەنا تۆش دەکووژم و خۆشـم دەکوژم!' دایکی حەیزەلەم بە یاســەمینی گوت: 'قەحبە، لێی گەڕێ با کوڕەکەم چێژت لێ ببینێ.' یاسەمین گوتی: 'ئاخر سەگی گلاوی نەسـڕانی، لەکوێ و لە چ مەزهەبێکدا دیوتانە ژنێک دوو مێردی هەبێ؟! ئەوە چۆناچۆنە کە دەبێ ســەگ جێگای شـێر بگرێتەوە!' ئیدی حەیزەلەم بە دیتنی ئەوەندەی دیکە ئارەزووی ســەری کرد و ئارامی نەمـا. خەو و خوراکی لێ برا و لە جێگـادا کەوت. ژنی والی بە یاســەمینی گوت: 'ئاخر قەحبە، بۆ کوڕەکەم بە دەرد و مەینەتەوە دەکوژی؟ بزانە منیش

چیت لێ دەکەم، ئەگەر عەلائەددینم نەکوشت بزانە من ژن نیم.' یاسەمینیش گوتی: 'ئەگەر من لە تاوی عەلائەددین بمرم، لەوە خۆشترە قسە لەگەڵ حەیزەلەمدا بکەم.'

"خاتوونی ژنی والی هەستا جلوبەرگی ئاوریشم و زێڕینی لە بەر یاسەمین داکەند. هێندێکی جلی کۆن و شڕەوبڕەی دایە لە بەری کا. ناردی بۆ چێشتخانە و خستییە گەڵ کەنیزەکانی دیکە. پێی گوت: 'تۆ هەر بۆ ئێرە دەبی. هەر بۆ ئەوە دەبێ چرپی و شت بشکێنی و پیواز بجنی و لە ژێر ئاوری مەنجەڵدا بسووتێی!' یاسەمین گوتی: 'بە تەواوی ئەوانە ڕازیم، بەڵام تاقەتی دیتنی کوڕەکەتم نییە.' باش بوو خودا خستییە بەر دڵی کەنیزەکانی چێشتخانە و نەیاندەهێشت دەست لە ڕەش و سپی بدا و ناڕەحەت بێ. یاسەمین کاری بێرە گەیشت.

"بەڵام عەلائەددین، عەلائەددینیان گرت و بە شتەکانی خەلیفەوە بردیان بۆ لای خەلیفە. خەلیفە لەسەر کورسی دانیشتبوو کە لە ناکاو ئەحمەد و والی و قازییەکان عەلائەددینیان بە قۆڵبەستکراوی و بە شتەکانی خەلیفەوە هێنا ژوورەوە. خەلیفە گوتی: 'ئەوانەتان لەکوێ دۆزینەوە؟' گوتیان: 'لە ماڵی عەلائەددین.' خەلیفە تووڕە بوو گڕی گرت. شتەکانی وەرگرت، چاوی لێ کرد چراکەیان لەگەڵ نەبوو. بە عەلائەددینی گوت: 'چراکە لەکوێیە؟! عەلائەددین گوتی: 'من ئاگام لە هیچ نییە و کاری من نییە.' خەلیفە گوتی: 'ناپاک، ئەوە چۆنە هەر من تۆ لە خۆم نزیک دەکەمەوە و تۆ خۆت دوور دەخەیتەوە؟! من تۆ دەکەمە دەست پاک و پارێزەری ماڵی خۆم و تۆش خیانەتم لێ دەکەی؟' دوای ئەوە فەرمانی دا عەلائەددین لە دار بدەن. والی داری بۆ عەلائەددین ساز کرد و بە جارچییان گوت لەنێو شاردا جاڕ بدا کە هەرکەس لەگەڵ خەلیفە ناپاکی بکا ئەوە سزاکەیەتی. خەڵک کاتێک ئەو هەواڵەیان بیست، بۆ سەیرکردنی کۆ بوونەوە. عەلائەددینیش کاری بێرە گەیشت.

"ئەحمەدی دەنەف لەگەڵ پیاوەکانیدا لە باخێک خەریکی عەیش و نۆش و ڕابواردن بوو. کە لە پڕدا پیاوێک لەو پیاوانەی کە لە دەربار نزیک بوو هات. دەستی ئەحمەدی ماچ کرد و گوتی: 'ئەحمەد دەنەفی! سەرسەرهەنگی سەرهەنگەکانی خەلیفە، تۆ لێرە خەریکی عەیش و نۆشی، ئاگاشت لەو هەمووە شتە نییە ڕووی داوە! ئاویان کردووەتە ژێرت!'

"ئەحمەد گوتی: 'چی بووە؟' ئاوگێڕ گوتی: 'ئەو عەلائەددینەی کە وەک کوڕی خۆت داتدەنا، ئەوە بردیان لە داری بدەن.' ئینجا ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەحمەد دەنەف بە حەسەن شوومانی گوت: 'بیرت بۆ چی دەچێ؟ چارە چییە و چ بکەین؟' حەسەن شوومان گوتی: 'عەلائەددین ئاگای لەو کارە نییە و بێگوناهە. یەکێک لە نەیارەکانی داو و تەڵەیان بۆ ناوەتەوە.' ئەحمەد گوتی :'دەی ئێستا دەڵێی چی بکەین؟' حەسەن شوومان گوتی: 'ئیشەڵڵا خودا بە دەستمانەوە دەدا و ڕزگاری دەکەین.' ئیدی حەسەن شوومان هەستا و چوو بۆ

بەندیخانە و گوتی: 'یەکێک لەو بەندییانە بێنن کە شـیاوی کوشـتنە.' بەرپرسـی بەندیخانە بەندییەکی هێنا کە شـیاوی کوشـتن بوو. زۆریش شـێوەی عەلائەددینی دەدا. دایە دەسـت حەسـەن شـوومان. حەسـەن شـوومان سـەری داپۆشـی و لەگەڵ ئەحمەدی دەنەف و عەلی زەیبەقی میسـری خسـتیانە نێوانی خۆیانەوە. بردیانە لای جەللادەکە. کە چوون، ئەوەندەی نەمـابوو عەلائەددین لە دار بـدەن. ئەحمەد دەنەف جەللادەکەی تێگەیـانـد کە عەلائەددین بێگونـاهە و ئەوەیـان لە دار بدە. جەللاد گوتی: 'لاچن لە بەردەسـت‌م با کارەکەم بکەم.' ئەحمەد دەنەف گوتی: 'گڵاو لەگەڵ تۆمە! من پێت دەڵێم.' جەللاد ئەو پیاوەی برد و لە جێی عەلائەددین لە داری دا. دوای ئەوە ئەحمەد دەنەف و عەلی زەیبەقی میسـری عەلائەددینیان برد و چوون بۆ مـاڵی ئەحمەد. کە هێنـایـانەوە بۆ مـاڵی ئەحمەد، عەلائەددین بە ئەحمەدی گوت: 'باوکە گیان، خودا پاداشـی خێرت بداتەوە.' ئەحمەد گوتی: 'عەلائەددین، ئەوە چی بووە؟ ئەو شتانە بۆ لەوێ بوون؟' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەحمەد گوتی: 'ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟ خودا لەو کەسە خۆش بێ کە گوتوویەتی: 'ناپاکی لەو کەسە مەکە کە باوەڕت پێ دەکا هەر چەند ناپاکیش بێت.' سەرەڕای ئەوەی کە خەلیفە ئەو هەمووە ڕێزەی لێ نای و پلە و پایەی دایتێ، ئەوە چۆناوچۆن بوو ئەو کارەت لەگەڵ کرد؟! ئەو شتانەت بۆ لێ دزیبوو؟!'

"عەلائەددین گوتی: 'باوکە گیان، بە خودا قەسەم ئەوە کاری من نییە! ئەوەی ئەو کارەشی کردووە نایناسم.' ئەحمەد دەنەف گوتی: 'ئەگەر وا بێ، ئەوە هەر کاری دژمنانە. بەڵام دڵنیا بە هەر کارێک بکا، دێتەوە ڕێی. سزاکەی دەبینێتەوە. ڕۆڵە گیان شتەکە وایە، تازە تۆ بۆ ئێرە نابی و ناتوانی لێرە بژییت، چونکە خۆ ڕکابەرێتیت لەگەڵ ئەوانە پێ ناکرێ. ئەوەی لەگەڵ ئەوانە تێ کەوێ، ناحەسێتەوە.'

"عەلائەددین گوتی: 'باوکە، دەبێ بچم بۆ کوێ؟' ئەحمەد دەنەف گوتی: 'من تۆ دەگەیەنمە ئەسکەندەرییە، لەوێ شوێنێکی پیرۆزی لێیە و زۆر خۆش و سەرسەوزە.' عەلائەددین گوتی: 'دەی زۆر باشە، بە قسەت دەکەم.' ئەحمەد دەنەف بە حەسەن شوومانی گوت: 'ئەگەر خەلیفە هەواڵی منی پرسی، بڵێ چووە سەرێکی سنوورەکان بدا.' ئیدی ئەحمەد عەلائەددینی هەڵگرت و لە بەغدا وەدەر کەوتن. هەر ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە باخێک. لەو باخە تووشی دوو کەسی جوولەکە بوون کە غولامی خەلیفە بوون و بە هێستر دەهاتن. ئەحمەد بە جووەکانی گوت: 'پیتاکم بدەنێ.' جووەکان گوتیان: 'پیتاکی چیت بدەینێ؟' ئەحمەد گوتی: 'من پیتاکستێنی ئێرەم.' یەکی سەد دیناریان دایە. ئەحمەد ڕازی نەبوو. جووەکانی کوشت و هێسترەکانی هێنا. خۆی سواری هێسترێک بوو عەلائەددینیشی سواری هێسترێک کرد و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری ئەیاس و لە کاروانسەرایەک لایان دا. شەویان لەوێ کردەوە. عەلائەددین هێسترەکەی خۆی فرۆشت و هێسترەکەی ئەحمەدیشی بە خزمەتکاری کاروانسەراکە سپارد. سواری کەشتی بوون و کەشتییان ئاژۆت هەتا گەیشتنە ئەسکەندەرییە. ئەحمەد دەنەف عەلائەددینی بردە بازار. لەوێدا دەگەڕان کە لە پڕدا دیتیان ئەوە دەڵاڵێک بانگەواز بۆ فرۆشی دووکانێک دەکا. داوای نۆسەد و پەنجا دینار دەکا. عەلائەددین گوتی: 'من هەزار دیناری دەدەمێ.' ئیدی دەڵاڵەکە دووکانەکەی بە عەلائەددین فرۆشت. عەلائەددین کلیلەکانی وەرگرت و دووکانی کردەوە. چاوی لێ کرد، ئەوە فەرش لەسەر یەک ڕاخراون. ئەباری دووکان پڕە لە شت. ئەحمەد بە عەلائەددینی گوت: 'ڕۆڵە گیان، ئێستا ئەو دووکانە و ئەو شتانەی نێوی هەمووی هی تۆن. ئیتر بۆخۆت دانیشە و دەست بکە بە کڕین و فرۆشتن. بازرگانی پیشەیەکی خۆش و

پیروزه.' ئەحمەد دەنەف سێ رۆژ لە لای عەلائەددین ماوە. رۆژی چوارەم کەمێکی دڵخۆشی عەلائەددین داوە و گوتی: 'تۆ لێرە بمێنەوە و کاری خۆت بکە. من دەبێ برۆمەوە. دیمەوە سەرت دەدەم. لە لای خەلیفەش تکات بۆ دەکەم و بە هەر جۆرێک بێ دەکەومە بەدوای ئەو کارە و سەبەبکاری دەدۆزمەوە.'

"بەو جۆرە ئەحمەد دەنەف گەڕاوە بۆ ئەیاس. لەوێ هێسترەکەی لە کاروانسراچییەکە وەرگرتەوە. سوار بوو بەرەو بەغدا گەڕاوە. رۆیی رۆیی هەتا گەیشتەوە بەغدا و چووەوە لای حەسەن شوومان و پێی گوت: 'حەسەن، خەلیفە داوای منی کرد یان نا؟' حەسەن گوتی: 'نەوەڵڵا، هەر لە بیریشی نەبووی.' ئیدی ئەحمەد هەستا چووە خزمەت خەلیفە. هەر وا بەدوای باسی عەلائەددینەوە بوو هەتا رۆژێک گوێی لێ بوو کە خەلیفە بە وەزیری گوت: 'دەزانی عەلائەددین چی لێ کردم؟' وەزیریش گوتی: 'دەی ئەوە جەنابیشت لە دارت دا و بە سزای خۆیت گەیاند.' خەلیفە گوتی: 'وەزیر، دەمەوێ بچم بەسەر دارەوە ببینم.' وەزیر گوتی: 'چۆن دەفەرمووی وا بکە.' خەلیفە و وەزیر چوونە لای سێدارەکە. خەلیفە چاوێکی لەو کەسە کرد کە بەسەر دارەکەوە بوو. کە لێی ورد بووەوە، زانی ئەوە کەسێکی دیکەیە. خەلیفە گوتی: 'وەزیر، ئەوە عەلائەددین نییە و کەسێکی دیکەیە.' جەعفەری بەرمەکی وەزیر گوتی: 'بە چیدا دەزانی؟' خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین کورتە باڵا بوو ئەوە کەلەگەت بووە.' جەعفەر گوتی: 'لەداردراو درێژ دەبێتەوە.' خەلیفە گوتی: 'عەلائەددین سپی بوو ئەوە رەشە.' وەزیر گوتی: 'خەلیفە مەگەر نازانی کە مردوو رەنگ دەگۆڕێ و تێک دەچێ؟' ئیدی خەلیفە گوتی: 'لە دارەکەی کەنەوە و دایگرنە خوارێ.' گوتی: 'لا یعلم الغیب إلا الله. ئاخری نەمانزانی کە ئەو کەسە عەلائەددینە یان یەکی دیکەیە! ئەوجا خەلیفە گوتی: 'ببەن بینێژن.' بەو جۆرە ناوی عەلائەددین لەنێو دڵ و لەسەر زمانان نەما.

"حەیزەلەم بێزازەش لە تاو خۆشەویستی یاسەمین بە یەکجاری نەخۆش کەوت. لە جێگەدا کەوت هەتا وای لێ هات مرد و ناشتیان. یاسەمینیش گەیشتە مانگ و رۆژی خۆی و کوڕێکی کاکۆڵزێڕینی بوو. کەنیزەکان گوتیان: 'ناوی دەنێی چی؟' یاسەمین گوتی: 'ئەگەر بابی هەبووایە، ئەو ناوی لێ دەنا. بەڵام ئێستا خۆم ناوی دەنێم 'ئەسڵان'. دوای ئەوە دوو ساڵان بەردەوام شیری دایە. ئەسڵان گەورە بوو هەتا وای لێ هات پێی هەڵگرت. بە رێکەوت رۆژێک دایکی ئەسڵان خەریکی کاری چێشتخانە بوو. ئەسڵان وردەوردە لە پێپلیکانەکان چووە سەرێ. میر خالید گرتی و لە پەناخۆی دانیا. کە جوان لێی ورد بووەوە، زۆر شێوەی عەلائەددینی دەدا. دایکی لە ئەسڵان گەڕا و نەیدیتەوە. بەدوایدا هاتە حەوشە، سەیری کرد ئەوە میر لەسەر پێپلیکانەکان دانیشتووە و ئەسڵانیشی لە پەنا خۆی داناوە. کە منداڵەکە دایکی دی، خێرا هەستا بچێ بۆ لای. ئەمیر خالید گرتی و لە باوەشی کرد و گوتی: 'کەنیزەکە وەرە.' کە یاسەمین چووە پێشێ، والی لێی پرسی: 'ئەو منداڵە کوڕی

کێیە؟' کەنیزە گوتی: 'کوڕی منە.' والی گوتی: 'باوکی کێیە؟' گوتی: 'عەلائەددین ئەبووشامات بوو. بەڵام ئێستا کوڕی تۆیە.' والی گوتی: 'عەلائەددین ناپاک بوو.' یاسەمین گوتی: 'ئەو قەت ناپاک نەبووە و ناپاکی نەکردووە.' والی گوتی: 'کاتێک ئەو کوڕە گەورە بوو و گوتی: 'بابی من کێیە؟' بڵێ: 'تۆ کوڕی میر خالیدی والییت.' ' کەنیزە گوتی: 'باشە بە چاوان.'

"دوای ئەوە میر خالید ئەسڵانی خەتەنە کرد و لەگەڵ خۆی دەیگێڕا. زۆر باش پەروەردەی کرد. مامۆستای بۆ گرت. فێری خۆشنووسی و خوێندنی کرد. ئەسڵان هەر پێی دەگوت باوکە. سوارچاکی باشی بۆ دەهێنا و ئەویان فێری شەڕ و سواری و دابونەریتی شەڕ کرد. وای لێ هات سوارچاکییەکەی گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. هەر ئاوا پەروەردە کرا هەتا تەمەنی گەیشتە چواردە ساڵان.

"بە ڕێکەوت ڕۆژێک لەگەڵ ئەحمەد قەماقیموسەرڕاق تووشی یەک بوون. بوونە ئاشنا. ئەحمەد فەرمووی بادەخواردنەوەی کرد. ئەویش چوو. لە ناکاو ئەحمەد چرا زێڕینەکەی خەلیفەی کە زێڕ و جەواهیراتێکی زۆری پێوە هەڵواسرابوو هێنا دەرێ و لەپێش خۆی داینا. لە بەر شەوقی ئەو چرایە ئەوەندەی بادە خواردەوە هەتا مەست بوو. ئەسڵان گوتی: 'فەرماندە، ئەو چرایەم بدەرێ.' ئەحمەد گوتی: 'ناتوانم ئەوە بە تۆ بدەم.' ئەسڵان گوتی: 'بۆ ناتوانی بیدەی بە من؟' ئەحمەد گوتی: 'چونکە دەیانکەس بوونەتە قوربانی ئەو چرایە.' ئەسڵان گوتی: 'گیانی کێ بووەتە قوربانی؟' ئەحمەد گوتی: 'پیاوێک هاتبووە ئێرە پێیان دەگوت، عەلائەددین. ئەویان کرد بە سەرۆکی سیتتین. هەر ئەو چرایە سەری ئەوی خوارد!' ئەسڵان گوتی: 'چۆناوچۆن؟' ئەحمەدی قەماقیم گوتی: 'تۆ برایەکت بوو ناوی 'حەیزەلەم بێزازە' بوو. کە تەمەنی بوو بە پازدە ساڵ و کاتی ژنهێنانی هات، باوکت ویستی کەنیزێکی بۆ بکڕێ.' ئیدی بەسەرهاتەکەی هەموو بۆ گێڕاوە. ئەو ستەمەی کە لە عەلائەددین ئەبووشامات کرابوو، هەمووی بۆ باس کرد. ئەسڵان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە یاسەمینی دایکی من بێ. ئەو عەلائەددینی ئەبووشاماتەش دەبێ باوکی من بێ.'

"دوای ئەوە ئەسڵان لە لای ئەحمەدی قەماقیم هاتە دەرێ و تووشی ئەحمەد دەنەف بوو. ئەحمەد دەنەف کە ئەوی دیت، گوتی: 'پاکە ئەو خودا بێهاوتایە!' حەسەن شوومان گوتی: 'ئەوە چیت بە لاوە سەیر بوو؟' ئەحمەد دەنەف گوتی: 'ئەو کوڕە زۆر شێوەی عەلائەددین دەدا.' ئیدی ئەحمەد بانگی کرد و گوتی: 'ئەسڵان، ناوی دایکت چییە؟' گوتی: 'یاسەمین.' ئیدی ئەحمەد گوتی: 'ئەسڵان، چاو و دڵت ڕوون کە تۆ هەر دەبێ کوڕی عەلائەددین بی. بچۆوە لای دایکت و ناوی باوکتی لێ بپرسە.' ئەسڵان چووەوە لای دایکی و پرسیاری ناوی باوکی کرد. یاسەمین گوتی: 'باوکی تۆ میر خالیدی والییە.' ئەسڵان بە دایکی گوت: 'کەس باوکی من نییە جگە لە عەلائەددین!' دایکی دەستی کرد بە گریان و

گوتی: 'ڕۆڵە، ئەوە کێ پێی گوتی؟!' ئەسڵان گوتی: 'ئەحمەد دەنەف پێی گوتم.' ئیدی یاسەمین بەسەرهاتەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە حەق دەر کەوت و پەردە لەسەر ناڕەوایی داماڵرا. ڕاستە تۆ کوڕی علائەددینی نەبووشاماتی. میر خالید تۆی پەروەردە کردووە و وەک کوڕی خۆی باڵی بەسەر کێشاوی. بەلام ڕۆڵە گیان، ئەگەر تووشی ئەحمەد دەنەف بووی، پێی بڵێ: 'تۆ خودا حەقی باوکم لە بکوژەکەی بکەوە.' ئینجا ئەسڵان لە لای دایکی هاتە دەر و ڕۆیشت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەسلان لە لای دایکی هاتە دەر و یەکسەر ڕۆیشت بۆ لای ئەحمەد دەنەف و دەستی ماچ کرد. ئەحمەد دەنەف گوتی: 'ئەوە چ بووە ئەسلان؟' ئەسلان گوتی: 'پرسیارم کرد، باوکی من عەلائەددین ئەبووشاماتە. دەمەوێ تۆڵەی خوێنی باوکم بکەیتەوە.' ئەحمەد گوتی: 'کێ ئەوی کوشتووە؟' ئەسلان گوتی: 'ئەحمەد قەماقیموسەڕڕاق کوشتوویەتی.' ئەحمەد دەنەف گوتی: 'تۆ لەکوێوە زانیت ئەو کوشتوویەتی؟' ئەسلان گوتی: 'چرا زێڕینە گەوهەرئاوێزەکە کە یەکێک لە کەلوپەلەکانی خەلیفە بوو لە لای ئەوە. پێم گوت: 'ئەوەم بدەیە.' گوتی: 'ناتدەمێ، ئەو چرایە چەند کەس لەسەر بوونەتە قوربانی.' تەواوی چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە کە چۆناوچۆن کەلوپەلەکانی خەلیفەی دزیوە. بردوویەتە مالی باوکم.'

"ئەحمەد دەنەف بە ئەسلانی گوت: 'ئەگەر بینیت کە میر خالید جلی شەڕی لە بەر کرد، پێی بلێ جلی شەڕیی بدە بە منیش با لە بەری بکەم. کاتێک بە جلی شەڕەوە هاتیتە دەر، لەبەردەم خەلیفەدا چالاکی و ئازایەتی خۆتی پیشان بدە. خەلیفە پێت دەلێ: 'ئەسلان، داوایەکم لێ بکە.' تۆش بلێ: 'داوام ئەوەیە کە تۆلەی خوێنی بەناحەقڕژاوی باوکم لە بکوژەکەی بکەیتەوە.' پێت دەلێ: 'باوکی تۆ زیندووە.' تۆ بلێ: 'باوکی من میر خالیدی والی نییە. باوکی من عەلائەددین ئەبووشاماتە. میر خالید منی پەروەردە کردووە.' دوایی، ئەوەی لە مالی ئەحمەدی قەماقیم بینیت و بیستت، بۆ خەلیفەی بگێڕەوە. پێی بلێ: 'ڕێم بدە با بچم چراکە لە مالی ئەحمەدی قەماقیم بێنمە دەر.' ' ئەسلان گوتی: 'بە چاوان.'

"ڕۆژێک ئەسلان سەیری کرد، ئەوە میر خالید خەریکە خۆی ساز دەکا بچێ بۆ لای خەلیفە. ئەسلان گوتی: 'پێم خۆشە منیش جلی شەڕ لە بەر کەم و بمبەیتە لای خەلیفە.' ئیدی میر خالید جلی شەڕی لە بەر ئەسلان کرد و بردی بۆ گۆڕەپان. لە دەرەوەی شار تاوڵ و سابات لێ درابوون و سوپا لەوێ کۆ کرابووەوە. یاری گۆیێنیان دەکرد. یەکێک بە گۆچان لە گۆیەکەی دەدا و دەیخستە هەوا و یەکی دیکە لە هەواوە بە گۆچان لە گۆیەکەی دەدا و دەیگێڕاوە. هەتا کەسێکی شۆفار کە بۆ کوشتنی خەلیفە هاتبوو گۆیەکەی گرت و بە گۆچان لێی دا. گۆیەکەی بەرەو خەلیفە هەلدا. خەریک بوو گۆیەکە لە سەروچاوی خەلیفە بدا کە ئەسلان زۆر چالاکانە خۆی گەیاندێ. گۆچانێکی وای لە گۆیەکە دا و گێڕایەوە کە گۆیەکە ڕاست لەنێو شانی ئەو کەسە درا و تەختی زەوی کرد. خەلیفە دەستخۆشی لە ئەسلان کرد و ئافەرینی لێ کرد. دوای ئەوە لە ئەسپەکەی هاتە خوارێ. لەسەر کورسی دانیشت. پاشان فەرمانی دا ئەو کەسە بێننە لای. هێنایان و خەلیفە لێی پرسی: 'تۆ لە

دوستانی ئێمەی یان دوژمنانی ئێمە؟ کێ هانی دای ئەو کارە بکەی؟' گوتی: 'دوژمنی ئێوەم و هەر بە تەما بووم بتکوژم.' خەلیفە گوتی: 'باشــــە لەبەر چی دەمکوژی؟ مەگەر تۆ موسولمان نییت؟' پیاوەکە گوتی: 'نا مەجووسیم.'

"خەلیفە فەرمانی کوشـتنی دا. بە ئەسـلانیشـی گوت: 'داوایەکم لێ بکە.' ئەسـلان گوتی: 'داوای من ئەوەیە کە تۆڵەی کوشـــتنی باوکم لە بکوژەکەی بکەیتەوە.' خەلیفە گوتی: 'خۆ باوکی تۆ زیندووە!' ئەســـلان گوتی: 'کێ باوکی منە؟' خەلیفە گوتی: 'میر خالیدی والی باوکی تۆیە!' ئەســلان گوتی: 'خوا پشــت و پەنای خەلیفە بێت! ئەو باوکی پەروەدەیی منە. ئەگینا باوکی ڕاســـتەقینەی من عەلائەددین ئەبووشـــاماتە.' خەلیفە گوتی: 'باوکی تۆ ناپاک بوو!' ئەســـلان گوتی: 'ئەو قەت ناپاکی نەکردووە. چ ناپاکییەکی لە تۆ کردووە؟' خەلیفە گوتی: 'ماڵی منی دزیوە.' ئەسـلان گوتی: 'خەلیفەی زەمان، باوکی من قەت دزی نەکردووە. خەلیفە، کاتێک شتەکانیان لە ماڵی باوکم هێنانە دەر، ئایا چراکەی تۆیان لەگەڵ بوو یان نا؟' خەلیفە گوتی: 'چراکەم نەدییەوە.' ئەسلان گوتی: 'من چراکەم لە ماڵی ئەحمەد قەماقیم بینی. تکام لێ کرد بیدا بە من. ئەو نەیدامێ و گوتی: 'چەند کەس لەســـــەر ئەو چرایە بوونەتە قوربانی.' باســـی نەخۆشـــی 'حەیزەلەم بێزازە'ی بۆ کردم کە لە تاوی ئەوینی یاســـەمین لە جێدا دەکەوێ. باسی ئازادی خۆی لە بەندیخانە و دزینی شتەکانی خەلیفە و شـاردنەوەیان لە ماڵی باوکم و تەواوی ئەوانەی بۆ گێڕامەوە. ئێســـتاش تکات لێ دەکەم تۆڵەی باوکم لە بکوژەکەی بکەوە.' ئیدی خەلیفە فەرمـانی گرتنی ئەحمەدی قەمـاقیمی دەرکرد. ئەحمەدی قەماقیمیان گرت. ئەوجا داوای کرد بانگی ئەحمەد دەنەف، فەرماندەی دەسـتەڕاسـتی بکەن. کاتێک ئەحمەد دەنەف هات، خەلیفە پێی گوت: 'ئەحمەد، قەماقیم بپشـــکنن.' ئیدی ئەحمەد دەنەف دەسی برد لە گیرفانیدا چرا زێڕە گەوهەرئاوێزەکەی دەر هێنا. ئەو جار فەرمانی دا. هەتا ڕاســـتی هەموو شـــتێک دەڵێ لێی دەن. خەلیفە پێی گوت: 'ئاخر هەتیوە زۆڵ و ناپاکە، ئەو کارانەت لەبەر چی کرد؟! عەلائەددینی دەســـتپاکت بۆ بە کوشـــتن دا؟!' دوایی خەلیفە فەرمـــانی دا والییش بگرن. والی گوتی: 'ئەی خەلیفە، من بێگونـــاحم، بە فەرمـــانی تۆ عەلائەددینم کوشتووە. من هیچ هەواڵێکم لە ڕاستی و درووستی شتەکە نەبووە. ئەو فێڵ و دەهۆیە لەنێوان پیرێژن و ئەحمەد قەماقیم و ژنەکەمدا بووە.'

"ئیدی والی پەنای بردە بەر ئەســلان و داوای تکای کرد. ئینجا خەلیفە لە والی پرســـی: 'ئێسـتا دایکی ئەســلان چی بەســەر هاتووە؟' والی گوتی: 'ئەو لە لای منە.' خەلیفە بە والی گوت: 'بە ژنەکەت بڵێ جلوبەرگ و خشــــڵ و جەواهێراتەکە لە بەری یاســـــەمین بکاتەوە. درۆشمیش لەسەر دەرگای ماڵی عەلائەددین هەڵگرن و بیدەنەوە بە ئەسلان.' والی هاتەوە ماڵ. فەرمانی خەلیفەی بە خێزانی ڕاگەیاند. جلوبەرگ و زێڕ و خشڵ و شتەکانیان لە بەر یاسەمین کردەوە. درۆشمیان لەسەر دەرگای ماڵی عەلائەددین هەڵگرت و کلیلی ماڵەکەیان

داوه به ئەسلان. دوای ئەوانەش خەلیفە بە ئەسلانی گوت: 'داوایەکم لێ بکە.' ئەسلان گوتی: 'تکای من ئەوەیە بە دیداری باوکم شادم بکەرەوە.' خەلیفە کە ئەوەی بیست، دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'وا دیارە ئەوەی کە بە دارەکەوە بوو عەلائەددینی باوکی تۆ نەبووە. بەلام بە ڕۆحی باب و باپیرانم، هەرکەس هەواڵی زیندووبوونی عەلائەددینم بداتێ، تەواوی ئاواتەکانی بەدی دەهێنم. هەرچەندی ماڵ بوێ، دەیدەمێ.' ئیدی ئەحمەد دەنەف هاتە پێشێ و کڕنۆشـــی برد و گوتی: 'موژدەم بەرێ کە عەلائەددین زیندووە.' خەلیفە گوتی: 'ئەوە دەڵێی چی؟' ئەحمەد گوتی: 'سوێن بە گەورەییت بە ڕاستمە! من کەسێک کە شیاوی ئەوە بوو لە جێی ئەو بکوژرێ بەختی ئەوم کرد. ئەوم گەیاندە ئەسکەندەرییە. لەوێ دووکانم بۆ داناوە.' خەلیفە گوتی: 'داوات لێ دەکەم بچووە بیهێنەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە بە ئەحمەد دەنەفی گوت: 'دەبێ بچی ئەوم بۆ بێنیتەوە ئێرە' و دەهەزار دیناریشی دایە. ئیدی ئەحمەد چوو بۆ ئەسکەندەرییە. کاری ئەسلانیش بێرە گەیشت.

"عەلائەددین کاتێک لە ئەسکەندەرییە دووکانی دانا. تەواوی ئەوەی وا لەنێو دووکانەکەدا بوو لەبەرەوە فرۆشتنی. لەو دووکانەدا جگە لە کەمێک ماڵ و هەنبانەیەک، هیچی دیکەی تیدا نەمابوو. عەلائەددین هەنبانەکەی بە دەستەوە بوو هەر وا رێکی دەگوشی و دەی پشکنی کەچی گەوهەرێکی بە قەد هێلە کۆترێک کە لە تۆرێکی زێڕیندا بوو کەوتە خوارێ. ئەو گەوهەرە پێنج بەر بوو. لە هەر بەرێکییەوە ناو و تەلیسمێکی بە خەتێکی ورد وەک شوێنپێی مێروولە لەسەر نەخشابوو. عەلائەددین دەستێکی بە هەر پێنج لای گەوهەرەکەدا هینا و سڕیی. کەس دەنگی لێوە نەهات. ئەوجا لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ڕەنگە ئەوەش هەر هی فرۆش بێ.' ئیدی ئەویشی هەڵاوەسی. لەو جەنگەیەدا پیاوێکی کورتەباڵا لەوێوە تێدەپەڕی، چاوی بە گەوهەرەکە کەوت. هاتە ژوورێ. لە پەنا عەلائەددین دانیشت و گوتی: 'گەورەم ،ئەو گەوهەرە دەفرۆشی یان نا؟' عەلائەددین گوتی: 'ئەوەی لەو دووکانەدایە بۆ فرۆشتنە.' پیاوە گزگلەکە گوتی: 'ئەو گەوهەرە بە هەشتاهەزار دینار بە من بفرۆشە.' عەلائەددین گوتی: 'بۆخۆت بە خێر بێیەوە.' گزگلە گوتی: 'ئەی بە سەدهەزار دینار دەیفرۆشی؟' عەلائەددین گوتی: 'دەیفرۆشم، پارەکەم بدەرێ.' گزگل گوتی: 'من ناتوانم ئەو هەموو پارەیە لەگەڵ خۆمدا بێنم، چونکە ئەسکەندەرییە دز و چەتەی زۆرە. ئەگەر تۆ لەگەڵم بێیتە ناو کەشتییەکە، لەوێدا نرخی گەوهەرەکەت دەدەمێ و بێجگە لەو تۆپێک شاڵی کشمیر و پەنجا گەزت ئەتڵەس و ئاوریشم لەگەڵ بوخچە و قەنیفەی یەمەنیت دەدەمێ.' ئیدی عەلائەددین گەوهەرەکەی دا بە کابرا گزگلەکە و هەستا دووکانی گاڵە دا. کلیلەکەی دا بە هاوسێی دووکانەکەی و گوتی: 'با ئەوانە سپاردەی لای تۆ بن. من لەگەڵ ئەو کابرایە هەتا ئەو کەشتییە دەچم. پارەی ئەو گەوهەرەی لێ وەردەگرم. ئەگەر هەر نەهاتمەوە، ئەحمەد دەنەف فەرماندەی دەستەڕاستی خەلیفە منی هێناوەتە ئەم شارە، دێتەوە بۆ ئێرە و کلیەکان بدە بەو. هەموو شتێکیشی بۆ بگێڕەوە.' ئیدی عەلائەددین لەگەڵ گزگلە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کەشتییەکە. گزگل کورسی بۆ عەلائەددین دانا و لەسەر کورسی داینا، گوتی ئەوەندە پارەیەی بۆ بێنن. ئیدی پارەکەی ژمارد و ئەوەندەی گفتی پێدا بوو دایێ. ئینجا گوتی: 'گەورەم، دڵمان بە خواردنی پارووە نانێک یان خواردنەوەی کەمێک ئاو خۆش بکە.' عەلائەددین گوتی: 'ئەگەر کەمێک ئاوم بدەنێ، سوپاستان دەکەم.' گزگل گوتی: 'ئاوی بۆ بینن.' بە ئاماژە بەنگیان تێ کرد. عەلائەددین ئاوەکەی خواردەوە، لەڕێوە بێهۆش بوو. ئیدی

کورسییان لا برد. چارۆکەیان هەڵدا و ڕۆیشتن. با لێی دان هەتا گەیشتنە ناوەڕاستی دەریا. ئینجا عەلائەددینیان وە هۆش هێناوە. کە چاوی کردەوە، گوتی: 'ئەوە من لەکوێم.' گزگل گوتی: 'ئەوە تۆ دیاری منی!' عەلائەددین گوتی: 'ئێوە چ کارەن، ئەوە بۆ ئاواتان کردووە؟' کابرا گوتی: 'من کەشـــتیوانم. بە تەمام بە دیاری بتبەم بۆ خۆشـــەویســـتەکەم.' ئیدی لەو قسانەدا بوون کەشتییەکی دیکە هات کە چل دانە بازرگانی تێدا بوو. کەشتیوانەکە هێرشی کردنە ســەر. تەواوی ماڵەکەیانی بە تالان برد. بازرگانەکانی بە دیل گرت و بەرەو شــاری جەنەوا کەوتە ڕێ.

"کە گەیشــتنە شــاری جەنەوا، کەشــتیوانەکە چووە دەرکی کۆشــک. کچێک هاتە دەرێ دەمامکی بەســتبوو. بە کەشــتیوانەکەی گوت: 'ئەرێ گەوهەرەکە و خاوەنەکەیت هێناوە یان نــا؟' کەشـــــتیوانەکە گوتی: 'هەردووکیــانم هێنــاوە.' کیژەکە گوتی: 'گەوهەرەکەم بەرێ.' گەوهەرەکەی وەرگرت و گەڕاوە. پاشـــای ئەوێ هەواڵی هاتنی کەشـــتییەکەی بیســـت. بۆ چاوپێکەوتنی کەشـــتیوانەکە هاتە دەرێ. لێی پرســـی: 'چۆن ســـەفەرێک بوو؟' کەشـــتیوان وەڵامی داوە: 'ســـەفەرێکی زۆر زۆر باش و پیرۆز بوو. لەو ســـەفەرەدا کەشـــتییەکم گرت چلویەک موســـوڵمانی تێدا بوو.' پاشـــا داوای کرد بیان بینێ. هێنایانن. لەپێشــدا بە یەکیانی گوت: 'موســـوڵمان، خەڵکی کوێی؟' وەڵامی داوە: 'خەڵکی ئەســکەندەرییە.' ئیدی فەرمانی بە بکوژەکەی دا. هەر لەوێ ئەوی کوشـــت. هەتــا چلەمین کەس دانە دانەیــانی کوشـــت. عەلائەددین لە ســەری ئەو ســەروە ڕاوەســتابوو. ئینجا عەلائەددینیان هێنا پێشــێ. لەویشــی پرســـی :'تۆ خەڵکی کام شــاری؟' عەلائەددین گوتی: 'خەڵکی ئەســکەندەرییەم.' فەرمانی بە بکوژەکەیدا ئەویش بکوژێ. بکوژەکە هەڵیکێشـــا شـــیر بیکوژێ، لەپڕدا پیرێژنێکی بە خۆوە هات. پاشـــا بە ڕێزەوە لە بەری هەســـتا. پیرێژنەکە گوتی: 'مەگەر بە تۆم نەگوت هەر کات کەشـــــتیوان دیلی هێنا، یەک-دووانێکیان بۆ خزمەت بهێڵەوە؟' پاشـــــا گوتی: 'دایە، خۆزگە زووتر دەهاتی. ئێستا هەر دەنکێکمان ماوە و نەمانکوشتووە. ئەو بەرە بۆ خزمەتی دێرەکە.' پیرێژن ڕووی کردە عەلائەددین و گوتی: 'خزمەتی دێر دەکەی، یان لێی گەڕێم پاشــا تۆش بکوژێ؟' عەلائەددین گوتی: 'خزمەتی دێر دەکەم.'

"ئینجـا پیرێژن عەلائەددینی لەگەڵ خۆی برد و چوون بۆ دێرەکە. عەلائەددین گوتی: 'من دەبێ چ خزمەتێک بکەم و کاری من چییە؟' پیرێژنە گوتی:'هەموو بەیانییەک پێنج دانە هێستر بەرە و بچووە بۆ بێشە. لەوێ دار و چرپی وشکەڵە کۆ بکەوە. لە هێسترەکانی دە و بیهێنەوە بۆ چێشـــتخـانەی دێر. دوای ئەوە فەرشـــەکـان کۆ بکەوە. بەردە ڕوخـام و مەرمەڕەکانی دێر جوان بسترە و خاوێنیان کەوە. ئینجا فەرشەکان ڕاخەوە و گسکیان بدە. پاشان نیو خەروار گەنم خاوێن کەوە و بیهاڕە. دوایی بیکە بە هەوێر. پاشان تەندووری بۆ داخە و بیکە بە نان بۆ دێر. دوای ئەوە نیسکێکی زۆر بێنە خاوێنی کەوە بژاری کە. ئەویش

بکوڵینە. جا چوار حەوزی دێرەکە پڕ کە لە ئاو. جا ئەوجار سێسەد و شەست جام دێنی شۆربا و نیسکیان تێ دەکەی. ئەو سێسەد و شەست جامە تێ دەکوشی و دەیبەی بۆ ئەو هەبیسانە[1]. '

"ئیدی عەلائەددین گوتی: 'من بەرەوە بۆ لای پاشا با بمکوژێ، چونکە مردن زۆر لەو هەموو کارە ئاسانترە.' پیرێژن گوتی: 'باشە، ئەگەر ئەوانەت بۆ ناکرێ، دەتبەمەوە بۆ لای پاشا بتکوژێ.' ئیدی عەلائەددین مات و مەلوول دانیشت.

"لەنێو کەنیسەکەدا دە کەسی کوێری تێدا بوو نەیاندەتوانی هەستن. یەکیان بە عەلائەددینی گوت: 'گلێنەکە[2] بێنە.' عەلائەددین گلێنەکەی بۆ برد. دوای ئەوە کوێرەکە بە ناحەزی گوتی: 'ئەو پیساییە بڕێژە.' عەلائەددین ئەوەشی بە قسە کرد. کوێرە گوتی: 'ئافەرین بۆ تۆ خزمەتکاری کەنیسەی دێر. مەسیح بتپارێزێ.' لەو جەنگەیەدا پیرێژنە هات و بە عەلائەددینی گوت: 'ئەوە بۆ ئەرکەکانت بەڕێوە نابەی؟' عەلائەددین گوتی: 'مەگەر من چەند دەستم هەیە تا بەو هەمووە کارە ڕابگەم؟' پیرێژنە بە عەلائەددینی گوت: 'شێتوویت، من تۆم بۆ خزمەتکردن هێناوەتە ئێرە.' دوای ئەوە بە عەلائەددینی گوت: 'ئەو شووڵەت دیوە خاچێکی بەسەرەوەیە، هەڵیگرە. لە قەراخ ئەو ڕێگایە ڕاوەستە. ئەگەر والی شاریش بیرەدا هات، پێی بڵێ وەرە کاری کەنیسەم پێتە. ئەو بێقسەییت ناکا. ئەوجار گەنمی دەیە و بڵێ خاوێنی کەوە. لێی بکە و بیکە بە هەویر و نان. ئەگەر بە کەسێکت گوت و نەهات لێی دە و لە کەس مەترسە. ئیدی عەلائەددین بە قسەی پیرێژنەی کرد. ئەوجار ئاوا کارەکانی بە ورد و درشتی خەڵک دەکرد. هەتا حەڤدە ساڵ ئەوە کاری بوو.

"ڕۆژێک لە کەنیسە دانیشتبوو کە پیرێژنە هات و پێی گوت: 'لە کەنیسە بڕۆ دەر.' عەلائەددین گوتی: 'بچمە کوێ؟' پیرێژنە گوتی: 'ئەمشەو لە مەیخانە بمێنەوە.' عەلائەددین گوتی: 'بۆ بچمە ئەوێ؟' پیرێژنە گوتی: 'حوسنی مریەم، کچی پاشا یوحەننا، پاشای ئەم شارە بە تەمایە بێتە سەردانی کەنیسە. نابێ کەس لێرە دابنیشێ.' ئیدی عەلائەددین هەستا وای نیشاندا کە ئەوە دەڕواتە دەرەوەی کەنیسە. بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ناچمە دەر هەتا چاوم بە کچی پاشا نەکەوێ. بزانم ئەوانیش وەک کچانی ئێمە وان یا جوانترن؟' ئیدی چوو لە شوێنێک خۆی مات دا کە دەیڕوانییە ئەو شوێنەی ئەوی پێدا دەهات. لەپڕدا دیتی ئەوە کچی پاشا هات. جوان چاوی لێ کرد. دەتگوت مانگە لەپشت هەور هاتووەتە دەرێ، ئەوەندە جوان بوو. کچێکیشی لەگەڵ بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. هەبیس: تەرکەدونیا. لەخواترس.

٢. گلێنە: دەفرێکی گلینە جاری وا بوو بۆ کەسی ناساغیان ڕادەگرت تا میزی تێ بکات.

## که ئەوی دووسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلائەددین چاوی لە کچی پاشا دەکرد، دیتی کچێکیشی لەگەڵە بە زبێدە بانگی دەکرد. عەلائەددین کە جوان لە کچە ورد بووەوە، دیتی ئەوە زبێدەی عودیەیە کە لەپێشدا مردبوو. دوای ئەوە کچی پاشا بە زبێدەی گوت: 'هەستە و بە عوود ئاهەنگێکم بۆ لێدە.' زبێدە پێی گوت: 'هەتا تۆ ئاواتەکەی من کە بەڵێنت پێدام بەدی نەهێنی، منیش عوودت بۆ لێ نادەم.' کچی پاشا گوتی: 'کوا بەڵێنی چیم پێ دای؟' زبێدە گوتی: 'تۆ بەڵێنت پێ دام کە من بە دیداری عەلائەددین ئەبووشاماتی مێردم شاد بکەیتەوە.' کچی پاشا گوتی: 'مۆژدە بێ، ئێستا تۆ لەگەڵ مێردەکەت گەیشتوونەتەوە یەک.' زبێدە گوتی: 'کوا مێردەکەی من؟!' کچی پاشا گوتی: 'هەر لەو کەنیسەیەدایە. ئێستا گوێی لە قسەکانی ئێمە هەیە.' ئیدی زبێدە دەستی دا عوودەکەی و دنیای پڕ کرد لە شادی و خۆشی و بە جۆرێک کە پیرێژنی دێنا سەما.

"عەلائەددین کە ئەوەی دیت، دڵی خۆش بوو و لە تاوی خۆشەویستەکەی ئاگای لە خۆی نەما. لەو شوێنەی لێی بوو هاتە دەر. لێیان چووە پێش. زبێدەی خێزانی لە ئامێز گرت. زبێدەش ئەوی ناسییەوە و دەستی لە ملی کرد. هەردووکیان لەوێ بێهۆش بوون. شازادەی جوانی، حوسنی مریەم، لێیان چووە پێشێ. گوڵاوی بەسەردا هەڵپرژاندن. ئەوانی وە هۆش هێناوە و گوتی: 'سوپاسی خودا بکەن کە پێک شاد بوونەوە.' عەلائەددین گوتی: 'گەورەم، ئێمە بە هۆی سۆز و بەخشندەیی تووە پێک شاد بووینەوە.' دوای ئەوە عەلائەددین رووی لە زبێدەی عودیە کرد و پێی گوت: 'زبێدە، تۆ خۆ مردبووی! ئێمە تۆمان ناشت! چۆناوچۆن زیندوو بوویتەوە و گەیشتیتە ئێرە؟!' زبێدە گوتی: 'گەورەم، من نەمردبووم، درنجێک هات منی رفاند و هێنامیە ئێرە. ئەوەی ئێوە ناشتتان ژنە درنجێک بوو کە هاتبووە بیچمی منەوە. ئیدی دوای ئەوەی کە ناشتتان، هاتەوە دەرێ و ئێستا لە خزمەت حوسنی مریەمی خانمەکەیدایە. منیش بێهۆش بووم، کاتێک وە هۆش هاتمەوە و چاوم کردەوە، سەیرم کرد لە خزمەت ئەو خانمە دام. ئەو خانمە حوسنی مریەمی کچی پاشایە. گوتم: 'ئەوە بۆ منت هێناوەتە ئێرە؟' وەڵامی دامەوە: 'پێیان گوتم من لەگەڵ مێردەکەی تۆ دا زەماوەند دەکەم! زبێدە تۆ ڕازییت کە عەلائەددین شەوێک لەگەڵ من و شەوێک لەگەڵ تۆ بێ؟' گوتم: 'من بەوە ڕازی و خۆشحاڵم، بەڵام کوا عەلائەددین لەکوێیە؟' شازادە گوتی: 'بە قەڵەمی دەسەڵات لەسەر تەوێڵی نووسراوە کە ئەگەر کاتی بێ، بۆخۆی دێتە ئێرە.' من لەو ماوەیەدا لە لای شازادە بووم. بە ئاهەنگی تەپڵ و ئامێری مۆسیقا خۆم هێور کردووەتەوە هەتاکو خودا پێکی شاد کردینەوە.'

"دوای ئەوە حوسنی مریەم بە عەلائەددینی گوت: 'گەورەم، ئایا تۆ قایلی بەوەی کە من ببمە ژنی تۆ و تۆش مێردی من بی؟' عەلائەددین گوتی: 'خانمەکەم، ئاخر من موسوڵمانم و تۆ مەسیحی! چۆن لەگەڵ تۆدا دەکرێ زەماوەند بکەم؟' شازادە گوتی: 'تۆبە تۆبە ئەگەر من کافر بم! من هەژدە ساڵە موسوڵمانم.' عەلائەددین گوتی: 'خانم، من پێم خۆشە بچمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم.' شازادە گوتی: 'من لە چارەی تۆدا هێندێک ڕووداو دەبینم. پێت خۆش بێ یان نا ئەوانەت بەسەر دێن و پاشان بە ئاواتت دەگەی. عەلائەددین با ئەو موژدەیەشت بدەمێ کە تۆ کوڕێکت هەیە ناوی ئەسلانە. ئێستا تەمەنی هەژدە ساڵە. لە جێی تۆیە و سەرۆکی سیێتینە. هەموو شتێک ئاشکرا بووە. پەردە لەسەر پیلانەکەی ئەحمەد قەماقیم هەڵدراوەتەوە. خەلیفە زانی کە شتەکانی ئەو ئەحمەد قەماقیم دزیونی و ئێستا لە زیندانە. ئەوەش بزانە ئەو زێڕەی لە هەنبانەکەدا بوو کاری خۆم بوو. من لەوێم خست. هەر من بووم کە کەشتیوانم نارد هەتا تۆ و گەوهەرەکە بێنێتە ئێرە. کەشتیوان عاشقی من بووە و شەیدامە، هەر بەدوامەوەیە. من وەڵامم نەداوەتە و پێم گوتووە: 'ئەگەر گەوهەرەکە و خاوەنەکەی بێنی، شووت پێ دەکەم و بە ئاواتت دەگەیەنم.' سەد بەدرەی زێڕیشم دایێ. لە بیچمی بازرگاندا ناردم. کاتێکیش دوای ئەو چل کەسە ویستیان تۆ بکوژن، من ئەو پیرێژنەم نارد تا تۆ ڕزگار بکا.' عەلائەددین گوتی: 'خودا پاداشی چاکەت بداتەوە.'

"دوای ئەوە حوسنی مریەم لەسەر دەستی عەلائەددین دیسان باوەڕەکەی بە ئیسلام تازە کردەوە. کاتێک عەلائەددین زانی قسەکانی هەموو ڕاستن، گوتی: 'من لە ڕاستی ئەو گەوهەرە ئاگادار بکەوە. پێم بڵێ ئەو گەوهەرە هی کوێیە؟' حوسنی مریەم گوتی: 'ئەو گەوهەرە لە خەزێنەیەکی جادوویدا بوو. پێنج تایبەتمەندی هەیە کە لە کاتی تەنگانەدا بە کارمان دێت. بابەگەورەی دایکم جادووی دەزانی. نهێنی و شتی دەکردەوە. بە شوێنی گەنجەکانی دەزانی. ئەو گەوهەرەی لە گەنجێکدا دۆزییەوە. کاتێک گەورە بووم و بوومە چواردە ساڵ، ئینجیل و کتێبەکانی دیکەم خوێندنەوە. ناوی پیرۆزی محەممەدم [درووود و سڵاوی خودای لێ بێ] لە چوار کتێبی تەورات و ئینجیل و زەبوور و فورقاندا بینی. ئیدی باوەڕم پێ هێنا. لەگەڵ خۆمدا کەوتمە لێکۆڵینەوە کە جگە لە خودا هیچ پەروەردگارێک نییە. بۆم دەرکەوت کە جگە لە ئیسلام هیچ باوەڕێکی دیکە ڕاست نییە. باوەگەورەی دایکم کە نەخۆش کەوت، ئەو گەوهەرەی دامێ. هەر پێنج تایبەتمەندییەکەشی فێر کردم. پێش ئەوە بشمرێ، بابم پێی گوت: 'چاوێک لە چارەی من بکا و پێشم بڵێتەوە چارنووسم دەبێ بە چی.' باپیرەگەورەم پێی گوت: 'ئەتۆ بە دەستی دیلێک کە لە ئەسکەندەرییەوە هێناویانە دەکوژرێی. ئیدی باوکم هەڵوێستی گرت هەر دیلێک کە لە ئەسکەندەرییەوە بیهێنن بیکوژێ. بە کەشتیوانەکەی گوت: 'هێرش بکەنە سەر ئەو کەشتیانەی لە ئەسکەندەرییەوە دێن. یان بیانکوژن یان بیهێننە لای من.' ئیدی کەشتیوان بە فەرمانی باوکم موسوڵمانەکانی دەهێنایە

ئێره، چەندین موسوڵمان لێره کوژراوه.

"دوای ئەوەی باپیرەگەورەم مرد، من فاڵم بۆ خۆم دەگرتەوه. له دڵی خۆمدا دەمگوت: 'بڵێی لەگەڵ کێ زەماوەند بکەم؟' دوایی بۆم ڕوون بووەوه که مێردی من کەس نابێ جگه له عەلائەددین ئەبووشامات. پێم سەیر بوو، سەرم سوور مابوو. ئیدی هەر ڕاوەستام هەتا وا بوو ئەوه به تۆ گەیشـــتم.' بەو جۆره حوســـنی مریەم خۆی له عەلائەددین ماره کرد. عەلائەددین پێی گوت: 'من دەمەوێ بچمەوه بۆ وڵاتەکەی خۆم.' حوســـنی مریەم گوتی: 'ئەگەر هەر به تەمای، ئەوەی هەســـته لەگەڵم وەره.' عەلائەددینی لەگەڵ خۆی برد و له کۆشـــکدا شـــاردییەوه. بۆخۆی هاتەوه لای باوکی. بابی پێی گوت: 'کچەکەم، ئەمڕۆ من دڵم زۆر تەنگه، لەگەڵم دانیشه با تۆزێک سەرخۆش بم.' حوسنی مریەم لەگەڵی دانیشت. پاشا داوای مەی کرد. حوســـنی مریەم پیاڵه پیاڵه بۆی تێ کرد و دایه دەســـتی. هەتا پاشـــا ســـەرخۆش بوو. دوای ئەوه حوســـنی مریەم بەنگی بۆ له پیـاڵەیەک کرد و دایێ. که خواردییەوه، یەکسەر فڕی به دنیاوه نەما.

"ئینجا حوسنی مریەم هاتەوه بۆ لای عەلائەددین. ئەوی لەو شوێنەی لێی شاردبووەوه هێنا دەرێ. پێی گوت: 'دژمنی تۆ و دژمنی خودا بێهۆش کەوتووه. بەنگم داوەتێ. ئێســـتا چی لێ دەکەی لێی بکه.' عەلائەددین هات بۆ لای. ســـەیری کرد بێهۆش لەوێ کەوتووه. ئینجا قۆڵی بەســـت و تەواو شـــەتەکیان دا. پاشـــان دەرمانی دژەبەنگی دایێ. وه هۆشـــی هێناوه."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# کە شەوی دووسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلائەددین پاشای وە هۆش هێناوە. پاشا دیتی ئەوە حوسنی مریەمی کچی و عەلائەددین بە لایەوە ڕاوەستاون. دەست و لاقی بەستراوە. بە کچەکەی گوت: 'ئەوە تۆ ئاوا لەگەڵ من دەکەی؟' حوسنی مریەم پێی گوت: 'ئەگەر من کچی تۆم، تۆش موسوڵمان بە، چونکە من ڕاستیم بۆ ڕوون بووەتەوە و موسوڵمان بووم. پشتم لە ناحەق کردووە و ڕووم لە حەق. ئەگەر تۆش ئیمان بێنی و موسوڵمان بی، ئەوە ئازیزی نیمەی و بە قەدر و ڕێزی لە لامان، ئەگەر موسوڵمانیش نەبی، ئەوە دەتکوژین.' عەلائەددینیش زۆری ئامۆژگاری کرد. پاشا بە گوێی نەکردن و ملی نەدا. عەلائەددینیش هەڵیکێشا خەنجەر و سەری بڕی. لەسەر کاغەزێک ڕووداوەکەی نووسی و لەسەر سنگی داینا. دوایی هەر شتێک بە کێش سووک و بە نرخ گرانبایی بوو هەڵیانگرت و لە کۆشک هاتنە دەر. چوونەوە بۆ کەنیسە.

"پاشان گەوهەرەکەی بە دەستەوە گرت. دەستی بەو بەرەدا هێنا کە وێنەی تەختێکی لەسەر نەخشێنرابوو. لەڕێوە تەختێک لە بەردەمیان حازر بوو. حوسنی مریەم و عەلائەددین و زبێدەی عودیە لەسەری دانیشتن و شازادە گوتی: 'تەختەکە بە حورمەتی ئەو ناوانەی لەسەر ئەو گەوهەرە نەخشێنراون، بمانخە هەوا.' ئیدی تەختەکە ئەوانی هەڵگرت. بردنی بۆ بێروونێک کە گیای لێ شین نەببوو. شازادە دەستی بە لایەکی گەوهەرەکەدا هێنا کە وێنەی تاوڵێکی لەسەر نەخشێنرابوو. دەمودەست تاوڵ و خێوەت لەوێ هەڵدرا. چوونە ناویان و دانیشتن. ئەوجا چوارلایەکەی دیکەی لە ئاسمان کرد و گوتی: 'بە حورمەتی ناوەکانی خودا لەو دەشت و بێروونەدا دار بڕوێ و بەدەوری دارەکاندا دەریایەک بەدی بێ.' لەجێوە دارەکان شین بوون. دەریاکە چێ بوو. ئیدی ئاویان خواردەوە و دەسنوێژیان گرت. نوێژیان کرد. دوایی سێ لایەکەی دیکەی لە ئاسمان کرد و گوتی: 'بە حورمەتی ناوەکانی خودا سفرەیەک بێتە بەردەممان.' گورج سفرە ڕاخرا و هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەک لە بەردەمیان داندرا. ئینجا خواردنیان خوارد و خواردنەوەیان خواردەوە. با ئەوان لێرە خەریکی خواردن و خواردنەوەی خۆیان بن.

"کوڕی پاشا یۆحەننا کە هاتە لای باوکی و بە کوژراوی دیتی. ئەو پەڕەی کە عەلائەددین نووسیبووی و لەسەر سنگی باوکی داینابوو بینی و هەڵیگرت. پەڕەکەی خوێندەوە و زانی چ باسە. بەدوای خوشکەکەیدا گەڕا، نەیدیتەوە. هەستا چوو بۆ کەنیسە و هەواڵی خوشکی لە پیرێژنەکە پرسی. پیرێژنە گوتی: 'لە دوێنێکەوە تا ئێستا نەمدیوە.' ئیدی چوو بۆ لای سوپاکە و شتەکەی لەگەڵ باس کردن. فەرمانی دا سوپا سوار بێ و بکەونە

شوێنیان. سوپا سوار بوو. کەوتنە دوایان هەتا لە تاوڵەکان نزیک بوونەوە. حوسنی مریەم سەیری کرد ئەوە تەپوتۆزێک دنیای داگرتووە. کە تۆزەکە نیشتەوە، براکەی و سوپاکەی دەرکەوتن. لە دوورەوە هاواری کرد: 'لە ترسی ئێمە ڕۆحتان بۆ کوێ دەبەن؟' حوسنی مریەم بە عەلائەددینی گوت: 'خۆڕاگریت لە شەڕدا چۆنە؟' گوتی: 'وەک ئەوە وایە بزمار لە خۆڵەمێشدا داکوتن. ئەمن نە شەڕ و شوورم پێ دەکرێ و نە زەرگ و شیرم پێ دەوەشێ. ئیدی شازادە گەوهەرەکەی دەرهێنا و دەستی بەو لایەدا هێنا کە وێنەی سواریان لەسەر نەخشێنرابوو. دەمودەست سوارێک پەیدا بوو. لەگەڵ تەواوی ئەو سوپایە کەوتە شەڕەوە هەتا سوپای تارومار کرد. دوای ئەوە بە عەلائەددینی گوت: 'دەچی بۆ میسر یان ئەسکەندەرییە؟' عەلائەددین گوتی: 'دەچم بۆ ئەسکەندەرییە.' ئینجا سواری تەختەکە بوون. شوێن و ئامانجی چوونیان بە تەختەکە گوت. تەختەکە لە چاولێکدانێکدا گەیاندنییەوە ئەسکەندەرییە.

"عەلائەددین ئەوانی بردە دووکان و لەوێ حەسانەوە. دوای ڕۆژێک لە دووکان هاتنە دەر بچنەوە بۆ بەغدا کە لەپڕ تووشی ئەحمەد دەنەف بوون. ئەحمەد دەنەف سڵاوی لە عەلائەددین کرد و لە ئامێزی گرت. مژدەی ئەسڵانی کوڕی دایێ کە بیستسالانە. عەلائەددینیش بەسەرهاتی خۆی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ ئەحمەد دەنەف گێڕاوە. ئەحمەد دەنەف ئەو چارەنووسەی پێ سەیر بوو. ئەو شەوە هەتا بەیانی لە ئەسکەندەرییە بوون. کە ڕۆژ بووەوە، ئەحمەد دەنەف بە عەلائەددینی گوت: خەلیفە گوتوویە بێتەوە. عەلائەددین گوتی: 'دەچمەوە میسر چاوێکم بە دایک و بابم بکەوێ.' ئیدی هەموویان سواری تەختەکە بوون و لە میسر لە بەردەرگای ماڵی باوکی عەلائەددین نیشتنەوە. عەلائەددین لە دەرگای دا. دایکی عەلائەددین گوتی: 'کێیە لە دەرگا دەدا.' گوتی:' دایکە، عەلائەددینی کوڕتم.'

"دایکی هاتە دەرێ و ئەوی لە ئامێز گرت. عەلائەددین لەگەڵ هاوڕێکانی چوونە ژووری. هەتا سێ ڕۆژ لە وێ مانەوە. تەواو حەسانەوە. ئینجا ویستیان بگەڕێنەوە بۆ بەغدا، باوکی گوتی: 'کوڕم، لە لای من بمێنەوە.' ئەویش گوتی: 'باوکە، بە خودا لە تاوی ئەسڵانی کوڕم ناتوانم لێرە بمێنمەوە.' ئینجا عەلائەددین باوک و دایکی لەگەڵ خۆی برد و گەڕانەوە بۆ بەغدا. کە گەیشتنەوە بەغدا، ئەحمەد دەنەف چوو بۆ لای خەلیفە و موژدەی گەڕانەوەی عەلائەددینی دایێ. بەسەرهاتی عەلائەددینی بۆ خەلیفە گێڕاوە. خەلیفە هەستا بە پیر عەلائەددینەوە هاتە دەر. ئەسڵانی کوڕی عەلائەددینیشی لەگەڵ خۆی برد. کە لەگەڵ عەلائەددین یەکتریان دیت، باوەشیان پێکدا گرت. دوای من خۆش و تۆ خۆش، قسە و باسێکی زۆر، خەلیفە فەرمانی دا ئەحمەدی قەماقیمیان هێنا بەردەم عەلائەددین. خەلیفە بە عەلائەددینی گوت: 'دژمنی خۆت بکوژە.' عەلائەددین شیری دەرکێشا و ئەحمەدی قەماقیمی کوشت. دوای ئەوە خەلیفە قازی و شایەدی بانگ کردن. حوسنی مریەمی لە عەلائەددین

ماره کرد. جێژنێکی گەورەیان ساز کرد. عەلائەددین چووە پەردەی حوسنی مریەم سەیری کرد دورێکی نەســـماوە. دوای ئەوە خەلیفە ئەســـلانی لە جێی بابی دانا و ئەوی کردە سەرۆکی سیتتین. کەوای شانازی بە شانیدا دا. دیاری گرانبایی دایێ. بەو جۆرە ژیانیان بە خۆشی و شادی تێپەڕی هەتا داڵی مەرگ یەکەیەکەیانی بەسەر کردەوە و لێکی هەڵاواردن."

شـــەهرزاد کاتێک کۆتایی بەو چیرۆکە هێنا و گوتی: "خاوەنشـــکۆ، چیرۆکەکانی دڵاوا و بەخشـــندکان ئێجگار زۆرن، یەکێک لەوان بەســـەرهاتی حاتەم و زوولکەراعە کە ئەویش ئاوایە:

## چیرۆکی دڵاواکان

### بەسەرهاتی حاتەم و زوولکەراع

"دەگێڕنەوە کاتێک حاتەمی تایی مرد، ئەویان لەســـەر کێوێک ناشــت. لەســـەر گڵکۆکەی حەوزێکیـان چێ کرد. لەســـــەر بەردەکانی بن حەوزەکە وێنەی کیژگەلێکی قژئـاڵۆزیـان کێشابوو کە سەروبسکیان پەرێشان ببوو. لە داوێنی کێوەکەوە ڕووبارێک دەخوشی. کاتێک کاروانێک لەوێ لایان دەدا، تا بەیانی گوێیان لە دەنگی شـــین و گریان دەبوو. کە ڕۆژ دەبووەوە، لەو ناوچەیە کەســـی لێ نەدەبوو جگە لەو کیژە ســـەر ئاڵۆزانەی نێو حەوزەکە. دەگێڕنەوە کاتێک زوولکەراع پاشای حیمیەر لەوێ لای دا و شەوی لەوێ کردەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، دەگێڕنەوە کاتێک زوولکەراعی پاشای حیمیەر شەوێک لەوێ ماوە و گوێی لە دەنگی ئەو شـــین و گریانە بوو. گوتی: 'ئەوە چ باســـە؟' پێیان گوت: 'گۆڕی حاتەمی تایی لەو نیزیکانەیە. حەوزێک لەســـەر گلکۆکەیەتی لە بەردی مەڕمەڕ چێ کراوە. وێنەی کەنیشکگەلێکی سەروقژ ئالۆز لەسەر ئەو بەردانە نەخشێنراوە. هەموو شەوێک دەنگی ئەو گریان و شـــیوەنە بە گوێی ئەو کەســـانە دەگا کە شـــەوانە لێرە لا دەدن و دەمێننەوە.'

"زوولکەراع، پاشـــای حیمیەر گاڵتەی بە حاتەمی تایی کرد. بە خەڵکەکەی گوت: 'ئێمە ئەمشەو میوانی حاتەمی تایین. برسیمانە و تکای ژەمێک لە حاتەم دەکەین.' دوای ماوەیەک خەو بەســەریدا زاڵ بوو نووست. ئەوەندەی پێ نەچوو بە خەجڵاوی و شێواوی لە خەو ڕاپەڕی. گوتی: 'ئەی هۆزی عەرەب، خێرا وشـــترەکەم بۆ بێنن!' کە وشـــترەکەیان هێنا، ســـەیریان کرد وشـــترە دەلەرزی. زوولکەراع فەرمانی دا وشـــترەکەیان کوشـــتەوە و گۆشـــتەکەیان برژاند و خواردیان. دوایی خەڵکەکە هۆکاری کوشـتنەوەی وشـترەکەیان لە زوولکەراع پرســـی. گوتی: 'کە خەوتم، خەونم بە حاتەمی تاییەوە دی. لە خەونمدا بوو شـــیرێکی بە دەســـتەوە گرتبوو بەرەو من هات و گوتی: 'تۆ هاتوویتە لای من و لە کاتێکدا من هیچم نییە.' ئینجا هەر بەو شـیرە وشـترەکەمی ســـەر بڕی. ئەو جەنگەیەی وە خەبەر هـاتم. گوتم بگەنە وشـــترەکەی من و بیهێنن. دەمزانی ئەگەر ســـەرتـان نەبڕیبـا مردار دەبووەوە.' کاتێک ڕۆژ بووەوە، زوولکەراع ســـواری وشـــتری یەکێک لە هاوڕێکانی بوو. ئەویشـی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد و ڕۆیشتن. لە چێشتەنگاودا سوارێکیان دیت کە بە ســـواری وشـــترێکەوە دێت و وشـــترێکی لغاو کردووە و بە دواوەیەتی. بە پەرتاو دێ. کە هاتە بەرەوە، لێیان پرســـی: 'تۆ کێی؟' گوتی: 'من عەدی کوڕی حاتەمی تاییم. زوولکەراع، پاشای حیمیەر کامتانن؟' زوولکەراعیان پیشان دا. ئینجا ڕووی لە زوولکەراع کرد و گوتی: 'ها سواری ئەو وشترە بە، چونکە باوکم وشترەکەی تۆی سەربڕیوە. ئەوەم لە جیاتی ئەو بۆ هێناوی.' زوولکەراع گوتی: 'کێ ئەوەی پێ گوتی؟' عەدی کوڕی حاتەم گوتی: 'من دوێ شـــەو خەوتبووم. باوکم لە خەوندا پێی گوتم: 'عەدی، زوولکەراعی پاشـــای حیمیەر داوای میوانی لێ کردم، من وشـــترەکەی ئەوم ســـەر بڕی. تۆ وشـــترێکی بۆ بەرەوە و داوای لێبووردنی لێ بکە. لەو کاتەدا هیچم بە دەستەوە نەبوو.' ' ئیدی زوولکەراع وشترەکەی لێ وەرگرت و سەری لە دەهەندەیی و دلۆڤانی حاتەم سووڕ ما!

**حیکایەتی دەهەندەیی مەعنی کوڕی زائیدە**

"ئەوەش هەر لە چیرۆکی دلاوا و دەهەندەکانە کە لە مەعنی کوڕی زائیدەوە دەگێڕنەوە کە رۆژێـک لە ڕۆژان چوو بۆ ڕاو. تینوویتی بەسـەریـدا زاڵ دەبێ. لە لای کۆیلە و غولامەکانی ئاوی گیر ناکەوێ. لەو جەنگەیەدا کە ئەو ئاوای تینوو بوو، سێ کچ هاتن یەکی مەشکۆڵەیەک ئاویان بە کۆڵەوە بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و حەفتا هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سێ کچ هاتن یەکی مەشکۆڵەیەک ئاویان بە کۆڵەوە بوو. مەعنی کوڕی زائیدە داوای ئاوی لێ کردن. ئەو کچانە ئاویان دایێ. مەعن داوای لە غوڵام و کۆیلەکانی کرد کە شتێکی دەنێ بیدا بەو کچانە، کەچی غوڵام و کۆیلەکان هیچیان پێ نەبوو بیدەنێ. ئیدی ئەویش بۆ هەر کام لە کچەکان یەکی دە تیری لە تیردانەکەی دانێ. کە نووکی ئەو تیرانە لە زێڕ چێ کرابوون. یەکێک لە کچەکان بەوانی دیکەی گوت: 'بەخشەندەیی و دڵاوایی ئاوا ناکرێ، مەگین لە لایەن مەعنی کوڕی زائیدەوە. وا چاکە ئێمەش یەکی شێعرێکی بەسەردا هەڵبڵێین.' کیژی یەکەم گوتی:

چی بەخشیوە پێت لە هەردوو دنیا
خوای بێنیاز و تاک و بێهاوتا
چی گەورەیە شایانی تۆیە
بێ شک تۆ دەبووی خوا شەریکی با

"کەنیشکی دووەم گوتی:

ڕووناکە دنیا بە تیشکی گەشت
بەختەوەری چون گەورەیە بەشت
درێژ کا گشت کەس دەستی نیازی
دڵنیام دابین دەکەی نیازی

"کچی سێیەم گوتی:

دەستی دڵاوییت وەک دەستی مووسا دەدرەوشێ
لە گەورەیی و دەهەندەییت دنیایەک دەخرۆشێ
گەردوون چاوی بە کەسێکی ئاوا ناکەوێ تازە
دەستگیری و دڵاوایی لە دەروونیەوە بجۆشێ

"دەگێڕنەوە کە مەعنی کوڕی زائیدە لەگەڵ چەند کەسێک دەچێ بۆ ڕاو. چەند ئاسکێک لە پێشیان هەستان. هەرکەسەی کەوتە شوێن یەکیان. مەعنی کوڕی زائیدە کەوتە سەر دەنکێکیان و لە خەڵکەکە دوور کەوتەوە. دواجار ئاسکەکەی گرت. لە ئەسپەکە هاتە خواری

و سەری بڕی. لەو جەنگەیەدا پیاوێکی دیت بە سواری گوێدرێژێک بەوێدا دێت. مەعنی کوڕی زائیدە سوار بوو چووە پێشی و سڵاوی لێ کرد. پێی گوت: 'لەکوێوە دێی؟' گوتی: 'لە ولاتی 'قەزاعە'وە دێم. دەمێک ساڵە لەوێ باران نەباریوە. ئەمساڵ کە باران باریوە، وڵات سەرسەوز و خۆش بووە. من لەوێ بێستانم کرد. ئێستا هاڕۆی گوڵبەدەمم بۆ میر مەعنی کوڕی زائیدە هێناوە کە لە لای ئێمە ناوبانگی بە دەستوودڵبازی و دڵاوایی دەرکردووە.' مەعن فەرمووی: 'تۆ چ چاوەڕوانییەکت لەو هەیە؟' ئەو کابرایە گوتی: 'من بە تەمام هەزار دینارم بداتێ.' مەعن فەرمووی: 'ئەو پارەیە بۆ تۆ زۆرە.' گوتی: 'دەی داوای پێنجسەد دینار دەکەم.' فەرمووی: 'ئەگەر بڵێ ئەوەش زۆرە؟' گوتی: 'سێسەد دینار داوا دەکەم.' ئەی ئەگەر گوتی: 'ئەوەش زۆرە؟' گوتی: 'دووسەد دینار داوا دەکەم.' فەرمووی: 'ئەی دیسان گوتی زۆرە؟' گوتی: 'دەڵێم، باشە سەد دینار' فەرمووی: 'ئەگەر لەوەش کەمتری گوت؟' گوتی: 'دەڵێم پەنجا.' فەرمووی: 'ئەی ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوو؟' گوتی: 'بە سێ دیناریش لەگەڵی دەسازێم.' فەرمووی: 'ئەی ئەگەر هەر ملی نەدا؟' گوتی: 'گوێدرێژەکەمی حەواڵە دەکەم و بە دەستی خاڵی دەگەڕێمەوە ماڵ.' مەعن دەستی کرد بە پێکەنین. پاشان ئەسپەکەی ئاژۆت و خۆی گەیاندە دەستوپێوەندەکانی. کاتێک چووەوە ماڵەکەی، چەند کەسی بانگ کرد. گوتی: 'لە فلانە شوێن کەسێکی لێیە هاڕۆی هێناوە و بۆ ماڵی ئێمە دەگەڕێ. بچن بیهێنن.' چوون کابرایان هێنا. پەردەدار ڕوخسەتی هاتنەژووری بۆ خواست. فەرمووی با بێتە ژوور. کە هات، ئەو دەرک و بان و سامان و دەستوپێوەندەی دیت، بەو دۆخە تۆزێک خەجڵا و مەعنی نەناسییەوە. سڵاوی کرد. میر سڵاوی سەندەوە و گوتی: 'برای عەرەب، چیت هێناوە؟' گوتی: 'هەرچەندە کاتیشی نییە، لەو وەرزەدا هاڕۆم بۆ هێناوی! داوایەکیشم لێتە.' فەرمووی: 'داوای چیت هەیە؟' گوتی: 'هەزار دینارم بدەیتێ.' مەعن فەرمووی: 'ئەوەندە زۆر؟!' گوتی: 'دەی پێنجسەد دینار.' فەرمووی: 'پێنجسەد دینار؟!' گوتی: 'با سێسەد دینار بێ.' فەرمووی: 'کوڕە زۆرە، زۆر.' گوتی: 'قەینا دووسەد دینار.' فەرمووی: 'وەرە خوارێ.' گوتی: 'دەی سەد دینار.' فەرمووی: 'دیسان زۆرە.' گوتی: 'پەنجا دینار.' فەرمووی: 'هەر زۆرە.' گوتی: 'با سێ دینار بێ.' فەرمووی: 'لە سێ کەمتر چی؟' کابرا گوتی: 'بە خودا ئەو سوارەی هاتە ڕێم هەر زۆر بەدفەڕ بوو. ئاخر لەوە کەمتر چی لێ بکەم؟' میر مەعنی کوڕی زائیدە ئەوەندە پێکەنی، ژانی کردبوو. پاشان بانگی دەمڕاستەکەی کرد و گوتی: 'هەزار دینارییەک و پێنجسەدییەک و سێسەدییەک و دووسەدییەک و سەدییە و پەنجا دینارییەک و سێ دیناری بدەرێ با کەرکەشی لە بەردەرگا ڕاوەستێ.' بەو جۆرە عەرەبەکە دوو هەزار و سەد و هەشتا دیناری وەرگرت و بە سەرسامییەوە بە دۆعای خێرەوە بۆ مەعنی کوڕی زائیدە، گەڕاوە. ڕەحمەتی خودایان لێ بێ.

**چیرۆکی زاڵبوونی عەڕەب بەسەر ئەندەلوسدا**

"خاوەنشسکۆ، دەگێڕنەوە لە ئەندەلوس شـارێک پێتەختی پاشـاکان بوو. پێیان دەگوت: 'لەبتە.' ئەو شارە کۆشکێکی تێدا بوو، هەمیشە قوفڵێک بە دەرگاکەیەوە بوو. ئەگەر یەکێک لە پاشـاکان دەمرد و یەکێکی دیکە جێگاکەی دەگرتەوە، قوفڵێکی دیکەی دەهێنا لە دەرکی ئەو دەدا. بەو جۆرە ژمارەی کڵۆمەکان گەیشـتنە بیسـت و چوار دانە. وای لێ هات دەسەڵاتی وڵات کەوتە دەست کەسێک کە وەچەی پاشـاکان نەبوو. ئەو پاشـایە ویستی قوفڵەکان بکاتەوە. بۆ ئەوەی بزانێ ئەو دیوە چی تێدایە. گەورەکانی وڵات سـەرکۆنەیان کرد. پاشا گوێی نەدانێ و گوتی: 'هەر دەیانکەمەوە.' گەوەرکانی وڵات ئەوەی ماڵیان هەبوو دایانێ هەتا نەیکاتەوە. پاشا لە هەڵوێستەکەی پاشگەز نەبووەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا لە هەڵوێستەکەی پاشگەز نەبووەوە. دوای ئەوە کڵۆمەکانی لێ کرنەوە و دەرگای کۆشـــکی کردەوە. لەوێدا پەیکەری چەند عەرەبێکی دیت کە لەســـەر ەسپ و وشترن. شیریان بە لا قەد و ڕمبیان بە دەستەوەیە. کتێبێکیشی دیتەوە کە تێیدا وسـرابوو: 'هەر کاتێک ئەو درەگایە بکرێتەوە، هۆزێکی عەرەب دەسـت بەسـەر ئێرەدا ەدگرێ. بیچم و قەبارەیان وەکوو ئەو پەیکەرانەیە. تکایە، تکایە! بە هیچ شـێوەیەک ئەو ەدرگایە مەکەنەوە.'

"وا بوو هەر لەو ســاڵەدا تاریقی کوڕی زیاد لە ســەردەمی خیلافەتی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکی ئوومەویدا ئەو شـارەی گرت. ئەو پاشـایەی بە خراپترین شـێوە کوشـت. شـاری تاڵان کرد. ژنان و کوڕانی ئەوێی بە دیل گرتن و بردنی. خەزێنەیەکی زۆری لەوێ یتەوە و بردی. یەکێک لەو خەزێنانە سـەد و حەفتا تاج و دوڕ و یاقووت بوو. بەردی گرانبایی لەوێدا دیتەوە. هەیوانێکی هەبوو کە سواری نێزەبەدەست نەیدەتوانی بچێتە ئەوێ. ەو دیوانەدا ئەوەندەی دەفری زێڕین و زێوین تێدا بوو لە ئەژمار نەدەهات. سفرەیەکیشی ەوێدا دیتەوە کە هی سـەردەمی سـولەیمان کوڕی داوود بوو مابووەوە. ئەو سـفرەیە لە زمرودی سـەوز بوو. هەر ئەو سـفرەیە ئێسـتا لە شـاری ڕۆمایە. دەفرەکانی ئەو سـفرەیە زێڕینن. لەو شـارەدا زەبووریشـیان دیتەوە کە بە خەتی یۆنانی لەسـەر پەڕی زێڕین نووسرابوو. گەوهەر و شتێشیان پێدا کردبوو. کتێبێکیان دیتەوە کە باسی سوود و زیانی ڕووەک و چۆنییەتی شار و گوندەکانی تێدا نووسرابوو. هەر لەو کتێبەدا تەلەسم و زانستی کیمیای خۆری و مانگی تێدا دەزانرا. کتێبێکی دیکەیان دیتەوە، لەبارەی پیشـەگەلی تاشـینی یاقووت و بەردەگەلی دیکە، تێکەڵاوی ژەهر و تریاک، سـیمای زەوی و دەریاکان، شـار و کانگاکانەوە نووسرابوو. لەو شارەدا کووپەیەکی گەورەی پڕ لە ئیکسیریان دیتەوە.

"ئیکسیرێک کە درەمێک لەو سەد درەم زێو دەکا بە زێڕ. هەروەها ئاوێنەیەکی گەورەی بازنەییان دیتەوە کە بۆ سولەیمانی کوڕی داوود [سڵاوی خودای لێ بێ] دروست کرابوو. هەر کات کەسێک چاوی لێ دەکرد، حەوت شوێن و ناوچەی تێدا دەدیت. لەوێدا شوێنێکیان دیتەوە کە ئەوەندەی یاقووت تێدا بوو لە باس نایە و نەدەژمێردرا. ئیدی تەواوی ئەو ماڵەیان پێچاوە و بردیان بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان. عەرەب بوونە دەسەڵاتداری ئەو شارە کە یەکێک لە شارەگەورەکان بوو.

## بەسەرهاتی هیشام و منداڵێک

"دیسـان دەگێڕنەوە کە هیشـامی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ڕاودا ئاسـکێکی دیت و کەوتە شـوێنی. لەو جەنگەیەدا چاوی بە منداڵێک کەوت، خەریکی مەڕلەوەڕاندن بوو. هیشام بە چەند کەس لە پیاوەکانی گوت: 'ئەو منداڵە بگرن و بۆم بێنن.' منداڵەکە سـەری هەڵێنا و بە هێشـامی گوت: 'دابونەریتی مەزنان نازانی؟ بە چاوی سـووک سـەیری من دەکەی؟ منت شـکاندەوە. قسـەی گەورە و پاشـایانە دەکەی، بەڵام ئاکارت پاتـاڵانەیە.' هێشـــام پێی گوت: 'کوڕە، ئەوە دەڵێی چی؟! وریـا بە! دەزانی من کێم؟! من دەناسی؟' گوتی: 'دەتناسـم، بەڵام هێندە بێڕەوشتی، پێش ئەوەی سـڵاوم لێ بکەی، دەستت کرد بە قسـەکردن.' هێشـــام گوتی: 'وریا بە! من هیشـــامی کوڕی عەلدولمەلیکی کوڕی مەڕوانم.' منداڵەکە گوتی: 'خوا دەوامی عومرت نەدا و بە ئامانجت نەگەیەنێ! تۆ زۆر قسـە دەکەی و ڕێز و حورمەتی بەرانبەرەکەت کەم دەگری. ئەوەش دابی گەوران نییە.' ئیـدی هێشتا قسەکانی منداڵەکە تەواو نەببوو کە غوڵام و نۆکەرەکانی هیشام لە هەموو لایەکەوە لەدەوری کۆ بوونەوە. هەریەک لە لایەکەوە دەیگوت: 'سـڵاوت لێ بێ خەلیفە.' هیشـام بە داروەستەکەی گوت: 'لەو قسەیە گەڕێن، بچن ئەو منداڵە بێدەنگ کەن.' غوڵامەکان دەوری منداڵەکەیان گرت. کاتێک منداڵەکە ئەو هەموو سـوپایەی دیت، ئیدی هیچی نەگوت و هیچی لێ نەپرسین، بەڵکوو سەری داخست. یەکسەر هات بۆ لای هیشام، لە پێشی ڕاوەستا، بێ ئەوەی سـڵاو بکا، سـەری داخسـت و چاوی لە زەوییەکە بڕی و متەقی نەکرد. یەکێک لە پیاوەکانی خەلیفە گوتی: 'گڵاو ئەوە بۆ سـڵاو لە خەلیفە ناکەی؟' ئەو منداڵە بە توورەییەوە چاوێکی لێ کرد و گوتی: 'کورتانە کەر، ڕێگاکەم دوور بوو. پشـووم سـوار بوو. نەمتوانی سڵاو بکەم.' هیشام ئەوەندەی دیکە تووڕە بوو گوتی: 'بچکۆل، وا دیارە ئەمڕۆ بەختت نییە و هەڵگەڕاوەتەوە و ئەجەلت هاتووە.'

"منداڵە گوتی: 'هیشام، بە خودا ئەگەر کاتی مردنم نەهاتبێ، ئەوە قسەی تۆ ناتوانێ هیچ زیانێکی بۆ من ببێ.' ئینجا پەردەدار بە منداڵەکەی گوت: 'گڵاو ئاخر تۆ شـیاوی ئەوە هەی لەگەڵ خەلیفەی سەردەم دمبەدمە بکەی؟!' منداڵەکە گورج وەڵامی داوە: 'بەردەوام تووشی دەرد و خەم دێی و لە دەسـت مەینەت ڕزگارت نابێ. مەگەر نەتبیسـتووە کە پەروەرێنی مەزن دەفەرمووێ: 'یوم تأتي كُلُّ نفسٍ تُجادل عن نفسـها.'[1] ئیدی لەو جەنگەیەدا هیشام زۆر تووڕە بوو. بە میرغەزەبی گوت: 'سەری ئەو منداڵەم بۆ بێنە، چونکە بێڕەوشتی کردووە و سنووری خۆی نازانێ.' میرغەزەب منداڵەی لەسەر زەوی درێژ کرد و شیرەکەی لەسەر ملی ڕاگرت. خۆی خافڵاند و چاوەڕێی فەرمانێکی دیکە بوو. هیشام گوتی: 'بیکوژە.'

---

١. واتە: "ڕۆژی پەسـڵان هەرکەسـەی پارێزگاری لە خۆی دەکا و بناشـت دەکا." بەشـێک لە ئایەی ١١١ی سوورەی نەحل.

ماوەیەکی دیکە خۆی لە گێلی دا و گوتی: 'چ بکەم؟' هیشـــام گوتی: 'بیکوژە.' منداڵەکە زانی کە ئەم جار جاری سێیەمە و فریای خۆی نەکەوێ کاری تەواوە. قاقایەکی کێشا. وا پێکەنی کە خلینەکانی وەدەر کەوتن. هیشـــام بەو پێکەنینە زۆر تووڕە بوو. ئینجا گوتی: 'پێم وا بێ تو شـێتی. مەگەر تۆ نازانی ئێســتا دەکوژرێی و لەم دنیایە دەڕۆی؟ لەو جەنگەیەدا بە چی پێدەکەنی؟'

"منداڵەکە گوتی: 'خەلیفە، ئەگەر کەمێک درەنگتر بمکوژن، هیچ قازانجێک بە من ناگا. بەڵام، خەلیفە، چەند بەیتێکم وەبیر هاتەوە، ئەوانەم لێ ببیســـتە، مەترســـە ماوە زۆرە بۆ کوشـتنی من.' هیشـام گوتی: 'بڵێ بزانم چین، بەڵام بە کورتی، زۆری درێژ مەکەوە.' منداڵە عەرەبەکە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

لە دارســـــتـانـێـکـی چـڕدا فـیـســـــقەیەک
بە گـریـانەوە لـێـی دەهـات نـووزەیەک
ئەی گەورە و ســـەروەری باڵـنـدان هـاوار
بەزەیـیـت دابـێ بە زەرنەقــووتەی زار
بـێ تـامە ژیـن پـڕپـڕە لە داخ و ئـاخ
بە گڕ مێشـــوولەدا دەچێ هەڵۆی شـــاخ

"هیشام بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'بە خۆشەویستی حەزرەتی محەممەد، ئەگەر ئەو منداڵە لە پێشـــدا ئەو قســـەیەی کردبا، بێجگە لە خەلافەت، ئەوەی داوای کردبا دەســـتم وەبەر نەدەهێنا.' بە یەکێک لە خزمەتکارەکانی گوت: 'دا گیرفانی پڕ کەن لە زێڕ و گەوهەر.' ئینجا خزمەتکـارەکە خەڵاتێکی گەورەی لە زێڕ و زیو و مـاڵی دیکە دا بە منـداڵەکە. منـداڵەکە خەڵاتەکەی وەرگرت و گەڕاوە بۆ لای مەڕەکانییەوە.

### بەسەرهاتی برایمی کوڕی مەهدی و مەئموون

"چیرۆکێکی خۆشـــی دیکە ئەوەیە کاتێک نۆرەی خەلافەت گەیشـــتە مەئموونی کوڕی هاروونەڕەشـید، مامی خۆی، برایمی کوڕی مەهدی، پشـتی نەگرت و سـەرسـپێری نەکرد. بەرەو وڵاتی 'ڕەی' چوو. لەوێ خەلافەتی دامەزراند. ســاڵێک و یازدە مانگ و دوازدە ڕۆژ بەو شـێوەیە تێپەڕی. مەئموونی برازای داوای لێ کرد، بێتەوە ژێر دەســەڵاتی خەلافەت و ســـەرپێچی نەکا. بەڵام برایم تکا و داوای مەئموونی قەبووڵ نەکرد و گوێڕایەڵی نەبوو. کە مەئموون زانی ناگەڕێتەوە، سوپای ساز کرد و بەرەو ڕەی کەوتە ڕێ. کە برایم هەواڵەکەی پێ گەیشـــت، لە ترســـی کوژران نەیتوانی بەردەوام بێ. هەڵات بۆ بەغدا. لەوێ خۆی

شـــاردەوە. مەئموون جاڕی دا هەر کەس شـــوێنی برایم ئاشـــکرا بکا، ســـەدهەزار دیناری دەدرێتێ. برایم دەگێڕێتەوە دەڵێ: 'کاتێک ئەوەم بیست، ترسم لێ نیشت.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ، برایم گوتی: 'من کە ئەو هەواڵەم بیست، ترسم لێ نیشت. خۆم پێم سەیر بوو! نیوەڕۆ لە ماڵ هاتمە دەرێ. نەمدەزانی بچم بۆ کام لا. ڕووم لە کۆڵانێک کرد. لەسەر کۆڵانەکە دەلاکێکم دیت لە بەردەرکی ماڵێک ڕاوەستابوو. چوومە پێش و پێم گوت: لەری شوێنێکت پێ شک دێ ماوەیەک خۆمی تێیدا بشارمەوە؟' گوتی: 'بەڵێ وەرە ژووری.' درگای کردەوە. منی بردە ماڵێکی زۆر خاوێنەوە. دەرگای داخست و لەوێوە لێیدا ڕۆیشت. زۆر ترسام، لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ڕەنگە ئەو کابرایە بانگەوازەکەی خەلیفەی بیستبێت. ئەوە ڕۆیشت هەتا خەلیفەم لێ ئاگادار کاتەوە.' ئیدی بە ترس و دڵەڕاوکێوە وەک مەنجەڵی سەر ئاو لە کوڵاندا بووم. لەوێ دانیشتم. بیرم لە کارەکانی خۆم دەکردەوە کە لەپڕدا دەرگا کراوە. دەلاکە هاتەوە. کۆڵبەرێکیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. کۆڵبەرەکە هەموو کەلوپەلێکی ژیان، لە دەفر و خواردەمەنی و شتی دیکەی لەسەر شان دانابوو. پێی گوتم: 'بە قوربانت بم، ئەوە چونکە من بە ڕۆژدا هەر دەستم لەناو قژ و سەر و خوێن و زیپکە و شتی خەڵکدایە، نەمویست کەڵک لە شتەکانی من وەرگری.' برایم دەڵێ: 'لەو جەنگەیەدا من زۆرم برسی بوو دانیشتم دەستم کرد بە خواردن. پێم شک نایە تا ئەو ڕۆژە ئەوەندەم خواردن بە گیان کەوتبێ. کە تێرم خوارد، دەلاکە پێی گوتم: 'گەورەم، ببوورە، من شایانی ئەوە نیم لەگەڵ جەنابت قسە و باس بکەم، بەڵام ئەگەر جەنابت کەرەم بفەرمووی و بە فەرمایشتەکانت گەورەم کەی، من خۆشحاڵ دەبم.'

" 'من پێم وا نەبوو بمناسێ. پێم گوت: 'تۆ لە کوێوە دەزانی کە من قسەیەکم بۆ گوتن پێیە یان نا؟' گوتی: 'ماشەڵڵا، گەورەم زۆر لەوە بە ناوبانگترە کە من ناویم نەبیستبێ. جەنابت سەروەری من، برایمی کوڕی مەهدییت کە مەئموون سەدهەزار دیناری داناوە بۆ خەڵاتی ئەو کەسەی شوێنی تۆی پیشان دا.' ' برایم دەڵێ: 'کە ئەو قسەیەم بیست، گەورەیی ئەوم بۆ دەرکەوت. لە لای من ئەوەندەی دی ڕێزی چووە سەرێ. ڕازی بووم قسەی بۆ بکەم. ئینجا من ماڵ و منداڵەکەمم بیر هاتنەوە و ئەو شێعرەم بۆ گوت:

ئەگەر گریانی دوو چاوم وەکوو کزەی جەرگم بایە
خەم و ناسۆری دروونم دەبووا سەری بکردایە
بەختم وەهای خەو لێ کەوتووە، هەر تەمای هەستانی نییە
ژیانی پڕ لە نسکۆی من دەردێکە دەرمانی نییە

" 'کە ئەو شێعرەی لە من بیست، گوتی: 'گەورەم، دەتوانم منیش چەند بەیتێک بڵێم؟'

گوتم: 'بیلێ.'

" 'ئیدی دەلاکیش ئەو شیعرەی خوێندەوە:

من دەزانم تۆ چەندەت دەرد و خەم دیوە
چەندت ئێش و ئازار و مەینەت بینیوە
چی کۆسپ و تەگەرەیە هەمووت هاتە ڕێ
ڕەوا نەبوو ئەو هەموو کەندەت بێتە ڕێ
شاد بە و بە دڵێکی ئاسوودە بخەوە
من هەم مەل ناتوانێ بفڕێ لەو سەرەوە

"برایم دەڵێ: 'من پێم گوت: 'لە گەورەییدا هیچت نەهێشتەوە. بەو شیعرانەت تەواو خەمت لە دڵ ڕەواندم و ماتەمت لە دڵ شۆردمەوە. دا زەحمەت نەبێ چەند بەیتی دیکەشم بۆ بڵێ.' ئەویش ئەو چەند بەیتەشی بۆ گوتم:

قەت مات و مەلوول مەبە بە دەست کاری خوداوە
خۆشی ئێستات تێک مەدە لەبەر ئەوەی ڕووی داوە
شتی وایان زۆر دیوە گەلی میر و پاشایان
ڕۆژی خۆشی سەرکەوتوون، دەرباز بوون لە بەڵایان

"برایم دەڵێ: 'کە ئەو شێعرەم بیست، سەرم سووڕ ما. خۆشی و شادیم بۆ گەڕاوە. ئینجا کیسەیەک کە زێڕێکی زۆری تێدا بوو لە پێشم دانا و ماڵاواییم لێ کرد.' پێشم گوت: 'تکایە، ئەو پارەیە لە کارە گرینگەکانتدا خەرج کە. ئەگەر ڕۆژێک من لەو گێژاوە ڕزگارم بێ، زۆر لەوەت زیاتر پاداش دەدەمەوە.' دەللاکەکە بە تووڕەییەوە کیسە زێڕکەی بۆ لای من هاویشت و گوتی: 'ئەگەر ئێمەی سواڵکەر لە لای ئێوە پلە و پایەیەکمان نییە، بەڵام لە سایەی گەورەیی و جوامێری جەنابتەوە یەکی وەک منت بەسەر کردەوە و بە هەنگاوە پیرۆزەکانت منت سەربڵند کرد. من لە هەنبەر خزمەتێکدا کە ئەرکی خۆم بووە، چۆن زێڕت لێ وەرگرم. بە خودا ئەگەر ئەو قسەیە دووبارە بکەیتەوە، خۆم دەکوژم.' ' برایم دەڵێ: 'من کیسەکەم هەڵگرتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، برایمی کوڕی مەهدی دەڵێ: 'من کیسەکەم هەڵگرت و گەڕامەوە. کە گەڕامەوە بەردەرکی ماڵەکەی، پێی گوتم: 'گەورەم، ئێرە بۆ تۆ لە هەموو جێیەک پارێزراوترە. هیچ بە سەر منەوە بارگرانی نییت. تۆ لێرە دانیشە هەتا خودا دەرکێک بە ڕووتدا دەکاتەوە.' گوتم: 'بە قسەت دەکەم. بە مەرجێک لەو کیسەیە خەرج بکەی.' ئەو وای پیشاندا کە مەرجەکەی منی قەبووڵ کردووە. هەر بۆیە من چەند ڕۆژێک لەوێ مامەوە. بەڵام ئەو لە کیسەکەی خەرج نەدەکرد.

" 'ئەوجار من وەک ژنان سۆڵەم لە پێ کرد. پەچەم بە ڕوومدا دا. چارشێوم بەسەردا دا و لە ماڵەی ئەو هاتمە دەر. زۆریش دەترسام. ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە نزیک پردەکە، ویستم لە پردەکە بپەڕمەوە. لەپڕ سوارێک کە لەپێشدا یەکێک لە غولامەکانی من بوو چاوی پێم کەوت. منی ناسییەوە. هەرای کردم و گوتی: 'ئەوەیە وا پیاوەکانی حکوومەت بە دوایەوەن.' ئەوەی گوت و هات بمگرێ. مستێکم لە دەمی ئەسپەکەی دا. بە ئەسپەوە لە دیجلەم هاویشت. خەڵک تێی ئاڵان و خەریکی ڕزگارکردنی بوون. منیش بە پەلە لە پردەکە پەڕیمەوە. گەیشتمە بەردەرکی ماڵێک، ژنێک لە دالانەکەی ڕاوەستابوو. بە ژنەکەم گوت: 'خانم، پەنام بدە. پیاوی خەلیفە بەدوامەوەن.' ژنە گوتی: 'خەمت نەبێ.' گورج منی بردە دیویکەوە. گەورەیی نواند خواردن و خواردنەوەی بۆ هێنام. ئینجا پرسی: 'ئەرێ ترسەکەت ڕەوی؟' لەو قسەیەدا بوو کە زۆر بە توندی لە دەرگایان دا. ئەو ژنە چووە دەرێ دەرگا بکاتەوە. سەیرم کرد خاوەن ماڵەکە هەر ئەو پیاوەیە کە من لەسەر پردەکەوە لە دیجلەم هاویشت. سەر و چاوی شکابوو خوێنی پێدا دەهاتە خوارێ. ئەسپەکەشی پێ نەبوو. ژنەکەی پێی گوت: 'ئەوە چ بووە؟' کابرا گوتی: 'بە فەرمانی خەلیفە بەدوای پیاوێکەوە بووم، بە ڕێکەوت چاوم پێی کەوت. ویستم بیگرم، کەچی مستێکی لە دەمی ئەسپەکەم دا و لە دیجلەی هاویشتم. بۆ خۆشی هەڵات.' دوای ئەوە ژنە دەسماڵی هێنا دەرێ و سەر و دەموچاوی بۆ پێچا و لە جێدا خەواندی. دوایە هاتەوە بۆ لای من. گوتی: 'وا دیارە مێردەکەم ئەو کێشەیەی لەگەڵ تۆ بووە.' گوتم: 'بەڵێ، من بووم لە دیجلەم هاویشت.' ژنە دڵخۆشی دامەوە و گوتی: 'مەترسە، هیچ کێشەیەکت بۆ دروست نابێ.' ئیدی هەتا سێ ڕۆژان لەوێ مامەوە. پاشان گوتی: 'دەترسم ئەو پیاوەم پێت بزانێ و دوایە ئەوەی لێی دەترسی بەسەرت بێ. وا چاکە خۆت ڕزگار کەی.' هەتا شەو دەرفەتم خواست. گوتی: 'قەیدی نییە، تا شەو لێرە بە.' کە بوو بە شەو جل و شتم لە بەر کرد و وەدەر کەوتم. کەنیزێکم بوو چووم بۆ ماڵی ئەو. کە منی دیت، بەزەیی پێمدا هات. زۆرم بۆ گریا. سوپاسی خودای کرد کە ساغ و سڵامەتم. گورج لە ماڵ چووە دەر. وای پیشان دا دەچێ پێداویستی

شێو بكرێ. من ئاگام له هیچ شتێک نەبوو له ناكاو دیتم ئەوه برایمی مووسڵی و پیاوەكانی لەو لاوه دێن. ژنێكیش لەپێشیان دەڕوا. كه جوان لێیان ورد بوومەوه، هەر ئەو كەنیزه بوو. ڕاســـت هاتنه لای من. منی دایه دەســـت ئەوان. ئەوان منیان به جلی ژنانەوه برده لای مەئموون.

" 'مەئموون له كۆڕی گشــتیدا داوای منی كرد. كه چوومه كۆڕەكەیەوه، به خەلیفه ناوم برد و سلاوم كرد. مەئموون گوتی: 'سلاوت لێ نەبێ.' گوتم: 'ئەی خەلیفه، فەرمان فەرمانی خۆته، یان بمكوژه، یان بمبەخشــه. بەلام له بیرت نەچێ ئەو خۆشــییەی له بەخشــیندایه له تۆڵەســــەنـدنەوەدا نییه. لێبوردنی تۆ گەورەترین لێبوردن دەبێ، چونكه گونــاحی من گەورەترین گوناحه. ئەگەر بمكوژی، ئەوه دەسەلاتداری و ئەگەر بەخشندەییم لەگەڵ بكەی، ئەوه كارێكی ڕەوایه.' ئیدی ئەو دوو بەیتەم بۆ گوت:

گەوره و گەورەیــی و شـــــاخ و بەرزایــی
لــێــک دێــن ئەوانه، دێــنــن تەبــایــی
گەورەیــی نــایه له ســـــووک و هەرزان
تەپــكــیــش قەت ســـەری نــاگــاته هەوران
چـــاوەڕێــم ئەورۆ خەلــیــفەی زەمـــان
خۆش بێ له ســـــووچ و هەڵه و تــاوانمــان

"برایم دەڵێ: 'كاتێک ئەو شـێعرانەم خوێندنەوه، مەئموون سـەری هەڵهێنا و چاوێكی لێ كردم.' ئەوجا من ئەو دوو بەیتەشم خوێندەوه:

كـــاری مـــن بەڵــێ و گــوێ ڕاگــرتــنه
كــاری پــاشـــاشــــم مشــــوورخــواردنه
به ڕقیشـــەوه گـــــــــــــەر ســـەرم ببڕێ
له كەرەمـــی ئەو خــێــرم پــێ دەبــڕێ

" 'ئیدی مەئموون سەری هێنایه پێشێ و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوه:

لەگەڵ دوژمــنــدا وەک پــۆلا ســــەخــتــیــن
لەگەڵ دۆســـــتیشـــــدا، نەرمیـن و مۆمیـن
ئـێنســـــافـی ئـێمه وەک ســـەوقــات دەڕوا
بۆ ســـــام و زاكوون، تــاكی ســــەرزەوین

" 'کاتێک ئەو شـــێعرەم لەو بیســـت، تۆزە هیوایەکم بە دڵدا گەڕا. دوای ئەوە مەئموون ڕووی لە ئامۆزا و براکەی، ئەبی ئیســـــحاق کرد و لە بابەت منەوە ڕاوێژی لەگەڵ کردن. هەموویان ڕازی بە کوشتنم بوون، بەڵام لەسەر کوشتنەکەم کێشەیان بوو. ئینجا مەئموون بە ئەحمەدی کوڕی خالیدی گوت: 'تۆ دەڵێی چی؟' ئەحمەد گوتی: 'خەلیفە، ئەگەر تۆ ئەو بکوژی، نموونەی ئاوا زۆرە کە بەو شێوەیە کەسێکیان کوشتووە، بەڵام ئەگەر بیبەخشی، ئەوە نموونەی وا پەیدا نابێ کەسێک لە کەسێکی ئاوا خۆش بووبێ.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'هەرکە مەئموونی خەلیفە قسەکەی ئەحمەدی کوڕی خالیدی بیست، سەری بردە پێشێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دێو و درنج بیب، من لێت خۆش دەبم
بزانم پیاوکوژیت، من لێت خۆش دەبم
مادام ئەو قسەی تێدا کردووە
دەزانم دژمیت، من لێت خۆش دەبم
ڕقی دونیایە من دەخۆمەوە
لەبەر زانایت من لێت خۆش دەبم
گەر پێکدا بدەی ئاسمان و زەوی
ڕق تەواو نابێت، من لێت خۆش دەبم
ئەتۆ کە ئاوا دەپاڕێیەوە
چون تۆبە دەکەیت، من لێت خۆش دەبم
حەز ناکەم من بە کوڕووزانەوەی کەس
ناخۆشە پەستیت، من لێت خۆش دەبم

" 'کە ئەو شێعرەم بیست، چارشێوەکەم لەسەر لا برد و دەستم کرد بە ئەڵڵاهوئەکبەر و سەڵاواتلێدان. گوتم: 'خەلیفە، خودا چاکەت بۆ بکا، ڕەحمەتت بەسەردا بڕێژێ.' ئینجا مەئموون گوتی: 'بڕۆ بێخەم بە. تۆ لە ئەماندای.' گوتم: 'خەلیفە، گوناحی من زۆر لەوە زیاتر و گەورەترە بتوانم پاکانەی بۆ بکەم. دڵاوایی و لێبووردەیی تۆش زۆر لەوە زیاترە من بتوانم لە ئاستێکی شیاودا سوپاست بکەم.' دوای ئەوە ئەو شێعرەم خوێندەوە:

پادشا! بە تووە سەری تاجت بەرز بێ
هاتت بە گوڕ و دوژمنت لەرز بێ
بۆ دڵخۆشی و کەیف و شادی لە ماڵا
حۆریت دەلال و ڕێک و دلاوا
دەرکت بە ڕووی هەموو کەس کراوەیە
تا ئاوا بی ئاڵاکەت هەر شەکاوەیە

ـ مەئموون گوتی: قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ یوسف: ٩٢

واتا: فەرمووی: ﴿هیچ جۆرە لۆمەو سەرزەنشتێکتان لەسەر نیە، من هیچ رەخنەیەکم ـیتان نیەو هیچم لەدڵدا نیە بەرامبەر ئێوە! خودا لێتان خۆشبێو لەتاوانو ستەمکاریتان ـبوریێ: خودا لەهەموو کەس بەرحم ترو لێبوردوو ترە بۆ کەسانێک تۆبە بکەنو بگەڕێنەوە ـۆ لایو ملکەچی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بن!﴾.

مامە ئەوە تەواوی ماڵ و سامانەکەم دایەوە و برۆ ترست لە هیچ نەبێ.' من سوپاسم کرد و دۆعام بۆ کرد. مەئموون قەدری گرتم و گوتی: 'مامە، ئەبوو ئیسحاق و عەباس گوتیان بتکوژم.' منیش گوتم: 'خەلیفەی زەمان، ئەبوو ئیسحاق و عەباس پێشنیاری کوشتنی منیان بۆ کردی، بەڵام تۆ ژیرانەترین کارت کرد. منت لە بێهیوایی رزگار کرد. هیوات وەبەر نامەوە.' ئیدی مەئموون سوجدەی برد و ماوەیەکی باش لە سوجدەدا ماوە. ـوایە سەری هەڵبڕی و گوتی: 'مامە دەزانی لەبەر چی چوومە سوجدە؟' گوتم: 'ڕەنگە ـەبەر ئەوە بوو بێ کە تۆی بەسەر دژمنەکەتدا زاڵ کرد.' مەئموون گوتی: 'مەبەستی من ـەوە نەبوو بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو لێبووردنی تۆی خستە دڵمەوە.' '

"برایم دەڵێ: 'منیش باسی کابرای دەلاک و سوارەکە و خێزانی سوارەکە و کەنیزە و ئەوەی بەسەرم هاتبوو هەموم بۆ مەئموون گێڕاوە. مەئموون فەرمانی دا کەنیزەکە بێنن. ئەویش لە ماڵ چاوەڕێی خەڵات بوو. کە هێنایانە هەنتەشی خەلیفە، خەلیفە پێی گوت: 'ئەوە چی وای لێ کردی کە خەیانەتت بە خاوەنەکەی خۆت کرد؟' کەنیزە گوتی: 'تەماعی ئەو خەڵاتە وای لێ کردم.' خەلیفە گوتی: 'تۆ مێرد یان کورت هەیە، یان نا؟' گوتی: 'نەوەڵا.' ئیدی خەلیفە گوتی: 'سەد قامچی لێ بدەن و بیخەنە بەندی هەتاهەتاییەوە.' دوای ئەوە کابرای دەلاک و سوارەکە و خێزانیان هێنا. خەلیفە لە سوارەکەی پرسی: 'بۆ پێشت بەو کابرایە گرت؟ هۆکارەکەی چی بوو؟' سوارەکە گوتی: 'لەبەر ئەو ماڵە بوو.' خەلیفە گوتی: 'تو بەو دڵ و دەروونە پیسەتەوە شایانی ئەوەی ببی بە دەلاک.' ئینجا کەسێکی بۆ دانا کە بیبا بۆ دووکانی دەلاکی و ڕایسپێرێ فێری دەلاکی بکەن. خەڵاتێکی باشیشی دا بە ژنەکەی و لە کۆشکدا جێی کردەوە و گوتی: 'ئەوە ژنێکی گەورە و تێکەیشتووە، لە کار و بڕیارە گرنگەکاندا کارمان پێی دەبێ.' پاشان بە دەللاکی گوت: 'چونکە ئەو کارە جوامێرانە و ئازایانەت کردووە، دەبێ لە ڕادەبەدەر ڕێزت لێ بگیردرێ.' هەر بۆیە هێنایان ماڵی سوارەکەی سوپایان دایێ و پازدەهەزار دیناریشیان لەگەڵی دایێ.'

## چیرۆکی ئیرەمی زاتولعیماد[1]

"حیکـایەتێکی دیکە دەگێڕنەوە: عەبـدوڵڵا کوڕی ئەبووقولابە وشـــترەکەی بزر ببوو. بەدوای وشـترەکەیدا ڕۆیشـت. دەشـت و بێروونەکانی یەمەن و دەشـتی سـینا گەڕا. لەپڕدا ڕێی کەوتە شارێکی گەورە کە لەو شارەدا خانووی بەرز بەرزی لێ بوو. کە نزیک بووەوە، بیری بۆ ئەوە نەدەچوو ئەو شـــارە کەســـی تێدا نەبێ. چووە نێو شـــارەوە هەتا بەدوای وشـترەکەیدا بگەڕێ، بەڵام ئەوەندەی بەنێو شـاردا گەڕا، کەسـی نەدیت، شـار چۆڵوهۆڵ. تەواوی وڵاتیش کاول کرابوو. دەڵێ: 'لە وشترەکەم دابەزیم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١. ئەو شارەی شەدداد درووستی کرد.

## که شه‌وی دووسه‌د و حه‌فتا و پێنجه‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشکۆ، عه‌بدوڵڵا کوڕی ئه‌بی قولابه ده‌ڵێ: 'من له وشتره‌که‌م دابه‌زیم. وشتره‌که‌م به‌سته‌وه. خۆم پێ ڕانه‌گیرا و چوومه نێو شار. قه‌ڵایه‌ک له‌نێو شاردا بوو. له قه‌ڵاکه نیزیک بوومه‌وه. ئه‌و قه‌ڵایه دوو ده‌رگای هه‌بوو. قه‌ت ده‌رگای ئاوا گه‌وره و به‌رزم نه‌دیتبوو. ئه‌و ده‌رگایانه به گه‌وهه‌ری جۆراوجۆر و یاقووتگه‌لی سپی و سوور و زه‌رد و سه‌وز ڕازابوونه‌وه. که ئه‌و ده‌رگایانه‌م دیت، به جارێک حه‌په‌سام. ئیدی به ترس و له‌راوکێوه چوومه نێو قه‌ڵاکه‌وه. قه‌ڵاکه‌م وه‌ک شارێکی گه‌وره هاته به‌رچاو. نێو ئه‌و شاره پڕ بوو له کۆشک. کۆشکه‌کان یه‌کی چه‌ند دیویان هه‌بوو. ئه‌و دیوانه له زێڕ و زیو چێ کرابوون. به مرواری و مه‌رجان و یاقووت و گه‌وهه‌ری جۆراجۆر ڕازاندرابوونه‌وه. ده‌رکی ئه‌و کۆشکانه وه‌ک ده‌رکی قه‌ڵاکه چاک و جوان و ڕازاوه بوون. ته‌ختی عه‌رزه‌که‌شیان به یاقووتی گه‌وره فه‌رش کرابوو. له جیاتی خیز و خۆڵ هه‌موو بیناکه میسک و عه‌نبه‌ر و زه‌عفه‌ران بوو. که گه‌یشتمه نێوه‌ڕاستی قه‌ڵاکه و هیچ مرۆڤێکم تێدا نه‌دیت، خه‌ریک بوو گیانم ده‌رچێ. دوای ئه‌وه ڕوانیم دیتم ئه‌وه جۆگه‌جۆگه ئاو به به‌رده‌رکی دیوه‌کاندا ده‌ڕوا، له قه‌راغ ئه‌و جۆگانه‌ش هه‌موو جۆره دارێکی میوه چه‌قاوه. وڵات سه‌رسه‌وز و خۆشه. دیواره‌کانی قه‌ڵایان وا درووست کردووه که خشتێکی له زێڕه و یه‌کی له زیوه. له دڵی خۆمدا گوتم ئه‌وه ڕاست ئه‌و به‌هه‌شته‌یه که ده‌ڵێن له‌و دنیا هه‌یه. دوایه له‌و خیز و خۆڵه میسک و زێڕینه‌وه، ئه‌وه‌نده‌ی توانیم هه‌ڵمگرت و گه‌ڕامه‌وه بۆ شاره‌که‌ی خۆم. خه‌ڵکم له‌و شاره ئاگادار کرده‌وه. ئه‌و هه‌واڵه زاره‌وزار گه‌ڕا هه‌تا به گوێی موعاوییه گه‌یشت که له حیجاز خه‌لیفه بوو. خه‌لیفه نامه‌یه‌کی بۆ نوێنه‌ر و ده‌مڕاسته‌که‌ی له سه‌نعای یه‌مه‌ن نارد و گوتی: 'ئه‌و که‌سه بدۆزه‌ره‌وه و له ڕاستی و درووستی قسه‌که‌ی بکۆڵه‌ره‌وه.' نوێنه‌ری موعاوییه بانگی کردم و له‌و باره‌وه پرسیاری لێ کردم. ئه‌وه‌ی دیتبووم بۆ ئه‌ویشم گێڕاوه. ئه‌و منی نارد بۆ لای موعاوییه. ئه‌وه‌ی دیتبووم بۆ ئه‌ویشم هه‌ر وا گێڕاوه. موعاوییه باوه‌ڕی پێ نه‌کردم. له‌و گه‌وهه‌ر و شته‌ی هێنابووم پیشانم دا. به‌ڵام مرواریی‌ه‌کان ڕه‌نگیان گۆڕابوو و زه‌رد هه‌ڵگه‌ڕابوون.' "

لێره‌دا بوو، ماوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشه‌ویش کۆتایی پێ هات و شه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

# کە شەوی دووسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەبدڵلا کوڕی قولابە گوتی: 'بەڵام مرواریییەکان ڕەنگیان گۆڕابوو و زەرد هەڵگەڕابوون. موعاوییە پێی سەیر بوو. بانگی کەعبولئەحباری کرد و پێی گوت: 'من بۆیە بانگم کردییە ئێرە هەتا لە بارەی ڕاستبوونی شتێکەوە پرسیارت لێ بکەم!' کەعب گوتی: 'خەلیفە، لە بارەی چ شتێکەوە لێم دەپرسن؟' معاوییە گوتی: 'تۆ لە دنیادا شارێکت پێ شک دێ لە زێڕ و زیو چێ کرابێ؟ کۆڵەکەکانیشی لە یاقووتی زەرد بن؟ خیز و خۆڵەکەی میسک و عەنبەر و مرواری بن؟' کەعب گوتی: 'بەڵێ خەلیفە، ئەو شارە 'إرم ذات العماد التي لم يُخلق مثلها في البلاد'[1] ئەو شارە شەددادی کوڕی عاد دروووستی کردووە.' موعاوییە گوتی: 'بەسەرهاتی ئەو شارم بۆ بگێڕەوە.' کەعب گوتی: 'خەلیفەی بەڕێز، عادی گەورە دوو کوڕی هەبوو. یەکیان ناوی شەدید و ئەویتریان ناوی شەدداد بوو. کە باوکیان مرد، ئەو دوو برایە دەستیان بەسەر تەواوی دنیادا گرت. هیچ پاشایەک نەبوو کە لەژێر فەرمانی ئەواندا نەبێ. وا بوو شەدیدیش مرد. دنیا کەوتە بن دەستی شەدداد. شەدداد کتێبخوێندنەوەی پێ خۆش بوو. کاتێک لە کتێبەکاندا نێوی ڕۆژی پەسڵان و بەهەشت و کۆشک و باڵاخانە و ڕووبار و دار و میوەکانی بەهەشتی دیت، ئارەزووی شەدداد بزووت بۆ ئەوەی دنیایەکی وەک بەهەشت ساز بکا. شەدداد سەدهەزار پاشای لەژێر دەسەڵاتدا بوو. هەر پاشایەکیش سەدهەزار فەرماندەی لە بەر دەستیدا بوو. هەر فەرماندەیەکیش سەدهەزار سوپای هەبوو.

" ' 'ئیدی شەدداد کۆمەڵێک لە کارگێڕەکانی بانگ کرد و پێی گوتن: 'لە کتێبە کۆنەکاندا تایبەتمەندییەکانی ئەو بەهەشتەم دیوە کە گفتیان بە باوەڕداران داوە. دەمهەوێ لە شێوەی ئەو بەهەشتە بەهەشتێک چێ کەم. کەوایە ئێوە بڕۆن وڵاتێکی بەرین و سەرسەوز و خۆش ببیننەوە. لەوێدا شارێک و لەنێو شارەکەدا کۆشکگەلێک لە زێڕ و زیو بینا بکەن. خیز و خۆڵەکەی دوڕ و مرواری و میسک بێ. کۆڵەکەکانی لە یاقووتی زەرد بێ. چەم و ڕووباری تێدا وەڕێ بخەن و لە قەراخ چەم و ڕووبارەکان نەمامی هەموو جۆرە میوەیەک بچەقێنن.' ئەوان گوتیان: 'ئێمە چۆن ئەو شارە ساز کەین و ئەو هەموو یاقووت و مرواری و میسک و دوڕە لە کوێ پەیدا کەین؟!' شەدداد گوتی: 'ئەی مەگەر ئێوە نازانن تەواوی پاشاکانی سەر گۆی زەوی لەژێر فەرمانی من دان و ناتوانن سەرپێچی بکەن؟! بڕۆن دوای کانگاکانی ژێر زەوی بکەون.' ' "

---

١. واتە: "هۆزی ئێرەم کە خاوەنی بەژن و باڵایەکی کۆڵەکەئاسا و کۆشک و سەرسەرایەکی وا بوون کە نموونەی وەک ئەوان و کۆشک و سەرسەراکانیان لە هیچ کوێیەکی دنیادا چێ نەکراوە." سوورەی ئەلفەجر، ئایەی ٧و٨.

لیرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیروکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ' 'شەدداد بەو خەڵکەی گوت: 'برۆن دوای کانگاکانی یاقووت و مرواری و دوڕ و شتی وا بکەون. ئەو بەرد و کانزا و شتە لە کانگاکان دەربێنن. هەرچی زێڕ و زیو و گەوهەر و شتی لای پاشاکانە کۆیان کەنەوە و کەمتەرخەمی نەکەن.' ئیدی نامەیان بۆ پاشاکان نووسی پێیان گوتن کە هەر فرۆشیارێک ئەو جۆرە شتانەی لە لا بوو لێی بستێنن یان ئەوەی زانیتان لە لای خەڵک هەیە، هەمووی کۆ کەنەوە. ئەوەی لە کانگاکان و ژێر دەریاکاندایە هەیە هەر هەمووی دەربێنن و کۆی کەنەوە. هەتا بیست ساڵ خەریکی کۆکردنەوەی زێڕ و زیو و بەردە گرانباییەکان بوون. ئەو کاتە سێسەد و شەست پاشا لەسەر زەوی حوکمیان دەکرد. ئەو دەم حاکم و کارگێڕ و ئەندازیار و وەستای دیوار و پیشەسازیان لە هەموو وڵاتان کۆ کردەوە و بە دەشت و بێروونیاندا بڵاویان کردنەوە. ئەوان بەدوای دۆزینەوەی شوێنێک بۆ شارەکە دەگەڕان. هەتا جێگایەکی زۆر پان و بەرینیان دیتەوە کە شاخ و زەد و بەردەڵان و زۆنگ یان بێروونێکی کاکی بە کاکی نەبوو. بەڵکوو شوێنێک بوو، ئاو و هەوای سازگار و چەم و ڕووبار بوو. بە گشتی تەواوی ئەو تایبەتمەندیانەی کە پێویست بوو، تێیدا هەبوو. بەرپرسان گوتیان: 'ئەوەی پاشا مەبەستییەتی، ئێرەیە.' لە هەموو لایەکەوە کووپەکووپە گەوهەر و بەرد و دوڕ و لالی ورد و درشتیان تونگەتونگە بە کەشتیدا دەنارد بۆ بەرپرسانی دروستکردن و ئاوەدانی ئەو شارە. ئەندازیار و وەستا و کرێکارەکان سێسەد ساڵ خەریکی کار بوون. کاتێک شارەکە بە کۆشک و باڵاخانە و چەم و ڕووبار و شتەوە تەواو بوو، بە شەددادیان ڕاگەیاند. ئینجا شەدداد هەزار گزیر لە گزیرەکانی خۆی لەگەڵ گەورە گەورە و ڕیشسپی و پیاوماقووڵەکانی بانگ کرد، هەتا خۆیان ئامادە بکەن لەگەڵ پاشای پاشایانی سەر گۆی زەوی، شەددادی کوڕی عاد، ساز بن بڕۆن بۆ 'ارم ذات العماد.' لە ژن و کەنیز و قەرەواشیش ئەوەندەی پێویستی بوو، فەرمانی دا ئامادە کران. بیست ساڵی پێچوو هەتا ساز بوون بۆ ئەو سەفەرە. دوای ئەوە شەدداد لەگەڵ خەڵکێکی زۆر و سوپایەکی لەبننەهاتوو بەرەو ئەو شارە ڕۆیشتن.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ' 'شەددادی کوڕی عاد لەگەڵ سوپایەکی لەبن‌نەهاتوو بەرەو 'ارم ـت العماد' کەوتە ڕێ. بە دڵێکی پڕ لە خۆشی بەدی هاتنی ئامانجەکەیەوە هەر وا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوا قۆناخی چوونە ناو 'ارم ذات العماد'ەوە. ئینجا ئافرینەری بێهاوتا لە مەکوی هێزییەوە بەڵایەکی ئاراستە کردن کە هەموویان تێدا چوون. لە شەدداد و دەستوپێوەند و سوپاکەی تاقیان دەرنەچوون و نەگەیشتنە ئەو شارە. خودای خاوەن دەسەڵات نهێنی ئەو شارەی بۆ هەتاهەتا بە شاراوەیی هێشتەوە. هەتا ڕۆژی پەسڵانیش بە شاراوەیی دەمێنێتەوە.'

" 'معاوییە گوتی: 'ئەی کەس لەم دنیایەدا ئەو شوێنە دەبینێ؟' کەعبولئەحبار گوتی: بەڵێ، هێندێک لە ئوممەتی موحەممەد(د ـ س) دەچنە ئەوێ. ئەویش دەبێ ئەو تایبەتمەندییەی ئەو کابرایەی هەبێ.' ئاماژەیەکی بە عەبدوڵڵا کرد.'

"شەعبی یەکێک لە زانایانی حمیەر گێڕاویەتەوە کاتێک شەدداد لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی بە ناڵەکە تێدا چوون، کوڕەکەی، شەددادی گچکە، شوێنی گرتەوە. باوکی، شەددادی گەورە، ـە پێشدا لە وڵاتی حەزەرەلمەوت و سەرزەمینی سەبائ داینابوو. شەددادی گەورە لەگەڵ سوپا و دارودەستەکەی بەرەو 'ارم ذات العماد' کەوتبووە ڕێ. کاتێک بیستییەوە کە باوکی پێش ئەوەی بگاتە 'ارم ذات العماد' تێدا چوون، فەرمانیدا باوکی بەرنە وڵاتی حەزەرەمەوت. ئەوی گوتی: 'لەنێو ئەشکەوتێکدا جێگایەکی بۆ هەڵکەنن.' تەرمەکەی باوکیان بە تەختێکی زێڕ بردە ئەوێ. حەفتا دانە کراسی دیبای قەراخ داگیراوە بە تاڵی زێڕ و ڕازاوە بە گەوهەری گرانباییان لە بەر کرد. لەوحێکی زێڕینیشیان لەپشت سەری دانا. لەوحەکە ئەو شیعرەی لەسەر نووسرابوو:

چاوەڕوانیت نەبێ لەم جیهانە
وەبزانە گورگ شوانی مەڕانە
کوانێ دیاکۆ پادشای جیهان
کوانێ ئەوانەی شێر بوون لە مەیدان
کوا کاوە؟ خەوی، دوژمنی زڕاند
پاشای خوێنخۆری لە خوێندا گەوزاند
ئەو کاتەی کە ماد دەسەڵاتی بوو
عەرش تا قورشی لە بن دەستی بوو

"سـەعالیبی گوتوویە: 'بە ڕێکەوت دوو پیاو چوونە ئەو ئەشـکەوتە. لە سـەرەوەی ئەو ئەشکەوتە چاویان بە ڕیزێک پێپلیکان کەوت. بە پێپلیکانەکاندا ڕۆیشتنە خوارێ، چوونە نێو ئەشـکەوتەکەوە. دیتیان ئەوە قوڵکەیەک هەڵکەندراوە، سـەد گەز درێژ و سـەد گەز پان و سـەد گەزیش قووڵە. لەنێو ئەو قوڵکەیەدا تەختێکی تێدایە، پیاوێکی زەلام و بەخۆوە بە قەد پانی و درێژی تەختەکە لەسـەری درێژ کراوە و قوماشـی ئاوریشـمی پێدا دراوە. لە لای سـەرییەوە لەوحێکی زێڕی لێیە. ئیدی ئەوانیش لەوحە زێڕەکەیان بەو هەموو ئاڵتوون و گەوهەر و شتەی پێوەی بوو هێنا دەرێ.'

### حیکایەتی ئیسحاق مووسڵی و مەئموون

"یەکی دیکە لەو چیرۆکە خۆشـانەی، ئیسـحاق مووسـڵی گێڕاویەتەوە ئەوەیە دەڵی: 'شـەوێک لە لای مەئموون هـاتمە دەرێ و بەرەو مـاڵ بوومەوە. لەو جەنگەیەدا کـاری ئاودەستم بوو، چوومە کۆڵانێکەوە لەوێ دانیشتم، خۆم سووک کەم. لە پڕدا دیتم شتێک بە دیواری مـاڵێکەوە شـۆڕ بووەتەوە. دەسـتم بۆ برد بزانم چییە. تەمـاشـام کرد ئەوە سـەوەتەیەکی چوارگۆشـە و گەورەیە. ئاوریشـمیشـی پێدا دراوە. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەو سـەوەتەیە لە خۆڕا شـۆڕ نەکراوەتەوە. بێگومان هۆیەکی هەیە. تۆزێک مەسـت بووم. هەر ئەوە وای کرد بچمە نێو سەوەتەکەوە و لەوێدا دانیشم. لە پڕدا خاوەنی ماڵەکە هەڵیکێشام پێی وا بوو ئەوەی چاوەڕوانی دەکا، ئەو بم. کە گەیشتمە سـەر لێواری دیوارەکە، چاوم لێ کرد ئەوە چوار دانە کیژۆڵەن. سڵاویان لێ کردم. لە سەوەتەکە دایانگرتم. ئەوان لە پێشەوە و من بە دوایاندا ڕۆیشـتم. هەتا گەیشـتینە ماڵێک کە تەواوی دیوەکانی بە جۆرێک فەرش کرابوون کە تا ئێستا ماڵ و فەرشی ئاوام نەدیبوو حەگین لە دارولخەلافە. ئیدی ئەمن لەوێ دانیشتم و ئاگام لە هیچ شتێک نەبوو. پاش ئەوەی ماوەیەکی پێچوو، پەردە لا درا. لە ناکاو هەشـتا کەنیز، جێ عوود و مۆمی هەڵکراو بە دەسـتەوە هاتنە ژوورێ. لەنێویاندا کیژێکی باڵابەرز و ڕێکوپێک و مەمکقوت و ڕووپەڕی دەرکەوت. من هەسـتام. کچە سـڵاوی کرد. زۆری بەخێرهاتن کردم. ئینجا هەواڵی پرسـیم. پێم گوت: 'لە لای کۆمەڵێک لە هاوڕێکانم دەگەڕامەوە بۆ ماڵ. مەمنا کاری پێویسـتم بوو، لامدا ئەو کۆڵانە. چاوم بە سـەوەتەیەک کەوت شـۆڕ کرابووەوە، بە هۆی مەسـتیمەوە چوومە ناو سـەوەتەکەوە. وا بوو منیان بە سەوەتەکە هەڵکێشا سەرێ و ڕێم کەوتە ئێرە. ئەوە بوو هۆی هاتنە ئێرەی من. وەسسەلام.' کچە گوتی: 'نیگەران مەبە، هیوادارم کۆتایی کارەکەت بە خێر بێ.' دوای ئەوە بە منی گوت: 'پیشـەت چییە؟' گوتم: 'بازرگانم.' گوتی: 'ئەی هیچ لە شـێعر و شت دەزانی؟' گوتم: 'بەڵێ. شـێعر و شـتی زۆرم لە بەرە.' گوتی: 'شـێعرێکم بۆ بڵێ.' من گوتم: 'جا کەسـێک ئاوا بە ڕێکەوت ڕێی بکەوێتە ماڵێکەوە، کوا دەسـتوبرد شـێعری بۆ دێ؟ تۆ جارێ شـێعرێکم بۆ

بێ تا من سامم دەشکێ.' کچە گوتی: 'ڕاست دەکەی.' وا بوو شێعرێکی خۆشی لە پەندی پێشینیان خوێندەوە. ئەو شێعرە خۆشترین شێعری پێشینیان بوو. من سەرم لە جوانی و چاکی و زمانپاراوی و گفتولفتەکەی سووڕ ما. بە منی گوت: 'ئەری ترس و سامت شکا یان نا؟' گوتم: 'بەڵێ سامم شکا.' کچە گوتی: 'من گومانم هەیە تۆ بازاڕی بی.' دوای ئەوە داوای خواردنی کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئیسحەقی مووسڵی دەڵێ: 'دوای ئەوە کچە داوای خواردنی کرد. لە کۆڕەکەدا هەموو جۆرە گیای بۆنخۆش و میوەیەکی لێ بوو. خواردنیان هێنا. بە ڕیز دایاننا. ئینجا کیژەکە داوای مەی کرد. پیاڵەیەکی مەی خواردەوە و پیاڵەیەکیشی دا بە من و گوتی: 'ئێستا کاتی قسە و باسە.' ئیدی ئەوم سەرقاڵ کرد و چیرۆکی خۆش خۆشم بۆ گێڕاوە. شێعری خۆشم بۆ گوت. کەیفی ساز بوو، گوتی: 'من پێم سەیرە بازرگانێک ئەو هەمووە چیرۆک و شێعرە بزانێ و لە بیری مابێ! ئەو چیرۆکانە تایبەتی پاشاکانە.' من بە کەنیشەکەم گوت: 'من دراوسێیەکم بوو هاتوچۆی پاشای دەکرد. وا بوو هەر کات ئەو نەدەچوو بۆ لای پاشا، من دەچوومە لای ئەو. جارجار چیرۆکێکی بۆ دەگێڕامەوە. منیش ئەو چیرۆک و شێعرانەم لە زەینی خۆمدا ڕادەگرت.' ئەو کیژۆڵەیە پێی گوتم: 'وەڵا زۆر چاک فێر بووی.' دوای ئەوە خەریکی چیرۆکگێڕانەوە بووین. ئەگەر من بێدەنگ دەبووم، ئەو بۆی دەگێڕامەوە. هەتا وای لێ هات بوو بە نیوەشەو. لە بارودۆخێکدا بووم ئەگەر خەلیفە دیتبای، ئێرەیی پێ دەبردم. ئەو کچە پێی گوتم: 'تۆ چاک و پاک و قوز و خوێنشیرینترین پیاوی دنیای کە عەیب و کێشەت تیا نابینم جگە لە یەک شت.' گوتم: 'ئەو شتە چییە؟' گوتی: 'ئەگەر تۆ عوودیش بزانی، ئیدی بەزمەکەمان تەواوە.' گوتم: 'پێش ئەوەی دەنگ بکەی، من حەزم لێی بوو، بەڵام گوتم نەکا تۆ پێت خۆش نەبێ، بۆیە دەنگم نەکرد. دەنا پێم خۆشە عوود لێ دەم و ئاهەنگ ساز کەم. هەتا جار لەگەڵ جار کۆڕەکەمان گەرمتر بێ.' ئینجا کچە داوای عوودی کرد. عوودیان بۆ هێنا، وەریگرت و تاڵەکانی توووند کردەوە و دەستی کرد بە ژەنینی. بە دەنگ و ئاوازێکی ئەوەندە خۆش و ژەنینێکی ئەوەندە جوان کۆڕەکەی ڕازاندەوە کە من تا ئێستا نە دەنگی ئاوام بیستبوو نە ژەنینی ئاوا لێزانانەم دیتبوو. دوای ئەوە گوتی: 'خاوەنی ئەو شێعرانت ناسییەوە؟ ئەو ئاوازە دەزانی؟' گوتم: 'نەوەڵڵا!' کچە گوتی: 'ئەو شێعرە هی فڵان کەس و ئەو ئاوازە هی ئیسحاقی مووسڵییە.' گوتم: 'من بە قوربانی تۆ بم. مەگەر ئیسحاقی مووسڵی ئەوەندە هونەرمەندە؟' گوتی: 'ئەڕێ وەڵا ئیسحاق ئەوەندە هونەرمەندە نەبێتەوە—مامۆستای ئەوانەیە.' منیش گوتم: 'پاکە خودایەک کە بەهرەیەکی ئاوای داوە بەو پیاوە کە بە قسمەت خەڵکی دیکە نەبووە.' ئیدی ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر بە عەیش و نۆش و خۆشی ڕامانبوارد. بەیانی پیرێژنێک هات، گوایە دایەنی ئەو کچە بوو، بەو کچەی گوت: 'کاتیەتی.' کچە گورج هەستا و بە منی گوت: 'ئەوەی کردمان و دیتت، لە بەین خۆماندا بمێنێتەوە، چونکە مەرجی هاونشینی ئەمانەتدارییە.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کچە گورج هەستا و بە منی گوت: 'ئەوەی کردمان و دیتت، لە بەینی خۆماندا بمێنێتەوە، چونکە مەرجی هاونشینی ئەمانەتدارییە.' منیش گوتم: 'من بە فیدای تۆ بم، پێویست بە گوتنی نەدەکرد.' ئیدی مالاواییم لێ کرد. بە کەنیزێکی گوت، هەتا بەردەرگا لەگەڵم بێ. لەگەڵم هات. دەرگای بۆ کردمەوە و من هاتمە دەرێ. بەرەو ماڵی خۆمان چوومەوە. نوێژی بەیانیم کرد و خەوتم. کە لە خەو هەستام، مەئموون پیاوی نارد لە دوام. هەستام چوو بۆ لای. ئیدی ئەو ڕۆژە لە لای مەئموون مامەوە. نوێژی شێوان، لە لای مەئموون ڕۆیشتم. چوومەوە ئەو کۆڵانەی سەوەتەکەیان لێ شۆڕ کردبووەوە. سەیرم کرد سەوەتەکە هەر لەوێ شۆڕ کرابووەوە. چوومەوە ناوی. منیان هەڵکێشاوە سەرێ و بردیانمەوە ئەو شوێنەی شەوی پێشوو. ئەوەندەی پێ نەچوو کیژە هات. وەک شەوی پێشوو لەگەڵ ئەو کیژە ڕەزاسووکە دەستمان کردەوە بە باسی چیرۆک و شێعرخوێندنەوە. بەری بەیانی چوومەوە ماڵەکەی خۆم. نوێژی بەیانیم کرد و خەوتم. دیسان دوای ئەوەی کەمێک خەوتم. هەستام ڕاسپاردەی مەئموون هاتەوە لەدوام و بردمی بۆ لای خەلیفە. هەتا ئێوارە لە لای خەلیفە بووم. کە کاتی شێو هات، خەلیفە سوێندی دام کە دەبێ لێرە دانیشی، هەتا دەرەوە دەچم و دێمەوە. کە خەلیفە چووە دەرەوە، کەوتمە دڵەڕاوکێ و یادی شەوانی پێشووم دەکرد. داواکەی خەلیفەم بە هێند نەگرت و بە پەلە هەستام وەدەر کەوتم. خۆم گەیاندە کۆڵانەکە. سەوەتەکە شۆڕ کرابووەوە. چووم لەناویدا دانیشتم و هەڵیانکێشامە سەرێ. بردیانمەوە لای کیژە چاوکەژاڵەکە و شوێنەکەی شەوان. کیژە گوتی: 'هەر هاوڕێکەی شەوانی؟' گوتم: 'هەر ئەوم، بە قوربانت بم. هەر ئاشقەکەی شەوانم.' گوتی: 'مەگەر ماڵی ئێمەت کردووەتە هێلانەی هەمیشەییت؟' گوتم: 'گیانم فیدات بێ. دابی میوانداری سێ ڕۆژە. ئەگەر دوای ئەوە هاتمەوە خوێنم حەڵاڵت بێ.' ئەوجار دەستمان کرد بە قسە و باس و خواردنەوە. کە کاتەکەم بەرەو کۆتایی چوو، زانیم خەلیفە لێم دەپرسێ: 'بۆ کوێ چووی؟ چیت کرد؟' لە کۆڵم نابێتەوە و وادارم دەکا بۆی بگێڕمەوە. هەر بۆیە بەو کیژۆڵەیەم گوت: 'وا دیارە تۆ دەنگی عوود و ئاوازت زۆر پێ خۆشە. من ئامۆزایەکم هەیە لە من جوانتر و ڕووخۆشتر و زاناترە، ئەو لە هەموو کەس باشتر ئیسحاق دەناسێ.' ئەو پەریپەیکەرە گوتی: 'ماڵی خۆتە.' لای بەیانی بوو. من هەستام چوومەوە ماڵی خۆم. هێشتا نەگەیشتبوومەوە ماڵ ڕاسپاردەکانی مەئموون دەوریان دام. زۆر بە شێوەیەکی ناحەز وەپێش خۆیان دام و بردیانم.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئیسحاق گێراویەتەوە: 'پیاوەکانی مەئموون بە شێوەیەکی زۆر ناحەز وە پێش خۆیان دام و بردیانم بۆ لای مەئموون. مەئموون لەســەر کورسـییەک دانیشـتبوو دەتگوت میرغەزەبە. بە منی گوت: 'ئیســحاق، ئەوە تۆ ســەرپێچی دەکەی؟' گوتم: 'نەوەڵلا!' گوتی: 'بۆم بگێڕەوە چیت لەبن ســەردایە.' گوتم: 'خەلیفە، ڕاســتییەکەت پێ دەڵێم، بەڵام با هەر دووبەدوو بین.'

" 'خەلیفە ئاماژەیەکی کرد، دەوریان چۆڵ کردین. ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە و پێم گوت: 'قەولم بە کچە داوە، تۆش بەرمە ئەوێ.' خەلیفە گوتی: 'ئیســـحاقی فێڵەزان، کارێکی باش و بەجێت کردووە!' ئیدی ئەو ڕۆژەمان بە خۆشـی و شـادی تێپەڕاند. بەڵام مەئموون هۆشـی هەر لە لای ئەو کچە بوو. کە بوو بە شــەو، هەســتا چووینە ئەو کۆڵانەی ســەوەتەکەی لێ شـــۆڕ کرابووەوە. بە مەئموونم گوت: 'نەچی لە لای کچەکە ناوم بێنی. لە لای کچە من یەکێک لە شوێنکەوتەکانی تۆ دەبم.' ئیدی لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە و ڕۆیشتین. چووین لەنێو سەوەتەکەدا دانیشتین. یەکـیەک هەڵیانکێشاین. ئیمەیان بردە لای کچە. کچەکە سڵاوی لێ کردم. مەئموون کە کچەی دیت، واقی لە ئەدەبی ورما و ســەری لە جوانییەکەی ســووڕ ما. لەگەڵی دەستیان کرد بە قسە و باس و شێعرخوێندنەوە و شتی وا. پاشان مەیی خورما و ترێیان هێنا. بادەمان خواردەوە. کچە چاوی لەســـــەر مەئموون هەڵنەدەگرت و بە دیتنی خۆشــحاڵ بوو. مەئموونیش چاوی هەر لەســەر ئەو هەموو جوانییەی ئەو بوو. ئینجا کچە عوودی هەڵگرت و ئاوازێکی لێدا. دوای ئەوە ئاماژەی بۆ مەئموون کرد و بە منی گوت: 'ئامۆزاکەشــت خەریکی بازرگانییە؟' گوتم: 'بەڵێ، ئەویش بازرگانە.' گوتی: 'زۆر شــێوەی یەک دەدەن.' کاتێک مەئموون سێ پیاڵەی شەراب خواردەوە، خۆشـی و شـادی دەسەڵاتی لە دەست دەرهێنا و گوتی: 'ئیسحاق!' گوتم: 'بەڵێ، خەلیفە.' گوتی: 'هەر لەسـەر ئەو ڕێتمە بیڵێ!' کچە کە زانی ئەوە خەلیفەیە، هەڵات بۆ دیوێکی دیکە. ئەوجار خەلیفە گوتی: 'دا بزانە خاوەنماڵ کێیە؟' پیرێژنێک هاتە دەرێ و گوتی: 'ماڵەکە هی حەسەنی کوڕی سەهلە.' خەلیفە گوتی: 'دا بچن بیهێننە لای من.' پیرێژنە ماوەیەک ون بوو، کە هاتەوە حەســـەنی کوڕی ســـەهلی هێنا. مەئموون پێی گوت: 'ئەرێ تۆ کەنیشـــکێکت هەیە بە ناوی خەخیج؟' گوتی: 'بەڵێ.' خەلیفە گوتی: 'مێردی هەیە یان نا؟' حەســـەن گوتی: 'نەوەڵلا.' خەلیفە گوتی: 'من خوازبێنی لێ دەکەم.' حەســـەن گوتی: 'ئەو یەکێک لە کەنیزەکانی خەلیفەیە.' خەلیفە گوتی: 'ئەوە ئەوم بە ســێهەزار دینار مارەیی داوا کرد و بۆ ســبەینێ بەیانی پارە زێڕەکانت بۆ دەنێرم. کە زێڕەکەت وەرگرت، شــەو کچەکەتم بۆ بنێرە.' حەســەن گوتی: 'بەســـەر چاو، گەورەم.'

" 'دوای ئەوە ئێمە لە ماڵەکە هاتینە دەرەوە. خەلیفە بە منی گوت: 'ئیسحاق، ئەو قسەیەی لە لای کەس باس مەکە.' من ئەو شتەم شاردەوە هەتا وا بوو مەئموون مرد. کەس بە قەد ئەو چوار شەوەی کە من لەگەڵ خەجیج بووم، خۆشی ڕانەبواردووە. ئەو چوار ڕۆژەش کە لەگەڵ مەئموون دادەنیشتم، هەر وا. لەنێو ژنانیشدا کەسی وەک خەجیجم نەدیوە. خودا خۆشی باشتر دەزانێ.'

### بەسەرهاتی شیاکەڕێژ و خانم

"دەگێڕنەوە لە کاتی حەجدا خەڵک خەریکی تەواف بوون. ئەوەندە خێڵ و هۆز کۆ ببوونەوە، لە شوێنی تەوافەکە دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە زەوی. لە پڕدا کەسێکیان دیت دەستی بە پەردەی کەعبەوە گرتووە و خۆی پێوە هەڵواسیوە، لە دڵەوە لە خودا دەپاڕێتەوە: 'خودایە، تکات لێ دەکەم ئەو ژنە لەگەڵ مێردەکەی لێی ببێتە کێشە و ڕقی لێی هەستێ هەتا جارێکی دیکەش دەستم پێی بگاتەوە.' گێڕەوە دەڵێ: 'حاجییەکان کە ئەوەیان بیست، گرتیان. دوای ئەوەی بیرازێکی باشیان کرد، بردیانە لای سەرۆکی حاجییەکان و گوتیان: 'سەرۆک، ئەو پیاوەمان دیت لە شوێنێکی وا پیرۆزدا شتی ئاوا و ئاوای دەگوت.' سەرۆک فەرمانی کوشتنی دا. ئەو پیاوە گوتی: 'سەرۆک، بیکە بۆ خاتری ڕەسوولەڵڵا لە پێشدا گوێم لێ بگرە با شتەکەت بۆ بگێڕمەوە جا دوایی چۆنت پێ خۆشە ئاوا بکە. سەرۆکی حاجیان گوتی: 'بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە.' گوتی: 'سەرۆک، من کابرایەکم شیاکە و پەین و پاڵ و پشکەڵ و شت کۆ دەکەمەوە و دەیبەم بۆ مەزراکان. بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان بارم لە گوێدرێژەکەم نابوو و دەڕۆیشتم. خەڵکم دیت پەرێشان بوون و بە خەجلاوی بەملاولادا هەڵدەهاتن. یەکیان گوتی: 'هەڵێ لەو کۆڵانەوە هەتا نەکوژراوی.' منیش گوتم: 'ئەو خەڵکە بۆ ڕا دەکەن؟!' گوتیان: 'ژنی یەکێک لە گەورەکان دێت. کۆیلەکانی ڕێگای بۆ چۆڵ دەکەن. هەرچی بیگەنێ، لێی دەدەن و دەست لە کەس ناگێڕنەوە. ئیدی منیش سەری کەرەکەم وەرسووڕاند و چوومە کۆڵانێکەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، ئەو پیاوە گوتبووی: 'من كەرەكەم لەویٚ بەجیٚ هیٚشـــت و هاتمە سەری كۆلانەكە چاوەڕیٚ بووم، خەلّكەكە بیٚن. سەیرم كرد ئەوە كۆیلە و غولامەكانی یەكی داریٚكیان بە دەســتەوەیە و ســی ژنیشـیان لەگەلّە و دەڕۆن. لەنیٚو ژنەكان دەنكیٚكیان تیٚدایە دەلٚیٚی مانگە دەدرەوشیٚ، بەژن و بالآی ڕیٚكوپیٚک وەک شاعیر دەلٚیٚ:

لەشـــی زیٚـویـنـی دلـبەرەكەم گـوڵ و ســـیٚوی پـیٚـوە
چەنەی سیٚوی ســوور، ڕووی گولەباخە و جەســتەشـی زیٚوە
چاو لە ســـیمای گەش و زولفی لوولی ئەو لەش‌شـــلكە كە
بلٚیٚ ڕووح پشـــوویەک بـدە و دلّە تـۆش بـحەســـیٚوە

"ژنە جوانەكە گەیشتە سەری ئەو كۆلانەی كە من لەویٚ ڕاوەستابووم. چاویٚكی لە لای ڕاسـت و چەپی خۆی كرد. پیاوەمالٚییەكی بانگ كرد. سـرتەیەكی لەگەلّ كرد. پیاوەمالٚییەكە هات منی گرت. خەلّک كە ئاویان بینی، هەلآتن. پیاوەمالٚییەكان كەرەكەی منیان پەت كرد و خۆشمیان گرت. بەدوای خۆیاندا دەیانكیٚشام. نەمدەزانی بۆ كویٚم ڕادەكیٚشن. خەلّكیٚكی زۆر دوامان كەوتبوون. لە دوورەوە دەیانگوت: 'ئەو پیاوە هەژارە شـیاكەڕیٚژە بۆ كویٚ دەبەن؟ گوناحە بەزەییتان پیٚیدا بیٚ. بۆ پەتتان كردووە. لەڕیٚی خوادا ئازادی كەن، خیٚرتان دەگاتیٚ.' لە دلٚی خۆمدا دەمگوت: 'ئەو پیاوەمالّیانە منیان هەر لەبەر ئەوە گرتووە كە خۆشـــم و بارەكەشـــم بۆگەنمان لیٚ دیٚ؛ ئەو بۆگەنە خانمی ئازار داوە. یان ڕەنگە خانم دووگیان بوو بیٚ و بەو بۆنە شتیٚكی لیٚ هاتبیٚ.'

" 'كورتی كەمەوە، من بە ملكەچی بەدوایاندا دەڕۆیشـتم، هەتا گەیشـتینە بەردەرگایەكی گەورە. ئەوان چوونە ژوورەوە و منیشــیان لەگەلّ خۆیان برد. مالٚیٚكی زۆر زۆر خۆش، بە جۆریٚک كە نازانم چۆنی پەسن و تاریف بكەم. فەرش و مافووری وایان ڕاخستبوو كە من هەر نەشمدەزانی لە چی چنیویانن. خانمەكان چوونە دیوەكانەوە و منیش دەستبەستراو بە دەســـت پیاویمالٚییەكانەوە بووم. لە دلٚی خۆمدا گوتم: 'لەو مالّەدا ئەوەندەم ئازار دەدەن هەتـا دەمرم و كەســـیش پیٚم نـازانیٚ.' لەو جەنگەیەدا پیاوەمـالّییەكـان هـاتن منیـان بردە گەرماویٚكی خاویٚنەوە كە لەو مالّەدا بوو. هەر لە گەرماوەكەدا بووم كە ســـیٚ كەنیز هاتنە لام و لە پەنام دانیشتن، گوتیان: 'ئەو جلانە لە بەر خۆت داكەنە.' جلەكانم داكەندن. دەستیان كرد بە شـۆردنم. یەک سـەری دەشـۆردم. یەک قاچی خاویٚن دەكردمەوە. یەكی دی پشـتی دەشـــۆردم. بەو جۆرە جوان شـــۆردیـانم. كە تەواو بووین، بوخچەیەک جـلوبەرگی

ئاوریشمیان هێنابوو. پێیان گوتم کە لە بەریان بکەم. گوتم: 'بە خودا من نازانم ئەوانە چۆن لە بەر بکەم!' ئەوان هاتنە پێشێ. لە بەریان کردم و زۆریش پێکەنین. دوایی شیشـەیەکیان گولاو هێنا و منیان بۆنخۆش کرد. منیان بردەوە دیوێکی دیکە جگە لە دیوەکەی پێشوو. بە خودا هەر بە ڕاسـت نازانم ئەو ماڵە و ئەو شـتانەی تێیدا بوو چۆنی باس بکەم. کە چوومە نێو دیوەکەوە، ژنێکم دیت وەک خۆر تیشکی داویشت. لەوێ دانیشتبوو ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو پیاوە گێڕاویتەوە کاتێک دەچێتە ئەو دیوەوە، دەڵێ: 'ژنێکم دیت، لەسەر تەختێک دانیشتبوو، وەک خۆر تیشکی داویشت. چەند کەنیز لە پێشی ڕاوەستابوون. که چاوی بە من کەوت، لەبەرم هەســــتا. بـانگی کردمە لای خۆی. کە چوومە بەرەوە، فەرمووی کردم. لە پەنـای دانیشـــتم. بە کەنیزەکـانی گوت: 'خواردن بێنن.' کەنیزەکـان سـفرەیان ڕاخسـت. هەموو جۆرە خواردنێکیان هێنا و لەسـەریان دانا. من قەت ئەو جۆرە خوارنـانەم نەدیتبوو، نەشـــمـدەزانی چۆنیش دەخورێن. کەمێـک خواردنم خوارد. کە سـفرەکەیان کۆ کردەوە، دەستم شـۆرد. گورج هەموو جۆرە میوەیەکیان هێنا. کەمێکیشـم لەوان خوارد. دوای ئیســـتێک بە کەنیزەکانی گوت: 'مەی بێنن.' چەند جۆرە مەییان هێنا. عوود و عەنبەریـان لە جێگـا عوود و عەنبەرەکـانـدا دانـا. کەنیزێکی گەنج بـادەی دەگێڕا. گۆرانی خۆش خۆشـــی دەچڕی. هەتا وای لێ هات ســـەرخۆش بووم. ئەو خانمەش لەوێ دانیشتبوو. هەر وام دەزانی خەون دەبینم. دوای ئەوە ئاماژەی بە یەکێک لە کەنیزەکان کرد لە یەکێک لە دیوەکان جێخەو ڕاخەن. کەنیزەکەکان جێگەیان ڕاخسـت. ئینجا خانم هەسـتا. دەســـتی منی گرت. بردمی بۆ ئەو دیوە. هەتا بەیانی لە ئامێزی یەکتردا خەوتین. هەر کات بە باوەشمەوە دەمگوشی، بۆنی میسکی منی هەڵدەمشت. من پێم وا بوو لە بەهەشتم.

" 'کە ڕۆژ بووەوە، شوێنی ماڵەکەمانی پرسی. گوتم کە لە فلانە گەڕەک و فلانە کۆلانە. ئینجا گوتی: 'هەسـتە برۆ دەرەوە.' دەسـتەسـڕێکی دامێ جەمسـەرەکانی بە تاڵی زێڕین و سـیمین داگیرابوونەوە. شـتێکی خسـتبووە سـووچێکی دەسـتسـڕەکەوە. پێی گوتم: 'بەوە بچووە بۆ گەرماو.' خۆشحاڵ بووم، لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەگەر ئەو گرێیەی لەو گۆشەیەی داوە پێنج فلســـی تێدا بێ، ئەوە ناشـــتایەکی[1] پێ دەخۆم.' ئیدی لە لای ئەو هاتمە دەرێ. دەتگوت لە بەهەشـــت هاتوومە دەرێ. کە چوومەوە ماڵەکەی خۆم، گرێی دەســـماڵەکەم کردەوە. پەنجا دیناری زێڕی تێدا بوو. زێڕەکانم خستنە ژێر گڵەوە و دوو فلسـم دا ناشـتام خوارد. دانیشـتم بیرم لەو کارەی خۆم دەکردەوە کە ئەوە چ بوو بۆم هاتە پێشـێ؟ کە بوو بە ئێوارە، دیتم کەنیزێک هـات. گوتی: 'خـانم بـانگت دەکا.' منیش لەگەڵی ڕۆیشـــتم هەتـا گەیشـتینە بەردەرگاکەیان. کەنیزە ڕوخسـەتی خواسـت و منی بردە ژوورێ. کڕنۆشـم بۆ خانم برد. فەرمووی کردم. دانیشتم و فەرمانی دا خواردن و مەییان هێنا. هەر وەک شەوی ڕابردوو هەموو شـــتێک ئامادە کرا. دوای خواردن و خواردنەوە پێکەوە خەوتین. کە ڕۆژ بووەوە، دیســـان دەســـتســـڕێکی دیکەی دامێ کە پەنجـا دینـاری زێڕی تێدا بوو. من

---

١. ناشتا: نانی بەیانی.

دەستسرەکەم وەرگرت. هاتمە دەرێ و چوومەوە کۆختەکەی خۆم. زێڕەکانم خستە بن گڵەوە. هەر ئاوا بەو شێوەیە هەتا هەشت ڕۆژان هەموو ئێواران دەچوومە لای ئەو خانمە خانومانە. بەیانی دەهاتمەوە دەرەوە. ڕۆژی هەشتەم لە پاڵ خانمدا خەوتبووم. هێشتا نەهاتبوومە دەرەوە. کەنیزێک بە ڕاکردن هات و بە منی گوت: 'هەستە هەڵێ بۆ سەربان.' منیش هەستام هەڵاتم بۆ سەربان. لە سەربان بووم، دیتم هەراهەرای خەڵک و دەنگی سمی ئەسپان پەیدا بوو. لە سەربانەوە سەیری خوارەوەم دەکرد. کوڕێکی جوانچاکم دیت دەتگوت مانگە، بەسەر ئەسپێکەوە بوو. کۆیلە و غوڵام لە دەستی ڕاست و چەپی دەڕۆیشتن. کە گەیشتە بەر دەرگا، دابەزی. هاتە ناو ماڵەکەوە. سەیری کرد ئەوە خاتوون لەسەر تەختێک دانیشتووە. کڕنۆشی بۆ برد. دەستی ماچ کرد. کەچی خاتوون هیچی نەگوت. ئەو کوڕە هەر بەدەوری خانمدا دەهات و دەچوو. کلکەسووتەی بۆ کرد. هەتا خاتوون لە کۆتاییدا قسەی لەگەڵ کرد و لەگەڵی ئاشت بووەوە. ئیدی ئەو شەوە لە لای خانم ماوە و لەگەڵی خەوت.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو خانمە گوڵڕوخسارە لەگەڵ مێردەکەی ئاشت بووەوە و ئەو شەوە لەگەڵ ئەودا خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، کۆیلە و نۆکەرەکان هاتنە بەردەرگا. ئەو کوڕە جوانچاکە سوار بوو و ڕۆیشت. منیان بانگ کردەوە و بردیانمەوە دیوەکەی خانم. خانم هات و لێی پرسیم: 'ئەو کوڕەت دیت؟' گوتم: 'بەڵێ، دیتم.' گوتی: 'ئەوە مێردەکەم بوو. دەزانی بۆ نێوانمان تێک چووبوو؟' گێڕایەوە: 'بە ڕێکەوت ڕۆژێک من و ئەو دانیشتبووین. وا بوو لە پڕدا هەستا چووە دەرەوە. ماوەیەکی پێ چوو نەهاتەوە. گوتم ڕەنگە لە ئاودەست بێ. ئیدی هەستام چووم بۆ ئاودەست لەوێ نەبوو. چووم بۆ چێشتخانە لەوێ پرسیارم کرد، کەنیزێک پیشانی دام. سەیرم کرد ئەوە لەگەڵ یەکێک لە کەنیزەکانی چێشتخانە دەستەملان بووە و خەریکییەتی. ئیدی کە ئەوەم دیت، سوێندم خوارد منیش بچم لەگەڵ پیسترین و هیچوپووچترین پیاو دەست تێکەڵ کەم. ئەو ڕۆژەی کە پیاوی‌ماڵییەکان تۆیان گرت، چوار ڕۆژ بوو من لە کەسێک دەگەڕام کە پیسترین و پلەنزمترین کەسی ئەم شارە بێ. کاتێک تۆم دیت و زانیم کە پیسترین و پلەنزمترین کەسی ئەم شارەی، ئیدی ئاوام کرد کە کردمان. من تازە قسەکەی خۆم بردە سەر و کارم بە تۆ نەماوە. بچووە بە لای کاری خۆتەوە. هەر کاتێکیش مێردەکەم بچێتە لای ئەو کەنیزانە، ئەوە منیش دەنێرم لە دوات و لەگەڵت ڕادەبوێرم.' ئەمن کە ئەوەم بیست، دەستم کرد بە گریان و ئەو شێعرەم خوێندەوە:

دەرم مەکە لە دەرکی خۆت، ئەوە مەرجی وەفا نییە
هیچ وڵاتێک بێ غەریبە و هیچ شارێک بێ گەدا نییە

" 'ناچار دوای ئەوە لە ماڵەکەی هاتمە دەرەوە. بەو هەشت ڕۆژە چوارسەد دیناری زێڕم پاشەکەوت کردبوو. ئیدی من ئەو پارانەم کردنە تێچووی هاتنە ئەو شوێنە پیرۆزە هەتا لە خودا بپاڕێمەوە دیسان مێردی ئەو خانمە چاوکەژاڵە بچێتەوە لای کەنیزەکانی چێشتخانە، بەشکو ئەوە خانم بانگم کاتەوە و بە دیداری شاد ببمەوە.' سەرۆکی حاجیان کە ئەوەی بیست ئازادی کرد و بەوانی دیکەشی گوت: 'دۆعای بۆ بکەن؛ فەقیرە لێی قەوماوە.'

### بەسەرهاتی محەممەدی گەوهەرفرۆش و کەنیشکی یەحیا بەرمەکی

"بەسەرهاتێکی خۆشی دیکە ئەوەیە: شەوێکیان خەلیفە هاروونەڕەشید خەوی لێ

ناکەوێ. بانگی جەعفەری بەرمەکی وەزیری کرد و پێی گوت: 'دڵم تەنگە، پێم خۆشە کەمێک ە کۆلانەکانی بەغدادا بگەڕێین. چاو لە کاری خەڵکی بکەم، بەڵام دەبێ جلی بازرگانان لە بەر بکەین، با خەڵک نەمانناسێتەوە. وەزیر گوتی: 'باشە بە چاوان.' هەستا. جلی خەلافەتی اکەند. جلی بازرگانانی لە بەر کرد. لەگەڵ جەعفەر و مەسروووری شیروەشێن لە شوێنێک بۆ شوێنێکەوە دەچوون هەتا گەیشتنە دیجلە. کابرایەک لەنێو لۆتکەیەکدا دانیشتبوو. چوون بۆ لای. سـلاویان لێ کرد. پێیان گوت: 'کاکە گیان، پیاوەتی بکە سوارمان کە و بەنێو یجلەدا بمانگێڕە. ها ئەوەش دینارێک.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی دووسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، بە كابراكەیان گوت: 'ســـواری لۆتكەكەمان كە با كەمێک بگەڕێین. دینارێكیشـــمان حەقدەســـت لێ وەرگرە.' كابرا پێی گوتن: 'من ناتوانم ئێوە بگێڕم. خەلیفە هەموو شـەوێک دێتە دیجلە، سـواری كەشـتییەک دەبێ. جارچی جاڕ دەدا كە هەركەس لە هەر پلە و پایەیەكدا بێ، ئەگەر بێتوو ســـواری لۆتكە بێ بۆ ســـەیر و گەڕان، دەیكوژم.' خەلیفە و جەعفەر گوتیان: 'كاكە، ئەوە دوو دینار و سـوارمان كە.' كابرا گوتی: 'دینارەكانم دەنێ. دەڕۆین پشـــت بە خودا.' دینارەكانی وەرگرت. ســـواری لۆتكەكەی كردن. ویســـتی بیاژوێ. لە پڕدا كەشـــتییەكی بچووكیان دیت لەوبەری دیجلەوە دەهات. مۆم و چرای تێدا هەڵكرابوو. كابرای لۆتكەوان گوتی: 'ئەمگوت خەلیفە هەموو شـــەوێ دەگەڕێ.' كابرا یا سـەتتار یا سـەتتار لۆتكەكەی لا دا قەراخێک و پەردەیەكی ڕەشـی گەورەی بەسـەردا دا. لەژێرەوە چاویان لە كەشـتییەكە دەكرد. سـەیریان كرد ئەوە لە پێشـەوەی كەشـتییەكەدا كابرایەک چرایەكی زێڕینی بە دەســـتەوەیە. چراكە بە عوودی قاقولی دەگرێ و عەبایەكی سـووری ئەتڵەسـی لە بەردایە. تاجی مووسـڵی بەسـەرەوەیە. هەنبانەیەكی پڕ لە عوودی قاقولی بە شـانی داداوە كە چراكە بەو دەگرێ. چەند كەسی دیكە لە پشتەوەی كەشـتییەكە دانیشـتبوون. وەک ئەو چرای زێڕین و عەبای ئەتڵەسـیان لە بەردایە. لەنێو ئەو كەشـتییەدا نزیک بە دووسـەد كۆیلە لە ڕاسـت و چەپیان ڕاوەسـتابوون. لە نێوەڕاسـتی كەشـتییەكەدا كورسـیـیەكیان لە زێڕی ســـوور دانابوو. لاوێكی ڕوو وەک مانگی چواردە لەســـەر ئەو كورسـییە دانیشـتبوو. لاوەكە كراسێكی ڕەشـی پەڕاوێزداری لە بەردا بوو. پەڕاوێزەكەی بە زێڕ داگیرابووەوە. كەسێک لە پێشی ڕاوەستا بوو لە جەعفەری وەزیر دەچوو. خزمەتكارێک بە شیرێكەوە لەپشت سەری ڕاوەستابوو وەک ئەوەی مەسرووری شیروەشێن بێ. بیست كەس لە هاونشینانی ڕووبەڕووی دانیشتبوون.

"خەلیفە كاتێک ئەوەی دیت، بە جەعفەری وەزیری گوت: 'جەعفەر، دەڵێی ئەوە یەكێک لە كوڕەكـانی خۆمە، جـا یـا مەئموونە یـان ئەمین.' دوای ئەوەی خەلیفە جوان لێی ورد بووەوە، دیتی كوڕێكی زۆر قۆز و كەشـــخەیە. چاوێكی لە وەزیر كرد و گوتی: 'وەزیر، بە خودا ئەوەی لەســـەر كورســـییەكە دانیشـــتووە هیچی لە خەلیفەیەک كەمتر نییە. ئەوەی لەپێشـیشـی ڕاوەسـتاوە ڕاست دەڵێی تۆی. ئەو خزمەتكارەی شیری بە دەسـتە و لەپشـت سـەری ڕاوەسـتاوە، دەڵێی مەسروورە. ئەو هاودەم و هاونشـینانەش شـێوەی ئەوانەی من دەدەن. بە ڕاستی من ئەقڵم بڕ ناكا. سەرم لەو كارە سووڕ ماوە!' "

شـــەهرزاد كە هەتا ئێرەی گێڕاوە، دنیا زادی خوشـــكە چكۆلەكەی گوتی: 'دادە، ئەو

چیرۆکانەی تۆ زۆر زۆر خۆش و سەیرن.' شەهرزاد گوتی: 'ئەگەر بمێنم و پاشا نەمکوژێ، ئەوە خۆشـــتریشـــتان بۆ دەڵێم.' پاشـــا لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خودا قەتت ناکوژم هەتا چیرۆکەکانی تەواو نەکا.'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشسکۆ، خەلیفە کە ئەو شـتەی دیت، کاس بوو. واقی وڕ ما. بە جەعفەری گوت: 'جەعفەر، بە خودا من سـەرم لەو کارە دەرناچێ.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە منیش تێیدا ماوم.'

"کورتی کەینەوە، ئەو کەشـتییە ڕۆیشـت و لە چاو ون بوو. لەو جەنگەیەدا کابرای لۆتکەوان لەژێر پەردەکە هـاتە دەرەوە و گوتی: 'سـپاس بۆ خودا کەس ئێمەی نەدی.' هارووونەڕڕەشـید گوتی: 'کاکە، خەلیفە هەموو شـەوێک دێتە دیجلە؟' کابرا گوتی: 'بەڵێ، گەورەم. سـاڵێکی تەواوە هەموو شـەوێ دێتە دیجلە.' هارووونەڕڕەشـید گوتی: 'کاکە، شـەوێکی دیکە پیـاوەتی بکە هەر لێرە بە لۆتکەوە چـاوەڕێ بە، ئێمە دێینەوە و پێنج دیناریشـت دەدەینێ. چونکە ئێمە لەو شـاردەدا غەریبین، پێمان خۆشـە کەمێک لێرەدا بگەڕێین.' کابرا گوتی: 'باشـە بە چاوان.' دوای ئەوە خەلیفە و جەعفەر و مەسـروور گەڕانەوە بۆ کۆشک. جلوبەرگی بازرگانیان داکەند. جلی خەلافەت و وەزارەتیان کردە بەر. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە چووەوە سەر کورسی دەسەلات. ئەمیران و وەزیران و پەردەدار و نوێنەرەکان لە خزمەت خەلیفەدا ئامادە بوون. هەرکەسـەی هەر پرس و ڕاوێژ و کارێکی هەبوو، چووە خزمەت خەلیفە. خەلیفە لە مێژ بوو لە دیوان دانیشتبوو. کە کاتی بەڕێوەبردن تەواو بوو، هەرکەسەی چوو بە لای کاری خۆیەوە. کە شەو داهات، هارووونەڕڕەشید گوتی: 'جەعفەر، هەستە با بچینە گەڕان بۆ لای خەلیفەی دووەم.' جەعفەر پێکەنی. ئینجا خەلیفە و جەعفەر و مەسروور جلوبەرگی بازرگانانیان لە بەر کرد. بەوپەڕی خۆشی و شـادییەوە بەرەو دیجلە ڕۆیشـتن. کە گەیشـتنە دیجلە، کابرا بە لۆتکەوە لەوێ چاوەڕێیان بوو. ئەوان سـواری لۆتکەکە بوون. ئەوەندەی پێ نەچوو کەشـتییەکەی خەلیفەی دووەم وەدەر کەوت. هات بۆ لای لۆتکەکەی هارووونەڕڕەشـید و ئەوان. خەلیفە و جەعفەر ورد خستبوویانە ژێر چاوەدێرییەوە. تێی ڕامابوون، سەیریان کرد بێجگە لە کۆیلەکانی شەوی پێشوو، دووسەد کۆیلەی دیکەش لە ڕاست و چەپیانەوە ڕاوەسـتاون. جارچی بەپێی عادەتی خۆی ئاگاداری بڵاو دەکردەوە. خەلیفە هارووونەڕڕەشید گوتی: 'جەعفەر، ئەو کارە زۆر سەیرە! ئەگەر شتی وام بە چاوی خۆم نەدیتبا باوەڕم نەدەکرد. بەڵام ئێسـتا ئەوە بە چاوی خۆم دیتم.' دوای ئەوە خەلیفە بە کابرای لۆتکەوانی گوت: 'کاکە، دە دینارت دەدەینێ لۆتکەکەت بەرە ڕێکی کەشـتییەکەی ئەوان با جوان چاویان لێ بکەین بزانین کێن، چونکە ئەوان شـوێنەکەیان ڕووناکە و شـوێنی ئێمە تاریکە. ئێمە ئەوان دەبینین، بەڵام ئەوان ئێمە نابینن.' کابرا دە دینارەکەی وەرگرت و لۆتکەکەی بردە ڕێکی کەشـتییەکەی ئەوان و لە ئاستی سێبەرکەی ئەوان ڕایگرت و لەگەڵ ئەوان دەی ئاژۆت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دووسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـکۆ، لۆتکەوان دە دینـارەکەی وەرگرت و لۆتکەکەی بردە ڕێکی کەشتییەکەی ئەوان و لە سێبەرکەی ئەواندا ڕایگرت. لەگەڵ ئەودا ڕۆیشت هەتا گەیشتە باخەکان. کەشـتییەکەی خەلیفەی دووەمیان لە قەراغ دیجلە بە گوڵمێخێکەوە بەسـتەوە و بۆخۆیان دابەزینە نێو باخەکان. کۆیلەکان لە قەراخەوە ڕاوەسـتابوون، ئەسـپێکیشـیان بە زینکراوی و لغاوەوە لەوێ ڕاگرتبوو. خەلیفەکەیان سواری ئەو ئەسپە بوو. خزمەتکارەکان لە ڕاسـت و چەپیەوە دەڕۆیشـتن. کۆیلەکان لە پێش و پاشـییەوە دەڕۆیشـتن. خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید و جەعفەر و مەسروور یش لە لۆتکەکە دابەزین و بە لەز خۆیان گەیاندنێ. چوون تێکەڵیان بوون. کۆیلەکان چاویان بەو سێ کەسە کەوت، جلوبەرگی بازرگانانیان لە بەردا بوو ـــــ دیار بوو غەریبە بوون. ئیدی تێیان ڕۆهاتن و گرتیانن. بردیانن بۆ لای خەلیفەی دووەم. خەلیفە ئەوانی دیت و لێی پرسـین: 'چۆناوچۆن هاتوونەتە ئێرە؟ بۆ لەو جەنگەیەدا هاتوون؟' گوتیان: 'ئێمە بازرگانین و ئەمڕۆ هاتووینەتە ئەم شـارە. ئەمشـەو بۆ سـەیران و گەڕان هاتینە ئێرە. کۆیلەکانی ئێوە گرتیانین و هێنایانینە خزمەت جەنابت. ئەوە بوو بەسەرهاتی ئێمە، وەسسەلام.' ئەو خەلیفەیە گوتی: 'قەیناکا. نیگەران مەبن. کەس کاری پێتـان نییە، چونکە خەڵکی ئێرە نین. دەنـا دەمکوشـتن.' ئیدی ئەو خەلیفەیە ڕووی لە وەزیرەکەی خۆی کرد. گوتی: 'ئەوانە بخە ژێر باڵی خۆتەوە و ئاگات لێیان بێ، چونکە ئەوانە میوانی ئێمەن.' وەزیر گوتی: 'باشـە بەسـەر چاو.' ئیدی ڕۆیشـتن. خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید و جەعفەر و مەسروور یش لەگەڵ ئەوان ڕۆیشتن. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کۆشـکێکی دەروازە بەرز و قایم کە دیوارەکانی هێند بەرز بوون سـەریان لە هەوران دەسـوو. دەرگاکانی ئەو کۆشـکە لە ئاونووس بوون و بە زێڕ لیاوکاری کرابوون. دوڕ و گەوهەریان تێدا دەکار کرابوو. بە دوڕ ئەو شێعرەیان تێدا نەخشاندبوو:

نـاڵـێـم ئەوێ ڕێـک بـۆخـۆی بەهەشـتە
دەڵـێـم هـێـنـد خـۆشـە دەڵـێی بەهەشـتە
نەخش و نیگـار و تەسـویـری جوانی
دڵان دەڕفـێـنـێ بە سـیـحـری جـوانـی

"دوای ئەوە خەلیفە لەگەڵ خەڵکەکە چوونە نێو کۆشکەوە. خەلیفە لەسـەر کورسـییەکی زێڕین کە پەردەیەکی ڕازاوە بە گەوهەر و یـاقووت و مرواری پێدا درابوو، دانیشـت. هاونشینەکانی ڕووبەڕووی دانیشتن. شیروەشێنیش بە شیری ڕووتەوە ڕووبەڕووی وەستا.

ـە پێشدا سفرە ڕاخرا و خواردنیان خوارد. دەست شۆردرا. دوای ئەوە گۆزەڵە مەی و پیاڵە ریز کران. دەسـتیان کرد بە بادەخواردنەوە. کە دەوری پیاڵە گەیشـتە هارووونەڕڕەشـید، بادەی نەخواردەوە. خەلیفەی دووەم بە جەعفەری گوت: 'ئەوە بۆ هاوڕێکەت ناخواتەوە؟' جەعفەر گوتی: 'مەولانا خەلیفە، ئەو بەینێکە تەرکی کردووە.' خەلیفە گوتی: 'من بێجگە لە بادە شـتێکی دیکەم لە لایە کە ئاوی ژیانی پێ دەڵێن.' ئینجا فەرمووی: 'ئاوی ژیانی بۆ بێنن.' خەلیفەی دووەم هاتە لای هارووونەڕڕەشـید ڕاوەسـتا. بە هارووونی گوت: 'ئەگەر سەرەی پیاڵە گەیشتە تۆ، لە جیاتی مەی ئاوی ژیان بخۆرەوە.' ئیدی ئەوان مەی خەستیان خواردەوە هەتا تەواو سەرخۆش بوون و ئاوەزیانی لە کار خست."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، خەلیفە لەگەڵ هاوڕێکانی ئەوەندەیان بادە خواردەوە تا هەموویان تەواو ســـەرخۆش بوون و ئاوەزیان لە کار کەوت. خەلیفە هاڕوونەڕڕەشـــید بە وەزیری گوت: 'جەعفەر، خۆ بە خودا ئێمە لەو گۆزەڵە شووشـەیی و شتەمان نییە. خۆزگە دەمزانی ئەو کوڕە چکارەیە. نهێنی ئەو بارەگا و شتە چییە؟'

"وا بوو لەو جەنگەیەدا کە خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید خەریک بوو بە سرتە قسەی لەگەڵ جەعفەر دەکرد، ئەو کوڕە گەنجە چاوی پێیان کەوت. وەزیری دیت کە خەریک بوو لەگەڵ خەلیفە بە ســـرتە قســـەی دەکرد. گوتی: 'لە کۆڕی مەیخواردنەوەدا ســـرتەکردن جۆرێک زەڕاندنە.'

جەعفەر گوتی: 'زەڕاندنێک لە گۆڕێدا نییە. قســـەی ناحەزیشـــم نەکردووە. تەنیا بە هاوڕێکەم گوت کە من زۆرم ئەم شـــارەوشـــار کردووە، لەگەڵ پاشـــایان هەڵسوکەوتم کردووە، لەگەڵ گەورەکان ژیاوم، هەتا ئێســـتا دابونەریت و بەزم و کۆڕی ئەوەندە شـاد و خۆشم نەدیوە. بەڵام خەڵکی بەغدا دەڵێن بادەی بێ سەما و هەڵپەڕکێ هەر مایەی سەرێشە و ناخۆشییە.'

"کە خەلیفەی دووەم ئەو قسەیەی بیست، بزەیەکی هاتێ و خۆشحاڵ بوو. شووڵێکی بە دەســـتەوە بوو، دەرگایەک لە پەنای بوو لە دەرگاکەی دا. خێرا دەرگا کراوە. بە دوای کرانەوەی دەرگـاکەدا کچێکی جوانی ڕەزاســـووک و خوێنشـــیرین هـاتە ژوورەوە. خزمەتکارەکە کورسی دانا. کیژۆڵەکە لەسەری دانیشت. عوودێکیان دا دەستی. گۆرانییەکی چڕی. ئاوازێکی بە بیست و چوار شێوە لێدا، بە جۆرێک کە مرۆڤ لە خۆشیان هۆشی لە لای خۆی نەدەما. دوای ئەوە هاتە سەر ئاوازێکی دیکە و ئەو شیعرەی خوێندەوە:

کۆڕی ئەمڕۆمـان پڕ لـــە خۆشـــی و بەزم و کەیف و شـــادییە
بەری کـــۆڕی ئـــەمڕۆکـــەمـــان مـــــــاچ و ئـــاواز و جوانییە
لکی شـلک چـــرۆ دەدا، خـــــــــــونچە دەمی دەکاتەوە
ئـــەمڕۆ ڕۆژی بـــەزم و بزە و ڕۆژی گـــــــــــەردن ئازادییە

"خەلیفەی دووەم کە ئەو شیعرەی لە کچە بیست، یەکبەخۆی قیژاندی و جلەکانی بەری ســـەرتاخوار دادڕی. خزمەتکارەکان پەردەیان پێدا دا و بە لەز جلوبەرگی دیکەیان لە بەر کرد. دوای ئەوە گەنجەکە هاتەوە شوێنەکەی خۆی. دیسان بادەگێڕان دەستی پێ کردەوە.

که سەرە گەیشتە لاوەکە، بە شووڵەکەی لە دەرگاکەی دا. لەڕێوە دەرگا کراوە. خزمەتکارێک کورســـییەکی هێنا. بەدوای ئەودا کیژێکی لەوەی پێشـــوو جوان و دەلالتر هاتە ژووری، ـەسەر کورسییەکە دانیشت. دەستی دا عوودەکە و ئەو شێعرەی گوت:

برینی دەردی دووریـت هێنـدە قووڵە، لێو هەنگوین
نە بە ڕۆژ حەجمینم هـــــــیە، نە شەو خەوی شیرین
چـاو و دڵم لە ســـوێی دووری تۆ، دوری جوانی من
دەریایەکی پڕ لە ئـــــــــــــاوە و دشتێکی ئاگرین

"لاوەکە کە ئەو شـــێعرەی بیســـت. قیژاندی و جلەکانی لە ســـەرتاخوار دادڕی. خێرا پەردەیەکیان پێدا دا. کراســـێکی دیکەیان بۆ هێنا. کوڕە کراســـی گۆڕی. لە جێی خۆی دانیشـتەوە. بە ڕووی خۆشـەوە قسـەی دەکرد. تا دوو پیاڵەی دیکەی گەیشتێ. خواردییەوە و شـــووڵێکی دیکەی لە دەرگـاکە دا. خزمەتکـارێـک هـاتە دەرێ. بەدوای ئەودا کیژێکی خۆرئاسـا هات. لە کچەکانی پێشـوو جوانتر و ڕێکوپێکتر. خزمەتکار کورسـی بۆ دانا. کچە دەســـتی دا عوودەکە و دانیشـــت تاڵەکانی عوودەکەی توونـد کردنەوە. ئەو شـــێعرەی خوارەوەی بە دەنگ و ئاوازێکی خۆش چڕی:

گەر بـێـتـوو ئەو بـێـبەڵـێـنە گـفـتـێـکـی کە بـداتەوە
گیـانی دەرچوو بۆ نـاو جەســـتەی ســـاردەوەبوو دێنێتەوە
شـــەوانی تـاریکی ژینم بە تیشـــکی ڕووی ڕوونـاک دەبێ
ئـــــــــــەگەر بێتوو بەیاناسا لە ئاسۆ سـەر هەڵداتەوە
هەموو خەمێک کۆتـایی دێ، خەمی دووری هەر ســـەر دەکا
دەتـرســـم ژەهـر بـمـکـوژێ، جـا نـۆژدار ئـاوڕێ داتەوە

"لاوەکە کە ئەو شـــێعرەی بیســـت. قیژاندی و جلەکانی لە ســـەرتاخوار دادڕی. خێرا پەردەیەکیان پێدا دا. کراســـێکی دیکەیان بۆ هێنا. کوڕە کراســـی گۆڕی. لە جێی خۆی دانیشـتەوە. لەگەڵ هاونشـینەکانی دەسـتی بە قسـە کردەوە. مەیگێڕ دەسـتیان کردەوە بە بادەگێڕان. کە پیاڵە گەیشـتەوە ئەو لاوە، شـووڵێکی لە دەرگا دا. دەرگا کراوە، خزمەتکارێک کورسییەکی هێنا و داینا. بەدوایدا ئەودا کیژێک هاتە ژووری و لەسەر کورسییەکە دانیشت. دەستی دا عوودەکە و ئەو شێعرەی خوارەوەی بە دەنگ و ئاوازێکی زۆر خۆش گوت:

شـــەو تـا بەیـان چـاوەڕوانم من بە هـــــیوای دیـداری تۆ
مەگـیـن هەر ســـــروەی بەیـانـی بـۆم بـێـنـێ بـۆی هەواری تـۆ

سـوماى چاوم نەما و كوێر بووم هێندەم چاوەڕوانى كێشـا
وەره گيانه زيندووم كەوه، چون دەزانم عيسامى تۆ
كوا دەتـوانم دوور كەومەوە من دانەخۆرەى عيشقى تۆم
گەر بێتوو ڕێگەشم نەدەى من ببمه هاونشينى تۆ
چيها شەوم بردووەتە سەر بە تەنيايى بەو هيوايە
من بسرەوم تەنيا شەوێک لەنێو ئامێزى گەرمى تۆ

"کاتێک خەلیفەی دووەم ئەو شێعر و ئاوازەی لە کیژە بیست، قیژاندی ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که خەلیفەی دووەم ئەو شێعرەی بیست، هاواری لێ بەرز بووەوە. جلەکانی له بەری دادڕی و له هۆش خۆی چوو. ویستیان پەردەیەکی بەسەردا بدەن. لایەکی پەردەکە نووشتاوە. هاروونەڕەشید بەشێکی جەستەی دیت که جێگای قامچیی بەسەرەوە بوو. ئینجا بە جەعفەری بەرمەکی گوت: 'وەزیر، هەرچەند ئەوە کوڕە لاوێکی جوانچاکە، بەڵام وا دیارە دزێکی خراپکاریشە.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، لەکوێوە زانیت دزە؟' خەلیفە گوتی: 'ئەی ئەو جێگا قامچییانەت بە جەستەیەوە نەدی؟' پەردەکەیان پێدا دا. جلەکانیان گۆڕی. ئەوجار هەستا دانیشت و لەگەڵ هاودەمەکانی دەستی بە قسە کرد. سەیری کرد خەلیفە لەگەڵ جەعفەر خەریکی وتوویژ بوون. لێی پرسین: 'بازرگانەکان، ئەوە ئێوە باسی چی دەکەن؟' جەعفەر گوتی: 'گەورەم، چیت لێ بشارمەوە؟ ئەو هاوڕێیەم بازرگانە و دنیای زۆر دیوە، شار و شوێنی جیاواز چووە، لەگەڵ پاشا و پاشای جۆراوجۆر دانیشتووە. دەڵێ: 'ئەوەی من ئەمشەو لێرە دیم، لە هیچ کوێ نەمدیوە.' باسی ئەوەی کرد، گوتی: 'ئەوە ئەمشەو پاشا چەند کراسی دیبای لە بەر خۆی دادڕی—ئەوە زیادە خەرجییە.' ' خەلیفەی دووەم بەرسڤی دانەوە کەماڵی دنیا بۆ بەخشین و بڵاوکردنەوە دەبێ. ئەو کراسانە کە من دایاندەڕم هەرکامیان لەگەڵ پێنجسەد دینار دەدەم بە یەکێک لە هاودەمەکانم. جەعفەر گوتی: 'جا ئەگەر وا بێ، ئەوە کارێکی گەورەیە.' ئیدی ئەو شێعرەی بۆ خوێندەوە:

ولات دەبێتە شاری گوڵەستێرە کە بێتوو
لە خۆشی بوونی تۆ هەتاو دەرگا بکاتەوە

"کاتێک لاوەکە ئەو شێعرەی جەعفەری بیست، هەزار دیناری زێڕ و کەوایەکی گرانبایی دایێ. دوای ئەوە بادە گەڕا و خۆشییەکی لەڕادەبەدەر لە کۆڕەکەدا گەڕا. ئەوجار خەلیفە هاروونەڕەشید بە جەعفەری گوت: 'دا لێی بپرسە بڵێ ئەو جێگا قامچییانە بۆ بە جەستەیەوەیە؟ هۆکارەکەی چییە؟ بزانین چۆنت وەڵام دەداتەوە.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، پەلە مەکە! پەلەنەکردن لەو کارانەدا زۆر باشترە.' هاروونەڕەشید گوتی: 'بە خاکی عەباس قەسەم، ئەگەر هەر ئێستا لێی نەپرسی، دەتکوژم.'

"لەو دەمەدا گەنجەکە چاوی لێیان بوو، گوتی: 'ئەرێ ئەو سرتەسرتەتان لە چییە؟ بە منیش بڵێن.' جەعفەر گوتی: 'هەر باسی چاکەی تۆیە.' لاوەکە گوتی: 'تووخودا ئەوەی دەیڵێن لە منیشی مەشارنەوە و، پێم بڵێن.' جەعفەر گوتی: 'گەورەم، هاوڕێکەم چاوی بە

جەستەی تۆ کەوت، شوێنی قامچی لەسەر دیوە، پێی سەیرە و دەڵێ: 'ئەوە دەبێ بۆ ئاوایان لە خەلیفە دابێ؟!' دەیەوێ هۆکارەکەی بزانێ.' کوڕەکە کە ئەوەی بیســـت، بزەی هاتێ و گوتی: 'ئەوەندە بزانن بەســەرهاتی من زۆر ســەیرە و جێی ســۆسـرەتە[1].' پاشــان ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

خەم و دەردی دووری یــار، هەمــیشــــە گــران بــووە
بە تایبەتی بەهـــــــــــــاران کە ســرووشــت، جوان بووە
کوا لە دنــــــــــــــــیادا کەســی، هێندە لێ قەوماو هەیە؟
کاری کـــــــــــــــێ هەتا ئــــــــێستا، وا گرێی تێ کەوتووە؟
لە یارم هـــــــــــــــــــــەڵبڕاوم، لە لای بەرهەڵستی ویم
ســــەیری چــارەی ڕەشــــم کە، من چیم بەســــەر هــاتووە
هەر ئەوکـــاتە خۆشـــــیم دیــت هەتــاکوو پێکەوە بووین
مەلی خەم ئیســـــتــا لەســـــەر چــڵ و پۆپم نیشـــتووە

"دوای ئەوە گوتی: 'پێم وایە ئێوە خەلیفە و جەعفەر و مەســـرووری شــیروەشــێنن.' جەعفەر نکۆڵی لێ کرد و گوتی: 'ئێمە ئەوانە نین کە نێوت هێنان.' ئەوجار گەنجەکە پێکەنی و گوتی: 'بەڕێزان، بـا ئەوە بزانن کە من خەلیفە نیم. بەڵام بۆیە خۆم کردووە بە خەلیفە هەتا ئەوەی پێم خۆش بێ لەو شــارەدا بیکەم. من محەممەد عەلی کوڕی عەلی جەواهێریم. باوکم ســاماندار بوو. کاتێک مرد، ماڵ و ســامانێکی زۆری هەر لە زێڕ و زیو و مرواری و یاقووت و کاروانســەرا و باخ و کۆیلە و کەنیز و شــتی وای لەپاش بە جێ ما. بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە دووکان دانیشتبووم خزمەتکار و دەوروبەریانم لەدەورم ڕاوەستابوون. لە ناکاو کیژێک بە سواری وشترێکەوە هاتە دووکان. سێ کەنیزیشی لەگەڵ بوو. کە هاتە دووکان، لە پەنا من دانیشـــت و گوتی: 'ئەوە تۆ محەممەد عەلی گەوهەرفرۆشـــی؟' گوتم: 'بەڵێ، کۆیلەی تۆم.' گوتی: 'تۆ ملوانکەیەکی وات هەیە شـــیاوی من بێت؟' من گوتم: 'خانم، من ئەوەی هەمە دەیهێنمە خزمەتت، چاویان لێ بکە، ئەگەر هی وای تێدا بێ بە دڵی تۆ بێ، ئەوە لە بەختەوەری منەوە دەبێ. ئەگەر تێیشــیدا نەبێ، ئەوە لە ڕۆژڕەشـــیی منەوە دەبێ.' ســـەد دانە گەوهەرم هەبوو، هەموویانم پیشـــان دا. هیچیانی بە دڵ نەبوو و گوتی: 'لەوانە جوانتر چیت هەیە؟' ئیدی هەســـتام، چووم گەردانەیەک کە باوکم کڕیبووی بە ســـەدهەزار دینار و، شتی وا لە لای پاشاکانیش وەگیر نەدەکەوت، بۆم هێنا. کە ئەوەی دیت، پەسەندی کرد و گوتی: 'نرخی ئەو گەردانە چەنـد دینـارە؟' گوتم: 'بـاوکم بە ســـەدهەزار دینـار کڕیوییەتی.' گوتی: 'پێنجهەزار دینــارت خێر دەدەمێ؟' گوتم: 'خـــانمەکەم، ملوانکە و

---

[1] سۆسرەت: سەیر. جێی سەرسووڕمان.

خاوەنەکەشی هەر هی خۆتن.' کیژەکە گوتی: 'زۆر باشە، پێنج هەزار دینارت خێر دەدەمێ و سپاسیشت دەکەم.' ئیدی هەستا سواری وشترەکەی بوو، بە منیشی گوت: 'لەگەڵم وەرە با پارەکەشت بدەمێ.' وا بوو هەستام دووکانم داخست. لەگەڵی ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە بەردەرکی ماڵێک کە بەختەوەری و خۆشبەختی لە دەر و دیواری ماڵەکەدا دیار بوو. دەرگاکەیان بە زێڕ و زیو و یاقووت و شتی وا ڕازاندرابووەوە. ئەو دوو بەیتەش لە سەر دەرگاکە نووسرابوو:

لە خۆشی و جوانیدا تۆ، بەهاراسا خەملاوی
کامە ڕەنگ گەش و جوانە، دەڵێی لەویان لێ داوی
بە هۆی هاتتەوە خوێڕی نموونەی ئازایەتییە
لە سای بەختتەوە ناپاک، دەستپاکێکە تای نییە

"کچە دابەزی و چووە ژوورەوە. بە منیشی گوت، لەسەر سەکۆکەی بەردەرگاکەیان دانیشم. هەتا ژمێریارەکەیان هات من ماوەیەک لە بەردەرگاکەیان دانیشتم. لەپڕدا کەنیزێک هات و بە منی گوت: 'گەورەم، بۆ تۆ جوان نییە لەوێ دانیشتووی، وەرە دالانەکەوە.' هەستام چووم لە دالانەکە دانیشتم. ئەوەندەی پێ نەچوو، کەنیزێکی دیکە هات. گوتی: 'گەورەم، خانم دەڵێ: 'جوان نییە، لەوێ دامەنیشە.' هەستە، وەرە ژوورەوە لە شوێنێک دانیشە هەتا ژمێریارەکەمان دێ و پارەکەت بۆ دەژمێرێ.' دوایی هەستام چوومە ژوورێ. تاوێک بوو لە سەرەوەی دیوەکەوە دانیشتبووم، کورسییەکی زێڕینم دیت کە لەپشت پەردەیەکی ئاوریشمەوە بوو. کە پەردەکە لا درا، هەر ئەو کیژە ڕووهەتاوەی کە گەردانەکەی لە من کڕیبوو، لەژێر پەردەکە وەدەر کەوت. ڕووی وەک خۆر تیشکی دەداوە. گەردانەکە لە ملیدا بوو. ئیدی هەر کە ئەوم دیت، هۆشم لەسەر خۆم نەما. کەوتمە دڵەکوتە و دڵم خەریک بوو وەک مەلێک لە سینەم دەرفڕێ. کە کیژەکە منی دیت، لەسەر کورسییەکە هاتە خوارەوە و هاتە لای من. پێی گوتم: 'سۆمای چاوم، ئەرێ هەرکەس وەک تۆ جوان بێ، نابێ بەزەیی بە خۆشەویستەکەی خۆیدا بێ؟' من گوتم: 'خاتوونەکەم، تەواوی جوانی و دەلالی لە تۆدا کۆ بووەتەوە.' دوایی گوتی: 'لاوی گەوهەرفرۆش، من دڵم هۆگری تۆ بووە. باوەڕم نەدەکرد بتوانم تۆ بێنمە لای خۆم.' ئەوەی گوت و سەری هێنا بەرەوە. منیش ماچم کرد. ئەویش منی ماچ کرد. بە خۆیەوە گوشیمی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و نەوەد هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گەوهەرفرۆشەکە دەگێڕێتەوە 'دەڵێ: 'ئەو کیژە نازدارە هات بۆ لام و باوەشـــی پێدا گرتم و توند بە خۆیەوە گوشـــیمی. منیش ئەوم لە ئامێز گرت و هێند بە تاسـەوە بە خۆمە گوشـیم، بە ڕەنگ و حاڵی مندا وای زانی هەسـتم بزووتووە و بە تەمای کارێکم. هەر بۆیە لێی پرســـیم: 'گەورەم، ئیشـــتیای نزیکیت کردووە. بە خودا من ناتوانم، هێشتا کچێنیم بێ عەیبە و کەس لەگەڵم جووت نەبووە. من لەم شارەدا کەسێکی ناسراوم. دەزانی من کێم؟'

" 'گوتم: 'نەوەڵڵا، خانمەکەم.' گوتی: 'ئەمن دنیا خانمی کچی یەحیا بەرمەکیم. براکەشـم جەعفەری وەزیری خەلیفەیە.' کە ئەو قسـەیەم لەو بیست، ترسـم کەوتە دڵەوە و گوتم: 'جا تاوانی منە ئێستا لێرەم؟ تۆ خۆت بانگت کردوومەتە ئێرە و منت وە تەماع خستووە خۆ لە تۆ خۆش کەم.'

" 'ئەو گوتی: 'هیچ نیگەران مەبە، تۆ بە ئارەزووی خۆت دەگەی، چونکە من دەســـەڵاتی خۆم بە خۆمە. بە تەماشـم مێرد بە تۆ بکەم. دوای ئەوە بانگی قازی و شـایەدی کرد. ئەو گوڵڕوخســـارە پێی گوتن: 'محەممەد عەلی کوڕی عەلی گەوهەرفرۆش داوای منی کردووە. دەیەوێ ببێتە مێردی من. ئەو ملوانکەیەشی لە جیاتی مارەیی داومەتێ. منیش پێم خۆشە و بەو پیاوە ڕازیم. هەر بۆیە ئێوەم بانگ کردووە لێکمان مارە کەن و تاپۆکەمان بۆ بنووسن.'

" 'دوای ئەو کـارانە منی بردە دیوێـک و دەســـتمـان کرد بە مەی خواردنەوە. پیاڵە دەستاودەستی کرد. کە سەرخۆش بووین، کیژەکە بە کەنیزێکی گوت دەست بداتە عوود و شێعر و ئاوازێکی خۆشمان بۆ بڵێ. کەنیزەکە دەستی دا عوود و ئەو شێعرەی بە ئاوازەوە بۆ خوێندینەوە:

هەرکەس دەبـیـنـی وێـردی زمـانـی، بـوتـی چـیـنە
بـوتـی ئـێمە کەزیە و بســـکەکەی چین لەســـەر چینە
لە بەهەشـــتە ئەو کەســـەی تـۆی لە ئـامـێـز گـرتـووە
بەو کەســـە دەڵێن خوســـرەو، لە هەنتەشـــی شـــیرینە

" 'بەو جۆرە کەنیزەکان دانەدانە دەهاتن و شـێعریان دەخوێندەوە و عوودیان دەژەند. هەتا ژمارەی کەنیزەکان گەیشـــتە دە کەس. ئەوجار دنیا خانم عوودەکەی لێ وەرگرت و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئێمە هەموو ملکەچین بۆ دەستوور و یاساکەت
ڕەبی بۆ دژمنت بێ دردەد و بەلا و قەزاکەت
هەر جێیەکت پێ باشە باروبنەی لێ بخە
کێیە بتوانێ بلێ: 'لاچووە لەسەر جێگاکەت'؟
کەس نییە بلێن ڕەنگە دڵی من بڕفێنێ
هەر لە ئاوێنەکەتا دەبیندرێ هاوتاکەت

" 'کە خانم شێعرەکەی تەواو کرد، من عوودەکەم لێ وەرگرت. ئاوازی جۆراوجۆرم لێدا و ئەو شێعرەم خوێندەوە:

ئەو کەسەی ئاوی ژیانم لە زاری تۆوە دێ
تیری تێداچوونی من لە کەوانی تۆوە دێ
ئەگەر تۆ دانەپۆشی ڕووی جوانت لەو شارەدا
هەرکەس بکوژرێ دیارە ئەو تیرە لای تۆوە دێ
خەڵک هەر ڕۆژەی پەنا و پشتیوانێکیان هەیە
ئێمە بەو بایە دەژیین لە گەڕەکی تۆوە دێ

" 'کە خانم گوێی لەو شێعر و ئاوازە بوو، خۆشحاڵ بوو بە کەنیزەکانی گوت: 'بچنە دەرەوە.' کەنیزەکان چوونە دەرەوە. ئێمە هەستاین چووینە شوێنێک کە باشترین و خۆشترین شوێن بوو. من جلەکانیم لە بەر داکەند. لە باوەشم گرت. ئەویش منی بە خۆیەوە گوشی. من ئەوم وەک گەوهەرێکی نەسماو هاتە بەرچاو. بە جۆرێکی وا دڵخۆش بووم کە لە ماوەی تەمەنمدا قەت ئەوەندە دڵخۆش نەبیووم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، محەممەد عەلی کوڕی گەوهەرفرۆش گێڕاویەتەوە کە 'مانگێک لە لای ئەو خانمە دەلالە مامەوە. ئاگام لە ماڵ و دووکان و خزمان نەبوو. ڕۆژێک پێی گوتم: 'چاوەکەم، من دەچم بۆ گەرماو، تۆ لەسەر ئەو تەختە مەبزوو هەتا دێمەوە.' ئیدی منی سوێند دا کە لە جێی خۆم هەڵنەستم.

" 'وا بوو کەنیزەکانی لەگەڵ خۆی برد و چوو بۆ گەرماو. هێشتا ئەو گوڵە جوانە نەگەیشتبووە سەری کوڵان، پیرێژنێک لێم وەژوور کەوت و گوتی: 'محەممەد کوڕی عەلی، زبێدە خانم تاریفی دەنگی تۆی بیستووە و دەڵێ بێ.' من بە پیرێژنەم گوت: 'بە خودا من لە جێی خۆم نابزووم هەتا دنیا خانم نەگەڕێتەوە.'

"پیرێژنە گوتی: 'کارێک مەکە کە زبێدە خانم ڕقت لێ هەڵگرێ و لێت بە قیندا چێ. هەستە وەرە لای دوو قسە بکەن و وەرەوە جێگاکەی خۆت.' من گورج هەستام دوای کەوتم بۆ لای زبێدە خانم. پیرێژنە لە پێشەمەوە دەڕۆیشت و منیش بە دوایدا. هەتا منی بردە لای زبێدە خانم. کە چوومە لای، پێی گوتم: 'سۆمای چاوم، تۆی ئەویندارى دنیا خانم؟' گوتم: 'بەڵێ، یەکێ لە کۆیلە و نۆکەرەکانی تۆم.' گوتی: 'ئەوەی پەسن و تاریفی تۆی کردووە، ڕاستی کردووە. تۆ لە پەسن و تاریفەکانی ئەوانیش سەرتری. وا دیارە لە تاریف بەدەری و کاری پێداهەڵگوتن نییە. گۆرانییەکم بۆ بڵێ با گوێم لە دەنگت بێ.' من گوتم: 'بەسەر چاو، خانمەکەم.'

" 'عوودیان بۆ هێنام. دەستم دا عوودەکە و بە ئاوازێکی سەرنجڕاکێش ئەو شێعرەم بۆ گوت:

نە باسی چینم بۆ بکە و نە هی ڕۆم
ئەمن هەمە گراو و ئەڤینی خۆم
ئەو کاتانەی کە ئەو دێتە خەیاڵم
ئاوەدانە باخی دڵم خۆشحاڵم
نە بێ ئەو هەڵدەکەم من نە لەگەڵ ئەو
بە ڕاستی حەیفە بێتە چۆڵەماڵ ئەو

" 'کە شێعرەکەم خوێندەوە، ئیدی زبێدە خانم پێی گوتم: 'خودا بە ئاواتت شاد کا. دەنگ و ئاوازت زۆر زۆر خۆشە. هەستە ئێستا بڕۆوە بۆ شوێنەکەی خۆت، چونکە ئەگەر دنیا

خانم بێتەوە و لەوێ نەبی، لێت نارەحەت دەبێ.' ئیدی من کڕنۆشـــم برد و لەوێ هاتمە دەرێ. دیسان پیرێژنە پێشم کەوت و لەگەڵم هات هەتا منی گەیاندەوە بەردەرگا. کە چوومە ژوورەوە، سەیرم کرد ئەوە دنیا خانم لە گەرماو گەڕاوەتەوە و لەسەر تەختەکە درێژ بووە و خەوتووە. من لە لای قاچییەوە دانیشـــتم و نەرم نەرم قاچیم بۆ شـــێلا. وا بوو چاوی هەڵهێنا و دیتمی. ئیدی لەقەیەکی لێ دام و لە تەختەکە خســـتمییە خوارەوە. پێی گوتم: 'ناپاک! ئەوە بەڵێنەکەی خۆت نەبردە سـەر و شـکاندت؟! تۆ سـوێندت خوارد لە جێی خۆت نەبزووی، کەچی هەسـتای چووی بۆ لای زبێدە خانم! بە خودا ئەگەر لەبەر ئابڕووی خۆم نەبوایە، کۆشکی زبێدەم بەسەریدا کاول دەکرد.' ئیدی بە کۆیلە ڕەشەکەی گوت: 'سەواب، ئەو درۆزنە بکوژە.' کۆیلەکە هاتە بەرەوە و دەســـڕێکی دەرهێنا چاومی بەســـت. ئینجا شیرەکەی دەرکێشا بمکوژێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی دووسەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، محەممەد عەلی گەوهەرفرۆش گێڕاویەتەوە: 'کۆیلەکە ویستی بمکوژێ کە کەنیزەکان بە گەورە و بچووکەوە دەستیان کرد بە پاڕانە و لالانەوە. گوتیان: 'خانم، ئەوە یەکەم سەرپێچی ئەوە. ئەو باش شارەزای خوو و خدەی تۆ نەبوو. تاوانەکەشی وا نییە شیاوی کوشتن بێ. ئەو جارە لێی خۆش بە.' خانم گوتی: 'کە وایە، بە خودا دەبێ وای لێ بکەم هەتا ماوە لە بیری نەچێتەوە و لە بەرچاوی بێ.' ئیدی فەرمانی دا، بە قامچی لێیان دام. ئەوەندەیان لێ دام تەواوی گیانم خوێنی تێ چزا. ئەو جێگە قامچیانەی ئێوە دیتوتانە، ئەوە هی ئەو دەمەن. دوای ئەوە فەرمووی لە کۆشک فڕێیان دامە دەرەوە. ئیدی هەستامەوە و وردەوردە بەرەو ماڵ بوومەوە. نۆشدارێکم بانگ کرد برینەکانم تیمار بکا. وا بوو بەزەیی پێمدا هات. دڵسۆزانە دەرمانی کردم تا برینەکانم ساڕێژ بوونەوە. ئینجا چوومە گەرماو. هاتمەوە سەر خۆ و چاک بوومەوە. چوومەوە دووکان. ئەو ماڵەی هەمبوو هەموویم فرۆشت. بەو پارەیە چوارسەد کۆیلەم پێ کڕی کە کۆیلەی ئاوا لە لای پاشاکانیش گیر ناکەون. ئەو کەشتییەم بە پێنجهەزار دینار چێ کردووە. خۆم کردووە بە خەلیفە. هەر شەوەی دووسەد کەس لەو کۆیلانە سوار دەکەم. بە هەر کام لە خزمەتکارەکانم پلە و پایەیەکی وەک خزمەتکارەکانی خەلیفەم داونێ. خۆمان لەگەڵ ئەوان یەکڕەنگ کردووە. جاڕم داوە هەرکەس شەوانە لەنێو دیجلەدا هاتوچۆ بکا، دەیکوژم. ئەوە ساڵێکە ئەوە پیشەمە. هیچ هەواڵێکیشم لە دنیا خانم نییە. لێی بێئاگام.' کە ئەوەی گوت، کوڕە دەستی کرد بە گریان. فرمێسکی هاتە خوارێ و ئەو شیعرەی گوت:

خەمی دنیایە بخۆم، یان لە سوێی یار گیان بدەم؟
نازانم ڕوو لە کوێ کەم، شان وەبەر کامیان بدەم؟
توانایی ئەوەشم نیە وە پشت گوێچکەمیان بخەم،
یان هەر بە فشە و گاڵتە ژیان وەپێش خۆم بدەم
خۆ ئەو سەبرەشم نییە ئاوەز ڕێشاندەرم بێ
عەقڵیش ئەونە بڕ ناکا سەرۆک و ڕێبەرم بێ

"هاڕوونەڕڕەشید کاتێک گوێی لە ئاخ و داخ و ئەوینی ئەو گەنجە بوو، کەوتە بیرکردنەوە و سەری سووڕ ما. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'سوبحانەڵڵا! هەر کارێک هۆکارێکی هەیە.' دوای ئەوە هاڕوونەڕڕەشید و جەعفەر ڕەوخسەتیان لەو گەنجە خواست و لەوێ هاتنە دەرەوە. هاڕوونەڕڕەشید لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەبێ بێویژدانی نەکەم و دەست لە

زۆر و ســـتم هەلگرم. ئەو لاوەم لە بیر نەچێ و چاکەیەکی لەگەڵ بکەم.' کە هـاتەوە نارولخەلافە، جلەکانی گۆڕی و دانیشت. ئینجا بە جەعفەری بەرمەکی گوت: 'وەزیر، بچووە ئەو لاوە بێنە ئێرە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی دووسەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، خەلیفە بە وەزیری گوت: 'وەزیر، بچووە ئەو لاوەم بۆ بێنە.' جەعفەر بە گوێی کرد. هەســتا چووە لای کوڕەکە و پێی گوت: 'گوێڕایەڵی فەرمانی خەلیفە بە.' ئیدی ئەو لاوە لەگەڵ جەعفەر هاتە لای خەلیفە. کڕنۆشـــی برد و زەوییەکەی ماچ کرد. دۆعای بۆ بەردەوامیی دەسەڵاتی خەلیفە کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

پلە و پـایەت هەر لە هەڵکـــــشـــانـدا بێ
با بەدخوازت پەســت و ســـووک و ڕســوا بێ
هەر خـۆزگە و ئـاواتـێـکـی کە تـۆ هەتـبـێ
هــیــوادارم ورد و درشـــــت وە دی بـــێ

"خەلیفە پێکەنی. وەڵامی ســڵاوەکەی داوە. بە ڕوویەکی خۆشـــەوە خولقی کرد. لە لای خۆی داینا و پێی گوت: 'ئەی محەممەدی کوڕی عەلی، دەمەوێ ئەوەی ئەمشـەو بەســەرت هات، بۆم بگێڕیتەوە، چونکە زۆر جێی زەندومان و ســۆســرەت بوو. ئیدی لاوەکە گوتی: 'بمبەخشە، بمبەخشە خەلیفەی مەزن، دەسرۆکەی پەنادانم بەرێ با دڵم داسەکنێ و ترسم بڕەوێ.'[1] خەلیفە گوتی: 'تۆ لە پەنا منداى. لە هیچ شتێک مەترسە و ئەرخەیان بە.' ئەوجارر لاوەکە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی. خەلیفە زانی ئەو لاوە ئەویندارە و لە گراوەکەی دوور کەوتووەتەوە، لێی پرســـی: 'دەتەوێ ئەو کیژە بدەمەوە بە تۆ؟' لاوەکە گوتی: 'جا ئەگەر خەلیفە وەها کارێک بکا، ئەوە لە گەورەیی و مەزنیی خۆیەوەیەتی.' ئیدی ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بوونی پادشـــا و گەورەی وەک تۆ بەختەوەرییە
دڵـی گەورەت دایـمە لە بـیـر چـاکەکـاریـیە
باڵی خێر و بێرت بە ســـەر هەمووان کێشـــاوە
وڵاتــت ئـاوەدان، وەک بـاخـێـکـی پـاراوە

"ئیدی لەو جەنگەیەدا خەلیفە ڕووی لە وەزیر کرد و فەرمووی: 'جەعفەر، بچووە دنیا خانمی خوشـــکت بێنە.' جەعفەر خێرا چوو دنیا خانمی هێنا بۆ لای خەلیفە. خەلیفە لێی

---

[1] ١. ئەو کات باو بوو، بۆ ئەوەی کەسێک ئەرخەیان بێ. لە لایەن پادشاوە لەسەر ئەو شتەی دەیڵێ لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێ وەک بەڵگە پادشـا دەســرەیەک یا شـتێکی لەو چەشـنەی دەدایە. ئەویش بێ ترس شـتەکەی دەگێڕاوە یان کارەکەی دەکرد.

پرسی: 'دنیا خانم، ئەو کوڕە دەناسی؟' خانم گوتی: 'گەورەم خەلیفە، جا ژنان چۆناوچۆن پیاوان بناسن؟' خەلیفە بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'مێردەکەی تۆیە. محەممەدی کوڕی عەلی گەوهەرفرۆشە. ئێمە ئاگاداری تەواوی بەسەرهاتەکە هەین. ئاگامان لە تەواوی کون و کەلەبەرەکانی ئەو ڕووداوە هەیە. کارەکان ئەگەر زۆریش شاراوە بن، دواجار هەر ئاشکرا دەبن.' دنیا خانم گوتی: 'خەلیفە، قەزا و قەدەر وا بوو تووشی ئەو کارە بم، بەڵام من زوو تۆبەم کرد. هیوادارم تۆش لێم خۆش بی.' خەلیفە هاروونەڕڕەشید پێکەنی و قازی و شاهیدی بانگ کرد. دیسان دنیا خانمیان لە محەممەدی کوڕی عەلی مارە کردەوە. بەختەوەری ڕووی تێ کردنەوە. هاروونەڕڕەشید محەممەدی کردە هاودەمی خۆی و ئیدی هەر لە خێر و خۆشی و شادیدا ڕایانبوارد هەتا سوپای مەرگ بە سەریدا دان و لە یەکی بلاو کردن.

### چیرۆکەکانی هەنبانەی عەلی عەجەم

"یەکێکی دیکە لەو چیرۆکانەی کە لە زمان هاروونەڕڕەشیدی عەباسییەوە گێڕدراوەتەوە ئەوەیە کە شەوێک لە شەوان خەلیفە هاروونەڕڕەشید خەوی دەزڕێ و بانگی جەعفەری وەزیر دەکا. کە وەزیر دێتە لای، پێی دەڵێ: 'جەعفەر، ئەمشەو دڵم گیراوە و خەوم لێ ناکەوێ، فکرێکم بۆ بکەوە بەشکو کەمێک ئارام بمەوە.' جەعفەر گوتی: 'من هاوڕێیەکم هەیە، عەلی عەجەم پێ دەڵێن. ئەوەندەی چیرۆک و قسەی خۆش و گاڵتە و جەفەنگ لە لایە ئیستێکت لە لا بێ خەمت لە دڵدا ناهێڵێ.' خەلیفە فەرمووی: 'بچنە شوێنی و بیهێنن.' وەزیر هاتە دەرەوە و چوو عەلی عەجەم بانگ کرد. کاتێک عەلی هات، وەزیر گوتی: 'خەلیفە بانگت دەکا.' عەلی عەجەم گوتی: 'باشە، بە سەر چاو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی دووسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

کوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی عەجەم گوتی: 'باشە بە سەر چاو.' ئیدی لەگەڵ وەزیر چوون بۆ لای خەلیفە. کە گەیشتنە لای خەلیفە، خەلیفە فەرمووی کرد دانیشی. پاشان پێی گوت: 'کاک عەلی، ئەمشەو دڵم زۆر تەنگە و بیستوومە کە جەنابت نەقڵ و نەزیلەی زۆر خۆش دەزانی. گوتم ئەمشەو کەمێکمان قسە بۆ بکەی—وا بێ خەم و خەفەت لە دڵم بڕەوێنی و تۆزێک سەرقاڵ بین.' عەلی گوتی: 'گەورەم خەلیفە، لەو شتانەی بە چاوی خۆم دیتوومە بۆت بگێڕمەوە؟ یان ئەو شتانەی بیستوومن بۆت بگێڕمەوە ؟' خەلیفە گوتی: 'لەوانەی بە چاوی خۆت دیتووتن بۆم بگێڕەوە.' عەلی گوتی: 'خەلیفە، ساڵێکیان هەر لەو بەغدایەوە چووم بۆ سەفەر و غوڵامێکیشم لەتەک خۆم برد. ئەو غوڵامە هەنبانەیەکیشی پێ بوو. کاتێک گەیشتینە ئەو شارەی تر، لە جێیەک دانیشتم و دەستم کرد بە کڕین و فرۆشتن. تماشام کرد کوردێکی ناجسنی شەڕفرۆش هێرشی کردە سەرم و هەنبانەکەی لێ ستاند و وتی: 'ئەو هەنبانەیە هەنبانەی خۆمە و ئەوەی تێشیدایە هی خۆمە.' منیش هاوارم کرد: 'هۆو موسوڵمانینە، فریام کەون لە چنگ ئەو ستەمکارە ڕزگارم کەن.' خەڵک گوتیان: «پێکەوە بچن بۆ لای قازی و ملکەچی بڕیاری قازی بن.» ئیدی ئێمەش چووین بۆ ماڵی قازی. کە چووینە لای قازی، قازی گوتی: 'بۆ هاتوون؟ چ کارێکتان هەیە؟' گوتم: 'ئەو دووانەمان پێکەوە کێشەمان هەیە. هاتووین دادمان بکەی.' قازی گوتی: 'کامتانە داواکارن؟' ئەو کابرایە سنگی خۆی وە پێش دا و گوتی: 'خودا دەست بە باڵی قازییەوە بگرێ، ئەو هەنبانەیە و هەرچی تێیدایە هی منە.' قازی گوتی: 'ئەو هەنبانەیەت کەی لێ گوم بووە؟' کوردەکە وتی: 'لە دوێنێوە دیار نییە. ئەمشەو لە تاوا خەوم لێ نەکەوتووە.' قازی گوتی: 'جا ئەگەر ئەو هەنبانەیە هی تۆیە، دا پێم بڵێ چی تێدایە؟'

" ئیدی ئەو پیاوە گوتی: 'لەو هەنبانەیەدا میلگەلێکی زێوین، کلی عەنبەرین، شەمعدانی زێڕ، گۆزەی بلوورین، باڵاخانەی نەخشێنراو، فەڕشگەلی گرانبایی و ڕەنگاوڕەنگ، قەڵای قایم و سەرچاوەگەلی زوڵاڵ و شیرین، هەمەدان و قەزوێن، وڵاتی هێند و چین و کۆمەڵێک لە کوردە بێ باوڕەکان شایەدی دەدەن کە ئەو هەنبانەیە ئی منە.' قازی بە منیشی گوت: 'فلانی ئەو هەنبانە چی تێدایە و کێت شایەدە؟' ئەمن لە کاتێکدا خەریک بوو جەرگم جەرگی دەخواردەوە و لە داخان خەریک بوو بتەقم؛ چوومە پێشێ و گوتم: "اعزالله مولینالقاضی" (= خودا سەروەری ئێمە قازی بەرز و بەڕێز کا.) ئەو هەنبانەیە ماڵێکی کاول، کانییەکی وشک و بزماری تێدایە. پەتک و تەنبووری تێدایە. ڕووباب و نوقڵ و شەڕاب و سیخی تێدایە. ئەو هەنبانەیە کەبابی تێدایە. کیژی مەمک قوتی تێدایە. هاوڕێ و خۆشەویستان، شاری گەنجە، دەڕوازەی دەروازەکان و کۆمەڵێک لە ئیمانداران و پیر و

کڵ شایەدن کە ئەو هەنبانەیە ئی منە و ئەوەی لە نێویشی دایە هەر ئی منە. لاوە کوردەکە قیژاندی و گوتی: 'قازی ئەو هەنبانەیە بە ناوبانگە. ئەوەی لە ناویشـــیدایە پەســـنکراوە. ئەو هەنبانەیە چۆم و کانی، کۆڕۆم و دار و دەریا، شـــاخ و ڕەوەز، مێرگ و ســـواری زەڕگ بە دەســـت، شـــێری مرۆخۆر و هەزاران هەزار ماری تێدایە. تەڵەی ڕاوچی و کوورەی حەداد، کۆشـــکی شـــەدداد کوڕی عاد و ئێرەمی زاتولعێماد، شـــاری بەســـەرە و بەغدا، هەزار دزی فێڵباز و هەزاران لەشـــفرۆش و گەواد و کۆمەڵێک لە کوردەکان شـــایەدن کە ئەو هەنبانەیە، هەنبانەی منە و ئەوەی لە ناویشـــــیدایە هەر ئی منە.'قازی گوتی: 'کاکە عەلی دەڵێی چی؟' ئەمنیش تووڕە بووم و چوومە پێشتر و گوتم: 'خودا قازی ڕاوەستاو کا!' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ، عەلی عەجەم گێڕاوییەتەوە کە من تووڕە بووم، بە قازیم گوت: 'ئەو هەنبانەی من خەنجەر و نێزە و تیری تێدایە و کەوان و گۆ. گۆچان و زرێ، جلی ژێر زرێ و پیاوی تێدایە. شەڕگە و گۆڕەپانی تێدایە. هەیوان و سەلوی تێدایە. گوڵ و باخی تێدایە. ڕیحانەی تێدایە. دەریای عومان و ڕەی و تەبەرستان، دامەغان و سمنان و قوم و کاشان. لوبنان و ئیسفەهان و بەرینی ئازەبایجان و سامانی خوراسان، کۆمەڵێک لە زانایان و لە خوداترسان، وتارخوێنان و قەشە و پارێزکاران شایەدن کە ئەو هەنبانەیە هەنبانەی منە. ئەوەی لە ناویشیدایە هەر ئی منە. کوردەکە لە قسەکەی من ڕقی هەستا و کەمێک چووە پێشێ دانیشت و گوتی: 'قازی، ئەو هەنبانەیە چیمەنی تێدایە. چڕۆ و گوڵزاری تێدایە. بووژانەوە و بولبولی تێدایە. هەزاران چەنگی تێدایە. دووزەلە و مەیخانەی تێدایە. مەیفرۆش و شاری کووفە و بەسرە و سەبزەوار و ئەوانی تر، شەڕەنگێزان شایەدن کە ئەو هەنبانەیە، هەنبانەی منە. ئەوەی لە ناویشیدایە هەر ئی منە.'

ئەمن کە ئەو قسەیەم بیست تووڕە بووم. گوڕاندم گوتم: 'قازی ئەو هەنبانەیە کێوی تێدایە. دەریا و قەڵای تێدایە. کۆشک و کۆیلە لووسکەی تێدایە. حۆری و سازی تێدایە. تەنبوور و دیجلەی تێدایە. فورات و بەلخی تێدایە. ئەو هەنبانەیە هەراتی تێدایە. هەیوانی ئەنووشیرەوان و وڵاتی سولەیمانی تێدایە. لە پێتەختی کیانەوە بگرە هەتا دەشتی نوعمان و سەرزەوییەکانی سوودان و هێند و شاری عەسقەلانی تێدایە. کاتێک قازی ئەو قسانەی بیست، تووڕە بوو گوتی: 'ئێوە یەک لە یەک هیچوپووچتر و داوێنپیسترن. ئەو هەموو درۆ و دەلەسەیە هەر لەبەر دوژمنایەتییە دەنا چۆن لە دوورگەگەلی خالیدانەوە هەتا سەرسنووری ڕۆژئاوا لەوێوە هەتا هەرات و فارس و خوراسان، لە چین هەتا وەڵاتی دێو و مێردەزمەکان، لە ئەرزەوە هەتا ئاسمانەکان خۆ دونیا جێگای ئەو هەمووە نابێتەوە کە ئێوە دەیڵێن. بۆ ئەو هەنبانەیە حەوت ئاسمانەکەیە؟ بۆ مەگەر ئەو هەنبانەیە عەرشی خودایە؟ بۆ ئەو هەنبانەیە دەشتی مەحشەرە؟ بۆ ئەو هەنبانەیە ڕۆژی پەسڵانە؟ ئینجا فەرمانی دا زارکی هەنبانەکە بکەنەوە. کە کردیانەوە سەیریان کرد لە دوو نانی جۆ و مستێک زەیتوون زیاتر هیچی تری تێدایە نییە. ئیدی قازی هەنبانەکەی بۆ حەوا داین و لە کۆڕەکە دەری کردین. عەلی عەجەم گێڕاوییەتەوە کە کاتێک خەلیفە ئەو بەسەرهاتەی لە من بیست ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو بە پشتدا بکەوێ. خەڵاتێکی باشی کردم.'

**بەسەرهاتی هاڕوون و کەنیزێک**

"یەکێکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە جەعفەری وەزیر بەرمەکی شەوێک لەگەڵ هاڕوونەڕڕەشید خەریکی بادەنۆشی بوون. هاڕوونەڕڕەشید کە مەست بوو، گوتی: جەعفەر، بیستوومە دەڵێن کەنیزێکی جوانت کڕیوە. من بێ ئەوەی ببینم هۆگری بووم. پێم بفرۆشەوە.' جەعفەر گوتی: 'نایفرۆشمەوە.' خەلیفە گوتی: 'بە دیاری بمدەیە.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، بە دیاریش نایدەم.' ئیدی هاڕوون گوتی: 'هەر سێک تەڵاقی زبێدەم کەوتبێ یان بە دیاری یان کڕین دەمدەیەی.' جەعفەر گوتی: 'هەر سێک تەڵاقی خێزانم کەوتبێ نە بە فرۆش و نە بە دیاری ناتدەمێ.'

"وا بوو کاتێک هاتنەوە سەر خۆ، سەرخۆشییەکە بەری دان، زانییان کە چۆن خۆیان تووشی سەرئێشە کردووە و کارەکە هەر وا بە ئاسانی جێبەجێ نابێ. کەمێکیان بیر کردەوە و خەلیفە گوتی: 'ئەو کارە بە کەس جێبەجێ نابێ بە ئەبوویوسف نەبێ.' ئەبوویوسفیان بانگ کرد. ئەبوویوسف بە لەز سواری هێسترەکەی بوو، بە خزمەتکارەکەی گوت: 'توربێنەکە[1] لەگەڵ خۆت بێنە با هێسترەکە برسی نەبێ.' خزمەتکارەکە توربێنەکەی هەڵگرت و ڕۆیشتن. کە ئەبوویوسف گەیشتە لای هاڕوونەڕڕەشید، هاڕوون لە بەری هەستا. ئەوی لە پەنا تەختەکەی خۆی دانا. کەس لەگەڵ هاڕوون لەسەر تەختەکەی دانەدەنیشت. ئینجا خەلیفە بە ئەبوویوسفی گوت: 'تۆم بۆ کارێکی گەورە بانگ کردووە.' ئیدی باسی بابەتەکەی بۆ کرد و گوتی: 'نازانم چ بکەم!' ئەبوویوسف گوتی: 'خەلیفە، ئەو کارە لە هەموو شتێک ئاسانترە.' ئەوجار بە جەعفەری گوت: 'نیوەی کەنیزەکەت بە خەلیفە بفرۆشە و نیوەشی بە دیاری بدەیە بۆ ئەوەی هیچ کامتان تەڵاقتان نەکەوێ.' جەعفەر ئاوای کرد و خەلیفەش خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە خەلیفە دەستووری دا: 'هەر ئێستا کەنیزەکە بێنن.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. توربێن: توورەکە جۆی ئەسب، یان توورەکەیەکە وەک تێر کەلوپەلی تێدەخەن.

## كە شەوی دووسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە هارِوونەرِەشید گوتی: 'هەر ئێستا کەنیزە بێنن. زۆری تاسە دەکەم.' کەنیزەکەیان هێنا. خەلیفە بە ئەبوویوســــفی گوت: 'دەمەوێ لەگەڵی جووت بم. من تاقەتی چاوەڕوانی ڕۆژانی پاکبوونەوەی ئە چوار مانگ و دەرِۆژ و شــــتەی ژنانەم نییە. دەبێ بیرێک بۆ ئەوەش بکەیتەوە.'

"ئەبوویۆســــف گوتی: 'یەکێک لە کۆیلەکانی خەلیفە بێنن.' لەرِێوە کۆیلەیەکیـان هێنـا. ئەبوویوســـف بە خەلیفەی گوت: 'ئەگەر مۆڵەت بفەرمووی، ئەو کەنیزە لەو کۆیلەیە مارە دەکەم، پێش ئەوەی لێی بەرێ، تەلاقی دەدا. ئەو دەم بەبێ ئەوەی ئەو ماوەی پاکبوونەوەیە تێپەڕێ، بۆ تۆ حەلاڵ دەبێ.' هارِوونەرِەشـید ئەو فێڵەی لە فێڵەکەی پێشـوو پێ سـەیرتر بوو. خەلیفە مۆڵەتی ئەبوویوسفی دا لە کۆیلەکەی مارە بکا. قازی کەنیزەی لە کۆیلەکە مارە کرد و کۆیلەکەش قەبووڵی کرد. ئینجا قازی بە کۆیلەکەی گوت: 'تەلاقی بدەوە و سەد دینار وەرگرە بۆ خۆت.' کۆیلەک گوتی تەلاقی نادەم و دیناریشم ناوێ.' قازی ژمارەی دینارەکانی بردە سـەر و کۆیلە ڕازی نەبوو. هەتا گەیشتە هەزار دینار. ئینجا کۆیلەکە لە ئەبوویوسـفی پرسـی: 'قازی، تەلاق بە دەست منە یان بە دەست خەلیفەیە؟ ئەبوویوسف گوتی: 'تەلاق بە دەســــت تۆیە.' کۆیلە گوتی: 'بە خودا قەت تەلاقی نـادەم.' ئینجـا خەلیفە توورە بوو، لە ئەبوویوســـفی پرســـی: 'ئێســـتا ئەو گرێیە چۆن بکەینەوە؟.' ئەبوویوســـف گوتی: 'خەلیفە نارِەحەت مەبە، ئەوە شتێک نییە. ئێستا تۆ ئەو کۆیلەیە بەو کەنیزە بفرۆشە.' خەلیفە گوتی: 'ئەوە ئەو کۆیلەیەم بەو کەنیزە فرۆشت بۆ خۆی.' قازی بە کەنیزەکەی گوت: 'قەبووڵی کە.' کەنیزەکە قەبووڵی کرد. ئەوجارر قازی گوتی: 'چونکە ئەو کۆیلەیە بوو بە ماڵ و کۆیلەی کەنیزەکە، مارەبرِینەکە هەڵوەشـاوەتەوە و بەپێی شـەرعی ئیسـلام ناتوانێ مێردی ئەو بێ، دەبێ لێک جودا ببنەوە.' ئیدی خەلیفە لە بەری هەســـتا و گوتی: 'لە هیچ زەمانێکدا قازی هێندە زانا و تێگەیشـتوو نەبووە!' پاشـان خەلیفە چەند سـینی زێرِی دا بە ئەبوویوسـف. لێشـی پرسـی: 'هیچت هەیە ئەو زێرِانەی تێ کەی؟' ئەبوویوسف کەمێک بیری کردەوە و توربێنی هێسـترەکەی بیر هاتەوە، داوای کرد. توربێنەکەیان بۆ هێنا و زێرِەکانی تێ کرد و گەراوە ماڵەکەی خۆی."

### چیرۆکی لاوی جوامێر

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێرِنەوە: ڕۆژێک چەند کەسـێک کورِێکی ژیری جوانچاکیان هێنا بۆ لای میر خالیدی کوڕی عەبدوڵلای قوسـەر کە میری بەسـرە بوو. میر

خالید لێی پرسین: 'چی بووە؟' ئەوان گوتیان: 'ئەو کوڕە دزە و دوێ شەو لەماڵی خۆماندا گرتوومانە.' کە خالید لەو کوڕەی ڕوانی، سەری لە جوانچاکی و پاک و خاوێنی کوڕە سوور ما. کە ئاوای دیت خەڵکەکەی ناردە دەرەوە و کوڕەی بانگ کردە لای خۆی و لێی پرسی: 'بۆم بگێڕەوە چی بووە.' کوڕە وەڵامی داوە، گوتی: 'ئەو خەڵکە ڕاست دەکەن، کارەکە بەو جۆرە بوو کە گێڕایانەوە.' خالید لێی پرسی: 'تۆ ئەو هەمووە جوانی، بۆ کاری ئاوات کرد؟' کوڕە گوتی: 'تەماحی ماڵی دنیا هانی دام. لە دەست قەزاوقەدەر ناتوانی ڕاکەی.' خالید پێی گوت: 'دەک دایکت لەسەر تەرمت دانیشێ بۆ ئەو کارەت. ئەوە کەس نەبوو نەهێڵێ دزی بکەیت و پێت بڵێ تۆ بەو هەموو جوانی و ڕێکوپێکی و قۆزییەتەوە کاری ئاوات لێ نایە؟!' کوڕە گوتی: 'گەورەم، لەو قسانە گەڕێ و بەپێی فەرمانی خودا و شەرعم لەگەڵ بکەن. من شیاوی ئەوەم و خودا ستەم لە کەس ناکا.' میر ماوەیەک چوو لە فکرەوە. سەری لە کاری ئەو کوڕە سوور مابوو. ئەوجارر بە گەنجەکەی گوت: 'ئەو دانپێدانانەی تۆ لە لای ئەو خەڵکە بە گومانی خستم، دەنا من قەت باوەڕم نەدەکرد تۆ چووبیت بۆ دزی. ڕەنگیشە تۆ شتێکی دیکەت لە بن سەردا بووبێت. ئەگەر شتێکی دیکە لە گۆڕێدایە بە منی بڵێ.' کوڕە گوتی: 'ئەمیر جگە لەوەی دانم پێدا ناوە، هیچ شتێکی دیکەت بە دڵدا نەیە. من هیچ شتێکی دیکەم نییە، باسی بکەم جگە لەوەی چوومە ماڵەکەیان بۆ دزی. ئەوانیش منیان دیت. گرتیانم و هێنایانمە خزمەت جەنابت.' کاتێک خالید قسەکانی کوڕەی بیست، فەرمانی دا بردیانە بەندیخانە. جاڕچی لە نێو شاری بەسرەدا جاڕیان کێشا: 'هەرکەس پێی خۆشە بێ بۆ تەماشای قرتاندنی دەستی کەسێک کە دزی کردووە، سبەینێ بێتە فڵانە شوێن.'

"کوڕەیان خستە بەندیخانەوە و زنجیریان لە دەست و پێی کرد. کوڕە ئاخێکی هەڵکێشا. ڕوندکی لە چاو هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

ئەوە ئەڤین نییە لە دڵەوە بێتە سەر زمان
ئەڤیندار نییە کەسێک لە دەست ئەڤین بکا فغان
ئەڤیندار ئەو کەسەیە دڕکی ڕێگای لا گوڵزار بێ
خۆشەویستی بێخەوشی مەتاراسای[1] بۆ دڵدار بێ

"کاتێک بەندیوانەکە گوێی لەو شێعرە بوو، چوو بۆ لای میر خالید و پێی ڕاگەیاند کە ئەو لاوە ئەویندارە. کە بوو بە شەو و پەردەی تاریکی بەسەر وڵاتدا کشا. میر ناردی بەدوای کوڕەکەدا و قسەی لەگەڵ کرد. زۆر زانا و ژیر و وێژەوان و وریای هاتە بەرچاو.

---

١ . مەتار: دایک، دالک.

فەرمووی: 'خواردنی بۆ بێنن.' دوای ئەوەی کوڕە خواردنەکەی خوارد و ماوەیەک لەگەڵ میر خالید وتووێژی کرد. لە کۆتاییدا میر خالید گوتی: 'ئەگەر سـوزی خەڵک کۆ بووەوە، قازی هات و لێی پرسـیت: 'دزیت کردووە یان نا؟' خێرا دانی پێدا مەنێ. قسـەیەک بکە بەشـکوو لە دەسـتپەڕاندن ڕزگارت بێ. پێغەمبەر(د ـــ س) فەرموویەتی: 'تا دەتوانن بە هێنانەوەی گومان پاکانە بۆ خۆتان بکەن بەشکوو خۆتان لە سزاکان بپارێزن.' دوای ئەوە میر خالید ئەوی ناردەوە بەندیخانە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی دووسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، میر خالید گەنجەکەی ناردەوە بۆ بەندیخانە. ئەو شەوە هەتا بەیانی ـە بەندیخانە ماوە. کە ڕۆژ بووەوە، خەڵک بۆ سەیری ئەو ڕووداوە لە شوێنی دیاریکراو کۆ بوونەوە. خەڵکی بەسرە بە پیر و کاڵ و ژن و منداڵەوە هەموو هاتبوون بۆ سەیری ئەو کوڕە. میر خالیدیش لەگەڵ گەورە گەورەکانی بەسرە سوار بوون هاتنە ئەو شوێنە و قازییشیان بانگ کرد. ئینجا گوتیان: 'ئەو کوڕە بێنن.' خێرا ئەو کوڕەیان بە دەست و پێ بەستراوی هێنا. کەس نەبوو ئەو کوڕە ببینێ و دەست نەکا بە گریان. ژنان بە دەنگی بەرز شین و ڕۆیان بوو. قازی داوای لە ژنان کرد بێدەنگ بن. ئینجا بە لاوەکەی گوت: 'ئەوانەی تویان گرتووە، پێیان وایە کە تۆ چوویتەتە ماڵی ئەوان و شتت لێ دزیون. بەڵام گەنجۆ، ڕەنگە تۆ بە ڕادەی پێویستت نەدزیبێ!' ئەو کوڕە گوتی: 'من بە ڕادەی پێویست دزیومە.' قازی گوتی: 'ڕەنگە ئەو ماڵە بەشی تۆشی تێدا بێ!' ئەو کوڕە گوتی: 'نەوەڵڵا، هەمووی هی خۆیانە، من هیچ مافم بەسەریانەوە نییە.' ئیدی خالید قینی هەستا و بۆخۆی چوو بۆ لای کوڕەکە و بە قامچی لێی دا و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

گەر بێتوو گەوجێک ڕێنوێنی بکەی
لە لای ئەو گەوجە تۆ پووشێک ناکەی

"پاشان فەرمووی: 'دەستی بپەڕێنن.' ئیدی میرغەزەب دەستی دا تەورەکە و خۆی ئامادە کرد. ئەو کوڕەش دەستی لەسەر کۆلکەکە دانا. میرغەزەب تەورەکەی هەڵهێناوە لە دەستی بدا و لە مەچەکییەوە لێی کاتەوە. کە لە ناکاو کیژۆڵەیەک بە هەڵەداوان لەناو خەڵکەکەوە هاتە دەرێ. کراسێکی کۆنە و چڵکنی لە بەردا بوو. قیژاندی و خۆی بەسەر کوڕەکەدا دا. لەو جەنگەیەدا پەچەکە لە ڕووی داماڵرا و ڕوخساری وەک مانگی دەرکەوت. خەڵک لە ڕووی میرخاسیانەوە پشتیوانییان لە کوڕەکە کرد. خەریک بوو لەبەر ئەو بابەتە پشێوییەک ساز بێ. لێرەدا کچۆڵەکە بە دەنگێکی بڵند گوتی: 'گەورەمان، ئەمیر، تکایە پەلە مەکەن و دەست ڕاگرن. دەستی مەپەڕێنن تا ئەو نووسراوەیە نەخوێنیتەوە.' ئیدی کەنیشکەکە نووسراوەکەی دایە دەست میر خالید. میر خالید نووسراوەکەی کردەوە و دیتی ئەو شیعرەی تێدا نووسرابوو:

ئەمیر مزەففەر ئاگادار بە، ئەو کوڕە دز نییە
ئەو لاوێکی ئەڤیندارە و دڵی منی بردییە
سەیر نییە حازر بێ بۆ من دەستی لەدەست بدا

ئەو کە لەڕێگەی مندا سەروسامانی لەدەست دەدا
لەوێ بوو، نەک بۆ دزی کە ئەو دانی پێدا ناوە
درکاندنی خۆشەویستی شوورەیە لەو ناوە

"کە خالید ئەو شیعرەی خوێندەوە، لە ناو خەڵکەکە چووە دەرێ و بە تەنیا ڕاوەستا. کچەکەی بانگ کرد و لێی پرسی: 'چی بووە؟ بۆم بگێڕەوە.' کیژە گوتی: 'ئەو کوڕە منی خۆش دەوێ. هاتبوو بۆ ژوان. بۆ ئەوەی من ئاگادار بکاتەوە، زیپکە بەردێکی لە دەرگاکە دا. بابم و براکانم لە ماڵ بوون و گوێیان لەو دەنگە بوو، خێرا دەرپەڕینە دەرێ. ئەویش بۆ ڕێونکردن دەستی کردبوو بە کۆکردنەوەی کەلوپەلی ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی ئەڤینەکەی ئێمە بە نهێنی بمێنێتەوە. بابم و براکانیشم کە دەیبینن خەریکی دزییە، خێرا دەیگرن و دەیبەن بۆ لای ئەمیر. ئەویش دانی بە دزبوونی خۆیدا نا بۆ ئەوەی هیچ قسەیەک نەیەتەوە سەر من. واتە جوامێرانە خۆی فیدای من کرد و خۆی خستە ئەو مەترسییە گەورەیەوە.'

"دوای ئەوە خالید گوتی: 'بە خودا دەبێ کارێک بکەم ئەو کوڕە ڕزگار کەم و ئاواتی بەدی بێنم.' ئینجا بانگی کوڕەکەی کرد، تەوێڵی ماچ کرد. بانگی باوکی کچەکەشی کرد، پێی گوت: 'کاکە، ئێمە بە تەما بووین دەستی ئەو کوڕە بپەڕێنین، بەڵام خودا ڕەحمی کرد و منی لەو کارە گێڕاوە. ئێستا دەهەزار درەم دەدەم بەو کوڕە لەبەر ئەوە حازر بوو دەستی خۆی لەڕێی ناموسی تۆ و ناموسی کچەکەتدا لەدەست بدا. دەهەزار درەمیش دەدەم بەو کیژەی تۆ، چونکە ئازیانە هات و منی لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە و نەیهێشت تووشی ئەو گوناحە گەورە بم. داوا لە تۆش دەکەم ڕێم بدەی ئەو کیژەی تۆ لەو کوڕە مارە بکەم.' باوکی کچەش ملکەچ بوو. خالید سپاسی خودای کرد. ئاهەنگێکی خۆشی بۆ پێک گەیشتنی ئەو دوو دڵدارە ساز کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، میر خالید ئاهەنگێکی خۆشی بۆ ڕۆژی زەماوەندی ئەو کوڕ و کچە ساز کرد. فەرمانیشی دا بیستهەزار درەمیشیان لەگەڵ کچەکدا برد بۆ ماڵی ئەو کوڕە. خەلکی بەسرەش هەموویان شاد و خۆشحاڵ بوو. من تا ئێستا ڕۆژی ئەوەندە سەیرم نەدیوە، سەرەتای بە شین و گریانەوە بێ و کۆتاییشی ئاهەنگ و شادییەوە بێ."

### چیرۆکی دڵاوایی جەعفەری بەرمەکی

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کاتێک خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید جەعفەری بەرمەکی وەزیری کوشت، فەرمانی دا: 'ئەوەی بۆ جەعفەر بگری یان شینی بۆ بگێڕێ، بیکوژن.' بەو جورە پێشیان بە خەڵک گرت.

"بە ڕێکەوت عەرەبێکی دەشتەکی خووی وا بوو کە هەموو ساڵێک قەسیدەیەکی لە پەسنی جەعفەردا دەهۆنییەوە و دەهاتە سەردانی. جەعفەریش هەزار دیناری دەدایە. ئیدی عەرەبە دەڕۆیشت هەتا ساڵێکی دیکە کاتی خۆی بە دەستی پڕەوە دیسان دەگەڕاوە لای جەعفەر. ئەو ساڵە وەک ساڵانی پێشوو هاتەوە. بەڵام کاتێک گەیشتە بەغدا، بیستی جەعفەر کوژراوە. چووە ئەو شوێنەی جەعفەری لێ کوژرا بوو، وشترەکەی یخ دا، دانیشت تێر گریا. شێعرەکەی لە جێی خۆی خوێندەوە. بەدەم گریانەوە خەوی لێ کەوت. خەونی بە جەعفەرەوە دیت. جەعفەر هاتە خەونییەوە و پێی گوت: 'تۆ خۆت خستووەتە زەحمەتەوە و شێعرت بۆ من هۆنیوەتەوە و هاتوویتە لای من. ئێستا کە من نەماوم، بچووە بۆ بەسرە، کەسێک بەو ناو و نیشانە بدۆزەرەوە. کە دۆزیتەوە، سڵاوی منی پێ بگەیەنە و بڵێ: 'جەعفەر دەیگوت لە دەسەڵاتداریتی پاقلە هەزار دینارت بداتێ.' کاتێک دەشتەکییەکە خەبەری بووەوە، بەرەو بەسرە کەوتە ڕێ. لەوێ بە پرسیار کابرای دیتەوە. پەیامەکەی جەعفەری پێ گەیاند. کابرا کە ئەوەی بیست، یەکبەخۆی هاواری کرد و دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە گریا خەریک بوو گیانی دەرچێ. دوایە زۆری کابرا بەخێرهاتن کرد و هەتا سێ ڕۆژان بەپێی دابی خۆیان میوانداریان کرد و ئەوەندەی لە دەستی هات، خزمەتی کرد. دوای سێ ڕۆژ دەشتەکییەکە ویستی بگەڕێتەوە. ئەو کابرایە هەزار و پێنجسەد دیناری دایێ. پێشی گوت: 'هەزار دیناری بە فەرمانی جەعفەرە، پێنجسەد دیناریشی هی خومە دەتدەمێ. لەمە بەدوا هەموو ساڵێک هەزار و پێنجسەد دینارت لە لای من هەیە. کە ساڵ نوێ بووەوە، وەرە زێڕی خۆت وەرگرە.'

"ئیتر دەشتەکییەکە ڕووی لە بازرگانەکە کرد و گوتی: 'کاکە، تۆخودا ڕووداوی ئەو

پاقلەیەم بۆ بگێڕەوە.' بازرگانەکە گوتی: 'من سەرەتا زۆر زۆر هەژار و دەستکورت بووم. لە کۆلانەکانی بەغدادا دەگەڕام. پاقلەی کوڵیوم دەفرۆشت و بەو جۆرە بژیوی ڕۆژانەم پەیدا دەکرد. ڕۆژێکی سارد کە بارانیش دەباری، بە قابڵەمە پاقلەوە وەدەر کەوتم. جلوبەرگێکی وام نەبوو بە کاری باران و سەرما بێ، دامپۆشێ و بمپارێزێ. بەدەم لەرز و سەرماوە بەنێو قوڕ و لیتەدا دەڕۆیشتم. بە ڕێکەوت لە بەردەرکی کۆشککی جەعفەری وەزیرەوە تێدەپەڕیم. جەعفەر کە لە بەر نوای کۆشکەوە چاوی پێم دەکەوێ، بەزەیی پێمدا دێت و کەسێک بە شوێنمدا دەنێرێ. خزمەتکارەکە منی بردە لای جەعفەر. لەو کاتەدا ژن و کەسە تایبەتەکانی جەعفەر لە لای ئەو دانیشتبوون. کە چوومە لای جەعفەر، گوتی: 'ئەو پاقلەیەی پێتە، هەمووی بەوانە بفرۆشە.' منیش دەفرێکی پێوانەم پێ بوو، یەکی دەفرێکم بۆ تێ کردن. هەر کام لەوانیش دەفرەکەیان بۆ پڕ دەکردم لە زێڕ. کە پاقلەکەم تەواو کرد. زێڕەکانم کۆ کردنەوە. لە دواییدا جەعفەری بەرمەکی بە منی گوت: 'دا بزانە هیچی تیا ماوە؟' من سەیرم کرد و پێکەنیم. گوتم: 'ئەو دەنکەی تیا ماوە.' جەعفەر ئەو دەنکە پاقلەیەی لە من وەرگرت و دوو لەتی کرد. لەتێکی هەڵگرت بۆ خۆی و لەتێکیشی دا بە یەکێک لە ژنەکانی و پێی گوت: 'ئەو نیوە باقلایەی بە چەندە دەکڕی؟' ئەو ژنە گوتی: 'بە دوو بەرابەری ئەو زێڕانەی داویانەتێ.' من سەرم لەو قسەیەی سووڕ ما. لە دڵی خۆمدا دەمگوت: 'شتی وا هەر نابێ.' ئیدی هەر وا بە واقوڕماوییەوە لە فکردا بووم کە ئەو ژنە بە کەنیزەکانی گوت و دوو هێندەی زێڕەکانی خۆمیان زێڕ بۆ هێنام. دوایی جەعفەر گوتی: 'من ئەو لەتەی خۆم بە دوو بەرابەری تەواوی ئەو زێڕەی ئێستا دەکڕم.' ئیدی دەستووری بە خزمەتکارەکانی دا زێڕەکەیان بۆ هێنام.

" 'کە زێڕەکانم هەموو کۆ کردەوە و قابلەمەکەم پڕ بوو لە زێڕ. دەستم دا قابلەمەکەم و مالاواییم لێ کردن. گەڕامەوە بۆ بەسرە. بەو ماڵە دەستم کرد بە بازرگانی. ماڵێکی زۆرم کۆ کردەوە. ئەگەر هەموو ساڵێک هەزار دینار بۆ جەعفەری بەرمەکی بکەمە خێر، پێمەوە دیاری نادا. ڕەحمەتی خودا لە ڕۆحی پاکی بێ.'

### چیرۆکی هاڕوونەڕڕەشید و ئەبوومحەممەدی تەپلۆس

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە هاڕوونەڕڕەشید ڕۆژێک لەسەر تەختی خەلافەت دانیشتبوو. یەکێک لە پیاوەماڵییانە پەیدا بوو. تاجێکی ڕازاوە بە زێڕی سوور و دوڕ و گەوهەری گرانبایی هێنا. کڕنۆشی برد و گوتی: 'خەلیفەی مەزن، ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی دووسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

دنیازاد بە شـەهرزادی گوت: "خوشـکێ چیرۆکەکەمان بۆ بگێڕەوە." شـەهرزاد گوتی: 'ئەگەر خاوەنشکۆ ڕێم بدا، دەیگێڕمەوە." پاشا گوتی: "بیگێڕەوە."

شـەهرزاد گوتی: "خاوەنشـکۆ، ئەو پیاوەماڵییە گوتی: 'خەلیفەی مەزن، زبێدە خانم سـڵاوی لێ دەکردی و دەیگوت: 'ئەو تاجەم دروست کردووە، ئەو گەوهەرانم لێ داوە. ئێستا پێویستیم بە گەوهەرێکی گەورە هەیە لەسەر لوتکەکەی دەدەم. نێو گەوهەرەکانی خۆشم گەڕام شـتێکی وام نەدیتەوە، بە کاری ئەوێ بێ.' ' خەلیفە فەرمووی: 'بگەڕێن گەوهەرێکی تـایبەت کە کـارەکەی زبێـدە خـانمی پێ جێبەجێ بێ، بۆی ببیننەوە.' خەزێنەدارەکان زۆر گەڕان شتێکی وایان نەدیتەوە. ئێتر بە خەلیفەیان ڕاگەیاند.

"خەلیفە زۆری پێ نـاخۆش بوو. لە دڵی گران هـات. گوتی: 'جا وەرە من سـەرۆکی پاشـاکانی جیهان بم، کەچی گەوهەرێکی ئاوام دەسـت نەکەوێ!' ئیدی ڕقی هەسـتا و بە خزمەتکارەکانی گوت: 'بچن بۆ لای بـازرگـانەکـان.' خزمەتکـارەکـان گوتیـان: 'گەورەم، بـازرگـانەکـان عەرزت دەکەن کە گەوهەری ئـاوا وەگیر نـاکەوێ، مەگەر لە لای پیـاوێکی دانیشتووی بەسرە کە ئەبومحەممەد تەپلۆسی پێ دەڵێن.'

"ئێتر خەلیفە جەعفەری بەرمەکی وەزیری بـانـگ کرد و پێی گوت: 'نـامەیەک بۆ میر محەممەدی زیبەدی والی بەسرە بنووسە. پێی بڵێ: 'میر محەممەد، ئەبوومحەممەد تەپلۆس بەرێی ئێرە بکە.' ' لەڕێوە جەعفەر نامەکەی نووسی و بە مەسروری شیروەشێندا ناردی. مەسروور گەیشتە بەسرە و چووە لای میر محەممەدی والی. میر محەممەد خۆشحاڵ بوو. ڕێزێکی زۆری لە مەسـروور گرت. دوای ئەوە نـامەکەی خوێندەوە و زانی چ باسـە. مەسـرووری لەگەڵ دەسـتەیەک لە هاوڕێکانی نارد بۆ لای ئەبومحەممەد تەپلۆس. ئەوان چوونە بەردەرگای ماڵی ئەبوومحەممەد و لە دەرگایان دا. خزمەتکاری ئەبومحەممەد هاتە دەرێ. مەسـروور گوتی: 'بە خاوەنەکەت بڵێ هارونەڕەشـید داوای کردووە بچێتە لای.' خزمەتکار دەچێتە ژوورێ و خـاوەنەکەی ئـاگادار دەکـاتەوە. ئەبوومحەممەد هـاتە دەرێ مەسروور و پیاوەکانی والی لەوێ دیت. لەبەر گەورەیی و شکۆی خەلیفە کڕنۆشی برد و گوتی: 'من گوێبەفەرمـانی خەلیفەم. جـارێ وەرنە ژوورەوە.' ئەوان گوتیـان: 'نـایەینە ژوورەوە، کـاتی ئەوەمـان نییە. بەپەلەین، خەلیفە چـاوەڕێیە تۆ بەرینە خزمەتی.' ئیـدی ئەبوومحەممەد گوتی: 'ڕاوەسـتن هەتا خۆم سـاز دەکەم.' ئینجا ئەوان چوونە ژوورەوە. لە ڕاڕەوەکاندا پەردەی پەڕاوێز زێڕین و ڕازاوە بە خشڵی جۆراوجۆر هەڵواسرابوو.

"ئەبوومحەممەد تەپلۆس بە دوو-سـێ کەس لە کۆیلەکانی گوت: 'مەسـروور بەرنە

گەرماوی ماڵەوە.' مەسروور دەرک و دیوار و زەوی گەرماوەکەی دیت کە شتێکی سەیر بوو. تەواوی ماڵەکە زێڕ و زیو و بەردی گرانبایی بوو. ئاوی گەرماوەکە گوڵاوی تێکەڵاو کرابوو. کۆیلەکان لە مەسروور ئاڵان، خێرا کارەکانیان بۆ جێبەجێ کرد. کە لە گەرماو هاتە دەرەوە، کەوای دیبایان لە بەر کرد. ئەوجار مەسروور لەگەڵ هاوڕێکانی چوونەوە لای ئەبوومحەممەد کە لە کۆشکەکەی خۆی لەسەر تەختێکی زێڕین کە بە دوڕ و یاقووت و شتی دیکە ڕازابووەوە، دانیشتبوو. دیوەکەی فەرشی ئاوریشمی تێدا ڕاخرابوو. کە ئەبوومحەممەد چاوی بە مەسروور کەوت، لە بەری هەستا و سڵاو و بەخێرهاتنی کرد. لە پەنا خۆی داینا. فەرمانی دا سفرە ڕاخەن. کە سفرە ڕاخرا، مەسروور لە بەر خۆیەوە گوتی: 'خۆ بە خودا من لە لای خەلیفە سفرەی ئاوام نەدیوە.' لەسەر ئەو سفرەیە هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی لەسەر بوو کە هەر کامەی لەسەر سینییەکی زێڕین دانرابوون. مەسروور گێڕاویەتەوە: 'خواردنەکەمان خوارد و خواردنەوەمان خواردەوە. ئەو ڕۆژەمان بە ئاهەنگ و خۆشی ڕابوارد. ئەوجار بە هەر کام لە ئامادەبووان یەکی پێنج هەزار دیناری دانێ.'

"بۆ ڕۆژی دوایە کەوای شۆڕی سەوزی پەڕاوێزدار بە تانوپۆی زێڕەوەی بە شاندا دان و ڕێزێکی زۆری لێ گرتن. مەسروور پێی گوت: 'لەوە زیاتر ناتوانین بمێنینەوە و ڕوخسەتمان نەماوە، خەلیفە ناڕەحەت دەبێ.' ئەبوومحەممەد تەپلۆس گوتی: 'هەتا سبەینێ ڕاوەستن. سبەینێ ڕێگای سەفەر دەگرینە بەر و دەکەوینە ڕێ.' ئیدی ئەو ڕۆژەش مانەوە. کە ڕۆژی سێیەم هاتەوە، خزمەتکارەکان یەێستریکیان بۆ ئەبوومحەممەدی تەپلۆس بە زینی زێڕینی ڕازاوە بەگەوهەر و خشڵی جوان زین کرد. مەسروور لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بڵێی ئەگەر ئەبوومحەممەد بەو هەموو ماڵەوە بێتە لای خەلیفە، خەلیفە لەبارەی ئەو ماڵەوە لێی نەپرسێتەوە؟' وا بوو مەسروور و ئەبوومحەممەد تەپلۆس ماڵاواییان لە میر محەممەدی والی کرد و لە بەسرە وەدەر کەوتن. هەر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری بەغدا. کە چوونە خزمەت خەلیفە، خەلیفە فەرمووی ئەبوومحەممەد تەپلۆسی کرد کە دانیشی. ئەبوومحەممەد دانیشت. زۆر بە ڕێزەوە دەستی کرد بە قسە کردن و گوتی: 'گەورە و سەروەرم خەلیفە، من دیارییەکم لە قەدەر خۆم نەک لە ئاستی گەورەیی جەنابتدا، هێناوە. ئەگەر ڕێ بدەی، دەیهێنمە خزمەتت.' هاڕوونەڕڕەشید ڕێی پێ دا. ئیدی ئەبوومحەممەد سندووقێکی هێنا کردییەوە. دیاری پاشایانەی لەو سندووقە دەر هێنا. یەکێک لەوانە داری زێڕین بوو کە گەڵاکانی لە زمڕووتی سەوز و میوەکانی لە یاقووتی سوور و زەرد و مرواری سپی چێ کرابوون. خەلیفە بە دیتنی ئەوانە واقی وڕ ما. دوای ئەوە ئەبوومحەممەد سندووقێکی دیکەی هێنا، خێوەتێکی لێ هێنا دەرێ کە لە دیبا چێ کرابوو. سەر خێوەتەکە بە مرواری و یاقووت و زمڕووت و زمڕووتی سەوز ڕازابووەوە. ئەستووندەکانی کە دەر هێنان، سەیریان کرد هەموویان لە دارعوودی هیندی بوون. داوێنەکەی تەواوی لە بەردی

گرانبایی، له یاقووت و زمرووتی سەوز و شتی وا تەنرابوو. دیوی نێوەوەی خێوەتەکە بە وێنەی ئاژەڵی کێوی و ماڵی و مەل و پەلەوەر نەخشێنرابوو. کاتێک هاروونەڕەشید ئەوانەی دیتن، خۆشحاڵ بوو. ئەوجار ئەبوومحەممەد تەپلۆس گوتی: 'خەلیفە، وا بیر نەکەیەوە کە ئەو دیارییانەم لە ترسان یان بە هیوایەکەوە هێناوە. من هەستم کرد کە من کێم تا ئەوانەم هەبێ؟! هەر بۆیە بە شیاوی تۆم زانین و هێنامنە خزمەتت.' ئینجا گوتی: 'ئەگەر خەلیفە ڕازی بێ و ڕێم بدا، هێندێک لە توانایيەکانی خۆم پیشان بدەم.' خەلیفە گوتی: 'هەرچی پێت خۆشە بیکە، با ئێمە تۆزێک سەیر بکەین.' ئیدی ئەبوومحەممەد لێوی جووڵاندەوە و چاوێکی لە کۆشکەکە کرد. دەموودەست کڵاوفەڕەنگییەکان[1] وێک هاتن. ئینجا ئاماژەیەکی دیکەی کرد، وەک خۆیان لێ هاتەوە. دوایی ئاماژەیەکی بۆ چاوی خۆی کرد، کۆمەڵێک کۆشکی دەرگاداخراو هاتنە هەنتەش. ئینجا ڕووی لە کۆشکەکان کرد و قسەی کرد، لەپڕدا لە وەڵامدا مەل و باڵندە دەستیان کرد بە جریوەجریو و خوێندن. خەلیفە لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. سەری سووڕ ما و گوتی: 'ئەو هەموو لێهاتوویی و توانایيەت لە کوێ بوو لە کاتێکدا بیستوومە ناوی تۆ ئەبوومحەممەد تەپلۆسە؟! دەڵێن کوڕی کابرایەکی دەللاکی گەرماو بووی. باوکت هیچی بە میرات بۆ بەجێ نەهێشتووی.' ئەبوومحەممەد گوتی: 'گوێ لە بەسەرهاتی من بگرە ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. کولاوکەی گەورە جا بۆ ئەوەی ڕووناکی بداتە ژوورێ و با و بارانیش تێی نەکا، بە شووشە دادەپۆشرێ.

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەبوومحەممەد بە خەلیفەی گوت: 'خەلیفە، گوێ لە بەسەرهاتی من بگرە، چونکە شتێکی زۆر سەیرە.' هاروونەڕڕەشید گوتی: 'بۆم بگێڕەوە، بزانم چی بووە.'

"ئەبوومحەممەد گوتی: 'خەلیفەی زەمان، ئەوەی کە بە من دەڵێن تەپلۆس یان دەڵێن بابم لە گەرماو دەللاک بووە و هیچ ماڵی بۆ من بەجێ نەهێشتووە، ڕاستە. من بە منداڵی ئەوەندە تەپلۆس بووم کە ئەگەر لە هاویندا خەوتبام و تاوم گەیشتبایە، هەتا ئێوارە لەو بەر تاوە دەخەوتم و نەمدەتوانی هەستم بچمە بەر سێبەرێک. پازدە ساڵم ئاوا تێپەڕاند. دوای ئەوە باوکم مرد و هیچی بۆ من بەجێ نەهێشت. دایکم لە ماڵان کاری دەکرد و نانیان دەداینێ. منیش لەسەر لاتەنیشتێک کەوتبووم و نەدەجوولامەوە.

" 'بەرێکەوت ڕۆژێک دایکم پێنج درەمی زیوی دامێ و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بیستوومە دەڵێن شێخ ئەبوومزەففەر بە تەمایە بچێ بۆ چین. شێخ ئەبوومزەففەر پیاوێکە لە بیری هەژاران و دەستکورتاندایە. بچووە ئەو پێنج درەمەی بدەرێ و تکای لێ بکە بەشکو بایی ئەو پێنج درەمە لە چین شتت بۆ بکڕێ و لێرە بیفرۆشیتەوە، بەڵکو خودا بکا شتێکی لێ پەیدا بکەی.' من تەپلۆسیم کرد و لە جێی خۆم نەبزووتم و هەڵنەستام بچم. دایکم سوێندی خوارد، گوتی: 'ئەگەر هەڵنەستی بچی، شەرت بێ منیش تازە کارم پێت نییە. ئەگەر لە ژوورەوەدا لە برسان بمری سەرت نادەم و نان و ئاوت بۆ ناهێنم.' کە زانیم دایکم ئاوا بە ڕاشکاوی سوێندی خوارد. دەشمزانی دایکم سوورە لەسەر قسەکەی، گوتم: 'بە خودا لە ژوورەوەدا لە برسان دەمکوژێ.' ناچار بووم بە دایکم گوت: هەڵمستێنێ با دانیشم. دایکم هەڵیستاندمە سەر قون. دەستم کرد بە گریان. کەمێک گریام. پاشان گوتم، پێڵاوەکانم بۆ بێنێ. ئەوجار گوتم: 'پێڵاوەکان بکاتە پێم.' دایکم کەوشەکانی لە پێ کردم. ئیجا گوتم: 'پیلم بگرە با هەستمە سەرپێ.' پیلی گرتم و هەڵیساندمەوە حەوا. گوتم: 'لەنگەرێکم بگرە با بڕۆم.' لەنگەری گرتم. ئیدی من هەر وا بەدەم گریانەوە بە لۆژەلۆژ دەڕۆیشتم و داوێنەکەم لە لاقم دەئالا. هەتا گەیشتینە قەراخ دەریا. شێخم دیتەوە و سلاوم لێ کرد. گوتم: 'مامە ئەبوومزەففەر تۆی؟' ئەویش گوتی: 'ئەرێ، ئەبوومزەففەر خۆمم.' گوتم: 'زەحمەت نەبێ پێنج درەمەم لێ وەرگرە و لە چین کەمێک کەلوپەلم بۆ بکڕە، بەشکو خودا قازانجێکم بۆ بنێرێ.' شێخ ئەبوومزەففەر لە هاوڕێکانی پرسی: 'ئەرێ ئەو گەنجە دەناسن؟' گوتیان: 'بەلێ، ئەوە ئەبوومحەممەد تەپلۆسە. ئێمە قەت نەماندیوە ئاوا لە ماڵ بێتە دەرەوە.' ئەبوومزەففەر گوتی: 'ڕۆڵە گیان، درەمەکانم بۆ بێنە و پشت بە خودا ببەستە.' ئیدی شێخ درەمەکانی لێ وەرگرتم و بیسمیللای کرد. دوای ئەوە لەگەڵ دایکم گەڕامەوە ماڵەوە.

ئەبوومزەففەریش لەگەڵ بازرگانەکانی دیکە وەڕێ کەوتن. ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە وڵاتی چین.

" 'شێخ ئەبوومزەففەر لەوێ دەستی کرد بە کڕین و فرۆشتنی شتەکانی. کە کارەکەی تەواو بوو، لەگەڵ هاوسەفەرەکانی گەڕانەوە. سێ ڕۆژ بوو لەناو کەشتیدا بوون. ڕۆژی چوارەم شێخ ئەبوومزەففەر گوتی: 'پاپۆڕەکە ڕاگرن.' بازرگانەکان گوتیان: 'چی بووە وا فەرمانی ڕاگرتنی کەشتی دەدەی؟' شێخ گوتی: 'لە بیرم چوو کارەکەی ئەبوومحەممەد ئەپلوس جێبەجێ بکەم و، بایی درەمەکانی شتم بۆ نەکڕیوە. لەگەڵم بگەڕێنەوە با شتەکانی بۆ بکڕم، بەشکو خودا خێرێکی بە قسمەت کا.' بازرگانەکان گوتیان: 'کاکە بیکە بۆ خاتری خودا مەمانگێڕەوە. ئێمە ئەو هەموو ڕێگایەمان بڕیوە و بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەری ئەو هەموو مەترسییە تێ پەڕیوین.'

" 'شێخ ئەبوومزەففەر گوتی: 'ناچارم، هەر دەبێ بگەڕێمەوە.' بازرگانەکان گوتیان: 'چەند بەرابەری خێر و قازانجی ئەو پێنج درەمە لە ئێمە بگێڕەوە، بەڵام مەگەڕێوە.' شێخ بەو مەرجە ڕازی بوو. ماڵێکی زیاتر لەوەی خۆشیان بۆ ئەبوومحەممەد کۆ کردەوە. دوای ئەوە کەشتیان ئاژۆت و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دوورگەیەک کە خەڵکێکی زۆری تێدا بوو. لەوێ لەنگەریان خست و بازرگانەکان دابەزین و چوون خەریکی کڕینی گەوهەر و مرواری بوون.

" 'شێخ پیاوێکی خەڵکی ئەو دوورگەیەی دیت لەوێ دانیشتبوو، مەیموونێکی زۆری تێ ئاڵابوون. لەنێو ئەو مەیموونانەدا دەنکێکی ڕووتەڵەی سەرلێشێواویان تێدا بوو، هەر کە ئەو مەیموونانە چاوی خاوەنەکەیان لێ دیار نەدەبوو، تێی دەئاڵان و لێیان دەدا و ئازاریان دەدا و فڕێیان دەدا بۆ لای خاوەنەکەیان. خاوەنەکەشیان هەڵدەستا هەموویانی دەبەستەوە و لێی دەدان.

" 'کە شێخ ئەبوومزەففەر ئەوەی دیت، بەزەیی بەو مەیموونەدا هات. بە خاوەنەکەی گوت: 'ئەو مەیموونەیان دەفرۆشی؟' کابرا گوتی: 'بە چەند دەتەوێ؟' شێخ گوتی: 'کوڕێکی هەتیو پێنج درەمی لە لای منە، هەر بەو پێنج درەمە دەمدەیتێ یان نا؟' کابرا گوتی: 'باشە ئەوە دامێ. هیوادارم کوڕەش خێری لێ ببینێ.' بەو جۆرە شێخ پێنج درەمەی دا بە کابرا و مەیموونەکەی کڕی. خزمەتکارەکانی مەیموونەیان لەنێو کەشتییەکەدا بە شوێنێکەوە بەستەوە. دوای ئەوە چارۆکەیان هەڵدا و کەشتییان ئاژۆت. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دوورگەیەکی دیکە. لەوێش لەنگەریان گرت. مەلەوانەکانی ئەو دوورگەیە دەهاتنە لای بازرگانەکان و پارەیەکیان وەردەگرت و دەچوونە بن دەریاوە و گەوهەر و مرواری و شتی دیکەیان بۆ دەهێنانە دەرێ. کاتێک مەیموونە ئەوەی دیت، بە هەر جۆرێک بوو پەتی

پچڕاند و خۆی لە دەریا هاویشت. ڕۆیشتە خوارێ. شێخ ئەبوومزەففەر گوتی: 'سوبحانەڵلا، لە چارەی ڕەشی ئەو کوڕە هەتیوە. ئەوە خۆ ئەوەش تێدا چوو.'

" 'شێخ دەستی لە مەیموونەکە شۆرد و دانیشت. کاتێک مەلەوانەکان هاتنەوە دەرێ. مەیموونەکەش لەگەڵ ئەوان هاتەوە دەرێ و هەردووک دەستی پڕ بوون لە گەوهەری گرانبایی. گەوهەرەکانی بۆ شێخ هاویشت. شێخ واقی وڕ ما و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو مەیموونە نهێنییەکی گەورەی لەپشتەوەیە!' لەو دوورگەیەش ڕۆیشتن و کەشتییان ئاژوت هەتا گەیشتنە دوورگەی قولان[1]. خەڵکی ئەو دوورگەیە هۆزێکی ڕەشپێست بوون، گۆشتی مرۆڤیان دەخوار. کاتێک قولەکان زانییان ئێمە چووین. لە فوودانەی چەرمیان تووڕاند و یەکتریان ئاگادار کردەوە. بەرەو کەشتییەکەی ئێمە هاتن و کەسانی نێو کەشتییەکەی ئێمەیان گرت و بردیاننە لای گەورەکەیان. گەورەکەیان هێندێکیانی سەر بڕی بۆ خواردن. ئەوانی دیکەی خستنە بەندەوە. هەموویان مات و مەلوول لە دیوێکدا بوون هەتا شەو. کە بوو بە شەو، مەیموونەکە هەستا چووە لای ئەبوومزەففەر و دەستی کردەوە. کە بازرگانەکانی دیکە دیتیان ئەبوومزەففەر دەستی کراوەتەوە، گوتیان: 'دەستی ئێمەش بکەوە، بەشکو بە بۆنەی تۆوە خودا ڕزگارمان بکا.' شێخ گوتی: 'ئەوەتان لا ڕوون بێ کە پاش ویستی خودا، ئەو مەیموونە بووە هۆی ڕزگاری من.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. قولان کۆی (قولە: زەنگی، ڕەشپێست)

# که شەوی سێسەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'شێخ ئەبوومزەففەر بە بازرگانەکانی گوت: 'ئەو مەیموونە منی ڕزگار کرد. منیش هەزار دینارم نەزری ئەو مەیموونە کردووە.' بازرگانەکان گوتیان: 'ئەگەر بێتوو ئێمەش ڕزگار بکا، ئێمەش هەزار دیناری نەزر دەکەین.' ئیدی هەستا و یەکیەک دەست و پێی هەموویانی کردەوە. ئینجا دەرباز بوون، خۆیان گەیاندە کەشتییەکەیان کە چوونە ناوی، سەیریان کرد هەموو شتەکان وەک خۆیان ماون و دەستیان لێ نەدراوە.

" 'چارۆکەکانیان هەڵدا و ڕۆیشتن. شێخ ئەبوومزەففەر گوتی: 'بازرگانینە بەڵێنەکانتان بەرنە سەرێ.' بازرگانەکان یەکی هەزار دیناریان بۆ مەیموونەکە دانا. ئەبوومزەففەریش هەزار دیناری بۆ مەیموونە دانا. بەو جۆرە پارەیەکی باش بۆ مەیموون کۆ بووەوە. ئەوجار کەشتییان ئاژۆت و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە بەسرە و لە کەشتییەکە دابەزین.

"هەر کە دابەزین، شێخ ئەبوومزەففەر گوتبووی: 'ئەبوومحەممەد تەپلۆس لەکوێیە؟' ئەو هەواڵە بە گوێی دایکم گەیشتبووەوە. هات بۆ لام، گوتی: 'ڕۆڵە، شێخ ئەبوومزەففەر هاتووەتەوە، هەستە بچووە سڵاوی. بە خێرهاتنەوەی بکە و پرسیاری ماڵەکەتی لێ بکە، بەشکو خودا ڕەحم بکا و لەو ڕێیەوە ڕزق و ڕۆزیمان زیاد کا.' من کە لەسەر لاشان کەوتبووم، بە دایکمم گوت: 'یارمەتیم بدە با هەستم.' دایکم یارمەتی دام، هەستام. لەنگەری گرتم وردەوردە ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە قەراخ دەریا. لەوێ چووینە لای شێخ ئەبوومزەففەر. شێخ کە منی دی، گوتی: 'ئافەرین بۆ ئەو کەسەی کە درەمەکانی بووە هۆی ڕزگاری من و بازرگانەکانی هاوڕێم.' دوایە گوتی: 'ئەو مەیموونەم بۆ تۆ کڕی. هەڵیگرە بچووەوە ماڵێ هەتا منیش دێم.' ئیدی من مەیموونەکەم هەڵگرت و چوومەوە ماڵی خۆمان. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'وەڵا کاڵایەکی جوانی بۆ کڕیوم!' کە مەیموونەکەم بردەوە بۆ لای دایکم، پێم گوت: 'ئەگەر من دەخەوتم، تۆ سەرکۆنەت دەکردم و دەگوت 'هەستە هەستە.' ئێستا تۆ هەستە بزانە چ کاڵایەکیان بۆ کڕیوم.' ئیدی مەیموونەکەم پیشان دا و لە جێی خۆم درێژ بووم و خەوتم. لەپڕدا کۆیلەکانی ئەبوومزەففەر هاتن. بەدوای ئەواندا شێخیش پەیدا بوو. من هەستام و دەستیم ماچ کرد. گوتی هەستە با بچین بۆ ماڵی ئێمە. لەگەڵ ئەوان ڕۆیشتم. کە چووینە ماڵەکەیان، شێخ بە خزمەتکار و شتەکەی گوت: 'شتەکانی بۆ بێنن.' ئەوان ماڵێکی زۆریان هێنا. گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە ودم و فەڕی ئەو پێنج درەمەی تۆ بوو، ئەو هەموو ماڵەی بۆ تۆ بە دیاری هێنا.' خزمەتکارەکان یەغدانەکانیان لەسەر شانیان دانا و کلیلەکانیشیان دا بە من.

" 'شێخ پێی گوتم: 'ئەو یەغدانە شتان هەمووی ماڵی خۆتە و لەگەڵ خۆت بیانبەوە.' دڵم خۆش بوو. ئەو هەموو یەغدانە شــــتەم بردەوە و چووم بۆ لای دایکم. دایکم گوتی: 'رۆڵە گیان، ئێســـتا خودا ئەو هەموو ماڵەی بە قســـمەت کردووی، ئیدی دەســـت لە تەپلۆســـی و تەوەزەلی هەڵگرە و بچووە بازاڕ و دەست بە کاری کڕین و فرۆش و بازرگانی بکە.'

" 'منیش دەســـــتم لە قونگرانی و تەپلۆســـــی هەڵگرت و لە بـازاڕ دووکـانێکم دانـا. مەیموونەکە لە دووکان لەگەڵم دادەنیشـــت. ئەگەر شـــتێکم دەخوارد، ئەویش لەگەڵ من دەیخوارد. ئەگەر ئـاوم دەخواردەوە، ئەویش دەیخواردەوە. هەموو بەیـانیـان لێم دادەبڕا و نیوەڕۆ دەگەڕاوە. کیســـەیەکی پارەی لەگەڵ خۆی دەهێناوە کە هەزار دینار زێڕی تێدا بوو. کیســـەکەی لە لای من دادەنا و لە پەنام دادەنیشـــت. ماوەیەکی زۆر ئاوا تێپەڕی هەتا من سامانێکی زۆرم کۆ کردەوە.

گەورەم خەلیفە! بەو ماڵە باخ و باخات و زەوی و زار و بێســـتان و کۆیلە و کەنیزێکی زۆرم کڕی. بەڕێکەوت ڕۆژێک من دانیشـــتبووم. مەیموونەکەش لە پەنا من دانیشـــتبوو. لەپڕدا مەیموونەکە چاوێکی لەملا و ئەولای خۆی کرد. من لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئاخۆ بڵێی چی بووبێ وا ئەو مەیموونە چاو لەوبەرەوبەری خۆی دەکا؟!' وا بوو خێرا ئەو مەیموونە بە فەرمانی خودا هاتە قســــە و بە زمانێکی ڕەوان و پاراوەوە گوتی: 'ئەبوومحەممەد!' من یەکبەخۆم ڕاپەڕیم. پێم ســـەیر بوو ئەو مەیموونە قســـەی کرد. پێی گوتم: 'مەترســـە، من هەموو ڕاستییەکت پێ دەڵێم. ئەوە بزانە من جنۆکەم. کاتێک دیم تۆ لە بارودۆخێکی باشدا نیت، هاتم بۆ لای تۆ. دەمەوێ کیژێکی زۆر جوانت لێ مارە کەم.' من گوتم: 'ئەو کچە کێیە و لە کوێیە؟' گوتی: 'سبەینێ جلوبەرگێکی شکۆدار لە بەر بکە. هێسترێک بە زینی ڕازاوە بە زێڕ و خشـڵی جوان زین کە و بە ســـواری ئەو هێســـترە دەچینە بازاڕی گیافرۆشـــان. پرسـیار بکە و دووکانی شـەریف ببینەوە. لە لای دانیشـــە و پێی بڵێ هاتووم بۆ خوازبێنی کچەکەت. ئەگەر گوتی: 'تۆ ماڵ و ســـامانت نییە و بێ کەس‌وکاری،' هەزار دیناری بدەری. ئەگەر گوتی: 'ئەوە چییە؟ بۆی زیاد بکە.' بیخە تەماعەوە.' کە ڕۆژ بووەوە، جلی گرانباییم لە بەر کرد. هێســـترێکم بە زینی زێڕینەوە زین کرد و ســـوار بووم. چووم بۆ بازاڕی گیافرۆشـان و بە پرسـیار دووکانی شـەریفم دۆزییەوە. لە دووکان دانیشـتبوو. سـڵاوم لێ کرد و لە لای دانیشتم.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەبوومحەممەد تەپلۆس دەڵێ: 'سڵاوم لێ کرد و لە لای دانیشتم. دە دانە کۆیلەشم لەگەڵ خۆم بردبوو. شەریف گوتی: 'دەڵێی کارێکت بە منە؟ کارەکەت چییە؟' گوتم: 'هاتووم بۆ خوازبێنی کچەکەت.' کەچی گوتی:'خۆ تۆ سامانێکت نییە، کەس‌وکارێکت نییە.' من کیسەیەکم دەرهێنا هەزار دیناری تێدا بوو، گوتم: 'کەس‌وکاری من ئەوەیە. هەر وەک فەرموویانە: باشترین شانازی، سامانە.' شاعیر لەو بارەوە جوانی گوتووە:

منـــــالّی شاش بی، ئەگەر بۆت نەیە
ژیــــــان دەتهاڕێ یاساکەی وەیە
کوڕ پارسەکیش بیت، ئەگەر هاتت بێ
هەر چی ئاواتە بە دەستتەوە دێ

" 'لە جێیەکی دیکەدا دەڵێن:

جوویـــــەکی ماڵـــی دنیایەی هەیە
پیاوە و ماقـــــووڵە و ناوبانگی هەیە
زۆر موســـوڵمـان بێ، بەڵام هەژار بێ
بووعـــــــەلی سیناش بێ کەمی هەیە

" 'شەریف کاتێک ئەو قسانەی لە من بیست. لە مەبەستەکەم گەیشت، ماوەیەکی باش سەری داخست. پاشان سەری هەڵهێنا و گوتی: 'ئەگەر هەر دەتهەوێ لەگەڵ کچەکەی مندا زەماوەند بکەی، سێ‌هەزار دیناری دیکەشم بدەیە.' گورج من یەکێک لە کۆیلەکانی خۆم ناردەوە ماڵەوە و سێ‌هەزار دیناری زێڕی دیکەی هێنا. کاتێک شەریف ئەو زێڕانەی دیت، خێرا هەستا دووکانی داخست و هاوڕێ و دراوسێکانی بانگهێشت کردە ماڵی خۆیان و کچەکەی لە من مارە کرد. پێی گوتم: 'دوای دە ڕۆژی دیکە کچەکەت بۆ دەنێرمە ماڵەوە.' کە لە ڕۆژی دەیەم نزیک بووەوە، مەیموونەکەم پێی گوتم: 'من کارێکم بە تۆیە، ئەگەر بۆم جێبەجێ بکەی، هەرچی بڵێی بە قسەت دەکەم.' گوتم: 'چ کارێکت پێمە؟' گوتی: 'لەسەر ئەو دیوەی لە ماڵی شەریف تۆ دەچیتە ژوورەوە، خەزێنەیەکی لێیە. ئاڵقەیەک لەسەر ئەو خەزێنەیە کە کلیلەکانی پێوەیە. دەرگاکە بکەوە سندووقێکی ئاسن دەبینی کە لە هەر چوار سووچی ئەو سندووقەوە، چوار دانە ئاڵای تێ چەقاوە کە تەلیسم کراون. لە نێوەڕاستی ئەو ماڵە تەشتێکی تێدایە پڕە لە زێڕ و ماڵ. یازدە مار لە چواردەوری ئەو تەشتەن. لەنێو

تەشتەکەشدا کەڵەشێرێکی سپی تێدا بەستراوەتەوە. وێردێک[1] لە پەنا تەشتەکەیە. دەست دە ئەو وێردە، کەڵەشێرەکە سەر بڕە. ئاڵاکان بخە و سندووقەکە هەڵڕێژە. دوای ئەوە وەرە دەرەوە و بچووە بۆ لای بووک و لەگەڵی جووت بە. من ئەوەندەم لە تۆ دەوێ.' گوتم: 'بەسەر چاو.'

" 'کە ڕۆژی دیاریکراو هات، من هەستام چووم بۆ ماڵی شەریف. لەگەڵ بووک کەوتینە لای یەک و تێر سەیری جوانی و پاکی و چاکیم کرد و پێکەوە هەتا نیوەشەو ڕامانبوارد. کە بوو بە نیوەشەو، بووک خەوی لێ کەوت. هەستام چووم دەستم دا وێردەکە و کەڵەشێرەکەم سەربڕی. کلیلەکانم هەڵگرت و سندووقەکەم هەڵگرت و ئاڵاکانم خستن. پاشان سندووقەکەم سەرەوبن کرد. دوای ئەوە هاتمە دەرەوە و کچەکەم هەڵساند. کە دەرکی دیوەکەی کردەوە و کەڵەبابەکەی بە سەربڕاوی دیت، گوتی: 'هەر ئێستا دێوەکە دێ و من دەبا.' هێشتا ئەو قسەکانی تەواو نەکردبوو کە دێوە پەیدا بوو و ئەوی برد و ڕفاندی. لەو جەنگەیەدا لە هەموو لایەکەوە هاوار هەستا. لەناکاو شەریف هات و بە چەپۆک بەربووە سەروچاوی خۆی، گوتی: 'ئەبوومحەممەد، ئەوە ئاوا وەڵامی چاکەکانی منت داوە؟' پاشان گوتی: 'من ئەو تەلیسمەم لەبەر ئەو دێوە لەو دیوەدا درووست کردبوو. ئەوە شەش ساڵ بوو بە تەما بوو ئەو کچەی من بڕفێنێ، لەبەر ئەو تەلیسمە نەیدەتوانی. ئێستا کە ئاوات کرد، هەستە بڕۆ دوای کاری خۆت کەوە، ئێرە جێگای تۆ نییە.' خێرا من لە ماڵی شەریف هاتمە دەرەوە و چوومەوە ماڵی خۆمان. کە چوومەوە، مەیموونەکە لە ماڵەوە نەبوو. ئەو دەم زانیم کە ئەو دێوە هەر ئەو مەیموونە بووە کە خێزانی منی ڕفاندووە. پەشیمان بوومەوە و یەخەی خۆم دادڕی و بە چەپۆک لە سەروسەکوتی خۆم بەربووم. دنیام لە بەرچاو تاریک بوو. هەر ئەو کاتە لە ماڵ هاتمە دەر و ڕووم لە دەشت و بێروون کرد. هەر وا سەرگەردان دەڕۆیشتم هەتا شەوم بەسەردا هات، نەمدەزانی چ دەکەم و بۆ کوێ دەچم. بەدەم بیرکردنەوەوە دەڕۆیشتم کە تووشی دوو مار بووم. یەکی ڕەش و یەکی چەرموو کە پێکەوە بە شەڕ دەهاتن. مارە ڕەشەکە بەسەر مارە چەرمووەکەدا زاڵ بوو. دەستم دا بەردێک و مارە ڕەشە زاڵمەکەم کوشت. مارە سپییەکەم لێ ون بوو. دوای ماوەیەک هاتەوە و دە ماری دیکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. چوونە سەر ئەو مارە ڕەشەی من کوشتبووم، تێی ئاڵان و مارە ڕەشەیان پچڕپچڕ کرد. پاشان هەر لەتەی فڕێیان دا بۆ لایەک و ڕۆیشتن. من مەمنا ئەوەندە ماندوو و شەکەت بووم، هەر لەوێ کەوتم. سەرم لەو کارانە سووڕ مابوو. لەو جەنگەیەدا گوێم لە دەنگێکی نادیار بوو، ئەو بەیتەی دەگوتەوە:

خاس و خراو گشتی لای خواوە دێ
پیاو ئەو پیاوەسە هەراسان نەوێ

---

١. وێرد: چەقۆیەکە کە دەسکەکەی ئانوشتێتەوە. وێردی چێشتخانە، وێردی میوە خواردن.

" 'خەلیفەی جیهان، کاتێک گوێم لەو دەنگە بوو، واقم وڕ ما و چووم لە فکرەوە. کە لەنەکاو گوێم لە ئاوازێکی دی بوو کە دەیگوت:

بۆچ دڗ بە ســـــــەربــــەرز و مەزنانی؟
لە کۆڕی ئاشتیخــــــــــــــوازان نەبانی؟
یارت بە نەیـــــــــــــار دێنیتە ئەژمار؟
شــــادی بە خەم و مەینەت دەزانـی؟

" 'من پێم گوت: 'تۆ و ئەو کەسـەی دەیپەرستی، خۆتم پێ بناسـێنە.' لەڕێوە دەنگەکە لە بیچمی مرۆڤدا خۆی پیشـــان دام و پێی گوتم: 'ترســـت نەبێ، چاکەی تۆ بە گوێی ئێمە گەیوەتەوە. ئێمە هۆزێکین لە جنۆکە باوەڕدارەکان. ئەگەر ویســتێکت هەیە، پێمان بڵێ تا بۆت بەدی بێنین.' من پێم گوت: 'دەردێکی گرانم هەیە و تا ئێســتا پێم وا نییە کەس وەک منی لێ قەوما بێ!' ئەوجار لێی پرســـیم: 'تۆ ئەبوومحەممەد تەپلۆس نیت؟' گوتم: 'بەڵێ، ئەبوومحەممەدم.' گوتی: 'ئەبوومحەممەد، من برای ئەو مارە سپییەم کە تۆ ڕزگارت کرد و دڗمنەکەیت کوشـــت. ئێمە چوار براین هەموومان ســـپاســـی تۆ دەکەین و خۆمان بە قەرزاربـاری تۆ دەزانین. ئەو دێوەی کە ژنەکەی تۆی ڕفـانـد، هەر ئەو مەیموونەیە کە لە ماڵەکەی تۆدا دەژی. ئەو ئەگەر تۆی بۆ کردنەوەی تەلیســـم و کوشـــتنی کەڵەبابەکە فریو نەدابایە، نەیدەتوانی ئەو کەنیشکە بڕفێنێ، چونکە ئەو لەمێژ بوو بە تەمای ڕفاندنی ئەو کچە بوو، بە هۆی ئەو تەلیسمەوە بۆی جێبەجێ نەدەبوو. بەڵام تۆ خۆت ناڕەحەت مەکە و خەم مەخۆ، ئێمە پێکتان دەگەیەنینەوە. ئەو درنجەش دەکوژین. ئێمە ئەو چاکەیەی تۆمان قەت لە بیر ناچێتەوە.' دوای ئەوە یەکبەخۆی هەرای کرد.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'دوای ئەوە یەکبەخۆی هەرای کرد. دەمودەست کۆمەڵێک لەوانەی خۆیان کۆ بوونەوە. داوای لێ کردن مەیموونەکە ببیننەوە. یەکێک لەوان گوتی: 'مەیموونەکە لە شـاری نەحاسـە. شـارێکە قەت خۆری تێ ناکەوێ.' ئیدی پێمی گوت: 'ئەبوومحەممەد. یەکێک لە خزمەتکارەکانمان تۆ لەسەر قەڵاندۆشی دادەنێ و چۆنیەتی هێنانی کەنیشکەکەت فێر دەکا، بەڵام لە بیرت نەچێ ئەو خزمەتکارە ناموسـوڵمانە. ئەگەر هەڵیگرتی، ناوی خودا مەهێنە، دەنا ون دەبێ و دەرباز دەبێ.' گوتم: 'تۆ چۆن بڵێی، ئاوا دەکەم.'

" 'وا بوو یەکێک لە خزمەتکارەکانیان هات. منی سـواری قەڵاندۆشـی خۆی کرد. ئینجا هەسـتا حەوا، ئەوەندەی بردمە سـەرێ کە هەر کام لە ئەسـتێرەکانم وەک کێوێکی بلند دەهاتە بەرچاو. گوێم لە گازە و نزای مەلائیکەکان بوو. ئەو جنۆکەیەش بەردەوام قسـەی لەگەڵ دەکردم و دەیخافڵاندم نەکا من ناوی خودا بێنمە سەر زمانم.

" 'لەو جەنگەیەدا یەکێکی مووبژی جوان چاک و ڕووگەش، عەبایەکی سەوز بە شانەوە. بە شـێری ڕووتەوە ڕووبەڕوومان هات. ڕووی لە من کرد و گوتی: 'ئەبوومحەممەد، بڵێ 'لائیلاهە ئیلەڵڵا، محەممەد ڕەسـوولوڵڵا' دەنا دەتکوژم.' من لە ترسـان بەدوایدا گوتمەوە. لەو دەمەدا شیرەکەی گەیاندە جنۆکەکە و جنۆکە گڕی گرت و نەما. من لەسەر قەڵاندۆشی کەوتمە خوارێ و کەوتمە ناو دەریایەکەوە. بەڕێکەوت پاپۆڕێک هات، پێنج کەسـی لەسـەر بوو. هەر کە منیان دیت، هاتن بۆ لام. سواریان کردم. ئەوان بە زمانێک قسەیان دەکرد کە من تێیاننەدەگەیشتم. هەر بە ئاماژە تێم گەیاندن کە من زمانی ئەوان نازانم و تێیانناگەم. لە ڕێدا قولاپیان لە دەریا هاویشـت و هێندێکیان ماسـی گرت. سـووریان کردنەوە و، دەرخواردی منیشیان دا. هەر ئاوا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە شارەکەی خۆیان. بردیانمە لای پاشـای ئەو شـارە. من کڕنۆشـم برد. پاشـا خەڵاتی کردم. ئەو پاشـایە عەرەبیی دەزانی. بە منی گوت: 'تۆ دەکەمە یاریدەدەری خۆم.' من ناوی شـارەکەم لێ پرسـی، گوتی: 'ناوی ئەم شارە 'هەناد'ە و سەر بە وڵاتی چینە.' بەو جۆرە پاشا منی بە وەزیرەکەی سپارد و گوتی: 'بیبە لە ناو شاردا بیگێڕە و وڵاتی پێشان بدە.' بەو جۆرە ماوەی مانگێک لەو شارە مامەوە.

" 'ڕۆژێک لە شـار هاتمە دەرەوە و لە قەراخ چۆمێک دانیشـتم. لە پڕدا سـوارێک هات. گوتی: 'ئەرێ تۆ ئەبوومحەممەد تەپلۆس نییت؟' گوتم: 'بەڵێ، ئەوم.' گوتی: 'نیگەرانی هیچ شـتێک مەبە. تۆ چاکەت لەگەڵ ئێمە کردووە.' گوتم: 'تۆ کێی؟' گوتی: 'من برای ماری چەرمووم. ئێستا تۆ لەو شوێنەی کیژەکەی لێیە و، تۆ بە شوێنیەوەیت—نیزیک بوویتەوە.' ئیدی ئەو سوارە منی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد. بردمی بۆ دەشت و بێروونێک و گوتی:

ـیره دابەزە و برۆ بۆ نێوان ئەو دوو کێوە هەتا شاری نەحاس ببینی. کە شارەکەت لێ ـەرکەوت، تۆ مەچووە ناو شار و هەر لە دوور ڕاوەستە و چاوەڕێ بە هەتا من ـەگەڕێمەوە. ئەو دەم پێت دەڵێم چ بکەی.' ئیدی من لە ئەسپەکە دابەزیم و ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە نێوانی ئەو دوو کێوە و لەوێ دیوارەکانی شارم لێ دەرکەوتن. دیواری ئەو شارە ـە مس بوو. بە دەوری شاردا سووڕامەوە، بەڵام دەروازەیەکم نەدیتەوە. هەر وا سەرم ـسووڕ مابوو کە برای ماری سپی گەیشتێ. شیرێکی تەلیسمکراوی دامێ. ئەو شیرە وا بوو بە دەست هەرکەسەوە بووایە. ئەو کەسە لە بەرچاو ون و نادیار دەبوو.

" 'ئەو کە شمشیرەکەی دا بە من بۆخۆی ڕۆیشت. ئەوەندەی پێ نەچوو دەنگەدەنگێک پەیدا بوو. چاوم بە خەڵکێکی زۆر کەوت کە چاویان لەسەر سینگیان بوو. هەر کە مینان ـیت، لێیان پرسیم: 'تۆ کێی و کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟' من ڕاستییەکەم پێ گوتن. ئەوانیش گوتیان: 'ئەو کچەی تۆ باسی دەکەی، دێو هێناویەتە ئەم شارە. ئێمە براکانی ماری سپیین. ئیستا تۆ بچووە سەر ئەو کانییە. بزانە ئەو ئاوە لەکوێوە دەچێتە ناو شارەوە، لەگەڵ ئاوەکە برۆ.' وا بوو من لەگەڵ ڕەوتی ئاوەکە ڕۆیشتم هەتا چوومە ناو شار.

" 'هەر بەدەم ئاوەکەدا ڕۆیشتم هەتا چوومە سارداوێکەوە. کە لە سارداوەکە هاتمە دەرەوە، سەیرم کرد ئەوە لە ناو کۆشکێکدام و کچەشم دیت لەسەر تەختێکی زێڕین دانیشتبوو. پەردەیەکی دیباش بەسەر تەختەکەدا درابوو. لەدەوری ئەو کۆشکە باخێکی لێ بوو، دارەکانی لە زێڕی سوور و میوەکانیان لە یاقووتی گرانبایی چێ کرابوون. کە کیژەکە منی دیت، ناسیمیەوە و گوتی: 'گەورەم، ئەوە کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟!' بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە. ئەویش بە منی گوت: 'چونکە ئەو گڵاوە منی زۆر خۆش دەوێ، هەموو نهێنییەک لە لای من دەدرکێنێ—تەنانەت ئەو شتانەی بۆ ئەویش جێی مەترسین و کێشەی بۆ درووست دەکەن. ئەو دەیگوت: 'لەم شارەدا تەلیسمێکی تێدایە ئەگەر کەسێک پێی خۆش بێ دەتوانێ بەو تەلیسمە تەواوی خەڵکی ئەم شارەش لەنێو بەرێ.' بەو تەلیسمە تۆ دەتوانی کارێک بکەی هەرچی بەو دێوە بڵێی، بە قسەت بکا و گوێڕایەڵت بێ. گوتیشی: 'ئەو تەلیسمە لەنێو کوڵەکەیەکدایە.'' گوتم: 'ئەو کوڵەکەیە لەکوێیە؟' کچەکە شوێنی کوڵەکەکەی بە من گوت.' گوتم: 'ئەو تەلیسمە چۆناوچۆنە؟' کیژەکە گوتی: 'لە بیچمی هەڵۆیەکدایە و شتێکی لەسەر نووسراوە کە من نازانم چییە. تۆ بچووە ڕووبەڕووی کوڵەکەکە دانیشە. کەمێک خەڵووز بگەشێنەوە و نەختێک میسک بەسەر ئاورەکەوە بکە، دووکەڵێک هەڵدەستێ. هەر کە ئەو دووکەڵە هەستا، تەواوی دێوەکان دێنە هەنتەشی تۆ. هەرچییەکیان پێ بڵێی بەگوێت دەکەن. ئێستا هەستە پشت بە خودا ببەستە بچووە وا بکە بەشکو ڕزگارمان بێ.'

" 'ئیدی من هەستام چووم بۆ لای ئەو کوڵەکەیە. ئەو جۆرەی کچەکە پێی گوتبووم ئاوام کرد. دێوەکان لەدەورم کۆبوونەوە و گوتیان: 'گوێڕایەڵتین گەورەم. هەرچییەکمان پێ

بلێی لە خزمەتتداین.' گوتم: 'لە پێشـــدا ئەو دێوەی کە فلانە کچی هێناوەتە ئێرە، بیگرن و بیبەســتنەوە.' ئەوان بە لەز چوون ئەو دێوەیان گرت و بەســتیانەوە. پاشــان هاتنەوە لای خۆم و گوتیان: 'فەرمانتانمان بەجێ گەیاند.' ئینجا ئەوانم ئازاد کرد و گوتم: 'برۆن بە لای کاری خۆتانەوە.' خۆم چووم بۆ لای کچەکە. هەموو شـتێکم بۆ گێڕاوە. لێم پرسـی: 'لەگەڵ من دێیتەوە یان نا؟' گوتی: 'دێمەوە و گیانیشـــم بەختی تۆ دەکەم.' ئیدی ئەوم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و چووینە نێو ســارداوەکە و بەوێدا لە شــار هاتینە دەرەوە. ڕۆیشـتین ڕۆیشـتین هەتا گەیشتینە لای ئەو هۆزەی کە شوێنی کیژەکەیان پێ نیشان دام.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

# که شەوی سێسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، ئەبوومحەممەد تەپلۆس گوتی: 'كە گەیشـــتینە لای ئەو هۆزەی بارمەتیان دام تا ئەو كیژە بدۆزمەوە، پێم گوتن: 'ڕێنوێنیم بكەن تا بگەڕێمەوە شـــارەكەی خۆم.' ئەوان بردیانینە قەراخ دەریا و ســـواری پاپۆڕیان كردین. پاشـــان بای خوازراو هەڵیكرد و لە كەمترین ماوەدا ئێمەی گەیاندەوە بەســـرە. كە كچەم هێناوەماڵی شـــەریف، خزم و كەس‌وكاری هەموو خۆشـــحاڵ بوون. دوای ئەوە میســـكم لەســـەر ســـكڵ ڕۆكرد. تەواوی دێوەكان لەپێشـــم ئامادە بوون، گوتیان: 'فەرمان بدە گەوەرم، ئێمە گوێڕایەڵین.' ئیدی منیش فەرمانم پێ كردن بچن هەرچی زێڕ و گەوهەر و یاقووت و مرواری لە شاری نەحاس هەیە، هەمووی بێننە مـاڵەكەی من. دوای ئەوە گوتم: 'مەیموونەكەش بێنن.' مەیموونەكەیان بە دەست و پێی بەستراوەوە هێنا. پێم گوت: 'كڵاو، بۆ كڵاوت لەسەر نام؟' ئینجا بە دێوەكانم گوت: 'لە كووپەیەكی فافۆنی بكەن و ســـەرەكەی بە قورقوشـــم دادەن[١].' دوای ئەوە بە دڵێكی ئاسـوودەوە لەگەڵ ژنەكەم خەریكی عەیش و نۆش و ڕابواردن بووم. ئێســـتا خەلیفە، ئەوەندە گەوهەری گرانبایيم هەیە كە نە باس دەكرێ و نە دێتە ئەژمار. ئەگەر خەلیفەی جیهان شـــتێكی بوێ، بە جنۆكەكان دەڵێم خێرا جێبەجێی دەكەن.' خەلیفە ئەو بەســـەرهاتەی زۆر بە لاوە ســـەیر بوو. ئەویش لەبەرابەر دیارییەكانی ئەودا خەڵاتێكی شایانەی كرد و دیارییەكی زۆر شیاوی خۆی پێشكەش كرد.

## چیرۆكی دڵاوایی یەحیا بەرمەكی

"یەكێكی دیكە لە بەســـەرهاتەكان ئەوەیە كە پێش ئەوەی بەرمەكییەكان ژێروژوور بن، ڕۆژێک خەلیفە هاروونەڕەشـــید پیاوێكی نزیكی خۆی كە ناوی ســـاڵح بوو، بانگ كرد و فەرمووی: 'ساڵح، هەستە بچووە لای مەنسوور و پێی بڵێ كە ئێمە هەزارهەزار درەممان لە لاتە و پێویســـتە هەر ئێســـتا بۆمان بێنێتەوە.' دیســـان ســـاڵحیشـــی تێگەیاند كە ئەگەر هەتا ئێوارە ئەو پارەیە نەهێنێتەوە، دەبێ سەری مەنسوور بۆ خەلیفە بباتەوە. ساڵح بە فەرمانی خەلیفە دەرچوو. كە گەیشـــتە لای مەنســـوور، بابەتەكەی بۆ باس كرد. مەنســـوور گوتی: 'ســـاڵح، بە خودا كارم تەواوە، چونكە ئەگەر تەواوی سامانەكەم زۆر بە گرانیش بفرۆشـم، ســـەدهەزار درەمم بۆ كۆ نابێتەوە. نازانم نۆســـەد هەزار درەم لە كوێ بێنم.' ســـاڵح گوتی: 'بیرێكی بۆ بكەرەوە با ڕزگارت بێ، ئەگینا منیش تیا دەچم. ئێســـتا تا زووە، بڕۆ چارەیەكی بۆ بدۆزەرەوە، چونكە ناتوانم سەرپێچی فەرمانی خەلیفە بكەم و بە گوێی نەكەم.' مەنسوور

---

١ . سەر ... دادان: واتە سەر گرتن و كونبڕ كردن.

گوتی: 'ساڵح، گەورەیی بفەرموو هەتا ماڵی خۆمان بمبەرەوە با چاوم بە منداڵەکانم بکەوێ و وەسییەتیان بۆ بکەم. پاشان ماڵاوایییان لێ بکەم.' ساڵح گێڕاوییەتەوە: 'لەگەڵ مەنسوور چوومەوە ماڵی ئەوان. ئەو دەستی کرد بە وەسییەتکردن و گەردنئازایی. شین و گریان لە ماڵیان بەربوو.' لەو جەنگەیەدا ساڵح بە مەنسووری گوت: 'بە بڕوای من ڕزگاری تۆ بە دەست بەرمەکییەکان جێبەجێ دەبێ. وا چاکە هەتا ماڵی یەحیای کوڕی خالید بچی.' مەنسوور بە قسەی ساڵحی کرد و هەردووکیان چوون بۆ ماڵی یەحیا. کە چوونە ئەوێ. مەنسوور بابەتەکەی بۆ یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکی گێڕاوە. یەحیا بەو بابەتە زۆر تێک چوو. سەری داخست و کەوتە بیرکردنەوە. دوای ماوەیەک سەری هەڵهێنا و گازی خەزێنەدارەکەی کرد و گوتی: 'چەند درەممان لە خەزێنەدا هەیە؟' خەزێنەدار گوتی: 'پێنجهەزار درەم لە خەزێنەدایە.' فەرمووی: 'ئەو پێنجهەزار درەمە بێنە.' دوای ئەوە ڕاسپاردەی نارد بۆ لای فەزڵی کوڕی و نامەیەکی بەو ناوەرۆکەوە بۆ نارد کە شارۆچکەیەکی گەورە و ئاوەدانیان داناوە بۆ فرۆش و بە منیشیان ڕاگەیاندووە بیکڕم. مڵکێکی زۆر هەرزانە، کەمێک درەم و دینارم بۆ بنێرە با بیکڕم. فەزڵی کوڕی یەحیا سەدهەزار درەمی بۆ باوکی نارد. دوای ئەوە پیاوێکیشی نارد بۆ لای جەعفەر و نامەیەکیشی هەر بەو ناوەرۆکە بۆ نارد کە کارێکی زۆر ئاستەم هاتووەتەوە پێشەوە و پێویستیم بە کەمێک درەم و دینار هەیە. جەعفەریش لەڕێوە سەدهەزار درەمی بۆ نارد. بەو جۆرە یەحیا لێکدالێکدا پیاوی بە نامەوە دەنارد بۆ لای بەرمەکییەکان و بێ ئەوەی ساڵح و مەنسوور بەو کارە بزانن، پارەیەکی زۆری بۆ مەنسوور کۆ کردەوە.

" 'مەنسوور بە یەحیای گوت: 'گەورەم، من پەنام بۆ تۆ هێناوە و دەستم بە هیچ کوێ ڕاناگا. ئەوەی دیکەشم بۆ جێبەجێ کە. گەورەیی هەر لە خۆت دەوەشێتەوە.' دەگێڕنەوە یەحیا سەری داخست و دەستی کردە گریان. پاشان کۆیلەیەکی لەوێ بوو ڕووی تێکرد و گوتی: 'هۆ غولام، خەلیفە هارووونەڕەشید زێڕ و گەوهەرێکی زۆری دا بە کەنیزە عوودژەنەکەم، بچووە بۆ لای پێی بڵێ ئەو زێڕ و گەوهەرانەم بۆ بنێرێ.' کۆیلەکە چوو ئەوانیشی هێنا. ئەوجار یەحیای کوڕی خالید بە ساڵحی گوت: 'من ئەو گەوهەرانەم بە دووسەد هەزار دینار لە بازرگانەکان کڕی بۆ خەلیفە. خەلیفە ئەوانەی پێشکەشی کەنیزەکەی من کرد. ئەگەر بێتوو ئەو زێڕ و گەوهەرانە ببینێ، دەیانناسێتەوە، ڕێزت لێ دەنێ و بە حورمەتی ئێمە لە تۆش خۆش دەبێ. ئێستا ماڵەکە تەواوە.'

"ساڵح گێڕاویەتەوە: 'پارە و شتەکەم لەگەڵ گەوهەرەکان بردە لای هاڕوونەڕەشید. مەنسووریشم لەگەڵ بوو. لەناکاو بیستم مەنسوور دەڵێ:

چوونم بۆ مـــــالی ئەو بەرمەکییانە
لە خۆشـــییان نێ هی، ناچارییانە

" 'من ســەرم لە بێســفەتی و هیچوپووچی ئەو ســوورِ ما. ئاورِم داوە و جنێوم پێ دا. پێشم گوت: 'لەسەر گۆی زەوی کەس لەو بەرمەکییانە چاکتر نییە. کەسیش لە تۆ خوێڕیتر و خراپتر نییە. چونکە ئەوان تۆیان لە مردن رِزگار کرد، کەچی تۆ پێ نازانی و قسـەی ئاوا نەشیاو دەکەی!'

" 'بەو جۆرە من و ئەو چووینە دیوانی هارِوونەرِەشــید. من تەواوی رِووداوەکەم بۆ گێراوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سالح گێڕاوییەتەوە: 'من تەواوی ڕووداوەکەم بۆ هاڕوونەڕڕەشید گێڕاوە. خەلیفە سەری لە گەورەیی و دلاوایی یەحیا سووڕ ما. لەو هەموو سپڵەیی و بێچاووڕوویییەی مەنسووریش واقی وڕ ما. پاشان فەرمووی: 'ئەو گەوهەرانە بەرنەوە بۆ یەحیا، ئێمە دیاری خۆمان وەرناگرینەوە.' ئیدی من گەوهەرەکانم هێناوە بۆ یەحیا و قسەکەی مەنسوورم بۆ گێڕاوە و باسی سپڵەیییەکەیم کرد. یەحیای کوڕی خالید گوتی: 'سالح، پیاو کە دەستەنگ دەبێ، دڵیشی چکۆلە دەبێتەوە و سەری لێ دەشێوێ. نابێ قسە و ئاکاری بگریتە دڵ، چونکە زۆر جار لەبەر نارەحەتی ئاگای لە خۆی نابێ.' ئیدی یەحیا لە جێی مەنسوور داوای لێبووردنی کرد. من بە خۆم نەبوو دەستم کردە گریان و گوتم: 'ڕۆژگار هی وەکوو تۆ بە خۆیەوە نابینێ. مخابن کەسێکی گەورەی وەک تۆ دەبێ بچێتە ژێر ئەو گلەوە.' ئینجا ئەو شیعرەم بۆ خوێندەوە:

دەبوو لەبەر گەورەییت ئاسمان سووژدەی بردبا
ئەستێرە دانەدانە سەریان لە دەرکت سووبا
ئەگەر بێتوو ئەم ڕۆژگارە ڕۆژێک تۆی ئازار دابا
دەبوایە دەستی عەدالەت ڕۆژگاری لە دار دابا

### چیرۆکی دلاوایی بەرمەکییەکان

"یەکێکی تر لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکی و عەبدوڵلای کوڕی مالیکی خوزاعی دژمنایەتییەکی شاراوەیان هەبوو، بەڵام وەدەریان نەدەخست. هۆکاری ئەو دژمنایەتییەش ئەوە بوو کە خەلیفە هاڕوونەڕڕەشید عەبدوڵلای کوڕی مالیکی زۆر خۆش دەویست. تا ئەو جێیەی کە یەحیا و کوڕەکانی یەحیا دەیانگوت: 'عەبدوڵلا نوشتەی لە خەلیفە کردووە.'

"ماوەیەک تێپەڕی و ئەو ڕق و کین و ئیرەیییەش هەر وا لە جێی خۆی بوو. بە ڕێکەوت وا بوو خەلیفە بەرپرسیارێتی وڵاتی ئەرمەنستانی خستە ئەستۆی عەبدوڵلاوە. ئەوی نارد بۆ ئەوێ. کاتێک عەبدوڵلا چووە سەر کورسی دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە، پیاوێکی خەڵکی عێراق کە زۆر زانا و گەورە بوو، بەڵام هەژار و دەستەنگ و لێقەوماو بوو، هێنای نامەیەکی ساختەی بە زمانی یەحیای کوڕی خالیدەوە نووسی بۆ عەبدوڵلای کوڕی مالیک و هەستا چوو بۆ لای عەبدوڵلا. کاتێک گەیشتە ئەوێ، نامە ساختەکەی دا بە یەکێک لە دەرکەوانەکانی. دەرکەوان نامەکەی لێ وەرگرت و بردی بۆ عەبدوڵلا. عەبدوڵلا نامەکەی

هەڵپچڕی و خوێندییەوە. کە جوان سەرنجی دایە، زانی ئەو نامەیە ساختەیە. ئیدی بانگی ئەو پیاوەی کرد. ئەو پیاوە چووە هەنتەشی و نزای بۆ کرد. عەبدوڵلا لێی پرسی: 'ئەوە بۆ بەو هەمووە ڕەنج و زەحمەتەوە نامەی ساختەت بۆ هێناوم؟! بەڵام قەیناکا مەترسە و نیگەران مەبە، هەوڵ دەدەم کارێکت بۆ بکەم—بێهیوات ناکەم.' ئەو پیاوە گوتی: 'خودا دەست بە عومرتەوە بگرێ. ئەگەر دەزانی بارگرانیم بەسەرتەوە، پاساو هێنانەوەی ناوێ. زەوی خودا پان و بەرینە و ڕۆزیدەریش زیندووە. ئەو نامەیەی هێناومە هی یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکییە.' عەبدوڵلا گوتی: 'من بریکارم لە بەغدا هەیە، نامەیەکی بۆ دەنووسم هەتا بکەوێتە پێوشوێنی ئەو نامەیە. ئەگەر ئەو نامەیە هی یەحیا بێ و ساختە نەبێ، ئەوە من یەکێک لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆم دەدەم بە تۆ، یان دووسەد هەزار درەم و ئەسپێک و وشترێک و خەڵاتێکی شایانەت دەدەمێ. بەڵام ئەگەر ئەو نووسراوەیە ساختە بێ، دەڵێم دووسەد قامچیت لێ دەن و چەنەشت بتاشن.' ئەوجار عەبدوڵلا فەرمووی: 'دیوێکی بۆ تەرخان کەن و پێداویستی ژیانی بۆ دابین کەن هەتا کارەکەی ڕوون دەبێتەوە.'

"ئینجا عەبدوڵلا نامەیەکی ئاوای بۆ بریکارەکەی نووسی: 'پیاوێک هاتووەتە ئێرە، نووسراوەیەکی پێیە و دەڵێ ئەو نووسراوەیە لە لایەن یەحیا بەرمەکییەوەیە. بەڵام من لێی دردۆنگم و نامەکەم لێ قەبووڵ نەکردووە. ئێستا دەبێ تۆ بۆ خۆت بچی دوای ڕاستی و درووستی ئەو کارە بکەوی. زۆر زووش من ئاگادار کەیەوە هەتا شتەکەم بۆ ڕوون ببێتەوە.' کە نووسراوەکەی عەبدوڵلا لە بەغدا گەیشتە دەست بریکارەکەی ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی سێسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که نووسراوەکە گەیشتە دەست بریکاری عەبدوڵلای کوڕی مالیکی خوزاعی، گورجێ سوار بوو بۆ چوو بۆ ماڵی یەحیای کوڕی خالید. که چوو، یەحیا لەگەڵ هاوڕێ و کەسانی نزیکی دانیشتبوون. سڵاوی کرد و نامەکەی لەپێش دانا. یەحیا نامەکەی خوێندەوە. پاشان گوتی: 'سۆزی وەرەوە، وەڵامەکەیت بۆ دەنووسمەوە.' که ئەو ڕۆیشت. یەحیا ڕووی له دانیشتووان کرد و گوتی: 'ئەو کەسەی به ناوی منەوە نامەی ساختە بۆ نەیارەکەم بەرێ، به بڕوای ئێوە دەبێ چی لێ بکەم؟' هەرکەسەی شتێکی گوت و سزایەکی بۆ دیاری کرد. یەحیا پێی گوتن: 'هەمووتان له هەڵە دان و له خۆڕا بڕیارتان دا. له ڕوانگەیەکی نزم و دەروونێکی تەنگ و پووچەوە ڕێتان نیشانی من دا. ئێوە ڕێز و پلە و پایەی عەبدوڵلاتان لەگەڵ خەلیفە لێ تێک چووە. خۆ ئێوە دەزانن که من و عەبدوڵلا کێشە و ئیرەیی و ددانەچیڕەمان لەنێواندایە. خودا ئەو کابرایەی کردووەتە هۆکاری سڕینەوەی ناکۆکی و بەدیهاتنی ئاشتی لەنێو ئێمە دا. ئەو ڕق و کینەی چەند ساڵە لەسەر یەک کەڵەکە بووە، به هۆی ئەو کابرایەوە دەکرێ له بیر بکرێ و جێگای خۆی بدا به خۆشەویستی و دۆستایەتی و لێکتێگەیشتن. که وایە، من به ئەرکی خۆمی دەزانم که پشتی ئەو کابرایە بگرم و ڕاستی داواکەی بۆ پشتڕاست بکەمەوە. بەو جۆرە قەدر و ڕێزی ئەو کابرایەش بەرمە سەرێ.'

"کاتێک هاونشینەکانی یەحیا ئەو قسەیان له یەحیا بیست، نزای خێریان بۆ کرد. خۆشیان لەو هەموو جوامێری و دڵاواییەی هات. ئینجا یەحیا داوای قەڵەم و کاغەزی کرد و نامەیەکی بەو جۆرەی بۆ عەبدوڵلا نووسی: 'ئاگادار به که نامەکەت به دەستم گەیشت. من ورد خوێندمەوە. لەوەی که زانیم جەنابت ساخ و سلامەتی، خۆشحاڵ بووم. بەڵام له بابەت ئەوەوە پێت وا بووە ئەو نامەیەی به دەستت گەیشتووە، ساختەیە، نەخێر قەت شتی وا نییە. نامەکە من ناردوومەتە خزمەتت. تکا و ڕەجاشم له گەورەیی و چاکی و پاکی جەنابیشت ئەوەیە که به ئەندازەی داوا و لێهاتوویی و شارەزاییی ئەو کابرایە له کاروباردا ڕێزی لێ بگری و به ئاواتی بگەیەنی—له دڵاوایی خۆتی بێبەش نەکەی. ئەوەش بزانە هەر چاکەیەک لەگەڵ ئەوی دەکەی، له ڕاستیدا لەگەڵ منت کردووە. منیش قەرزبار و سپاسگوزارتم.' بەو جۆرە نامەکەی تەواو کرد و دای به بریکارەکە. ئەویش ناردییەوە بۆ عەبدوڵلا. که عەبدوڵلا نامەکەی خوێندەوە، له ڕادەبەدەر خۆشحاڵ و کەیفساز بوو. ناردی به شوێن کابرادا. به کابرای گوت: 'پێت خۆشە کام یەک لەو دوو شتەی بەڵێنم پێ دابووی بتدەمێ؟' ئەو کابرایە گوتی: 'له دنیادا زێڕ له لای من له هەموو شتێک به بایەخترە.' ئیدی عەبدوڵلا دووسەدهەزار درهەم و دوو ئەسپی عەرەبی، بیست دەست جلی گرانبایی، ده دانە کۆیلە و هەندێک گەوهەری گرانبایی دا بەو پیاوە. کابرای به دڵێکی خۆشەوە ناردەوە بۆ

بەغدا.

"ئەو پیاوە هەر کە گەیشتەوە بەغدا، پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵی خۆیان، یەکسەر چووە ماڵی یەحیا. لە دەرگای دا. دەرکەوانی یەحیا چوو پێی گوت: 'گەورەم، کابرایەکی بەشکۆ لە بەردەرگایە و کۆیلەیەکی زۆریشی لەگەڵە، دەیەوێ بە خزمەتت بگا.' یەحیا گوتی: 'با بێتە ژوورەوە.' ئەو کابرایە کە هاتە ژوورەوە، کڕنۆشی برد. یەحیا گوتی: 'تۆ کێی؟' کابرا گوتی: 'من ئەو کەسەم کە بە دەست ڕۆژگاری ستەمکارەوە مردبووم و تۆ زیندووت کردمەوە. من هەر ئەو کەسەم کە نامەی ساختەم بە ناوی جەنابتەوە برد بۆ عەبدوڵڵای کوڕی مالیکی خوزاعی.' یەحیا لێی پرسی: 'ئەو چۆن لەگەڵت جووڵاوە و چی دایتێ؟' ئەو پیاوە گوتی: 'ئەوەندەی شت دامێ کە لەسەریشم زیادە و تەواو بێنیازی کردم. تەواوی دیاری و پێشکەشییەکانیشم هێناوەتە دەرکی ئێوە و فەرمان بە دەست خۆتە.' یەحیا گوتی: من سپاسگوزاری تۆم، چونکە ئەو چاکەیەی تۆ لەگەڵ منت کرد، زۆر لەو چاکەیە گەورەترە کە من لەگەڵ تۆم کردووە. تۆ بەو کارەت ڕق و کین و دژمنایەتی چەندینساڵەی ئیمەت کرد بە لێبووردەیی و خۆشەویستی و برایەتی. منیش ئەوەندەی عەبدوڵڵا پێی داوی، دەتدەمێ.' ئیدی یەحیا فەرمانی دا ئەوەندەی عەبدوڵڵا ماڵ و ئەسپ و شتی داوەتێ، بۆی بێنن. بەو شێوەیە ئەو کابرایە بە ماڵ و سامانێکی زۆرەوە گەڕاوە ماڵەوە و هەتا ما هەر دوعای خێری بۆ ئەو دوو جوامێرە کرد.

**چیرۆکی زیانەکانی مەی**

"دەگێڕنەوە: لەنێوان خەلیفەکانی تۆرەمەی عەباسدا کەس لە مەئموون ژیر و زاناتر نەبوو. بە جۆرێک کە هەموو زانستەکانی بە باشی دەزانی و هەموو حەوتوویەک کۆڕی بیروڕاگۆڕینەوەی زانایانی دادەنا. هەموو بیرمەند و بلیمەت و قسەزانەکانی هەریەکەی لە جێگە و پێگەی خۆ دەدایە.

"ڕۆژێک مەئموون لەگەڵ بلیمەت و ئاخێوەران دانیشتبوون، کابرایەکی غەوارە بە جلوبەرگێکی سپی و کۆنەوە وەژوور کەوت و لە لای خوار خوارەوە دانیشت. گەورەپیاوەکان دەستیان کرد بە قسەکردن و کردنەوەی گرێکوێرەکانی ڕۆژ. مەئموون خووخدەی وا بوو کە دانەدانە ڕووی لە تەواوی دانیشتووانی کۆڕەکە دەکرد و داوای لێ دەکردن قسەیەک، گێڕانەوەیەکی خۆش یان قسەیەکی نەستەق بکەن. ئەو ڕۆژەش هەرکەسەی شتێکی گوت هەتا نۆرە گەیشتە کابرای غەوارە. ئەو پرسیارەی لەوان کرابوو، لەویش کرا، کەچی وەڵامەکەی زۆر لەوانی دیکەی جوانتر بوو. خەلیفە دەستخۆشی لێ کرد.."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە مەئموونی ڕەشید قسەکەی ئەو پیاوەی بە لاوە پەسند بوو. فەرمووی: 'هەستە وەرە سەرتر دانیشە.' بابەتێکی دیکە هاتە گۆڕێ و دیسان بیروبۆچوونی ئەو لە کۆڕەکەدا زۆر لەوانی دیکە لەسەرتر بوو. دیسان فەرمووی: 'هەستە وەرە سەرترەوە دانیشە.' کە بابەتی سێیەم هاتە بەرباس، دیسانەکە ئەو کابرایە بیروڕاکەی هێند جوان و باش بوو، لە کۆڕەکەدا تای نەبوو. خەلیفە فەرمووی: 'وەرە لە پەنا خۆم دانیشە.'

"کە مشتوومڕ تەواو بوو، ئاویان هێنا. دەست شۆردرا و سفرە ڕاخرا. خواردن خورا. دوای ئەوە زانا و بلیمەتەکان هەستان چوونە دەرێ. مەئموون نەیهێشت ئەو پیاوە بڕوا. بانگی کردە لای خۆی. بە سۆز و خۆشەویستییەوە لەگەڵی دوا. گفتی خەڵات و یارمەتی پێ دا. ئەوجارر کۆڕی مەی خواردنەوەیان بەست. هاوڕێ و هاونشینەکانی بانگ کردن. ساقی جوان هاتن و پیاڵە وەگەڕ کەوتن. کە سەرە گەیشتە، ئەو پیاوە. خێرا هەستا و گوتی: 'خەلیفە، ڕێم بدە قسەیەک بکەم.' خەلیفە گوتی: 'چیت پێخۆشە بیڵێ.' ئەو پیاوە گوتی: 'خەلیفە، خودا دەوڵەتەکەت پایەدار کا، ئەمڕۆ دیار بوو کە من لەو کۆڕە شکۆدارەدا یەکێک لە مرۆڤە هەرە پێخوستەکان بووم، بەڵام بە هۆی ئەوەی تۆزە زانستێکت لە مندا شک برد. شوێن و پلەی منت بردە سەرتر و لە لای خۆت جێت بۆ کردمەوە. ئێستا دەتهەوێ کەلێنێک بخەیتە نێوان من و ئەو تۆزە زانیارییەمەوە. هەڵبەت من ڕێ بە خۆم نادەم بڵێم خەلیفە ئیرەیی بەو تۆزە زانستەی من دەبا، بەڵام خواردنەوەی مەی ئاوەز لە سەری مرۆڤ دەتارێنی و سووک و ڕسوای دەکا. من تکا لە خەلیفە دەکەم ئەو گەوهەرە دەگمەنەم پێوە ڕەوا ببینێ و لێم گەڕێ من نەخۆمەوە.' کە خەلیفە گوێی لەو قسەیە بوو، پەسن و تاریفی کرد و لە شوێنی خۆی هێشتیەوە. ڕێز و حورمەتی ئەوەندەی دی بردە سەرێ. سەدهەزار درەمیشی دایە، کەوایەکی شۆڕی گرانبایيشی خەڵات کرد. لە کۆڕی باس‌وخواس و مشتومڕە زانستییەکاندا هەمیشە لە لای خۆی دایدەنا. لە هەموو بیرمەند و بلیمەتەکان لە لای بە قەدرتر بوو.

### بەسەرهاتی عەلی کوڕی مەجدەددین و کەنیزەکەی

"یەکی تر لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە سەردەمانی زوو بازرگانێک هەبوو لە بازرگانەکانی خۆرهەسان[1] ناوی مەجدەددین بوو. ئەو کابرایە خاوەنی ماڵ و سامان و کۆیلە و کەنیزێکی

---

[1]. خۆرهەسان: خۆرهەستان، خوراسان، ئەو شوێنەی خۆر لێوەی هەڵدێ. ویلایەتێکە کەتووەتە خۆرهەڵاتی

زۆر و زەوەند بوو. بەڵام تەمەنی لە شەست لای دابوو و هێشتا خودا منداڵی بە قسمەت نەکردبوو. وا بوو خودای گەورە و خاوەن دەسەلات منداڵێکی دایە. ناوی منداڵەیان نا عەلی. کاتێک کورە گەورە بوو، بوو بە خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکی باش. بابی نەخۆش کەوت و مەرگ بەر بینگی گرت. هەر بۆیە بانگی کورەکەی کرد و پێی گوت: 'ڕۆڵە گیان، کاتمە و من ئەوە دەمرم. دەمەوێ وەسیێتت بۆ بکەم.' کورە گوتی: 'وەسیێتەکەت چییە؟' مەجدەددین گوتی: 'کورم، خۆت لە هاوڕێی خراپ مەدە، چونکە هاوڕێی خراپ وەک ئاسنگەر وایە. ئەگەر بە ئاورەکەشی نەتسووتێنێ، بە دووکەڵەکەی نارەحەتت دەکا. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

خۆ لە هاوڕێیەتی ماستاوکەر لا دە
زمانلووسە و درۆزنە و شەییادە
هەتا هەتە، گوێلەمستە تاهەتا
کە لێت قەوما نەیناسیوی ئەبەدا

"عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بابە، بەسەر چاو بە قسەت دەکەم. چی دیکەش؟' مەجدەددین گوتی: 'هەتا بۆت دەکرێ لەگەڵ خەڵک باش بە و چاکەیان لەگەڵ بکە، دەستی لێقەوماوان بگرە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ڕێگەی جوامێر و مێرخاسان بگرە
تۆ کە سەرکەوتووی، کەوتووان بێنە سەر
بە چاکە، دڵێک بحەسێنەوە
سووژدەی بێ چاکە ناتهێنێتە سەر

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

ئێرانەوە. بەو ناوەدا دەبێ سەردەمانێک بە دەست کوردەوە بووبێ. ئێستا نزیک نیومیلیۆن کوردی تێدا دەژی. (و. ک.)

## که شەوی سێسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی کوڕی مەجدەددین بە باوکی گوت: 'بەسەر چاو، چی دیکەش هەیە ڕەچاوی بکەم؟' مەجدەددین گوتی: 'ڕۆڵە، ئاگات لە خودا بێ، با ئەویش ئاگای لە تۆ بێ. ماڵ و سامانی خۆت بە فیڕۆ مەدە، با تووشی دەرکی خوێڕی نەبی. ئەوە بزانە نرخی پیاو بە سامانەکەیەوەیەتی. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

بێ ماڵی دنیا، دەوروبەریانت پێ ڕازی نابێ
گەر ڕازی نەبوون ئیدی نەیارت بە تۆ خۆش دەبێ
چی لە دەست نایە ئەو کەسەی هیچی لە دەستدا نییە
ڕووحە و لە جەستەدایە کە زێڕت لە گیرفاندا بێ

"عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'باوکە، چی دیکەش؟' مەجدەددین گوتی: 'ڕۆڵە، کەسێک کە لە تۆ بەتەمەنترە، لە کاروبارتدا ڕاوێژی لەگەڵ بکە. لە کارەکانتدا پەلە مەکە. بەزەییت بە ژێردەستانتدا بێ، با ئەوان بەزەییان بە تۆدا بێ. ستەم لە کەس مەکە، چونکە ئەوەی ستەمی لێ دەکەی، خودای بەرز و مەزن ڕۆژێک بەسەر تۆیدا زاڵ دەکا. شاعیر لە بارەی ئەو سێ بابەتەوە دەڵێ:

ڕاوێژ دەبێ ڕەچاو بکەی هەتاکوو هەی
ڕاوێژ بکەی کارت جوانە دوور لە هەڵەی
پەلەپەل دنەی شەیتانە، وریا بە تۆ
پیشەی ڕەحمان ئارامییە و لەسەرەخۆ
وریای ژێردەستانت بە، ئازاریان نەدەیت
نەکا ڕۆژێ لەژێر دەستیدا گیان بدەیت

"'کوڕم تکات لێ دەکەم خۆت لە مەیخواردنەوە بپارێزە، چونکە سەرچاوەی تەواوی خراپەکانە. خواردنەی دەبێتە هۆی سووکی مرۆڤ و ئاوەز لە کەڵلەیدا ناهێڵێ. لە بەرچاوی خەڵک سووک و چرووکن. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

زانا مەستی ناکات و عاقڵ مەی ناخواتەوە
ژێر کارێک ناکا ڕۆژێ بێت، پەشیمان بێتەوە
گەر چاکە بکا دەڵێن: 'هۆشی نەبوو، مەی پێی کرد'

بشـــزەڕێنێ پێی دەڵێن: 'ئەهـا دیســـان خۆی کەر کرد

" 'ڕۆڵە گیـان، ئەوانە قەوینتی من بوو بۆ تۆ، بەڵام لە بیریـان مەکە.' دوای ئەوە مەجدەددین لە هۆش خۆی چوو. ئیستێکی پێ چوو بە هۆش هاتەوە. شـایەدومانی هێنا و گیانی دەرچوو. کوڕە لەســـەری گریا، پاشـــان کفن کرد. گەورە و چکۆلە هاتنە ســـەری گەردنازاییان کرد. ئینجا نوێژیان لەســـەر کرد و ناشــتیان. ئەو دوو بەیتەشـیان لەســـەر کێلەکەی نووسی:

ئەو گەورە پیـاوەی قـۆڵـی هەڵـمـاڵـی
دەسـتی یارمـــــــەتی خسـتە بنباڵی
لێقەومـــــــــــاوانی ئەو ئاو و گڵە
ئێستا مـــــــــــخابن وا لەژێر گڵە

"دوای ئەوە عەلی کوڕی مەجـدەددین چۆکی خەمی لە ئـامێز گرت و هەر لە خەمی باوکیدا بوو کە دایکیشـی دوای ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کرد. عەلی کوڕی مەجدەددین ئەوەی بۆ باوکی کردی، بۆ دایکیشی کرد.

"دوای ئەوە وەسێتەکەی باوکی ڕەچاو کرد و چوو لە دووکان دانیشت. دەستی کرد بە سـەودا. هاتوچۆی کەسـی نەدەکرد. سـاڵێک ئاوا تێپەڕی. دوای سـاڵێک لات و پووت تێی ئالان. بە فێڵ و کەڵەک خۆیان لێ نیزیک کردەوە و لەگەڵی بوون بە هاوڕێ و برادەر. وای لێ هات ئەویش لەگەڵیان هاوڕەنگ بوو. ڕێگەی ئەوانی گرتە بەر. لە ڕێی ڕاســـت لای دا. ڕووی کردە مەیخواردنەوە و بەڕەڵایی. دەیگوت: 'بابم ئەوماڵەی بۆ من کۆ کردووەتەوە. ئەگەر من نەیخۆم، بۆ کێی بەجێ بێڵم؟! بە خودا ڕاست بە قسەی شاعیر دەکەم کە دەڵێ:

ئەوەی هەتە بـیـخـۆ لەگەڵ هـاوڕێـیـان
دەنا دەیخۆن دژمنت و هـــــــــاوڕێکانیان

"بەو جۆرە عەلی کوڕی مەجدەددین شـــەو و ڕۆژ ماڵەکەی لەڕێی ئارەق و واشـــتادا خەرج دەکرد هەتا وای لێ هات تەواوی ماڵەکەی دانا. دووکان و کاروانســـەراکەشـــی فرۆشـت. وای لێ هات لە کاتی مەسـتیدا جلەکانی بەری فرۆشـت. کە هاتە سـەر خۆی و مەستییەکەی ڕەوی، مات و پەشێو بوو. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە چووە ماڵەوە و لە ژوورەوە نەهاتە دەر. هەر بە برسـێتی دانیشـت. ئەوجارر لە بەر خۆیەوە گوتی: 'دەچم بۆ لای ئەو کوڕانەی هاوڕێم. بەشکو یەکیان دەرگام لێ بکاتەوە پارووە نانێکم بداتێ؛ من ئەو هەمووەم

بۆ ئەوان خەرج کردووە.' ئیدی چووە دەرکی هەموویان و دانەدانە لە دەرگاکەیانی دا. وا بوو هیچیان دەرگایان لێ نەکردەوە. خەریک بوو لە برسان بمرێ. تەواو بێهێز ببوو. هەستا چوو بۆ بازاڕی بازرگانان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی کوڕی مەجدەددین لە برسان خەریک بوو تێدا بچێ، هەستا چوو بۆ بازاڕی بازرگانان. خەڵکەکەی دیت لە شوێنێک کۆ ببوونەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بڵێی بۆ کۆ بووبنەوە؟ وا چاکە جارێ ڕاوەستم بزانم چی بووە و بۆ کۆ بوونەتەوە.' ئینجا چووە پێشەوە، سەیری کرد کچێکی باڵابەرز و گوڵڕوخسار لەوێیە کە لە جوانی و ڕێکوپێکیدا تای نییە. لە جوانیشدا هیچی تێدا نەهێشتووەتەوە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

سێ هاوتای گوڵ و نێرگز و سونبولن
ڕوخ و چاو و بسکی خاوی گوڵگوڵن
سێ شت پێناسەی بسک و کەزیەتن
پێڵی دەریا و ماری سارا و قەددتن
بە بۆنی کەزیەت سێ شت بەختیارن
شانە و دەمی شانە و دەستی دڵدارن

"کچە ناوی زمڕوود بوو. کە عەلی کوڕی مەجدەددین ئەوی دیت، سەری لەو هەموو جوانییەی سووڕ ما. گوتی: 'بە خودا لێرە نابزووم هەتا نەزانم نرخی ئەو کەنیزە دەگاتە چەندە و بزانم کێ دەیکڕێ.' ئیدی لەنێو بازرگانەکان ڕاوەستا. بازرگانەکان وایان زانی ئەویش کڕیاری کەنیزەکەیە، چونکە ئەویان بە دەوڵەمەند دەزانی.

"ئینجا دەلاڵەکە لە لای کەنیزەکە ڕاوەستا و گوتی: 'بازرگانەکان، دەوڵەمەند و سامانداران! یەکتان نرخ لەسەر ئەو کەنیزە ڕوومانگ و هەنیەزوهرە و مەمکهەنارە کە ناوی زمڕووودە، دانێ. یەکێک لە بازرگانەکان پێنجسەد دیناری دانا. یەکی دیکە دە دیناری زیاد کرد. پیاوێکی چاوشینی ناحەز کە ڕەشیدەددینیان پێ دەگوت، سەد دیناری دیکەی زیاد کرد. یەکی دی دە دیناری زیاد کرد. ئەوجار ڕەشیدەددین گوتی: 'من بە هەزار دینار دەمەوێ.' ئینجا بازرگانەکان متەقیان لێ بڕا و بێدەنگ بوون. دەلاڵەکە لەگەڵ خاوەنی کەنیزەکەدا ڕاوێژی کرد. خاوەنی کەنیزە گوتی: 'من سوێندم خواردووە کە هەتا کەنیزەکەش بەو کەسە ڕازی نەبێ، نایفرۆشم. کەوایە لەگەڵ کەنیزەکە قسە بکە.'

"ئیدی دەلاڵەکە چوو لەگەڵ کەنیزەکە قسەی کرد و گوتی: 'خۆری جوانان، ئەو بازرگانە دەیەوێ تۆ بکڕێ. دەڵێی چی؟' کەنیزە شۆخەکە چاوێکی لە پیاوە چاو شینە ناحەزەکە کرد و بە دەلاڵەکەی گوت: 'ناکرێ من بە پیاوێکی پیر بفرۆشن، چونکە شاعیر دەڵێ:

مێردی کچی نەونەمام میریش بێ
پیاوێکی پیر بێ، ژینی ژار دەبێ
لەناو ژناندا ئەو قسە باوە
گڕ لە ئامێزت گرێ نەک پیرێ

"کە دەلاڵەکە گوێی لە قسەی کەنیزەکە بوو، گوتی: 'بە خودا قسەکەی تۆ زۆر جوانە و ڕەوایە و نرخی تۆ دەهەزار دینارە.' دوایی یەکی دیکە لە بازرگانەکان هاتە پێشێ و گوتی: 'بەو نرخەی شێخ ڕەشیدەددین داینا، منیش دەمەوێ.' کەنیزە چاوێکی لێ کرد. سەیری کرد کە ئەو ڕدێنی خۆی ڕەنگ کردووە. کەمێکی لێ ورد بووەوە، زۆری پێ سەیر بوو و ئەو شێعرەی گوت:

وا دیارە ڕیشی لە هەش گرتووە
قۆزە و پیربوونی لە بیر کردووە
چاو لە کابرا کەن بە فێڵ و کەڵەک
چۆناوچۆن ئابڕووی خۆشی بردووە

"کە بازرگانەکە گوێی لەو شێعرە بوو، لە فیتی خۆی گەیشت و کشاوە. بازرگانێکی دیکە چووە پێشێ و بە دەلاڵەکەی گوت: 'هەر بەو نرخە قسەیەکی بۆ منیش لێ بکە.' کاتێک کەنیزە چاوی لێ کرد، دیتی ئەوە چاوێکی کوێرە. گوتی: 'ئەو پیاوە یەکچاوە و شاعیر لە بارەی یەکچاوانەوە دەڵێ:

پیاوێکی لەخۆبابیە و چاوێکی کوێرە
لە خۆی دەرچووە، هەر لە خۆڕا هاتووەتە ئێرە
هێندە بە فیز و دەمارە بە تاقە چاوێ
ئاگام لێیە بۆ گەورە و چووک دەخا لاتاوێ

"ئەوجار دەلاڵەکە دەستی کێشا و دەستی بازرگانێکی گرت و هێنایە پێشێ و گوتی: 'ئەگەر ڕازی بی، بەو بازرگانەت بفرۆشم؟' کەنیزە چاوی لێ کرد. ئەوی کورتە بالا و ڕدێندرێژ هاتە بەرچاو. گوتی: 'ئەوە ئەو کەسەیە کە شاعیر دەڵێ:

ڕدێنت درێژ و بالاکەت کورتە
ناشیرینترین جۆری ڕێکەوتە
ئەویانت کورتە وەک ڕۆژی پاییز

"ئیدی دەلاڵەکە بە کەنیزەکەی گوت: 'خانم، چاوێکیان لێ بکە کامەیانت بە دڵە بڵێ با بەوت بفرۆشـم.' کەنیزە چاوی بە دانەدانەیاندا گێڕا و لە دڵی خۆیدا سـەنگوسـووکی کردن هەتا چاوی بە عەلی کوڕی مەجدەددین کەوت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که کەنیزەکه چاوی به عەلی کوڕی مەجدەددین کەوت، گیرۆدەی داوی ئەوینی بوو. جا چونکه عەلی کوڕی مەجدەددین لاوێکی جوانچاک و قۆز بوو، هەر بۆیه کەنیزه ئاماژەی بۆ عەلی کرد و به دەڵاڵی گوت: 'من جگه لەوەیان، پیاوی دیکە ناوێ. ئەوه باڵاسەلو و ڕووگوڵە، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

گەر قەراره هەر پێم بکرێ مامەڵە
با له داوی ئەوینی ئەو ئەوەدا بم
مووی فڕ و ئاڵقەئاڵقه و لەبەردڵە
بەو کوڕه قۆزه نەبێ ڕازی نابم

"دوای ئەوه گوتی: 'کەس بۆی نییه خاوەنی من بێ، جگه لەو کوڕه قەدباریک و چاوڕەش و مووعەنبەرە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

هەرکەسێ جارێ سەروکاکۆڵی ئەو کوڕەی دیبێ
دڵنیام هەرگیز ئەو وێنه جوانەی له دڵ دەرناچێ
کەروێشکەی کاکۆڵی ویم که به دەم باوه دێ گوتم
خۆشی نابینم بێتوو ئەو کوڕەم به قسمەت نەبێ
شادی جێی چێ کرد له دڵما، به هۆی ئەوینییەوە
شاد و خۆشحاڵه دڵێ که ئەڤین میوانی ئەو بێ
کێ له دەستی دێ بەهاراسا وڵات بۆنخۆش بکا
هەواش سەرمەستی بۆی کاکۆڵییەتی کاتێ دەجووڵێ

"که دەڵاڵەکه گوێی لەو شێعرەی کەنیزەکه بوو که بەسەر عەلی کوڕی مەجدەددینیدا هەڵگوت، سەری له زمانپاراویی ئەو کەنیزه سووڕ ما. خاوەنی کەنیزەکه به دەڵاڵەکەی گوت: 'پێت سەیر نەبێ. ئەو زۆری شێعر و غەزەل خوێندووەتەوە و شارەزایە. قورئانی مەجید به حەوت ڕیوایەت دەخوێنێتەوە و تەواوی فەرموودەکانت به درووستی بۆ دەگێڕێتەوە. به حەوت زمان دەنووسێ. ئەوەندەی زانیاری له لایه و زانستی جۆراوجۆر دەزانێ که زانایان مستێک له خەرمانی زانستی ئەون. دەستڕەنگینێکەشی که لەوێ ڕاوەستێ له تەواوی قامکەکانی زێڕ و گەوهەر دەبارێ. له هەشت ڕۆژدا پەردەیەکی ئاوریشمت بۆ دەدوورێ که هەر پەردەیەی پەنجا دیناری زێڕی سوور خێر دەکا.'

"دەلاڵەکە گوتی: 'خۆزگەم بەو کەســە کە ئەو گوڵە ســووره دەچێتە ماڵەکەیەوە.' دوای ئەوە خاوەنی کەنیزەکە بە دەلاڵەکەی گوت: 'بۆخۆی کێی پێ خۆشە بەوی بفرۆشە.'

"ئەوجار دەلاڵەکە ڕووی لە عەلی کوڕی مەجدەددین کرد و دەســـتی ماچ کرد و پێی گوت: 'گەورەم، ئەو کەنیزە بکڕە کە ئەو بۆ تۆی پێ خۆشـــە.' عەلی کوڕی مەجدەددین ماوەیەک سەری داخست و لە بەر خۆیەوە کەمێک بە خۆی پێکەنی و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'من نانی بەیانیم نەخواردووە، چۆن دەتوانم ئەو کەنیزە بکڕم؟! بەلام لە ڕووشــم نایە بڵێم پارەم نییە.'

"ئیدی کەنیزەکە سەرداخستنی ئەوی دیت و بە دەلاڵەکەی گوت: 'دەستم بگرە، بمبە بۆ لای ئەو. بزانم دڵگەرمی ناکەم و ســەرنجی ڕاناکێشــم.' دەلاڵەکە دەســتی گرت و بردیە بەردەمی عەلی کوڕی مەجدەددین. پێی گوت: 'گەورەم، چۆنە ئەو ڕوومانگەم لێ بکڕی؟' عەلی کوڕی مەجدەددین دەنگی نەکرد و وەلامی نەداوە. ئەوجار کەنیزەکە لێی پرســـی: 'ئەوە چۆنە من نـاکڕی؟' تۆ چەنـدە دەدەی بیـدە، من تۆ بەختەوەر دەکەم. عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'خۆ کڕین و فرۆشــتن بە تکا و ڕەجا و زۆری نابێ. تۆ بە هەزار دینار گرانی.' کەنیزەکە گوتی: 'گەورەم، تۆ نۆســـەد دینار بدە.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'نۆســـەدیش گرانە.' کەنیزە گوتی: 'تۆ هەشــتســـەد بدە.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'زۆرە.' کەنیزە بەردەوام نرخی خۆی هێنا خوارێ هەتـا ئـاخری گوتی: 'بە ســـەد دینـار بمکڕە.' عەلی مەجدەددین گوتی: 'من ســـەد دینارم پێ نییە.' ئەوجار کەنیزەکە پێکەنی و گوتی: 'ســـەد دینـارەکە چەندی کەمە؟' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بە خودا من لە دینارێکەوە هەتا ســـەد دینار هیچم پێ نییە. نە درەم و نە دینار. تکایە کەســـێکی دیکە بدۆزەرەوە.' کەنیزە کە زانی هەر هیچی پێ نییە، لێی چووە پێشــتر و دەســتی بە گیرفانی خۆیدا کرد، کیســـەیەکی دەرهێنا کە هەزار دیناری زێڕی ســـوور تێدا بوو. دای بە عەلی کوڕی مەجدەددین و پێی گوت: 'ئەو زێڕانە هەڵگرە، نۆسەد دینار لەو زێڕانە بدە بە خاوەنم و ســەد دینارەکەی دیکە هەڵگرە با پێت بێ.' بەو جۆرە عەلی کوڕی مەجدەددین کچەی بە نۆسەد دینار کڕی و پارەکەی هەر لەو کیسەیە دا. کەنیزەی لەگەڵ خۆی بردەوە ماڵێ.

"کەنیزە کە چووە ماڵەکەی، ســەیری کرد ماڵێکی چۆڵ وەک کەلاوە وایە. نە فەرشـــی تێدایە و نە دەفر و کەلوپەلی ناو ماڵ. ئیدی هەزار دیناری دیکەی دایە و پێی گوت: 'بچووە بۆ بازاڕ، بایی سێ سەد دینار فەرش و دەفر و شت بکڕە و بایی سێ دیناریش خواردن و خواردنەوە بێنەوە.' عەلی کوڕی مەجدەددین چوو ئەوانەی کڕی."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کەنیزە بە عەلی کوڕی مەجدەددینی گوت: 'بایی ســـێ دیناریش خواردن و خواردنەوە بێنەوە.' دوای ئەوە کەنیزە گوتی: 'پەردەیەکی ئاوریشـــم و حەوت جۆرە ئاوریشمم بۆ بکڕە.' عەلی ئەوانەشی کڕی.

"ئیتر کەنیزە فەرشـی ڕاخسـت و چەند مۆمی هەڵکرد. لەگەڵ عەلی کوڕی مەجدەددین دانیشـتن و خەریکی خواردن و خوارنەوە بوون. دوای ئەوە چوون تێ خزان و لە ئامێزی یەکتردا خەوتن. وەک شاعیر دەڵێ:

ژیـن لە چـاو دوێـنـێ شــتـێکـی دی بـوو
بەخـــتەوەری وام هەرگــیــز نەدیــبــوو
خـۆشـــبـەخـتـی وەهـا ڕووی تـێ کـردبـووم
ڕابــردووی تــاڵــی لە بــیــر بــردبــووم
هـێـدە شــــیـریـن بـوو بـزە و کەنـیـنـی
هەر دەتـگـوت خەریـکـی گـوڵـچـنـیـنـی
ئەو شــــەوە چـۆن ڕۆی خـۆشــــم نـازانـم
فــریشــــــتەیەکە هــاتــووەتە ژیــانــم

"هەتا بەیانی لە پاڵ یەکتردا خەوتبوون. کە ڕۆژ بووەوە، کەنیزە جوانەکە دەســـتی دا پەردەکە و بە ئاوریشـمە ڕەنگاوڕەنگەکان و بە تاڵی زێڕ و زیو نەخشـی جۆراوجۆری تێدا نەخشـاند. لەسـەر ئەو پەردەیە وێنەی مەل و باڵندە و ئاژەڵی کێوی تێدا کێشا. هیچ شـتێک لە دنیادا نەما کە ئەو کەنیزە لەسەر ئەو پەردەیە وێنەکەی نەکێشابێ. هەشت ڕۆژ خەریکی ئەو پەردەیە بوو. کە تەواو بوو، جوان سـاف و سـفت و ڕێکوپێکی کرد. پێچایەوە و دای بە عەلی کوڕی مەجدەددین و پێی گوت: 'ئەوە بەرە بۆ بازاڕ و بیفرۆشــــە بە پەنجا دینار. بەڵام نەچی بە خەڵکی ئاسایی بفرۆشی—بە بازرگانەکانی بفرۆشە. ئەگەر وا بکەی، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی من و خۆت. چونکە ئێمە نەیارمـان زۆرە.' عەلی کوڕی مەجدەددین پەردە ئاوریشمەکەی برد بۆ بازاڕ و بە بازرگانی فرۆشت. قوماشی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ و تاڵی زیو و زێڕی کڕی و هێنایەوە. خواردەمەنی و شــتیش ئەوەندەی پێویســـتیان بوو کڕی. ئەو درەمەی زیادیش ماوە دایەوە بە کەنیزەکە.

"هەر بە هەشـــت ڕۆژان کەنیزە پەردەیەکی ســـاز دەکرد و دەیدا بە عەلی کوڕی مەجدەددین. ئەویش دەیبردە بازاڕ و دەیدا بە پەنجا دینار. هەتا ســـاڵێک ئەوە کاریان بوو.

ـوای سالێک دیسان ڕۆژێک عەلی پەردەی هەڵگرت، بردی بۆ بازاڕ و دای بە دەلاڵێک. لەو جەنگەیەدا گاورێک هات و داوای پەردەکەی کرد و شـــەســـت دیناری دا. عەلی کوڕی مەجدەددین نەیدا. گاورەکە زیاتری کرد. عەلی هەر نەیدا. هەر زیادی کرد هەتا گەیشـــتە ســەد دینار و گفتی دە دیناریشی بە دەلاڵەکە دا. دەلاڵەکە هاتە لای عەلی کوڕی مەجدەددین پێی گوت: 'ئەو پارەیە پارەیەکی کەم نییە' و هانی دا ســـەوداکە بکا. پێشـــی گوت: 'تۆ نیگەرانی ئەو گاورە مەبە و جێی نیگەرانی نییە.'

"عەلی کوڕی مەجدەددین بە دڕدۆنگییەوە پەردەکەی بە کابرای گاور فرۆشت. پارەکەی وەرگرت و بەرەو ماڵ بووەوە. سەیری کرد، ئەوە گاورە بەدوایدا دێت. بۆی گەڕاوە و لێی پرســـی: 'ئەوە بۆ وەدوای من کەوتووی؟' گوتی: 'گەورەم، لەو کۆلانە کارێکم هەیە.' عەلی کوڕی مەجدەددین هێشـــتا تەواو وە ژوور نەکەوتبوو کە گاورە گەیشـــتە بەردەرگا. عەلی چووە پێشـێ و گوتی: 'گلاو، دەڵێم بۆ بەدوامدا دێی؟' گاورە گوتی: 'گەورەم، زۆرم تینووە. قومێکم ئاو دەیە خودا پاداشـــت داتەوە.' عەلی کوڕی مەجدەددین لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوەش باوەڕدارە لە پەنا ئێمەدا دەژی. قومێک ئاو چ نییە؟ وەڵا دڵی ناشکێنم.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلی لە بەر خۆیەوە گوتی: 'وەڵا دڵی ناشـــکێنم.' ئیدی چووە ژوورەوە دەســـتی دا گۆزە ئاوەکە. زمڕوود ئەوی دیت هـات بە لایەوە، لێی پرســـی: 'خۆشەویستم، پەردەکەت فرۆشت؟ گوتی: 'ئەرێ فرۆشتم.' گوتی: 'بە بازرگانت فرۆشت یان بە ڕێبوار؟ ڕاســـیتم پێ بڵێ، من دڵم جۆرێک خەبەر دەدا.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بە بازرگانم فرۆشت.' زمڕوود گوتی: 'ڕاستییەکەیم پێ بڵێ، با بیرێکی بۆ بکەمەوە. بۆ دەســـتت دا ئەو گۆزەیە؟' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'ئـاو بۆ دەلاڵەکە دەبەم.' کەنیزەکە گوتی: 'پەنـا بە خوا، بۆ خۆت لە دوژمن نـاپـارێزی؟!' دوایی ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

خۆ بـــــپارێزە لەوەی نەیاری تۆ دەڵێ بـــــــــــیکە<br>
بۆ ئەوەی پەشیـ......ـــــمان نەبیتەوە قەتقەتی مەکە<br>
ئەگەر بێتوو ڕێت، نیشان بدا ڕێک، وەکوو بەری دەست<br>
نەچی بەگوێی کەی، پشت لەو ڕێیە کە و بگرە ڕێی دیکە

"ئاوا بوو، عەلی کوڕی مەجدەددین گۆزە ئاوەکەی هێنا دەر. ســـەیری کرد گاورەکە هاتووەت دالانەکە. پێی گوت: 'خوێڕی، ئەوە بۆ بێ مۆڵەت هاتوویتە ماڵی منەوە؟' گاورەکە گوتی: 'گەورەم، لە بەردەرگابوون و لە دەلانبوو چ جیاوازییەکی نییە.' گۆزە ئاوەکەی دایە. گـاور ئـاوەکەی خواردەوە و گۆزەکەی داوە بە عەلی کوڕی مەجـدەددین. عەلی کوڕی گۆزەکەی لێ وەرگرت و گوتی: 'هەســـتە بڕۆ وەدوای کاری خۆت کەوە.' گاورە گوتی: 'گەورەم، تـازە پیـاوەتییەکەت مەکەوە بە هیچ و بە منەت بێبـایەخی مەکە. ئـاوەکەم خواردووەتەوە و دەمەوێ نمەکیشـــت بکەم. ئەگەر لەتە نـانێکی جۆش بێ.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'پێش ئەوەی بە تێهەڵدانت دەم، هەستە وەدەر کەوە. بڕۆ بە لای کاتەوە.' گاورەکە گوتی: 'ئەگەر دەزانی ماڵەوە هیچی لێ نییە، ئەو ســەد دینارەم لێ وەرگرە بچووە لە بـازار خواردنێکم بۆ بکڕە بـا نمەکی تۆ بکەم.' عەلی کوڕی مەجدەددین لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وا دیارە ئەو گاورە زۆر گەوجە. با ئەو سەد دینارەی لێ وەرگرم و بایی دوو درەم شـتی بۆ بکڕم بیخوا.' گاورەکە ئەوەشـــی گوت: 'من هەر شـتێکم دەوێ کە برســـییەتیم بشکێنێ، ئەگەر نانێکی وشکیش بێ، چونکە باشترین خواردنەکان ئەوانەن برسێتی نەهێڵن. نەک ئەوەی تامی خۆش بێ. لەو بارەوە شاعیر دەڵێ:

که گوڵقەند بخۆی و لە گوشـــاردا بی، گەنده[1]
ورکەنــان بخۆی و ئــاســـووده بی، گوڵقەنـده

"ئیدی عەلی کوڕی مەجدەددین بە گاورەی گوت: 'تاوێک لێرە بحەســێوە، ئەوە دەرگا دادەخەم و دەچم بۆ بازاڕ. شتێکت بۆ دەکڕم و دێمە.' گاور گوتی: 'باشە بە چاوان.'

"عەلی کوڕی مەجدەددین دەرگای لەســـەر کابرا گاڵە دا و کلیلەی لە گیرفانی نا و ڕۆیشـت بۆ بازاڕ. لەوێ کەمێک هەنگوین و کاکڵە بادام و نان و ماسـی کڕی و گەڕاوە. کە گاورەکە ئەوی دیت، پێی گوت: 'گەورەم، ئەو هەموو شتەت بۆ کڕی، بەشـی دە کەس دەکا و من بە تەنیام. ڕەنگە تۆش لەگەڵم بخۆی.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بە تەنیا بخۆ، چونکە من تێرم.' گاور گوتی: 'گەورەم، حەکیمان دەڵێن هەرکەس نان لەگەڵ میوان نەخوا، نە ناپاک بووە.' کە عەلی کوڕی مەجدەددین ئەوەی بیســـت، دانیشـــت و کەمێکی لەگەڵ خوارد. ویستی بکشێتەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. گوڵقەند: جۆرێک شیرینییە لە برێشکە(سەرداری) و شەکر و ڕەنگ دروست دەبێ.

## که شەوی سێسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی کوڕی مەجدەددین هەر کە ویستی بکشێتەوە و هیچی دیکە نەخوا، گاورە بادامێکی شکاند و ناوکەکەی کردە دوو کوتەوە و نەختێکی بەنگ خستە بەینی دوو لەتەکەوە کە فیلی لە خەو دەکرد. لە هەنگوینەکەی هەڵکێشا و بە عەلی کوڕی مەجدەددینی گوت: 'بە خودا دەبێ ئەوەندەش بخۆی.' عەلی کوڕی مەجدەددین لە ڕوو داما و لێی وەرگرت و خواردی. هێشتا تەواو لە گەدەیدا نەتوابووەوە کە بە لایدا خست. گاورەکە هەر کە ئەوەی دیت، وەک گورگ ڕاپەڕی و کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا. چوو براکەی ئاگادار کردەوە، چونکە براکەی هەر ئەو کابرا ناحەزە چاو شینە بوو کە ویستی کەنیزەکە بە هەزار دینار بکڕێ. کەنیزە خۆشی نەویستبوو و ئەو شێعرە گاڵتەجاڕییەشی بۆ گوتبوو. ئەو کابرایە بە ڕواڵەت موسوڵمان و لە بنەوە کافر بوو. ناوی خۆی نابوو ڕەشیدەددین. وا بوو ئەو کچە ناخۆشی ویست و ئەو شێعرە پڕ لە تانەوتەشەرەی بەسەردا هەڵگوتبوو، ئەویش چووبوو بۆ براکەی گێڕابووەوە. کە ئەو گاورە بوو. ئەمیش لە وەڵامدا دەڵێ: 'خەمت نەبێ، دەبێ کارێک بکەم بێ ئەوەی یەک درەم و دیناریش بدەی. بۆت بێنمەوە ئێرە.' لەو ڕۆژەوە دایمە لە دەرفەتێک دەگەڕا و داوی دەناوە هەتا ئەمڕۆ ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخسا. ئاوا بە ئاسانی کلیلەکەی لە گیرفانی عەلی کوڕی مەجدەددین دەرهێنا و چوو بۆ لای براکەی. ئەوی لەو شتە ئاگادار کردەوە. براکەشی گورج سواری هێستر بوو، لەگەڵ کۆیلەکانی هات بۆ ماڵی عەلی کوڕی مەجدەددین . توورەکەیەکی هەزاردیناریشی لەگەڵ خۆی هێنا. هەتا ئەگەر تووشی داڕۆغە بوو، دەمی ئەوی پێ ببەستێ.

"کە گەیشتنە بەردەرگای ماڵی عەلی کوڕی مەجدەددین، دەرگای ماڵەکەیان کردەوە. کۆیلەکان دەوری زمڕوودیان گرت و هەرچۆنێک بوو گرتیان و پێیان گوت: 'بێدەنگ بە. ئەگەر هەراوهوریا بکەی دەتکوژین.' ئیدی بێ ئەوەی دەست لە هیچ شتێک بدەن، لە کاتێکدا عەلی کوڕی مەجدەددین لە دالانەکە کەوتبوو، کلیلەکەیان لە پەنا دانا. هەر ئاوا ماڵەکەیان بەجێ هێشت و دەرگایان پێوە دا. کچەیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ ماڵی گاورەکە.

"گاورە ئەوی لە پاڵ کەنیزەکانی دیکەی کرد و پێی گوت: 'قەحبە، من هەر ئەو کەسەم کە حازر بووم بە هەزار دینار بتکڕم، بەڵام تۆ ڕازی نەبووی و بە شێعر تانە و تەشەری دنیات لێ دام. ئێستا ئەوە تۆم بەبێ دینار و درەم وە چنگ خست.' کەنیزە گریا و گوتی: 'گڵاوی پیس، چۆن توانیت من و خاوەنم لێک بکەی؟' گاورە گوتی: 'قەحبە، دەبینی بەم زووانە چۆنت ئازار دەدەم. بە مەسیح و پاکیزە قەسەم، ئەگەر گوێڕایەڵم نەبی و نەیەیتە

ــەر دینی من، بە دەیان شێوەی جۆراوجۆر ئازارت دەدەم.' کەنیزە گوتی: 'قەسەم بە خوا، ئەگەر بە زیندوویی تەواوی گۆشـــتی گیانم بپچڕی، دەســـت لە باوەڕی خۆم هەڵناگرم. هیوادارم خودا بە زووترین کات فریام کەوێ.' ئیدی گاورە زۆر چاکی لێ دا و ئەویش هەر گریا و هاواری کرد. دوای ئەوە ئیتر هاواریشی نەدەکرد و ددانی بە جەرگیدا دەگرت. وەک دەڵێن: 'حســـبی الله.'[1] هەتا وای لێ هـات لە زمـان کەوت. کە گـاورەکە ئاوای دیت، بە خزمەتکارەکانی گوت: 'بیبەن لە چێشتخانەی هاوێن و خواردنیشی مەدەنێ.'

"کە ڕۆژ بووەوە، دیسـان کەنیزەیان هێناوە. هەر بەو شـێوەیەی ڕۆژی پێشـوو لێیان دا هەتا لە هۆش خۆی چوو. ئینجا بە خزمەتکارەکانیان گوت: 'بیبەن بیخەنە چێشـــتخانەوە.' دوای ماوەیەک کەنیزەکە وە خۆ هاتەوە، گوتی: 'لا اله الا الله محمد رسـول الله، حسـبی الله و نعم الوکیل.' دوای ئەوە پەنای بۆ گەورەی دوو عالەم محەممەد(د ـ س) برد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1] واتە: خودام بەسە.

# که شەوی سێسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کەنیزەی زمڕوودی ناو بوو، پەنای بۆ گەورەی دوو دنیـ محەممەد(د ـ س) برد.

"عەلی کوڕی مەجدەددین ئەو ڕۆژە و هەتا بەیانییەکەی هەر ئاوا لەوێ کەوت. ئەوجار وردەوردە کاریگەری بەنگەکە کەم بووەوە و وە هۆش هاتەوە. چاوی هەڵێنا، تاوێک کاس بوو کە تەواو وە خۆ هاتەوە و زانی چ باسە، یەکبەخۆی هاواری کرد: 'زمڕوود!' کەس وەڵامی نەداوە. ئیدی هەستا بە ماڵەکەدا گەڕا. هیچ سۆراغی نەبوو. زانی کە ئەوە لەبن سەری ئەو گاورەدایە. ئیتر دەستی کرد بە هاتوهاوار و شین و گریان، بەدەم کڕووزانەوەوە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

قەدری لەگەڵتۆبوونم نەزانی، چاوەکەم
بۆیە لە دووریتا وا خەریکە دیق دەکەم
لە سۆی دووریت چاوم وەکوو ڕووت سپی بووە
خۆشەویستی چارەمی وەک مووت ڕەش کردووە
لە تاوی تۆیە دەباری خوێن لە دوو چاوم
بڵێسەی جەرگی برژاوم دێ لە هەناوم

"کە ئەو شیعرەی تەواو کرد، دەستی کرد بە شین و گریان و ئەو دوو بەیتەشی گوت:

نووکی تیری خەمی دووریت ئەڵماسی شادیمی کون کرد
هەوری خەمت مانگەشەوی پڕ لە ورشەی منی ون کرد
دابڕانت تۆی حۆری کردووە بە هاودەمی کەسێک
قەت ناتوانم بە تۆ بڵێم ئەو نسکۆیە چی لە من کرد

"عەلی کوڕی مەجدەددین خۆی سەرکۆنە دەکرد و پەشیمان ببووەوە، بەڵام پەشیمانی تازە سوودی نەبوو. جلەکانی لە بەر خۆی دادڕی و بەردێکی بە دەستەوە گرتبوو لە سینگی خۆی دەدا و دەگریا و دەلالاوە و لە ماڵێدا دەهات و دەچوو. هەتا وای لێ هات هێزی نەما. هەستا چووە دەرێ. منداڵان کە ئەویان بەو دۆخەوە دیت، پێیان وا بوو شێتە و تێی ئاڵان. هەرکەس دیبای، گریانی بۆ دەهات. دەیگوت: 'فڵانی، ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟!' عەلی کوڕی مەجدەددین ئەو ڕۆژە هەتا شەو ئەوە کاری بوو. هەر لە کۆڵان و

گەرەکەکان دەسووڕاوە و شین و ڕۆی بوو. کە هەوا تاریک بوو، شەو باڵی بەسەر وڵاتدا کیشا، لە قولینچکی کۆلانێک خەوت هەتا ڕۆژ بووەوە. کە ڕۆژ بووە، هەستا و هەر وەک رۆژی پێشوو لەنێو شاردا خولاوە. هەتا لە دواییدا هاتەوە ماڵەکەی خۆی کەمێ بحەسێتەوە. پیرێژنێک چاوی پێی کەوت. ئەو پیرێژنە لەو پیرێژنە ئاکارجوانانە بوو. لێی پرسی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە چی بووە؟ بۆ ئاوا بە جارێک تێک چووی؟' عەلی کوڕی مەجدەددین بە و شێعرە وەڵامی پیرێژنەی داوە و گوتی:

ئەمن بووم و یارە لەشرزێوینەکەم و شەو
کۆڕێکی شادی لە من و ئەو و مانگەشەو
لەگەڵ کازیوەی بەیانی ئەوان هەڵفڕین
بەتەنیا من مامەوە و پەژارە و یادی ئەو

پیرە کە زانی ئەوە ئەویندارێکی دابڕاوە لە ئەوینەکەی، پێی گوت: 'ڕۆڵە گیان، بۆم بگێڕەوە بزانم چیت بەسەر هاتووە؟ بەشکو کارێکم لە دەست بێ.' عەلی کوڕی مەجدەددین تەواوی ئەو ڕووداوەی بەرسوومی گاور بەسەری هێنابوو، هەمووی بۆ گێڕاوە. کە پیرە زانی شتەکە چۆناوچۆن بووە، گوتی: 'ڕۆڵە، تۆ بێگوناهی.' پیرە زۆری خەم بوو. بۆی گریا و ئەو شێعرەی بۆ گوت:

هەرکەس چاوی بەسەر ماڵی خەڵکەوە بێ
ئێرەیی ویشکی دەکا، قەت بێ خەم نابێ
وای بەرچاو دەگرێ ماڵ و سامانی خەڵک
دونیاشی هەبێ بۆخۆی،دەمرێ و نایبێنێ

"پیرە کە شێعرەکەی تەواو بوو، پێی گوت: 'هەستە مجرییەکی وەک هی زێڕینگەرانم بۆ پەیدا بکە، گوارە و کرمەک و خرخاڵ و خشڵ و شتی ژنانەم بۆ بکڕە. لە کڕینی ئەو شتانەدا کەمتەرخەمی مەکە و بیانهێنەوە. ئەو دەم من وەک چەرچی و وردەواڵەفرۆش بە کۆلان و گەڕەکەکاندا دەگەڕێم. دەچمە ماڵەکانەوە هەتا هەواڵی ئەو کەنیزەت بۆ دێنم.' عەلی کوڕی مەجدەددین بەو قسەیەی ئەو پیرێژنە خۆشحاڵ بوو؛ دەستی ماچ کرد. بە لەز چوو تەواوی ئەو شتانەی کە پیرێژنە داوای کردبوون، هەمووی بۆ کڕی و بۆی هێناوە. ئینجا پیرێژنە هەستا جلێکی کۆنی کردە بەری و چارشێوێکی ئاماڵ زەردی بەسەردا دا. هەستا وەدەر کەوت و کۆلانەوکۆلان و ماڵبەماڵ گەڕا هەتا وا بوو خودا ڕەحمی کرد و ڕێی کەوتە کۆشکی ئەو ڕەشیدەددینی گاورە گڵاوە. لەناوەوەی کۆشک گوێی لە دەنگی ناڵەیەک

بوو. لە دەرگای دا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: 'خاوەنشــکۆ، پیرێژنە کە گوێی لە ناڵەکە بوو، لەوماڵەوە دەهات، لە دەرگای دا. کەنیزێک لە کەنیزەکانی گاورە هات دەرگای کردەوە و سڵاوی لە پیرێژنە کرد. پیرێژنە پێی گوت: 'من شـتی زۆر جوانم پێیە، ئەو ماڵە کەسـی وای تێدایە شـتێکم لێ بکڕێ؟' کەنیزەکە گوتی: 'بەڵێ تێیـدایە.' لەڕێوە کەنیزەکە پیرێژنەی بردە ژووری و کەنیزەکـانی دیکە تێی ئالان. هەرکەسـەی شـتێکی لە پیرێژنە دەکڕی. ئەویش لەگەڵیـان زۆر بە نەرمی و لەسـەرخۆیی دەجووڵاوە. شـتەکانی زۆر بە هەرزان دەدانێ و هی واش بوو هەر هیچی لێ وەر نەدەگرت. کەنیزەکان زۆریان ئەو شـێوە هەڵسـوکەوتەی ئەو بە دڵ بوو. پیرێژنەش هەر چاوەچاوی بوو. چاوی لەملا و لەولا دەکرد بۆ ئەوەی بزانێ ئەو ناڵەیە هی کێ بوو. لە کوێوە دەهات. لە پڕدا چاوی بە زمڕوود کەوت لە حەوشـە بەسترابووە. دەسـتی کرد بە گریان و لە کەنیزەکانی پرسـی: 'کچەکان ئەوە ئەو لێقەوماوە چی کردووە؟' کەنیزەکان بەسـەرهاتی ئەویان بۆ گێڕاوە. گوتیان: 'ئەو کارە بە خۆشـی خۆمان نییە و خاوەنمان فەرمانی داوە. ئێسـتا چووە بۆ سـەفەر.' پیرێژنە گوتی: 'کچەکان، من تکایەکتان لێ دەکەم. ئەویش ئەوەیە کە دەس و پێی ئەو کچە بکەنەوە. کە خاوەنتان هاتەوە، خێرا بیبەسـتنەوە. دڵنیا بن خودا پاداشتی ئەو چاکەیەتان دەتاتەوە.'

"کەنیزەکان بە قسـەی پیرێژنەیان کرد. دەسـت و لاقیان کردەوە و نان و ئاویان دایە. دوای ئەوە پیرێژنە چووە لای زمڕوود و پێی گوت: 'کچەکەم، خەم مەخۆ. خـاوەنت بەم زووانە ڕزگـارت دەکا.' بە هێواشـیـیەوە گوتی: 'من لە لای عەلی کوڕی مەجدەددینەوە هاتووم. ئەمشـەو دێتە دەوری کۆشـک، لەوێ فیکەیەک لێ دەدا. تۆش فیکەیەکی بۆ لێ دە. بە هەر جۆرێک بێ خۆتی بگەیەنێ، لەگەڵ خۆی دەتبا و ڕزگار دەبێ.' ئیدی زمڕوود زۆر سـپاسـی پیرێژنەی کرد. پیرێژنە لە کۆشـک هاتە دەرەوە و چووەوە لای عەلی کوڕی مەجدەددین و شـتەکەی بۆ گێڕاوە. پێشـی گوت: 'ئەگەر شـەو دەرنگ بوو، هەسـتە بچووە فلانە کۆڵان لای مـاڵی ئەو گڵاوە و فیکەیەک لێ دە. زمڕوود ئـاگـادار کەوە. ئەو بە هەر جۆرێک بێ خۆت دەگەیەنێتێ. جا دوایی بۆ کوێی دەبەی، بیبە.' عەلی کوڕی مەجدەددین سپاسی پیرێژنەی کرد و لە خۆشیان دەستی کردە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

لە دەسـتـم بێ ئەگەر ڕۆژێ بێـم و دیسـان بتهێنمەوە
قەرزی ڕۆژانـی ڕابـردووی تـۆ بە شـادی بـدەمەوە
دەبـێ دان بـگـرم بە خـۆمـدا لە دووریـت دەربـچـێ گـیـانـم
گـەر لەبەر ئـازارت هەڵێم، هـاوڕێیەکـی بێویژدانم

شـــــــەوان بـــــە هێمنی دەگریم هــــــەتا بـــــــە دەردم نەزانن
هــــــــاواری بێـدەنگیـم بەرزە، دوور و نیـزیـک پێی دەزانـن

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، ڕۆندکی ڕژانە خوارێ و ئەو دوو بەیتەشی گوت:

بـڵـێـی دیـســــان چـاوم بە چـاوی جـوانـی ئەو ڕوون بـێـتەوە
بڵێی دیســــان من بە قـامکم بســـکی ڕەشــــی بهۆنمەوە
بڕۆم لە ڕوخـــــســـــاری مـانگی ڕابمێنم تێر بە دڵی خۆم
نەرم نەرم بـۆی دابـێـنـم بســـکی ڕەشـــی وەک بەختـی خـۆم

"دوای ئەوە ڕاوەستا هەتا تەواو شـەو درەنگ بوو. ئەوجار هەستا چووە ئەو شـوێنەی پیرێژنە پێ گوتبوو. سـەکۆیەک لەبن دیوارەکەی ماڵی ئەو گاورە بوو، لەوێ دانیشـت بیری دەکردەوە چۆن خۆی بگەیەنێتێ. کەچی هێنـد لە مێژ بوو لە تـاوی ئەو چـاوکەژاڵە نەخەوتبوو، لە جێی خۆی بە لادا هات و وەک مەستان کەوت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلی کوڕی مەجدەددین وەک مەســـتان لەوێ کەوتبوو. دزێک لە دزانی شـار هاتبووە دەرەوە لە شـتێک دەگەڕا کە دەرفەتی لێ بێنێ. بە ڕێکەوت ئەو گلاوە هات لە دەوروبەری ماڵی گاورەکە دەسـووڕاوە. هەر ملۆمۆی بوو لە دیوارەکەیان وەسـەر کەوێ، بەڵام زەفەری پێ نەبرد. وا بوو هـاتە سـەر ئەو سـەکۆیەی کە عەلی کوڕی مەجدەددین لەسـەری خەوتبوو. کە دیتی عەلی لەوێ خەوتووە، مەندیلەکەی لەسـەری کردەوە و لەسەر خۆی نا. لەو جەنگەیەدا زمرووود خۆی گەیاندبووە سەربان. دیتی کەسێک لە تاریکاییەکەدا ڕاوەستا، وای زانی ئەوە عەلی کوڕی مەجدەددینە. فیکەیەکی لێ دا، ئەویش فیکەیەکی لێ دا. لەپڕدا زمرووود بە گوریسـێکدا هاتە خوارەوە و توورەکەیەکی گەورەشـی زێڕ و زیو و شتی وای لەگەڵ خۆی هێنابوو.

"کە دزە ئەوەی دیت، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوەیە کاری سـەیروسـەمەرە!' زوو کچەی بە توورەکەوە لەسەر شانی دانا و وەک ڕەشەبا بردی. کەنیزە گوتی: 'خۆ پیرێژنە دەیگوت: 'تۆ لە تاوی من هێندە کز و لاواز بووی هێزی هیچت نەماوە،' کەچی ئێسـتا لە فیلیش بەهێزتر دیاری!' دزە هیچ وەڵامی نەداوە. زمرووود سـەرنجی دایە، دیتی ڕدێنی لە گسـکی ئاودەسـتیش پیسـترە. ئیدی زمرووود لێی ترسـا و پێی گوت: 'تۆ چ ئاژەڵێکی؟' دزە گوتی: 'قەحبە، من لاوچاکی کوردم، یەکێک لە پیاوەکانی ئەحمەد دەنەفم. ئێمە چل کەسی چەتەین.' زمرووود زانی کە چارەنووسـی تووشـی پەندێکی دیکەی کردووە و تازە هیچی پێ ناکرێ جگە لەوەی پشـت بە خودا ببەسـتێ. ئیدی هیچ دەنگی لێ نەهاتە دەرێ. ملکەچ بوو. گوتی: 'خودایە! لەو بەختە، لە کێشـەیەک ڕزگارم نەبووە، کەوتمە یەکی کەوە.' هۆی هاتنی ئەو کوردە ئەوە بوو کە بە ئەحمەد دەنەفی گوت: 'گەورەم، لە دەرەوەی ئەو شارە ئەشکەوتێکی لێیە جێگای چل کەس دەبێتەوە تێیدا دانیشـن.' گوتی: 'من دەمەوێ دایکم بەرمە ئەوێ. بۆ خۆشـم بگەڕێمەوە شـار و هەندێک دەسـکەوت کۆ کەمەوە و بیبەم لە لای دایکم داینێم. تا سـبەینێ فراوێن لە خزمەتتدا بین.' ئەحمەد گوتی: 'چۆنت پێ خۆشـە ئاوا بکە.' ئیدی ئەو کوردە چوو دایکی لەو ئەشکەوتە دانا. کە لە ئەشکەوتە هاتە دەرەوە، تووشی کەسێک بوو لەوێ خەوتبوو ئەسپەکەشی لە لای خۆی بەستبووەوە. کوڕە کابرای کوشت و ئەسپ و جلوبەرگ و چەکەکەی بردە ئەشـکەوتەکە و لە لای دایکی دانان. خۆی گەڕاوە بۆ ناو شـار. دوایە زمرووودیشـی گرت و بردی بۆ ئەشـکەوتەکە و بە دایکی سـپارد. پێی گوت: 'ئاگات لێی بێ.' ئیتر خۆی لە ئەشکەوتەکە هاتەوە دەرێ."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، لاوەکە دایکی ڕاســـپارد ئاگای لە زمرڕوود بێ و بۆخۆی هاتەوە دەرێ. زمرڕوود لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئاوا نابێ. دەبێ من بیرێک بۆ خۆم بکەمەوە.' کە ئەو بیرۆکەی بە مێشــکی گەیشــت، بە دایکی لاوەکەی گوت: 'دایکە، بۆ نایەی لە ئەشــکەوتەکە بچینە دەرێ لە بەر ڕووناکایی کەمێک ســــەرت بۆ بدۆزم؟' پیرێژنە گوتی: 'بۆ نایەم؟ وەڵا زۆرم پێم خۆشـــــە. زۆر لە مێژە نەچوومەتە گەرمـاو. ئەو خوێڕییە هەر لەملا بۆ ئەولا دەمگێڕێ.' وا بوو پیرێژنە لەگەڵ زمرڕوود هاتنە بە دەرکی ئەشکەوتەکە و لە بەربەڕۆچکەکە دانیشـتن. پیرێژنە ســەری لە ســەر کۆشــی زمرڕوود دانا. زمرڕوود دەسـتی کرد بە دۆزینی سـەری. هەتا وردەوردە پیرێژنە لەو بەر تاوە گەرم داهات و خەوی لێ کەوت. بە هێواشـی ســــەری پیرێژنەی داگرت. چوو خێرا عەمــامە و جلی ئەو کـابرایەی وا لاوەکە تـازە کوشــتبووی، لەســـەر کرد و شــیرەکەی لە قەدی دا و توورەکە زێڕەکەی خۆی هەڵگرت. سواری ئەسپەکەی ئەو کابرایە بوو. ئینجا گوتی: 'ئەی ئەو کەسەی داپۆشین هەر لە خۆت جوانە، داممپۆشـە!' ئیدی ڕووی لەو دەشــتە کرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر ڕوو لە شـار بکەم، هاتوو تووشـــــی پیاوی دارۆغە بم چی وەڵام دەمەوە؟' ئیدی ســــەری ئەســــپەی وەرسووڕاند و ڕووی لە دەشت و کێو کرد. لە برسان گژوگیای دەخوارد و لە ئاوی کانی و چۆماوەکانی دەخواردەوە. هەتا دە ڕۆژ ئەوە حاڵی بوو. لە ڕۆژی یازدەیەمدا گەیشـــــتە شارێک. زستان تەواو ببوو. هەموو وڵات و شار سەرسەوز و خۆش بوو. سەیر ئەوە بۆ خەڵکی ئەو شارە لە دەروازەی شار کۆ بوونەوە. بە خۆیی گوت: 'ئەوە دەبێ چ بێ، لە خۆڕا ئەو خەڵکە لەوێ کۆ نەبوونەتەوە.' ئیتر چوو بۆ لایان.

"کە چووە بەرەوە، پیاوەکانی ســوپا بەرەو پیری هاتن و کڕنۆشــیان برد و ڕیز بوون. گوتیان: 'ســــوڵتان، خودا ســــەرت بخا و هاتنت بۆ موســــڵمانان بکاتە خێر.' زمرڕوود لێی پرسین: 'بۆ ئاوا کۆ بوونەتەوە؟' وەزیری ئەو شارە پێی گوت: 'خودا کە دەستی دڵاوایی لە کەس ناگێڕێتەوە، تۆی کرد بە ســـوڵتانی ئەم شــارە.' ئەم شــارە دابێکی هەیە، هەر کاتێک سوڵتانەکەی بمرێ و کوڕی نەبێ، ئەوە گەورە گەورەی شار بە سوپاوە دێنە ئەم شوێنە و هەتا سێ ڕۆژان لەم شوێنە دەمێننەوە. هەرکەسێک لەو ڕێگەیەوە بێ کە تۆی لێوە هاتووی، ئەوە دەیکەن بە پاشای خۆیان. سپاس بۆ خودا ئەوە لاوێکی جوانچاکی وەک تۆی بۆ ئێمە نارد. ئەگەر کەســــێکی خوێڕی و گڵاویش هاتبا، هەر دەبوو بە ســــوڵتانی ئێمە.' زمرڕوود گوتی: 'پێتان وا نەبێ من کەســێکی ڕەشــۆکی تورک بم، بەڵکو من بۆ خۆم پاشــازادەیەکم. بەڵام دڵم لە هۆزەکەم ئێشاوە و وەدەر کەوتووم. ئەو توورەکە پڕ لە زێڕەشم لەگەڵ خۆم هێناوە. هەتا بیدەم بە هەژاران.' ئیدی گەورەکان و ســوپاکەیان نزایان بۆ کرد و دڵیان پێی

خۆش بوو. زمڕوودیش بە خۆشحاڵییەوە بە خۆی گوت: ‘ئێستا کە بەو پلەوپایە گەیشتووم ...’ ”

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، زمڕوود لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئێستا کە بەو پلەوپایەیە گەیشتووم. هیوادارم خودا من و خاوەنم، عەلی کوڕی مەجدەددین، لێرە پێک شـــاد کاتەوە.' بەو جۆرە زمڕوود ڕۆیشت و سوپا و گەورەکان بەدویدا چوونە ناو شارەوە. بردیانە کۆشکەوە. کە لە ئەسپەکەی دابەزی، خێرا لەمبەرەوبەرەوە قۆڵیان گرت و لەسەر تەختی دەسەڵاتیان دانا. لەبەردەمی کەوتنە ســەر چۆک و کڕنۆشـیان بۆ برد. کاتێک زمڕوود جێگیر بوو، فەرمانید سەری خەزێنەکانیان کردەوە. دیاری و خەڵاتێکی زۆری دا بە وەزیر دەستوپێوەندەکانی و سپاکەی. هەموویان نزای ڕاوەستاوییان بۆ کرد. ماوەیەکی زۆر لەسەر تەخت ماوە. خەڵک هەســـتیان بە گەورەیی و تەناهی[1] و پارێزراوی دەکرد. ڕێز و حورمەتیان بۆ گەڕابووەوە. بەندییەکانی ئازاد کردبوو. هەموو کەس زۆریان خۆش دەویســـت. بەڵام ئەو هەر کاتێک خاوەنی بیر دەکەوتەوە، دەســـتی دەکرد بە گریان و لە خودا دەپاڕاوە پێکیان بگەیەنێتەوە. بە ڕێکەوت شـــەوێک کەوتبووە بیری خاوەنی و ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ ئەو ڕایانبواردبوو. فرمێسک بەسەر گۆنایدا هاتە خوارەوە و ئەو شێعرەی گوت:

قەنـــد لە دەمـــی دڵبەرانـــم دەکەم بە ژار
لە عەشـــقتدا خۆم دەکەمە وێردی ســـەر زار
نـــاهێڵم دەســـتی نەیاران پێت ڕابگـــا
دوژمنـــی خوێڕی و ڕەزیـــل بە ئـــاوات بگـــا

"دوای ئەوە ئەســـرینەکانی ســـڕی و هەســـتا چوو بۆ حەرەمســـەرا، کەنیزە ژنەکانی هەڵاواردن و نشینگەی جودای بۆ دیاری کردن. بۆ خۆشی چوو لە شوێنێک بە تاقی تەنیا دانیشـت. جگە لە خزمەتکاری کەمتەمەن، نەیدەهێشـت کەس بچی بە لایەوە. سـاڵێک بەو شـــێوەیە تێپەڕی و هیچ هەواڵێک لە عەلی کوڕی مەجدەددین نەبوو. مات و مەلوول دوژ دامابوو. فەرمانی دا وەزیر و پەردەداریان بانگ کرد. پێی گوتن: 'ئەندازیار و وەســـتای دیوار بێنن. لەپێش کۆشـکەوە هەیوانێک بە درێژایی فرســـەخێک و پانایی فرســـەخێک چێ کەن.' لە ماوەیەکی کەمدا کارەکەیان ڕاپەڕاند. کە هەیوانەکە تەواو بوو، ســـوڵتان هاتە هەیوان، فەرمانی دا هۆبە و تاوڵیان بۆ هەڵدا. لەدەوری ئەو هۆبە و تاوڵانەدا کورســـی بۆ گەورەکان ڕیز کرا. ئینجا فەرمانی دا ســـفرەیان ڕاخســـت. هەموو جۆرە خواردنێکیان دانا. تەواوی گەورە گەورەکانی بانگهێشت کردن. دوای میوانداری بە گەورەکانی گوت: ' هەموو

---

١. تەناهی: ئاسایش.

سەری مانگێ لە کاتی تازەبوونەوەی مانگدا دێنە ئێرە. جارچی لە شاردا جاڕ دەدا کە ئەو ڕۆژە کەس بۆی نییە دووکان و بازاڕ بکاتەوە. وەرن میوانی سـولتانن. هەرکەسیش دژایەتی بکا دەکوژرێ.'

"ئیدی کە مانگ تازە دەبووەوە، خەڵک دەهاتن و میوانی سـولتان دەبوون. لەو ڕۆژە بەدواوە ببووە داب و ئەو دابەیان ڕەچاو دەکرد. هەتا وا بوو لە ساڵی دووەمدا مانگ تازە بووەوە. زمرووود وەک سـولتان لەوێ لەسەر تەخت دانیشت و خەڵک و سوپاییيەکانیش دەستەدەستە دەهاتن و ئەویش فەرمووی دەکردن دانیشن. هەرکەس لەسەر سفرەکە پێی وا بوو سـولتان هەر چاوی لەوە. پەردەداران بە دەنگی بەرز دەیانگوت: 'فەرموون بخۆن، سـولتان دڵی بە خواردن و خۆشحاڵیتان خۆشە.' ئەوانیش تێر بە دڵی خۆیان دەیانخوارد. نزایان بۆ سـولتان دەکرد. پێکەوە بە یەکتریان دەگوت: هەتا ئێستا ئێمە سـولتانی ئاوا هەژارگر و دەستگیرۆمان نەدیوە.' زمرووود هەستا و لە هەیوانەوە بەرە و کۆشک چوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سولتان زمرووود هەستا لە هەیوانەوە چووەوە کۆشک. زۆر دڵخۆش بوو بەو کارەی کردبووی. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'ئەگەر خودا ڕەزای لە سەر بێ، بە هۆی ئەو کارەوە خاوەنی خۆم دەبینمەوە.' کە دیسان مانگ تازە بووەوە، هەر وەک جاران لەناو شار جاڕ درا. خواردن چێ کرا و سفرە و خوان ڕاخرا. سولتان زمرووود چووە هەیوان و لەسەر تەخت دانیشت. خەڵکیش پۆلپۆل هاتن. سولتانیش فەرمووی کردن. لەپڕدا سولتان چاوی بە بەرسوومی گاور کەوت ئەوەی وا پەردەکەی لە عەلی کوڕی مەجەددینی خاوەنی کڕیبوو. ئەوی ناسییەوە و گوتی: 'ئەوە یەکەم هەلە.' بەرسووم هاتە پێشەوە و لەگەڵ خەڵکەکە دەستی کرد بە نانخواردن. دەفرێک خواردن کە شەکری بەسەردا کرابوو لەولای بەرسوومەوە لەسەر سفرەکە بوو. بەرسووم دەستی کێشا هێنایە پێش خۆیەوە. کابرایەک کە لە لایەوە دانیشتبوو، گوتی: 'ئەوە بۆ لەوەی بەردەمی خۆت ناخۆی؟ بۆ دەست دەکێشی بۆ هی خەڵک؟ شەرم ناکەی؟' بەرسووم گوتی: 'من پێم خۆشە و هەر لەوە دەخۆم.' ئەو کابرایە گوتی: 'بخۆ نۆشی گیانت نەبێ.' بەرسوومی گاور پاروویەکی لەو دەفرە هەڵگرت. مەلەکە زمرووود چاوی لە بەرسووم دەکرد. بانگی خزمەتکارەکانی کرد و پێی گوتن: ' بچن ئەو کابرایەی ئەو دەفرەی شەکری بەسەردا کراوە و لەبەردەمیدایە. بیهێنن و مەهێڵن ئەو پارووەش بخوا و لێی بستێنن.'

"ئیدی چوار کەس لە خزمەتکارەکان چوون پێلی بەرسوومی گاوریان گرت و پارووەکەیان لە دەستی سەند. هەڵیانگرت و هێنایان لەبەردەمی زمرووود لەسەر زەوی دایان نا. خەڵکەکە دەستیان لە خواردن هەڵگرت و بوو بە سرتوخورت. یەک دەیگوت: 'ئەو کابرایە زۆردارە و خواردەمەنی بەردەمی خەڵک هەڵدەگرێ.' یەکی دیکە دەیگوت: 'جاری ڕاوەستن بزانە چ باسە و چ بووە.' کاتێک هێنایان لەبەردەمی تەختەکەی سولتان دایاننا. سولتان لێی پرسی: 'ناوت چییە مۆرە[1]؟ بۆ هاتوویتە ئێرە؟' ئەو گڵاوە ناوی خۆی نەگوت. گوتی: 'سولتان، ناوم عەلییە و پیشەم ڕستنە. بۆ کاسبی هاتوومە ئێرە.' سولتان زمرووود گوتی: 'تەختەی بەختم بۆ بێنن. لەگەڵ قەڵەمێکی مسین.' خێرا ئەوەی سولتان داوای کرد بۆیان هێنا. سولتان قەڵەمەکەی لە تەختەکە دەدا و لێکی دەداوە و دەینووسی. ئەوجار سولتان سەری هەڵهێنا و ماوەیەک چاوی لەملا و لەولا کرد و پێ گوت: 'گڵاو، درۆ لەگەڵ سولتان دەکەی؟ تۆ گاوری و ناوی تۆ بەرسوومە. تۆ هاتووی بۆ سۆراغی کەسێک. ڕاستییەکەم پێ بڵێ دەنا بە خودا هەر ئێستا دەتکوژم.' گاورە زمانی تێکەڵ دەهات.

---

١. مۆر: شینێکی توخ کە ئاماژەیە بە ڕەنگی جلوبەرگی گەورەی گاوران لە سەردەمی عەباسییەکاندا.

هەنتەشـــييان لە دڵی خۆیاندا گوتیان: 'ســـوڵتان فاڵیش دەزانێ. پاکە ئەو خودایەی هەموو شـــتێکی پێ داوە.' دوای ئەوە ســـوڵتان بەســـەریدا گوڕاند و گوتی: 'ڕاســـتی بڵێ، دەنا دەکوژرێی.' گاورە گوتی: 'بمبەخشە سوڵتانی زەمان، تۆ ڕاست دەفەرمووی. منی ڕووڕەش گاورم!' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گاورە گوتی: 'منی ڕووڕەش گاورم!' دانیشتووان پێیان سەیر بوو که سوڵتان فاڵگرتنەوەی دەزانی. ئیدی سوڵتان فەرمانی دا کەوڵی کەن و کا لە پێستەکەی کەن و لە دەروازەی شار هەڵیواسن. گۆشت و ئێسک و شتەکەشی لە قوڵکەیەک لەدەرەوەی شار بسووتێنن. سوڵتان چۆنی فەرمووبوو ئاوایان لێ کرد. خەڵک دەیانگوت 'ئەو گاورە هەر دەبووایە ئاوای لێ بکرێ.'

"کە مانگی سێیەم نوێ بووەوە، هەر وەک جاران سفرە ڕاخرا و هەموو خواردەمەنییەکیان دانا. سوڵتان هاتەوە لەسەر تەختەکە دانیشت. چاوەدێری خەڵک و سوپای دەوری سفرەکە و دەفری خواردەمەنی شەکراویی دەکرد. یەکێک لە هەنتەشییان بە هاوڕێکەی گوت: 'لەو خواردنە شەکراوییە مەخۆ، دەکوژرێی.' خەڵک دانیشتبوون خەریکی خواردن بوون و سوڵتانیش لەو سەرەوە لەسەر تەختێکی ڕازاوەوە دانیشتبوو سەیری دەکردن. کە لە ناکاو پیاوێک هاتە ناو هەیوانەکە و بە پەلە بەرەو سفرەکە چوو سوڵتان چاوی پێی کەوت، جوان لێی ورد بووەوە، ناسییەوە کە ئەوە ئەو لاوەیە وا ئەوی دزی. ئەو کوڕە دوای ئەوەی زمڕوود لە ئەشکەوتەکەدا لە لای دایکی دادەنێ، بۆخۆی دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوڕێکانی و پێیان دەڵێ: 'دوو دەستکەوتی باشم بووە. یەکیان سوارێکی سوپام کوشتووە ئەسپ و چەک و ڕەخت و جلەکانیم هەڵگرتووە. ئەوەی کەیان کچێکی زۆر جوانە لەگەڵ توورەکەیەک زێڕ بردوومن لە ئەشکەوت لە لای دایکم دامناون. هاوڕێکانی بەو هەواڵە دڵخۆش بوون و هەڵاتن بەرەو ئەشکەوتەکە. لاوەکە لەنواوە و ئەوان لەدواوە چوونە ئەشکەوتەکە. کە سەیریان کرد هیچیان نەدی، نە زێڕ و نە ئەسپ و نە ژنی جوان. لاوە لە دایکی پرسی: 'ئەوە کوان دایە؟' دایکی ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. لاوە بەردی پەشیمانیی لە ئەژنۆ دا. گوتی: 'قەسەم بە خودا تەواوی دنیا لەو قەحبەیە دەگەڕێم لە هەر کوێ بێ دەیبینمەوە. ئەگەر لە تاریکستانیشدا بێ دەیدۆزمەوە و خەوشی دڵمی پێ دەڕێژم.' ئیدی گورج هاتە دەرەوە و شار بە شار و گوند بە گوند لەدوای گەڕا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سێسەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشكۆ، لاوەكە شار بە شار گەڕا هەتا گەیشتە ئەو شارەی زمڕوود. كە هاتە ناو شارەوە كەسی نەدی. لە چەند ژنی پرسی، گوتیان: 'سەرەتای هەر مانگێك سوڵتان سفرەی خواردن ڕادەخا و هەموو خەڵک دەچن بۆ ئەوێ نان دەخۆن.' ڕێگاكەشیان پیشان دا. كە هاتە ئەوێ، پاشا ناسییەوە و بە خزمەتكارەكانی گوت: 'نەهێڵن ئەوە دانیشێتە سەر سفرە. ئەوە هەر خراپە لە چارەیدا دەردەكەوێ.' خزمەتكارەكان گرتیان و هێنایانە لای سوڵتان. لەبەردەمیدا لەسەر چۆک دایاننا. سوڵتان لێی پرسی: 'ناوت چییە؟ پیشەت چییە؟ بۆ هاتوویتە ئەم شارە؟' لاوەكە گوتی: 'ناوم عوسمانە. پیشەم باخەوانییە. شتێكم لێ بزر بووە لەو دەگەڕێم، بۆیە هاتوومەتە ئێرە' مەلەكە گوتی: 'ئەو تەختەی فاڵە بێنن.' تەختەی فاڵیان بۆ هێنا. دەستی دا قەڵەمەكە و لە تەختەكەی دا و فاڵەكەی بۆ گرتەوە. ماوەیەک سەری داخست و بیری كردەوە. پاشان سەری هەڵهێنا و بە لاوەكەی گوت: 'گلاوی پیس، چۆن درۆ لەگەڵ سوڵتان دەكەی؟! تۆ نە ناوت عوسمان و نە باخەوانیشی. تۆ خەڵكی فلانە جێی و دایكێكی پیرت هەیە. پیشەت دزی و چەتەیی و پیاوكوژییە. شتەكانیشت دەبەیتە فلانە ئەشكەوت دایدەنێی.' ئیتر سوڵتان بەسەریدا نەڕاند و گوتی: 'گلاو، ڕاستییەكەی دەڵێی، چاكە، دەنا هەر ئێستا دەتكوژم.' كە كوڕە گوێی لە قسەكانی ئەو بو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وای زانی ئەگەر ڕاستی بڵێ، لێی خۆش دەبێ. گوتی: 'سوڵتان! تۆ ڕاست دەفەرمووی. بەڵام من لەسەر دەستی تۆ تۆبە دەكەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خودا.' سوڵتان پێی گوت: 'گەمار، من نامەوێ دڕک بخەمە بەر پێی موسوڵمانان.' ئیدی فەرمانی دا ئەو ستەمكارەش كەوڵ كەن و وەک ئەوەی مانگی پێشووی لێ بكەن. ئینجا پاشا چۆنی فەرمووبوو، خزمەتكار و سوپاییەكان ئاوایان لێ كرد.

"كاتێك خەڵكەكە نانەكەیان خوارد و بڵاوەیان كرد. سوڵتان زمڕوود هاتەوە كۆشک تەواوی دەستوپێوەندەكانی هەموو ناردنەوە بۆ ماڵی خۆیان بۆ حەسانەوە. هەر بەو جۆرە دیسان كە مانگ نوێ بووەوە. هەر بەپێی جاران سفرە لە هەیوان ڕاخرا و خەڵک لە دەوری سفرە كۆ بوونەوە و چاوەڕێی فەرموو بوون. وا بوو سوڵتان هات. فەرمووی كردن و دانەدانە خستنییە ژێر چاوەدێرییەوە. كتوپڕ چاوی بە كەسێک كەوت كە بە هەڵەداوان هاتە نێو هەیوانەوە و هەر لەو شوێنەی كە دەفرە شەكرەكەی لێ بوو، دانیشت. كە سەرنجی دایە، سەیری كرد ئەوە ئەو گاورە گلاوە دووڕووەیە كە خۆی بە ڕەشیدەددین ناساندبوو. سوڵتان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەمڕۆ سفرەكەمان چەند بە بەرەكەت بوو وا خوانەناسی ئاوای بۆ خستینە داوەوە!' جا ئەو گلاوە لەبەر شتێكی سەیر هاتبوو. ئەویش ئەوە بوو كاتێك لە سەفەرەكەی گەڕاوە ..."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو ئائلە[1] خوێرییە کە لە سەفەر هاتەوە، ئەندامانی ماڵەکەی پێیان گوت: 'زمڕوود بە توورەکەیەک زێڕەوە بزر بووە.' کە ئەوەی بیست، جلی لە بەر خۆی دادڕی و بە چەپۆک بەربووە خۆی. سەر و ڕدێنی داڕنی. براکەی ڕەوانەی شارەکان کرد هەتا بچێ سۆراخێکی بکا. کە بەرسووم هەر نەهاتەوە، خۆشی هەستا شار بە شار کەوتە بەدوای شوێنی زمڕوود و بەرسووم. گەڕا گەڕا هەتا ئەو مانگە ڕێی کەوتە ئەو شارە. سەیری کرد دووکان و بازاڕ داخراوە و کۆڵانەکان چۆڵن. هۆکاری ئەو شتەی لە یەک دوو ژن و منداڵ پرسی. گوتیان: لە سەرەتای هەر مانگێکدا سوڵتان سفرە ڕادەخا و میوانداری خەڵک دەکا. کەس بۆی نییە، نەچێ و لە ماڵێ یان لە دووکان دانیشێ.' شوێنەکەشیان پێشان دا. کە گەیشتە ئەوێ، سەیری کرد ئەوە خەڵک دانیشتوون و خەریکی نانخواردنن. ئەویش ویستی دانیشێ نان بخوا. سوڵتان چاوی پێی کەوت و ناسییەوە. گورج بە پیاوەکانی گوت: 'بیگرن و مەهێڵن نان بخوا.' گرتیان و هێنایانە لای سوڵتان. سوڵتان زمڕوود لێی پرسی: 'ناوت چییە، گلاو؟ چ کارەی؟ بۆ هاتوویتە ئەم شارە؟' گوتی: 'گەورەم سوڵتان، ناوم ڕۆستەمە، هیچ پیشەیەکم نییە و دەروێشم.' سوڵتان داوای تەختەی فاڵی کرد. کە تەختەکەیان بۆ هێنا، دەستی دا قەڵەمی مسین و بەسەر تەختەکەیدا هێنا. چاوی لێ کرد و نووسیی. ماوەیەکی باش بیری کردەوە. ئینجا سەری بەرز کردەوە و پێی گوت: 'ئەوە تۆ درۆ لەگەڵ سوڵتانیش دەکەی، خوێری؟ تۆ ناوت ڕەشیدەددینی گاورە. پیشەی تۆ ئەوەیە کچانی موسوڵمان لە داو بخەی. تۆ لە ڕواڵەتدا موسوڵمانی و لە ناخەوە گاوری. ئێستا ڕاستی بڵێ، دەنا بە خراپترین شێوە دەتکوژم.' گاورە زمانی تێک دەئالا و وە منگەمنگ کەوت. چەند جار قسەکەی هێنا و برد. هەتا گوتی: 'سوڵتانی زەمان، حەق بە تۆیە—تۆ ڕاست دەکەی!' سوڵتان فەرمانی دا درێژیان کرد و هەزار قامچییان لێ دا. پاشان کەوڵیان کرد. گۆشت و پێشە و شتەکەشیان لە قوڵکەیەک هاویشت و سووتاندیان. پێستەکەشیان ئاخنییەوە و پڕیان کرد لە کا. لە دەروازەی شار هەڵیان واسی.

"خەڵکەکەش دوای ئەوەی نانیان خوارد، ڕوخسەت دران هەرکەسەی بڕوا بە لای ژیانی خۆیەوە. سوڵتان هاتەوە کۆشکەکەی خۆی و گوتی: 'سپاس بۆ ئەو خودایەی یارمەتی دام تۆڵەی خۆم لەو کەسانە بکەمەوە وا منیان ئازار دا. ئۆخەی دڵم حەساوە.' ئینجا بە یادی خاوەنییەوە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

خوایە شادم کەوە بە یاری خەمڕەوێنم

---

١. ئائل: ستەمکار.

بەرگە نـاگرم چۆن دوایی بەو دووریيە بێنم
ئەو بە من و من بەوەوە شـاد و دڵخۆشم
لە دووری ئەوە دایم من کـاس و خەمۆشم

"دوای ئەوە دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'هیوادارم ئەو خودایەی منی بەسەر دژمنەکانمدا زاڵ کرد، ئێمەش بە یەک بگەیەنێتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که ئەوی سێسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، ســـولّتـان زمڕوود گوتی: 'هیوادارم خودای گەورە لەگەڵ خۆشـــەویســـتـانم بە یەکترمـان بگەیەنێتەوە و، لە زووترین کـاتـدا لەگەڵ عەلی کوڕی مەجدەددین چاومان بە چاوی یەک کەوێتەوە. چونکە خودا گەورە و بە توانایە و چی پێ خۆش بێ دەتوانێ بیکا.' ئیدی سپاسی خودای کرد و ملکەچی قەزا و قەدەر بوو و، گوتی:

بە هـــــیوای ئەو ڕۆژەم گرێی کــــــارم بکرێتەوە
ئـێـمە پـێـک بـگەیـن و، هەوری خەم بـڕەوێـتەوە
گوڵی لە دەســـتی من ڕفـانـد ئەو چەرخە چەپگەردە
چـــــــــاوەڕوانی ئـــەو ڕۆژەم گـــــولّم بگەڕێتەوە
گەر نەمـرم و بـمـێـنـم، ئەو خەمە کـۆتـایـی دێ
ئەگەر بولـــــــــــبول بمێنێ، دار هەر گوڵ دەکاتەوە
هـــــێنـدە دێیە بەرچـاوی خەیـاڵی منی عـاشـــق
ئەخـــــــــــتوچارمە خـــــەیاڵم وەبەر چاو نایەتەوە
هەزاران نوشـــتەم نووســـی، خۆر لە کەل نەهاتە دەر
نـازانـم هـات و بەخـتـم لە کـام لاوە دێـتەوە

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، ناچار ملکەچی قەزا و قەدەر بوو و گوتی: 'بزانم چی دەبێ.' بە ڕۆژدا خەریکی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی دەبوو، بە شـەویشـدا بە تەنیا لە تاوی عەلی کوڕی مەجدەددینی خاوەنی دەگریا. هەتا دیسان مانگ تازە بووەوە. فەرمانی دا هەر بەپێی مانگەکانی پێشـــوو لە هەیوان ســـفرەیان ڕاخســـت. خەڵک لە دەوری خوان کۆ بوونەوە. سـولّتانیش هاتەوە هەیوان، چووەوە لەسـەر شـوێنەکەی خۆی دانیشـت. چاوی لە دەرکی هەیوانیش بڕی بوو، خەڵکەکەشـی خسـتبووە ژێر چاودێرییەوە. لە بەر خۆشـــییەوە ئەو نزایەی دەکرد: 'یا من ردَّ یوسـف علی یعقوب و کشـف البلاء عن أیوب مُنَّ علي بردِّ سيِّدي!'[1] هێشتا نزاکەی تەواو نەببوو کە یەکێک لە دەرگای هەیوانەکەوە هاتە ژوورەوە. پشـــتی لەژێر باری خەما چەمابوو. ڕەنگی زەرد و ســـیمای تێک چرژابوو. هەر کە هاتە ژوورەوە، چاوێکی گێڕا، شـــوێنێکی چۆڵی دیتەوە و دانیشـــت. زمڕوود کە ئەوی دیت، تووشـی دڵەڕاوکێ و دڵەکوتە بوو، سـەری لێ شـێوا نەیدەزانی چ بکا. زۆر جوان لێی ورد

---

١. واتە: "ئەی ئەو کەســـەی یوســـفت گەیاندەوە بۆ یەعقووب و ئەیوبت لە بەلا پاراســـت، بە گەڕاندنەوەی خاوەنەکەم منەتبارم کە."

بووەوە. زانی ئەوە خاوەنییەتی، عەلی کوڕی مەجدەددینە. ویستی لە خۆشیاندا هاوار بکا! بەلام گوتی: 'ئابڕووم دەچێ.' خۆی خواردەوە و بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. عەلی کوڕی مەجدەددین بۆیە هاتبوو، کاتێک لەسەر سەکۆکەی بەرماڵی گاورەکە لەبەر بێخەوی و ماندوویی بە لادا دێ و خەوی لێ دەکەوێ، پاشان لاوەکە زمڕوودی دەڕفێنێ، ئەویش بە ئاگا دێ. سەیر دەکا مەندیلەکەی بە سەرەوە نەماوە. زانی کەسێک دەستی داوەتێ و لێی دزیوە. خێرا هەستا چوو بۆ لای ئەو پیرێژنەی کە شوێنەکەی زمڕوودی بۆ دیتبووەوە. دەستی کرد بە گریان ئەوەندە گریا هەتا بوورایەوە. کە چاک بووەوە، هەموو شتێکی بۆ پیرێژنە گێڕاوە. پیرێژنە کەمێکی سەرکۆنە کرد و گوتی: 'ئەوەی بەسەرت هاتووە، خۆت بەسەر خۆتت هێناوە و هەر دەبێ خۆشت چارەی کەی.'

"بە کورتی هەر ئەو دەگریا و ئەویش سەرکۆنەی دەکرد. هەتا دیسان لە هۆش خۆی چووەوە. وا بوو پاش ماوەیەک وە هۆش هاتەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە عەلی مەجدەددین وە خۆ هاتەوە، سەیری کرد ئەوە پیرێژنەش بۆ ئەو دەگری و فرمێسک دەڕێژێ. لەبەرەوە ئەو شێعرەش دەڵێ:

گەر بێتوو بەهاری تەمەن هەر وا میوانی چەمەن بێ
مەلی خۆشخوێن هەر دەم دەژی، لەژێر سای گولا خەم مەخۆ
گەر لە خۆشی ئیشقی کەعبە لە بێرووندا هەنگاو دەنێی
دڕکەدەرزی بەردەوام گەر لۆمەی تۆ بکا، خەم مەخۆ

"دوای ئەوە پێی گوت: 'هەر لێرە دانیشە هەتا هەواڵێکت بۆ دێنمەوە.' ئیدی پیرێژنە عەلی کوڕی مەجدەددینی هەر لەوێ بەجێ هێشت و ڕۆیشت. هەتا نیوەڕۆ نەهاتەوە. دوای ئەوە هاتەوە بۆ لای عەلی کوڕی مەجدەددین و پێی گوت: 'عەلی، پێم وابێ تۆ هەر بەو داخەوە دەمری و هەتاهەتایە نایبینیتەوە، چونکە دانیشتووانی کۆشک دەڵێن کاتێک بەیانی هەستاون، سەیریان کردووە زمڕوود لە هیچ کوێ دیار نەبووە و لە کۆشکدا نەماوە.' کە عەلی کوڕی مەجدەددین ئەوەی بیست، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. لە هەموو شتێک بێهیوا بوو. هاواری کرد و دەستی کرد بە گریان هەتا هێزی لە بەر بڕا و وردەوردە نەخۆش کەوت. لە جێدا کەوت. پیرێژنە بەردەوام نۆژداری دێنا سەر و دەرمان و شتیان دەدایە تا تۆزێک وەخۆ هاتەوە. ئینجا یادی خۆشەویستەکەی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

سروە، بەرامەیەکی خۆڵی یارەکەم بێنە
خەمی دڵ بڕەوێنە و هەست و سۆز ببزوێنە
هەڵمژم لە سای تۆوە بۆنی گڵی گراوم
سروە بە لەز بشنێوە، بێنە بۆ من ئەو بێهنە
ژیانم لێ تاڵ بووە هێندە چاوەڕوانت بووم
بە ماچی شیرنی لێوت، دڵی من وەحەسێنە

"کە ساڵی بە سەردا هاتەوە، پیرێژنە پێی گوت: 'ڕۆڵە، بە خەم و ناڕەحەتی تازە یارەکەت نایەتەوە. هەستە و قۆڵی لێ هەڵماڵە. شار بە شار و بگەڕێ و بکەوە سۆراخی گراوەکەت. ڕەنگە بتوانی بیدۆزیتەوە.' عەلی کوڕی مەجدەددین قسەی پیرێژنەکەی بە دڵ بوو. هەستا لە شار وەدەر کەوت. تەواوی ئەو شار و ناوچانەی دەوروبەر گەڕا هەتا گەیشتە شارەکەی زمڕوود و ڕێی کەوتە هەیوان و سەر خوانی زمڕوود. حەڵوایەک لەوێ

بوو کەس دەستی لێ نەدابوو. دەستی بۆ برد. هەنتەشییان خەمیان بوو، گوتیان: 'کوڕە لەوە مەخۆ، هەرکەس ویستوویەتی بیخوا، سەری تیا چووە.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'من هەر لەوە دەخۆم، چیم لێ دەکەن با بیکەن. بەشکو لەم ژیانە گڵاوە پڕ ستەم و زۆرە ڕزگارم بێ.' ئەوەی گوت و دەستی کرد بە خواردن. هەر کە پارووی یەکەمی خوارد. زمڕوود ویستی بانگی بکاتە لای خۆی. وا بوو بە دڵیدا هات گوتی: 'جارێ برسییەتی با جوان نانەکەی بخوا هەتا تێر دەبێ.'

"عەلی کوڕی مەجدەددین کەمێکی خوارد و تێر بوو. سولتان بە یەکێک لە پیاوەماڵییەکانی گوت: 'بچووە هێواشێک بەو کوڕە بڵێ بچووە بۆ لای سولتان.' پیاوەماڵییەکە چووە لای و پێ گوت: 'بەڕێزم، وەرە بۆ لای سولتان.' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بەسەر چاو.' دەمودەست هەستا و لەگەڵ پیاوەماڵییەکە چوو بۆ لای سوڵتان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، عەلی کوڕی مەجدەددین لەگەڵ پیاوەماڵییەکە چوو. خەڵک بە یەکتریان دەگوت: 'بڵێی چی لەوەیان بکا؟' هێندێکی دیکە دەیان گوت: 'بە چاکە نەبێ لەگەڵی ناجووڵێتەوە. ئەگەر ویستبای شتێکی لێ بکا، نەیدەهێشت خواردنەکەی بخوا.' دەستەیەک خەمیان بوو. کە عەلی کوڕی مەجدەددین لەپێش زمڕوود ڕاوەستا، کڕنۆشی برد. زمڕوود ئەسەر خۆ و بە هێمنی لێی پرسی: 'ناو و پیشەت چییە و بۆ هاتوویتە ئەم شارەوە؟' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'پاشــــای زەمان، ناوم عەلییە و کوڕە بازرگانم. خەڵکی شــــاری خوراســـــانم. هۆکاری هاتنە ئێرەم ئەوەیە بەدوای کیژێکدا دەگەڕێم کە لە گیانی خۆم خۆشــترم دەوێ—هەر لەبەر ئەوە هاتووم.' ئەوەی گوت و دەســتی کردە گریان. ئەوەندە گریا هەتا دڵی لە بوورەوە هات و کەوت. زمڕوود فەرمووی: 'گوڵاوی بەســەردا هەڵپرژێنن و وە هۆشـــــی بێننەوە.' ئەوجار زمڕوود داوای تەختەی فاڵ و قەڵەمی مســــینی کرد. کە کەنیزەکان هێنایان، دەستی دا قەڵەم و فاڵی گرتەوە و ماوەیەک مات بوو. دواى ئەوە گوتی: 'تو ڕاست دەکەی. بەم زووانە خودا بۆت دەدۆزێتەوە.'

"ئیدی زمڕوود بە پەردەدارەکانی گوت: 'بیبەن بۆ گەرماو. جلوبەرگی شکۆداری لە بەر کەن. دوای ئەوە سواری ئەسپێکی کەن و بۆ شێو بیهێننە کۆشک.'

"پەردەدار ئەویان برد بۆ گەرماو. هێندێک لە دانیشـــــتووان دەیان گوت: 'ئەوە چۆنە سوڵتان ئاوا لەگەڵ ئەو کوڕە بە نەرمی و لەسەرخۆیی جووڵاوە؟!' هێندێکی دیکە دەیانگوت: 'جا هی ئاوا قۆز و جوان هەر دەبێ ئاوا لەگەڵی بجووڵێتەوە.' ئیدی هەرکەسەی قسەیەکی دەکرد هەتــا وردەوردە بڵاوەیــان کرد و هەرکەســـــەی چووەوە بە لای ژیــانی خۆیەوە. زمڕووديش گەڕاوە بۆ کۆشک و چاوەڕێ بوو شەو بێ. کە بوو بە شەو، چووە خەوگەکەی و پاڵ کەوت، وای نواند کە خەوی لێ کەوتووە.

"زمڕوود خووی وا بوو شــەوانە جگە لە دوو خزمەتکاری منداڵکار، نەیدەهێشت کەسی لە لا بێ. کە چووە ئەوێوە، کەســــێکی نــارد بە شــــوێن عەلی کوڕی مەجــدەددینی خۆشــــەویســــتیدا. خۆشــــی لەســــەر تەختەکەی دانیشــــت. چەند مۆمێکیشــــی هەڵکرد. کە دانیشــتووانی کۆشــک بیســتیانەوە کە کەســێکی ناردووە بەدوای ئەو کوڕەدا. پێیان ســەیر بوو. هەر کام لەوان جۆرێکی بیر دەکردەوە و قســـەیەکی دەکرد. هێندێک دەیان گوت: 'دڵی سوڵتان ئەو کوڕەی گرتووە. سبەینێ دەیکا بە سەرداری سوپا.'

"بە کورتی، کاتێک عەلی کوڕی مەجدەددینیان هێنا. کڕنۆشــی برد و پێچکەی تەختەکەی ماچ کرد. نزای خێری بۆ کرد. زمڕوود لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆمی پێ ناناســــێنم هەتا

کەمێک گاڵتەی لەگەڵ نەکەم.' دوای ئەوە گوتی: 'عەلی! چوویتە گەرماو یان نا؟' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'بەڵێ پاشا.' زمڕوود گوتی: 'هەستە لەو خواردنە خۆشانە بخۆ و لەو مەیەش بخۆرەوە، چونکە لە ڕێگا زۆر ماندوو بووی.' کاتێک عەلی خواردنەکەی خوارد و مەیەکەی خواردەوە، هەستا و لەبەردەم تەختەکەی ڕاوەستا. زمڕوود پێی گوت: 'وەرە لەسەر تەختەکە دانیشە و قاچم بۆ بشێلە.' عەلی کوڕی مەجدەددین چووە سەر تەختەکە و قاچ و قولی بۆ شێلا. سەیری کرد بەلەکی لە ئاوریشم نەرمترە و لە بەلەکی ژنان دەچێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی لە دڵی خۆیدا گوتی: 'سوبحانەڵلا، ئەو سوڵتانە دەڵێی کچە، زۆر سەیرە!' ئیدی ئارەزووی بزووت. کە زمڕوود دیتی ئاوای لێ هات و تێک چوو، پێکەنی و گوتی: 'گەورەم، هێشتا منت نەناسیوەتەوە؟' عەلی کوڕی مەجدەددین گوتی: 'تۆ کێی؟' سوڵتان گوتی: 'کورە من کەنیزەکەی تۆم—زمڕوود.'

"عەلی کوڕی مەجدەددین کە ئەوەی زانی، باوەشی پێدا گرت و ماچی کرد. زمڕوودیش خەمزە و نازی بۆ دەکرد و لە بەردەستیدا تواببووەوە. کاتێک پەردەدارەکان بەوەیان زانی و هاتنە پشت پەردە، گوێیان لەو ناز و نووز و عیشوە و کرێشمەیە بوو، گوتیان: 'ئەو نازونووزە وەک هی پیاوان ناچێ. ڕەنگە ئەو سوڵتانە ژن بێ.' کە ڕۆژ بووەوە، زمڕوود فەرمانی دا گەورەگەورەکانی سوپا و دەستوپێوەندەکانی دەوڵەت بێنە ئێرە. پێی گوتن: 'من دەمەوێ بچمەوە بۆ شارەکەی خۆم. ئێوە کەسێک بە جێگری من دەسنیشان بکەن کە لەجیاتی من ئەم وڵاتە بەڕێوە بەرێ هەتا دێمەوە لاتان.' دوای ئەوە خۆی بۆ سەفەر ساز کرد. ئیدی توشەی ڕێگایەیان لە هێستر و وشتران نا. لە شار هاتنە دەرێ. شەو و ڕۆژ ڕێگایان بڕی هەتا گەیشتنەوە شارەکەی خۆیان. لەوێ هەتا دوایین ساتەکانی ژیانیان بە شادی و خۆشی و عەیش و نۆش گوزەراندیان.

### بەسەرهاتی جوبەیری کوڕی عومەیر و دەسگیرانەکەی

"بەسەرهاتێکی دیکە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە: شەوێک خەلیفە هارووونەڕڕەشید خەوی زڕابوو، هەر ئەمشانەوشانی دەکرد. هەتا دواجار وەڕەز بوو. ئینجا ناردی بەدوای مەسروورردا و پێی گوت: 'فکرێکم بۆ بکەوە زۆر وەڕەزم، بەشکو کەسێک پەیدا کەی با تاوێک قسەی خۆشم بۆ بکا.' مەسروور گوتی: 'خەلیفە، ئەی پێت خۆش نییە بچی لە باخ تاوێک لە نێو گوڵانەدا پیاسە بکەی؟ سەیر بکەی بزانی چۆن تیشکی مانگ و ئەستێرەکان کەوتوونەتە نێو باخەکەوە؟' خەلیفە گوتی: 'مەسروور، بە خودا دڵم بە هیچ کام لەو شتانە ناکرێتەوە.'

"مەسروور گوتی: 'خەلیفە، تۆ سێسەد ژنت هەیە، هەر ژنەی بە جیا کۆشکی خۆشی هەیە. دەستوور بفەرموو بچووە بۆ لایان و سەریان بدە.' خەلیفە گوتی: 'مەسروور، کۆشک و کەنیزەکان هەمووی هی خۆمن، ئەوانە ناتوانن کارم تێ بکەن.'

"مەسروور گوتی: 'خەلیفە، زانا و شاعیران کۆ کەمەوە هەتا پێکەوە شێعر و شتی

خۆش بخوێننەوە، یان چیرۆک و قسەی خۆشت بۆ بگێڕنەوە؟' خەلیفە گوتی: 'بە خودا هیچ کام لەوانەم بە دڵ نین.' مەسـرروور گوتی: 'هاودەم و هەڵبژادەکانت بانگ دەکەم، نوکتە و قسـەی نەسـتەقی جوانت بۆ بگێڕنەوە.' خەلیفە گوتی: 'من دڵم بەوانە ناکرێتەوە. نـ مەسروور گوتی: 'خەلیفە، دەی من بکوژە ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، مەســروور گوتی: 'خەلیفە، دەی من بکوژە با تۆ بحەســێیتەوە و ودرەزییەکەت بەســەر بچی.' خەلیفە بە قســەکەی ئەو پێکەنی و بە مەســروری گوت: 'مەسروور، بزانە لەو هاوذشینانەی من کامیان لە بەر دەرگایە؟' مەسروور چوو هاتەوە و گوتی: 'قوربان، عەلی کوڕی مەنســووری دیمشــقی لە بەردەرگایە.' خەلیفە گوتی: 'بچووە بانگی کە بێتە ئێرە.' ئیدی مەســروور چوو عەلی کوڕی مەنســووری هێنا. کە عەلی کوڕی مەنســوور هات، ســڵاوی لە خەلیفە کرد. خەلیفە ســڵاوەکەی ســەندەوە و گوتی: 'عەلی چیرۆکێک لەو چیرۆکانەی خۆتمان بۆ بگێڕەوە.' عەلی گوتی: 'خەلیفە، شتێکت بۆ بگێڕمەوە کە بیستوومە یان شتێکت بۆ بگێڕمەوە کە دیتوومە؟' خەلیفە گوتی: 'شتێکم بۆ بگێڕەوە کە دیوتە، چونکە بیستن قەت وەک دیتن نایەتەوە.'

"عەلی کوڕی مەنســوور گوتی: 'خەلیفە، من هەموو ســاڵێ ســەرێکی محەممەدی کوڕی سلێمانی هاشمیم دەدا. سەری ساڵ بوو، هەر وەک جاران چووم بۆ لای. کە چووم خەریک بوو دەچوو بۆ ڕاو. سڵاوم لێ کرد و ئەویش وەڵامی سڵاوەکەمی داوە و گوتی: 'مەنسوور لەگەڵ من سوار بە.' من گوتم: 'گەورەم، تاقەتی سواریم نییە.' ئیدی منی لە شوێنی میوانان دانـا. پەردەدار و میواندارەکانی ڕاســپارد ئاگایـان لێم بێ. ئەوپەڕی ڕێزیـان لێ نـام. میوانداریییەکی باشیان کرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'جا وەرە ئەو هەمووە لە بەسرە بمێنیتەوە، کەچی هەر ڕێگای کۆشـک بۆ باخ و باخ و بۆ کۆشـک شـارەزا بی. خۆ من دەرفەتی ئاوام نابێتەوە تا ســەرێکی دەوروبەری بەســرە بدەم. وا چاکە هەســتم بە تەنیا بڕۆم دەورێکی شـار لێ دەم.' گورج هەستام جلوبەرگی شـکۆدارم لە بەر کرد و لە ماڵەوە وەڕێ کەوتم. خەلیفە، بۆ خۆت دەزانی بەســرە حەفتا گەڕەکە. درێژاییی هەر گەڕەکێک حەفتا فرســەنگی عێراقییە. ئیدی من لەو کۆڵانانەدا سەرم لێ شێوا و ڕێم لێ ون بوو. تینوێتی ئەوکی گرتم. لەپڕدا تووشــی دەرگایەکی گەورە بووم کە دوو ئاڵقەی مســینی پێوە بوو. پەردەی دیبای ســووری بەســەردا درابوو. لەوبەرەوبەری دەرگاکە دوو ســەکۆی لێ بوو. دوو دارمێو سێبەریان بەسەردا کردبوو. لەسەر یەکێک لە سەکۆکان دانیشتم و سەیری دەر و دیوارم دەکرد کە لە ناکاو گوێم لە ناڵەناڵکێک بوو. دیار بوو لە دڵێکی داخدارەوە دەهات. کە ئەو شێعرەی دەگوت:

لاڵانەوی جەرگــبــڕم ئەشـــێ بـــوێ
بەشـــکو دڵی ئـاشـــقکم تۆزێـک بســـرەوێ
شـــەو تـا بەیـان لە تـاوی حەجمینم نییە

ڕۆژ نـیـیه ئەو شــــینــی نەکـا لـێرەولەوێ
ڕۆژێ بێ بیبینمەوە ســــیمـای جوانی ئەو
جێژنێ دەگرم من شـــتی وا هەر تـای نەوێ
ســــواری و کەوتن شـــتێکی زۆر ئـاســــاییه
دیتنی نەورۆز ســـەبری زســـتـانی دەوێ

" 'له دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەگەر خودا ئەو دەنگه خۆش و لەبەردڵانەی بیســـتبا تەواوی دەنگخۆشـــەکانی کۆ دەکردەوە.' وردەوردە له دەرگاکه نزیک بوومەوە. پەردەکەم لا دا. لەپڕدا چاوم به کچێک کەوت، ســپیوســۆڵ و ناســک، مێوژەڕەشــکەی خواردبا له ئەوکیدا دیار بوو ، برۆکەوانی، بســـک و کەزییەی ئاڵقەئاڵقه و چینچین، چاوی مەســـت و مەمک پرتەقاڵی، دەمی هێندە بچووک بوو گلارە ترێی تێوە نەدەچوو، لاجانگی وەک کاروانکوژە دەتروسکاوە. به جۆرێک که دڵی پیر و لاو بۆی دەبووراوە و ژن و پیاوی له هۆش دەبرد. وەک شاعیر دەڵێ:

دڵی بــــــــردم بەو بسکه پڕ له ئاڵقه و چینه
تیشــــک داوێ ســـیمای ســـپی خۆری زەمینه
لەشـی چـــــەرمووی شـیراسـایه، دڵمی بردووە
خۆزگه بەو کەســـــه کـا له ئـامێزی گرتووە

" 'من به کەلێنی پەردەکەدا چاوم لێ دەکرد. له پڕدا چاوی پێم کەوت. به کەنیزەکەی گوت: 'بزانه کێیه له بەردەرگایه؟' کەنیزەکه هات و چاوێکی له من کرد و گەڕاوە پێی گوت: 'پیاوێکی پیرە.' گوتی: 'بانگی که بێتە ژوورەوە.' که چوومە ژوورەوە، لەپێشی ڕاوەستام و سڵاوم کرد. پێی گوتم: 'ئەوە شەرم ناکەی خۆت دادەگری؟ شوورەییه پیرێک بەو تەمەنەوە کاری ئاوا ناحەز بکا.' گوتم: 'خانمەکەم، پیرییەکەم ڕاســـتە، پیرم، بەڵام پێم وا نییه کاری خراپم کردبێت.' ئیدی کەمێک بێدەنگ بوو. پاشــــان گوتی: 'ئەی کار لەوە خراپتر که بچیته پشـت دەرگای خەڵک و به دزییەوە چاو له ژن و منداڵ بکەی؟' من گوتم: 'به دەسـت خۆم نەبوو، نـاچـار بووم.' گوتی: 'بۆ نـاچـار بووی؟' گوتم: 'غەوارەم و تینووم بوو. هـاتمه بەردەرگا و ئیدی منتان دیت.' گوتی: 'باشـــه، ئەگەر وا بێ قەیناکا. ئەوە لێت خۆش بووین.' "'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# کە شەوی سێسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کچە گوتی: 'ئەوە لێت خۆش بووم.' بە کەنیزێکی گوت: 'بچووە ئاوی بۆ بێنە.' ئەو کەنیزە گۆزەیەکی زێڕینی خەملاو بە دوڕ و گەوهەری پڕ لە ئاوی بونداری بۆ هێنام. دەسماڵێکی ئاوریشمی سەوزیان بەسەردا دابوو. من گۆزەکەم وەرگرت و قومەقومە و بە چێژەوە دەمخواردەوە. لەبنەوەش بە دزییەوە چاویشم لێ دەکرد. دوای ئەوە گۆزەکەم داوە بە کەنیزەکە و ڕاوەستام. ئەو کیژە گوتی: 'پیرە، بڕۆ بەڕێی خۆتدا.' منیش گوتم: 'خانمەکەم، شتێکم بە زەین گەیشت.' گوتی: 'شتی چیت بە زەین گەیشت؟' گوتم: 'بیر لە سووڕی دەوران و ڕووداني ئەو هەموو ڕووداوە بەدوای یەکدا دەکەمەوە.' ئەو کەنیشکە گوتی: 'جێی خۆیەتی لە بیر ئەوەدا بی کە لەو ڕۆژگارەدا کاری سەیر سەیر ڕوو دەدا. پێم بڵێ بۆ کەوتیتە بیرکردنەوە؟' گوتم: 'بیر لە خاوەنی ئەم ماڵە دەکەمەوە، پێش ئەوەی بمرێ لەگەڵ من برادەر بوو.' ئەو کیژە گوتی: 'خاوەنی ئەم ماڵە نێوی چ بوو؟' گوتم: 'محەممەدی کوڕی عەلی گەوهەرفرۆش بوو. پیاوێکی زۆر ساماندار بوو. نازانم وجاخی ڕوونە یان نا؟' گوتی: 'بەڵێ، کچێکی لە پاش بەجێ ماوە ناوی بێدوورە و تەواوی ئەو سامانە بەو بڕاوە.' گوتم: 'خانم، دەڵێی ڕەنگت تێک چووە؟ پێم بڵێ چ بووە؟ بۆم بگێڕەوە—بەشکوو کارێکم لە دەست بێ.' ئەو کچە گوتی: 'ئەگەر بزانم ڕازداری، ئەوە نهێنی خۆمت لە لا دەدرکێنم. لە پێشدا پێم بڵێ تۆ کێی؟ هەتا بزانم بۆ ئەوە دەبی ڕازی خۆمت پێ بڵێم یان نا. وەک شاعیر دەڵێ:

نهێنی نادرکێنێ مرۆڤی ژیر
جگە لای کەسێ زانا بێت و بەبیر
بدوێنە هەرکەسەی لە قەرا ژیرییە
ئەگەر مەیخۆرە، شێتە یا ڕمێنییە[1]

" 'پێم گوت: 'من عەلی کوڕی مەنسووری دیمەشقیم، هاونشینی هاروونەڕڕەشیدم.' کە کچە ئەو قسەیەی منی بیست، لەسەر کورسییەکەی هاتەخوارێ و گوتی: 'بژی کوڕی مەنسوور. من دەردی دڵی خۆم لە لای تۆ دەدرکێنم و ئاگادارت دەکەمەوە. من ئەڤینداریکی لەیاردابڕاوم.' گوتم: 'خانم، تۆ جوان و دەلالی. جوانان ئەڤین تێدەپەڕێنن. پێم بڵێ گراوەکەت کێیە؟' گوتی: 'من ئاشقی جوبەیری کوڕی عومەیری شەیبانیم.' منیش پێم گوت: 'خانم، ئێوە یەکترتان لە نیزیکەوە دیوە، یان پێوەندیی نامە و شت و هەیە؟' گوتی: 'بەڵێ، بەلام

---

١. ڕمێنی: لە ڕمێندابوون، بەدوای باوەوە، مۆدەیی، کەسێک بە دوای مۆدەوەیە.

ئەو وەک من نییە. بە پێچەوانەی من خۆشەویستییەکەی سەرسەرەکییە و هەر بە زمانە، لە دڵەوە نییە. چونکە ئەو لەســەر گفت و بەڵێن نەبوو و پەیمانشـکێنی کرد.' من گوتم: 'خانم. هۆی جیابوونەوەی ئێوە چی بوو؟' کیژە گوتی: 'هۆی جیابوونەوەکەمان ئەوە بوو، ڕۆژێک من دانیشـتبووم. ئەم کەنیزە ســەری بۆ دادێنام و بۆی دەهۆندمەوە، ســەری لە جوانی و دەلالیی من سووڕ ما و هاتە پێشێ و هەنییەی ماچ کردم. لەو جەنگەیەدا ئەڤینەکەم وەژوور کەوت و دیتی کە هەنییەمی ماچ کرد. ئیدی ئەو شێعرەی گوت:

بڕۆ لاچـــــۆ بێوەفـای تۆ من ئیتر یـاری وام نـاوێ
ئەوا دەرچـووم و ڕۆیشـــــتم لە داوت حەزی وام نـاوێ
تۆ کە منـت لە بیر کردووە، منیش وا لە بیرم کردی
ئەوە گفـت و بەڵێنـت بێ، گفـت و بەڵێنی وام نـاوێ

" ' 'لەو ڕۆژەوە ڕقی لێ هەڵگرتووم و بە تەمایە خۆ لە من نەداتەوە. هەتا ئێســتا نە هاتووەتە لام و هیچ نووســراوەیەکیشــی بۆ نەناردووم.' پێم گوت: 'دەی تۆ بە تەمای چی بکەی؟' گوتی: 'من بە تەمام نامەیەکی لە منەوە بۆ بەری. ئەگەر وەڵامت بۆ هێنامەوە، ئەوە پێنجسەد دیناری زێڕی سوورت دەدەمێ. ئەگەر وەلامیشت نەهێناوە، ئەوە سەد دینارەکەی خۆتت دەدەمێ.' ئیتر کەنیزێکی بانگ کرد و گوتی: 'قەڵەم و کاغەزم بۆ بێنە.' کەنیزە قەڵەم و کاغەزی بۆ هێنا. کیژە دەلالەکە ئەو چەند بەیتەی بۆ نووسی:

ئەگەر بۆم بلوێ، گیـانی شـــیرینـت بە قوربـان دەکەم
پـێـم لەســـەر دانـێ، وە بـزانە ئەمـن خـۆڵـی دەرکەکەم
دەزانـــم چـارەڕەشــــم و مەیـلـی دڵـداریـت نـیـیە
کـوا بەخـتـی ئەوەم هەیە هەڵـۆی وا بـێـتە لانەکەم
خۆ ئەمن و تۆ ئەڤــــینـدار و هـاودەمی یەکتر بووین
تۆ بێ بەڵێن بووی پەیمـانت شــکاند، من هەر ئاشــقەکەم

" 'دوای ئەوە نامەکەی مۆر کرد و دای بە من. من نامەکەم وەرگرت و چووم بۆ ماڵی جوبەیری شـەیبانی. ئەو چووبوو بۆ ڕاو. چاوەڕێ بووم هەتا هاتەوە. خەلیفە! کاتێک ئەوم بە سواری بینی، لە سوارچاکی و جوانچاکی و شۆخ و شەنگی ئەو کابرایە سەرم سووڕ ما و خەریک بوو شـێت بم. چاوی لێ کردم، منی دیت لە بەردەرگاکەیان دانیشـتبووم. لە ئەسپەکە دابەزی و هات بۆ لام، سڵاوی کرد و دەستی لە ملم کرد. من وام هەسـت کرد بەهەشـتم لە ئامێز گرتووە. دوای ئەوە بردمییە ژوورەوە و لە پەنا خۆی دایانم. پێی گوتن:

خوان ڕاخەن.' خزمەتکارەکان خوانیان ڕاخست. هەموو جۆرە خواردنێکیان لە سەر ڕیز کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی کوڕی مەنسوور گوتی: 'لەسەر سفرەی جوبەیری کوڕی عومەیر دانیشتم. ئەو شێعرە لەسەر کەوڵەکە نووسرابوو:

حەز دەکەی ببینی ژنی لەبار و شۆخ و شەنگ
چاوێک هەڵێنە با هەتا هەی، قەت نەبی دڵتەنگ
شەرابت پیرۆز دەبێ لە لا وەک ئاوی کەوسەر
گەر بمژی تۆ دم و لێوی شیرینی وەکوو هەنگ

" 'دوای ئەوە جوبەیری کوڕی عومەیر بە منی گوت: 'فەرموو، دەست بکێشە شتێک بخۆ و ئەو دڵە خەمبارەم کەمێک شاد کە.' گوتم: 'بە خودا داوایەکم هەیە، هەتا داواکەم جێبەجێ نەکەی، هیچ ناخۆم.' گوتی: 'داواکەت چییە؟' نامەکەم هێنا دەرێ و دامێ. کە نووسراوەکەی خوێندەوە، دڕاندی و فڕێی دا ئەو لاوە. بە منیشی گوت: 'جگە لەوە، هەر شتێکی دیکەت بوێ جێبەجێی دەکەم. خاوەنی ئەو نامەیە لە لای من هیچ وەڵامێکی نییە.' ئیدی بە تووڕەییەوە هەستام. ئینجا ئاتەگی گرتم و گوتی: 'کوڕی مەنسوور، من پێت دەڵێم ئەو چی بە تۆ گوتووە. ئەو پێی گوتی: 'ئەگەر وەڵامم بۆ بێنیتەوە، پێنجسەد دیناری زێڕی سوورت دەدەمێ. ئەگەر وەڵامیشت بۆ نەهێنامەوە، ئەوە سەد دیناری خۆتت دەدەمێ؟' ' گوتم: 'بەڵێ، وای گوت.' گوتی: 'ئەمڕۆ تۆ لێرە لەگەڵ ئێمە دانیشە و خەریکی عەیش و نۆشی خۆت بە، پێنجسەد دینارە زێڕە سوورەکەشت وەرگرە.' من ئەو ڕۆژە لە لای ئەو مامەوە و خواردنم خوارد. دوای ئەوە پێم گوت: 'گەورەم، تۆ حەزت لە سەما و هەڵپەڕکێ و شادی نییە؟' گوتی: 'لە مێژە ئێمە مەی و سەمامان بە یەکەوە نەبوو.' بانگی کرد: 'شەجەرەتوددور!' کەنیزێک بە عوودێکەوە کە کاری هیندییەکان بوو، هات. لە لای ئێمە دانیشت و دەستی دا عوودەکەی و بیست و یەک شێوەی ژەند و گەڕاوە سەرەتا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

(" 'کە کەنیزەکە شێعرەکەی تەواو کرد، کابرا هاواری لێ هەستا و لە هۆش خۆی چوو. کەنیزەکە گوتی: 'کاکە، خودا بتگرێ! ئێمە لە مێژ بوو لەبەر ئەوەی نیگەرانی گەورەمان بووین، قەت لە کاتی مەیخواردنەوەدا بەزمی سەما و هەڵپەڕکێمان نەدەبوو. ئێستا هەستە بچووە لەو دیوە بخەوە.' هەستام چوومە ئەو دیوەی ئاماژەی پێ کردبوو. لەوێ خەوتم. کە ڕۆژ بووەوە، کۆیلەیەک هاتە لام. تووڕەکەیەکی بۆ هێنام پێنجسەد دیناری زێڕی تێدا بوو. گوتی: 'ئەوە ئەو زێڕانەیە کە گەورەم گفتی پێ دابووی، بەڵام تۆ تازە مەچۆرەوە بۆ

لای ئەو کیژە و وای دانێ تۆ قەت ئێمەت نەدیوە.' گوتم: 'باشـــە بەســـەر چاو.' ئیدی توورەکەم وەرگرت و ڕۆیشـــتم. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەو کچە چاوەڕێی منە، هەر دەبێ بچمە بۆ لای و شـــتەکەی بۆ بگێڕمەوە. ئەگەر نەچمەوە کـارێکی نـاجوامێرانەیە.' ئیدی چوومەوە بۆ لای. کە چووم، لەپشت دەرگاکە ڕاوەستابوو. هەر کە منی دیت، گوتی: 'کوڕی مەســـنوور، کارەکەت بۆ جێبەجێ نەکردم.' گوتم: 'تۆ لەکوێوە دەزانی کارەکەتم جێبەجێ نەکردووە؟' گوتی: 'کوڕی مەنســـوور، من دەزانم کاتێک نامەکەی منت دایە ئەو نامەکەی منی دڕاند و فڕێی دا ســـەر زەوی و بە تۆی گوت: 'کوڕی مەنســـوور، تۆ جگە لەوە هەر داوایەکت هەبێ بۆت جێبەجێ دەکەم، بەڵام باســـی ئەو کیژە لە لای من مەکە.' تۆ توورە بووی و هەستای. ئەو ئاتەگی گرتی و گوتی: 'ئەمڕۆ لە لای من دانیشە و شەویش بەزم و ئاهەنگمان دەبێ و خۆشـــت بۆ دەگوزەرێ.' کەنیزێک هات و فڵانە شـــێعر و فڵانە ئاوازی گوت. ئەو بوورایەوە و کەوت.'

" 'خەلیفەی زەمـان! ئەمن بەو کچەم گوت: 'گەلۆ تۆ لەگەڵ من بووی وا هەمووی ئەو قســانەت بیســتووە و ئەو شــتانەت دیوە؟' گوتی: 'کوڕی مەنســوور مەگەر ئەو قســەیەی شاعیرت نەبیستووە کە دەڵێ دڵی ئەڤیندار ئاوێنەیەکی شەش پەڕە. بەڵام کوڕی مەنسوور ئەوە بزانە لەو دنیایەدا هیچ شتێک نییە نەگۆڕێ.'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'ئەو کەنیشکە گوتی: 'کوڕی مەنسوور، هیچ شتێک لەو دنیایەدا نییە گۆڕانی بە سەردا نەیە.' ئینجا ڕووی لە ئاسمان کرد و گوتی: 'خودایە، بۆ خاتر گەورەیی و دەسەلاتی خۆت، کارێک بکەی وەک چۆن من گیرۆدەی ئەڤینی جوبەیری کوڕی عومەیر بووم، ئەویش ئاوا گیرۆدەی داوی ئەڤینی من بکەی! ئەو خۆشەویستییەی لە دڵی من هەڵگری و بیخە دڵی ئەوەوە!' دوای ئەوە سەد دیناری زێڕی سووری دامێ. زێڕەکانم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ بەغدا. کە ساڵ تێ وەرسووڕاوە، هەر بەپێی ڕەواڵی سالان چوومەوە بۆ بەسرە بۆ پیتاکی سالانە. پیتاکەکەم لە والی وەرگرت. ویستم بگەڕێمەوە بۆ بەغدا کە بیدووورم بەبیر هاتەوە—کچە ئەڤیندارەکە. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'بە خودا هەتا سەرێکی ئەو کچە نەدەم و نەزانم لەگەڵ دڵدارەکەی چی کردووە، ناگەڕێمەوە.' ئیدی هەستام چووم بۆ ماڵەکەیان. سەیرم کرد بەردەرگاکەیان ئاوپرژێن کرابوو، جوان ماڵدرابوو. خزمەتکار و دەرکەوان و کۆیلە لەوێ لە بەردەرگا ڕاوەستابوون. بە خۆمم گوت: 'ڕەنگە خەم و پەژارەی ئەو کچە سەری کردبێ و مردبێت و گەورەیەک لە گەورەکانی شار هاتبێتە ماڵەکەی.' لەوێوە هەستام چووم بۆ ماڵی جۆبەیری کوڕی عومەیر. سەیرم کرد ماڵەکەی وەک کەلاوە وایە، بەردەرگاکەی کەسی لێ نییە. بە خۆمم گوت: 'ڕەنگە ئەویش مردبێت.' ئیدی لە بەردەگاکەیان ڕاوەستام. گریانم بۆی هات. ئەو شێعرەم خوێندەوە:

ڕەنگە ئێرە دیاری یار بێت، بۆیە من لێرە لام داوە
لە هەور و گرمە دەپرسم سۆراخی ڕۆحی کەلاوە
کەوتوومە پێ‌وشوێنی هاوڕێم، بە شوێنی لەیلا دەزانێ
دەزانێ کەی مانگ کۆچی کرد، زوحەل هاتووەتە ئەو ناوە
لە دوای ڕۆینم، یاسەمەن و سەلو و چیمەنیش تێدا چوون
بە هۆی ئەسرینی چاومەوە ئەوت دەدی وا تێراوە

" 'کە بەو شێعرە شینگێڕیم بۆ دانیشتووانی ئەو ماڵە کرد، لەپڕدا کۆیلەیەکی ڕەش هاتە دەرەوە و بە منی گوت: 'لاڵ بی یا خوا! ئەو لالانەوەیەت لە چییە؟! دەڵێی قەلی دەقرێنی.' بە کۆیلەکەم گوت: 'من لێرە هاوڕێیەکەم هەبوو.' کۆیلەکە گوتی: 'ناوی هاوڕێکەت چییە؟' گوتم: 'جوبەیری کوڕی عومەیری شەیبانی بوو.' گوتی: 'سپاس بۆ خودا هیچی لێ نەهاتووە و لە هەموو شتێکیشی زۆرە: گەورەیی و بەختەوەی و ... بەڵام خودای بەرز و

بیهاوتا خۆشەویستی کچێکی بە ناوی بێدووری خستووەتە دڵییەوە. ئەو خۆشەویستییە بێ سەر و زمانی کردووە و لەوێ کەوتووە، برسی بێ و تینووی بێ هیچ دەنگی لێ نایە و نە داوای خواردن دەکا و نە بۆ قومێک ئاو دەگەڕێ.' بە کۆیلەکەم گوت: 'روخســەتێکم بۆ بخوازە بێمە ژوورەوە.' کۆیلەکە گوتی: 'گەورەم، تۆ دەچیتە لای کەسێک کە ئەو تۆ بناسێ. ئەگەر نەتناســێ، دەگەڕێیتەوە؟' پێم گوت: 'دەبێ دەســبەجێ بێم بۆ لای.' کۆیلەکە چووە ژوورێ و ڕوخســەتی بۆ وەرگرتم و گەڕاوە. لەگەڵی چوومە ژوورێ. ســەیرم کرد وەک تاشە بەردێک، بێ جووڵە لەوێ کەوتبوو. نە کەسی دەناسی و نە ئاوڕی لە کەس دەداوە. قەسەم لەگەڵ کرد. هیچی نەگوت. ئەوانەی لەوێ بوون یەکیان گوتی: 'ئەگەر شێعر دەزانی، بە دەنگێکی بەرز شـێعری بۆ بخوێنەوە، چونکە پێی خۆشـە و هەڵدەسـتێ قسـەت لەگەڵ دەکا.'

" 'ئیدی من ئەو دوو بەیتەم بۆ خوێندەوە:

لێوبەبـاری و ڕەنگی زەردت پێم دەڵێن تۆ عـاشــقی
پـێـم بڵـێ تـیـری ئەڤـیـنـی کـام دلبەر ئەنگـاوتـی
تـا دوێـنـێ دەتـلاوە ئـاشـــقـی زار بە تـیـری تـۆ
چۆنە پێکراوی ئەوڕۆکە، پەککەوتە و کەنەفتی تۆ

" 'کە جوبەیر شــێعرەکەی منی بیســت، چاوی هەڵێنا و پێی گوتم: 'هەر بژی، کوڕی مەنســوور.' گوتم: 'گەورەم، کارت بە من هەیە یان نا؟' گوتی: 'بەڵێ، دەمەوێ کاغەزێک بنووســم، بۆم بەری بۆ ئەو کیژە. ئەگەر وەڵامت بۆ هێنامەوە، ئەوە هەزار دیناری زێڕی ســوورت دەدەمێ. ئەگەر وەڵامیشـت بۆ نەهێنامەوە، ئەوە دووسـەت دیناری زێڕت خەڵات دەکەم.' گوتم: 'چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عەلی کوڕی مەنســـوور گوتوویەتی: 'ئەمن بە جوبەیری کوڕی عومەیرم گوت: 'چۆنت پێ خۆشــە وا بکە.' ئیدی بە کەنیزێکی گوت: 'قەڵەم و کاغەزێکم بۆ بێنە.' کە بۆیان هێنا، ئەو شێعرەی نووسی:

دڵـم تەنـگە بە قەڵەمـی بـۆنـخـۆشـــی خـۆت یـادم بـکە
لە دەریـای بـێ بـنـی عـیشـــقـا دەخـنـکـێـم ڕزگـارم بـکە
لـێـم بپرســـە چۆنی؟ بـا پـێـت بـڵـێـم چەنـد دەردەدارم بـۆت
کەوتـووم لە ژووری کەلەلا ئەوە دەردەچـێ گـیـان لە ســـۆت
تـیری عـیشـــقـت هـێنـد بێ بەزە بە نـاخـی دڵـمـا ڕۆ چووە
هەر چـی خـۆزگە و بـریـای تـرە هەمـوویـم لە بـیـر کـردووە

" 'دوایی نامەکەی مۆر کرد و دایمێ. نامەکەم وەرگرت و چووم بۆ ماڵی بێدوور خانم. خەریک بووم وردەوردە پەردەکەم لا دەدا، کەچی سەیرم کرد ئەوە دە کەس لە کەنیزەکان لە دەوری بێدوور خـانم کۆ بوونەتەوە و ئەویش وەک مـانـگ لەنێو ئەســـتێرەکـانـدا دەدرەوشـاوە. هیچ خەم و پەژارەیەکیش لە سیمایدا نەبوو. لەو جەنگەیەدا کە من سـەیری ئەوم دەکرد، ئەویش چاوی پێم کەوت کە لە بەردەرگا ڕاوەســـتاوم. گوتی: 'ئافەرین کوڕی مەنسوور، وا دیارە شاعیر لە خۆڕا ئاوای نەگوتووە:

هـێـمـن بە لە خـۆشـــی و نـاخـۆشــــیـدا
هەبوون تیـــــــــــژ بەرەو تێداچوون دەڕوا

" ' 'کوڕی مەنسـوور، ئێستا من وەلامەکەی بۆ دەنووسـمەوە تا ئەوەی گفتی پێ داوی، لێی بستێنی.' گوتم: 'خودا پاداشت بە باشی بداتەوە.' ئیدی کەنیزێکی نارد قەڵەم و کاغەزی بۆ بێنێ و، ئەو شێعرەی نووسی:

لێت ســـــــــــوور بێ لێوت وە لێوم ناکەوێ
بـۆ لە خـۆتـی تـاڵ دەکەی ڕۆژ و شـــەوێ؟
عـوودی وجـوودی خـۆت لە هـیـچ و خـۆڕا
دەســـــــــــــــووتێنی لەنێو مەنقەڵی خەمدا
گەر بناڵـــــــــــێنی بە شـــەو هەتاکوو ڕۆژ
لێت حەرام بێ خورد و خەو تۆ شـــەو و ڕۆژ
دڵـنـیـا بە خـۆشـــی لە مـن نـابـیـنـی
خـۆزگە و بـریـاکـانـت بە خەو دەبـیـنـی

" 'گوتم: 'خانم، باوەڕ بکە هیچی وای نەماوە بمرێ. ئەو نووسراوەیە بخوێنێتەوە، بە سۆگەری دەمرێ!' کە وام گوت، نامەکەی لێ وەرگرتم و دڕاندی. گوتم: 'لە جێی ئەوە شێعرێکی دیکەی بۆ بنووسە.' ئیتر دەستی دا قەلەمەکەی و ئەو شێعرەی بۆ نووسی:

ئەو حەز و کەفوکولە وەلا نیی
تەواوی کە ئەو حالە وەلا نیی
تۆ کە ناتوانی ڕۆژێ پێم بگەی
بۆچی لە خۆڕا خۆت ئازار دەدەی
نابینی ڕۆژێ من هاودەمت بم
ببمە هاوژینت، خەمڕەوینت بم

" 'گوتم: 'خانم، ئەگەر ئەو ئەم شێعرە بخوێنێتەوە، دڵی دەتۆقێ.' گوتی: 'کوڕی مەنسوور، تاوانی من نییە. منیش ئێش گەیشتووەتە ئێسقانم. ئەوەندە ئازارم چەشتووە بە دەست خۆشەویستی ئەوەوە، بە خۆم نییە منیش قسەی ئاوا دەکەم.' منیش گوتم: 'خۆ حەق بە تۆیە، ئەگەر لەوە زیاتریشی ئازاری بدەی، بەڵام ئاخر لە بیرت نەچێ بەخشین و لێبووردەیی کاری گەورانە.' کە ئەو وتانەی منی بیست، چاوی پڕ بوو لە ئاو و شتێکی دیکەی نووسی. خەلیفە بە خودا لەو دیوانەی تۆ دا کەس دەستخەتی ئەوەندە خۆش نییە. کە نووسراوەکە تەواو بوو. سەیرم کرد ئەو شێعرەی تێدا نووسیبوو:

مزگێنی بێ، ڕووناکی سەحرای چۆڵم
ڕێگەی دووریت من بە بڕژۆڵ دەکێڵم
حەوتووی دابێ دێم و میوانت دەبم
خەم مەخۆ خۆم بەلاگەردانت دەبم
دڵم بە هیچ کەسێ نەداوە ئێستا
تۆ نەبی کەس ئارامی بەو دڵەم نادا
جەستەمان ئاوێتەی یەک دەکەینەوە
لێومان بە ماچی یەک ئاشت دەکەینەوە

" 'کە نامەکەی تەواو کرد ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کە بێدوور خانم نامەکەی تەواو کرد، مۆری کرد. گوتم: 'خانم، ئەو نامەیە دەرد و نەخۆشـــی پێ دەپەڕێ و گڕی دەروون دادەمرکێنێ.' نامەکەم وەرگرت و هـاتمە دەرەوە. خـانم قـاوی کردم: 'کوڕی مەنســـوور، بە جوبەیری کوڕی عومەیر بڵێ. ئەمشـەو میوانی تۆ دەبێ.' بەو قسـەیە ئەوەندی دی خۆشـحاڵ بووم و نامەکەم برد بۆ لای جوبەیر. کە چووم، دیتم چاو لە دەرگا چاوڕێی وەڵامی نامەکەیە. کە نامەکەم دایە، وەری گرت. کردییەوە و خوێندییەوە. کە زانی چ باسە، قیژاندی و بە لا داهات. کە هاتەوە سەرخۆ. گوتی: 'کوڕی مەنسوور، یانی خانم بە دەستی خۆی ئەو کاغەزەی نووسی و قامکی خۆی پێدا هێناوە؟' گوتم: 'گەورەم، بۆ کەسێک کە شتێک دەنووسی، بە قاچی دەینووسی؟!'

" 'خەلیفە! قەســـەم بە خودا هێشـــتا قســـەکانی من و جوبەیر تەواو نەببوو کە دەنگی خرخاڵەکانی خانم هات و وەژوور کەوت. جوبەیر هەر کە ئەوی دیت، ڕاســـت بووەوە. تومەز قەتقەت نەخۆشـیش نەبووە. کە یەکتریان لە ئامێز گرت، ئەوەی ناسـاخی بوو تێیدا نەما. دوای ئەوە جوبەیر دانیشت و خانم بە پێوە ویستا. گوتم: 'خانم، بۆ دانانیشی؟' گوتی: 'کوڕی مەنســـوور، من دانانیشـــم مەگین بەو مەرجەی لەنێوانماندایە.' گوتم: 'چ مەرجێکتان لەنێواندایە؟' خانم گوتی: 'ئەڤینداران کەس لە نهێنی نێوانیان تێناگەیەنن.' ئینجا خانم دەمی بردە بن گوێی جوبەیر و سرتەیەکی لەگەڵ کرد. جوبەیر گوتی: 'بەسەر سەر و سەر چاو.'

" 'دوای ئەوە جوبەیر هەســـتا و یەکێک لە کۆیلەکانی ناردە دەرێ. کۆیلە دوای تاوێک گەڕاوە. قازییەک و دوو شـایەدی لەگەڵ خۆی هێنابوو. جوبەیر بە قازی گوت: 'ئەو کچەی لەســـەر ئەوەندە مارەیی لە من مارە بکە.' قازی بە خانمی گوت: 'تۆش بەو کارە ڕازییت؟' خانم: 'ڕەزایەتی خۆی دەربڕی.' قازی لێکی مارە کردن. خانم دەســـتی برد و کیســـەیەکی چکۆڵەی دەرهێنا و مستێکی زێڕی سوور دا بە قازی و شایەدەکان و ئەوەی دیکەی دا بە جوبەیری کوڕی عومەیر. قازی و شـــایەدەکان گەڕانەوە. من بە دڵێکی خۆش و کەیفێکی ســـازەوە دانیشـــتبووم هەتا پاژێکی شـەو ڕابرد. ئەوجار لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەو جووتە ئاشـــقن و زۆر دەمێکیشـــە چاوەڕێی ئەو کاتە دەکەن و شـــەویش دەرنگە وا چاکە ئەمن هەســـتم بڕۆم لە دیوێکی دوور لەوانە، هەتا بەیانی بنووم و لەوان گەڕێم دووبەدوو بن. هەرکە من هەســـتام. خانم ئاتەگی گرتم و گوتی: 'ئەوە بە تەمای چیت؟' ئەمن پێم گوت بە تەمام چ بکەم.' خانم گوتی: 'دانیشـــە هەر کات پێمان خۆش بێ بەڕێت دەکەین.' ناچار لەگەڵیان دانیشـــتم هەتا لای بەیانی.' ئەوجار خانم گوتی: 'کوڕی مەنســـوور، ئەگەر پێت خۆشە بخەوی، هەستە بچووە فڵانە دیو.' ئیدی من چوومە ئەو دیوە و هەتا بەیانی خەوتم.

" 'که ڕۆژ بووەوە، کوێلەیەک تەشـت و مەسـینەیەکی هێنا. دەسـنوێژم گرت و نوێژم کرد. لەوێ دانیشـتبووم کە جوبەیر و گراوەکەی لە گەرماوەکەی ماڵی خۆیان هاتنە دەرێ. ئاو لە سـەر و بسکیان دەتکا. پیرۆز بایم لێ کردن و گوتم: 'هەر شـتێک کە سـەرەتایەکی تووشی هەبێ، کۆتاییەکی خۆشی دەبێ.'

" 'جوبەیر گوتی: 'ڕاسـت دەفەرمووی، ڕێز و حورمەتی تۆ لەسـەر ئێمە واجبە.' لەڕێوە خەزنەدارەکەی بانگ کرد و پێی گوت: 'سـێهەزار دیناری زێڕی سـوور بدەیە.' خەزنەدار کیسـەیەکی هێنا کە سـێهەزار دیناری زێڕی سـووری تێدا بوو. جوبەیر بە منی گوت: 'کوڕی مەنسوور، گەورەییم لەگەڵ بکە و ئەو دیارییەم لێ وەربگرە.' پێم گوت: 'هەتا نەزانم بۆ دوای ئەو شەیداییەی بێدوور خانم ئەوجار تۆ وات لێ هات، دیاری وەرناگرم.' جوبەیر گوتی: 'کوڕی مەنسـوور، ئێمە جەژنێکمان هەیە نەورۆزی پێ دەڵێین. لەو ڕۆژەدا خەڵک دێنە دەرەوە و سـواری لۆتکە دەبن، دەگەڕێن و سـەیران دەکەن. منیش لەو ڕۆژەدا هاتمە دەرەوە و لەگەڵ هاوڕێکانم خەریکی سـەیران بووین. لۆتکەیێکم دیت دە کەنیزی تێدا بوو وەک مانگ دەدرەوشـانەوە. خانمیش لەنێویاندا دانیشـتبوو. بێدوور خانم عوودێکی بە دەستەوە بوو. عوودەکەی بە یازدە شێواز ژەنی و گەڕاوە بۆ یەکەم شێواز و ئەو شێعرەی گوت:

خـوایە یـارێـکـی جەفـاکـاری دەیەی
دڵـــــــــڕەق و بێ بەزە و نازداری دەیەی
بە دەســـت دەردی بێ وەفـایی زەلیـل بێ
تـووشــــی نۆژدارێـکی بێـبەزە و دڵ بـێ
بـا بـزانـێ شـــەو و ڕۆژی عـاشـــقـان
چـۆن پـڕە لە ئـێـش و بـڕک و دەرد و ژان

" ' 'من بە کەنیزەکانم گوت کە ڕاوی بنێن.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ' 'جوبەیر گوتوویە کە من گوتم ڕاوی بنێن با بڕوا. هاوڕێکانم وایان نارنج بارانکرد کە من ترســام لۆتکەکەیان نوقم ببێ. ئەوە بووە هۆی ئەوە دڵم بۆی نیگەران بێ و بۆی لێ بدا. بەو جۆرە هـاتە دڵمەوە و ئیتر نەچووە دەرێ و کـاری خۆی کرد.'

" 'من توورەکە زێڕەی خۆم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ بەغدا.' خەلیفە کە ئەو چیرۆکەی لە عەلی کوڕی مەنسوور بیست، دڵی کراوە. حەکایەتێکی دیکە هەیە ئەویش زۆر خۆشە.

### چیرۆکی خاوەنی شەش کەنیزەکە

"خەلیفە مەئموون ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کۆشکەکەی خۆی دانیشتبوو. گەورە گەورەکانی حوکوومەت و شاعیر و هاونشینەکانی لە لای خۆ کۆ کردبوونەوە. یەکێک لە هاونشینەکانی محەممەد بەسری بوو. مەئموون ڕووی تێ کرد و گوتی: 'محەممەد، دەمەوێ چیرۆکێکم بۆ بگێڕیتەوە کە قەت نەمبیســتبێت.' محەممەدی بەسـری گوتی: 'خەلیفە، شـتێکت بۆ بگێڕمەوە کە بیستبێتم یان دیتبێتم؟' مەئموون گوتی: 'کامەیان خۆشترە ئەوەیانم بۆ بگێڕەوە.'

"محەممەد گوتی: 'خەلیفە، لە وڵاتی یەمەن کـابرایەکی دەوڵەمەنـد هەبوو. ئەو کـابرایە جارێکیان لە یەمەنەوە هات بۆ بەغدا. بەغدای زۆر پێ خۆش بوو. هەر بۆیە چوو ماڵ و منداڵەکەشــی هێنا بۆ بەغدا. شـــەش کەنیزیشـــی هەبوو. یەکەمیان ســـپیکەڵانە، دووەمیان ئەســـمەر، ســێیەمیان قەڵەو و چوارەمیان لاواز، پێنجەمیان زەرد و شـەشـەمیان ڕەش بوو. بەڵام هەموویان جوان و زانا و دەستڕەنگین و لە ژەنینی عووددا شارەزاییان هەبوو.

" 'ڕۆژێک ئەو پیاوە کەنیزەکانی لە دەوری خۆی کۆ کردبووەوە و داوای خواردن و خواردنەوەی کرد. خواردیان و خواردیانەوە و سەرخۆش بوون. دوای ئەوە پیاوە دەسـتی دا پیـاڵەیەک و پڕی کرد لە مەی. ڕووی لە کەنیزە ســـــپیکەڵانەکەی کرد و گوتی: 'ڕوومانگەکەم، شتێکی خۆشم بۆ بڵێ.'

" 'کەنیزە دەســـتی دا عوودەکە و تاڵەکانی توند کردەوە و وای ژەنی کە دار و دیواری هێنایە سەما. ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بـا پیـاڵە پڕ کەیـــــــن لە بـادە، وەرن بـا گوڵ هەڵخەینەوە
با گـــــــــــەردوون ژێروژوور بکەین، لە نوێوە دایڕێژینەوە

گەر لەشـــــــــــكری خەم ویستی كۆڕی ئاشقان بشێوێنێ
من و سـاقـــــــــی یەک دەگرین و بەفراسـا دەیتوێنینەوە
گەر ئـامێرت پێیە موتریـب شـــتێکی خۆشـــمان بۆ بڵێ
چەپڵە لێـدەین و هەڵپەڕین، ســەرمـان لە بیر بەرینەوە

" 'كـابرا كەیفی ســــاز بوو، پیـاڵەكەی فڕ كرد و پڕی كردەوە. ڕووی لە كەنیزە گەنمڕەنگەكە كرد و پێی گوت: 'كیژی ســیماگەش و ئاكار بەهەشــتی، گورانییەكی خۆشــی خۆتمان بە گوێدا بچڕە.' كەنیزە عوودەكەی دەست دایە و ئاوازی ئەوەندە خۆشی ژەنی كە داروبەردی وە جۆش هێنا و ئەو شێعرەی گوت:

ئـازیـزان مـانـگـی گـوڵانە وا چـاكە چـاكـی ڕابـوێـریـن
فەرمووودەی پیری موغـانە بە دڵ و گیـانی بســـپێرین
گەورەیی لای كەس نەمـاوە و شـــادی تێـدەپەڕێ ڕۆژێ
چـار هەر ئەوەیە بەرمـاڵیش لە پێنـاو بـادە بفرۆشـــین
هەوایـــــــەكی خۆش و دڵـگیـرە خـوایە بـینـێری ئەوڕۆ
دڵێكی خۆش، ڕۆژێكی شـــاد، تێر بـادەی تێـدا بنۆشـــین

" 'پیاڵەیەكی دیكەی پڕ كرد و بە دەســـتییەوە ڕایگرت و بە كەنیزە قەڵەوەكەی گوت: 'خەپە گیان، نۆرەتە.' كەنیزە عوددەكەی هەڵگرت و وای ژەنی كە خەمی لە دڵان ڕامالی و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

پشـــكووتووە گوڵی ســـوور و بولبول ســـەرمەســـت بوون
ســـۆفی زیـكـریـان وەلا نـا و بەرەو مەیـخـانە چـوون
پـڕ كە پـیـاڵە بـا ئـێـمەش تـۆزێ خەم بە بـا دەیـن
گەر وا نەكەیـن گەمـژەیـن ژیـنـمـان بە فـیـرۆ دەدەیـن

"پیاوە دڵی خۆش بوو. بادەكەی دەســـتی هەڵدا. یەكی دیكەی پڕ كردەوە و ئاماژەی بۆ لاوازەكە كرد و گوتی: 'ڕێواســە ناسـكەكەم، تۆ بەو دەنگە خۆشــەت ســەرمەســتمان كە.' كەنیزە دەستی دا عوودەكە و بە دەنگێكی خۆش ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بـادە هەڵـدەن ئەوڕۆكە تـێـر بـخـۆنەوە
بەو بـادەیە خەمـی دڵـتـان بشـــۆرنەوە
دەبـا هەموو دڵیـان خۆش بێ یەک دوو ڕۆژە

## کەس فـریـای خەم نـاکەوێ بەو تەمەنەوە

" 'کابرا گوڕاحی[1] خۆش بوو، بادەکەی پێدا کرد و پیاڵەکەی دەســتی پڕ کردەوە. ئینجا ئاماژەی بۆ کەنیزە زەردەکە کرد و پێی گوت: 'هەتاوی گەش، شــیعرێکی خۆشــمان بۆ بخوێنەوە.' ئەو کەنیزەش دەســتی دا عوودەکەی و ئاوازی زۆر خۆشـــی لێ دا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

له هـــــــیچ پەرستگێکی موغان نییە سەوداسەری وەک من
عەبا لە شـــــــوێنێ گرەوی بادە و، دەفتەر لە شوێنێ دن
تۆبەم کـــــــــــردووە لەسەر دەستی بوتێکی بادەفرۆش
نەخـــــــــــــۆمەوە بێ ئەوانەی دەلالن و نەشەبەخشن
جــــــــــۆگەلەی وام هەڵبەستووە لە چاومەوە بەرەو ئاتەگ
بەشـــــکم لە پەنام نەمامـــــــــــێکی بەژن زراف بنێژن

" 'کابرا ترياکی گوڵی کرد و پیاڵەکەی فڕ کرد و بە لەز تێی کردەوە. دەســـتی بۆ لای کەنیزە ڕەشـــەکە ڕاداشــت و پێی گوت: 'ڕەشــێنەی چاو، بچڕە.' ئیدی کەنیزە دەســتی دا عوودەکە و تاڵەکانی توند کردنەوە، چەند شــوازێکی تاقی کردەوە پاشــان هاتەوە ســەر ئەوەی سەرەتا و بە دەنگێکی خۆش ئەو چەند بەیتە شێعرەی خوێندەوە:

گــوڵ لەبەردەم، مەی لەســـەر لەپ و گــراو بە دڵـی خـۆ
ســــــــوڵتانی جیهان نـــــاگرم ئەمڕۆ بە نۆکەری خۆ
بە بــاوەڕی مە بـــــــــادە حەلاڵە بــۆ ئـێـمە، بەڵام
حەرامە بــۆ مە دوور لە دیــدارت، ســـەلـوی گــوڵەنـدام
دایمە من گوێم لە ئـاوازی چەنـگ و دەنگی شــمشــــاڵە
چـاویش چـاوەڕێـی جـامـی شـــەراب و لـێـوێـکی ئـاڵە
ئـارەقــخــۆر و ســـــەرەڕۆم و بەڕەڵا و تــوولازم مــن
لەو وڵاتەدا ئەوەی کە وا نەبـێ نـایـبـیـنـم مـن

" 'ئینجا ئەو کەنیزانە هەســـتان کڕنۆشـــیان برد و گوتیان: 'کامممانت بە دڵترە؟' کابرا چاوێکی لە جوانی و شـــەنگ و شـــەپاڵی هەموویان کرد. جیاوازیی ڕەنگەکانی لە بەرچاو گرت و سپاسی خودای بەجێ هێنا و پێی گوتن: 'ئێوە کەستان نییە کە قورئانی نەخوێندبێ

---

١. گوڕاح: جەو.

و زانستەکان فێر نەبووبێ و پەند و قسەی پێشینیان نەزانێ. ئێستا داوا دەکەم هەرکەسەی هەستێ و ڕوو لە بەردەنگەکەی بکا. پەسنی خۆی بکا و زەمی لایەنی ڕووبەڕووی بکا. من ئەوە گوێم لێتان دەبێ، ئەوەی دەیڵێن لە ڕووی قورئان و قســـەیەکی نەســـتەق و پەند و شتەوە بێ. با بزانم چەندتان لە باردا هەیە.' ئەوان گوتیان: 'بەسەر سەر و سەر چاو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و سی و چوارەم

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کەنیزەکان گوتیان: 'بەسەر سەر و سەر چاو.' ئینجا کەنیزە سپیکەلانەکە هەستا ڕووی لە کەنیزە ڕەشەکە کرد و گوتی: 'قولەڕەش، من وەک مانگی چواردە دەدرەوشێمەوە، ڕەنگم گەشە و تەوێڵم شەوق دەداتەوە. خودای پایەبەرز لە کتێبە پیرۆزەکەیدا بە پێغەمبەرەکەی خۆی، حەزرەتی مووسا(د ـ س) دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى:﴿ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ فِي تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾﴾ النمل: ١٢

واتا: ﴿دەستت بخەرە ناو باخەڵی خۆتەوە، دەستت بەبەرۆکی خۆت دا بکە، ئەگەر دەستت بخەیە ناو بەرۆکتەوەو دەریبهێنیەوە دەدرەوشێتەوەوەکوو پارچە ئەستێرەیەکی پرشنگداری لێدێ، هیچ دیاردەی نەخۆشیشی پێوە نابێ. [ئەم دوو موعجیزەیە بەشێکن لەو نۆ موعجیزانەی پشتگیری پێغەمبەرایەتی تۆی پێدەکەین‌و دەیانکەین بەنیشانەی ڕاستی پەیامی تۆ بۆ لای فیرعەون‌و گەلەکەی. واتە: چونکە ئەوان گەل‌ونەتەوەیەکی لەڕێ دەرچوو بوون، لەڕێبازی حەق لایان دابوو، لەچوارچێوەی سروشت دەرچووبوون، فیرعەون لافی خودایەتی لێدەداو ئەوانیش تەصدیقیان دەکردو بەخودایان دەزانی ملیان بۆشۆڕکردبوو چی پێدەگوتن جێ بەجێیان دەکرد!!﴾.

دیسان خودای پایەبەرز دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَى:﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾﴾ آل عمران: ١٠٧

واتا: ﴿ئەوانی ڕوو گەش‌و ڕوو سپین بەهۆی ئەوەی کە لە ژیانی دونیایاندا یەکیەتی‌و تەباییان بەرجەستە دەکرد، جیاوازییان لە ئاییندا نەدەکرد، ئەوانە هەتا هەتایە دەکەونە ژێر ڕەحمەتی خوداوە، لەبەهەشتا دەمێننەوە ئەوەندەیان بەلاوە خۆش‌و دڵگیرە نایانەوێ لێی دەربچن﴾.

ڕەنگی هێمای بەختەوەری و جوانیی من گەیوەتە ئەوپەڕی خۆی و مرخی منی وا بردووەتە سەرێ کە دڵەکان بە منەوە بەستراونەتەوە. فەرموودەی لەسەرە دەڵێن کە سپی باشترینی ڕەنگەکانە و موسوڵمان شانازی بە جلی سپییەوە دەکا. ئەگەر منیش بمەوێ پەسنی ڕەنگی سپی بدەم، درێژدادڕی دەبێ، بەڵام گوتەیەکی کورت و پوخت کە بە ئاکامت

بگەیەنێ، باشترە لە درێژدادڕییەک کە فڕی بەسەر بابەتەوە نەبێ. قولەڕەش، جارێ چیت دیوە؟ بزانە چیت بەسەر دێنم! دەڵێی ناوکی قەڵەمی، هەی قەلەڕەش. شاعیر لە پەسنی سپی و زەمی ڕەشدا گوتوویە:

دوڕێک بە هەنبانەیەک زێڕ کڕدراوە
کۆڵێک خەڵووز بە درەمێک فرۆشراوە
قولەڕەش لە دۆزەخدایە تا هەتایە
سپی پێست بەختەوەرە لە بەهەشتدایە

" ' 'دەشگێڕنەوە ڕۆژێک نووح(د ـ س) خەوتبوو، دوو کوڕەکەی کە سام و حام بوون، لە لای دانیشتبوون. لەو جەنگەیەدا بایەک هات و داوێنی کراسەکەی هەڵداوە. گەڵوگونی نووح دەرکەوت. حام چاوێکی لێ کرد و پێکەنی. سامیش هەستا داپۆشییەوە. لەڕێوە نووح لە خەو ڕابوو. بەو شتەی زانی کە ڕووی دابوو. نزای بۆ سام کرد و نزای لە حام کرد. سام ڕووی سپی و گەش بوو. بوو بە یەکێک لە پێغەمبەران و، پاشاکانی لێ کەوتەوە. حامیش ڕووی ڕەش بوو. هەلات بۆ ناوچەی حەبەشە. هۆزی سوودان لە وەچەی ئەون. خەڵک هەموو لەسەر ئەو بۆچوونەن کە سوودانییەکان تەواو نین. ئەقڵسووکن. وتەیەک هەیە دەڵێن: 'چۆن مرۆڤی ڕەشی ژیر پەیدا دەبێ؟!' ' لێرەدا کابرا بە کەنیزە سپیکەلانەکەی گوت: 'دانیشە، ئەوەندە بەسە.' ئەوجار بە کەنیزە ڕەشەکەی گوت: 'تۆش هەستە وەلامی بدەوە.' ئیتر کەنیزە هەستا، ئاماژەیەکی بۆ کەنیزە سپییەکە کرد و گوتی: 'ئەی تۆ نەتزانیوە قورئان لە شەودا بۆ پێغەمبەر هاتە خوارەوە و لە قورئاندا خودا دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَالَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ① وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ② ﴾ الليل: ١ - ٢

واتا: ﴿سوێند بەشەو کە بەتاریکی خۆی هەرچی ڕوناکی هەیە دایدەپۆشێ و پەردە بەسەر بونەوەردا دەدا. سوێند دەخۆم بەڕۆژ هەرکاتێ دەرکەوت تاریکی نەماو بوونەوەر ڕوناک بووەوە﴾.

ئەگەر شەو لە لای خودا ڕێزی نەبایە، ئەوە سوێندی پێ نەدەخوارد و وە پێش ڕۆژی نەدەخست. یانی تۆ نازانی ڕەشی یەکێک لە دیاردەکانی گەنجێتییە و کاتێ مووسپیبوون ڕوو لە گەنجان دەکا، ئیدی هیچ شتێک ئەو تامە نادا و لە مردنیان نیزیک دەکاتەوە؟ ئیدی تۆ بۆت نییە سەرکۆنەی من بکەی، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ئەگەر دڵۆپێک ئەڵەو ڕەشییەی من
بە ڕووتا بتکێ بە جۆری شیرن
هێندەت جوان دەکا، وێردی زاران بێ
دایم بەرباسی لاوی شاران بێ
خەڵک بە دەستە بێن تا بتبینن
بە دیتنت هەموو دۆش دابمێنن
بە پێچەوانە گەر خاڵێ سپی
کەسێ ببینێ لە چەند جێی پێستی
تازە ئەو کەسە هەراسان دەبێ
خزم و کەسیشی لێی نەبان دەبێ
خەڵک وەکوو شووم تەماشای دەکەن
گەر بۆیان بکرێ هەر خۆی لێ نادەن

" 'بەڵام سپیلۆک، ئەوەش بزانە هاوڕێ و خۆشەویستان هەر شەوانە لەدەوری یەک کۆ دەبنەوە. شتێکی زۆر گرینگ ئەوەیە شەو پەردەی دڵدارانە و ئەوان لە لۆمەکەرانی دووزمان و خۆتێهەڵقوتێن دەپارێزێ، هەر وەک شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

ئەمشۆکە تێر مژیم لێوی ئەو چاو کەژاڵە
تامی شەکری داوە بە مەی ئەو لێوە ئاڵە
تکایە شەو! مەڕۆ هەزار کاریشت هەبێ
خونچەی ڕۆژ مەپشکوێ، گەر دڵیشت خۆشحاڵە

" 'ئەگەر من ئەوەندەی شایانییەتی پەسنی ڕەش بدەم، کاغەزی دنیا بەشی ناکا. کە وایە لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆم. بەڵام سپیلۆک، ئەوەندەش بزانە ڕەنگی تۆ ڕەنگی کوچکە، جوانیی تۆ دڵ مات دەکا و دڵی مرۆ دەگرێ. سەرماوسۆڵە بۆ ئازاردانی لەڕێداماوان. گەورەیی ڕەشێتی لەوەدایە کە قورئان بە قەڵەم نووسراوە، بە ڕەنگی ڕەشی میسک و عەنبەر هەڵدەڵێن. بە نرخێکی گران دەیفرۆشن و بە دیاری دەیبەن بۆ پاشاکان. ئەگەر باشترین شتیش نەبا، خودا گلێنەی چاوی لە ڕەنگی ڕەش چێ نەدەکرد. شاعیر لە پەسنی ڕەنگی ڕەشدا دەڵێ:

کە چاو لە لاجانگت دەکەم
مانگیش ڕەش دێتە بەر چاوم

تـۆ گـلـێـنەی چـاوی مــــــــنـی
بـــۆیە ڕەش دێـیـــتە بەر چـــاوم

" 'پیاوەکە پێی گوت: 'دانیشـــە، هەر ئەوەندە بەســە.' ئینجا کابرا بە قەڵەوەکەی گوت کە هەستێ. قەڵەوە ڕابوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزە قەڵەوەکە هەستا و ڕووی لە کەنیزە لاوازەکە کرد. پووز و بەلەکی وەدەر خستن و باسکی ناسکی لێ هەڵماڵی و کراسی لا دا. زگی وەک ئاوریشم و ناوکی وەک ئاڵقەی شفرە وەدەر کەوتن. گوتی: 'سپاس بۆ خودا وا سیمایەکی جوانی دا بە من و منی قەڵەو بەدی هانی. لە کتێبە پیرۆزەکەیدا ڕێزی لە قەڵەوی ناوە و گوتوویە: 'وجاء بعجل سمين.'[1] سپاس بۆ خودا کە منی وەک باخێک خوڵقاندووە کە قۆخ و سێو و هەنارم هەیە. خەڵک حەزیان لە مامری قەڵەوە و دەیخۆن. قەڵەوی شانازییە، بەڵام تۆی لەڕ چی؟ لینگت دەڵێی هەر تەشییە. تۆمەز لە بەر خۆر وشکیان کردوویتەوە. ماڵتە، هیچی وات نییە دڵت پێ خۆش کەن، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ڕەقوتەق وەکوو مەلیچکی بێگیانی
لە چاو من تۆ هەر یەکسەرە ئێسقانی
تا من لەوێ بم، کێ لە تۆ دەڕوانێ؟
تا نەرمە بێ ئێسقان بە هیچ نازانێ

" 'کابرا بە کەنیزەکەی گوت: 'دانیشە.' ئینجا ڕووی لە کزەکە کرد و ئاماژەی دایێ کە هەستێ. کەنیزە لاوازەکە وەک خەڵفە سەلوێک ڕاست بووەوە. بەژن و لاق و لەتەری تومەز داری حەیزەران و چڵە ڕێحانەیە. گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە منی ئاوا جوان و ڕێکوپێک ئافراندووە. من لە خەڵفە سەلو دەچم کە هەموو کەس خۆشی دەوێ و حەزی لێیەتی. ئەگەر هەستم، زۆر سووک و ئاسان هەڵدەستم و، ئەگەر دانیشم چالاکانە دادەنیشم. کەس ناڵێ: 'دۆستەکەم دەڵێی فیلە' یان 'دەڵێی دێوە هەتا دەجووڵێتەوە دیق دەکەم.' بەڵکوو وەک نەمامە سەلوێکم دەچووێنن. گەیشتن بە من، کەیفی ئاشقان ساز دەکا و دڵخۆشیان دەکا. دیتنی من دەبێتە هۆی گەشانەوەی ئاشقان و، پێکەنینم ڕوحیان شاد دەکا. وەک ئەوەی من لکە حەیزەران یان چڵە ڕێحانە بم و هاوتام نەبێ. وەک دەڵێن:

لە نێو هەموو خاسییەکاندا کزی وەبەر من کەوتووە
پیو و بەز و گۆشتە ڕزیو وەبەر قەڵەوان کەوتووە

---

١. واتە: "گوێلکێکی قەڵەوی هێنا."

له جێیەکی دیکەدا دەڵێ:

لەش‌ولارم چـوسـت و چـالاک
دوور لە نەخـۆشـی وەک کەلاک
جەسـتەی مـن قەت بـۆگەن نـابێ
ئـارەقـاوی و چـڵـکـن نـابێ
جەسـتەی تـۆ بە دایـمە پـیسـە
چەور و بـۆگەن و نەگـریسـە
ئـای کە چەنـدە بەخـتەوەرم
قەڵەو نـیـم و کـز و لەڕم

" ' 'دەی چون ئاشـق و عەودالّی کەسـێکی وەک من تابن. ئەگەر خۆشـەویسـتەکەم بیهەوێ بێ بۆ لام، منیش دەچم بۆ لای. ئەگەر ئەو ڕامێکشـێ، منیش ئەو ڕادەکێشـم. بەڵام تۆی قەڵەوی چارەڕەش، جارێ بە قەد فیلێک دەخۆی. هەستان و دانیشتن لەگەڵ تۆ خۆش نییە. ئەو ورگە زلەت هیچ جوانییەکی تێدا نییە و هەر بۆ سـەربڕین باشـی. بۆ هەڵسـووڕان و شت نابی. یەکێک گاڵتەیەکت لەگەڵ بکا، خێرا تووڕە دەبی. بە قانەقدیلە و شەڕەچنگ زوو نارەحەت دەبی و نازونووزت لێ نایە و زۆریشت لێ ناحەزە. کە بە ڕێدا دەڕۆی، ماندوو و شـەکەت دەبی. تێرخواردنت نییە. نە جووڵەیەکت هەیە و نە خێر و بەرەکەت. بێجگە لە خواردن و خەوتن هیچی دیکەت لە دەسـت نایە. هەر دەڵێی خێگەی فوودراوی، یان فیلی گۆڕاوی. هەر خێرت تێدا نییە. لەو بارەوە قەڵەو سەرکۆنە کراوە، گوتوویانە:

قەڵەو نـاشـاردرێتەوە لە هـیـچ کـوێـیەک
کـز جـێـی دەبـێـتەوە لە هەمـوو جـێـیەک
سـووکی شـادی ڕۆحە و، قورسـی خەمی دڵ
شـادی ڕۆح دەکرم، دەفرۆشـم خەمی دڵ
لەشـی لاواز سـووک و چـالاک و گەشـە
هەر قەڵەوە تەپـلـۆس و چـارەڕەشـە

" 'ئیدی کابرا پێی گوت: 'دانیشە، تەواوە.' دوایی ڕووی لە کەنیزە زەردەکە کرد. کەنیزە زەردەکە هەستا و ڕووی لە کەنیزە ئەسمەرەکە کرد ...' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کەنیزە زەردەکە ڕووی لە کەنیزە ئەسمەرەکە کرد و گوتی: 'خودای بەرز و بێهاوتا لە قورئاندا باسی ڕەنگی منی کردووە و پەسنی دەکا و منی بەسەر ڕەنگەکانی دیکەدا نرخاندووە و فەرموویەتی: 'صفراء فاقع لونها تسر الناظرین. ڕەنگی من باشترین ڕەنگە و لە ڕەنگی خۆر و مانگ و ئەستێرەکانە. من جێی ئیرەیی و مانگ و موشتەریم و، ولاتی دەلالی و دلبەریم. ڕەنگی من وەک زێڕە و لەبەردلانم و قازانجی زۆرم هەیە. شاعیر لە پەسنی مندا دەڵێ:

تۆ کە وەک هەتاو زەرد و جوانی
لە زێڕیش زیاتر لەبەردلانی
ناچی لە یادم زەردەزێڕینە
زەردیی تۆ مایەی ڕووناکی ژینە

" 'هۆ کەنیزەی ڕەنگ ئەسمەر تۆ ڕەنگی کامێشی، خەڵک ڕقیان لێتە. هەر شتێک بە ڕەنگی تۆ بێ، لای خەڵک پەسند نییە. ڕەنگی تۆ هێمای خەم و ماتەمە. قەت دوڕ و گەوهەر و زیو و زێڕ بە ڕەنگی تۆ نابن. ئەوەندەی دەستت تێوە دەن و بتسوون و بە دورتدا بێن ناحەزتر دەبی. ئارایشتەکەشت نەما، ئەوەندەی دی ناحەز دەبی. نە ڕەشی پەسنت بکەن نە سپیت پێتدا هەڵبڵێن. هەر بۆ پێداهەڵگوتن نابی. وەک لەو بارەوە دەڵێن:

کەسێک ئاوەزی ڕێنوێنی بێ
ئاشقی شتی گەنمرەنگ نابێ
ئەگەر ئیشتیاشی بۆ گەنم بچێ
ژینی دنیاشی لە دەست دەردەچێ

" 'پیاوەکە پێی گوت: 'باشە تۆش دانیشە.' ڕووی لە کەنیزە گەنمرەنگەکە کرد، یانی هەستە. ئەو کەنیزێکی ڕووخۆش و بالابەرز، خاوەنی جوانی تایبەت و فریشتەئاسا، مووعەنبەرین و ڕەوشتجوان، ناوقەدباریک و سمتخڕ، لەشێکی لە ئاوریشم نەرمتر و زولفەکانی لە قیر ڕەشتر بوون. گورج بە ئاماژەی خاوەنەکەی هەستا و گوتی: 'سپاس بۆ

---

١. واتە: "بە ڕەنگی زەرد کە بینەرەکانی شاد دەکا." بەشێک لە ئایەی ٦٩ی سوورەی بەقەرە.

خودا کە منی ئاوا جوان بەدی هانی. نە زۆر قەڵەو، جێی لۆمە بم و نە زۆر لەڕ تیزەجاڕ بم. نە وەکوو بەڵەکان سپی و نە وەک ڕەشـان قولەڕەش و پیسـم. بەڵکوو من ڕەنگی جێی پەسـندی ژیران و هێژا و بلیمەت و هونەرمەندانم. بە هەموو زمـانەکـان پەسـنی گەنمڕەنگیان کردووە و پێیان لە هەموو ڕەنگەکان لەسەرترە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ئەو ئەسـمەرە کە جوانیی هەمـوو دنیای لە لایە
چاوی مەسـت و بزەی لێو، دڵی شـادی لە لایە
گەرچی سـوڵتانی دلان زمانخۆشانن، بەڵام
سـولەیمانی زەمـانە کلکەوانەی لە لایە
خاڵی ڕەشـی سـەر گۆنای یاری خوێن شـیرینی من
نـهـێـنـی دەنـکە گەنـمـی بـاوادەمـی لە لایە

" 'ڕەنگی من پەسەندی پاشایانە و بەژنێکی ڕێکوپێکم هەیە و جەستەم وەک ئەڵماسە. نرخم گرانە. من لە خوێنشـیرینی و ئاکار و ڕەوشـت و زمانزانیدا گەیشـتوومە چلەپۆپە. شۆخی و دەستبازی و ئیشقبازی لەگەڵ من خۆشە. بەڵام تۆ کەنیزە زەرد و ڕەنگپەڕیوەکە هەر دەڵێی تەرسی. سەروچاوت دەڵێی سەروچاوی کوندەیە. تامت وەک تامی کەکرە وایە. هەرکەس لەگەڵت تێ خزێ، پشـووی لێ دەبڕێ و دەبێ خۆ بۆ مردن سـاز کا. ئەوەی جوانییە تێتدا نییە. لەو بارەوە لە پەسنی هی وەکوو تۆدا دەڵێن:

بێزارم لە خـۆت، قسە و ئاکارت
هێند ناپەسـەندە وتە و ڕەفتارت
زەردییەکەت دەڵێی ڕەنگی شـەمچەیە
هـەناسەکەشت دووکەڵەکەیە

" 'کە کەنیزەکە شێعرەکەی تەواو کرد. کابرا پێی گوت کە دانیشێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کە کەنیزەکە قسەکانی تەواو بوو، کابرا گوتی: 'دانیشە و ئەوەندە بەسە.' دوای ئەوە پیاوەکە کەنیزەکانی ئاشت کردەوە. یەکی خەلاتێکی باشیشی دانێ و گەوهەری گرانبایی پێشکەش کردن.

" 'خەلیفە، من لە هیچ جێیەک کەنیزی ئاوام نەدیوە.'

"کە مەئموون ئەو چیرۆکەی لە محەممەدی بەسری بیست، گوتی: 'محەممەد، ئەو کابر یەمەنییەماڵی لەکوێیە تا ئەو کەنیزانەم بۆ بکڕی؟' محەممەد بەسری گوتی: 'خەلیفە بیستوومە کە کابرا هۆگر و ئەویندای کەنیزەکانیەتی و ناتوانێ لێیان جوێ ببێتەوە.'

"مەئموون گوتی: 'بۆ هەر کام لە کەنیزەکانی یەکی دەهەزار دینار ببە.'

"ئیدی محەممەدی بەسری شەستهەزار دیناری هەڵگرت و چوو بۆ ماڵی کابر یەمەنییەکە. کە چوو بۆ لای ئەو پیاوە، گوتی: 'خەلیفە دەیەوێ کەنیزەکانی تۆ بکڕێ و شەستهەزار دیناریشی بە مندا بۆ ناردووی. تۆ لەبەر دڵی خەلیفەش بێ، بیانفرۆشە.' ئەو کابرایە کەنیزەکانی بۆ خەلیفە نارد. کە کەنیزەکان چوونە لای خەلیفە، خەلیفە کۆڕێکی خۆشی بۆ گرتن. لەگەڵیان دەستی کرد بە وتوویژ. هەتا ماوەیەکی زۆر خەلیفە شەو و ڕۆژ لەگەڵیان بوو. دوای ماوەیەک خاوەنی ئەو کەنیزانە نەیتوانی شان وەبەر قورسایی دووری ئەوان بدا و تاقەت بێنێ. هەر بۆیە نامەیەکی بۆ خەلیفە نارد و ئەو دوو بەیتەی تێد نووسی:

لە تاوی دووری ئەو شەش بتە لەشزێوینەم<br>
لە دەستم داوە شەش شت و تاڵە ئەم ژینەم<br>
هۆش لە سەرم و ڕەنگ لە ڕووم و بینای چاوانم<br>
هێمنی دڵ، تاقەتی لەش، ئارامی گیانم

"کە نامەکە گەیشتە دەست خەلیفە. جلی باش و گرانبایی لە بەر کەنیزەکان کرد و شەستهەزار دیناری دانێ و ناردنییەوە بۆ لای خاوەنەکەیان. کەنیزەکان چوونەوە لای خاوەنەکەیان. کابرا بە دیتنیان گەشاوە و لەگەڵیان دەستی کرد بە عەیش و نۆش و خوشڕابواردن هەتا تێکدەری خۆشی بەسەریدا دان.

## چیرۆکی دەمودەستویژی ئەبوونەواس

"یەکی دیکە لەو چیرۆکەکانە ئەوەیە کە خەلیفە هارِوونەڕڕەشید شەویک لە شەوان خەوی زڕابوو، فکریکی گەورەی بە زەین گەیشت. ئیدی هەستا بە دەوری کۆشکدا دەگەڕا کە تووشی دیویک بوو، پەردەیەک بە دەرگاکەیدا درابوو. کە پەردەکەی لا دا، لە لای سەرەوە تەختیکی دیت تارماییەکی لەسەر خەوتبوو. لە لای چەپ و ڕاستی خۆشی مۆمی داگیرساندبوو. خەلیفە هەر وا سەیری دەکرد کە لەپڕ دیتی ئەوە دەفریک مەیی کۆن لەوێیە و پیاڵەیەکیشیان لەسەر داناوە. خەلیفە پێی سەیر بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەو بادە و مۆم و تەختە لە کوێ و ئەو داوەڵە لە کوێ؟!' ئیدی لە تەختەکە چووە پێشێ، کەچی دیتی ئەوە کچێک لەسەر تەختەکە خەوتووە و قژیشی بەسەر دەموچاویدا داوە. قژەکەی لەسەر دەم و چاوی لا دا. سەیری کرد هێندە جوانە، سەیر. وەک مانگ دەدرەوشێ.

"ئیدی خەلیفە پیاڵەیەکی مەیی هەڵدا و لە سیمای جوانی ڕاما. ئەوجار سەری بردە پێشێ و ماچێکی خاڵەکەی سەر گۆنای کرد. کیژە خێرا لە خەو ڕابوو. گوتی: 'یا أمین الله ما هذا الخبر؟'[1] خەلیفە گوتی: 'میوانێکە و بەو شەوە لێت پەیدا بووە، دەبێ هەتا بەیانی میوانداری بکەی.' کەنیزە هەستا مەیی هێنا پێشێ و دەستیان کرد بە مەیخواردنەوە. کەنیزە عوودێکی هێنا و تاڵەکانی توند کردەوە و دەستی کرد بە ژەنینی. بیست و یەک شێوەی تاقی کردەوە. دوای ئەوە هاتەوە سەر شێوازێکیان و بە ئاوازێکی خۆش و شادەوە ئەو چەند بەیتەی گوت:

تۆ کە پێت وا بوو هیچ شتێک وەکوو دووری یار نییە
بێتوو هیوایەک هەبێ، ئەوەندەش زنار نییە'
دەبا خەڵک بزانن هۆی ئەسرینی چاوی من
سەیر لەوەدایە کە دەگریم کەس بێدار نییە!
نووکی برژانگم لەسەر ڕووی زەرد و لاوازی من
دەردی دڵ ئینشا دەکا پێویست بە وتار نییە

"کە کەنیزەکە شێعرەکەی خوێندەوە، گوتی: 'خەلیفە، من لەتملێکراوم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1] واتە: "خودایە ئەوە چ باسە؟!"

# که شەوی سێسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کەنیزە گوتی: 'خەلیفە، من ستەملێکراوم. خەلیفە پێی گوت: 'کێ ستەمی لێ کردووی؟' کەنیزە گوتی: 'کوڕەکەت لە مێژە منی بە دەهەزار دینار کڕیوە و دەیویست من بە دیاری بدا بە تۆ. زبێدەی ئامۆزات دوو بەرابەری ئەو نرخەی داوەتی و پێی گوتووە کە من لەو دیوەدا بەند بکا و لە تۆم بشارێتەوە.' خەلیفە پێی گوت: 'من چی بکەم؟ چیم لە دەست دێ بۆ تۆی بکەم؟' کەنیزە گوتی: 'تکای ئەوەت لێ دەکەم شەوی دادێ لە لای من بی.' خەلیفە بەڵێنی دایە و کەنیزەکەی لەوێدا بەجێ هێشت و ڕۆیشت. کە بەیانی لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشت، داوای ئەبوونەواسی کرد. نەیاندیتەوە. بە پەردەداری گوت: 'بکەونە پێوشوێنی و بیبیننەوە.'

"کە چوو بەدوایدا گەڕا، دیتییەوە. سەیری کرد لە مەیخانە لەبەر هەزار درەم گلیان داوەتەوە. پەردەدار کە ئەبوونەواسی دیت، هەواڵی پرسی. ئەبوونەواس بە پەردەداری گوت: 'هەزار درەم قەرزباری ئەوانەم و ناهێڵن بێمە دەرێ.' پەردەدار گەڕاوە بۆ لای خەلیفە و باسی ئەبوونەواسی بۆ گێڕاوە. خەلیفە فەرمانی دا هەزار درەمیان هێنا. دای بە پەردەدار و گوتی: 'بچووە ئەبوونەواسی پێ ڕزگار بکە.' پەردەدار درەمەکانی برد و ئەبوونەواسی ڕزگار کرد. هێنایە لای خەلیفە. کە ئەبوونەواس لەپێش خەلیفە ڕاوەستا. خەلیفە پێی گوت: 'شیعرێک بڵێ کە 'یا امین الله ما هذا الخبر'ی تێدا بێ. ئەبوونەواس گوتی: 'وەی بەسەر سەر و سەر چاو.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و سی و نۆیەم هاتە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەبوونەواس گوتی: 'بەسەر سەر و سەر چاو.' ئیدی لەجێوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دوێشەو لای دابوو لە نیوەی شەوێ
خەیاڵ نەیدەهێشت خەوم لێ بکەوێ
هەر سووڕامەوە، تووش ئەو دیوە بووم
کە چاوم پێی کەوت ئیدی یەکسەر چووم
کە چوومە ژوورێ ڕەشایەکم دی
کە ورد تێی ڕامام دیتم دەجمی
کەچی ئەو ژنە لەشڕزیوینە بوو
بە بسکی ڕەشی خۆی داپۆشیبوو
مانگ کەمی دینا، دمبەدمەی دەکرد
بەڕەزا شەرمی لە بسکی دەکرد
خواردمەوە من لە دەفری بادەکەی
هۆشی لێ بڕیم سیحری چاوەکەی
من بە بێشەرمی چوومە سەر سەری
ماچم کرد لێوی شیرین و تەڕی
کیژە ڕاپەڕی گرتی سەرسامی
کەچی لێی پرسیم بە زمانی سامی
'یا امین الله ما هذا الخبر؟!'
بە مەستی و نازەوە لێم هاتە بەر
گوتم هاتووم و ڕێم کەوتە ئێرە
چاو مەست میوانتم ڕێم بکە خێرە
خزمەتکاریی تۆ بۆم شانازییە
تۆ پێم ڕازی بی من حەددم چییە؟!

"خەلیفە بە ئەبوونەواسی گوت: 'خودا بتکوژێ، دەڵێی تۆ لەوێ بووی!' دوای ئەوە خەلیفە دەستی ئەبوونەواسی گرت و بردی بۆ لای ئەو کەنیزە. ئەبوونەواس دەمودەست ئەو شێعرەی گوت:

من چاوم به کچی جوان و دەلالی وا نەکەوتووە
قژی هێند لەبەردلان و ڕەختە و گەشم نەدیتووە
گەر بێتوو ڕووی دانەپۆشێ ئەو دلڕەق و لەشچەرمووە
بۆنی بسکی هاوار دەکا کە جیهانی شێواندووە!
تۆ کە کەماڵ و جەماڵت وا هاوتەریبی یەکترن
دڵنیام گەر خۆت دەربخەی کێشەت لە بازاڕ خستووە

"کاتێک ئەبوونەواس شێعرەکەی تەواو کرد، کەنیزەکە پیاڵەیەکی مەی بۆ خەلیفە تێ کرد و دەستی دا عوودەکەی، بە دەنگێکی خۆش ئەو دوو بەیتەی گوت:

ئەمشەو لەگەڵ ئەو دلبەرە مەستی دەکەم
دەستێک لەنێو بسک و قژی خاوی دەخەم
دەڵێم: 'چۆنە من لە تۆدا نابینم ئەو
سۆز و ئەڤینەی من بۆ تۆی هەست پێدەکەم؟!'
دەمهەوێ بۆ جارێکیش بێ بمدەیتێ تۆ
لە دەوڵەتی ئەو جوانییەت ماچێک بکەم

"خەلیفە فەرمووی مەیێکی زۆریان دا بە ئەبوونەواس. هەتا تەواو سەرخۆش بوو. هۆشی لە جێی خۆی نەما. دوای ئەوەش پیاڵەیەکی دیکەی دایە. ئەبوونەواس قومێکی لێ خواردەوە و دەستی ڕادەشت. خەلیفە فەرمووی پیاڵەکەی لە دەست وەرگرن و بیشارنەوە.

"کەنیزە پیاڵەکەی لێ وەرگرت و شاردییەوە. ئینجا خەلیفە شیری لێ دەرکێشا و لەسەر سەری ئەبوونەواس ڕاوەستا. نووکە شەقێکی لە ئەبوونەواس دا. ئەبوونەواس وە هۆش هاتەوە. سەیری کرد ئەوە خەلیفە بە شیرەوە لەسەر سەری ڕاوەستاوە. ئەبوونەواس سەرخۆشییەکەی پەڕی. خەلیفە پێی گوت: 'شێعرێک بڵێ و من ئاگاداری ئەو پیاڵەیە کەوە کە بە دەستەوە بوو، دەنا دەتکوژم.' ئەبوونەواس دەمودەست ئەو شێعرەی گوت:

خاڵێکی جوان لە سەر گۆنایەتی
مسکینخاڵێکە لە سەر پەڕی سپی
بە گاڵتە پیاڵەی لە من ڕفاندووە
بەو گاڵتە شیرنەی منی تاساندووە
شاردوویەتەوە ئەو شۆخە جوانە
شوێنەکەی ناڵێم میرم لامانە

"خەلیفە پێی گوت: 'خودا بتکوژێ. چۆنت بە شـــوێنی پیاڵەکە زانی؟!' ئەوجار خەلیفە ناردی دیارییەکی باش و هەزار دیناریان بۆ هێنا و ئەبوونەواســـیش بە دڵێکی خۆشـــەوە مالاوایی لە خەلیفە کرد و ڕۆیشتەوە.

## چیرۆکی دڵاوایی سەگ

"یەکێکی تر لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە کابرایەک هیچی نەبوو، زۆر قەرزبار بوو. ژیانی بە ســەگەمەرگی تێپەڕ دەرکرد. وای لێ هات ماڵ و منداڵی بەجێ هێشت و لە شـار وەدەر کەوت. ســەرگەردان لەو شــار بۆ ئەو شــار دەڕۆیشــت. کەســاس و هەناســەســارد. دوای ماوەیەک ڕێی کەوتە شـــارێک. لێقەوماو و چارەڕەش، برســـی و داماو چووە کۆڵانێکەوە. ســـەیری کرد ئەوە کۆمەڵێک لە گەورە گەورەکان دەڕۆیشـــتن، ئەویش لەگەڵیان کەوت. گەیشــتنە شــوێنێک کە زیاتر لە ماڵی پاشــا و شــت دەچوو. ئەو پیاوەش لەگەڵیان چووە ناوەوە. پیاوێک لە لای ســەرەوەی ئەو شــوێنە دانیشــتبوو. پیاوێکی ماقووڵ و ڕێکوپێک و بەشــــانوشــــکۆ بوو. گەورەیی لە تەوێڵیدا دیار بوو. کۆیلە و خزمەتکار لەبەردەمی ڕیز ببوون. ئەو پیاوە کە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی دیت، لە بەریان هەســـتا و ڕێزی لێ گرتن. کابرا هەژارەکە بەو دیمەنە ئەوەندەی دی خەجڵا و سەری لێ شێوا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێ‌سەد و چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کابرا چارەڕەشە بە دیتنی ئەو دیمەنە ترسی ڕێ نیشت. بە دیتنی ئەو دەبدەبە و کەبکەبەیە لاقی لە بەز کەوت و وردەوردە کشاوە دواوە. چوو لە سووچێک دوور لەوان بە تاقی تەنێ دانیشت و بە سڵەوە چاوی لەملا و ئەولا دەکرد. وا بوو لە نەکاو پیاوێک هات چوار سەگی پێ بوو. ئەو سەگانە ئاوریشم و دیبای جۆراوجۆریان لە بەر کرابوو. قەڵاتەی زێڕ و زیویان لە ملدا بوو. دوایە ئەو سەگانە هەریەکەیانی بە جودا لە شوێنێک بەستەوە و، ڕۆیشت. دوای ماوەیەک هاتەوە، یەکی دەفرێکی زێڕینی پڕ لە خواردەمەنی خۆشی بۆ هێنان و هەریەکەی هی خۆی لە پێش دانان. بۆخۆی چوو بە لای کاری خۆیەوە. کابرای هەژاریش لە برسان هەر سەیری خواردنی سەگەکانی دەکرد و خواخودای بوو بچێ لەگەڵ لە سەگەکان دەست بکا بە خواردن. کەچی لە ترسان نەیدەوێرا. بە ڕێکەوت یەکێک لە سەگەکان چاوی بە کابرا کەوت. هەستی کابرای خوێندەوە کە برسییەتی. هەر بۆیە دەستی لە خواردنەکە هەڵگرت و کشاوە. کابراشی تێگەیاند بچێ بخوا. کابرای داماو چووە پێشێ و کەمێکی خوارد. ویستی بکشێتەوە و بڕواتە دەرێ. کەچی سەگەکە تێیگەیاند کە ئەو دەفرانە بەو بەرماوانەوە هەڵگرێ و بیانبا. هەژارە چوو دەفرەکانی هەڵگرت و وەدەر کەوت. کەسیش بە شوێنیدا نەچوو. لەو شارە ڕۆیشت بۆ شارێکی دیکە. دەفرەکانی فرۆشتن و پێداویستی ماڵی کڕی و گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆی. دەستی کردە دان‌وسان. شتی دەکڕی و دەیفرۆشتەوە. وای لێ هات قەرزەکانی داوە. ڕزق و ڕۆزیی زۆر بوو. ماوەک هەر لە شارەکەی خۆیان ماوە. ڕۆژێک گوتی: 'دەبێ بچمەوە ئەو شارە دیارییەکی باش بۆ گەورەی ئەو شارە بەرم و پارەی ئەو دەفرانەیان بدەمەوە کە یەکێک لە سەگەکانی دایمێ.' وا بوو ڕۆژێک چوو دیاری شیاوی کڕی. نرخی دەفرەکانی هەڵگرت و بەرەو ئەو شارە بەڕێ کەوت. ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا گەیشتە ئەو شارە. لە کۆڵانەکانی شاردا خولاوە هەتا گەیشتە ئەو گەڕەکە. ئەو شوێنەی دیتەوە، کەچی کاول ببوو. بێجگە لە کەلاوە کۆنێک، هیچ کەس و هیچ شتێکی لێ نەمابوو. بەو دیمە زۆر نارەحەت بوو، ئەو شێعرەی شاعیری بیر کەوتەوە:

ئەو شوێنە دڵگرەی گوڵستانێک بوو چەلان[1]
ئێستا کاولاشێکە مەکۆی کوند و چەقەڵان
ئەو کۆشکەی من دیم وەک باخی ئێرەم ڕازاوە
کەلاوەیەکە ئێستا هەمووی تێک ڕووخاوە

---

١. چەل: جار، بەشێک لە زەمانی ڕابردوو.

"ئەو پیاوە کە ئاوای دیت، تەواو مات و مەلوول بوو. خەمبار لەوێ ڕاوەستابوو کە کابرایەکی هەژاری دیت. لە تاوانی دڵی لەرزی و بەزەیی پێیدا هات. پێی گوت: 'دەزانی ڕۆژگار چی بەسەر خاوەنی ئەوماڵە هێناوە؟ ئەو هەموو کۆیلە و کەنیز و دادوبۆدییەی لە نەستاندووەتەوە؟' ئەو پیاوە هەژارە گوتی: 'خاوەنی ئەو ماڵە منم. ئاوام لێ بەسەر هاتووە. ڕۆژگار ئاوا تێکی شکاندووم. ئەو قسەیەی پێغەمبەر ڕاستە کە فەرموویەتی: 'خودا بەرز و نەوییان هەتا سەر لە ئاستێکدا ناهێڵێتەوە. نەوییان بڵند دەکا و، بڵندانیش نەوی. من خاوەنی ئەو ماڵە بووم و کۆیلەی وەک مانگی چواردە و کەنیزەی خۆراسام بوون. بەڵام ڕۆژگار لەبەر هەندێک هۆکار کە هەر بۆخۆی دەزانێ، تەواوی ئەوانەی لە من سەندەوە. جا ئەو پرسیارەی تۆ هۆکارێکی هەیە. دەی پێم بڵێ چی بووە و بۆ ئەوەندە بەلاتەوە سەیرە؟' ئیدی کابرا تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە و پێی گوت: 'ئەوە من ئەو دیارییەم بۆ تۆ هێناوە. ئەوەش پارەی دەفرە زێڕەکانتە کە بووە هۆی ئەوەی من لە هەژاری و دەستتەنگی ڕزگارم بێ و ژیانم ئاوای لێ بێتەوە.' ئەو پیاوە هەژارە کە ئەوەی بیست، سەرێکی ڕاوەشاند و دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'ئەرێ کاکە، پێم وا بێ تۆ شێت بووی، دەنا چۆن ژیر قسەی وا دەکا؟ چۆن دەبێ یەکێک لە سەگەکانی من دەفرێکی زێڕین بدا بە تۆ، ئێستا من بێم ئەوەت لێ وەرگرمەوە؟! ئەگەر من لە برسان بمرم، دیاری سەگی خۆم وەرناگرمەوە! بە خودا لێت وەرناگرم. بە سەلامەتی بگەڕێوە بۆ شارەکەی خۆت.' ئیدی کابرا داهاتەوە لاقی ماچ کرد و دۆعای بۆ کرد و مالاوایی لێ کرد و گەڕاوە. لە گەڕانەوەدا ئەو بەیتەی گوت:

وەجاخی چاکەکاران هەر ڕوون بێ
پیسکە و خوێڕیگەل با دوایان ببڕێ

### چیرۆکی فێڵبازی چالاک

"یەکی دیکە لە چیرۆکەکان ئەوەیە کە سنووری ئەسکەندەرییە والییەکی لێ بوو ناوی حیسامەددین بوو. شەوێک لە شەوان لەسەر کەتێکی گەورە دانیشتبوو پاڵی بە باڵگەیەکەوە دابوو کە یەکێک لە پیاوەکانی سوپاکەی هاتە لای، پێی گوت: 'گەورەم والی، من ئەوشەو هاتمە ناو شارەوە. چوومە فلانە کاروانسەرا و تا بەیانی خەوتم. کیسەیەکم پێ بوو دووهەزار دیناری تێدا بوو. کە وە خەبەر هاتم، سەیر کرد کیسەکەم لە هەگبەکەمدا نەماوە.' والی بە فەرمانەدەکانی گوت: 'بڕۆن ئەوەی لە کاروانسەرادا بووە بیهێنن.' هەموویانی لە دیوێکدا بەند کرد هەتا بەیانی. کە ڕۆژ بووەوە، هێنانییە دەرێ و کابرا سوپاییەکەشی بانگ

کرد. ویســـتی ئازاریان بدا. لەپڕدا پیاوێک لەنێو خەڵکەکە هاتە دەرێ و لەپێش والیدا ڕاوەستا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، پیاوێک لەنێو خەڵکەکە وەدەر کەوت و هاتە لای والی و ئەو کابرا ســوپاییە ڕاوەســتا و گوتی: ‘گەورەم والی، ئەو خەڵکە ئازاد کە با بڕۆن، ئەمن کیســەکەی ئەو کابرایەم لە هەگبەکەی دەرهێناوە.’ ئیدی کیســەکەی لە قۆڵی کراســەکەی دەرهێنا و لە پیش والی و ئەو کابرا ســوپاییە داینا. والی بە ســـوپاییەکەی گوت: ‘ئەتۆ کیســـەی خۆت وەگیر کەوتەوە و کارت بە ئەوانی دیکە نەدابێ.’ خەڵکەکە دۆعای بە خێریان بۆ ئەو پیاوە کرد. دوای ئەوە پیاوە گوتی: ‘جەنابی والی، ئەوەی کە بۆ خۆم ئەو کیســـەیەم هێناوە بۆ نێوە، ئەوە ئازایەتی نییە. بگرە ئازایەتی ئەوەیە کە دیسـان ئەو کیسـەیە لەو کابرا سـوپاییە بدزمەوە.’ والی گوتی: ‘زۆرزان ئەو کیسەیەت چۆناوچۆن دزی؟!’ گوتی: ‘والی، لە میسر لە بازاڕی ســەڕافییەکاندا ڕاوەســتابووم. ئەو کابرایە ئەو پارانەی گۆڕییەوە و لەو هەگبەیەی خســت. ئەمن کۆڵان بە کۆڵان بەدوایدا ڕۆیشــتم. هەر دەرفەت نەبوو لێی بدزم. دوای ئەوە ئەو کابرایە سوار بوو، ڕۆیشت. ئەمن شار بە شار کەوتمە شوێنی. فرۆفێڵی زۆرم لە کار کرد، هەر نەمتوانی بیاندزم. ئەو کە هات بۆ ئەو شــارە، منیش بەدوایدا هاتمە نێو شــارەوە. کە چووە کاروانســـەراوە، ئەمنیش چوومە پەنای. چاوەڕێ بووم تا خەوی لێ کەوت و پرخەی لێ هەستا. نەرمنەرم بە ئەسپایی و لەسەرەخۆ چووم بەو چەقۆیە هەگبەکەیم بڕی. بەو جۆرە کیســـەکەم دەرهێنا.’ ئیدی کیســـەکەی لەبەردەم والی و ســـوپاییەکە هەڵگرت و کشــاوە دواوە. خەڵکەکە وایان زانی ئەوە شــێوەی هەڵگرتنەکەیان پێشــان دەدا. کە لەپڕدا دەرپەڕی و لەو لاوە خۆی هاویشتە نێو ئاوێکەوە. خزمەتکار و شت کەوتنە شوێنی و هەر بە جلوبەرگەوە خۆیان لە ئاوەکە خست. بەڵام پیاوە دزەکە ببوو بە ئاو و دیار نەما. زۆری لێ گەڕان نەیاندیتەوە. ئەوجار والی بە پیاوە سـوپاییەکەی گوت: ‘خۆ ئەتۆ کارت بە خەڵک نەماوە. ئەوە شـــتەکەی خۆت وەگیر کەوت، بەڵام نەتتوانی پارێزگاری لێ بکەی.’ ئیدی کابرای سوپایی هەستا بە دڵێکی خەمناکەوە ڕۆیشت و خەڵکەکەش لە دەستی ڕزگار بوون.

### چیرۆکی سێ ڕووداوی سەیر

"یەکی دیکە لەو چیروکانە ئەوەیە کە ناسرشا ڕۆژێک لە ڕۆژان والی شارەکانی قاهیرە و بولاق و میسری دێرینی بانگ کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ناسرشا بەو سێ والییەی گوت: 'دەمەوێ هەرکەسەی سەیر و سەمەرەترین ڕووداوێک کە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا ڕووی داوە، بۆم بگێڕێتەوە.'

"والی قاهیرە گوتی: 'جەنابی پاشا، سەیرترین شتێک کە لە سەردەمی دەسەڵاتداری مندا ڕووی داوە، ئەوەیە کە دوو پیاو هەبوون شایەدییان لەسەر کوشتوبڕ و خوێن و ماڵ دەدا و شایەدییەکەشیان لە لای هەموو کەس جێی باوەڕ بوو. بەڵام ئەوەیان هەبوو زۆر ئۆگری ژن و مەینۆشی بوون و بە هیچ جۆرێکیش بۆم هەڵنەدەکەوت بەسەریاندا بچم، هەتا بیانگرم و سزایان بدەم. وا بوو ڕۆژێک چووم بە مەیفرۆش و خاوەنی ئەو ماڵانەی ژن و پیاوی خراپەکاریان دەچوویێ، ڕاگەیاند: 'هەر کات ئەو دوو دادخوازە هاتن بۆ ئێرە، ئاگادارم کەنەوە ـــ چ بە تەنیا بن یان بە یەکەوە بن.' وا بوو شەوێک کابرایەک هاتە لام و پێی گوتم: 'والی، ئەو دوو کەسە لە فلانە ماڵ و لە فلانە کۆڵان و گەڕەک خەریکن مەی دەخۆنەوە.' ئیدی منیش هەستام و لەگەڵ پیاوەکانم چووم. ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە بەردەرگای ئەو ماڵە. لە دەرگام دا. کەنیزێک هات دەرگای لێ کردمەوە و گوتی: 'ئەتۆ کێی؟' وەڵامم نەداوە و وەژوور کەوتم. سەیر دەکەم ئەوە ئەو دوو پیاوە دادخوازە لەوێ دانیشتوون و مەی و یار لەبەردەمیانە. هەر کە منیان دیت، لە بەرم هەستان و کڕنۆشیان برد و وەلای سەرەوەیان خستم. گوتیان: 'ئافەرین بۆ ئەو میوانە ڕێکوپێک و بەڕێزە. ئەو هاوپیاڵە خۆشەویستە.' دوای ئەوە خاوەنماڵەکە هەستا وەدەر کەوت. ماوەیەکی پێ چوو، کە گەڕاوە، سێسەدهەزار دیناری لەگەڵ خۆی هێنا و بێ ئەوەی ترسی لە من هەبێ، پێی گوتم: 'والی، دەزانم تۆ چۆنی پێت خۆش بێ، دەتوانی ئازارمان بدەی، بەڵام لە نارەحەتی زیاتر بۆ تۆی تێدا نییە. لەو سۆنگەوە وا چاکە ئەو پارەیەمان لێ وەرگری و بێدەنگەی لێ بکەی.' منیش دوای ئیستێک مابت بوون لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەو ماڵەیان لێ وەرگرم و ئەو جارە لێیان خۆش بم، بەڵام جارێکی دیکە ئاوا بیانبینم سزایان بدەم.' ئیدی تەماحی ماڵەکە گرتمی و لەوێ بەو حاڵەوە بەجێم هێشتن و گەڕامەوە. کەس بەو کارەی منی نەزانی.

"ڕۆژێکی دیکە دانیشتبووم کە ڕاسپاردەیەکی قازی هات و پێی گوتم: 'جەنابی والی، قازی گازت دەکا.' ئەمن هەستام چووم بۆ لای قازی. نەمدەزانی بۆ بانگی کردووم. کە چوومە لای قازی، ئەو دوو پیاوە دادخوازە لەگەڵ خاوەنماڵەکە لەوێ دانیشتبوون. هەر کە چوومە ژوورێ، خاوەنماڵ هەستا و داوای سێسەدهەزار دینارەکەی کرد. نووسراوەیەکی دەرهێنا کە ئەو دوو شایەدە دادخوازەش شایەدییان لەسەر دابوو. وا بوو لە لای قازی بە

شایەدی ئەو دووانە داواکەی سەلمێنرا و لەسەر من بوو بە ماڵ. هەر لەوێ نەیانهێشت بیمەوە دەرێ هەتا سێ‌سەدهەزار دینارەکەیان لێ نەستاندم. ئیدی مینش بە ڕووزەردی هاتمەوە دەر.'

"ئینجا والی بولاق هەستا و گوتی: 'جەنابی خەلیفە، سەیرترین ڕووداوێک کە منیش لە ماوەی دەسەڵاتداریمدا بۆم هاتووەتە پێشێ، ئەوە بوو؛ سەردەمێک سێ‌سەدهەزار دینار قەرزبار بووم و قەرزداران تەنگیان پێ هەڵچنیبووم. ئەوەی بووم، فرۆشتم. سەدهەزار دینارم کۆ کردەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، والی بولاق گوتی: 'سەدهەزار دینارم کۆ کردەوە. گێژ ببووم نەمدەزانی چ بکەم. هەتا وا بوو شەوێک لە شەوان ئاوا بە پەرۆشی دانیشتبووم کە لەپڕ لە دەرگایان دا. بە یەکێک لە کۆیلەکانم گوت: 'بزانە کێیە لە دەرگا دەدا.' کۆیلەکەم چوو دەرگای کردەوە. کە گەڕاوە، سەیرم کرد ڕەنگی تێک چووبوو، زەرد هەڵگەڕابوو و دەلەرزی. لێم پرسی: 'ئەوە چی بووە؟' گوتی: 'کەسێکە کەڵپۆسێکی لە بەردایە و شیرێکی بە دەستەوەیە. تاقمێکی ئاواشی لەگەڵە. کاریان بە تۆیە.' ئیدی دستم دا شیر و چووم دەرێ. کە چووم تەماشا دەکەم، کۆیلەکە چۆنی گوتبوو ئاوا بوون. لێم پرسین: 'چ کارێکتان هەیە؟' گوتیان: 'ئێمە دزین و ئەوشەو دەسکەوتی باشمان بووە، هێناومانە بۆ تۆ هەتا لەو دۆخە ڕزگار بی. دەزانین لەبەر ئەوە نارەحەتی و لە گوشارداى، بچووە قەرزەکانتی پێ بدەوە.' ئەمن پێم گوتن: 'ئەو دەسکەوتە لەکوێیە؟' لەڕێوە سندووقێکی گەورەی پڕ لە دەفری زێڕین و زیوینیان هێنا. ئەمن کە ئەوەم دیت، دڵخۆش بووم و لە دڵە خۆمدا گوتم 'قەرزەکەمی لێ دەدەمەوە و دووهێندەی قەرزەکەشم بۆ دەمێنێتەوە.' ئیدی سندووقەکەم لێیان وەرگرت و هێنامەوە ژوورێ و لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئاوا جوان نییە ئەوان بە دەستی خاڵی بەڕێ کەم.' ئیدی چووم ئەو سەدهەزار دینارەی کە بە فرۆشتنی کەلوپەل کۆم کردبووەوە، دامنێ و زۆریشم سپاس کردن. ئەوان زێڕەکانیان وەرگرت و چوون بە لای کاری خۆیانەوە. کەسیش بەو کارەی نەزانی. کە ڕۆژ بووەوە، سەیرم کرد ئەوەی لەناو سندووقەکەدا بوو هەمووی مسن و زەرکەفتیان کردبوون. بە تەواویان بایی پێنجسەد دینار نەبوو. ئیدی ئەمن زۆر پەشیمان و نارەحەت بووم لەو کارەی کردبووم. ئەوە ناخۆشترین ڕووداوی ئەو ماوەیە بوو کە بەسەرم هاتبوو.'

"دوای ئەو والی میسری دێرین هەستا و گوتی: 'سوڵتانی مەزن! سەیرترین شتێک کە بۆ منیش هاتە پێشێ، ئەوە بوو؛ دە دانە دزم لە سێدارە دا. هەریەکەی داری تایبەتیم بۆ چەقاند و هەڵمواسی. پاسەوانم بۆ دانان تا چاوەدێرییان بکەن. بۆ بەیانی کە چووم چاوێک لە کوژراوەکان بکەم، سەیرم کرد ئەوە دارێک دوو کوژراوی پێوە بوو. لە نۆبەدارەکانم پرسی: 'ئەوە کێ ئەو کارەی کردووە؟ ئەو دارەی کە ئەو لاشەیەی پێوە بوو، چی لێ هاتووە؟' ئەوان ڕاستییەکەیان لە من دەشاردەوە. منیش ویستم سزایان بدەم، گوتیان: 'میر ئێمە دوێ شەو خەومان لێ کەوتبوو. کاتێک خەبەرمان بووەوە، سەیرمان کرد ئەوە لەداردراوێک هەڵاتبوو دارەکەی خۆشی بردبوو. ئیدی ئێمەش لە ترسی تۆ حەجمینمان نەبوو. لەو جەنگەیەدا جووتیارێک بێرەدا هات. کەرێکی وەپێش خۆی دابوو. ئێمەش گرتمان و کوشتمان و بەو دارەوە هەڵمانواسی.' پاشا ئەمن قسەکەی ئەو نۆبەدارانەم پێ سەیر

بوو. لێم پرســـین: 'جووتیارەکە چی پێ بوو؟' گوتی: 'تێرێکی بەســـەر کەرەکەیدا دابوو.' گوتم: 'تێرەکە چی تێدا بوو؟' نۆبەدارەکان گوتیان: 'نازانین.' گوتم: 'دا ئەو تێرەم بۆ بێنن.' کە تێرەکەیان هێنا و چاوم لێ کرد، لاشـــەی پیاوێکی کوژراوی تێدا بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ســـوبحانەڵلا. ئەو ســـتەمەی ئەو پیاوەی کوشـــتووە، هەر ئەوە یەخەی خۆی گرتووەتەوە!'

## چیرۆکی فێڵباز و دانپیانانەکەی

”یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەڵێن پیاوێک توورەکەیەکی زێڕی سوور پێ بوو لە بازاڕی سەڕافییەکان بوو. هەر لە دزانی دەشاردەوە. یەکێک لەو زیت و وریایانە گوتی: 'ئەمن دەتوانم ئەو توورەکەیەی لە و کابرایە بدزم.' هاوڕێکانی گوتیان: 'چۆنی لێ دەدزی؟' ئەو کوڕە زیتووریایە گوتی: 'جا ئێوە چاوتان لێ بێ، بزانن چۆنی لێ دەدزم.' ئیدی کوڕە وەدوای کەوت هەتا کابرا چووەوە ماڵێ. زێڕەکەی لەســـەر تاقێک دانا و بۆخۆی چوو بۆ ئاودەست. داوای مەسینەی لە کەنیزەکەی کرد. کەنیزە دەستی دا مەسینە و چوو پڕی کرد لە ئاو و بۆی برد. دەرگای ژوورەکەی هەر وا بە ئاوەڵایی بەجێ هێشت. بە لەز خۆی کرد بە ژووریدا و توورەکەکەی هەڵگرت و گەڕاوە بۆ لای هاوڕێکانی و چۆنییەتی دزینەکەی بۆ گێڕانەوە.“

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو کوڕە دزە ڕووداوی چوونی کابرا بۆ ئاودەســـت و بردنی مەسینە لە لایەن کەنیزەکە و دزینی توورەکەکەی هەموو مووبەموو بۆ هاوڕێکانی گێڕاوە. هـاوڕێکـانی گوتیـان: 'بە خودا ئەو کـارەی تۆ کردووتە، کـاری هەموو کەس نییە و چاوبەستێکی تەواوە، هەر ئازایەتی نییە. کەس ناتوانێ کاری وا بکا. ئێستا ئەگەر ئەو کابرا سـەڕرافە لە ئاودەســت بێتە دەرێ و بزانێ توورەکەکە نەماوە، ئەو کەنیزە چارەڕەشـە دەکوژێ. ئەگەر تۆ بە ڕاسـتی جوامێری، ئەو کیژە ڕزگار بکە.' ئەو لاوە تەڕدەسـتە گوتی: 'ئیشـەڵلا هەم کیژەکە و هەم توورەکەکە ڕزگار دەکەم.' ئیدی ئەو دزە تەڕدەست و چالاکە گەڕاوە ماڵی سـەڕرافەکە. کە چوو، سـەیری کرد ئەوە کابرا خەریکە کەنیزەکە ئازار دەدا. لەڕێوە لە دەرگای دا. ســـەڕراف گوتی: 'کێیە؟' کوڕە دزە گوتی: 'ئەمن کۆیلەی یەکێک لە هاوسێ دووکانەکانتم لە قەیسەرییەکان. خاوەنم سڵاوی دەگەیاندی و دەیگوت ئەوە لەبەر چی ئاوا حاڵت گۆڕاوە و توورەکە زێڕ لە بەر دووکان بەجێ دێڵی و دەڕۆی؟' باش بوو یەکی بێگانە هەڵینەگرتەوە و خاوەنم دیتبوویەوە. دەنا تازە هەر وا دەچوو.' دوای ئەوە کوڕە توورەکە زێڕەکەی دەرهێنا و نیشـــانی ســـەڕرافەی دا. کە ســـەڕرافەکە چاوی بە توورەکەکەی کەوت، ناسییەوە و گوتی: 'وەڵا ڕاست هی منە.' چوو پێشێ دەستی برد لێی وەرگرێ. کوڕە پێی گوت: 'بە خودا ئەمن ئاوا ناتوانم بتدەمەوە هەتا کاغەزێکم بۆ نەنووسی و مۆری نەکەی. ئێسـتا توورەکە زێڕەکەم لێ وەرگری و، سبەینێ لە لای خاوەنم حاشـای لێ بکەی، من ڕوو لە کوێ بکەم؟' کابرای سـەڕراف قسـەکەی ئەوی پێ جوان بوو. گەڕاوە ژوورێ بچێ کاغەزێکی بۆ بنووســـێ و بۆی مۆر کا. کوڕە بە لەز گەڕاوە و بەو جۆرە کچەشی ڕزگار کرد.

### چیرۆکی عەلائەددین و دز

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە شـەوێک لە شـەوان عەلائەددینی والی لە ماڵە خۆی دانیشتبوو کە پیاوێکی جوانچاک و ڕووپاک لەگەڵ خزمەتکارێک کە یەخدانێکی لەســـەر ســـەر بوو، هاتنە بەردەرگای ماڵی عەلائەددین. بە یەکێک لە کۆیلەکانیان گوت: 'بچووە بۆ خزمەت والی و پێی ڕابگەیەنە کارێکم پێیەتی، دەمەوێ لە شـوێنێک دانیشـین و چـاوم بە خۆی بکەوێ—کـارێکی تـایبەتم پێیەتی.' کۆیلەکە هـاتە خزمەت عەلائەددین و شتەکەی پێ ڕاگەیاند. عەلائەددین فەرمووی: 'با بێتە ژوورێ.' کە هاتە ژوورێ، والی هێندی پێ پیاوێکی جوان و ڕێکوپێک بوو، لە لای خۆیەوە داینا و ڕێزی لێ گرت. پێی گوت: 'چ

کارێکت هەیە؟' ئەو پیاوە گوتی: 'ئەمن چەتەم و ڕێگری دەکەم. هاتووم لەسەر دەستی تۆ تۆبە بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای خودا. هاتووم یارمەتیم بدەی. پەنام بۆ هێناوی. ئەو یەخدانەی پێشمە بایی چلهەزار دیناری شت تێدایە. بۆ تۆ بێ باشترە لە خەڵکی دیکە. بەلام تکایەکم هەیە، ئەتۆ لە ماڵی حەلاڵی خۆت هەزار دینارم دەیە کار و کاسپیی پێوە بکەم، بەشکو تازە پێویستیم بە ماڵی حەرام نەبێ.' ئیدی یەخدانەکەی پێ دانا و سەرەکەیان کردەوە، یەخدانە پڕ بوو لە زێڕ و گەهەر و نقێمی گرانبایی و مرواری. بە جۆرێک کە والی سەری سووڕ ما و کەیفی ساز بوو. بانگی خەزنەداری کرد و پێی گوت: 'فلانە توورەکە هەزار دیناری تێدایە، بۆی بێنە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکو، والی گوتی: 'فلانە توورەکە هەزار دینـاری تێـدایە، بۆی بێنە.' خەزنەدار ئەو توورەکەیەی هێنا. والی دا بەو پیاوە. پیاوە توورەکەکەی لە والی وەرگرت و بەدەم ســـپاس و پێزانینەوە وەدەر کەوت و چوو بە لای کاری خۆیەوە. کە ڕۆژ بووەوە. والی زێڕ و گەوهەرناسانی بانگ کرد. سەری یەخدانەکەی لا برد و پیشانی دان. سەیریان کرد تەواوی زێڕەکان مسـن و زەرکەفت کراون و گەوهەر و نقیمەکانیش لە شـووشـە چی کراون. والی زۆری پێ ناخۆش بوو. پیاوی نارد بەشـــوێنیدا بگەڕێن، بەڵام لە هیچ کوی نەیان دیتەوە.

### چیرۆکی ئیبراهیمی کوڕی مەهدی

"یەکی تر لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە خەلیفە مەئموونەڕڕەشید بە ئیبراهمی کوڕی مەهدی گوت: 'چیرۆکێکی خۆشم بۆ بگێڕەوە کە بۆ خۆت دیتبێتت.' ئیبراهیم گوتی: 'خەلیفە، ڕۆژێک هەر وا بە مەبەسـتی خەمبەبادان چوومە دەرێ تا پیاسـەیەک بکەم. بە شـوێنێکدا ڕۆیشـتم بۆنی چێشتێکی زۆر خۆشم بۆ هات. ئەوەندە خۆش بوو لە ئاستە خۆم وشک بووم. سەیر بوو! نە دەمتوانی لەوێ بڕۆم، نە دەمتوانی بچمە ژوورێ. کە ئاوڕم داوە، دیمەنێکم دیت. ئەویش دەست و بازنێک بوو، من هەتا ئێستا شتی وام نەدیتبوو. بۆن و مۆنم بیر چووەوە. تەنیـا لە بیر ئەوەدا بووم چۆن خۆم بگەیەنمە ئەو دەســـــت و بـازنە. لەپڕ چـاوم بە بەرگدروویەک کەوت لە لای ماڵی ئەوان بوو. چووم بۆ لای سلاوم کرد. وەڵامی سلاوەکەی دامەوە. لێم پرسـی: 'ئەوە ماڵی کێیە؟' گوتی: 'ئەوە ماڵی بازرگانێکە بە ناوی ئەبوو سـەعید کـە لەگەڵ بـازرگـانـان نەبێ، لەگەڵ کەس هەڵسوکەوت نـاکـات.' ئێمە هەر وا لەگەڵ دروومانکارەکە خەریک بووین قسەمان دەکرد، دوو کەسی ڕێکوپێک و بەدەماخ و پۆشتە وەدەر کەوتن. بەرگدروو گوتی: 'ئەو دووانە میوانی ئەو ماڵەن و زۆر هاتوچۆی ماڵەکەی دەکەن.' ئەمن ناوەکانیانم لە دروومانکارەکە پرسـی و بەرەو پیریان چووم. هەر کە لێیان نزیک بوومەوە، گوتم: 'بە ســـەدەقەتان بم، ئەوە بۆ وا دەرنگ هاتن؟ ئەبوو ســـەعید ئەود چاوەڕێی ئێوەیە.' ئیدی لەگەڵیان ڕۆیشتم هەتا گەیشتینە بەردەرگا. ئەمن چوومە ژوورێ و ئەوانیش بەدوامدا هاتن. کە خاوەنماڵ منی لەگەڵ ئەوان دیت، وای زانی منیش لەگەڵ ئەوانم و هاوڕێیانم. لە بەرمان هەسـتا و بەخێرهاتنی کردین. منیش کە لەپێش ئەوانە دەڕۆیشـتم. بردمییە لای سـەرەوە. دوای ئەوە سـفرەیان ڕاخسـت. ئەمن لە بەر خۆمەوە گوتم: 'سـپاس بۆ خودا خەریکە خواردنەکەم بە قسمەت دەبێ. هیواخوازم ئاواتی دیتنی خاوەنی دەست و

بازنەکەشـــم وەدی بێت.' دوای ئەوە چووینە شـــوێنێکی دیکە و لەوێش لەدەوری یەک کۆبووینەوە و دانیشتین. خاوەنماڵەکە پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و خوێنشیرین و ڕۆحسووک بوو. زۆر لەگەڵم بە خوڵـک و گەرم بوو. بەو مەبەســـتە کە من میوانی میوانەکـانیـانم. میوانەکانیش وایان دەزانی ئەمن میوان و هاوڕێی خانەخوێم. جار لەگەڵ جار لەگەڵم بە خولکتر دەبوون. هەتا چەند پیاڵەمان بادە هەڵدا. دوای ئەوە کیژێکی باڵابەرزی قەدباریک و ڕووگەش پەیدا بوو. عوودێکی بە دەســـتەوە بوو بە دەنگێکی خۆشـــەوە ئەو دوو بەیتەی دەخوێندەوە:

کـاتـێ لـێـم وەژوور کەوت ئەو بەژن زراوە
ڕاســـتـت دەوێ جەســـتەی بێگیـانی من بووژاوە
هەر کە تـــــۆ دەرکەوتیتەوە دوای دیـار نەمـانـت
ئەوەی کـۆنە بـریـنـێـک بـوو ســـەری هەڵـداوە

" 'گەورەم خەلیفەی جیهان، ئەمن بە دیتنی جوانی و ڕێکوپێکی و بیستنی ئەو شـێعرە خۆشـانەی تەواو سـەرخۆش بووم و کەیفم سـاز بوو. گوتم: 'کیژێ، شتێکت لە بیر چوو.' لەڕێوە کیژە تووڕە بوو، عوودەکەی فڕێ دا و گوتی: 'ئەوە کێ گەوجی وەک ئێوەی ڕێ داوە بێتە ئەو کۆڕەوە؟' ئەمن لە قسەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە. چاوم لێ کرد هەموویان بە خێـــــوە چاویان لێ دەکردم. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'تەواوی ئاواتەکانم بوون بە بڵقی ســـەر ئاو.' نەمدەزانی چ بکەم. ناچار داوای عوودەکەم کرد و گوتم: 'کچی چاک چاولێکە بزانە کوێت لە بیر چووە.' دانیشـتووان تۆزێک گەشـانەوە. عوودەکەم وەرگرت. تارەکانیم توند کردنەوە و ئەو دوو بەیتەم گوت:

ئەو ســـــــــــــــەلوەی دەڵێن: 'ڕێکە وەکوو باڵای تۆ'
قـــــــــــــەت ڕووی نییە بێ ڕاوەســـتێ لە ڕاســـتی تۆ
کـوا عەودالـی بـاڵابـوون ســـووچـی ئـێـمەیە
دوو چـاوی مەســـــتـت هـۆکـاری ئەو بەزمەیە

" 'کچە گورج هەستا و خۆی بەسـەر لاقمدا دا و لاقی ماچ کردم. داوای لێبووردنی کرد و گوتی: 'گەورەم، قەسەم بە خودا ئەمن پلەوپایەی تۆم نەدەناسی. ئەو شێوازەی تۆ ژەنیت و گوتت، من قەتم نەبیســـتبوو.' ئیدی دانیشـــتووان ئەوەندی دی دڵخۆش بوون و لەگەڵ منیش بە خولکتر و ڕوو خۆشـــتر بوون. دوای ئەوە هەریەکەی داوای دەکرد کە شـــتێکی دیکە و ئاوازێکی دیکەیان بۆ بژەنم. ئەمن هەر عوودم بۆ ژەنین و ئاوازم بۆ گوتن هەتا

دانیشـــتووان هەموو مەســـت بوون و بە لادا کەوتن. خزمەتکارەکان دەســـتی میوانەکانیان گرت و بردیاننەوە بۆ ماڵەکانیان. بێجگە لە کچە و خاوەنماڵ کەس نەماوە. چەند پیاڵەیەکم هەڵدا. ئەوجار خاوەنماڵ پێی گوتم:'گەورەم، ئەمن تەمەنم بە زایە چووە هەتا ئێســـــتا تۆم نەناسیوە. بەڵام تۆو خودا خۆتم پێ بناسێنە.' ئەمن خۆمم ئاشکرا نەدەکرد. کەچی ئەو هەر سوێندی دەدام. ناچار خۆم پێ ناساند، کەچی ئەو منی دەناسی.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

## که شەوی سێسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئیبراهیمی کوڕی مەهدی گێڕاوییەتەوە: 'خاوەنماڵ کە منی ناسییەوە، هەستا و گوتی: 'پێم سەیر بوو کە جگە لە تۆ دەبێ کێ ئەو هەموو زانست و گەورەییەی هەبێ. ڕۆژگار بەسەری کردمەوە و نازانم چۆن سپاسی ئەو بەخششە بکەم.؟! هەر دەڵێی خەون دەبینم. دەنا چۆن دەکرێ من دەستم بە بگاتە بەری خەلافەت و شابازێکی وەکوو تۆ لەسەر گوێسوانەی هەژارانەی من بنیشێتەوە و ببێ بە هاونشینی من؟!'

" 'ئینجا سوێندم دا دانیشێ. دانیشت، پرسیاری کرد کە چۆناوچۆنە چوومە کوڕەکەیانەوە. ئەمن هەرچی بوو، لە سەرەتاوە تا کۆتایی مووبەموو هەموویم بۆ گێڕاوە و گوتم: 'لە تام و بۆنی ئەو چێشتەم بە قسمەت بوو، بەڵام لەو قۆڵ و بازنەم بە قسمەت نەبوو.' کەچی ئەو گوتی: 'هیوادارم ئەو قۆڵ و بازنەشت بە قسمەت بێ.' ئەوجار ڕووی لە کەنیزێک کرد و گوتی: 'فلانی، بە فلانە بڵێ بێتە ئێرە.' وا بوو بەو جۆرە دانەدانە کەنیزەکانی بانگ کردن و پیشانمی دان. ئەمن خاوەنی ئەو دەست و مەچەکەم هەر نەدیتەوە. ئەوجار گوتی: 'گەورەم، بە خودا جگە لە دایکم و خوشکم، کەسی دیکە نەماوە. ئەوانیشت پێشان دەدەم بیانبینە.' من سەرم لە خوڵک و میوانداری ئەو کابرایە سووڕ ما و گوتم: 'بە سەدەقەت بم، لە پێشدا خوشکت با بێت.' لەڕێوە خوشکی هێنا و پێشانی دام. چاوم لێ کرد، بۆخۆی بوو. خاوەنی ئەو دەست و مەچەک و قۆڵ وبازنە بوو. گوتم: 'بە قوربانت بم، ئەوە ڕاست ئەو دەست و مەچەکەیە کە من دیتم. ئەوە ئەو خانمەیە.' دەسبەجێ غوڵامێکی نارد بەدوای قازی و شایەددا. دوو توورەکە زێڕی سووری هێنا دایناو بە شایەدەکانی گوت: 'ئەو بەڕێزە سەروەری ئێمە، ئیبراهیمی کوڕی مەهدی مامی خەلیفەیە. داوای خوشکی منی کردووە. ئەمن ئێوە بە شایەد دەگرم کە من خوشکی خۆم پێشکەش کرد و کیسەیەک زێڕم لە مارەییەکەش بۆ خۆم بۆم دا.'

" 'دوای ئەوە مارەییەکە خوێندراوە و ئەمن قەبووڵم کرد. ئەوجار یەکێک لە کیسە زێڕەکانی دا بە خوشکی و یەکیانیشی بەسەر شایەدەکاندا بەشییەوە. بە منیشی گوت: 'گەورەم، دەڵێم یەکێک لەو دیوانەشت بۆ تەرخان کەم هەتا لەگەڵ خێزانی خۆت لەوێدا بژین.' ئەمن شەرمم لەو هەموو گەورەییەی کرد و گوتم: 'بۆم بنێرە ماڵی خۆم.' خەلیفە، بە گیانی تۆ ئەو کابرایە ئەوەندەی پیتەک[1] لەگەڵ ئەو خوشکەی ناردبوو، جێگامان نەبوو لێی دانێین. دوای ئەوە لەو کچە کوڕێکم بوو. ئەو کوڕە هەر ئەوەیە ئێستا لێرە وێستاوە. مەئموون سەری لەو هەموو جوامێرییەی ئەو کابرایە سووڕ ما. فەرمانی دا بچن بیهێنن.

١. پیتەک: ئەو کەلوپەلەی لەگەڵ بووکدا بۆ ماڵی زاوای دەنێرن.

کە ئەو پیاوە هاتە هەنتەشــی خەلیفە، خەلیفە قســەی لەگەڵ کرد. واقی لەو هەموو ژیری و وردبینی و زانیاری و ڕەوشـــتبەرزییەی وڕ ما. ئەوی کرد بە یەکێک لە کەســـە نیزیک و هاودەمەکانی خۆی.

### چیرۆکی ژنە خێرۆمەندەکە

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە پاشـایەک لە پاشـاکان بە خەڵکی شـارەکەی خۆی گوت: 'هەرکەس خێر بکا، دەسـتی دەپەڕێنم.' خەڵک دەسـتیان لە خێرکردن هەڵگرت. کەس نەیدەتوانی دەسـتی کەس بگرێ. بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان پارسـەکێکی برسـی و کەلەلا چووە لای ژنێک و داوای یارمەتی لێ کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

# که ئەوی سێسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، ئەو پیاوە سـواڵکەرە بە ژنەی گوت: 'خێرێکم پێ بکە داماوم.' ژنە گوتی: 'جا چۆن دەتوانم خێرت پێ بکەم؟! ئاخر پاشـا دەسـتم دەپەڕێنێ.' کابرا گوتی: 'بیکە بۆ خاتری خودا شتێکم دەیە، لە برسان برستم لێ براوە و تاقەت ناهێنم.' ئەو ژنە کە گوێی لە ناوی خودا بوو، دڵی بۆی سـووتا و دوو نانی دایە. کە ئەو هەواڵە بە گوێی پاشـا گەیشتەوە، ژنەی بانگ کرد و هەردووک دەستی پەڕاند. ماوەیەک لەو شتە تێپەڕی. پاشا بە دایکی گوت: 'دەمهەوێ ژنێکی جوانم بۆ بێنی.' دایکی گوتی: 'ژنێکی دراوسـێمان هەیە لە دنیادا شتی وا نییە. بەڵام ئەو عەیبێکی گەورەی هەیە، دەستیان پەڕاندووە.' پاشا گوتی: 'دا بنێرە بیهێنن، با ببینم.' چوون هێنایان. کە دیتی، ئاشـقی بوو. لە خۆی مارە کرد. ئەو ژنە هەر ئەو ژنە بوو کە دوو نانەکەی بە پارسەکەکە دابوو و لەبەر ئەوە دەستیان بڕیبووەوە. کە پاشا مارەی کرد، تەواوی ژنانی دیکەی پاشا ئیرەییان پێ دەبرد. نووسراوەیان بۆ پاشا نارد کە ئەو ژنە ژنێکی خراپکارە.

"پاشـــا باوەڕی بە بەوان کرد و بە دایکی گوت کە لە ماڵی وەدەر نێ و بینێرێ بۆ دەشـتێک و لەوێ بژی. دایکی پاشـا ئەو کارەی کرد کە پاشـا فەرمانی پێ دابوو. ئیدی ئەو ژنە لە دەشـت و بێروونێکی وشـک و بێ ئاو و گژوگیا، بە منداڵەوە برسـی و تینوو و سـەرگەردان بەڕەڵا کرا. منداڵ بە کۆڵەوە هەر لە خۆڕا بێ مەبەسـت ملی ڕێی گرت و ڕۆیشـت. ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە سـەر ڕووبارێک. لە تینووان چۆکی دادا ئەو بخواتەوە، کەچی منداڵەکە لە ئاوەکە کەوت. ژنە دەستی کرد بە هات و هاوار و گریان. لەو جەنگەیەدا دوو پیاو گەیشـتنێ. لێیان پرسـی: 'ئەوە چ بووە ئەو هاتوهاوارەت لە چییە؟' ژنە گوتی: 'داهاتمەوە ئاو بخۆمەوە، منداڵەکەم بە کۆڵمەوە بوو، لەو ئاوە کەوت.' ئەو دوو پیاوە گوتیان: 'پێت خۆشـە کوڕەکەت بۆ دەرهێنینەوە؟' ژنە گوتی: 'بەڵێ، بە قوربانتان بم.' ئیدی ئەوان دەستیان کرد بە دۆعاکردن. هێشتا دۆعاکەیان تەواو نەکردبوو کە منداڵە بە ساغ و سـلامەتی هاتەوە دەرێ. ئینجا ئەو دوو پیاوە گوتیان: 'حەز دەکەی خودا هەردووک دەسـتەکەت بداتەوە؟' ژنە گوتی: 'ئەرێ وەڵڵا! بڵێی خودا کاری ئاوام لەگەڵ بکا؟!' ئیدی پیاوەکان دۆعایان بۆ کرد و خوداش دوو دەسـتی لە دەسـتەکانی خۆی چاکتریش داوە. دوای ئەوە پیاوەکان گوتیان: 'ئەی دەزانی ئێمە کێین؟' ژنە گوتی: 'ناوەڵڵا!' گوتیان: 'ئێمە ئەو دوو نانەین کە دات بە سـواڵکەرەکە و لەبەر ئەو کارەت دەسـتیان بڕیتەوە. ئێسـتا تۆ سپاسی خودا بکە کە خودا منداڵ و دەستەکانتی دایەوە.' ئەو ژنە سپاسی خودای کرد.

## چیرۆکی دەروێش و سوودی خێر

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە لەناو هۆزی زاروزیچی ئیسرائیلدا پیاوێکی دەروێش تێدا بوو کە خێزانی خوری دەڕست و گوریسی لێ چێ دەکرد. ئەو پیاوەش گوریسەکەی دەبرد لە بازاڕ دەیفرۆشت. خوری دیکەی بۆ دەکڕییەوە و ئەوەی دیکەشی دەدا بە بژیوی ژیانیان و لەگەڵ خێزانی دادەنیشت دەیخوارد. ڕۆژێک لە ڕۆژان دەستی دا گوریس و هەستا چوو لە بازاڕ فرۆشتی. لەو جەنگەیەدا کابرایەک کە برادەری دینی بوو. دەستی کرد بە داد و هاوار لە دەستەنگی و هەژاری. ئەویش دڵی بۆی سووتا و پارەی گوریسەکەی دایە. بە دەستی خاڵی گەڕاوە لای خێزانی. نە خوری کڕیبوو نە خواردەمەنی و شت. ژنی دەروێشەکە گوتی: 'ئەوە بۆ خوری و خواردنت نەهێناوە؟' گوتی: 'کەسێک پەنای بۆ هێنام و منیش پارەکەم دایێ.' ژنە گوتی: 'ئەی بۆ خۆمان چ بکەین؟ خو هیچیشمان نییە بیفرۆشین!' هێندێکیان دەفر و گۆزە و کوپەڵە و شتی وا هەبوو، کابرای دەروێش هەڵیگرتن و بردنی. کەس هیچیانی لێ نەکڕی. ئیدی هەر وا سەرگەردان دەسووڕاوە، لەهیکەوە[1] تووشی پیاوێک بوو کە ماسییەکی بۆگەنی پێ بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١. لە هیکەوە: لە پڕدا. لە ناکاو.

# که شەوی سێسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، تووشی کابرایەک بوو ماسییەکی بۆگەنی پێ بوو کە کەس لێی نەدەکڕی. خاوەنی ماسییەکە بە کابرای عابیدی گوت: 'کاکە، دێی گۆڕینەوەیەک بەو شتە خراپانەمان بکەین؟' عابید گوتی: 'بەڵێ، دەیکەم.' ئیدی دەفر و دیزە و گۆزەکەی دایە و ماسییەکەی لێ وەرگرت و گەڕاوە بۆ ماڵێ. ژنی عابیدەکە گوتی: 'ئاخر ئێستا ئێمە چی لەو ماسییە ڕزیوە بکەین؟!' کابرا گوتی: 'جارێ ئەوەی سوور کەوە با بیخۆین، خودا گەورەیە.'

"ژنە ناچار زگی ماسی دڕی خاوێنی کاتەوە، کەچی لەنێو زگیدا دەنکە مرواریەکی تێدا بوو! بانگی عابیدی کرد و پێی گوت: 'دا چاوێک لەو مرواریە بکە. ئەگەر سوابێتیانەوە، ئەوە هی خەڵکە و، ئەگەر نەیانسوابێتەوە، ئەوە ڕزقێکە و خودا بۆی ناردووین.' خێرا چاویان لە مرواریەکە کرد. وا بوو نەسوورابووەوە. عابید مراوریەکەی بردە لای یەکێک لە هاوڕێکانی کە لەو جۆرە شتانە دەگەیشت. گوتی: 'فلانی، ئەوە ئەو مرواریەت لە کوێ ودگیر کەوتووە؟' عابید گوتی: 'ئەوە ڕزقێکە و خودا ناردوویەتی.' ئەو کابرایە گوتی: 'بە بڕوای من ئەو مرواریە هەزار درەم دێنێ. بەڵام ئەتۆ ئەو مراوریەی بەرە لای فلان بازرگان کە ئەو لە منی باشتر تێدەگا.' عابید مرواریەکەی بردە لای بازرگانەکە. بازرگانەکە گوتی: 'ئەمن ئەو مرواریە بە حەفتا هەزار درەم دەکڕم.' ئیدی بازرگانەکە بایی حەفتاهەزاری ماڵ دایە. دەروێش بانگی چەند کۆڵبەرێکی کرد و ماڵەکەی بردەوە بەردەرگا. لەو جەنگەیەدا پارسەکێک هات و گوتی: 'خودا بەشی تۆی داوە، ئەتۆش بەشی من بدە.' ئەو کابرا عابیدە بە پارسەکەکەی گوت: 'ئێمە دوێنێ وەک تۆ وا بووین. ئەوڕۆ خودای گەورە بەشی ئێمەی داوە. ئێمەش لەگەڵ تۆ بەشی دەکەین. دەیکەینە دوو بەش و نیوەی دەدەین بە تۆ.'

"ئیدی ئەو کابرا عابیدە ماڵەکەی کردە دوو بەش. نیوەی دا بە کابرای سواڵکەر. سواڵکەرەکە گوتی: 'ئەو ماڵەی بۆ خۆت بگێڕەوە. خودا بەرەکەتی تێ خا. ئەمن نێردراوی خودام هەر بۆ تاقیکردنەوە ناردوویانم.' کابرای عابید شوکری خودای کرد کە لەو تاقیکاریە سەربەرز بووە. ئیدی لەگەڵ خێزانی هەتا کۆتایی تەمەنیان هەر بە خێر و خۆشی ژیان.

## چیرۆکی ئەبووحیسانی زیادی

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە ئەبووحیسانی زیادی گێڕاوییەتەوە: 'هێندێک ڕۆژ

هەژاری و دەستتەنگی وای گوشار بۆ هێناوم کە دووکاندار و نانەواخانە بۆ سەندنەوەی پارەی نان و خواردەمەنی، بەردەرکیان پێ گرتووم. زۆر ناڕەحەت و پەرۆش بووم. جارێکی هیچ ڕێگایەکم پێ شک نەدەهات و نەمدەزانی چ بکەم. لەپڕدا کۆیلەکەم هات و گوتی: 'کابرایەک لە بەردەرگایە، دەڵێ کاری بە تۆیە. گوتم: 'با بێتە ژوورێ.' سەیرم کرد پیاوێکی خوراسانییە. سڵاوی کرد و من سڵاوەکەیم داوە. لێی پرسیم: 'ئەتۆ ئەبووحیسانی زیادییت؟' گوتم: 'بەڵێ، چ کارێکت هەیە؟' گوتی: 'ئەمن کابرایەکی غەوارەم و بە تەمام بچم بۆ حەج، ماڵێکم پێیە و بە تەمام دەهەزار درەمی لە لای تۆ دانێم هەتا حەجەکەم دەکەم و دێمەوە. ئەگەر حاجییەکان هاتنەوە و ماوەیەکی پێچوو من نەهاتمەوە، بزانە ئەوە مردووم و ماڵەکە بۆ خۆت. ئەگەر هاتیشمەوە، ئەوە ئەمانەتەکەم دەوە.' ئیدی کابرا توورەکەیەکی دەرهێنا. ئەمنیش بە کۆیلەکەم گوت: 'بچووە تەرازوویەک بێنە.' کۆیلەکەم تەرازووی هێنا. ئەو کابرایە زێڕەکانی کێشا و ڕۆیشت. لەڕێوە دووکاندار و نانەوا و تەواوی قەرزدارەکانم بانگ کردن و قەرزەکەم دانەوە و خۆم ڕزگار کرد. هێندێکیشم بژیو پێ کڕی بۆ ماڵێ و گوتم: 'هەتا کابرا دێتەوە، خودا دەرگایەکمان بەسەردا دەکاتەوە.'

" 'بۆ بەیانی کۆیلەکەم هات و گوتی: 'کابرا خوراسانییەکە هاتووە لە بەردەرگایە کاری پێتە.' بە کۆیلەکەم گوت: 'بیهێنە ژوورێ.' کە هاتە ژوورێ گوتی: 'ئەمن بە تەمای حەج بووم، کەچی هەواڵی کۆچی دوایی باوکمیان بۆ هێنام؛ دەگەڕێمەوە. زەحمەت نەبێ ئەمانەتەکەم دەوە.' کە ئەو قسەیەم بیست، سەری حەوت کێوانم لێ تاریک بوو. تاسێکم بە سەردا هات. دەستێکم کەوتە ئەولا و دەستی دیشم کەوتە ئەولا. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەگەر نکۆڵی لێ بکەم، ئەوە سوێندم دەدا و خودا دەزانێ چم بەسەر دێ. ئەگەر بڵێم ماڵکەتم بڵاو کردووەتەوە، ئەوە ئابڕووم دەچێ.' ناچار گوتم: 'ئەو ماڵەی ئێمە زۆر قایم نییە و یەخدانێکی واشم نەبوو، هەر بۆیە کاتێک توورەکەکەم لێ وەرگرتی، بردم لە لای کەسێکی جێی باوەڕ دامناوە. بەیانی وەرەوە توورەکەکەت وەرگرەوە.'

" 'وا بوو ئەو کابرایە ڕۆیشت. شەو هەتا بەیانی هەر جێنگم دا، خەوم لێ نەدەکەوت و لەبەر بیر و خەیاڵان نەمدەزانی چ بکەم. هەر ئەوشانەوشانم دەکرد. هەستام بانگی کۆیلەکەمم کرد، گوتم: 'هەستە ئەو ئەسپەم بۆ زین کە.' کۆیلەکەم گوتی: 'گەورەم، هێشتا هەر سەرەتای شەوە، بۆ کوێ دەچی؟' هاتمەوە سەر جێیەکەم. خەوم لێ نەدەکەوت. بەردەوام کۆیلەکەم لە خەو هەڵدەستاند و سەرکۆنەم دەکرد کە بۆ هەر دەخەوێتەوە. هەتا کازیوەی بەیانی. نۆکەرەکەم ئەسپەکەی بۆ زین کردم. نەمدەزانی ڕوو لە کام لا بکەم. لغاوی ئەسپەکەم بۆ شل کرد و چووم لە فکرەوە. ئەسپەکەم بۆخۆی سەری خۆی داخستبوو لە بەغداوە بەرە و ڕۆژهەڵات دەڕۆیشت. تووشی تاقمێک بووم. گوتم ڕەنگە جەردە و ڕێگر بن. لەڕێوە سەری ئەسپەکەم وەرسووڕاند و ڕووم لە لایەکی دیکە کرد.

ئەوان کەوتنە دوام و هەرایان کردم و گوتیان: 'ئەریّ کاکە ماڵی ئەبووحیسـانی زیادی دەزانی لەکوێوەیە؟' گوتم: 'ئەبووحیسـانی زیادی بۆ خۆمم.' گوتی: 'خەلیفە بانگی کردووی. لەگەڵمان وەرە.' ئەمن لەگەڵیان چووم. کە چووینە لای خەلیفە هارووونەڕڕەشید. خەلیفە لێی پرسـیم: 'ئەتۆ کێی؟' گوتم: 'کابرایەکم زانای دینی و لە برادەرانی ئەبوویوسـفم.' خەلیفە گوتی: 'ناوت چییە؟' گوتم: 'ناوم ئەبووحیسانی زیادییە.' خەلیفە گوتی: 'ژیان و بەسەرهاتی خۆتم بۆ باس بکە.' ئەمنیش ژیان و بەسـەرهاتی خۆمم بۆ باس کرد. خەلیفە دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: 'دویّ شەو پێغەمبەر(د ـ س) نەیهێشتووە لەبەر تۆ بخەوم. هەر سەر لە شەویّ کە خەوتم، پێغەمبەر(د ـ س) هاتە خەوم، فەرمووی: 'ئاگات لە ئەبووحیسانی زیادی بیّ. ئیدی ئەو شـەوە نەموێرا بخەومەوە. هەتا لای بەیانی هەر دانیشـتم و بەرەبەیانی زوو ئەو پیاوانەم وەدوای تۆ خسـت.' دوای ئەوە خەلیفە دەهەزار درەمی دامیّ و گوتی: 'ئەوەی بدەوە بەو کابرا خوراسانییە.' سیهەزار درەمی دیکەشی دامیّ و گوتی: 'بەوەشیان ژیانتی پیّ ببووژێنەوە. دوایەش وەرەوە با کار و پلەوپایەیەکت بدەمیّ.' ئەمن لە لای ئەو هاتمە دەریّ و گەڕامەوە ماڵەکەی خۆم. نوێژی بەیانیم کرد و لەسـەر بەرماڵەکە دانیشـتبووم کە کابرای خۆراسـانی هـات. ئەمن زۆرم ڕێز لیّ گرت و توورەکەکەم داوە. گوتی: 'ئەوە توورەکەکەی من نییە.' گوتم: 'ڕاسـتە، درووسـت ئەوەی خۆت نییە.' گوتی: 'ئەی هی من چی لیّ هاتووە؟ بۆ گۆڕاوە؟' ئەمن بەسـەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە. کابرای خوراسـانی دەسـتی کرد بە گریـان و گوتی: 'بە خودا ئەگەر هەر دوێنیّ ئەوەت پیّ گوتبـایەم، ئەمن لێم وەرنەدەگرتییەوە. ئێستاش قەسەم بە خودا هیچت لیّ وەرناگرمەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پیّ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشكۆ، 'كابرا گوتی: 'قەسەم بە خودا ئێستاش هیچت لێ وەرناگرمەوە و گەردنت خۆش و ئازاد بێ.' ئەوەی گوت و ڕۆیشتە دەرێ. ئەمن كارەكانم كردن و هەستام چووم بۆ لای خەلیفە. كە منی دیت، بانگی كردمە لای خۆی. فەرمانی دەستبەكاربوونی دادوەری شاری مەدینەی پیرۆزی دامێ و مانگانە پێنجسەد دیناری بۆ بڕیمەوە و دیارییەكی گرانباییشی دامێ.' ئیتر ئەبوو حیسانی زیادیی دادوەر ژیانێكی زۆر خۆش و تێروتەسەلی بوو هەتا لە سەردەمی خەلافەتی مەئموونیدا كۆچی دوایی كرد.

### چیرۆكی دڵاوایی گەوهەرفرۆش

"یەكی دیكە لەو چیرۆكانە ئەوە بوو كابرایەک زۆر دەوڵەمەند بوو. ماڵەكەی هەموو لە كیس چوو. ژنەكەی گوتی: 'داوای یارمەتی لە هاوڕێكانت بكە.' كابرا هەستا چوو بۆ لای یەكێک لە هاوڕێكانی و دەردی دڵی لە لا كرد. ئەو هاوڕێیەی پێنجسەد دیناری زێری سووری بە قەرز دایە هەتا كاری كڕین و فرۆشتنی پێ بكا. كابرا گەوهەرفرۆش بوو. زێڕەكانی لێ وەرگرت و چوو بۆ بازاڕی گەوهەرفرۆشان و لە دووكانی بابی دەستی كرد بە كڕین و فرۆشتن. ڕۆژێک لە ڕۆژان سێ كەس هاتن پرسیاری خاوەنەكانی پێشووی ئەو دووكانەیان كرد. كوڕە گوتی: 'خاوەنی پێشووی ئەو دووكانە بابی من بوو كە ئێستا فەوتی كردووە.' گوتیان: 'كەس دەزانێ كە تۆ كوڕی ئەوی؟' گوتی: 'جا ئەوە خەڵكی ئەو بازارە هەموو دەزانن كە ئەمن كوڕی ئەوم، بۆ؟' ئیدی كوڕە گەوهەرفرۆشەكە خەڵكەكەی كۆ كردەوە و تا شایەدی بۆ بدەن كە خاوەنی پێشووی ئەو دووكانە باوكی ئەو بووە. ئیدی ئەو سێ كەسە توربێنێكیان دەرهێنا كە بایی سێهەزار دینار گەوهەر و نقێمی گرانبایی تێدا بوو. گوتیان: 'ئەوانە هی باوكی تۆیە بە ئەمانەت لە لای ئێمە دایناببوون.' ئیدی ئەوان گەڕانەوە. ئەوجار ژنێک هات و یەكێک لەو گەوهەرانەی هەڵگرت كە بایی پێنجسەد دینار بوو. گەوهەرفرۆش ئەوی فرۆشت بە سێهەزار دینار. دوای ئەوە هەستا پێنجسەد دینارەكەی بۆ هاوڕێكەی بردەوە و پێی گوت: 'ها ئەوە پێنجسەد دینارەكەت، ماڵت ئاوەدان بێ. ئەوە خودا ناردی و دەست و باڵم كراوەتەوە.' ئەو هاوڕێیەی گوتی: 'ئەمن كاتێک ئەو زێڕانەم دا بە تۆ، ئیدی تازە بە هی خۆمیان نازانم و بیریشیان لێ ناكەمەوە. ئەمن پێم بەخشیوی. هەر بۆیە ئەو زێڕانە هەڵگرە و ئەو نووسراوەیەش لەگەڵ خۆت بەرەوە. لە ماڵێ نەبێ، لە هیچ كوێ مەیخوێنەوە. بەڵام ئەوەی لەو نووسراوەیەدایە، ڕەچاوی بكە.' ئیدی گەوهەرفرۆشەكە دەستی دا زێڕ و نووسراوەكە و چووەوە ماڵەكەی خۆی. كە

نامەکەی کردەوە، ئەو بەیتانەی تێدا نووسرابوو:

مـن کە بەخشـــیـم تەمـای وەرگـرتـنەوەم نەبـوو
مەبەســـتی مـن لەو بەخشـــینە هەر چـاکە بـوو
ئـــــەو مـالّەی کـــــە دوێنێ بۆیـان هێنـایەوە
بـابـم و مـامـم و خـالّـم بـوون هـێـنـایـانەوە
دایکـــم بـــوو هـاتبوو، زێــــڕەکــــەی لــێ کڕیت
ســــەد ئەوەنـــدەی زێـڕەکە پـارە دابـــوویەیـــت

## چیرۆکی خەونی سەیر

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە لە بەغدا پیاوێک هەبوو خاوەنی ماڵ و سـامانێکی زۆر بوو. قەدەر وا بوو تەواوی ماڵ و دارایییەکەی لە دەســـت دا و هیچی نەما. مافنگی[1] ماوە. بە هەزار زەحمەت بژیوی ڕۆژانەی پەیدا دەکرد. شـــەوێک بەدەم خەم و خەفەتەوە خەوی لێ کەوت. دەنگێک لە خەودا دوو-سێ جار پێی گوت: 'بژیوی تۆ لە میسرە. بچووە بۆ میسر.' ئەو کابرایە ناچار بوو بچێ بۆ میسر. کاتێک چووە میسر، جەنگەی شێو بوو. لە مزەگەوتێک خەوت. ماڵی بەرپرسـێک دیواری بە دیواری مزگەوتەکە بوو. تاقمێک دز هاتنە مزگەوتەکە و لەوێوە چوونە ئەو ماڵەوە. هاتوهاواریان لێ بەرز بووەوە و داوای یارمەتییان کرد. داروغە بە داروەدەســتەوە بە هاواریانەوە هات. دزەکان هەڵاتن. داروغە هاتە مزگەوت و کابرای بەغدایییـان لەوێ دیت. گرتیـان و ئەوەندەیان لێ دا خەریک بوو بمرێ. دوایە خسـتیانە بەندیخانەوە. سـێ ڕۆژان لەوێدا بوو. ئینجا داروغە هێنایە دەرێ و لێی پرســی: 'ئەتۆ بۆ لە بەغداوە هاتوویە ئێرە؟' ئەویش گوتی: 'ئەمن خەونم بینی، کەسێک پێی گوتم کە بژیو و قووتی تۆ لە میســرە. بچووە بۆ میســر. ئەوە هاتمە ئێرە و ئەو قامچییانەی تۆم بە قســمەت بوو.' داروغە بە قســەکەی پێکەنی و گوتی: 'ئاخر گەوجە، هەتا ئێســتا سـێ جار خەونم دیوە پێیان گوتووم: 'لە بەغدا لە فلانە جێ و فلانە گەڕەک و کۆڵان ماڵێکی لێیە، لەو ماڵەدا حەوزێکی تێدایە، لەبن ئەو حەوزە خەزێنەیەی زۆری تێدایە. ئەتۆ بچووە لەوێ ئەو ماڵە دەرهێنە.' ئەمن باوەڕەم بە شـتی وا نییە و گوێشـم نەداوەتێ. کەچی تۆ هێندە گەوجی لەبەر خەونێکی ئاڵوز و بڵۆزەوە لەوێوە هەســـتاوی هاتووی بۆ ئێرە؟!' دوای ئەوە داروغە چەنـد درەمێکی دا بە کـابرای بەغـدایی و پێی گوت: 'ئەو درەمـانە بۆ خواردنی ڕێت و بگەڕێوە بۆ شارەکەی خۆت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. مافنگی: مایەپووچ. دەست بەتاڵ بوون.

## که شەوی سێسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، داروغە بە کابرا بەغدایییەکەی گوت: 'بگەڕێوە بۆ شارەکەی خۆت.' پیاوەکە درەمەکانی وەرگرت و گەڕاوە بۆ بەغدا. چوو بۆ ئەو شوێنەی داروغە نیشانەکەی دایە. ئەو شوێنە ڕاست ماڵی ئەو کابرایە خۆی بوو. چووەوە ماڵەکەی خۆی حەوزەکەی لا برد و بنەکەی داوە و ماڵەکەی دەرهێنا.

### چیرۆکی وەکیەکبوونی دوو خەون

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە: لە کۆشــکی موتەوەککیلی عەبباســی چوارسەد کەنیزی تێدا بوو. دووسەدی ڕۆمی و دووسەدی حەبەشی. ئەوانە عەبدی کوڕی تاهیر بۆی ناردبوو. یەکێک لەو کەنیزانە کەنیزێک بوو ناوی مەحبووبە بوو. لە جوانی و دەلالی و شەنگ و شەپاڵیدا لەنێو ئەوانی دیکەدا تاک بوو. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەوە بوو کە بە بیســت و یەک شــێواز عوودی لێدەدا و دەنگێکی داووداســای هەبوو. شــێعری دەهۆنییەوە و بە حەوت شــێوە خەتی دەنووســی. موتەوەککیل زۆری ئۆگر بوو. بێ ئەو نەیدەتوانی هەڵبکا. کەنیزەکە کاتێک زانی کە ئەوە خەلیفە ئاوایە بۆی، پۆزی بەســەر خەلیفەدا لێدەدا. خەلیفە لێی بە قینا چوو. هاتوچۆی نەدەکرد و بە دانیشــتووانی کۆشــکی گوت: 'قســەی لەگەڵ نەکەن.' ماوەیەک ئاوا لەگەڵ ئەو کەنیزە جوولانەوە. بەڵام خەلیفە دڵی هەر لە لای بوو. ڕۆژێک خەلیفە بە ڕاوێژکار و هاودەمەکانی گوت: 'ئەمن ئەوشــەو لە خەونمدا لەگەڵ 'مەحبووبە'ی کەنیزم ئاشــت بووومەوە.' دەوروبەرییانی گوتیان: 'هیوادارین ئەوە لە ڕاستیشــدا بێتە دی.' ئەوان هەر وا خەریک بوون باســی ئەو خەونەیان دەکرد کە خزمەتکارێک هات و بە سرتە قســەیەکی لەگەڵ موتوەککیل کرد. خەلیفە خێرا هەستا چوو بۆ دیوی ژنەکانی. ئەو ســرتەیەی کە خزمەتکارەکە لەگەڵ خەلیفە کردی، ئەوە بوو کە ئێمە لە دیوەکەی مەحبووبە گوێمان لە دەنگی عوود و ئاواز بووە و نەمانزانی چ بووە. کاتێک خەلیفە گەیشــتە دیوەکەی مەحبووبە، گوێی لێ بوو کە عوودی لێدەدا و بە گۆرانی ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

دوێ شــەوێ لە خەونــتــدا هەر لەگەڵ مــن بــووی
ئــاشـــت بیوویتەوە و دەتگوت هەر ئــاشـــقەکەی زووی
تــا بەیــان هەر خەریــک بــووی گــوڵــت دەچەقــانــد
لە یەخەی خــۆت و زولــفــی مــنــت دەچەقــانــد

"هەر کە موتەوەککیل گوێی لەو گۆرانییەی مەحبووبە بوو، بە شێعر و قسەکانیدا دیار بوو کە مەحبووبەش لە خەودا ئەو خەونەی دیوە و زۆر بەلایەوە سەیر بوو. ئیدی خەلیفە چووە دیوەکەیەوە. کە مەحبووبە خەلیفەی دیت هاتە دیوەکەی ئەوەوە، لە بەری هەستا و خوی بە سەر لاقیدا دا. خەلیفە ماچی کرد. مەحبووبە گوتی: 'گەورەم، شەوی ڕابردوو ئا ئەوەم بە چاوی خۆم دیت.' یەکتریان لە ئامێز گرت و لەگەڵ یەک ئاشت بوونەوە. شەو و ڕۆژ خەلیفە لە لای مەحبووبە بوو. مەحبووبە ناوی خەلیفەی بە میسک و عەنبەر لەسەر هەنییەی کوتابوو. خەلیفە ناوی جەعفەر[1] بوو.

کە خەلیفە دیتی ئەوە مەحبووبە ناوی ئەوی لەسەر تەوێڵی بە میسک و عەنبەر کوتاوە، ئەو دوو بەیتەی بۆ خوێندەوە:

هەتا گیرۆدەترم کەی لەناو داوی ئەڤینتدا
کوتاوتە ناوی من لەسەر هەنییەی وەکوو مانگی خۆتدا
تۆ کە ناوی منت لەسەر تەوێڵت نەخش کردووە
بە ئەڤین و خۆشەویستیت ولاتی دڵمت گرتووە

"کاتێک موتوککیل کۆچی دوایی کرد، هەموو کەنیزەکان ئەهوەن بوونەوە جگە لە مەحبووبە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئەمە ناوی سەرەکی خەلیفەیە و موتەوەککیل ناسناویەتی.

## که شەوی سێسەد و پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، که موتوککیل مرد، مەحبووبه مات و مەلوول بوو. شـــەو و رۆژ کاری بوو به شین و گریان.

### چیرۆکی خۆشەویستی لەگەڵ ورچ

"یەکی دیکه لەو چیرۆکانه ئەوەیه له ســـەردەمی خەلافەتی حاکیم بیئەمریللا له میســـر پیاوێک هەبوو به ناوی وەردان. گۆشتی مەڕی دەفرۆشت. ژنێکیش هەموو ڕۆژێ دینارێکی دێنا دوو بەرابەر و نیوی دینارێکی میســـری بوو. باربەرێکیشـــی لەگەڵ خۆی دێنا بایی دینـارێکی گۆشـــت دەکڕی و دەیـدا به بـاربەرەکه. ژنه لەنواوه و بـاربەرەش لەدواوه دەڕۆیشتن.

"به کورتی ماوەیەکی زۆر قەســـابەکه هەموو ڕۆژێک دینارێکی لەو ژنه پێ دەگەیی. تا وای لێ هات وەردانی قەساب له کاری ئەو ژنه دڕدۆنگ بوو. به دزیی ژنەوه له باربەرەکەی پرسی: 'ئەوه هەموو ڕۆژێ لەگەڵ ئەو ژنه ئەو گۆشته بۆ کوێ دەبەن؟'

"بارەبەر گوتی: 'به خودا ئەمنیش سـەرم له کاری ئەو ژنه سـوور ماوه! هەموو ڕۆژێک بایی دینارێک گۆشـــت و بایی دینارێک میوه و مۆم و نوقڵ دەکڕێت و دینارێکیش دەدا به دەفرێک مەی. لەســـەر شـــانی مندیان دادنێ و دەمبا بۆ باخی وەزیر. لەوێ چاوی من دەبەســـتێ، به جۆرێک که نەتوانم هیچ کوێ ببینم. لێشـــی دەپرســـم: 'من بۆ کوێ دەبەی؟' وڵامم ناداتەوه. دەمبا هەتا شـــوێنێک لەوێ قرتاڵەکه لەســـەر شـــانی من دادەگرێ. دەستم دەگرێ و دەمهێنێتەوه ئەو شـــوێنەی چاوی منی لێ بەســـتبوو. لەوێ چاوم دەکاتەوه و دەرەمم دەداتێ و بەڕێم دەکا. دیســـــان که ڕۆژ دەبێتەوه، هەر کارەکەی ڕۆژی پێشـــوو دووپات دەکەیەوه. وەردانی قەساب ئەوەندەی دیکه دوودڵ بوو. ئەو شەوه هەتا بەیانی له بیری ئەوەدا بوو بڵێی چی بێ.

"وەردانی قەســاب گێڕاوییەتەوه: 'دیســـان ڕۆژ بووەوه، ئەو ژنه وەک ڕۆژان دینارێکی هێنا و هاته لام. گۆشـــتی کڕی و به کۆڵبەرەکەی ســـپارد و ڕۆیشـــت. ئەمن دووکانم به شاگردەکەم سپارد و دوور و نیزیک وه دوایان کەوتم.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# که شەوی سێسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەردان گوتوویە: 'بە دوایدا ڕۆیشتم. بە جۆرێک کە سۆسەم نەکا. هەتا لە میسر وەدەر کەوت و چوو بۆ باخێ وەزیر. ئەمن لەوێ خۆم شاردەوە هەتا چاوی کوڵبەرەکەی بەست. ئەوجار هەر لەوێ بۆ ئەوێ، بەدوایانەوە بووم هەتا گەیشتنە کێویک. بەردێکی گەورە لەوێ بوو. ڕاوەستان و قرتاڵەکەی لەسەر سەری داگرت. ئەمن لەوێ ڕاوەستام هەتا باربەرەکەی بردەوە شوێنەکەی خۆی. بۆخۆی هاتەوە ئەوێ. لەپڕدا لێم ون بوو. پێم سەیر بوو! هەستام چوومە لای بەردەکە. لەژێر بەردەکە کونێکی لێ بوو، پەیژەیەکی پێوە بوو ڕۆ نرابووە خوارێ. وردەوردە لە پەیژەکە چوومە خوارێ. چوومە نێو دالانەڕێیەکەوە. لەوێ دەرگای ماڵێک وەدیار کەوت. پاڵم وە لاشیپانی دەرگاکە دا. سەکۆیەک لەوێ بوو. چوومە سەر سەکۆکە. لەوێوە دیمەنێکم دیت. لێی ورد بوومەوە. سەیرم کرد ئەوە ژنە نەرمە گۆشتەکەی لە مەنجەڵێک دەخست و ئەوانی دیکەی داویشتە پێش ورچێکی زەلام کە لەوێ بوو. ئەو ورچە تەواوی ئەوانەی دەخوارد. ئاوری وەبن مەنجەڵە دا. کە گۆشتەکە برژا، ئەو ژنە کەمێکی لێ خوارد. میوە و نوقڵ و مەییشی دانابوو. هەر پیاڵەیەکی دەخواردەوە و دەفرێکی زێڕینی گەورەشی پڕ دەکرد و دەیدا بە ورچەکە هەتا وای لێ هات هەردووکیان مەست بوون و بە لادا کەوتن. نەیاندەتوانی بجووڵێنەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئێستا دەرفەتە.' خێرا چوومە ژوورێ. ئەوان ئەوەندەیان خواردبووەوە کە دەماریکیان نەدەبزووت. کێردێکم پێ بوو، وشتری دادێنا. ئەو کێردەم دەست دایە و لەسەر ملی ورچەم دانا. دەنگێکی وا لە گەرووی ورچەوە هات، دەتگوت هەورە دەگرمێنێ. لەڕێوە ژنە بە پەشۆکاوی خەبەری بووەوە. کە ورچەی بە سەربڕاوی و منی بە کێردەوە بینی، یەکبەخۆی هاواری کرد. ئەمن گوتم: 'حەتمەن گیانی دەرچوو.' بە منی گوت: 'وەردان، ئەوە پاداشی ئەو هەموو چاکەیە بوو کە من لەگەڵ تۆم کرد؟' ئەمنیش پێم گوت: 'دوژمنی خۆت، مەگەر پیاو نەمابوو لە دنیایەدا کە تۆ حەز لە ورچ بکەیت؟!' ئیدی سەری داخست و هیچی نەگوت. چاوێکی لە ورچەکە کرد و دەستی کرد بە گریان. بە منی گوت: 'وەردان، پێت خۆشە پێت بڵێم مایە خێر و فەڕ بێ بۆ تۆ ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی سێسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو ژنە گوتی: 'وەردان، شتێکت پێ بڵێم مایە خێر و فەڕ بێ بۆ تو یان لەبەرابەرمدا ڕادەوەستی و سەرت تێدا بچێ؟' ئەمن گوتم: 'گوێم لێتە، هەرچی دەڵێی بیڵێ.' ژنە گوتی: 'هەر وەک ئەو ورچەت سەر بڕی، سەری منیش ببڕە و لەو گەنجە بەشی خۆت هەڵگرە و بڕۆ بەدوای کاری خۆتدا.' ئەمن پێم گوت: 'ئەمن لەو ورچە چاکترم. ئەتو لەو کارە تۆبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای خودا. منیش مارەت دەکەم و پێکەوە زەماوەند دەکەین. ئیدی تا ئاخری تەمەنمان پێکەوە لەو خەزێنەیەش کەڵک وەردەگرین و بە خۆشی ژیان دەبەینە سەر.' گوتی: 'وەردان، ئەوە بزانە تازە دوای ئەو ژیان بۆ من ئەستەمە. بە خودا ئەگەر تۆ من نەکوژی، من تۆ دەکوژم. لە دەست من ڕزگارت نابێ. ئەوە قسەی منە. ئەمن گوتم: 'جا ئەگەر ئاوایە، ئەتۆش دەکوژم.' ئیدی پرچیم گرت و بەڕێی دۆزەخم کرد.

" 'دوایی چاوم گێڕا، ئەوەندەی زێڕ و جەواهیرات و نقیم و مرواری لێ بوو، بە هیچ پاشایەکیش کۆ نەدەکرانەوە. دەستم دا قرتاڵەی باربەرەکە و پڕپڕم کرد. ملپێچێکم پێ بوو لە ملم کردەوە و بەسەرمدا دا. لە خەزێنەخانەکە هاتمە دەرێ و ڕۆیشتم هەتا گەیشتمەوە دەروازەی میسر. لەپڕدا دە کەس لە خزمەتکارەکانی حاکیم بیئەمریللا و خەلیفە گەیشتنێ. خەلیفە لێی پرسیم: 'وەردان.' گوتم: 'بەڵێ، قوربان.' گوتی: 'ورچەکە و ئەو ژنەت کوشت؟' گوتم: 'بەڵێ، خەلیفە.' گوتی: 'قرتاڵەکەت دانێ و ئەرخەیان بە. ئەو ماڵەی پێتە هەمووی هی خۆتە و کەس حەقی بەسەرییەوە نییە.' ئیدی قرتاڵەکەم دانا و سەرەکەیم هەڵداوە. خەلیفە ئەوانەی دیت و لێی پرسیم: 'دا باسی ئەو ورچە و ئەو ژنەم بۆ بکە، هەرچەند هەموو شتێکیش دەزانم.' ئیدی هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە، خەلیفە دەیگوت: 'تۆ ڕاست دەکەی.' دوای ئەوە خەلیفە گوتی: 'وەردان، هەستە با بچین بۆ لای خەزێنەکە.' ئەمن و خەلیفە پێکەوە چووینە ئەو شوێنە. سەیرمان کرد کونەکە گیرابوو. خەلیفە گوتی: 'وەردان، ئەو درەگایە بکەوە، چونکە کەس وەک تۆ شارەزای ئەو کارە نییە. ئەو گەنجەیان بە ناوی تۆوە تەلیسم کردووە.' ئیدی ئەمن چوومە پێشێ. دەستم لەسەر بەردەکە دانا. بەردەکە بە ئاسانی واوە چوو. خەلیفە بە منی گوت: 'ئێستا بڕۆ ژووری ئەوەی گەنج و شتی لێیەتی هەمووی بێنە دەرێ، چونکە تۆ نەبی کەس ناتوانێ بچێتە ژوورێ. کوژرانی ئەو ورچ و ژنەش هەر بە تۆ دەکرا. ئەتۆ نەبای، بە کەس نەدەکوژران. ئەوانە هەمووی بە نووسراو لە لای من هەبوون، بەڵام من هەر چاوەڕێ بووم بڵێی ئەو شتە کەی ڕووی بدا.' ' وەردان گێڕاوییەتەوە: 'من چوومە خوارێ و هەرچی لێی بوو هێنامە دەرێ. ئیدی خەلیفە فەرمووی: 'بچن چوارسم بهێنن باری کەن.' گەنجەکەیان بە هێستر و ئەسپ و شت بردەوە بۆ دارولخەلیفە. ئەوەی لە قرتاڵەکەدا بوو، ئەوەیان دا بە من. ئەمن ئەوم هەڵگرت و هاتمەوە

**ماڵەکەی خۆم. ئیدی بۆ خۆم دووکان و بازاڕم دانا. ئەو بازاڕە ئێستاش ماوە و پێی دەڵێن بازاڕی وەردان.' "**

**لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.**

# که شەوی سێسەد و پەنجا و چوارەم

## چیرۆکی ئەسپی ئاونووس[1]

گوتی: "خاوەنشکۆ، یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە سەردەمانی زوو پاشایەک هەبوو خاوەن گەوەریی و شکۆ و سامان بوو. سێ کچی رووەمانگ و کوڕێکی ڕووگەشی هەبوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان پاشا لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو کە سێ کەس لە حەکیمان و زانایان هاتنە لای. یەکیان تاوسێکی زێڕینی هەبوو. ئەوەی دیکە شەیپوورێکی زیوینی پێ بوو. سێیەمینیش ئەسپێکی هەبوو لە شفرە و ئاونووس چێ کرابوو. پاشا لێی پرسین: 'ئەوانە چین و چ قازانجێکیان هەیە؟' خاوەنی تاوسەکە گوتی: 'تایبەتمەندیی ئەو تاوسە لەوەدایە کە سەری هەموو سەعاتێک باڵ لێ دەدا و دەخوێنێ.' خاوەنی شەیپوورەکە گوتی: 'ئەگەر ئەو شەیپوورە لە دەروازەی شار بدەین، بۆ شار وەک نۆبەدار و پاسەوان وا دەبێ. ئەگەر کەسێک بێتە نێو شارەوە، ئەوە ئەو تێی دەتووڕێنێ و هەموو کەس ئاگادار دەکاتەوە. هەر بۆیە دژمن ناتوانێ بێتە ناو شارەوە.' خاوەنی ئەسپەکە گوتی: 'تایبەتمەندیی ئەو ئەسپەش ئەوەیە کە ئەگەر کەسێک سواری بێ و بیهەوێ بچێ بۆ شارێک، ئەو ئەسپە بۆخۆی دەیباتە ئەو شارە.'

"پاشا گوتی: 'هەتا ئەو شتانەی باسیان دەکەن، تاقی نەکەمە و بە چاوی خۆم نەیانبینم، خەڵاتتان ناکەم.' دوای ئەوە تاوسی تاقی کردەوە، ڕاست ئەو شتە بوو کە خاوەنەکەی گوتبووی. ئینجا شەیپوورەکەی تاقی کردەوە، ئەویش ئەو شتە بوو کە خاوەنەکەی باسی کردبوو. دوایی پاشا بەو دوو زانا و پایەبەرزەی گوت: 'چتان دەوێ تا بتاندەمێ؟' ئەوانیش گوتیان: 'سەرو کچێکی خۆتمان لێ مارە بکە.' پاشا یەکی کچێکی لێ مارە کردن.

"پاشان ئەو کابرایەی ئەسپەکەی هەبوو هاتە پێشێ، کڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، پاشای جیهان، مینش خەڵات بکە هەروەک ئەوانت خەڵات کرد.' پاشا گوتی: 'هەتا ئەسپەکە تاقی نەکەمەوە، خەڵاتت ناکەم.' وا بوو لەو جەنگەیەدا کوڕی پاشا هات و گوتی: 'پاشا، من سواری ئەو ئەسپە دەبم و تاقی دەکەمەوە، با ڕاستی و درووستی قسەی کابرام بۆ ڕوون بێتەوە.' پاشا گوتی: 'تاقی کەوە.' لەڕێوە شازادە سوار بوو، لاقی لێ دا، بەڵام ئەسپ لە شوێنی خۆی نەجووڵا. شازادە گوتی: 'کاکە، ئەی کوا ئەو هەروگیڤەی لێت دەدا؟' زاناکە چووە بەرەوە و دەستێکی لە شتێک دا کە لەسەر ئەسپەکەوە جێگیری کردبوو. دەمودەست ئەسپەکە کەوتە جووڵەجووڵ و وە حەوا کەوت. شازادەی لەگەڵ خۆی برد و ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا لە چاو ون بوو. لەو جەنگەیەدا شازادە پەشیمان بووەوە و سەری لەو

---

[1] ئاونووس: دارێکی گرانباییە کە لە ناوچە گەرمێنەکان دەڕوێت و ڕەنگی بۆری تۆخە.

کارەی خۆی سـوورِ ما. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو کابرایە هەر ویسـتی من لەنێو بەرێ.' دوای ئەوە ورد سەرنجی تەواوی گیانی ئەسپەکەی دا. لە شانی ڕاستی ئەسپەکە شتێکی دیت وەک سەری کەڵەشێر. لە شانی چەپیشەوە شتێکی دیکەی ئاوای دیت. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو ئەسپە جگە لەو دوو شتە هیچی دیکەی پێوە دیار نییە. ئیدی ئەوەی لە شانی ڕاستییەوە بوو جووڵاندەوە، ئەسپەکە بەرەو ژوور هەڵکشا. دوای ئەوە ئەوەی شانی چەپی بزاوت، سـەربەرەوژێر داکشـا و، وردەوردە ڕاسـت و چەپی پێ کردن و لە شـێوازی کارکردنەکەی شارەزا بوو. شازادە خۆی لەسەر ماڵی زین توند گرتبوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە خۆی لەناو ماڵی زیندا مەڵاس دابوو. کە شازادە ئاوای دیت، زانی کە ئەو ئەسپە چەندە بە کەڵکە. دڵی زۆر خۆش و شاد بوو. سپاسی خودای دەکرد. نەرمنەرم بەرەو خوارێ دەهات. بەردەوام سەری ئەسپەکەی بۆ ئەملا و ئەولا وەردەسووڕاند و بە دڵی خۆی چاوی دەگێڕا. بەسەر شار و دەریاکاندا دەگەڕا کە هیچیانی نەدەناسین. یەکێک لەو شارانەی کە دیتی، شارێک بوو لە وڵاتێکی سەرسەوزدا کە چۆم و ڕووبارەکانی بەنێو زەوییەکانیدا دەخوشین. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە دەمزانی ئەو شارە کوێیە و نێوی چییە.' کە ڕۆژ ئاوا بوو، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەمن شارم لێرە خۆشتر و چاکتر وەگیر ناکەوێ. دەڵێم ئەوشەو لێرە بمێنمەوە. بیرۆکە لەوە باشتر نابێ. بەیانییش هەڵدەستم دەچمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان. جا تەواوی ئەوانە بۆ باوکم دەگێڕمەوە و پێشی دەڵێم ئەو ئەسپە چ ئەسپێکە.'

"هەر ئاوا لە شوێنێک دەگەڕا لێی دابەزێ و کەس خۆی و ئەسپەکەی نەبینێ. لەپڕدا لە نێوەڕاستی شار چاوی بە کۆشکێکی بەرز کەوت. بە خۆیی گوت: 'ئەو کۆشکە لە هەموو جێیەک باشترە.' ئیدی ئەو جێگەی کە تایبەتی هاتنەخوارێ بوو، بزاوتی و ئەسپەکە لە سەربانی کۆشک نیشتەوە. شازادە لەوێ دابەزی و لە سەربانی کۆشک دانیشت هەتا تەواوی خەڵکی ناو کۆشکەکە خەوتن. شازادە چونکە لەو کاتەوەی لە ماڵێ وەدەر کەوتبوو و هیچی نەخواردبوو، هێزی ئەوەی نەبوو هەستێ. دەشیزانی حەتمەن ئەو کۆشکە خواردەمەنی تێدایە.

"ئیدی ئەسپەکەی لەوێ بەجێ هێشت و هاتە سەر گوێسوانەی کۆشکەکە. پەیژەیەکی لێ بوو و پێیدا هاتە خوارێ. چووە حەوشەیەکەوە لە بەهەشت خۆشتر و خورەمتر بوو. واقی وڕ ما. زۆری بیر لە شێوازی چێکرانی ئەو کۆشکە کردەوە. لەو کۆشکەدا کەسی وەبەر چاو نەهات دوو قسەی لەگەڵ بکا. نەیدەزانی بۆ کام لا بچێ. گێژ ببوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وا چاکە بچمەوە سەرێ لە لای ئەسپەکە لێی بخەوم. کە ڕۆژ بووەوە سوار بم بڕۆمەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە گوتی: 'وا چاکە بچمەوە سەرێ لای ئەسپەکە لێی بخەوم. کە ڕۆژ بووەوە سوار بم برۆمەوە.'

"شازادە ئاوا ڕاوەستابوو بیری دەکردەوە. کە شۆقێکی دیت بەرەو ئەو شوێنە دەهات. کە جوان تێی ڕاما، خزمەتکارێکی دیت شـیرێکی ڕووتی بە دەسـتەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک لە کەنیزەکان و کیژێکی جوان و خۆرئاسا لە نێوەڕاستیاندا. لەو جوانانەی کە شاعیر دەڵێ:

ئەی زولف سونبول و ڕوخسارت وەکوو گوڵ
گیرۆدەیی ئەو سونبول و گوڵەتە دڵ
گوڵێکی ڕەش پشکووتووە لە سەر لێوت
ترووسکەی دێ لەبەر تورتیان کوڵمی سێوت

"ئەو کچەش، کچی پاشای ئەو شارە بوو. باوکی لەبەر خۆشەویستیان ئەو کۆشکەی بۆ ساز کردبوو. هەر کاتێک ئەو کیژە دڵی دەگیرا، لەگەڵ کەنیزەکانی دەهات بۆ ئەو کۆشکە و ڕۆژێک لەوێ دەمـاوە. دوای ئەوە دەگەڕاوە ماڵە بـابی. ئەو ڕۆژەش بە ڕێکەوت کچە لەگەڵ کەنیزەکانی لەو شەوەدا بۆ سەیران و حەسانەوە هاتبوو بۆ ئەو کۆشکە و خەریکی کایە و گەمە بوون. لەو جەنگەیەدا شازادە گەیشتە لایان. زللەیەکی لە باڵبازە[1]کەیان دا و لە وێ بێهۆش کەوت. شیرەکەی لە دەستی دەرهێنا و بەرەو کەنیزەکان هات. هەریەکەی بە لایەکدا بڵاوەیان کرد و هەڵاتن. کچی پاشا کە ڕێکوپێکی و قۆزیی شازادەی دیت، گوتی: 'ڕەنگە تۆ ئەو کەسە بی کە دوێنێ داوای منت کردبوو، بابم ڕازی نەبوو. ئەو پێی وا بوو کە تۆ ناحەزی. بە خودا باوکم تێینەگەیشتووە. تۆ زۆر ڕێکوپێک و قۆزی.' جا ڕاستی کردبوو. [داواکارەکەی کوڕی پاشای هیند بوو کە زۆر ناشیرین بوو.] کچی پاشا پێی وا بوو کە ئەو شازادەیە هەر ئەو کوڕەیە کە دوێنێ خوازبێنی کردبوو. ئیدی بەرەو پیری هات لە باوەشـی گرت و ماچی کرد. کەنیزەکان بانگیان کرد و گوتیان: 'خۆ ئەمە ئەوە نییە کە داوای کردبووی. ئەو زۆر ناحەز و دزێو بوو. ئەم کوڕە زۆر جوانە. ئەوەی خوازبێنی تۆی کرد و باوکت ڕازی نەبوو، بە قامکێکی ئەمە نابێ. هەر بۆ نۆکەری ئەمەش نابێ. بەڵام خانم، ئەو کارەی ئەمە کردوویە کارێکی زۆر گەورەیە.' ئیدی چوون بۆ لای باڵبازەکەیان و وەهۆشیان هێناوە.

---

١. سەرباز و چەکداری میر و پاشایان.

"باڵبازەکە بە شــپرزەییەوە هەســتا لە شــیرەکەی گەڕا، نەیدیتەوە. کەنیزەکان گوتیان: 'ئەوەی تۆی بێهۆش کرد و شــیرەکەی لێ ســتاندی ئێســتا ئەوە لەگەڵ کچی پاشــادا دانیشــتووە.' ئەو باڵبازە پاشــا دایناًبوو پارێزگاری لەو کچە بکا. ئیدی باڵبازەکە چوو بۆ لایان و پەردەکەی لا دا. ســەیری کرد ئەوە کچە لەگەڵ شــازادە خەریکی قســەکردنە. باڵبازەکە بە شازادەی گوت: 'گەورەم، تۆ مرۆڤی یان جندۆکەی؟ شازادە پێی گوت: 'کۆیلەی گلاو، چۆن دەتوانی شــازادە بێنیە ڕیزی جندۆکان؟' دوای ئەوە دەســتی دا شــیر و بە باڵبازەکەی گوت: 'ئەمن زاوای پاشــام. پاشــا کچەکەی خۆی لە من مارە کردووە.' کاتێک باڵبازەکە ئەو قســەیەی لە شــازادە بیســت، گوتی: 'گەورەم، ئەگەر بێتوو ئەتۆ لە تۆرەمەی مرۆ بی، لە تۆ زیاتر کەسی دیکە شیاوی شازداە خانم نییە. ئەتۆ لە هەموو کەس شیاوتری بۆ ئەو.' دوای ئەوە باڵبازەکە بە هاتوهاوار و خۆڕنین و خۆڵوەســەرکردن هەڵات بۆ لای پاشا.

"پاشا کە باڵبازەکەی ئاوا دیت، لێی پرسی: 'ئەو چ بووە؟' باڵبازە گوتی: 'گەورەم پاشا، فریای کچەکەت کەوە. ئەوە جندۆکەیەک لە بیچمی مرۆڤدا خەریکە لەگەڵ کچەکەت قســە دەکا.' کاتێک پاشــا ئەو قســەیەی بیســت، ویســتی باڵبازەکە بکوژێ، پێی گوت: 'ئەوە بۆ کەمتەرخەمیت لە ئاست کچەکەمدا کردووە، تا ئەوەی بەسەر بێ؟' ئیدی پاشا هەستا چوو بۆ ئەو کۆشکەی کچەکەی لێ بوو. کە گەیشتە کۆشک، لە کەنیزەکانی پرسی: 'چی بەسەر کچەکەم هاتووە؟' گوتیان: 'سەروەرمان پاشا، ئێمە هەموومان پێکەوە دانیشتبووین کە ئەو کوڕە قۆز و ڕوومانگە بە شیرەوە لێمان وەژوور کەوت و گوتی: 'پاشــا کچەکەی خۆی لە من مارە کردووە.' ئیدی ئێمە ئاگامان لە هیچی دیکە نییە و ئەو کوڕەش ناناسین کە مرۆیە یان جندۆکە. بەڵام پاشــا، ئەو کوڕە زۆر داوێنپاک و بە ئەدەبە و هیچ کارێکی ناحەزی نەکردووە.'

"کە پاشا ئەو قسەیەی بیست، ڕقەکەی نیشتەوە و بە ئارامی پەردەکەی لا دا. دیتی ئەوە کوڕە لەگەڵ کچەکەی دانیشــتووە و خەریکی قســەکردنن. ئەو کوڕەش لەوپەڕی جوانی و خوێنشیرینیدایە. پاشــا نەیتوانی بەســەر خۆیدا زاڵ بێ و هەر بۆیە پەردەکەی لا دا و وەک دێو پەلاماری دانێ. کە شازادە چاوی پێی کەوت، لە کچەی پرسی: 'ئەوە بابتە؟' کچە گوتی: 'بەڵێ.' "

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتــایی پێ هــات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەشکۆ، کاتێک شازادە، پاشای دیت بە شیری ڕووتەوە هێرشی بۆ کردن، لە کچەی پرسی: 'ئەوە بابتە؟' گوتی: 'بەڵێ.' ئیدی شازادە هەستا و دەستی دا شیرەکەی و بە سەریدا گوڕاند. پاشا زانی لە خۆی ئازاترە. شیرەکەی لە کالانەکەی ناوە و لەسەرەخۆ گوتی: 'کوڕە، تۆ لە وەچەی مرۆڤی یان جندۆکە؟' شازادە گوتی: 'ئەگەر لەبەر حورمەتی تۆ و کچەکەت نەبایە هەر ئە لێرە دەمکوشتی. بۆ پێتان وایە من جندۆکەم؟ لە کاتێکدا من کوڕی پاشایەکم ئەگەر بیهەوێ تەواوی وڵات و دەسەڵاتت تێکەوە دەپێچێ و خاکت بە توورەکە دەبا.'

"کە پاشا گوتەکەی ئەوی بیسیت، ترسی ڕێ نیشت و پێی گوت: 'ئەگەر تۆ شازادەی، چۆناوچۆن هاتوویە کۆشکی منەوە و خۆت گەیاندووەتە کچەکەی من؟ بۆ بە درۆ گوتووتە لێم مارە کراوە؟ ئەمن زۆر پاشا و پاشازادەم لە سەر ئەو کچەم کوشتووە هەر لەبەر ئەوەی هاتوون بۆ خوازبێنی کچەکەم. ئەگەر ئێستا فەرمان بدەم کۆیلە و غوڵامت وەسەر گەڕێ لێرەدا بتکوژن، کێ فریات دەکەوێ؟'

"کاتێک شازادە ئەو قسانەی بیست، بە پاشای گوت: 'ئەمن سەرم لە تۆ و لەو هەموو گەوجییەت سووڕ ماوە. کوا کچی تۆ مێردی لە من باشتر و چاکتری وەگیر دەکەوێ؟! مەگەر تۆ کەست دیوە لە من ئازا و چالاکتر بێ؟!' گوتی: 'نا وەڵڵا نەمدیوە. بەڵام ئەمن پێم خۆشە ئەتۆ بە ئاشکرا بێیە خوازبێنی و ئەمنیش لێت مارە کەم، چونکە لەنێو پاشاکاندا بە بیانووی بێغیرەتی ئابڕووم دەچێتە سەر لکی دارێ.' شازادە پێی گوت: 'قسەکەت جوانە، بەڵام، پاشا، ئەگەر کۆیلە و پیاوەکانی تۆ تێم ئاڵێن و وەک تۆ دەڵێی بتەوێت بمکوژن، دیسان ئابڕووی خۆت دەبەی. هێندێک خەڵک باوەڕ بە قسەکەت دەکەن و تاقمێکیش باوەڕ ناکەن. چار هەر ئەوەیە، چۆنت پێ دەڵێم ئاوا بکەی.' پاشا گوتی: 'بیڵێ بزانم دەڵێی چی.'

"شازادە گوتی: 'لەو دوو کارە یەکێکیان بکە: یان ئەوەتا پێکەوە ململانێ دەکەین و هەرکەس توانی ئەوەی دیکە بەزێنێ و بیکوژێ، ئەوە دەسەڵات شایانی ئەوە. یان دەنا ئەوشەو ئەمن لێرە ڕاگرە، بەیانی سوپام لەسەر کە، بەڵام ئەژماری سوپاکەتم پێ بڵێ.' پاشا گوتی: 'سوپای من چلهەزار سوارە. جگە لە کۆیلەکانم کە تایبەتی خۆمن و ئەوانیش چلهەزار کەسن.' شازادە گوتی: 'تاوهەڵاتی بەیانی ئەتۆ سوپا و غوڵامەکانت بێنە بۆ شەڕی من. پێشیان بڵێ ئەو کوڕە خوازبێنی لە کچەکەم کردووە و قەراری لەگەڵ کردووم لەگەڵ تەواوی ئێوە شەڕ بکا.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشــكۆ، شــازادە بە پاشــای گوت: 'پێیان بڵێ ئەو كوڕە دەڵێ بە تاقی تەنێ دەرەقەتی هەموو ســـپاكە دێم و شـــكســـتیان دەدەم. هەر بۆیە لێم گەڕێ با لەگەڵیان ڕووبەڕوو بمەوە. ئەگەر ئەوان من بكوژن، ئەوە نهێنی تۆ دەپارێزرێ. ئەگەر من بەســـەر ئەواندا زاڵ بم، ئەوە دەیسەلمێنم كە شایانی ئەوەم ببمە زاوات.' كە پاشا گوێی لەو قسانە بوو، قســەكەی پەســەند كرد و زۆر گەورەی هاتە بەرچاو. ئیدی دانیشــت و دەســتیان بە قســـەكرد و پاشـــا بە دزییەوە باڵبازەكەی تێگەیاند بچێ بە وەزیر بڵێ ســـوپا دەنگ دا و تەیاری كا.

"ئیدی باڵبازەكە چوو بە وەزیری گوت كە پاشـــا فەرمانێكی ئاوای داوە. لەڕێوە وەزیریش فەرماندەی بانگ كرد و فەرمانی پێ كرد خۆیان تەیار كەن بۆ شەڕ و سوار بن. ئەوان لەوێ خەریكی خۆ سازكردن بوون ...

"پاشــاش لەوێ شــازادەی لە قســە گرتبوو هەتا تاو هەڵات. ئینجا پاشــا گەڕاوە ســەر تەخت و ســـوپای دەنگ دا. ئەســـپێكی تایبەتی یەكێك لە گەورەكانی دەرباریان بۆ هێنا بە زینی ڕازاوەوە. شازادە بە پاشای گوت: 'هەتا من سوپا نەبینم و سەنگ و سووژنی نەكەم، سوار نابم.' پاشا پێی گوت: 'چۆنت پێخۆشە وا بكە.' شازادە چوو هەتا گەیشتە گۆڕەپانەكە و چاوێكی لە ســوپاكە كرد، ڕادەی پڕایی ســوپاكەی زانی. ئینجا پاشــا بە ســوپاكەی گوت: 'ئەو كوڕە داوای كچەكەی من دەكا. ئەمن كەســـی هێندە ڕێكوپێك و قۆزم نەدیوە. ئەو لەســـەر ئەو باوەڕەیە بە تاقی تەنیا بەســـەر هەمووی ئێوەدا زاڵ دەبێ. دەڵێ ئەگەر ئێوە ســەدهەزار كەس بن، بۆ ئەو كێشــەیەک نییە و پێتان دەوێرێ. ئێســتا ئێوە هێرشــی بكەنە ســەر و بەســەری ڕمب و زەرگەكانتانییەوەی بكەن، چونكە ئەو دەســتی داوەتە بەردێكی زۆر قورس.'

"دوای ئەوە پاشـــا بە شـــازادەی گوت: 'ئەوە گۆ و ئەوەش مەیدان، بزانم چ دەكەی؟ ئەوڕۆ ڕۆژی تاقیكارییە.' شازادە گوتی: 'پاشا، ئەوە مەرجی گەورەیی نییە. ئەمن چۆن ئاوا بە پێیان لەگەڵ ئەو هەموو ســـوپایە بەربەرەكانی بكەم؟!' پاشـــا گوتی: 'پێم گوتوون و، باشـــترین ئەســـپی خۆمانیان بۆ هێناوی. یان هەر ئەســـپێك بۆ خۆت پێت باشـــە بچووە هەڵبژێرە.' شازادە گوتی: 'ئەمن ئەو ئەسپانەی ئێوەم پێ باش نییە. بە سواری ئەسپی خۆم نەبێ شــەڕ ناكەم—ئەو ئەسپەی بە سـواری ئەو هاتم بۆ ئێرە.' پاشـا گوتی: 'ئەسـپی تۆ لەكوێیە؟' شازادە گوتی: 'ئەسپەكەم لە سەربانی كۆشكە.' پاشا كە گوێی لەو قسەیە بوو، گوتی: 'ئەوە بە شـێتمان دەزانی، ئەســپ چۆن دەچێتە ســەربان؟' پاشـــا بە پەردەدار و

شــتەکەی گوت دا بچنە ســەربان ئەوەی لێیەتی بیهێننە خوارێ. دەوروبەریانی پاشــا ئەو قســەیەی شــازادەیان پێ ســەیر بوو. لە بەر خۆیانەوە دەیانگوت: 'ئاخر ئەســپ چۆن بە پەیژەدا دێتە خوارێ؟!' پیاوەکانی پاشــا چوونە ســەربان. ســەیریان کرد ئەســپێک لەوێ وەستاوە هەتا ئێستا ئەسپی هێندە جوانیان نەدیبوو. ئەوجار چوونە پێشێ، سەیریان کرد ئەو ئەســپە لە شــفرە و ئاونووس چێ کراوە. کە پەردەدارەکان ئەوەیان دیت، چاوێکیان لە یەک کرد و پێکەنین. گوتیان: 'ئەو کوڕە هەر دەڵێی شــێتە. چۆن بەو ئەســـپە ئەو هەموو هەڕەشە و گوڕەشەیە دەکا؟! بەڵام هەرچی هەیە ئەوەندەی پێ ناچێ هەموو شتێک ئاشکرا دەبێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، پەردەدارەکانی پاشـــا گوتیان: 'هەر دەڵێی ئەو کوڕە شـــێتە یان نهێنییەکی گەورە لەو کارەدا هەیە کە ئێمە نازانین چییە.' ئیدی ئەسـپەکەیان هەڵگرت و بە هەر جۆرێک بوو ئەسپەکەیان هێنا لەبەردەمی پاشـا دایاننا. خەڵک هاتن دەوریان دابوو و چاویان لێ دەکرد. سـەریان لە جوانی و تایبەتمەندی و زین و لغاوی سـوورِ مابوو. پاشـا زۆری پێدا هەڵگوت و پێی باش بوو. ئینجا بە شـازادەی گوت: 'ئەسپەکە ئەوەیە؟' شـازادە گوتی: 'بەڵێ. جا بزانە کاری چۆنی پێوە دەبینی.' پاشـا گوتی: 'ها ئەوە ئەسپەکەت و سوار بە.' شازادە گوتی: 'ئەمن سواری نابم هەتا سوپاکە لێم دوور نەکەونەوە.'

"ئیدی پاشـا بە سـوپاکەی گوت: 'دەوری چۆڵ کەن و هەتا مەودای تیرهاوێژێک دوور کەونەوە.' شازادە گوتی: 'پاشا! ئەمن ئەوە سواری ئەسپەکەم دەبم و هێرش دەکەمە سەر سـوپاکەت و لە ڕاست و چەپدا هەڵیان دەبڕم و زراویان دەبەم.' پاشـا گوتی: 'ئەتۆ چت لە دەست دێ بیکە و، ئەوانیش ئەوەی لە دەستیان بێ دەست ناگێڕنەوە.'

"شـازادە سـواری ئەسـپەکەی بوو. سـوپایش ڕیزیان بەسـتبوو. یەک دەیگوت: 'هەر کە ئەو کوڕە بێتە پێشـێ، بەسـەری ڕمبەوەی دەکەم.' یەکی دی دەیگوت: 'کوشـتنی ئەو کوڕە جوانچـاکە کـارێکی دژوارە.' ئەوی دی دەیگوت: 'ئەوە بە کەس نـاکوژرێ.' یەک دەیگوت: 'ئەوە لە خۆی ڕادەبینێ. بە خودا دەردێکمان دەداتێ بە کەس نەدرابێ.' شـــازادە ســـواری ئەسـپەکە بوو. ئەو شـتەی دەبوو بیبزێوێ تا وە حەوا کەوێ، بزاوتی. سـوپاکە هەموو چاویان لەو بڕیبوو. ئەسـپ وە جووڵەجووڵ کەوت. وەک ئەسـپی دیکە خۆی کۆ کردەوە، جیفرکێ لە خۆی دا و وە حەوا کەوت. پاشا هاواری لێ هەستا فریا کەون ئەو کوڕە بگرن هەتا هیچی لێ نەهاتووە. لەو کاتەدا وەزیر گوتی: 'پاشـــا کێ دەســـتی بە مەل و باڵندە ڕادەگا؟ ئەو کوڕە خۆی ئەسـپێکی سـەرکێش بوو. خودا ڕزگاری کردی لە دەسـتی. بڕۆ سپاسی خودا بکە.' پاشا کە شازادەی ئاوا دیت، گەڕاوە بۆ کۆشک و چووە لای کچەکەی. ئەوەی بە شـازادەوەی دیت، بۆی گێڕاوە. کچی پاشـا خەم و پەژارە دایگرت و لە تاوان نەخۆشی بەرۆکی گرت و کەوتە جێوە.

"پاشـا کە کچەکەی ئاوا دیت، لە باوەشـی گرت و چاوی ماچ کرد و گوتی: 'کچەکەم، سپاسی خودا بکە کە ئێمەی لە دەست ئەو جادوبازە ڕزگار کرد.' پاشا لەو جۆرە قسانەی بۆ دەکرد و کچەش هەر گوێی لەو نەبوو. بەردەوام دەگریا و ئەو شێعرەی گوت:

ئەگەرئەمجارە بێتەوە، یاری جوان و بێبەزەیی
گوڵ لە دڕوو، دڕوو لە قاچ، قاچیشم لە قوڕ دەردێنی
هێندێک لە نزیکانی من دژی عەقڵ و باوەڕی من
دایم بەرۆکمیان گرتووە، بۆ وەی بەر دەم بەرۆکی من
دەزانی کەسێک زانا بێ، سەبووری لە مەجنوون ناوێ
وشتر لە شوێنێک یخ دەدا کە لەیلییەکەی ڕێی تێ کەوێ

"کچە لە بەر خۆیەوە گوتی: 'قەسەم بە خودا! نە هیچ دەخۆم و نە هیچ دەخۆمەوە هەتا خودا ئێمە پێک نەگەیەنێتەوە.' پاشاش زۆر ناڕەحەت بوو. خەمی کچەکەی بوو. هەرچەندی دڵخۆشی کچەکەی دەداوە، زیاتر ئۆگر و شەیدای کوڕە دەبوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە هەر دەهات و خۆشەویستی و ئەڤینەکەی سەری دەکرد. پاشا و کچە با لێرە بن و سەرێکی شازادە بدەینەوە.

"شازادە ناوی ئەو شارەی پاشای پرسیبوو، ناوی ئەو شارە سەنعای یەمەن بوو. که شازادە وە حەوا کەوت، لە رێگە پەلەی کرد بۆ ئەوەی زوو بگاتەوە ماڵە بابی. هەر که گەیشتەوە شارەکەی خۆیان، چوو لە سەربانی ماڵی خۆیان نیشتەوە. ئەسپەکەی لە سەربانی کۆشک بەجێ هێشت و بۆخۆی چووە لای بابی. سەیری کرد ئەوە باوکی لە تاوی ئەو مات و مەلوول دانیشتووە. هەر که پاشا چاوی بە کوڕەکەی کەوت، هەستا و باوەشی پێدا کرد. لە خۆشیان گەشاوە. دوای ماوەیەک دانیشتن، کوڕە هەواڵی ئەو زانایەی پرسی که ئەسپەکەی ساز کردبوو. کەچی باوکی گوتی: 'خودا چاکەی بۆ نەکا وا ئەو بووە هۆی دوورخستنەوەی تۆ لە من؛ ئێستا لە بەندیخانەیە.' شازادە تکای کرد خێرا ئازادی کەن. دەستوبرد چوون زاناکەیان لە بەند دەرکرد و هێنایانە هەنتەشی پاشا و شازادە. پاشا که زانی کارێکی چەندە گەورەی کردووە، خەڵاتێکی باشی کرد. بەڵام کچەکەی نەدایە. حەکیمەکە توورە بوو، زانی که شازادە تایبەتمەندی و لێهاتووییەکانی ئەسپەکەی بۆ دەرکەوتووە. دوای ئەوە پاشا بە شازادەی گوت: 'لەمەو بەدوا سواری ئەو ئەسپە مەبە، چونکە تۆ لە هەموو خووخدەی شارەزا نیی و دەترسم شتێکت بەسەر بێنێ.'

"شازادە بەسەرهاتی کچی پاشای سەنعا و ئەو رووداوانەی بۆی هاتبووە پێشی هەمووی بۆ گێڕاوە. پاشا گوتی: 'ئەگەر پاشای سەنعا بیویستبا تۆ بکوژێ، هەر لەوێ دەیکوشتی، بەڵام تۆ ئەجەلەت نەهاتووە. دوای ئەوە کەڵکەڵەی کچی پاشای سەنعا کەوتە گیانی و حەجمینی لە شازادە بڕی. هەستا چوو سواری ئەسپەکەی بوو. ئامێری ئاژووتنی بزاوت. ئەسپ کەوتە جووڵە و وە حەوا کەوت. که ڕۆژ بووەوە، پاشا چوو شازادە بەسەر کاتەوە، سەیری کرد لە شوێنی خۆی نییە. چووە سەربان و چاوێکی لە حەوا کرد. تەماشای کرد ئەوە کوڕەکەی بە حەوادا دەڕوا. پەشیمان بووە و خۆی سەرکۆنە کرد که بۆچی ئەسپەکەی لێ نەستاندووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو جار بێتەوە ئەسپەکەی لێ دەستێنم. دەنا بەو ئەسپە شتێک بەسەر خۆی دێنێ.' ئینجا لە تاوان دەستی کرد بە گریان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە

# که شەوی سێسەد و شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا لە تاوی کوڕەکەی ناڕەحەت بوو و دەستی کرد بە گریان.

"شـازادەش بە حەوادا چووەوە شـاری سـەنعا. ئەو شـوێنەی کە جاری پێشـوو لێی نیشتبووەوە. لەجێوە ئەسپەکەی لەوێ بەجێ هێشت و بۆخۆی چووە شوێنی کچی پاشای سەنعا. سەیری کرد کچی پاشا و کەنیز و قەرەواشەکانی لەو شوێنەی جاری دیکە نەبوون. لە تاوان دیو بە دیوی کۆشکەکە گەڕا هەتا سەیری کرد ئەوە کچی پاشا لە دیوێکدا لە جێدا کەوتووە و کەنیز و شتەکەشی لەدەوری کۆ بوونەوە. شازادە چووە ژوورێ و سڵاوی لێ کرد. کچە هەر کە گوێی لە دەنگی شازادە بوو لە جێگاکەی ڕاستەوە بوو. کوڕەی لە ئامێز گرت و دەمی بە دەمییەوە نا. شازادە گوتی: 'خانمە جوانەکەم، نازانی ئەو ماوە لە تاوی تۆ چم لێ هات!' کچەش گوتی: 'ئەمن لە تۆم خراپتر لێ بەسەر هات. ئەگەر ئێستا نەهاتبایەی، حەتمەن گیانم دەر دەچوو.' شـازادە گوتی: 'خاتوون، ئاگات لێ بوو بابت چی لە من کرد؟ بە خودا ئەگەر لەبەر تۆ نەبایە، هەر لەوێ دەمکوشت. بەڵام لەبەر دڵی تۆ ئەویشـم خۆش دەوێ و قەت نامهەوێ ئازاری بدەم.'

"کچە بە شـازادەی گوت: 'ئەگەر ئەو جار بەجێم بهێڵی، دڵم دەتۆقێ.' شـازادە گوتی: 'ئەگەر تۆ بە قسـەم بکەی، کارەکان ئاسـان دەبنەوە.' کچە گوتی: 'ئەو جار لە قسـەت دەرناچم، چونکە بەبێ تۆ هەڵناکەم.' شـازادە گوتی: 'دەبێ لەگەڵم بێی بڕۆین بۆ شـارەکەی ئێمە.' شـازادە خانم گوتی: 'بە گیان و دڵ لەگەڵت دێم.' شـازادە کە گوێی لەو قسـەیە بوو، کەیفی ساز بوو، بەڵێنی پێدا بەختەوەری بکا. دوای ئەوە چوونە سەربانی کۆشک. شازادە سـواری ئەسپەکەی بوو. کچی پاشـاشـی لە پاشکۆی خۆی سـوار کرد و توند بە خۆیەوە بەسـتییەوە. ئەو شـتەی شـانی ڕاسـتی ئەسـپەکەی بزاوت. ئەسپەکە ئەوانی هەڵگرت و وە حەوا کەوت. لەو جەنگەیەدا کەنیز و قەرەواشەکان دەستیان کرد بە هاتوهاوار و شینوڕۆ. دایک و باوکی کچەیان ئاگادار کردەوە. ئەوانیش هاتنە سەربانی کۆشک و چاویان لە حەوا بڕی. لە دوور چاویان بە ئەسـپە ئاونووسـەکە کەوت کە لە ئاسـماندا دەفڕی. پاشـا یەکبەخۆی هەرای لێ کرد: 'شـازادە بیکە بۆ خاتری خودا بەزەییت پێماندا بێ و لێکمان دامەبڕە!'

"شازادە وای زانی کچە پەشیمان بووەتەوە بۆ لای دایک و بابی و گوتی: 'ئەگەر دەزانی پەشـیمان بوویەتەوە، با بتبەمەوە لای دایک و بابت؟' پەریزادە وڵامی داوە: 'نە بە خودا، ئەمن حەز دەکەم تۆ لە کوێ بی، منیش لەوێ بم، چونکە لە دایک و بابم خۆشترم دەوێی.'

"شازادە کە ئەو قسەیەی بیست، زۆری کەوتە بەر دڵی و ئەوجار زۆر بە هێمنی ئەسپی

دەئاژۆت بۆ ئەوەی کچەکە نارەحەت نەبێ. ئیدی هەر ئاوا بە ئارامی دەڕۆیشت هەتا کانی و ئاو و مێرگێکی سەرسەوزیان لێ وەدیار کەوت. لەوێ نیشتنەوە نان و شتیان خوارد و کەمێکیان پشوو دا و سوار بوونەوە. وە حەوا کەوتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە شارەکەی بابی شازادە. شازادە کەیفی ساز و دڵی خۆش بوو. ویستی ئەو وڵاتە پیشانی شازادە بدا و تێیگەیێنێ کە وڵاتی بابی ئەو لە وڵاتی بابی کچە گەورەتر و بەربڵاوترە. هەر بۆیە لە هێندێک لەو باخانەی کە بابی بۆ حەسانەوە و دڵخۆشی خۆی درووستی کردبوون. دەهاتنە خوارێ و تێیدا دەگەڕان و پیشانی دەدا. ئەوی بردە کۆشکەکەی بابی و ئەسپەکەشی لەوێ ڕاگرت و بە کچەی سپارد. پێی گوت: 'لێرە بە هەتا کەسێک ڕادەسپێرمە لات. ئەمن دەچمە لای بابم. هەتا کۆشکێکی تایبەتت بۆ چێ بکا. بۆ ئەوەی پیشانت بدەم من کێم.' کچە دڵخۆش بوو، پێی گوت: 'چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە خانم گوتی: 'چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' شازادە خانم بیری دەکردەوە کە بڵێ بە چ داب و دەستوور و شکۆیەکەوە بچمە نێو شار. بە جۆرێک کە شایانی ئەو بێ. وا بوو شازادە کچەی لەوێ بەجێ هێشت و بۆخۆی چوو بۆ لای باوکی. باوکی کاتێک ئەوی دیت، زۆر خۆشحاڵ بوو. ئینجا شازادە بە بابی گوت: 'بابە، کچی پاشای سەنعام هێناوە. ئەوە لە یەکێک لە باخەکانی دەرەوەی شار دامناوە و هاتم تۆ ئاگادار بکەمەوە بۆ ئەوەی دەستەی سواران ساز کەی و بێی چاوت پێی بکەوێ هەتا شکۆ و گەورەیی تۆی بۆ دەرکەوێ.'

"پاشا دەمودەست فەرمانی دا شار برازێننەوە. گەورە گەورەکان و سوپای کۆ کردەوە. شوێنێکی پاشایانەی بۆ کچە ئامادە کرد کە کەنیزی هیندی و ڕۆمی و حەبەشیی لێ دانابوو. پاشان چوونە ئەو کۆشکەی کە کچەی لێ بوو. کە چوون، نە ئەسپەکە لەوێ مابوو نە کچە.

"ئیدی بە چەپۆک بەسەر خۆیدا دا و بەنێو باخ و دەوری باخدا هەڵسووڕا، بەڵام کچەی نەدیتەوە. ئیدی لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو کچە چۆناوچۆن شارەزای تایبەتمەندیی ئەو ئەسپە بوو؟ خۆ ئەمن هیچم پیشان نەداوە؟! ڕەنگیشە ئەو کابرا زانایەی درووستی کردووە، هاتبێ و بە تۆڵەی ئەو خراپانەی بابم لەگەڵی کردووە، ڕفاندوونی.' دوای ئەوە شازادە باخەوانەکەی بانگ کرد و لێی پرسی: 'ئەرێ کەست دیوە بێرەدا بێت یان بچێتە ناو باخەکە؟' ئەویش گوتی: 'ئەمن جگە لە زانای فارس کەسم نەدیوە بچێتە ناو باخەکە. ئەویش چوو گیای دەرمانی بڕنێتەوە بۆ دەرمان.' کاتێک شازادە قسەکەی ئەوی بیست، زانی زاناکە کچەکەی بردووە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە که ئەو قسەیەی بیست، زانی زاناکه کچەکەی بردووە.

کاتێک که شازادە کچەی لە باخدا بەجێ هێشت و بۆخۆی چوو بۆ لای بابی، بە ڕێکەوت زانای فارس بە لای کۆشکدا ڕۆیشت و ئەسپەکەی لەوێ دیت. بە دیتنی زۆر خۆشحاڵ بوو. چاوێکی بە تەواوی گیانیدا گێڕا، زانی ساخ و سەلیمە، ویستی سواری بێ و بڕوا بە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەبێ کەسێکی لەگەڵ بووبێ و لێرە بەجێی هێشتبێ.' ئیدی چووە نێو کۆشکەکە سەیری کرد ئەوە کچێک لەوێ دانیشتووە دەڵێی ڕۆژە دەدرەوشێ. چاوی بە کچەکە کرد، زانی شازادە ئەو کچەی هێناوە و لە کۆشکدا داناوە و بۆخۆی چووە بۆ نێو شار. ئیدی زاناکە چووە پێشێ و کڕنۆشی برد.

"کیژی چاوکەژاڵ سەری هەڵێنا و چاوی پێی کەوت. سەیری کرد. زۆر ناحەز و دزێوی هاتە بەرچاو. لێی پرسی: 'ئەتۆ کێی؟' کابرا گوتی: 'خانمەکەم، ئەمن نێردراوی شازادەم فەرمانی داوە ئەتۆ هەڵگرم و بتبەم بۆ شوێنێکی دیکە کە لە شار نزیکترە.' کچە کە ئەوەی بیست، گوتی: 'ئەی شازادە لەکوێیە؟' زاناکە گوتی: 'ئەوە لە شارە لە لای باوکییەتی و هەر بینا ئەویش هات بۆ لای تۆ.' کچە لێی پرسی: 'ئەوە شازادە لە تۆ زیاتر کەسی دیکەی وەگیر نەدەکەوت بینێرێ؟' زاناکە بە قسەکەی پێکەنی و گوتی: 'ئەوە شازادە منی هەر لەبەر ناحەزیان هەڵبژارد، چونکە هێندەی تۆ خۆش دەوێ، دڵی لە کەس نەدەحەساوە. دەنا شازادە چی زۆرە؟ کۆیلە و خزمەتکار و بەردەست. ئەوەندەی هەیە لە ژمار نایەن.' کچە باوەڕی بەو قسەیە کرد و هەستا ڕەگەڵی کەوت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە باوەڕی بەو قسەیە کرد و هەستا ڕەگەڵی کەوت. دەستی دا دەستی و گوتی: 'چیت هێناوە سوار بم؟' داناکە گوتی: 'خانم، هەر ئەو ئەسپەی کە پێی هاتی، سواری ئەو بە.' کچە گوتی: 'ئەمن بە تەنیا ناتوانم سواری بم.' زاناکە بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'ئەمنیش لەگەڵت سوار دەبم.' ئیدی زانا سوار بوو. ئەویشی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد و توند لە خۆی شەتەک دا. ئیدی کچە نەیدەزانی چی لەبن سەردایە. زانا ئامێرەکەی شانی ڕاستی ئەسپەکەی جووڵاندەوە و ئەسپ وە حەوا کەوت. ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا لە شار نەدیو بوو. کچە گوتی: 'ئەو شوێنەی شازادە گوتی، کوێیە؟' زانا گوتی: 'خودا شازادە لەنێو بەرێ، چونکە پیس و گڵاوترین پیاوی سەر گۆی زەوییە.' کچە گوتی: 'چارەڕەش، چۆن بێفەرمانیی خاوەنەکەت دەکەی؟' زانا گوتی: 'ئەو خاوەنی من نییە. مەگەر تۆ من ناناسی؟' کچە گوتی: 'ناوەڵڵا، خۆتم پێ بناسێنە.' زانا گوتی: 'ئەمن ئەو قسەیەم هەر بە فێڵ کرد. بۆیە گوتم شازادە ناردوومی، هەتا تۆ لەگەڵم بێی و ئاور لە دڵی شازادە بەردەم. ئەمن لە تاوی ئەو ئەسپە شێت و شەیدا بووم. ئەو ئەسپە من دروستم کردووە و شازادە لێی ئەستاندم. کە سپاس بۆ خودا ئەوە ئەسپەکەش و ئەتۆشم لێ ئەستاندەوە. جا لێ گەڕێ با ئەو لە تاوان شێت بێ وا ئەو منی ئاوا لێ کرد. ئیدی تازە چاوی بە تۆ ناکەوێتەوە. ئەتۆش خۆت ناڕەحەت مەکە، دڵنیا بە زۆر لەو بۆ تۆ چاکتر و بە کەڵکتر دەبم.' کچە کاتێک ئەوەی بیست، کەوتە لەخۆدان و ڕوورنین و شین و واوەیلا کە نە بە خۆشەویستەکەم گەیشتم و نە گەڕامەوە لای دایک و بابم. کچە هەر ئاوای دەکرد و زاناش هەر ئەسپی تین دەدا هەتا گەیشتنە وڵاتی ڕۆم. لەوێ لە دەشتێکی خۆش و سەرسەوز دابەزین. ئەو مێرگە لە شار نیزیک بوو. ئەو شارەش پاشایەکی پایەبەرزی هەبوو.

"ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت پاشای ئەو شارە بۆ ڕاو هاتە ئەو مێرگ و سەوزەڵانە. چاوی بە زانا کەوت کە لەگەڵ کچە لە پەنا ئەسپەکە ڕاوەستابوون. پیاوەکانی پاشا هاتن دەوریان دان و زانا و کچەیان گرتن. ئەسپە ئاونووسەکەشیان هەڵگرت و بردیانن بۆ لای پاشا. پاشا کە چاوی بە ناحەزی و ناشیرینیی زاناکە کەوت و کچەشی بەو هەمووە جوانییەوە دیت، لە کچەی پرسی: 'کیژە جوانەکە، ئەو کابرایە چی تۆیە؟' زانا خێرا وەڵامی داوە، گوتی: 'ئەوە خێزانی منە و ئامۆزاشمە.' کچە گوتی: 'پاشا، درۆ دەکا. بە خودا ئەو مێردی من نییە و ناشیناسم. ئەو بە فێڵ منی ڕفاندووە.' کە پاشا قسەکانی کچەی بیست، گوتی: 'دا تێی هەڵدەن.' ئەوەندەیان لە زاناکە هەڵدا خەریک بوو بمرێ. دوای ئەوە فەرمانی دا بیبەن لەنێو شار زیندانی بکەن. کچە و ئەسپەکەشی لەگەڵ خۆی هێناوە. بەڵام نەیدەزانی چۆن کار بە

ئەسپەکە بکا. زانا و کچە ئاوایان لێ بەسەر هات.

"شازادە دوای ئەو ڕووداوە کە تازە دەستی لە کچە شوشت و زانی نەماوە، خۆی بۆ ساز کرد، بکەوێتە پێ‌وشوێنی. هەستا ڕووی لە شاران کرد و هەر لێرە و لەوێ پرسیاری لە ئەسپە ئاونووسەکە دەکرد. بەشکو بەودا بیانبینێتەوە و سۆراخیان بکا. بەڵام هیچ سەروشوێنیان دیار نەبوو. دوای ئەوە چووە شاری سەنعا کە شاری ماڵە بابی کچە بوو. لەوێ کەوتە پێ‌وشوێنی کچە. هەواڵێکی نەبوو. سەیری کرد، بابی کچە تەواو تێک چووە. لەوێش ڕۆیشت و ڕووی لە ولاتی ڕۆم کرد. هەر دەڕۆیشت و پرسیار و سۆراخی دەکردن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە سەری خۆی هەڵگرت و ڕووی لە وڵاتی ڕۆم کرد. هەر ڕۆیشت و پرسیاری کرد. وا بوو ڕێی کەوتە کاروانسەرایەک. چەند بازرگان لەوێ دانیشتبوون پێکەوە قسەیان دەکرد. چوو لە نزیک ئەوان دانیشت. گوێی لێ بوو یەکیان گوتی: 'شتێکی سەیرم دیوە!' ئەوانی دی لێیان پرسی: 'چیت دیوە؟' گوتی: 'لە فلان شار بووم، خەڵک دەیانگوت: 'ڕۆژێک پاشا چووەتە دەرەوەی شار لە مێرگ و سەوزەڵانییەک چاوی بە پیاوێک کەوتووە کە لەگەڵ کچێک لە پەنا ئەسپێکی ئاونووس ڕاوەستاون. کابرا زۆر زۆر ناحەز و کچە زۆر زۆر جوان بووە. ئەسپەکەس دەسکارییەکی زۆر سەیروسەمەرە بووە.' ئەوانی دیکە لەو پیاوەیان پرسی: 'ئەی پاشا چی کرد و چی پێ گوتن؟' بازرگانەکە گوتی: 'پاشا، کابرا ناحەزەکەی بانگ کرد و لێی پرسی: 'ئەو کچە کێیە؟' ئەویش گوتی: 'ئەوە ئامۆزا و ژنی منە.' بەڵام کیژە وە درۆی خستەوە و گوتی: 'ئەو پیاوە هیچی من نییە و بە فێڵ منی ڕفاندووە.' پاشاش کچەکەی لێ ئەستاندووە و کابرای لە بەند کردووە. ئیدی نازانم چییان لە ئەسپەکەش کردووە.'

"شازادە چووە پێش و زۆر بە ڕێز و لەسەرخۆ ناوی شار و پاشاکەی لێ پرسی. لە زەینی خۆیدا ڕایگرت. ئەو شەوەی بە دڵخۆشی تێپەڕاند. کە ڕۆژ بووەوە، هەستا لە شار وەدەر کەوت و بەرەو ئەو شارە ڕۆیشت کە کچەکە و ئەسپەکەی لێ بوو. ڕۆیشت، ماوەیەک بە ڕێوە بوو گەیشتە ئەو شارەی کە بازرگانەکە پێی گوتبوو. کاتێک ویستی بچێتە ناو شارەوە، دەرکەوانەکان گرتیان و بردیانە لای پاشا هەتا پاشا لێی بکۆڵێتەوە بزانێ بۆ دەچێتە ئەو شارە. ئەگەر پیشەیەک دەزانێ، بزانن چی لە دەست دێ. پاشا ئەو خووەی هەبوو لەو شتانەی دەکۆڵییەوە. بەڵام چونکە درەنگانێک گەیشتبووە شار و کاتی دیمانەتی پاشا تەواو ببوو، ناچار بردیانە بەندیخانە. لەوێ دەبووایە بیخەنە بەندەوە، بەڵام هێندە جوان و ڕووگەش و خوێنشیرین و لەبەردڵان بوو، بەندیوانەکان پێیان حەیف بوو بیخەنە بەندەوە. هەر بۆیە لە لای خۆیان ڕایانگرت.

"کاتێک خواردنی شێویان هێنا، شازادە لەگەڵ ئەوان دانیشت و خواردنەکەی خوارد. پاشان دەستیان کرد بە قسەکردن و لە شازادەیان پرسی: 'ئەتۆ لە کام شارەوە هاتووی؟' گوتی: 'لە وڵاتی خۆراسانەوە هاتووم.' بەندیوانەکان بە قسەکەی پێکەنین و پێیان گوت: 'لاوی خوراسانی، ئێمە زۆر شتمان لە بارەی خەڵکی خۆراسانەوە بیستووە. ئێستا کەسێکی پارسی لە لای ئێمەیە کە هەتا ئێستا کەس مرۆڤی هێندە درۆزنی نەدیوە.' یەکی دیکەیان گوتی: 'کەس هی ئەوەندە ناحەز و ناشیرینیشی نەدیوە.' شازادە لێی پرسین: 'ئێوە چ

درۆیەکتان پێوە دیوە؟' گوتیان: 'ئەو دەڵێ کە پاشا ئەوی لە مێرگ و سەوزەڵانییەکدا دیوە کە لەگەڵ کچێکی لەڕادەبەدەر جوان ڕاوەستاوە و ئەسپێکی ئاونووسیشیان پێ بووە. جا ئێمە تا ئێستا دەستکردی ئاوامان نەدیوە. دەڵێ ئێستا کچە لە لای پاشایە و پاشا دڵی گرتوویەتی و بۆی شێت و شەیدا بووە. بەڵام ئەو کچە شێتە. جا ئەگەر ئەو زانایە ڕاست دەکا، ئەو کچەی چاک دەکردەوە. چونکە پاشا زۆر بە خەمی چارەی ئەوەوەیە. دەڵێ ئەسپی ئاونووسیش لە خەزێنەی پاشا دایە. ئەو پیاوە ناحەزە ئێستا لێرە لە لای ئێمە لە زینداندایە. نیوەشەو لەبەر گریان و هاتوهاوری خەومان لێ ناکەوێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە بەندیوانەکان باسی زانا فارسەکەیان بۆ کرد، ئەو بە زەینیدا هات بیرێک بکاتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەک کارەکەی جێبەجێ بێ.

"کاتێک بەندیوانەکان ویستیان بخەون، ئەویان لە بەندێک کرد و دەرگایان لەسەر داخست. شازادە گوێی لێ بوو، زاناکە دەگریا و دەلالاوە و دەیگوت: 'ئای چۆن ستەمم لە خۆشم و شازادەش و ئەو کچەش کرد کە نەمهێشت ئەوانیش بە مرادیان بگەن و خۆشم چارەڕەش کرد! ئەوە هەر گەوجێتی و بێتەگبیری خۆم بوو. چونکە لاقم لە بەڕەی خۆم زیاتر ڕاکێشا. هەرکەس لاق لە بەڕەی خۆی زیاتر ڕاکێشێ، ئاوای لێ بەسەر دێ.' کاتێک شازادە گوێی لەو قسانە بوو، بە فارسی هەرای کردێ و گوتی: 'ئەوە بۆ تەواوی ناکەی؟ وا دەزانی هەر ئەتۆ تووشی چارەڕەشی بووی و کەسی دیکە لێی نە قەوماوە؟' کاتێک زاناکە گوێی لە دەنگی ئەو بوو بە فارسی قسەی لەگەڵ کرد، خۆشییەک کەوتە دڵییەوە و دەستی کرد بە دەردەدڵکردن، ئەو کوێرەوەرییانەی بەسەری هاتبوو، هەمووی بۆی گێڕاوە.

"کە ڕۆژ بووەوە، دەرکەوانەکان شازادەیان گرت و هێنایانە هەنتەشی پاشا. بە پاشایان گوت: 'ئەو گەنجە دوێنێ هاتە دەروازەی شار و لەبەر درەنگیان نەمانتوانی بیهێنینە خزمەتت.'

"پاشا لە شازادەی پرسی: 'خەڵکی کوێی؟ ناوت چییە؟ سەرقاڵی چ کارێکی و بۆ هاتوویە ئێرە؟' شازادە گوتی: 'ناوم بە فارسی هورمزە. لە شاری پارسەوە هاتووم. پیشەم زانست و فێربوونە. بە تایبەت زانستی نۆژداری باش دەزانم. لە چاکردنەوەی شێت و ناتەواوەکاندا زۆر شارەزام. هەر بۆیەش لە شار و وڵاتان دەگەڕێم، هەتا هەم زانستەکەم پەرە پێ بدەم و هەم ئەگەر نەخۆشێک هەبێ، بتوانم چارەی بکەم. کە پاشا ئەو قسەیەی بیست، خۆشحاڵ بوو. پێی گوت: 'لە ساتێکی باشدا هاتووی.' ئینجا باسی کچەکەی بۆ کرد و پێی گوت: 'ئەگەر تۆ ئەو کچە چاک کەیەوە و لەو دۆخە ڕزگاری بکەی، هەرچی بتەوێ دەتدەمێ.' کاتێک شازادە گوێی لەو قسەیەی پاشا بوو، گوتی: 'پاشا، پێم بڵێ لە کەنگێوە ئاوا شێت بووە و لەکوێرا هێناوتە؟' پاشا تەواوی بەسەرهاتەکەی لە سەرەتاوە بۆ گێڕاوە، لە دواییدا گوتی: 'کابرا ناحەز و دزێوەکە ئێستا ئەوە لە بەند دایە.' شازادە گوتی: 'پاشای مەزن، ئەی چیت لە ئەسپە ئاونووسەکە کرد؟' پاشا گوتی: 'ئەسپەکە لە خەزێنەخانەدایە.' شازادە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وا چاکە من بەر لە هەموو شتێک شوێنی ئەسپەکە ببینمەوە. ئەگەر ئەو هەموو گیانی ساخ بێ، ئەوە کاری من جێبەجێ دەبێ. دەنا دەبێ بە هەر

شێوەیەک بێ خۆم لەو گرفتە ڕزگار بکەم.' ئەوجار بە پاشای گوت: 'ئەمن دەمەوێ چاوێک لەو ئەسپە بکەم، بەشکو بۆ چارەسەری ئەو کیژە بە کارم بێ.' پاشا هەستا دەستی گرت و بردی بۆ ئەو شوێنەی ئەسپەکەی لێ بوو. شازادە بە دەوری ئەسپەکەدا هات و جوان چاوی پێدا گێڕا. کە زانی ئەسپەکە ساغە، کەیفی ساز بوو. بە پاشای گوت: 'با کچەکە ببینم هیوادارم بە دەستی من چاک بێتەوە.' لەڕێوە پاشا لەگەڵ شازادە چوون بۆ لای کچەکە شازادە سەیری کرد کچە وەک شێت و دەلووی لێ هاتووە. کارێکی وای دەکرد کەس لێی نیزیک نەبێتەوە.

"کاتێک شازادە ئەوی ئاوا دیت، پێی گوت: 'ئەی جوانی جوانان، کەس کاری بە تۆ نییە و لە هیچ سڵ مەکە.' ئیدی وردەوردە بە هێمنی دواندی و خۆی پێ ناساند. کچە کە ئاوڕی داوە و چاوی لێ کرد، ناسییەوە. قیژاندی و لە خۆشیان بێهۆش بوو. شازادە چووە پێشێ و گوڵاوی بەسەردا هەڵپرژاند. کە زانی وە هۆش هاتووەتەوە، دەمی بردە بن گوێی و پێی گوت: 'خانمەکەم، لەسەرخۆ بە هەتا ڕێگایەک دەبینمەوە و خۆمانی پێ ڕزگار بکەین، دەنا هەردووکمان تێدا دەچین و ڕزگارمان نابێ. ئێستا ئەمن بە پاشا دەڵێم: 'ئەو کچە شێتە و ئەمن چاکی دەکەمەوە. ئێوە دەست و لاقی بکەنەوە.' کە دەست و قاچیان کردیتەوە ئەتۆ لەسەرخۆ و بە جوانی قسە لەگەڵ پاشا بکە. هەتا وا تێبگا کە قسەکانی من کاری لەسەر تۆ کردووە و چاکتر بووی.' کچە گوتی: 'چۆن بڵێی وا دەکەم.'

"شازادە گوتی: 'پاشا، بەختی تۆ قسەکانی من کاری تێ کرد و جندۆکەکان لێی دوور کەوتوونەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا هەستا چوو بۆ لای کچە. کە کچی پاشای سەنعا چاوی بە پاشا کەوت، لە بەری هەستا و کڕنۆشی برد. پاشا بە دیتنی ئەو گۆڕانە دڵخۆش و کەیفساز بوو. بە کەنیزەکانی گوت: 'لە خزمەتیدا بن.' بردیان بۆ گەرماو و خشڵ و زێڕیان بۆ هێنا. جلی شازادانەیان کردە بەری. ملوانکەی گەوهەریان کردە ملی و لە گەرماو بردیانە دەرێ. کەنیز و قەرەواش لەوبەرەوبەری ڕاوەستابوون دەتگوت مانگی چواردەیە. کە هاتە لای پاشا، سڵاوی کرد داهاتەوە سەکۆی کورسی پاشایەتی ماچ کرد. پاشا تەواو خۆشحاڵ بوو، بە شازادەی گوت: 'تەواوی ئەوانە هی پێوقەدەمی بەفەڕی تۆ بوو.' شازادە گوتی: 'پاشام، کێشەکەی تەواو چارەسەر نەبووە. کێشەکەی ئەو دەم چارەسەر دەبێ کە ئەتۆ لەگەڵ سوپاکەت بچنەوە ئەو مێرگ و شیناوەردەی کە ئەوتان لەوێ گرت. ئەسپە ئاونووسەکەش لەگەڵ خۆتان ببەن. بو ئەوەی ئەمن بتوانم ئەو درنجەی کە چووەتە لەشییەوە لەوێ بیگرم و زیندانیی کەم و پاشان بیکوژم. وا بێ ئیدی تازە قەت توخنی نەکەوێت.' پاشا بە قسەی شازادەی کرد و بە سوپاوە ئەسپە ئاونووس و کچەکەیان برد و چوونەوە بۆ ئەو مێرگ و سەوزەڵانییەی کە کچەکە و زاناکەیان تێدا گرت. کەسیش نەیدەزانی کە شازادە بە تەمای چییە. کە گەیشتنە مێرگەکە، شازادە فەرمانی دا کچە و ئەسپەکە بە مەودای ڕۆیشتنی تیرێک لە پاشا و سوپاکە دوور خەنەوە. ئەوجار شازادە بە پاشای گوت: 'فەرمانم پێ بکە با هەڵم و بخوورێک ساز کەم و ئەو درنجەی پێ بخەمە داوەوە و بەندی بکەم، هەتا ببرای‌ببڕ نەتوانی توخنی ئەو خانمە بکەوێت. بەڵام کاتی جادووبەندەکە دەبێ من و ئەو کیژە سواری ئەسپەکە بین.'

"کاتێک پاشا قسەکەی شازادەی بیست، خۆشحاڵ بوو. ڕێی دا شازادە زاناکە کارەکەی بکا. شازادە چوو لەوێ سواری ئەسپە ئاونووسەکە بوو. کچەکەشی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد و توند شەتەکی دا. پاشا و سوپاکەشی لە دوورەوە چاویان لێ دەکردن. شازادەش کە جوان کچەکەی بەستەوە، ئامێری جووڵەی شانی ڕاستی ئەسپەکەی بزاوت. ئەسپەکە وە حەوا کەوت. تەواوی سوپاکەش چاویان لێ دەکرد هەتا لە چاو ون بوون. پاشا هەتا تاریک داهات هەر لەوێ دانیشت و چاوەڕێی گەڕانەوەیان بوو. کە زانی ناگەڕێنەوە، زۆر پەشیمان بووەوە و لەگەڵ سوپاکەی گەڕانەوە شار.

"شازادەش ڕاست چووەوە شارەکەی خۆیان و یەکسەر چووە کۆشکەکەی بابی. لەوێ نیشتەوە. کچەکەی بردە کۆشک و بۆخۆی چووە لای بابی و سڵاوی لێ کرد. پێی گوت کە کچەکەی هێناوەتەوە. بابیشی ئاهەنگێکی خۆشی لە شاردا بەڕێوە برد و خواردنی باشی دا

به خەڵک."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، باوکی شازادە هەتا مانگێکی ڕەبەق خەڵکی نان دا و خوانی ڕاخست و ئاهەنگی خۆشـی بەردەوام بوو. دوای ئەوە شـازادە و کچە پێک گەیشـتن و بە خێر و خۆشـییەوە پێکەوە ژیان. باوکی شـازادە ئەسـپە ئاونووسـەکەی شـکاند و نامەیەکیشـی بۆ باوکی کچە نووسـی. بەسـەرهاتی کچەکەی تێدا نووسـی و دیاری و خەڵاتێکی زۆریشـی لەگەڵ نامەکەدا بۆ ناردە سەنعا.

"کاتێک نامەبەرەکە گەیشـتە سـەنعا و باوکی کچە نامەکەی خوێندەوە، لەڕادەبەدەر خۆشـحاڵ بوو. دیارییەکانی وەرگرت و ڕێزێکی زۆریشی لە ڕاسـپاردەکە گرت. دوای ئەوە ئەویش دیاریگەلێکی گرانبایی بۆ کچ و زاواکەی هەر بەو ڕاسپاردەیەدا ناردەوە. ڕاسپاردە گەڕاوە بۆ لای شازادە و خۆشحاڵبوونی باوکی کچەی پێ ڕاگەیاند. ئیدی ئەو جار هەموو ساڵێک پاشـای سـەنعا دیاریگەلێکی زۆری بۆ کچ و زاواکەی دەنارد هەتا باوکی شـازادە کۆچی دوایی کرد و شـازادە لە جێی باوکی لەسـەر تەخت دانیشـت. دەسـەڵاتێکی پڕ لە یەکسـانی و دادپەروەری دامەزراند. دوای ئەوە وڵاتی بەرین کردەوە و چەندین وڵاتی دیکەی خسـتەوە سـەر وڵاتەکەی. خەڵکەکەی لە تێری و تەسـەلیدا بوون هەتا تێکدەری خۆشـی و کاولکەری ئاوەدانی و ئاوەدانکەرەوەی گۆڕستان ئارامیی لێ تێک دان و هەموو شتێکی لەبەر یەک هەڵتەکاند."

### چیرۆکی وەردولئەکمام و ئینسولوجوود

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە لە سـەردەمانی دێریندا پاشـایەکی بەشـکۆ و گەورەیی هەبوو. ئەو پاشـایە وەزیرێکی هەبوو ناوی ئیبراهیم بوو. ئەو وەزیرەش کیژێکی جوانی هەبوو، وەک شاعیر دەڵێ:

پەردەی کەزیەی کە بەسـەر لەشـیدا بڵاوە
قەڵـغـانـی جەسـتەیە، لەبەر چـاوی گـڵاوە
لەنجەی سـڵکی کە هەر وەکوو لەنجەی کەوانە
بـۆنـی خـۆشـی ئەوە بـڵاوێـنـی دڵانە
جەسـتەی چەرمووی سـپی و سـۆڵ و نەرم و نیانە
نەرمونـۆڵ و گـۆشـتـنە، هەوێـنـی ژیـانە

"لەبەر جوانی و دەلالی پێیان دەگوت: 'وەردولئەکمام.' پاشـــا عادەتی وا بوو هەموو ساڵێک پاشاکانی دەوروبەری بانگ دەکرد بۆ یاری گۆیێن. کە ئەو ڕۆژە دەهات، خەڵک بۆ کایەی گۆیێن کۆ دەبوونەوە، کچی وەزیریش لە بەرجەوەندیکەوە دادەنیشـــت و ســـەیری دەکردن. بە ڕێکەوت ڕۆژێک کە کچی وەزیر ســـەیری یاری گۆیێنی دەکرد، چاوی بە کوڕێکی قۆز و باڵابەرز و جوانچاک کەوت. بە دایەنەکەی گوت: 'دایە، ئەو کوڕە جوانخاسە ناوی چییە؟ وا یاری دەکا؟' دایەن گوتی: 'جا ئەو لاوانە هەموو جوانخاســـن، ئەتۆ کامیانت مەبەســـتە؟' کچی وەزیر گوتی: 'ڕاوەســـتە با پیشـــانت بدەم.' ئینجا کچی وەزیر ســـێوێکی هەڵگرت و گرتییە کوڕەکە. کوڕەکە ســـەری هەڵێنا ســـەیری کرد ئەوە کچی وەزیر لە بەرجەوەندەکە دانیشتووە. کە کوڕە چاوی بەو کەوت، بە تیری ئەڤینی پێکرا. دڵ و هۆشـی چووە سەری و ئەو شێعرەی شاعیری خوێندەوە:

دڵ دەمێکە چاوەڕوانی تـــــــــــــیشکی ڕووتە  
زۆر بەخـێـر بـێـی، ڕووحـی تـیـنـووم وا لە دووتە  
سـێو دەهاوی، چاوەکانم، خۆشـەویـــــــــــستی  
شـەرتە وا بم وەک ئـــــــــــــــەوەی تۆ ئارەزووتە

"کە یاری ســوارەکان تەواو بوو، کچی وەزیر بە دایەنەکەی گوت: 'ئەو کوڕەی پیشــانم دای، ناوی چ بوو؟' دایەن گوتی: 'ناوی 'ئینسـولوجوود'ە.' کچی وەزیر ئاخێکی هەڵکێشـا و کەوتە بیرکردنەوە. دوای ئەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کە چـــاوم بە چـــاوت کەوت،  
دڵــم بــۆت لە لــێــدان کەوت  
لـغـاوی ئەســـپی ســـەرکێشــم  
پـچـڕا و کەوتە ســـەر کـۆشـــم  
لە دەســـت چوو ئیختیار و هۆشـــم  
هەمـوو شـــت بـوو فەرامـۆشـــم

"کە شێعرەکەی تەواو کرد، لە کوتە کاغەزێکدا نووسـییەوە و کاغەزەی پێچاوە. پاشـان قوماشـێکی ئاوریشـمی تێوە پێچا و خســتییە بن باڵنجەکەیەوە و خەوت. کە کچە خەوت. دایەن کاغەزەی لەبن ســـەری دەرهێنا و خوێندییەوە. ســـەیری کرد کچی وەزیر گیرۆدەی ئەڤینی ئینســـولوجوود بووە. ئیدی خێرا کاغەزەکەی پێچاوە و لە جێی خۆی داناوە. کە وەردولئەکمال لە خەو هەســتا، دایەنە پێی گوت: 'ئەتۆ دەزانی کە من ڕێنوێن و دڵســـۆزی

تۆم. ئەوە بزانە کە خۆشـــەویســـتی کارێکی دژوارە و شـــاردنەوەی ئاســـن دەتوێنێتەوە. شـاردنەوەی مایەی نەخۆشـی و کەنەفتییە. خۆ خۆشـەویسـتی سـووچ و تاوان نییە. هەر لە ئادەم و حەواوە مرۆڤ ئەویندارى کردووە و خۆشـــەویســـتی بووە.' وەردولئەکمام گوتی: 'دایە، دەوای ئەوین چییە؟' دایە گوتی: 'دەوای ئەوین پێوەنـدییە.' وەردولئەکمـام گوتی: 'چۆن پێوەندی ساز دەبێ؟' دایە گوتی: 'پێوەندی بە نامە و پەیام و قسەی خۆش درووست دەبێ. هەر نامە و پەیامە کە کارەکان ئاسان دەکا و دەنگی دڵدارەکان پێک دەگەیەنێ. ئەگەر تۆ کارێکت بێ، هەر بە من بڵێی باشـترە تا هی دیکە. ئەگەر ویسـتت نامەیەک، شـتێکی بۆ بنێری، پێم بڵێ. دڵنیاش لە لای کەس باسی ناکەم.' وەردولئەکمام کە ئەو قسەیەی بیست، خۆشـــــحاڵ بوو. بەڵام هیچی نەگوت. لە دڵە خۆیدا گوتی: 'کەس ئاگاداری ئەو کارە نییە. ئەمن بەو ژنەش ناڵێم هەتا تاقی نەکەمەوە.' وا بوو دایەنەکە پێی گوت: 'خانمەکەم، خەونم بینی کەسـێک پێی گوتم: 'خانمەکەت لەگەڵ ئینسـولوجوود حەزیان لە یەکە و لە خەمیاندا بە. ئەگەر نامە و شـــتیان هەیە، بۆیان بگەیەنە و هاوکارییان بکە و نهێنیشـــیان لای کەس مەدرکێنە، چونکە بە قازانجت تەواو دەبێ.' خەونەکەی من ئاوا بوو، ئیدی کەیفی خۆتە.' وەردولئەکمام پێی گوت: ..."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەردولئەکمام گوتی: 'دایە لای کەس باسی ناکەی؟' گوتی: 'ئەمن ئەوە تەمەنم لەگەڵ تۆدا تەواو کرد. چۆن لەملا و لەولا باسی نهێنی تۆ دەکەم؟!' ئیدی وەردولئەکمام ئەو کاغەزەی نووسیبووی، دەریهێنا و دای بە دایەنەکە و گوتی: 'ئەو نامەیەم بۆ بەرە و بیدە بە ئینسولوجوود و وڵامەکەیم بۆ بێنەوە.' دایە نامەکەی لێ وەرگرت و چوو بۆ لای ئینسولوجوود. کە گەیشتێ، دەستی ماچ کرد و بە لەبزێکی خۆشەوە دواندی و قسەی لەگەڵ کرد. ئینجا نامەکەی دایە. ئینسولوجوود نامەکەی خوێندەوە و زانی چ باسە. لەپشت نامەکە ئەو شێعرەی نووسی:

راستە دەڵێن دڵ ئاگای لە دڵانە  
شێتم لە دووت دڵم بۆت سەرگەردانە  
هەر کە دیتم بەژن و باڵای رێکی تۆ  
سەوداسەر بووم کەوتمە سەر رێی عیشقی تۆ

"دوای ئەوە نامەکەی پێچاوە و دای بە دایە و گوتی: 'دایە، سلاوم بە خانمەکەت بگەیەنە.' دایەنە نامەکەی لێ وەرگرت و گەڕاوە بۆ لای وەردولئەکمام. نامەکەی دایە. وەردولئەکمام نامەکەی لێ وەرگرت و ماچی کرد. لەسەر چاوی دانا. دوای ئەوە نامەکەی کردەوە و خوێندیەوە. ئینجا ئەو شێعرەی لە پەڕاوێزەکەی نووسی:

خۆشەویستی ئێمە دیاری ئاسمانە  
لەو رۆژەوە هەرچی دەیبینم جوانە  
خۆر و مانگ، شەو و بەیانی جوانن  
چاوەڕوانی و دڵەکوتەشی جوانن

"ئینجا نامەکەی پێچاوە و دای بە دایەنەکە. دایەن نامەکەی وەرگرت و وەدەر کەوت. دەرکەوان بانگی دایەنەکەی کرد گوتی: 'بۆ کوێ دەچی؟' دایەن گوتی: 'بۆ گەرماو.' بەڵام دایە دەستی تێکەڵ هات و نامەکەی لێ بەربووەوە و بۆخۆشی نەزانی و رۆیشت.

"نامەکە یەکێک لە دەستوپێوەندەکانی وەزیر لەسەر رێگا هەڵیگرتەوە و بردی بۆ وەزیر و گوتی: 'گەورەم، ئەو کاغەزەم لەسەر رێگا دیتەوە.' وەزیر کاغەزەکەی کردەوە و خوێندیەوە. زانی چ باسە و خەتەکەی ناسییەوە. زانی کە خەتی کچەکەیەتی. لەرێوە هەست

چوو بۆ لای ژنەکەی، ئەوەندە نارەحەت بوو دەستی کردە گریان. ژنەکەی گوتی: ‘گەورەم، بۆ دەگری ؟’ وزیر گوتی: ‘ئەو کاغەزەم لێ وەرگرە، بزانە چی تێدا نووســـراوە.’ ژنەکەی نامەکەی لێ وەرگرت و خوێندیەوە، ســـەیری کرد کچەکەی نامەی بۆ ئینســـول‌وجوود ناردووە. ژنی وەزیریش دڵی پڕ بوو. بەڵام خۆی خواردەوە و نەیهێشـت فرمێسـکی بێ. بە وەزیری گوت: ‘گەورەم، گریان بێسـوودە، ئێمە دەبێ کارێک بکەین کە ناموسـت پارێزراو بێ و نهێنی کچەکەشـمان ڕاگرین.’ وەزیر گوتی: ‘ئەمن لە خۆشـەویسـتی نێوان کچەکەم و ئینسـول‌وجوود دەترسم. ئەتۆ نازانی پاشـا چەندی ئینسـول‌وجوود خۆش دەوێ. هەر بۆیە من لە دوو ســەرەوە نیگەرانم: یەکیان ئەوەیە نیگەرانی کچەکەی خۆمم. ئەویدی لە پاشـــا دەترسم، چونکە ئینسول‌وجوود هاونشینی پاشایە. شیانی ئەوە هەیە کارەساتێکی گەورەی لێ بکەوێتەوە. ئەی تۆ دەڵێی چی؟’ ”

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، وەزیر بە خێزانی گوت: 'ئەی تۆ دەڵێی چی؟' خێزانی گوتی: 'ڕاوەســـتە با فاڵێک بە قورئانەکە بگرمەوە.' دوای ئەوە بە وەزیری گوت: 'لەنێو دەریای گەنجینەدا کێوێکی لێیە کە پێی دەڵێن کێوی سـەکەلا. کەس ناتوانێ بچێتە سـەری مەگین بە هەوڵ و تێکۆشـانێکی زۆر. ئەتۆ لەوێ شـــوێنێک بۆ کچەکەت ســـاز بکە و کچەکە بنێرە ئەوێ.' وەزیر قسەی ژنەکەی پێ جوان بوو. هەردووکیان هاتنە سەر ئەو بیرەی کۆشکێک لەســـەر ئەو کێوە بۆ کچەکەیـان چێ کەن و کچەکەیـان بنێرنە ئەوێ. خوردوخۆراکی ساڵێکیشـی بۆ دانێن. چەند کەسێکیش وەک خزمەتکار و هاودەمی لە لا دانێن. وەزیر خێرا وەســـتای دیوار و دارتاش و شـــتی نارد بۆ ســـەر ئەو کێوە و لەوێ کۆشـکێکی گەورە و قایمیان چێ کرد. دوای ئەوە وشترێکی بەهێزی هێنا و شەو چووە لای کچەکەی و فەرمانی پێ کرد بڕوا بۆ ئەو شـــوێنە و دوور کەوێتەوە. کاتێک کچە هاتە دەرێ، چاوی لێ کرد هەموو شتێک سـازە بۆ ڕاگواسـتنی. دەستی کردە گریان و بۆ ئەوەی ئینسـولوجوود لە کەشـــتەکەی ئاگادار کاتەوە، ئاوا چۆنیەتی ڕووداوەکەی بە شـــێعر لەســـەر دەرگاکەیان نووسی:

وا دەڕۆم و بـاری خەمـم لە کـۆڵ نـاوە
چارەنووسم زۆر سەرشـــــــێتانەی مل ناوە
ئەرخەیـان بە گوڵی یـادت قەت ســـیس نـابێ
خۆشـــەویســـتیت تیشــک داوێ، وەک هەتاوە

"کە شـــێعرەکەی تەواو کرد، چوو ســـوار بوو. ئیدی قۆناغ بە قۆناغ ئەویان برد هەتا گەیشـــتنە دەریای گەنجینە. لە ڕۆخی دەریا خێوەتیان هەڵدا هەتا گەمیەیەکی گەورەیان بۆ کچە ئامادە کرد. ئەوجار کچە و خزمتکارەکانیان پێکەوە ســـواری گەمیەکە کرد. وەزیر بە کەشـتیوان و خەڵکەکەی گوت: 'ئەگەر گەیشـتنە چیای سـەکەلا، کچەکە و خزمەتکارەکانی لەوێ لە کۆشـکەکەدا بەجێ بێڵن و بۆ خۆتان وەرنەوە بۆ ئێرە. گەمیەکەش لە قەراخ دەریا بشـــکێنن.' ناخودا و خزمەتکارەکان، وەزیر چۆنی پێ گوتبوون ئاوایان کرد و زۆر بۆ کچە و خزمەتکارەکان گریان. ئەوان لەوێ ئاوایان لێ بە سەرهات.

"لەولاوە ئینسولوجوود کە لە خەو هەستا، نوێژی کرد. دوای ئەوە سوار بوو چوو بۆ لای پاشا. هەر بەپێی ڕۆژان بە بەردەرگای ماڵی وەزیردا ڕۆیشت. ئاوڕێکی لە ماڵی وەزیر داوە، سـەیری کرد ئەو شـێعرە لە دەرگاکەیان نووسـراوە. ئاور لە هەناوی بەربوو. بەرەو

مـالی خۆی گەڕاوە، بەڵام نەیدەزانی چ بکـا، دەتگوت لەســـەر ئـاورە. حەجمینی نەبوو. دڵەڕاوکێی بوو هەتا بوو بە شــەو. شــەو ســەری خۆی هەڵگرت و ڕووی لە بێروون کرد. خۆشی نەیدەزانی بەرەو کوێ دەڕوا. هەتا بەیانی هەر ڕۆیشت. بەیانییەکەشی هەر ڕۆیشت تا وای لێ هات گەرما تەوژمی بۆ هێنا و توونیەتی بەسەریدا زاڵ بوو. سەیری کرد دارێک دیار بوو کە چووە پێشێ، بن دارەکە کانی و ئاو بوو. ویستی ئاو بخواتەوە، سـەیری کرد ئاوەکەی هیچ بە زاری خۆش نەبوو. قاچەکانی ماسـیبوون. زۆری زگ بە خۆی سـووتا و دەستی کردە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

چارەنـــــــــــــووس بۆ وام لێ دەکەی؟
خۆشــــەویســـتــــــیم لێ تاڵ دەکەی؟
تازیەبــــــــــــــــــاری کۆچی ئەوم
ناسـرەوم گـــــــــــەر لە پێش کەوم
لا دە کەنـد و کۆســـپی ســــەر ڕێم
ســـەقەتــــــیش بم لەو ڕێیە، دێم

"کە شـێعرەکەی تەواو کرد، ئەوەندە گریا هەتا خۆڵەکەی بەردەمی تەڕ بوو و خووسـا. دوای ئەوە هەسـتا ملی ڕێی گرت و بێروونە و بێروون ڕۆیشـت. لەپڕدا تووشـی شـێرێک بوو کە ســـەری بە قەد گومبەزێک و زاری بە قەد دەرکی ئەشـــکەوتێک دەبوو. ددانەکانی دەتگوت ددانی فیلن. هەر کە ئینسول‌وجوود ئەوەی دیت، دەستی لە خۆی شوشت، ڕووی لە قیبلە کرد و شـــادەوئیمانی هێنا. بەڵام لە کتێباندا خوێندبوویەوە کە دەکرێ دڕندەکان بە زمانی خۆش فریو بدەی. ئیدی ئینسـول‌وجوود پێی گوت: 'ئەی پاشـای دڕندە و هۆڤیان و ئەی پەنای بێپەنایان! ئەمن ئەویندارم و لە خۆشـــەویســـتەکەم هەڵبڕاوم. خەریکە لە تاوان گیانم دەرچێ. تکایە بەزەییت پێمدا بێ و لێم خۆش بە!' کاتێک شـێرەکە گوێی لە قسـەکانی ئەو بوو، کشـاوە دواوە و کلکی لە گەڵۆزی نا و لەسـەر پاشـوو دانیشـت. سـەری بۆ لای کلکی وەرسـووڕاند و دەسـتی کرد بە کایەکردن بە کلکی کرد. ئەوجار ئینسـول‌وجوود ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەی ئەو کەســـەی شـــێـری ژیـان
دەسـتەمۆ دەکەی بۆ ئـــــــینسـان!
تۆ و تەکووزیی مەخلــــــــووقاتت
بێنە سەر ڕێم خـــــــــێر و هاتت!
چـــــــــــــیم لە دنیا ناوێ ئیدی
گەر بیبـــــــــــــینم جارێکی دی

"که شێعرەکەی تەواو کرد شێرەکە هەستا و چوو بۆ لای."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شێرەکە هەستا چوو بۆ لای. لاواندییەوە و بە زمان لێستییەوە. لە پێشیدا ڕۆیشت. بە ئاماژە ئەویشی تێگەیاند بەدوایدا بڕوا. ئینسولوجوودیش بەدوایدا ڕۆیشت. ڕۆیشت هەتا گەیشتنە سەر کێوێک و لە کێوەکە داگەڕانە خوارێ. هەر بە ئاماژە لەوێ جێپێیەکی نیشان دا و بۆخۆی گەڕاوە. ئینسولوجوود زانی ئەو جێپێیانە هەر جێپێی ئەو کەسانەیە کە وەردولئەکمامیان بردووە. ئیدی ئینسولوجوود ئەو جێپێیانەی گرتە بەر و ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەراخ دەریای گەنجینە. لەوێ شوێنەواری جێپێیەکان نەما. ئینسولوجوود زانی کە چوونەتە دەریاوە. ئیتر هیوای بڕا و دەستی کردە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دڵدارەکەم وەکوو ماسی خوشیوەتە ناو دەریاوە
ئەمنیش هەژار و ماڵوێران سەرگەردان ماوم لەو لاوە
جێگای تۆ بنی دەریایە، ئەتۆی جوان وەکوو مرواری
چۆن دەتوانم لە دەریا دەم منی مرۆڤ وەک مراوی؟
بەڵام ئازیز بستبەبستی ئەو دنیایەت بۆ دەگەڕێم
چی شاخی زەرد و ڕەوەزە، بۆ مەینەتی بێتە سەر ڕێم

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، ئەوەندە گریا هەتا لە هۆش خۆی چوو. ئیدی هەتا درەنگانێک وە هۆش نەهاتەوە. کە وە هۆش هاتەوە، چاوێکی لەملا و لەولای خۆی کرد، کەسی نەدی. لە ترسی ئاژەڵی هۆڤی و دڕندە و شت، کێوێکی بەرز لەوێ بوو چووە سەر کێوەکە و لەبن بەردێک دانیشت و دەستی کرد بە گریان. لە ناکاو گوێی لە دەنگێک بوو. دەنگەکە لە ئەشکەوتێکەوە دەهات. ئەو دەنگە دەنگی تەرکەدنیایەک بوو کە لەو ئەشکەوتەدا خەریکی خوداپەرستی بوو. ئینسولوجوود چوو بۆ لای ئەشکەوتەکە. سێ جار لە دەرگای ئەشکەوتەکەی دا. دەروێشەکە وەڵامی نەداوە و نەهاتە دەرێ. ئینسولوجوود ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕوو لە هەر دەرکێک دەکەم، گاڵە دەدرێ
بێهیوا نابم لە یارم، با بدرێ
بۆی دەگەڕێم بەژ و دەریا و چۆڵ و چیا
ئەگەر بێت و بچمە دەرێ من لە دونیا

"که شێعرەکەی تەواو کرد، دیتی ئەوە دەرکی ئەشکەوتەکە کراوە. ئینسول‌وجوود هاتە نێو زارکی ئەشکەوتەکە و سلاوی لە دەروێشەکە کرد. ئەویش سلاوەکەی ئەستاندەوە و لێی پرسی: 'ئەتۆ کێی؟' گوتی: 'من ئینسول‌وجوودم.' دەروێشە گوتی: 'بۆ هاتوویە ئێرە؟ ئینسول‌وجوود بەسەرهاتەکەی لە سەرەتاوە تا دومایی بۆ گێڕاوە. دەروێش زۆری زگ پێی سووتا و گوتی: 'ئەمن بیست ساڵە لەم شوێنەم. تا ئێستا کەسم نەدیوە، هەتا دوێنێ گوێم لە دەنگی گریانێک بوو. هاتمە دەرێ سەیرم کرد ئەوە تاقمێک لە قەراخ دەریا خێوەتیان هەڵداوە. دوای ماوەیەک سواری گەمیەیەک بوون و ڕۆیشتن. هێندێک لە دەریا نەگەڕانەوە، بەلام هێندێکیان گەڕانەوە و گەمیەکەیان شکاند و لێیان دا ڕۆیشتن. پێم وا بێ ئەوانە هەر ئەوانە بن کە تۆ بەدوایاندا دەگەڕێی. کول و خەمی تۆ زۆر گەورە و گرانە. بەلام ئەوەندە بزانە هیچ ئەوینداریک نییە کە خەم و خەفەتی نەبێ.' ئیدی دەروێش ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەر کاتێک ناوی ئەوین دێ، سەر و سامان نرخی نییە
تاکوو بە ئاواتت نەگەی، کەند و کۆسپ مەعنی نییە
کەسێک بە ڕاستی ئاشق بێ، کوا بەژ و دەریا دەناسێ
تا دلداری پەیدا نەکا لە هیچ کوێ حەجمینی نابێ

"کاتێک دەروێش شێعرەکەی تەواو کرد ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سێسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کاتێک دەروێش شـــێعرەکەی تەواو کرد. لەگەڵ ئینســـولوجوود ئەوەندە گریان کە کێو لەگەڵیان کەوتە ناڵە. ئیدی ئەوەندە گریان هەتا هەردووکیان لە هۆش چوون. کە وە هۆش هاتنەوە، دەروێش بە ئینســـولوجوودی گوت: 'ئەمن ئەوشـــەو فاڵێکت بە قورئان بۆ دەگرمەوە، بزانم دەبێ چ بکەی.' کاری ئینسولوجوود بێرە گەیشت.

"بەڵام وەردولئەکمام کە گەیشتە کێوی سەکەلا و زانی هەر خۆی و دایەنەکەی و چەند خزمەتکارێک دەمێننەوە، دەســـتی کرد بە گریان و پێی گوت: 'بە خودا خۆ کۆشـــکەکە زۆر خۆشـــە، بەڵام حەیف خۆشـــەویســـتەکەمم لەگەڵ نییە.' وەردولئەکمام ســـەیری کرد ئەو دوورگەیە پڕە لە مەل و باڵندە. بە خزمەتکارەکەیی گوت کە داویان بۆ بنێتەوە بیانگرێ. هەرچی گرتیشی، بیخاتە قەفەسەوە. بۆ خۆشی لە بەر هەیوانی کۆشکەکە دانیشت. بیری لە ئینسولوجوود دەکردەوە و فرمێسکی دەڕشت و لەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

شەرتە تا ماوم لە ژینا ناوت وێـــــــــــــــــــــردی زارم بێ
خۆشـەویستیت خوێـــــــــــنی گەشی ناو دەمارەکانم بێ
غەیری ســـیمای دلڕفـــــــــــــــێنت نەهێنمە بەرچاوی خۆم
تا هەناسەم بـــــــــــــــێ لە ژینا خەمی دووری تۆ بخۆم
هێنـدە گەشـــبینم بە عیشـــقت، بـاوەڕ بە دووریـت نـاکەم
بە یەکتر شـــاد دەبینەوە، ئـــــــــــەو ڕۆژە بەدی دەکەم

"کە بوو بە شەو، وەردولئەکمام کەیفی سازتر بوو. یادی ڕۆژانی ڕابردووی دەکردەوە و ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

هێنـدە شـــیرین بوو یەکەم بینـــــــــــــێنت
خـۆزگەم بەو ڕۆژە کە بـوومە دیـــــــلت
عـیشـــقـت وەک لاولاو لە بەژنـم ئـالا
فیزم تیا نەما و کەوتمە ســـکـــــــــــالا
تـاکـوو مـن مـابـم یـادت لـــــــە نـاخـما
دەردەکـا چڕۆ و، خـــــــــــــونچە لە دڵما

"ئیدی ئەوە بوو بە ژیانی وەردولئەکمام.

سۆفیش لەو لاوە بە ئینسولوجوودی گوت: 'بچووە لەو دەشتە باوەشێکم شوول بۆ بێنە.' ئینسولوجوود چوو شوولێکی زۆری بڕی و هێنای بۆ سۆفی. سۆفی بەو شوولانە سەوەتەیەکی گەورەی شێوە لۆتکەی چنی و بە ئینسولوجوودی گوت: 'لەو دەشتە گیایەک شین دەبێ و پاشان هەر لەسەر بنچکەکەی خۆی ویشک دەبێ. ئەوانە کۆ کەوە. سەوەتەکەتی لێ پڕ بکە و سەری سەوەتەکە بگرە و بیبە ناو ئاوەکەوە و سواری بە. لە دەریا بدە—بەشکو بە ئاواتت بگەیت. دڵنیا بە هەرکەس لە خۆی نەگوزەرێ، بە ئاواتی ناگا.' ئینسولوجوود گوتی: 'باشە بە چاوان.' ئیدی سەوەتەی بە کۆڵیدا دا و ماڵاوایی لە سۆفییەکە کرد. چوو سەوەتەکەی پڕ کرد لەو گیایەی سۆفی پێی گوتبوو. سەرەکەی قایم کرد و بردییە نێو دەریاکەوە، سوار بوو و لە دەریای دا. بەدم شەپۆلانەوە هەڵدەستا و نەوی دەبووەوە. بەو شێوەیە ڕۆیشت هەتا وا بوو دوای سێ ڕۆژ شەپۆلەکان بردیانە دوورگەی سەکەلا. ئینسولوجوود لە برسان و لە بەر ماندووییان خەریک بوو بمرێ. ئەو شوێنەش زۆر خۆش بوو، پڕ لە کانی و ئاو و مەلی دەنگخۆش و داری میوە بوو. لەوی لای دا لە میوەی دارەکان تێری خوارد، لە کانی و جۆگەلە ئاوەکان ئاوی خواردەوە و لەو ناوەدا دەستی کرد بە گەڕان و سەیر و سەیاحەت بیر و هۆشیشی هەر لە لای وەردولئەکمام بوو. وا بوو لە دوور چاوی بە کۆشکێک کەوت. بەرەو کۆشکەکە ڕۆیشت. کە چووە پێشێ، سەیری کرد کۆشکێکی پتەو و قایمە و دەروازەکەی زۆر بەرزە. بەلام دەرکی کۆشکەکە داخرابوو. سێ ڕۆژان لەوێ دانیشت. لە کۆتایی ڕۆژی سێیەم دەرگا کراوە و خزمەتکارێک هاتە دەرەوە. ئینسولوجوودی دیت لەوێ دانیشتبوو. لێی پرسی: 'ئەتۆ خەڵکی کوێی و کێ تۆی هێناوەتە ئێرە؟' ئینسولوجوود گوتی: 'خەڵکی ئیسفەهانم و بۆ کاری بازرگانی بە دەریادا دەڕۆیشتم، کەشتییەکەم شکا و شەپۆل منیان هێنا ئێرە.' خزمەتکارەکە باوەشی پێدا کرد و گوتی: 'یاخودا بە خێر بێیت. ئیسفەهان شاری منە. ئامۆزایەکم هەیە ئێستا لە ئیسفەهانە و زۆرم خۆش دەویست. ئەمن هێشتا منداڵ بووم حەزم لەو ئامۆزایەم دەکرد. هۆزێک بە سەریاندا داین و منیان بە دیل گرت، هەر بە منداڵی سیرەتیان بڕیم و فرۆشتیانم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گوتی: 'سیرەتیان بڕیم و فرۆشتیانم.' دوای ئەوەی خزمەتکارەکە بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ ئینسولوجوود گێڕاوە، بردیە حەوشەی کۆشک. ئینسولوجوود تەماشای کرد لە نێوەڕاستی کۆشکەکەدا گۆلێکی گەورەی تێدایە کە دەوری ئەو گۆلە هەمووی داری سەرسەوز و جوانە و لەنێو قەفەسی زێڕین و زێویندا کە بە دارەکانەوە هەڵواسراون مەلی دەنگخۆش خەریکن دەخوێنن. کاتێک ئینسولوجوود گەتیشتە قەفەسی یەکەم، بولبولێکی دیت خەریک بوو دەیخوێند. ئینسولوجوود کە گوێی لە دەنگی ئەو بولبولە بوو، بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، بە دەنگێکی بڵند و گریانەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بولبولی خۆشخوێن، ئەی عیسا نەفەس
تاوانت چی بوو کەوتوویتە قەفەس؟!
ڕەنگە لای ئێوەش ئەڤین تاوان بێ
هەرکەس ئاشق بێ، تووشی زیان بێ!
دڵدارەکەشم ئەو کارەی کردووە
ئەویش وەکو تۆ لە کونجێک کەوتووە
ڕەنگە ئێستاکە بالوێرە لێ دا
بە یادی جاران هەناسە بدا

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، چوو بۆ لای قەفەسی سێیەمین. بولبولێکی دیکەی لەنێو قەفەسەکەدا دیت. بولبولەکە کە چاوی بە ئینسولوجوود کەوت، دەستی کرد بە خوێندن. ئینسولوجوودیش ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بخوێنە ئەی بولبولی شەیدا و سەرمەستی ئەڤین
هەڵڕێژە کوڵی دڵت کە دابڕاوی لە ژین
کزە و کسپەی هەناوت بەرم بۆ کامە وڵات
دڵدارەکەت لەکوێیە بچم بیهێنمەوە لات؟

"کە شێعرەکەی خوێندەوە، چوو بۆ لای قەفەسی چوارەم. بولبولێکی لەوێدا دیت کە خەریک بوو شینگێڕیی دەکرد و دەلالاوە. کە ئینسولوجوود گوێی لە دەنگی بوو، ڕۆندکی ڕشت و ئەو بەیتەی خوێندەوە:

به شـــیـن و زاری ژیـن نـاچـێـتە ســەر
دەرفەتێـک بـــــــــێنە و تۆ دەرفڕە دەر

"دوای ئەوە کەمێکی دیکە ڕۆیشت. قەفەسێکی دیت لە تەواوی قەفەسەکانی دیکە چاکتر بوو. کە لێی چووە پێشـێ، کۆترێکی تێدا دیت، ئەویش شـینی دەگێڕا و دەگریا. بە جۆرێک کە ئاوری لە دڵان بەر دەدا. کە ئەویشـی ئاوا دیت، فرمێسـکی لیزگەیان بەسـت و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مەلـی بـاڵـکـراوی دوور لە هـێـلانە
دەزانم دڵت پڕ ئـــــــــێش و ژانـــە
ئەو هەموو شـیـــــن و داد و فغـانە
حەتـمەن ئـاشـــقـی و دەردت گـرانە

"کە ئینسولوجوود شێعرەکەی خوێندەوە ..."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، کە ئینســــول‌وجوود شــێعرەکەی تەواو بوو، کۆترەکە گوێی بۆ ئینسول‌وجوود ڕاگرتبوو. لەڕێوە دەستی کرد بە چەمەرە و ئەو بەیتانەی بۆ گوت:

ڕۆژ، خــۆشـــــتـر لە ڕۆژی عەشـــــق نـیـیە
بەیـانــی عـــاشــــقـــان شـــــتـێـکـی دیـیە
شـــــەوانـــی نـــووتەک کە تەواو دەبـــێ
خـۆشـــــیـیەکەی وایە هەر بـۆ بـاس نـابـێ
عەشـــــق شـــــتـێـکـــی خەیـــاڵاویـــیە
پەســـــنی چی؟ یەکســــەر خۆشـــی و شـــادییە

"دوای ئەوە ئینسول‌وجوود ڕووی لە خزمەتکارە ئیسفەهانییەکە کرد و لێی پرسی: 'ئەو کۆشکە کێی تێدایە و کێ درووستی کردووە؟' پیاوی‌ماڵییەکە گوتی: 'ئەو کۆشکە وەزیری فلان پاشا بۆ کچەکەیی درووست کردووە هەتا لە مەترسیی ڕۆژگار بیپارێزێ. ئێستا ئەو لەگەڵ دەســـتوپێوەندەکانی لێرەدا دەژین. دەرگای ئەو کۆشـــکەش ســـاڵێ جارێک نەبێ نایکەنەوە. ئەویش ئازووقە دێنن.' ئینســـول‌وجوود لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ســـپاس بۆ خودا ئەوە دیتمەوە. بەڵام تا ئەو ماوەیە تەواو دەبێ، قیر سپی دەبێ.' ئینسول‌وجوود کاری بێرە گەیشت.

"وەردول‌ئەکمامیش لەو لاوە نە خەو و خۆراکی هەبوو، نە حەسانەوە. خۆشەویستی و ئەڤین لە پێی خست و حەجمینی لێ بڕی. هەستا ویستی بچێ لە دەوری کۆشک پیاسەیەک بکا، بەڵام هیچ ڕێگایەکی نەدیتەوە. ناچار دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەر چـواردەوری تەنـیـوم هـێـزی ڕەشــــی دەســــەڵات
ناهێڵێ بۆ ســـاتــــــــــــــــێکیش من دەرکەوم لە قەڵات
بڵێی هــــــــــــــەتا کەی ئاوا دەوروبەرم تەنرابێ؟
توانای فڕیــــــــــــــــــــــنم نەبێ و پەڕ و باڵم کرابێ؟
بەڵام قەت ئەوە من نـــــــــــیم لە بەنــدا جێم بێتەوە
ڕێـــــــــــــــگەی ڕزگاری دەگرم، گەر تەرمم بچێتەوە

"دوای ئەوەی وەردول‌ئەکمام ئەو شــێعرەی خوێندەوە، لە ســـەربانی کۆشـــکەوە بە

گوریسێک خۆی ڕۆهێشته خوارێ و له کۆشک هاته دەرێ و ڕووی له دەشت و سارا کرد هەتا گەیشــته قەراخ دەریا. ســەیری کرد ئەوه ڕاوچییەک لەنێو لۆتکەیەکدا دانیشــتووه و خەریکه ڕاو دەکا. که وەردول‌ئەکمامی دیت، له قەراخ دوور کەوتەوه و بەرەو نێوەڕاســتی دەریا ڕۆیشت. وەردول‌ئەکمام به شێعرەوه هەرای کردێ و گوتی:

چارەنووس پشتی تـــــــــێ کردووم تۆ بۆ ئاوا بێبەزەیی؟
بۆچی دەڕۆی به جێم دێڵی؟ گەر کێویم تۆ بمکه کەوی
هەگبەیەکم به کۆڵەوه پـــــڕپــــڕ له ئـــــــــاواتی تازه،
بگەڕێـــــــــــــوه منیش بەره، حەز دەکەم له دنیای تازه
دڵێک تـــــــــــێنووی دیدارمه و هەناوم له سوێی سووتاوه
دەبێ ئەوڕۆکه بـــــــــــــیگەمێ، دڵی پڕپڕ له زووخاوه
دڵی دڵدار برینداره، چۆڕچۆڕ خوێـــــــــــنی لێ دەچۆڕێ
گەر دەتەوێ خـواگـیـر نەبـی، زووبه خـێـرا که وەگەڕێ

"که ڕاوچییەکه ئەو شێعرەی بیست، دەورانی لاوییەتی خۆی وه بیر هاتەوه و دەسـتی کرد به گریان و گەڕاوه. ئەو شێعرەی خوێندەوه:

دڵـــــــــــــم پڕ کۆنەبرینه
قـاچـم مـانـدووی ڕێـی ئەوینه
ناتـــــــــــوانم تۆ بەجێ بێڵم
که دڵـــت پـــڕ له بـــریـــنه

"که شـێعرەکەی تەواو کرد، پەتکی لۆتکەکەی له قەراخەوه له شـتێک بەسـتەوه و هاته لای وەردول‌ئەکمام و پێی گوت: 'وەره لەگەڵم ســـوار به؛ کوێت پێ خۆشــــه هەتا بتبەم.' وەردول‌ئەکمام ســـواری لۆتکەکه بوو. ڕاوچی ســـەوڵی لێدا و خێرا ئاژۆتی هەتا گەیشــتنه قەراخ شارێک."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## کە شەوی سێسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، لە ڕۆخ دەریا گەیشتنە شارێک. ئەو شارە پاشایەکی بەڕێز و خاوەن بەزەیی هەبوو. دەرباس پاشایان پێ دەگوت. لەو جەنگەیەدا دەرباس پاشا لەگەڵ کوڕەکەی لە بەرجەوەندی کۆشکەکەیانەوە دەیانڕوانییە دەوروبەر، لەپڕ چاویان بە لۆتکەیەک کەوت کە بەرەو قەراخ دەهات. لە دوور دیتیان کچێکی تێدایە.

"ئیدی پاشا لە کۆشک هاتە خوارێ. سەیری کرد ئەوە ڕاوچییەکە لۆتکەکەی لە قەراخ ئاوەکە ڕاگرتووە و خەریکە دەیبەستێتەوە. کچەش لە لۆتکەکەدا خەوتووە. کچە دەڵێی مانگە و لە کەل دێتە دەرێ. گوارەی بەلەخشی لە گوێدایە و ملوانکەی گرانبایی لە مل. پاشا زانی ئەوە کچە پاشا و گەورانە. کچەی هەستاند و لێی پرسی: 'ئەتۆ خەڵکی کوێی؟ کچی کێی و چۆنە هاتوویە ئێرە؟' وەردولئەکمام گوتی: 'ئەمن کچی ئیبراهیمم—وزیری شامخشا.' ئیدی هیچی لێ نەشاردەوە و هەرچی بوو، گوتی. دوای ئەوە دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

گەوهەرێکی نایاب بووم لە ماڵی خۆم
هەڵوەدا و بێئەنوام، لەبەر دڵی خۆم
ئاشق بووم و دڵم فڕی لە دەستم
بە تاوانی خۆشەویستی وا پەستم

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، لەسەرڕا بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە و بە گریانەوە ئەو شێعرەشی بۆ خوێندەوە:

خاوەنشکۆ لە شکۆت ڕادەبینم
جارێکی دی ئەڤیندارم ببینم
وێڵی سارای ئەو توولەنەمامەم من
تەرە و لانەواز، عەوداڵی ئەوم من

"کاتێک پاشا قسەکانی ئەوی بیست و ئاگاداری دڵەی پڕ لە کوڵی بوو، بەزەیی پێیدا هات، گوتی: 'خەمت نەبێ، ئەمن کارێک دەکەم بە ئاواتت بگەیەنم و ئەو کەسەی خۆشت دەوێ بۆت بێنمە ئێرە.' پاشا ئەو شێعرەی خوێندەوە:

گەورەیی لەوەدایە دڵی خەڵک خۆش بکەی

ژیانی نـــــوێ ڕۆ بنێی، ماڵـــــــــــــێکی دیکە چێ کەی
گـــــــوڵێکی وەک تۆ جـــــــــــوان ئاوا سیس و ژاکا بێ،
لای من نەنگ و شـــــــــــــــــوورەییە، باخەوانی وا نابێ
تـۆزی خەم لا دە لە ڕووت، حەیفە ئەو ســــیـمـا جوانە
دەنێرم بـــــۆت بهـــــــــــێنن، گـــــەر بڵێن لە ئاسمانە

"دوای ئەوە دەرباس پاشـا وەزیرەکەیی بانگ کرد. سوپایەکی زۆری نایە بەر دەستی. ماڵێکی زۆری وەک دیاری بۆ پێچاوە و پێی گوت: 'ئەو ماڵە بەرە بۆ شـامخشـا و پێی بڵێ کە لاوێکی لە لایە بە نێوی ئینسـولوجوود. بۆم بنێرێ دەمهەوێ کچەکەی خۆمی لێ مارە بکەم. دوای ئەوە نـامەیەکی نووســـی و دای بە وەزیر و پێـداگری کرد کە ئەگەر ئینسـولوجوود نەهێنێ، لەســـەر کاری لا دەبەم. بەو جۆرە وەزیر دیارییەکانی هەڵگرت و بەرەو وڵاتی شامخشا وەڕێ کەوت. کە گەیشتە لای شامخشا، سڵاوی دەرباسی پێگەیاند و نامە و دیارییەکانی دایە. کاتێک پاشـا نامەکەی خوێندەوە و ناوی ئینسولوجوودی دیت، تێر گریا. بە وەزیری دەرباســی گوت: 'ئەوەی ئەتۆ هاتووی بە شــوێنیدا، لەکوێیە؟ وەزیر، ئەوەی تۆ لێی دەگەڕێ ڕۆیشـتووە و ئێمە بە جێ و شـوێنی نازانین. ئەتۆ ئەوم بۆ ببینەوە، ئەمن چەند قاتی ئەو دیارییانەت دەدەمێ.' دوای ئەوە شـامخشـا دەسـتی کرد بە گریان و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە.

ئەمانەتی خودا بوو ئەو لاوە شـــــــــــــۆخ و شەنگە
لاوێکی چوســـــت و چـالاک ڕێـک هەر دەڵێی خەدەنگە
زانا و بەنەزم و ژیـــــــــــــــــرە، هەر بابەتی وەزیرە
بە کۆچی ناوادەی ئەو کـــــــــــــــۆشک مات و بێدەنگە

"ئینجـا ڕووی کردە وەزیری دەربـاس پـاشـــــا و پێی گوت: 'ئەتۆ بچووەوە بۆ لای گەورەکەتان و پێی بڵێ کە ئینسولوجوود ساڵێکە سەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە و کەس نازانێ لە چ وڵاتێکە.' وەزیر گوتی: 'پاشـــا، دەرباس پاشـا پێی گوتم کە ئەگەر ئەمن نەیبینمەوە، لەسەر کارم لا دەبا. چۆن بگەڕێمەوە لای ئەو؟' شامخشا بە وەزیرەکەی خۆیی گوت: 'ئیبراهیم، ئەتۆ هەستە لەگەڵ وەزیری دەرباس بڕۆ تەواوی ئەو وڵاتانەی دەوروبەر بگەڕێن.' ئیبراهیم گوتی: 'باشـــە بەســـەر چاو.' ئیدی دەســـتوپێوەندی خۆی هەڵگرت و بە هاوڕێیەتی وەزیری دەرباس چوون وە پێ‌وشوێنی ئینسولوجوود کەوتن."
لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئیدی ئیبراهیم دەســـتوپێوەندی خۆی هەڵگرت و بە هاوڕێیەتی وەزیری دەرباس پاشا چوون وە پێوشوێنی ئینسولوجوود کەوتن. دەچوونە هەر کوێیەک و هەر کەســـێکیان دەدیت، پرســـیاری ئینســـولوجوودیان لێ دەکرد. کەس بە هەواڵی نەدەزانی. بەردەوام بە شـار و گوندانذا دەسووڕانەوە، دەشت و کێو و سـارا گەڕان هەتا گەیشـــتنە قەراخ دەریای گەنجینە. گەمیەیان ســـاز کرد و لێی ســـوار بوون. بە دەریادا ڕۆیشتن، ڕۆیشـتن هەتا گەیشتنە چیای سەکەلا. وەزیری دەرباس بە ئیبراهیمی گوت: 'بۆ بەو کێوە دەڵێن کێوی ســـەکەلا؟' ئیبراهیم گوتی: 'ئەوە لە ســـەردەمـانی زۆر زوودا جندۆکەیەک ئاشقی لاوێکی دەبێ. خۆشەویستییەکەیان وای لێ دێ ناتوانن دەست لە یەک هەڵگرن. کوڕە لە کەسوکاری دەترســـێ. هەر بۆیە دەگەڕێ جێیەک پەیدا بکا کە دەســـتی کەسیان نەگاتێ و خۆی بشارێتەوە. ئەو کێوەی دیتەوە کە تا ئێستا نە مرۆڤ و نە جندۆکە پێیان نەخســـتبووە ئەوێوە. ئیدی خۆشـــەویســـتەکەی برد و لەوێ داینا. بۆخۆی جارجار دەچووەوە بۆ لای کەسوکارەکەی. ماوەیەک ئاوا تێپەڕ بوو. هەتا منداڵیان لێ کەوتەوە. کاتێک بازرگانان بە دەریادا دەهاتن و ڕێیان دەکەوتە لای ئەو دوورگەیە، گوێیان لە دەنگی شـــین و گریـان دەبوو. ئەو شـــین و گریانەیـان وەک گریـانی ژنێک دەهـاتە گوێ کە منداڵەکەکانی لە دەســـت دابێ. دەیان گوت: 'لێرە ژنێکی 'ســـەکەلا'ی لێیە. ـــــ واتە ژنێکی جەرگسووتاوی لێیە ـــ هەر بەو بۆنەوە ناوی ئەو کێوەشیان نا 'سەکەلا'. وزیری دەرباس زۆری پێ سـەیر بوو. ئیدی هەر وا بەردەوام ڕۆیشـتن هەتا گەیشتنە دەرکی کۆشکەکە. لە دەرگـایـان دا. لەڕێوە دەرگـایـان کردەوە. ئیبراهیم چووە ژوورێ. لەنێو خزمەتکارەکانی وەردولئەکمامدا چاوی بە لاوێکی کزەڵۆک و شـێواو و لێوبەبار کەوت کە ئینسـولوجوود بوو. لە کۆیلەکانی دیکەی پرســـی: 'ئەوە کێیە و لەکوێوە هاتووە؟' گوتیان: 'ئەوە لاوێکی بازرگانە کە گەمیەکەی شـــکاوە و ماڵەکەی نغرۆ بووە، بەڵام بۆخۆی ڕزگاری بووە و شـــەپۆل بەرەو ئێرەی هێناوە.' وزیری شـامخشـا ئەوی لەوێ بەجێ هێشـت و چووە ناو کۆشـکەوە. سـەیری کرد وەردولئەکمامی کچی لەوێ نییە. لە کەنیزەکانی پرسـی، گوتیان: 'هەر چەند ڕۆژێک لەگەڵ ئێمە ماوە و، کەس نازانێ چوو بۆ کوێ و چۆن ڕۆیشت.' وەزیر فرمێسکی هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کچی شـــــــیرینتر لە گیان
لەکوێی ئەستـــــــێرەی بەیان؟
بابت زووخـــــــــاو هەڵێنێ
وا ژیـــــــــــنت دەشێوێنێ

ڕوو لە کویێ کەم ئێســـتـا من؟
شــــەرمەنـدەی دوو دنـیـا مــن

"کە شێعرەکەی تەواو بوو، گوتی: 'کەس ناتوانێ دەست لە کاری خودا بدا و چارەنووس چۆنی نووسی بێ، بەشـت هەر ئەوە دەبێ.' دوای ئەوە چووە سـەربانی کۆشـک. سـەیری کرد ئەوە گوریسـێک بە گوێسـوانەکەوە بەسـتراوەتەوە و شـۆڕ کراوەتەوە خوارێ. زانی کچەکەی لەوێوە خۆی ڕۆهێشـتووە و دەرباز بووە و لە کێوی داوە. بە گریان لە سـەربان هاتە خوارێ. بە خزمەتکار و شـتەکەی گوت: 'هەرکەسـەی بە لایەکدا وەدوای خانمەکەتان بکەون.' ئەوان چوون تەواوی وڵاتیان سـەنگوسـووژن دا، سـۆراخیان نەکرد. با ئەوان لێرەدا بەجێ بێڵین.

"ئینسولوجوود کە زانی وەردولئەکمام لە کۆشک چووەتە دەرێ، یەکبەخۆی قیژاندی و بە سـەری خۆیدا دا و بێهۆش بوو. ئەوان وایان زانی کە جەزبەیەکی خودایی بەسـەردا هاتووە.

"ئینسـولوجوود ماوەیەک بێهۆش بوو. خزمەتکارەکان دەسـتیان لێ شـۆرد. ئیبراهیمی وەزیریش لە تـاوی کچەکەی مـات و پەرێشـــان بوو. وەزیری دەرباســیش کە زانی ســـەفەرەکەی بێئاکام بووە، هەڵوێســتی گرت بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. ماڵاوایی لە ئیبراهیم کرد و پێشــی گوت: 'پێم خۆشــە ئەگەر ڕێ بدەن، ئەو پیاوە هەژارەی کە جەزبە گرتوویەتی لەگەڵ خۆم ببەم. ئێمە لە ئیســفەهان نیزیکین، بەشــکو بتوانێ بچێتەوە وڵاتی خۆی و لەو دۆخە ڕزگاری بێ.' ئیبراهیمی وەزیر گوتی: 'چۆنتان پێ خۆشە وا بکەن.' ئیدی هەرکام لەو دوو وەزیرە ماڵاواییان لە یەک کرد و هەرکەســـەی گەڕاوە بۆ زێدی خۆی. وەزیری دەرباس پاشا ئینسولوجوودی لەگەڵ خۆی بردەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەزیری دەرباس پاشا ئینسولوجوودی لەگەڵ خۆی بردەوە. سێ ڕۆژ بە ڕێوە بوون، لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا ئینسولوجوود هەر بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە،، بە وەزیریان ڕاگەیاند. وەزیر شەکر و گولاوی بۆ نارد. گولاویان بەسەردا هەڵپرژاند و شەکریان دەخوارد دا. بەردەوام ڕۆیشتن هەتا لە شارەکەی دەرباس پاشا نزیک بوونەوە.

"پاشا هەواڵی هاتنەوەی وەزیری پێ گەیشت. پیاوێکی نارد و پێی ڕاگەیاند کە ئەگەر ئینسولوجوودت نەهێناوە، مەیە نێو شارەوە. کە وەزیر فەرمانی پاشای بیست، ناڕەحەت بوو. وەزیر نەیدەزانی کە وەردولئەکمام لە لای پاشایە و نەیدەزانی بۆ ناردوویە لە شوێن ئینسولوجوود. ئینسولوجوودیش نەیدەزانی کە دەیبەن بۆ کوێ و ئاگاشی لەوە نەبوو کە وەزیریان ناردووە بە شوێن ئەودا. وەزیریش نەیدەزانی کە ئەو لاوە ئینسولوجوودە. ئیدی بانگی کرد، پێی گوت: 'پاشا منی ناردبوو کارێکی بۆ جێبەجێ بکەم. کارەکە بە دەسمەوە نەهات. ئێستا پاشا پیاوی ناردووە و فەرمانی داوە کە ئەگەر فەرمانەکەت بەجێ نەهێناوە، هەقت نییە بێیەوە نێو شار.' ئینسولوجوود لە وەزیری پرسی: 'کارەکە چی بوو؟' وەزیر تەواوی شتەکەی بۆ گێڕاوە. ئینسولوجوود پێی گوت: 'خەمت نەبێ. من بەرە بۆ لای پاشا. ئەمن هاتنی ئینسولوجوود مسۆگەر دەکەم.' وەزیر پێی گوت: 'بە ڕاستتە؟! یانی تۆ بەڵێن دەدەی بۆی بێنی یان بێ؟!' ئەویش گوتی: 'بە گەورەیی خودا بە ڕاستمە.' ئیدی وەزیر کەیفی ساز بوو. هەستا ئینسولوجوودی لەگەڵ خۆی برد و چوو بۆ لای پاشا. کە گەیشتنە لای پاشا، پاشا بە وەزیری گوت: 'ئینسولوجوود لەکوێیە؟' ئینسولوجوود گوتی: 'گەورەم پاشا، من بە شوێنی ئینسولوجوود دەزانم.' پاشا بانگی کردە لای خۆی و گوتی: 'ئینسولوجوود لەکوێیە؟' گوتی: 'ئینسولوجوود لێرە نیزیکە، بەڵام ئێوە پێم بڵێن ئینسولوجوودتان بۆچییە؟ هەتا من پێتان بڵێم.'

"پاشا هەستا ئینسولوجوودی بردە دیوێکی دیکە و ڕووداوەکەی لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بۆ گێڕاوە. ئینسولوجوود گوتی: 'پاشا، ئێوە جلوبەرگێکی گرانبایی و بەشکۆ بۆ من بێنن، هەتا ئینسولوجوودتان بۆ بێنم.' ئیدی جلوبەرگی پاشایانەیان بۆ هێنا و لە بەریان کرد. ئینسولوجوود گوتی: 'من ئینسولوجوودم.' دوای ئەوە ئەو شیعرەی خوێندەوە:

ئەوەی پێی وایە هەتاهەتایە<br>
هەتاوی هاتی لەپشت هەورایە

نــازانــێ ئــیــمــان و بــاوەڕ چــیــیە
گەورەیــی خــودای لە بەرچــاو نــیــیە
چــونــکە داهــاتــوو لــێــڵ و نــاڕوونە
ئــاڵوگــۆڕی ژیــن کــاری گەردوونە

"کاتێک ئینسولوجوود شێعرەکەی تەواو بوو، دەرباس پاشا پێی گوت: 'بە خودا ئەوینی ئێوە پاکترین ئەوینە. جێی سەرسووڕمانیشە!'

"پاشا بانگی قازی کرد و ئینسولوجوود و وەردولئەکمامی لێک مارە کرد. ئینجا دەرباس پاشا نامەیەکی بۆ شامخشا نارد و ئەوەی بەسەر ئینسولوجوود و وەردولئەکمامدا هاتبوو هەمووی بۆ نووسی و بە پیاوێکدا بۆی نارد. شامخشا بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوو، نامەیەکی بۆ دەرباس پاشا نووسی و گوتی: 'ئێستا کە ئەتۆ لەوێ ئەوانت لێک مارە کردووە، ئەمینش لێرە جێژن و ئاهەنگێکیان بۆ ساز دەکەم.' دوای ئەوە ئەسپ و هێستر و وشترێکی زۆری بە بارەوە لەگەڵ سوپایەک بۆ نارد. کاتێک نامەکە بە دەست دەرباس پاشا گەیشت، ماڵێکی زۆری دا بە وەردولئەکمام و ئینسولوجوود و سوپایەکی لەگەڵ ناردن هەتا گەیاندیاننەوە شارەکەی خۆیان. شامخشا گۆرانیبێژ و ژەنیارێکی زۆری هێنا و سفرە ڕاخرا. هەتا حەوت ڕۆژ میوانداری لە خەڵک کرا. هەموو ڕۆژێ دیاری و خەڵات بە گەورە و بچووک دەدرا و سفرە بۆ میوانی غەوارەش ڕادەخرا. دوای ئەوە ئینسولوجوود چووە پەردەوە و باوەشی بە وەردولئەکمامدا گرت و لە خۆشیان تێر گریان هەتا لە هۆش خۆ چوون."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كه شەوی سێسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئینسولوجوود و وەردولئەکمام لە خۆشییان لە باوەشی یەکتردا بێهۆش بوون. کە وە هۆش هاتنەوە، ئینسولوجوود ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەو بەینە هەرچـــــــی تـاڵی بـوو دیـتم
ئـــــــێش و ئـازاری دووری بوو دیتم
هـــــــێندە شـــیرن بوو دیتنەوەی یارم
دەســـــت و پێم ونە، وەک شـــێت و هـارم

"وەردولئەکمامیش لە خۆشی پێکگەیشتنیان ئەو شێعرەی خوێندەوە:

من دەمـــــــــــزانی بەهار دێت و خونچە دەمی دەکاتەوە
زستانی تـــــــــووش ڕادەبرێ و خۆشی دیسان دەگاتەوە
زۆرم بـــــــــینی ژیانی ڕەش، گریام بۆ دواڕۆژێکی گەش
دەپۆشـــم بەرگی زەرد و ســوور، لە بیر دەکەم دەورانی ڕەش

"ئینجا ئینسولوجوود لێوی وەردولئەکمامی ماچ کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ماچی لـــــــێوی ئاڵی تۆ بۆ من مانای ژیانە
ژینی بێ تــــۆ ئەستەمە بۆ من، دەرد و سندانە
خۆشە لە ئامــــــــێزتدا، بێ ترس لە ڕابردوو
لە یادتدا بینــــــــێژی چی برک و ئێش و ژانە

"هەتا حەوت ڕۆژان ئاوا لە عەیش و نۆش و شادی و خۆشیدا بوون و ئاگایان لە شەو ڕۆژ نەمابوو. دوای ئەوە لە پەردە هاتنە دەرێ و دیاری و خەڵاتیان بە سەر خەڵکدا دابەش کرد. پاشـــان وەردولئەکمام فەرمووی: 'گەرماو چۆڵ کەن.' بە ئینســـولوجوودی گوت: 'سۆمای دوو چاوم، حەز دەکەم بە تەنیا لە گەرماودا بتبینم' و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تـــــــینووی جەســــتەی پەمەییتم، دەرکەوە تۆ مـانگی من
چـاوەڕوانی بەســـــــە ئیدی، بوو بە خوێن دوو چـاوی من

"ئەوجار پێکەوە چوون بۆ گەرماو و ئەو ڕۆژەیان بە خۆشـــی تێپەڕاند. دوای ئەوە گەڕانەوە کۆشک و ژیانیان بە خێر و خۆشی بردە سەر، هەتا تێکدەری خۆشی و شادی و کۆڕەکان تەختی خۆشی لێ ئاوەژوو کردنەوە. پاک و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی ئاڵوگۆڕ و تێداچوونی بەسەر نایە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سێسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

**بەسەرهاتی هاڕوون و ئەبوونەواس**

گوتی: "خاوەنشــکۆ، خەلیفە هاڕوونەڕەشــید خووی وا بوو کە کار و باری دیوان و وڵات تەواو دەبوو، دەچووە شوێنێکی ئارام و بێدەنگ، شاعران و هاودەمەکانی خۆی بانگ دەکرد. بە هەڵکەوت ڕۆژێک ئاوا لە دەوری یەک کۆ ببوونە و هەرکەسەی لەسەر شوێن و پێگەی خۆی دانیشــتبوو کە ئەبوونەواس هاتە ژوورێ و ویســتی لە جێی خۆی دانیشــێ. خەلیفە هاڕوونەڕەشــید ئەو ڕۆژە ناڕەحەت و بێتاقەت بوو. بە تایبەت هێندێک کەس لە لای خەلیفە ســکاڵایان لەســەر ســووک و چرووکی ئەبوونەواس کردبوو. هەر بۆیە بە مەسروورى گوت: 'جلەکانی لە بەر داکەنن و کورتانی کەری پێدا دەن. ڕێشمە و هەوساری بەسەردا کەن و بە کۆشکی کەنیزەکاندا بیگێڕن، هەتا گاڵتەی پێ بکەن. دوای ئەوە سەری ببڕن و بیهێننەوە بۆ ئێرە.' مەسروو کورتانی لێ قایم کرد و ڕێشمە و هەوساری بە سەردا کرد و بە کۆشــکەکانی خەلیفەدا کە بە قەرای ڕۆژەکانی ســاڵ بوو، گێڕای. هەرکەس ئەبوونەواسی بەو حاڵە گاڵتەئامێزییەوە دەدیت، شتێکی دەدایە. کاتێک ئەبوونەواس هاتەوە، کۆشــێکی زێڕ پێ بوو. لەو جەنگەیەدا جەعفەری بەرمەکی وەزیر هــاتە ژوورێ. ئەبوونەواســی لەو دۆخەدا دیت و پێی گوت: 'ئەبوونەواس، تاوانت چییە ئاوایان لێ کردووی؟' ئەبوونەواس گوتی: 'هیچ تاوانێکم نییە جگە لەوەی کە شێعرە خۆشەکانی خۆم پێشــکەشــی خەلیفە کردووە. ئەویش جلی شــکۆداری خۆی بە شــانی مندا داوە.' خەلیفە هەرچەند ئەو هەمووەی ڕق هەســتابوو، پێکەنی و لێی خۆش بوو. فەرمانی دا هەنبانەیەکی زێڕ دەنێ."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی پێ هات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و هەشتایەم هاتەوە

## بەسەرهاتی کەنیزێک و خاوەکەی

گوتی: "خاوەنشکۆ، یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە، کەسێکی خەڵکی بەسرە کەنیزێکی زۆر زۆر جوانی کڕی. ئەوەندی کەنیزە چووبووە دڵەوە کە زێڕ و زیو هەرچی بووی لەڕێی ئەودا داینا و بۆی خەرج کرد هەتا هیچی نەما و دەستی لەبنی هەنبانە هاتە دەرێ. کەنیزەکەی زگی پێی سووتا و گوتی: 'من بفرۆشە و پارەکەی بدە بە بژیوی خۆت.' خاوەنەکەی هێندەی لێ قەوما بوو، بە ناچاری قەبووڵی کرد و بردی بۆ بازاڕ. دەڵاڵێک دڵی گرتی و بە پێنجسەد دیناری زێڕی سوور کڕیی و پارەکەی دا بە خاوەنەکەی. خاوەنەکەی پارەکەی وەرگرت و ویستی بچێتەوە. کەنیزە دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەرچەند ئاوا لێک دابڕاین، قەت دانابڕێ دڵی من
بۆ هەرکوێ بچی بە دواتا، چاوان دەگێڕێ دڵی من

"کاتێک خاوەنەکەی ئەو بەیتەی بیست، بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مردن بۆ من شتێک نییە، دە با بمرم لە تاوانا
بەڵام ناتوانم ببینم ڕەنگت زەردە لە برسانا
من و تۆیان نەگوتووە ماڵی من شیاوت نییە
ئاواتەخوازم بێتە ڕێت، چی بەزم و خۆشی و شادییە

"کاتێک دەڵاڵەکە ئەوانەی ئاوا دیت، گوتی: 'بە خودا من قەت ناتوانم ئەو دووانەتان لە یەک جودا کەمەوە، چونکە بە ڕاستی ئێوە ئەویندارێکی دڵپاکن. ئەو ماڵەش هەر بۆ خۆت و دەستی کەنیزەکەشت بگرە و بڕۆوە، چونکە ئەمن ناتوانم دوو دڵی ئاوا لێک داببڕم.' ئیدی کەنیز و خاوەنی دەستی کابرایان ماچ کرد و گەڕانەوە. هەتا ئەو کاتەی مردن، لێکی جوێ کردنەوە بە یەکەوە بوون."

**چیرۆکی کاریگەری ئەوین**

"یەکێکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە پیاوێک لە هۆزی بەنی عوزرە، هەر لەگەڵ جوانانندا خەریکی عیشـــقبازی بوو. بە هەڵکەوت هەر لەو هۆزەی خۆیان چاوی بە ژنێکی جوانی دەلال کەوت و چووە دەڵییەوە و ئاشقی بوو. هەموو ڕۆژێ نامەی بۆ دەنارد. بەڵام ئەو ژنە گوێی نەدەدایە و بە هێندی نەدەگرت. تا وای لێ هات کابرا لە تاوان نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت. لە خەو و خواردن بوو. خەڵک پێیان زانی و وەک ئەویندار نێوی کەوتە سەر زار و زمانان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

# کە شەوی سێسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو پیاوە لە جێدا کەوت. ئێش و ئازارەکەی هەر دەهات و پەرەی دەستاند. ژن و پیاوی ئەو هۆزە لەبەر ئەو ژنەیان هەڵدەخوێند کە ئاورێکی لێ بداتەوە. ئەو خانمە دەلالە وەلامی کەسـی نەدەداوە. تا وای لێ هات کابرا کەوتە ئاویلکەدان. چوون ئەو شـۆخەیان ئاگادار کردەوە. ئیدی وا بوو، بەزەیی بەو ئەویندارە سـەوداسـەرەدا هات. چوو بۆ لای. کە ئەو پیاوە عەوداڵە چاوی بەو خـانمۆڵە کەوت، رۆندکی هـاتنە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دەمـــــزانی دێی دڵی تینووم تێراو دەکـــــەی
بە هـاتـنـت مـالـم پـڕ لە گـولاو دەکەی
قـــــــــــــەلای خەمم بە بزەیەک دەڕووخێنی
هەرچـی خەم و دەرد و ژانە دەیـتـاریـنـی

"کاتێک ژنە چاوی بەو گریانە کەوت و ئەو شـێعرەی بیسـت، دەسـتی کرد بە گریان و پێی گوت: 'بە خودا قەت من باوەڕم نەدەکرد کە ئەوینی تۆ گەیوەتە ئاسـتێک ئاوا لەرێی خۆشـەویستی مندا گیانی خۆت بخەیە مەترسییەوە. ئەگەر بمزانیبایە ئاوای، زووتر دەهاتم بە هاناتەوە و دڵی تینووتم تێراو دەکرد.' هەر کە کابرای ئەویندار قسـەکەی ئەوی بیسـت. دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

مـن ڕازی نـیـم تـۆ بـبـیـنـم خەفەت دەخـۆی، ئـازیـزەکەم
بەو دیدارە سـ‌ــــــــــــــــــوکناییم هات، بشـمرم گلەیی ناکەم

"پاشـان یەکبەخۆی هاواری کرد و گیانی دەرچوو. ئیدی ژنە شۆخەکە خۆی بەسـەردا کێشـــا و دەســـتی کرد بە گریان و ماچکردنی هەتا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە. وەسیەتی کرد هەر کاتێک مرد ئەویش بخەنە گۆڕی ئەو ئەویندارەوە. دوای ئەوە فرمێسکی باراند و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تکـا دەکەم خوای بـانی سـ‌ــەر
لە تەمەنـی مـنـی خە سـ‌ــەر
من چـــــــــــوزانـم ئەو ئاوایە
خۆشـەویـــســتـی بۆی دەوایە

"دوای ئەوەی شـێعرەکەی تەواو بوو، دەسـتی کرد بە گریانێک کە هەتا بێهۆش نەبوو لێی نەبڕییەوە. ئیدی بۆ سـێ ڕۆژان بەردەوام لە شـۆبەدا[1] بوو. هەتا وای لێ هات ئاخری گیانی دا و ئەویشیان لە گۆڕی کابرای ئەویندارد ناشت."

### بەسەرهاتی دوو هاوپۆل

"یەکی دیکە لەو بەسـەرهاتانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە کوڕێک لەگەڵ کچێک پێکەوە لە خوێندنگەیەک وانەیان دەخوێند و هاوپۆل بوون. کوڕە دڵی چووبووە کچە و هۆگری ببوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١. شۆبە: بەردەوام لە حاڵی لەخۆچوون و وەخۆهاتنەوەدا بوون.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، کوڕە ئەوینداری کچە بوو. ڕۆژێـک لە ڕۆژان کە منداڵەکـان خافڵابوون، کوڕە لەسەر دەفتەری کچە ئەو بەیتەی نووسی:

تۆ دەزانی دڵی شەیدام گوڕووی گرتووە و تــــۆی دەوێ؟
حەجمینی نێ ڕۆژ و شــەوێ، بۆ چرکە ســاتێک ناسـرەوێ
مــنــی ئەویـنـداری دامــاو چـاوەڕێـتـم تـێـمـگەیەنـی
ئاخۆ تۆش هەر وەکوو من وای، یـان حەز ناکەی بمدوێنی؟

"بە هەڵکەوت مامۆسـتاکە چاوی بەو نووسـراوەیە کەوت و خوێندییەوە. بەزەیی پێیدا هات و لەژێرییەوە ئەو چەند بەیتەی نووسی:

پێت وایە دڵـــــــــــــــی من ناکورکێنێ؟
چـــاوی پـــڕ لە ئەویـنـت دەبـینـــی
چەنـدە تۆ شـــەیدا و ســـەوداســـەرم بووی
تـــۆش ئـاوا بەنـاو دڵـی مـنـدا چـووی

"سەیر لەوەدا بوو، لەو جەنگەیەدا خاوەنی کچەکە هات بۆ خوێندنگە و کاغەزەکەی دیت کە ئەو شـیعرانەی لەسـەر نووسـرابوو. لەڕێوە ئەویش دەسـتی دا قەڵەم و ئەو بەیتەی لەسەر نووسی:

ئێســتـا کە خۆشـــەویســتیتان وەکو لاولاو تێک ئالاوە
هـــــــــــیوادارم پیرۆزتان بێ منیش دەخۆم لەو پڵاوە

"دوای ئەوە قازی و شـایەدیان هێنان و هەر لەو شـوێنە کچەیان لە کوڕە مارە کرد و پڵاوی شـایی سـاز کرا. ئیدی بە خێر و خۆشـییەوە پێکەوە ژیان هەتا مەرگ بەربینگی پێ گرتن.

**بەسەرهاتی موتەلەممیسی شاعیر**

"یەکی دیکە لەو بەسەرهاتانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە موتەلەممیس[1] [یەکێک لە شاعیرانی دەرباری نوعمانی کوڕی مونزوور،] ڕووداوێکی بۆ دێتە پێشێ و لە ترسی نوعمان هەڵدێ. ماوەیەک خۆی لێ دەشارێتەوە. تا ئەو جێیەی خەڵک پێیان وا بوو موتەلەممیس مردووە. ژنێکی زۆر جوانیشی هەبوو، ناوی ئومەیمە بوو. خزم و کەسی ئەو ژنە هەڵیانپێچا دەبێ مێرد بکاتەوە. ئەویش بە قسەی کردن، هەرچەند زۆریش ناڕەحەت بوو. ئیدی هەر لە هۆزەکەی خۆیان دایان بە پیاوێک و لێیان مارە کرد. موتەلەممیس ئومەیمەی خێزانی زۆر خۆش دەویست. شەوی گواستنەوەی هات. بە هەڵکەوت هەر لەو شەوەدا موتەلەممیس هاتەوە. گوێی لە دەنگی دەف و گۆرانی و بلوێر بوو. لە چەند منداڵێکی پرسی: 'ئەوە چ باسە؟ ئەو ئاهەنگە چییە؟' منداڵەکان گوتیان: 'ئەوە ژنەکەی موتەلەممیسیان داوە بە کابرایەک ئەمشەو دەیگوێزنەوە.' موتەلەممیس کە ئەو قسەیەی بیست، بە هەر فێڵێک بوو خۆی لەنێو ژنانی دەوری بووک ڕاکرد. سەیری کرد ئەوە ژنەکەی لە لای کابراوە دانیشتووە و بە گریانەوە لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

تاڵی و سوێری بەشی منە
خۆشی و شیرنی لێم ونە

"موتەلەممسیش بەو شێعرە وەڵامی داوە:

ئۆغرت خێر بێ ئازیزم
دوور لە تۆ لە ژینیش زیزم
خۆشیت نەدی بە دەستمەوە
بڕۆ ئەوجار بحەسێوە

"لەو جەنگەیەدا زاواش ئەوی ناسییەوە و خێرا لەوێ هاتە دەرێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

جوانە خۆر لە ئامێزی ئاسمانا بێ
لەوێ نەبێ ژینیش مانایەکی نابێ

"دوای ئەوە موتەلەممیس لەگەڵ ژنی خۆی بە خێر و خۆشی ژیان. هەتا مردن هات و بارگە و بنەی پێ تێکەوە پێچان. پاکە ئەو خودایەی کە نامرێ.

---

١. شاعیرێکی بەناوباگی سەردەمی نەفامییە کە ناوی "جورەیری کوڕی عەبدولمەسیح" بووە. لەپاش خۆی کتێبێک بە ناوی "دیوان"ەوە بە گێڕانەوەی "ئەسمەعی" بەجێ ماوە. (و. ف.)

**چیرۆکی هارووونەڕرەشید و زبێدە**

"یەکی دیکە لەو چیرۆک و بەسەرهاتانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە هارووونەڕرەشید زبێدەی زۆر خۆش دەویست. هەر بۆیە بۆ سەیران و حەسانەوەی زبێدە شوێنێکی بۆ چێ کردبوو، حەوزێکی گەورەی تێدا بوو. لە دەوری ئەو حەوزە داری وا وای چەقاندبوو کە ئەگەر کەسێک چوو با ناو ئەو حەوزەوە، لەبەر چڕی و پڕی دار و گەڵاکان دیار نەدەبوو. بە هەڵکەوت ڕۆژێک زبێدە چووە ئەو شوێنە و چاوی بەو حەوزە کەوت. سەری لە خۆشی ئەو جێگایە و ئەو ئاو و دارانە کە وەک پەرژینێک بە دەوری ئاوەکەدا هاتبوونەوە، سوور مابوو. ئەو ڕۆژەش زۆر گەرم بوو. هەر بۆیە جلەکانی داکەند و چووە ئاوەکەوە. لەنێو ئاوەکەدا ڕاوەستابوو. بەڵام ئاوی حەوزەکە ئەوەندە نەبوو کە تەواو لەشی داپۆشێ. ناچار زبێدە بە گڵێنە ئاوەکەی بە خۆیدا دەکرد. خەلیفە زانی کە زبێدە چووەتە حەوزەکەوە. لەڕێوە خۆی گەیاندێ و لەپشت دارەکان خۆی مات دا. لە لەشی ڕووتی زبێدە ڕاما. دوای ماوەیەک زبێدەش هەستی کردبوو کە خەلیفە لە شوێنێکەوە خۆی لێ مات کردووە و سەیری لەشی ڕووتی ئەو دەکا، شەرمی کرد و بە هەردووک دەست پێشەوەی خۆی گرت. خەلیفە پێی سەیر بوو. لەڕێوە ڕووی وەرگێڕا و گەرەکی بوو شێعرێک بڵێت و گوتی:

'جوانێکم دی ئافەتی زانست و دینم'

"دوای ئەوە هیچی بۆ نەهات و نەیزانی چی بڵێ. هەر بۆیە ئەبوونەواسی بانگ کرد. کە هات، خەلیفە پێ گوت: 'شێعرێکم بۆ بڵێ کە یەکەم نیوەبەیتی ئەوە بێ: 'جوانێکم دی ئافەتی زانست و دینم.' '

"ئیدی ئەبوونەواسیش دەمودەست ئەو شێعرەی گوت:

جوانێکم دیت ئافەتی زانست و دینم
چۆن پێو بڵێم، چۆنی قلْپ دا ئەوینم؟
کانگایەک بوو پڕ پڕ لە گوڵ و لە جوانی
لەو ئاوەدا وەکوو مرواری بوو گیانی
جەستەی ئاو و ڕۆحی ئاو و هەستی ئاو بوو
ئەو شوێنەی وا دڵ دەیخوازێ لە بەر چاو بوو

"خەلیفە هارووونەڕرەشید پێکەنی و دیاری و خەڵاتێکی باشی دایە و ئەبوونەواسیش بە دڵێکی خۆشەوە ڕۆیشتەوە."

# که شەوی سێسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

## چیرۆکی هاروونەڕڕەشید و شاعیران

گوتی: خـاوەنشـــکۆ، یەکی دیکە لەو چیرۆکـانە ئەوەیە دەگێڕنەوە کە خەلیفە هاروونەڕڕەشید شەوێک خەوی لێ زڕابوو. هەستا لە کۆشکدا کەمێک پیاسە بکا، تووشی کەنیزێکی بوو کە لەبەر مەستی بە لادا دەهات. خەلیفە ئەو کەنیزەشی زۆر خۆش دەویست. کەمێکی گەمە و دەستبازی لەگەڵ کرد و داوای لێ کرد. کەنیزە گوتی: 'ئەمشەو لێم گەڕێ. بۆ شـــەوێکی دیکە، ئەمشـــەو ســـاز نیم و نەمدەزانی دێیتە لام.' ئیدی خەلیفە دەســـتی لێ کێشـاوە و ڕۆیشـت. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە کۆیلەیەکی نارده لای تا ئاگاداری کاتەوە کە شـــەو خەلیفە میوانی دەبێ و دەچێتە دیوەکەی ئەو. کەنیزە بە کۆیلەکەی گوت: 'بە خەلیفە بڵێ: 'کەلام اللیل یمحوه النهار.'[1] هاروونەڕڕەشید کە ئەو قسەیەی بیست، بە هاونشینەکانی گوت: 'شێعرێکم بۆ بڵێن کە ئەو میسرەعەی تێدا بێ: 'ڕۆژ قسەی شەو دەسڕێتەوە.' '

"گورج ڕەقاشی[2] هاتە پێشێ و ئەو دوو بەیتەی گوت:

هەر کە باســـــــــی گوڵ دەکرێ، من ڕووی ئەوم بیر دێتەوە
بێ بەڵا بێ ئەو بەفـــــــــــــــــیزە منی وە بیر نایەتەوە
دەڵـــــــــــــــــێم: 'ئازیزم تکایە دڵـم بەرگەی جەفا ناگرێ'
دەڵێ: 'قســـەی شـــەو خەیاڵە، ڕۆژ قســـەی شـــەو دەســـڕێتەوە

"دوای ئەوە ئەبوومولسعەب هاتە پێشێ و ئەو دوو بەیتەی گوت:

گوتم: 'ئاخر ئازیزەکەم شێت بـــــــــــــووم تا وادەی هاتەوە
بژاردم چرکە بە چرکە و عەوداڵ بـــــــــــووم من بە دواتەوە'
گوتی: 'لە بیر کە شتی وا، بە هـــــــــێند مەگرە قسەی شەوێ،
گفتی شـــەوێ هەر خەیاڵە 'ڕۆژ قســـەی شـــەو دەشـــواتەوە

"دوای ئەو، ئەبوونەواس هاتە بەرەوە و ئەو دوو بەیتەی گوت:

تۆ گوتت: مۆڵەتم بدە، شەوێ تر مـــــــــــــــــیوانیت دەکەم

---

١. واتە: "ڕۆژ قسەی شەو دەسڕێتەوە."

٢. یەزید ڕەقاشی شاعیری عەرەبیوێژی ئێرانی، خەڵکی ڕەی، سەناخوێنی بەرمەکییان و شاعیری دەرباری هاروون کە لە ساڵی ٨١٤ کۆچی کردووە. (و. ف.)

هەست و سۆز و خۆشەویستی چیم هەیە پێشکەشیت دەکەم

پاش ئەوەی وادەی هاتەوە بە منت گوت بە نازەوە:

'ڕۆژ قسەی شەو دەسڕێتەوە، چی شەوم بیر نایەتەوە.

"ئیدی خەلیفە یەکی توورەکەیەکی زێڕ دانێ، جگە لە ئەبوونەواس کە فەرمانی دا بیکوژن. پێی گوت: 'ئەوە تۆ شەوانە هەر بە دوای منەوەی بزانی چی دەکەم و چی ناکەم؟' ئەبوونەواس سوێندی خوارد: 'کوڕە بە خودا ئەمشەو پێم لە ماڵی خۆمان نەترازاوە! هەر بە قسەکەی خۆتدا زانیم چی ڕووی داوە.'

ئیدی خەلیفە لێی خۆش بوو. دوو توورەکە زێڕیشی دایە.

**چیرۆکی موسعەب و ئایشێ**

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە موسعەبی کوڕی زووبەیر چووە لای عیززە کە ژیرترین ژنی مەدینە بوو. پێی گوت: 'دەمەوێ لەگەڵ ئایشێی کچی تەڵحە زەماوەند بکەم. هاتووم بچی جوان چاوی لێ بکەی و لێی ورد ببیتەوە و بزانە جوانی و دەلالییەکەی چۆنە.'

"عیززە چوو بۆ لای ئایشێ و هاتەوە لای موسعەب. پێی گوت: 'ئایشێم دیت، ڕوخساری دەڵێی مانگی چواردەیە. چاوەکانی دەڵێی گەلاوێژە، دەمی هێند بچووکە دەنکە گلارەی بە حاڵ تێوە دەچێ. گەردنکێلە و پێستی هێندە سپی و ناسکە مێوژەرەشکە بخوا لە گەروویدا دیارە. جووتێک هەناری لەسەر مەرمەڕی سینەیەتی بە خەونیش نەدیتراون. ناوکی دەڵێی چاڵی چەنەیە و بە ڕووی پیاو پێدەکەنێ. لاق و پووز و بەلەکی وەک پەنیری تەڕ هەر باسی ناکرێ. تەنیا شتێک کە وەک عەیب بێتە بەرچاو، ئەوەیە کە قاچی تۆزێک گەورەیە.'

"موسعەب گوتی: 'قاچی گەورە بە عەیب حیساب ناکرێ.' ئیدی زەماوەندی لەگەڵ کرد و پێک گەیشتن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، دوای ئەوە عیززە ئایشێی لەگەڵ ژنەکانی دیکەی قورەیش بانگهێشت کردە ماڵی خۆیان. ئایشێ بە یادی موسعەب ئەو دوو بەیتەی گوت:

بالا بەرزیی و شانوشکۆی هاوتای نییە
قوزیی دەنگی داوەتەوە، خەتام چییە
گەر بیستەوە لە سوێی تۆ دیقم کردووە
کاری دڵمە، چارەی دی شک نەبردووە

"ژنێک گێڕاویەتەوە: 'لە لای ئایشێی کچی تەڵحە بووم، مێردەکەی هات بۆ لای. ئەویش ئەوەندەی نازونووز بۆ کرد و خۆی تلیساندەوە، ئەمن لەوێ شەرمم دەکرد. کاتێک مێردەکەی ڕۆیشت، بە ئایشێم گوت: 'ئەوە چۆناوچۆن بوو تۆیەک کە لە هۆزێکی وا ڕەسەن و ماقووڵی، لە لای من ئاوا جووڵایتەوە؟' ئایشێ گوتی: 'لەسەر ژنان فەرزە لەگەڵ پیاوەکانیان ئاوا بە نەرمونیانی و ناز و کرێشمەوە بجووڵێنەوە و ئەوەندەی بۆیان دەکرێ کارێک بکەن ئارەزووی پیاوانەیان بجووڵێنن.' گوتم: 'نازونووز باشە، بەڵام بە شەو' ئایشێ گوتی: 'بە ڕۆژ ئاوا دەکەم و شەویش خراپتر.' ' "

### بەسەرهاتی ئەبوولئەسوەد

"دەگێڕنەوە: ئەبوولئەسوەد کەنیزێکی خێلی کڕی، زۆری خۆش دەویست. خزم و کەس و دەوروبەریانی لە لای خۆی لۆمەیان دەکرد و سەرکۆنەیان دەکرد. ئەبوولئەسوەد پێی سەیر بو و لە داخان هەر دەهات و دەچوو و، ئەو دوو بەیتەی دەخوێندەوە:

گەر بە چاوی مەجنوون بڕوانی
عەیبێک نابینی جگە لە جوانی
لەیلی ناحەزە، جا بە خەڵکی چی؟
مەرجە تۆ هەستی مەجنوون بزانی

### چیرۆکی زیانەکانی ڕازنەپۆشین

"یەکی دیکە لەو چیرۆک و نەزیلانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە کابرایەکی ئاشەوان کەرێکی

هەبوو ئاشی پێ دەگێڕا. ئەو ئاشەوانە ژنەکەیی زۆر خۆش دەویست. بەڵام ژنەکەی خۆشی لێی نەدەهات و حەزی لە پیاوێکی هاوسێیان دەکرد. ئەو پیاوەی هاوسێشیان ئەوی خۆش نەدەویست و دووری لێ دەکرد. شەوێک ئاشەوانەکە خەونی بینی، لە خەونیدا دەنگێک لە پێوارەوە پێی گوت: 'فڵانە جێی دیوی ئاشەکە بدەوە گەنجێکی تێدایە.' وە خەبەر هات، خەونەکەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. هەر کە کابرا خەوتەوە، ژنەکەی لەڕێوە هەستا چوو بۆ لای پیاوەکەی دراوسێیان و خەونەکەی بۆ گێڕاوە.“

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ژنی ئاشەوانەکە چوو خەوی مێردەکەی بۆ پیاوەکەی دراوسێیان گێڕاوە و پێکەوە شوێنەکەیان داوە. گەنجێکیان تێدا دیتەوە. ئەو پیاوە بە ژنی ئاشەوانەکەی گوت: 'ئێستا چی لەو گەنجە بکەین؟' ژنە گوتی: 'دەیکەین بە دوو بەشەوە، نیوەی بۆ من و نیوەکەی دیکەی بۆ تۆ. دوای ئەوە تۆ ژنەکەت تەڵاق بدە و منیش تەڵاق وەردەگرم و لەو جیا دەبمەوە. ئەوجار ئەتۆ مارەم بکە. کە پێک گەیشتینەوە،ماڵەکەش تێکەڵ دەکەینەوە.' ئەو پیاوە بە ژنی ئاشەوانەکەی گوت: 'من لەوە دەترسم شەیتان هەڵتخەڵەتێنێ و مێرد بە کەسێکی دیکە بکەی. وا چاکە تەواوی ئەو گەنجە لە لای من بێ هەتا تۆ سوور بی لەسەر تەڵاقوەرگرتن و بێی شوو بە من بکەی.' ژنە گوتی: 'منیش لە تۆ دەترسم و ماڵی خۆم نادەم بە تۆ، چونکە من شوێنەکەشیم بە تۆ گوتووە.' پیاوە کە ئەو قسەیەی لە ژنە بیست، هاتە سەر ئەو بیرە کە جگە لە کوشتن ڕێگای دیکەی بۆ نەماوەتەوە. لەجێوە ژنەی کوشت و لەو قوڵکەیەی هاویشت کە گەنجەکەیان لێ دەرهێنابووەوە. گەنجەکەی هەڵگرت و لە ئاشەکە چووە دەرێ. دوای ئەوە ئاشەوانەکە لە خەو هەستا. سەیری کرد ژنەکەی لە لای نەبوو. چووە ئاشەکە و کەرەکەی لە ئاش کرد و دەنگی دا. کەرەکە هەنگاوێکی نا و ڕاوەستا. ئاشەوانەکە دیسان دەنگی دا، کەڵکی نەبوو. لێی دا، هەر نەبزووت. ئەختوچاری کرد، کەرە نەبزووت. ئەوەندی لێی دەدا، زیاتر پێی دەچەقاند و پشتاوپشت دەکشاوە. چونکە تەرمی ئەو ژنە کوژراوەی لە قوڵکەی ئاشەکەدا دیبوو، نەیدەوێرا بچێتە پێشێ. ئاشەوانەکەش نەیدەزانی چ باسە و بۆ پشتاوپشت دەکشێتەوە. ڕقی هەستا کێردێکی هێنا و لە کەلەکەی کەرەی دا. بەڵام کەرەکە هەر بەرەو پێش نەبزووت. ئاشەوانەکە لە داخان یەک دوو کێردی لە کەلەکەی کەرەکەی دا و کەرە لەجێوە تۆپی. کە ڕووناک بووەوە، ئاشەوانەکە سەیری کرد ئەوە ژنەکەشی لە قووڵکەکەدا مردووە. زانی گەنجەکەش دەرهاتووە. ئیدی ئاشەوانەکە کە زانی گەنجەکە نەماوە و ژنەکەی مردووە و کەرەکەشی تۆپیوە، بەسەر سەری خۆیدا دا و تووشی خەم و پەژارەیەکی زۆر بوو. هۆکاری تەواوی ئەو نەهامەتییانەش نەپاراستنی ڕازەکەی بوو کە خەونەکەی لە لای خێزانی گێڕاوە."

### بەسەرهاتی کەر و گێلەپیاو

"بەسەرهاتێکی دیکە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە گێلەپیاوێک بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت و هەوساری کەرێکی بە دەستەوە بوو لە پێشیدا دەڕۆیشت. دوو پیاوی دزی چاوبەست چاویان پێی کەوت. یەکیان گوتی: 'من دەتوانم ئەو کەرە لەو کابرایە بستێنم.' ئەویدی

گوتی: 'چۆن لێی دەستێنی؟' گوتی: 'لەگەڵم وەرە با پێت بڵێم.' ئینجا فێڵبازەکە کەوتە دوای کابرا و لەپشتەوە چوو هەوسارەکەی لە ملی کەرە کردەوە. کەرەکەی دا بە هاوڕێکەی و هەوسارەکەی لە ملی خۆی کرد. ماوەیەک بەدوای کابرادا ڕۆیشت تا هاوڕێکەی کەرەکەی نەدیو کرد. ئینجا پێی چەقاند. گێلەپیاوە ئاوڕی داوە! سەیری کرد ئەوە هەوسارەکە بە ملی پیاوێکدا کراوە. لێی پرسی: 'ئەوە تۆ چییت؟ ئەو هەوسارە بۆ بە ملی تۆدا کراوە؟' دزە گوتی: 'من کەری تۆم. بەسەرهاتی من زۆر سەیرە. ئەویش ئەوەیە کە دایکی من ژنێکی پیری زۆر پاک و چاکەکارە. ڕۆژێک بە مەستی چووم بۆ لای. ئەویش بە منی گوت: 'ڕۆڵە. دەست لەو کارانە هەڵگرە و تۆبە بکە.' من دەستم دا دارێک و وەریگەڕامێ و لێم دا. ئەویش دۆعای لێ کردم. خودای گەورە منی هێنایە سەر بیچمی کەر و کەوتمە بەر دەستی تۆ. من ئەو ماوەیە لە بەردەستی تۆدا بووم. ئەمڕۆ دایکم بیری منی کرد و بەزەیی پێمدا هات و لە خودا پاڕاوە بمبەخشێ. خودای گەورە منی کردەوە بە مرۆڤ.'

"ئیدی ئەو کابرا گێلە گوتی: 'بیکە بۆ خاتری خودا ئەگەر من خراپەیەکم لەگەڵ تۆ کردووە، لێم خۆش بە!' هەوسارەکەی لە ملی کردەوە و گەڕاوە ماڵێ. لەبەر ئەو بابەتە مات و نارەحەت بوو. ژنەکەی لێی پرسی: 'چی بووە؟ ئەوە بۆ ئاوا ماتی؟ ئەی کەرەکە لەکوێیە؟' ئیدی پیاوە فەقیرحاڵەکە هەموو ڕووداوەکەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. ژنە گوتی: 'ئەیەڕۆ! یانی لەو ساوە ئێمە لە جیاتی کەر کارمان بە مرۆڤ کردووە؟!' ئیدی ژنە چوو سەدەقەی دا و تۆبەی کرد. کابراش ماوەیەک بێ کار لە ماڵێ دانیشت. ڕۆژێک ژنەکەی گوتی: 'هەتا کەی ئاوا لە ژوورێدا بێکار دادەنیشی؟ هەستە بڕۆ بۆ بازاڕ و گوێدرێژێک بکڕە و خەریکی کارێک بە.' گێلەپیاوە هەستا چوو بۆ بازاڕی یەکسمان. کەرەکەی خۆی ناسییەوە کە هێنابوویان بیفرۆشن. هەر بۆیە لێی چووە پێشێ و دەمی بردە بن گوێی و گوتی: 'قۆشمە. وا دیارە دیسان ئارەقت خواردووەتەوە و دایکت ئازار داوە، ئەویش دۆعای لێ کردووی. بە خودا من تازە بە خۆڕاییش تۆم ناوێ.' ئیدی لەوێ بەجێی هێشت و گەڕاوە بۆ ماڵێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

### بەسەرهاتی حاکم بیئەمریللا و میواندارەکەی

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە: ڕۆژێک لە ڕۆژان حاکم بیئەمریللا لەگەڵ خزمەتکارەکانی بە سواری دەڕۆیشتن. گەیشتنە باخێک. پیاوێکیان دیت، خزمەتکار و کۆیلە و کەنیز دەوریان دابوو. خەلیفە داوای ئاوی لێ کردن. ئاویان بۆ خەلیفە هێنا. دوای ئەوە کابرا گوتی: 'تکا لە خەلیفە دەکەم ئەو شـــانازییەمان بە قســـمەت کا و لا دەنە ئەو باخەی من.' خەلیفە بە دەســتوپێوەندەکانی گوت: 'لا دەنە ناو باخەکە.' ئەو پیاوە فەرمانی دا ســەد ڕاخەر و سەد دۆشەگڵە و سەد پشتی و سەد بەرکەشی پڕ لە میوە و سەد دەفر حەڵوا و ســەد گۆزەڵە خواردنەوەی ســەرخۆشــکەر بێنن. ئەوەندەی نەخایاند شــتەکەیان هەموو هێنرانە ئەوێ و ڕیز کران. خەلیفە حاکم بیئەمریللا سەری لەو کارە سووڕ ما و لێی پرسی: 'کاکە، مەگەر تۆ دەتزانی ئێمە دێین وا ئەو هەموو شــتەت دەمودەســت هێنا؟!' ئەو کابرایە گوتی: 'ناوەڵڵا، خەلیفە. من نەمدەزانی ئێوە دێن. من کابرایەکم بازرگان و مســـکێنی تۆم. سەد ژنم هەیە. کە زانیم جەنابتان گەورەم دەکەن و لا دەدەن. سەد کەسم نارد بۆ لای ئەو سەد ژنەم. ڕامسپاردن یەکی ڕاخەرێک و دۆشەگڵەیەک و پشتییەک و بەرکەشێک میوە و دەفرێ حەڵواو و گۆزەڵەیەک خواردنەوەم بۆ بنێرن. ئەوانیش دەستوبرد بۆیان ناردم. من زۆر ڕۆژ کە میوانم دێ، هەر ئاوا دەکەم.' ئینجا خەلیفە حاکم بیئەمریللا ســپاســی خودای کرد و گوتی: 'ســپاس بۆ خودا کە مســکێنی ئاوام هەیە ئەوەندە دەســتڕۆیشــتووە کە بێ ئەوەی لە پێشدا خۆی تەیار کردبێ، دەتوانێ میوانداری خەلیفە و دەستوپێوەندەکانی بکا.' ئەوجار دەستووری دا کە هەرچی درەمی لە خەزێنەدا هەمانە هی ئەمساڵ هەمووی بدەنێ. سوار نەبوون بڕۆن هەتا درەمەکەیان بۆ نەهێنا. حەوسەدهەزار درەم بوو. پاشـان خەلیفە بەو پیاوەی گوت: 'ئەوانە بۆ خۆتان خەرج بکەن. هەرچەند گەورەیی تۆ زۆر لەوانە زیاترە.' پاشان خەلیفە و سوارەکانی سوار بوون و ڕۆیشتن.

### چیرۆکی ئەنووشیروان و کچە دێهاتییەکە

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە ئەنووشــیرەوانی پاشــای دادگەر لە کاتی ڕاودا ســوار بوو کەوتە شــوێن ئاســکێک و لە دەســتوپێوەندەکانی دابڕا. ئەو کە بە شــوێن ئاسکەکەدا ڕۆیشت، لە دوور گوندێکی لێ وەدیار کەوت. زۆری تینوو بوو. چووە گوندەکە و لە دەرکی ماڵێک ڕاوەســـتا و داوای ئاوی لەو ماڵە کرد. خێرا کچێک هاتە دەرێ. هەر کە ئەوی دیت، هەڵاتەوە ژوورێ. قامیشێکی نەیشەکەری هێنا و گوشییە ناو جامێک ئاوەوە و

شـتێکی بۆنخۆشـی وەک خۆڵ بەسـەرەوە کرد. دوای ئەوە جامەکەی برد بۆ پاشـا. پاشـا چاوێکی لێ کرد، شـــتێکی تێدا دیت وەگ خۆڵ دەچوو. ئیدی هێدیهێدی لە ئاوەکەی خواردەوە هەتا تەواوی کرد. دوای ئەوە بە کیژەکەی گوت: 'ئاوێکی خۆش بوو، ئەگەر ئەو گڵەی تێدا نەبایە.' کچە کوتی: 'بەڕێزم، من بە ئانقەســـت ئەو گڵەم تێ کرد.' پاشـــا گوتی: 'لەبەر چی ئەو کارەت کرد؟' کچە گوتی: 'ســـەیرم کرد تۆ زۆر ماندوو و تینووی، گوتم ئەگەر شـتێکی بەسـەرەوە نەکەم، جامە ئاوەکە یەکسـەر بە سـەرییەوە دەنێ و خراپە بۆی. نیگەران مەبە خۆڵیش نەبوو شـــێوەی دەدا.' پاشـــا ئەنووشـــیروانی دادگەر لەو هەموو ژیرییەی ئەو کچە واقی وڕ ما و گوتی: 'ئەو شـــەکرەت لە چەند قامیش گرت؟' کیژۆڵەکە گوتی: 'هەمووی هەر لە یەکدانە قامیش بوو.'

"ئەنووشیروان سەری سووڕ ما. لەوێ ڕۆیشت. داوای سیایی پیتاکی ئەو گوندەی کرد. پیتاکی ئەو دێیەی پێ کەم بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر چوومەوە، لە ســـەریان زیاد دەکەم.' گوتی: 'لە دێیەک کە لە قامیشـــی ئاوای هەبێ، چۆن دەبێ ئەوەندە پیتاک بدەن؟' دیسـان لە دێ ڕۆیشـتە دەرێ و چووەوە بەلای ڕاوەوە. درەنگانێکی شـێوان هاتەوە گوند، ڕاست چووەوە دەرکی ئەو ماڵە و داوای ئاوی کرد. هەر ئەو کیژۆڵەیە هاتە دەرێ. پاشای ناسـییەوە و چووەوە ژوورێ ئاوی بۆ بێنێ. کەمێک زۆری پێ چوو. ئەنووشـیروان پەلەی کرد. کە کچۆڵەکە هاتەوە، لێی پرسی: 'ئەوە بۆ ئاوا درەنگ هاتیتەوە؟'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەنووشیرەوان لێی پرسی: 'ئەوە بۆ ئەوەندەت پێ چوو؟' کچۆڵەکە گوتی: 'قامیشەکان بە قەد ئەوەی دیکە باش نەبوون. چوار دانەشم تێ گوشی، ئێستاش بە قەد ئەوەی پێشووی خۆش نەکردووە.' ئەنووشیروان گوتی: 'باشە ئەوە بۆ ئەوانە ئاوا بوون؟' کیژۆڵەکە وەلامی داوە و گوتی: 'ئەوە نییەتی پاشا گۆڕاوە.'

"ئەنووشیروان گوتی: 'تۆ چووزانی.' گوتی: 'لە پێشینیانم بیستووە ئەگەر نییەتی پاشا لەبارەی گەلەکەیەوە بگۆڕێ، ئەوە بەرەکەت لەنێویاندا هەڵدەگیرێ.' ئیدی ئەنووشیروان ئەوەی لە دڵیدا بوو، لە دڵی دەرهاویشت و پێکەنی و کچەی لە خۆی مارە کرد.

### چیرۆکی تۆڵەی کردار

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە پیاوێکی ئاوکێش لە شاری بوخارا هەبوو، ئاوی بۆ ماڵی کابرایەکی زێڕینگەر دەبرد. سێ ساڵان ئەوە کاری بوو. ئەو زێڕینگەرە ژنێکی جوان و داوێنپاکی هەبوو. ڕۆژێک هەر وەک پیشەی بوو، کابرای ئاوکێش ئاوەکەی هێنا و لە گۆزە و جەڕە و شتەکەی کرد. ژنی زێڕینگەرەش لە نێوەڕاستی حەوشە ڕاوەستابوو. ئاوکێشە لێی چووە پێشێ و دەستی گرت و گوشی و لێی دا ڕۆیشت بە لای کاری خۆیەوە. کاتێک کابرای زێڕینگەر لە بازاڕ هاتەوە، ژنەکەی لێی پرسی: 'ڕاستیم پێ بڵێ، ئەوڕۆ لە بازاڕ چ کارێکت کردووە کە خودا پێی ناخۆش بێ؟' ئەو کابرایە گوتی: 'بە خودا ئەوەی بووە ڕاست بۆت دەگێڕمەوە. ئەویش ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە دووکان دانیشتبووم ژنێک هات بۆ دووکان و داوای کرد بازنەیەکی بۆ ساز کەم. من بازنەیەکی زێڕم بۆ ساز کرد و دامێ. دەستی دەرهێنا و قۆڵی هەڵکرد. من سەرم لە سپێتی و جوانی مەچەک و قۆڵی سووڕ ما. ئەو شێعرەم وەبیر هاتەوە:

بازنی سپی و گۆشتنی تۆ دڵڕفێنە
جوانە بازنە لە دەستتدا، هەست بزوێنە

" 'ئینجا دەستیم گرت و گوشیم.' ژنە گوتی: 'سوبحانەڵلا، ئەوە تاوانی کابرای ئاوکێش نەبوو کە سێ ساڵە هاتوچووەی ماڵی ئێمە دەکا و قەت شتی وام پێوە نەدیوە. هەتا ئەمڕۆ کە دەستی منی گرت و گوشیی.' ئیدی ئەو کابرایە تۆبەی کرد و پەشیمان بووەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی سێسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کابرایە تۆبەی کرد و پەشیمان بووەوە. ڕۆژی دواتر کابرای ئاوکێش هات و خۆی بەسەر کەوشی ژنەدا دا و داوای لێبووردنی کرد و گوتی: 'خانمەکەم، لێم خۆش ببە! بە خودا شەیتان پێی کردم و هەڵیخەڵەتاندم.' ژنە پێ گوت: 'خودا لێت خۆش بێ، هەستە وە دوای کاری خۆت کەوە. خەتای مێردەکەی خۆم بووە، نەک هی تۆ، ئەوە بە تۆڵەی کاری نەشیاوی ئەو بوو.'

"کاتێک ژنە بۆی گێراوە کە کابرای ئاوکێش چی کردووە، زێڕینگەرەکە گوتی: 'لە دەرگای خەڵک بدەی، لە دەرگات دەدەنەوە. ئەگەر من لەوە زیاترم شوو لێ هەڵکێشابا، ئەویش زیاتری دەکرد.' ئیدی ئەو وتەیە لەنێو خەڵکدا بوو بە باو."

### چیرۆکی ڕاوێژی ژنان

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە، دەڵێن: پاشایەک هەبوو ناوی خەسرەو بوو. لەو پاشایانە بوو کە ماسی زۆر پێ خۆش بوو. ڕۆژێک لەگەڵ شیرینی خێزانی دانیشتبوو کە ڕاوچییەک ماسییەکی بە دیاری بۆ هێنا. خەسرەو ئەو ماسییەی زۆر پێ باش بوو. فەرمووی چوارهەزار درەمی بدەنێ. شیرین گوتی: 'ئەو کارەت باش نەبوو، چونکە تازە دوای ئەوە ئەگەر ئەو پارەیە بدەی بە یەکێک لە دەستوپێوەندەکانت، پێی کەم دەبێ و دەڵێ: 'هەر بە قەد ماسیگرێکی داومێ.' ئەگەر کەمتری بدەیتێ، دەڵێ: 'ڕێزی ماسیگرێکی بۆ دانەناوم.'' خەسرەو گوتی: 'وایە، قسەکەت ڕاستە، بەڵام بۆ پاشا شوورەییە کە دیاری خۆی بستێنێتەوە. ئەی چ بکەم؟' شیرین گوتی: 'من بیرێکت بۆ دەکەمەوە کە پارەکە وەرگریتەوە.' خەسرەو گوتی: 'بە ڕای تۆ چی بکەم؟' شیرین گوتی: 'تۆ ڕاوچییەکە بانگ کە و لێی پرسە ئەو ماسییە نێرە یان مێ. ئەگەر گوتی: 'نێرە،' بڵێ: 'من هی مێوم دەویست. ئەگەر گوتی: 'مێیە،' بڵێ: 'من هی نێرم دەویست.''

خەسرەو فەرمانی دا ڕاوچییەکە بگێڕنەوە. کە ڕاوچی هاتەوە، خەسرەو لێی پرسی: 'ئەو ماسییە نێرە یان مێ؟' ڕاوچی کڕنۆشی برد و گوتی: 'قوربان، نەنێرە و نەمێ.' پاشا هیچی پێ نەما و بە فەرمانی ئەو چوارهەزار دیناری دیشیان دایە. ڕاوچییەکە پارەکانی لە توورەکەیەک کرد و بە کۆڵیدا دا و ویستی بڕوا، درەمێکی لێ بەربووەوە. لەڕێوە توورەکەکەی دانا زەوی و داهاتەوە درەمەکەی هەڵگرتەوە. خەسرەوو شیرینیش چاویان لێ دەکرد. شیرین گوتی: 'سەیری ئەو کابرایە چەند خوێڕییە! ئەو هەمووەی دەست

کەوتووە، کەچی بۆ درەمێک داهاتەوە و نەیگوت با ئەوە بۆ یەکێک لە کۆیلە و غولامەکان بێ.' پاشـــا کە ئەوەی بیســـت، ڕقی لێی هەســـتا و گوتی: 'خوێڕی، ئەوە بۆ ئەوەندە هیچوپووچی؟! ئەوە درەمێک چییە ئاوا بۆی داهاتیتەوە؟! چی دەبوو ئەوە بۆ یەکێکی دیکە با؟' ڕاوچی کڕنۆشـی برد و گوتی: 'خودا تەمەنی پاشـامان درێژ بکا. من خۆ درەمم لەبەر ئەوە هەڵنەگرتەوە بڵێم ئەگەر ئەوە نەبێ قڕم دێ. لەبەر ئەوە هەڵمگرتەوە چونکە لایەکی وێنەی پاشا و لایەکی ناوی پاشای بەسەرەوەیە. ئەگەر کەسێک هات و بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ پێی لەسـەر دانێ، شتێکی خۆش و جوان نابێ.' پاشـا ئافەرینی لێ کرد و چوارهەزار دیناری دیکەی خەڵات کرد. جارچی بانگ کرد و پێی گوت: 'لە شـــاردا قاو کە بڵێ ئیدی کەس بە ڕاوێژی ژنان نەکا، چونکە ئەگەر بە قسەی ژنان بکا ماڵوێران دەبێ.'

### چیرۆکی بەخشندەییی یەحیای بەرمەکی

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە کە یەحیای کوڕی خالیدی بەرمەکی لە دیوانی دارولخەلافە هاتە دەرێ و بەرەو ماڵ بووەوە. لە دوور سـەیری کرد ئەوە پیاوێک لە بەردەرگای ئەوان دانیشتووە. کە چووە پێشێ، کابرا لەبەری هەستا و سلاوی کرد و گوتی: 'نەدارم و پەنام بۆ هێناوی، دەســـتم بگرێ.' یەحیا فەرمانی دا لەنێو ماڵەکەی خۆیدا شـــوێنێکی بۆ دیاری بکەن. بە خەزێنەدارەکەی گوت: 'هەموو ڕۆژێ هەزار درەمی دەیە و لە خواردنەکەی خۆشم بۆی بەرن.' ئەو کابرایە مانگێک ئاوا ماوە. سـێهەزار درەمی کۆ کردبووەوە. کابرا ترسـا، یەحیا بەو هەموو پارەیە بزانێ و پەشـیمان ببێتەوە و درەمەکانی لێ بسـێنێتەوە. ئیدی بە دزییەوە هەستا لە ماڵیان چووە دەرێ."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو کابرایە درەمەکانی هەڵگرت و لە ماڵی یەحیا وەدەر کەوت. بە یەحیایان ڕاگەیاند. یەحیا گوتی: 'بە خودا ئەگەر هەتا ئاخری تەمەنی لە لای من ماباوە، من ئەو مووچەیەم لێ نەدەبڕی و لە خواردنم کەم نەدەکردەوە.' گەورەیی بەرمەکییان لە ژمار نەدەهات، بە تایبەت یەحیای کوڕی خالید. یەحیا تەواوی گەورە گەورە و شـــاعیرانی لە خۆی کۆ کردبووەوە، شاعیر لەبارەیەوە دەڵێ:

یەحـیـا کە کـۆڵەکەی کـۆخـتـی زانـایـی بـوو
لە خـزمەت بە زانســـتـدا دریـغـیـی نەبـوو
پەنـا بـوو بـۆ هەژاران و لـێـقەومـاوان
چـرا بـوو بـۆ کـۆڕی شـــاعـیـر و ئەدیبـان

### چیرۆکی ئەمین و کەنیزی جەعفەر

"دەگێڕنەوە کە جەعفەری کوڕی موســـایهادی کەنیزێکی تارژەنی هەبوو نێوی مانگی چواردە بوو. لەو کاتدا کەس بە قەد ئەو دەنگخۆش و جوان و زانا نەبوو. لە تارژەنیشـــدا کەس وەک ئەو نەدەهاتەوە. ئەمین کوڕی زبێدە ناوبانگی ئەوی بیســـتەوە. زۆر لە جەعفەر پاڕاوە پێی بفرۆشـــێ. جەعفەر پێی گوت: 'تۆ دەزانی کە کەنیزفرۆشـــتن لە من ناکاڵێتەوە. ئەگەر ئەو کەنیزە لە دەرکی خۆمـان نەکەوتبـاوە[١]، ئەوە وەک دیـاری دەمـدایتێ و بۆم دەناردی.'

"دوای ئەوە ڕۆژێک هەر بۆ خۆشـــی ئەمین چوو بۆ ماڵی جەعفەر. جەعفەریش چۆنی پێشـــوازیی لە هاوڕێ و نزیکانی دەکرد، ئاواش پێشـــوازیی لەو کرد و بە 'مانگی چاردە'ی گوت بێ تاریان بۆ بژەنێ و گۆرانییان بۆ بڵێ. کەنیزە دەســـتی دا ئامێر و دەســـتی کرد بە ژەنینی تار و گۆرانیگوتن. ئەمینی کوڕی زبێدەش خەریکی خواردنەوە و بەزم و خۆشـــی بوو. ئەمین بە مەیگێڕەکانی گوتبوو کە لەرادەبەدەر مەی بە جەعفەر بدەن. ســـاقییەکانیش وایان کرد. وا بۆو جەعفەر مەست و بێهۆش کەوت. ئەمین کەنیزەکەی گرت و لەگەڵ خۆی بردییەوە مـاڵی خۆی. بەڵام دەســـتی بۆ نەبرد. کە ڕۆژ بووەوە، ئەمین نـاردی لە دوای جەعفەر. کە جەعفەر هات، ئەمین فەرمانی دا مەی بێنن. بە کەنیزەکەشـــی گوت: 'لەپشـــت پەردەوە گۆرانی بڵێ.' جەعفەر گوێی لە دەنگی کەنیزەکەی بوو، ئەوی نـاســـییەوە. بەو

---

١. لە دەرک کەوتنەوە: لەو ماڵە لە دایک بوون.

کارەی زۆر تووڕە بوو، بەڵام ئەوەندە بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، خۆی خواردەوە و وەسەر خۆی نەهێنا. کاتێک دانیشتنەکە کۆتایی هات، ئەمینی کوڕی زبێدە بە دەستوپێوەندەکەی خۆی گوت: 'ئەو لۆتکەیەی کە جەعفەر سواری بووە و پێی هاتووەتە ئێرە، پڕی کەن لە درەم و دینار و گەوهەر و یاقووت و جلوبەرگی شکۆدار و گرانبایی.' دەستوپێوەندەکەی ئەو کارەیان کرد و ئەوەندەیان تێ کرد کە جێی نەمابوو. دەترسان ئەگەر زیاتری تێ بکەن لۆتکەکە نوقم بێ. ئەوجار ئەمینی کوڕی زبێدە فەرمانی دا ئەو ماڵە بەرن بۆ ماڵی جەعفەر.

### چیرۆکی سەعیدی بابلی و بەرمەکییەکان

"چیرۆکێکی دیکە هەیە، دەگێڕنەوە: سەعیدی بابلی گوتوویەتی: 'لە سەردەمی خەلافەتی هاروونەڕڕەشیدا من زۆر دەستکورت بووم، خاوەنقەرز لێم کۆ بوونەوە و نەمبوو بیاندەمەوە. بە ڕاستی سەرم لێ شێوابوو و نەمدەزانی چی بکەم. لەو جەنگەیەدا چووم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی مالیکی خوزاعی و لێی پاڕامەوە کە بەشکو بە هیممەتی خۆی یارمەتیم بدا، یان ڕێیەکی باشم پێشان بدا. عەبدوڵڵا کوڕی مالیکی خوزاعی پێی گوتم: 'جگە لە بەرمەکییەکان، کەس ناتوانێ تۆ لەو تەنگدەستی و مەینەتبەشییە ڕزگار بکا.' گوتم: 'تاقەتی ئەو پۆز و لەخۆباییبوونەی ئەوانم نییە.' عەبدوڵڵا گوتی: 'دەبێ تاقەتت هەبێ تا کارەکەت جێبەجێ دەبێ.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی سێسه‌د و نه‌وه‌ده‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشـــکۆ، ‹ئیدی من له لای عه‌بدوڵڵا هاتمه ده‌رێ و چووم بۆ لای فه‌زل. قســـه‌م له‌گه‌ڵ ئه‌ویش کرد و ده‌رده‌دڵم بۆ کرد. ئه‌ویش گوتی: ‹خودا به هـانـاته‌وه بێ و چاوله‌ده‌ستی خه‌ڵکت نه‌کا. ڕۆزیتان زیاد کا، چونکه ئه‌و بۆخۆی ئاگای له هه‌موو شـتێکه و ده‌سه‌ڵاتی هه‌موو شتێکیشی هه‌یه.› ئیدی له لای فه‌زل و جه‌عفه‌ر هاتمه‌وه و چووم بۆ لای عه‌بـدوڵڵای کوڕی مـالیک. نـاڕه‌حه‌ت و بێهیوا بووم. ئه‌وه‌ی دیتبووم و بیســـتبووم، بۆ عه‌بدوڵڵام گێڕاوه. عه‌بدوڵڵا گوتی: ‹ده‌بێ ئه‌مڕۆ له لای من بی، بزانم خودا چی موقه‌دده‌ر کردووه.› مـاوه‌یه‌ک له لای عه‌بـدوڵڵا دانیشـــتم. له پڕدا کۆیله چکۆله‌که‌م هـات و گوتی: ‹گه‌وره‌م، له ده‌رکی ئێمه هێسترێکی زۆر به باره‌وه ڕاوه‌ستاون. پیاوێکه ده‌ڵێ: ‹من وه‌کیلی فه‌زل و یه‌حیـای به‌رمه‌کی کوڕانی جه‌عفه‌رم.› عه‌بـدوڵڵای کوڕی مـالیک گوتی: ‹هیوادارم ئه‌وه هێمای ڕزگاریتان بێ. هه‌ســـته بڕۆ بزانه چ باســـه.› ئیدی هه‌ســـتام و خێرا به‌ره‌و ماڵ بوومه‌وه. پیاوێکم له به‌رده‌رگای خۆمان دیت. کاغه‌زێکی به ده‌ســـته‌وه بوو، له‌ســـه‌ری نووســـرابوو: ‹کاتێک قســـه‌کانی تۆمان بیســـت، چووین بۆ لای خه‌لیفه و پێمان ڕاگه‌یاند که ســـه‌عید ده‌ســـتته‌نگه و فشـــاری ژیانی له‌ســـه‌ره.› ئیدی خه‌لیفه فه‌رمووی: ‹له به‌یتولماڵ هه‌زاره‌زار دره‌می بده‌نێ.› ئێمه‌ش هه‌رکه‌س له ماڵی خۆی هه‌زاره‌زار دره‌ممان بۆ ناردی. تۆ به‌و دره‌مانه قه‌رزی خۆتی لێ بده‌وه و کاروباری خۆتی پێ به‌ڕێوه به‌ره.› › "

لێره‌دا بوو، مـاوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشـــه‌ویش کۆتـایی پێ هـات و شـــه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

## که شەوی سێسەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

### چیرۆکی پەرجووەکانی دانیال[1]

گوتی: "خاوەنشکۆ، یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە سەردەمانی زوو ژنێکی باش و لە خوداترس لە هۆزی تورەمەی ئیسرائیلدا هەبوو. هەموو ڕۆژێ دەچوو لە نوێژگەیەک نوێژی دەکرد. ئەو نوێژگەیە لە پەنا باخێک بوو. ژنە هەموو جارێ دەچوو لەو باخە دەستوێژی هەڵدەگرت. دوو پیاوی چاوەدێری باخەکە تەماعیان تێ کرد و داوایان لێ کرد، دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکا. ژنە داوێنپاکە ملی نەدا. ئەوانیش گوتیان: 'ئەگەر نەماندەیتێ، ئابڕووت دەبەین و دەڵێین تۆمان لەگەڵ کەسێک دیوە زینات کردووە و لێت لە هەرا دەدەین.' ژنە گوتی: 'خودای گەورە لە شەڕی ئێوە دەمپارێزێ.' ئیدی ئەو دوو پیاوە لە باخ هاتنە دەرێ و دەستیان کرد بە هاتوهاوار. خەڵک لە هەموو لایەکەوە کۆ بوونەوە تا بزانن چ باسە. پیاوەکان گوتیان: 'ئێمە ئەو ژنەمان دیت لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا خەریکی زینا بوو. بە داخەوە کوڕەمان بۆ نەگیرا و ڕای کرد.' ئەو دەمیش داب وا بوو، کەسێک زینای کردبا هەتا سێ ڕۆژان دەیانگێڕا تا تەواو ئابڕووی بچێ و پاشان بەردبارانیان دەکرد. ئیدی سێ ڕۆژان ئەو داماوەیان گێڕا. هەموو جارێ ئەو دوو باخەوانە دەچوونە لای و دەیانگوت: 'ئەگەر بەڵێن بدەی دەستمان لەگەڵ تێکەڵ کەی، ڕزگارت دەکەین.' ئەویش دەیگوت: 'ئەگەر بە هەزار چەرمەسەری بشمرم، لەوە باشترە خۆم تووشی گوناهـ بکەم.' دوای سێ ڕۆژ خەڵک گلێر بوونەوە ویستیان بەردبارانی بکەن. دانیال(د ـ س) کە ئەو کات دوازدەسالان بوو، لەنێو خەڵکەکەدا بوو. کە خەڵکەکە ویستیان بەردبارانی بکەن، دانیال گوتی: 'پەلە مەکەن با من لێ پێچینەوەیەک لەو دوو پیاوە بکەم و لە ڕاستی و دروستی شتەکە دڵنیاتر بین.' خەڵکەکە دەستیان ڕاگرت. ئیدی کورسییان دانا. دانیال دوو باخەوانەکەی بانگ کرد. لێکی هەڵاواردن و دانەدانە بانگی کردن. پێی گوتن: 'ڕووداوەکە بگێڕنەوە.' ئەو یەکەم کەس بوو بیری بۆ ئەوە چوو. باخەوانی یەکەم شتێکی ساز کرد و گێڕایەوە. دانیال لێی پرسی: 'لە کوێوەی باخ ئەو شتە ڕووی دا؟' باخەوانی یەکەم گوتی: 'لە لای ڕۆژهەڵاتی باخ و لەژێر دارە هەرمێیەک بوون.' ئەوجار باخەوانەکەی دیکەی بانگ کرد. پێی گوت: 'ڕووداوەکە بگێڕەوە چۆناوچۆن بوو.' باخەوانی دووەمیش شتێکی لە زەینیدا ساز کرد و گێڕایەوە. دانیال لەویشی پرسی: 'لەکوێوەی باخ ئەو شتە ڕووی دا؟' باخەوانی دووەم گوتی: 'لە لای ڕۆژئاوای باخەکە و لەژێر دارە سێوێکدا.' لەو کاتەشدا ژنە

---

١. ئەو چیرۆکە لە کتێبی پیرۆزی جوولەکانەوە وەرگیراوە. دوایی مارنیکس خنیسە ڕۆمانێکی لەسەر بنەمای ئەو چیرۆکە نووسیوە. چاو لە کتێبی یەهواقیم بابلی و هاوژینە بەناوبانگەکەی بکە.

ســـەری بەرەو ئاســـمان بەرز کردەوە و لە خودا پاڕاوە کە ئابڕووی بپارێزێ. ئیدی هەورەتریشـــقەیە هات و ئەو دوو باخەوانەی ســـووتاند و داوێنپاکی ژنە بۆ هەموو کەس ڕوون بووەوە. ئەوە یەکەم پەرجووی دانیالی پێغەمبەر بوو کە نیشانی خەڵکی دا.

### چیرۆکی پاداشتی نۆژدارێتی

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان هارووونەڕڕەشید لەگەڵ ئەبوویەعقووبی هاونشـــینی و جەعفەری بەرمەکی وەزیر و ئەبوونەواس چووبوونە دەرێ و لە دەشـــتێک دەڕۆیشـــتن. تووشـــی پیرەپیاوێک بوون بە ســـواری کەر دەهات. هارووونەڕڕەشـــید بە جەعفەری گوت: 'لەو کابرایە بپرســـە بزانە لەکوێوە دێ.' جەعفەر لێی پرسی. ئەو کابرایە گوتی: 'لە بەسرەوە دێم.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سێسەد و نەود و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، ئەو كابرایە گوتی: 'لە بەســـرەوە دێم.' جەعفەر گوتی: 'دەچی بۆ كوێ؟' پیاوە گوتی: 'دەچم بۆ بەغدا.' جەعفەر گوتی: 'لە بەغدا چی دەكەی؟' گوتی: 'دەچم دەرمان دەكرم بۆ چاوم.' هارووونەڕڕەشـــید گوتی: 'دا كەمێكی قەڵسـ‍ــە لێ بگێڕە.' جەعفەر گوتی: 'ئەگەر قەڵسە بێ قسەی ناخۆشم پێ دەڵێ.' خەلیفە گوتی: 'لەبەر دڵی منیش بێ هەر دەبێ تووڕەی كەی.' ئیدی جەعفەر بە كابرای گوت: 'ئەگەر دەرمانێكت پێ بڵێم چاوت چا كاتەوە، پاداشتەكەی چیم دەدەیتێ؟' كابرا گوتی: 'خودا پاداشتی چاكەت دەداتەوە.' جەعفەر گوتی: 'جوان گوێ ڕاگرە، ئێستا شێوەی درووستكردنی دەرمانێكت پێ دەڵێم هەتا ئێستا بە كەسـم نەگوتووە.' كابرا لە دڵەوە گوێی بۆ ڕاگرت. جەعفەر گوتی: 'سـەد مسـقاڵ تیشـكی خۆر و سەد مسقاڵ تیشكی مانگ و سەد مسقاڵ شەوقی چرا لە شتێكدا تێكەڵ كە و هەتا سـێ مانگ لە بەر با هەڵیخە. دوای ئەوە لە ئاوەنگێكی بێبندا هەتا سـێ مانگان بیكوتە. ئەوجار بیكە كلدانێكەوە و هەتا سێ مانگ هەموو شەوێ لە جەنگەی خەودا لە چاوتی بكە. بەشكو خودا شیفات بدا.' كابرا كە قسـەكانی جەعفەری بیست، لەسـەر كەرەكەی كەمێكی خۆ بزاوت و یەک دانە شـ‍ـــەقە تڕی بۆ كەند و گوتی: 'جارێ ئەوەی هەڵگرەوە. دوای ئەوە من ئەو دەرمـانەم گرتەوە و خودا چـاكی كردمەوە، ئەو دەم كەنیزێكـت دەدەمێ هەتـا خزمەتت بكا. جا چونكە خودا گیان بەو زووانە گیانت دەكێشـــێ و ڕۆحت بەرەو ئاور دەنێرێ، ئەو كەنیزەش لەبەر ئەوەی زۆری خەمی تۆ دەبێ، هەموو شــــەوان و بەیانیانێک تڕێک بۆ ڕۆحت دەكەنێ.' هارووونەڕڕەشید كە ئەو قسانەی بیست، ئەوەند پێكەنی خەریک بوو پشتەوقەفار بێ. ئیدی سێهەزار درەمی بە كابرا دا.

### چیرۆكی عومەر و ئاكارجوانان

"حوســـەینی كوڕی ڕەببانی شـــەریف گێڕاویەتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب ڕۆژێک دانیشـتبوو گوێی لە سكاڵای خەڵک ڕاگرتبوو. زۆریەک لە یارانی لەو كۆڕەدا دانیشـتبوون. لەپڕدا ســـەیری كرد دوو لاو، گەنجێكی جوانچاک و ڕێكوپێكیان هێنا، كوڕە جلوبەرگێكی خاوێنی لە بەردا بوو، پیلیان گرتبوو و هێنـایـان لەپێش خەلیفە دایـاننـا. عومەری كوڕی خەتتاب بەو دوو لاوەی گوت: 'پیلی بەرپیدەن و بڵێن بزانم چی بووە؟' گوتیان: 'ئێمە دوو براین و بـاوكێكی پیرمـان هەبوو كە لە نـاو هۆزەكەمـانـدا بەنـاوودەنگ بوو، بە چـاكە و چاكەكاری ناسرابوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـــەویش كۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## کە شەوی سێسەد و نەود و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو دوو لاوە گوتیان: 'بابمان ڕۆژێک بۆ حەسانەوە و سەیران چوو بۆ باخەکەی. ئەو گەنجە ئەوی کوشتووە. ئێستا ئێمە هاتووین بەپێی شەرع و حوکمی خودا دادمان بدەی.' عومەر زۆر بە گرژی چاوی لە کوڕە بڕی و پێی گوت: 'ئەی تۆ دەڵێی چی؟' ئەو گەنجە زۆر نەترس و زمانپاراو بوو. بزەیەکی هاتێ و بە زمانێکی خۆش سڵاوی لە عومەر کرد و دوای ئەوە گوتی: 'بە خودا ئەوەی ئەوان گوتیان، هەمووی ڕاستە، بەڵام با من دەقی شتەکەتان بە وردی بۆ باس بکەم. دوای ئەوە فەرمان بە دەست جەنابتە.'

"ئینجا گوتی: 'خەلیفە، من عەرەبی دەشتەکیم. کاتێک قاتی و قڕی ڕووی لە هۆزەکەمان کرد، من بە ماڵ و منداڵەوە بەرەو ئێرە هاتم. ڕێم کەوتە نێو باخەکانی ئەم شارە. چەند ئاروانەیەکم[1] پێ بوو کە زۆرم خۆش دەویستن. لەنێو ئەواندا لۆکێکیان[2] تێدا بوو. بەرەیەکی زۆری لێ کەوتبووەوە و قەڵافەتی ڕێکوپێک و بەرچاوی بوو. لەنێو ئەواندا وەک پاشایەک لەنێو مسکێنەکانیدا بڕوا، وا بوو. یەکێک لە ئاروانەکان بەسەر دیواری باخی ئەواندا سەری کێشا و لقێکی کێشا دەرێ و لقەکە شکاوە. لە ناکاو کابرا لە باخ هاتە دەرێ. لەبەر تووڕەیی ئاور لە چاویدا دەگڕا و بەردێک بە دەستی ڕاستیەوە بوو. وەک شێر نەڕاندی و بەردەی لە لۆکەکە ڕاکێشا و کوشتی.

"منیش کە دیتم لۆکەکە مردار بووەوە، لە تاوان چاوم نەیدی و هەر ئەو بەردەم هەڵگرتەوە و لە کابرام دا. کابرا کەوت. وا بوو هەر بەو بەردەی کە لۆکەکەی پێ کوشتبوو، بۆ خۆشی مرد. کە بەردەکەی وێ کەوت، هاواری کرد و گیانی دەرچوو. منیش هەڵاتم. ئەو دوو گەنجەش بە پرتاو گەیشتنە سەرم و منیان گرت و هێنایانم بۆ لای تۆ.'

"عومەر گوتی: 'ئێستا کە تۆ دانت بە تاوانەکەتدا ناوە، ڕزگارت نابێ و بە مسۆگەری دەکوژرێیتەوە.' ئەو گەنجە گوتی: 'ئەوەی پێشەوا بفەرمووێ، لە ئاستیدا ملکەچم و ئەوەی شەرع بفەرمووێ ڕازیم پێی. بەڵام من برایەکم هەیە منداڵە و بابم پێش مردنەکەی ماڵەکەی بۆ جیا کردەوە و بە منی سپارد و منیشی بە خودا سپارد. گوتی: 'ئەو ماڵە هی ئەو برایەتە. زۆر بە وریاییەوە بۆی ڕاگرە و بیپارێزە.' من بەرپرسیارێتی ئەو ماڵەم لە ئەستۆ گرت و لەبن زەویم خستووە. جگە لە منیش کەس بە شوێنەکەی نازانێ، ئەگەر ئێستا فەرمانی کوشتنی من بدەی، ئەو ماڵە هەر وا دەڕوا. هۆکارەکەشی تۆ دەبی. ئەگەر ڕۆژی پەسڵان خودا لە حەق و ناحەق بکۆڵێتەوە، ئەو منداڵە یەخەی تۆ دەگرێ و ئەو ماڵەی لە تۆ

---

١. ئاروانە: وشتری مێی چوارساڵە.

٢. لۆک: وشتری نێر.

دەویتەوە. بەڵام ئەگەر ســــێ ڕۆژ مۆڵەتم بدەی، دەچم ئەو کوڕە و ماڵەکەی بە کەســێک دەسپێرم و دێمەوە ئێرە بۆ لای ئێوە.' عومەر ماوەیەک سەری داخست و چوو لە فکرەوە. دوای ئەوە چاوێکی لە دانیشتووان کرد و گوتی: 'کێ بەرپرسیاریێتی گەڕانەوە ئەو کوڕە لە ئەستۆ دەگرێ؟' ئەو کوڕە چاوێکی بە هەنتەشیاندا گێڕا. لەو نێوەدا قامکی بۆ لای ئەبووزەڕ ڕاداشت و گوتی: 'ئەو کابرایە وە ئەستۆی دەگرێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێسەد و نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، لاوەکە قامکی بۆ لای ئەبووزەڕ ڕاداشت و گوتی: 'ئەوە لە ئەستۆی دەگرێ.' عومەر گوتی: 'ئەبووزەڕ، بەرپرسیاریتییەکەی وە ئەستۆ دەگری کە بێتەوە یان نا؟' ئەبووزەڕ گوتی: 'بەڵێ، وە ئەستۆی دەگرم کە دوای سێ ڕۆژ بێتەوە.' عومەر ڕوخسەتی دا بە کوڕە، بڕواتەوە. کوڕە ڕۆیشت.

"ماوەکەی خەریک بوو تەواو دەبوو، عومەر و هاوەڵانی دانیشتبوون و ئەبووزەڕیش لەوێ بوو کە دوو گەنجە باوککوژراوەکە هاتنەوە و گوتیان: 'ئەبووزەڕ، ئەوە کاتەکە تەواو بوو. کوڕە نەهاتەوە. ئێمە لێرە نابزووین هەتا تۆ کوڕەکە نەدۆزیتەوە و نەیهێنیتە ئێرە. ئێمە دەبێ تۆڵەی خۆمان لەو بکەینەوە.' ئەبووزەڕ گوتی: 'بە خودا ئەگەر بێتوو کاتەکەی تەواو بێ و ئەو کوڕە نەیەتەوە، من لەسەر قسەی خۆمم و ئامادەم بەرپرسیاریتییەکەی لە ئەستۆ بگرم.' عومەر گوتی: 'بە گەورەیی خودا! ئەگەر بێتوو ئەو کوڕە نەیەتەوە، بە پێی شەرعی ئیسلام حوکم بەسەر ئەبووزەڕدا دەسەپێنم.' ئیدی دانیشتووان لە تاوی ئەبووزەڕ چاویان پڕ بوو لە ئاو و ڕوویان لە کوڕەکان کرد و تکایان کرد بە خوێنبایی ڕازی بن. ئەوان گوێیان نەدەدانێ و جگە لە تۆڵە بە هیچ شتێک ڕازی نەدەبوون.

"لەو جەنگەیەدا کە خەڵک هەموو ناڕەحەت بوون و خەمی ئەبووزەڕیان بوو و بۆی دەگریان، لە ناکاو گەنجەکە هاتەوە و چووە بەردەمی عومەر و بە زمانێکی شیرین سڵاوی کرد. ئارەقە لە نێوچاوانی دەتکا. بە هەناسە بڕکە گوتی: 'براکەم و ماڵەکەیم بە خاڵم سپارد. چونکە بەڵێنم دابوو، بەو گەرمای نیوەڕۆیە هەر بە ڕاکردن هاتووم.' خەڵکەکە سەریان لە ڕاستی و بەڵێنداری ئەو کوڕە سووڕ ما. بە تایبەت کە بەپێی خۆی ئاوا بەرەو مردن هاتبوو. یەکێک لە دانیشتووان گوتی: 'ئافەرین بۆ ئەو کوڕە ڕاساڵ و بەبەڵێنە.' ئەو گەنجە گوتی: 'ئەی نەتبیستووە دەڵێن: 'ئەگەر کاتی مردنت هات، ناتوانی لە دەستی ڕا بکەی؟' من بۆیە بەڵێنەکەیێ خۆم بردە سەر هەتا نەڵێن، بەڵێن لەناو خەڵکدا نەماوە.'

"ئەبووزەڕ گوتی: 'عومەر، خۆ بە خودا ئەو کوڕەم نەدەناسی و قەتیش نەمدیبوو. نەمدەزانی لە کام هۆزیشە. کاتێک چاوی بە خەڵکەکەدا گێڕا و لە دواییدا چاوی لە من کرد و ڕووی لە من نا، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەو کوڕە لە مرۆیەتی و گەورەیی منی ڕادیوە. بۆیە دەستەبەریم کرد هەتا نەڵێن مرۆیەتی و گەورەیی لەناو خەڵکدا نەماوە و پاک بووەتەوە.'

"لەو جەنگەیەدا دوو لاوەکەش کە پێکەوە سرت و خورتیان بوو، گوتیان: 'خەلیفە، ئێمەش لە خوێنی بابمان خۆش بووین هەتا نەڵێن چاکە و لێبووردەیی لەناو خەڵکدا نەماوە

و هەڵگیراوەتەوە.' ئیدی عومەر زۆری کەیف بە ســــەرراســـتی و پەیمانداری لاوەکە و لێبووردەیی دوو براکە و گەورەیی ئەبووزەڕ کرد و گوتی: 'کە وایە ئێمە لە بەیتولمـاڵ خوێنبایی بابتان دەدەین.' کوڕەکان گوتیان: 'ئێمە لەبەر ڕەزامەندیی خودا لێی خۆش بووین و چاومان لە ماڵی دنیا نییە.'

## چیرۆکی هەرەمەکانی میسر

"دەگێڕنەوە مەئموونی کوڕی هاڕوونەڕڕەشید گەیشتە میسر. فەرمانی دا هەرەمەکانی میســــر بڕووخێنن و ئەوەی لەنێویدایە دەری بێنن. هەرچەند هەوڵیان دا، زۆریان خەرجی تێدا کرد، نەیانتوانی."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەئموون زۆری هەوڵ دا بیانڕوخێنێ و،ماڵێکی زۆری لەو ڕێگایەدا دانا. لە دیوێکی چکۆلە زیاتر نەیتوانی تێک بدا. دەڵێن مەئموون هەر لەو دیوە چکۆلەدا ئەوەندی خەزێنە دیتەوە کە خەرجییەکەی دەرهێنابووەوە هیچ بگرە زیاتریش بوو.

"ئیدی ئەو ماڵەی هێنا و گەڕاوە. لە هەڵوێستەکەی خۆی پاشگەز بووەوە. ئەو هێرەمانەیانە کە بە بەردی گەورە گەورە داندراون یەکێک لە شتە سەرسووڕهێنەرەکانی جیهانن، وەک قەڵایەکی لە ڕووخاننەهاتوو لە جێی خۆیان ماونەوە. کاتی خۆی ئەو بەردانەیان کون کردووە و شیشی ئاسنیشیان تێ هەڵکێشاون. لەسەر ئەوەوە بەردێکی دیکەیان داناوە، ئەویش کون کراوە و شیشەکەی لێ ڕەد کراوە. دوای ئەوە قورقوشمی تواوەیان لە کەلێن و نێوانی بەردەکان کردووە. هەر کام لەو بینایانە سەد باڵ بە باڵی ئەودەم بەرزن. پێشینیان دەڵێن: 'ئەو گومبەزەی تێکیان داوە، سێ خەزێنەی تێدا بووە پڕ لە زێڕ و گەوهەری ناوازە و دەگمەن. پڕ لە چەکوچۆڵی بە ڕۆن چەورکراو کە هەتاهەتایە ژەنگ نەهێنن. شووشەی وا کە دەپێچرانەوە و نەدەشکان و هەویری وا کە لە شتی سەیر سەیر تێکەڵ کرابوو. نووسراوە و کتێبی پیاوانی ئۆلی میسر و وێنەی سەر دیوار و پەیکەرگەلێک کە بە دەستی خۆیان زۆر کاریان پێ دەکرا. هەر گومبەزەی خەزێنەیەکی تێدا بوو. نۆبەدارێکیان لەسەر دانابوو.' تەواوی وردبین و هونەرمەندان سەریان لەو هەموو شاکارە سووڕ ماوە و بە شێعر و نووسراوە بەسەریاندا هەڵگوتووەوە و پەسنیان کردووە. یەکێک لەو شێعرانە ئەوەیە کە دەڵێ:

شکۆدار و بەسامە تای نییە لە جیهانا
پتەو و قایم و بەرز وەک بەربەندی ئەسکەندەر
بە زێڕ و زیو و یاقووت وەها ڕازێندراوە
وەکوو کاخی سولەیمان لە تاریف چووەتە دەر

### چیرۆکی دزی زەرەرمەند

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، دەگێڕنەوە پیاوێکی دز تۆبەی کرد. دووکانێکی دانا و دەستی کرد بە کڕین و فرۆشتن. ماوەیەکی زۆر ئەوە کاری بوو. شەوێک لە شەوان دووکانی گاڵە دا و بەرەو ماڵ بووەوە. دزێکی زۆرزان خۆی کرد بە خاوەن دووکان و کلیل و مۆمی لە گیرفانی دەرهێنا و بە نۆبەداری گوت: «دا ئەو مۆمەم بۆ هەڵکە.» نۆبەدار مۆمەکەی لێ وەرگرت و چوو بۆی هەڵکا "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سێسەد و نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نۆبەدارەکە مۆمەکەی لە دزە وەرگرت و چوو بۆی هەڵکا. دزە دووکانی کردەوە و مۆمێکی دیکەی پێ بوو دایگیرساند. کە نۆبەدار هاتەوە، سەیری کرد ئەوە دزە لە دووکان دانیشتووە و خەریکە سەیری حیساب و کیتاب دەکا و بە قامکی خەریکی ژماردن بوو. هەتا ماوەیەک زۆر ئاوا خەریک بوو. دوای ئەوە بە نۆبەداری گوت: 'وشترەوانێک بە وشترەوە بانگ بکە با کەمێک شت بار بکەم.' نۆبەدار چوو وشترەوانێکی بە وشترەوە هێنا. دزە چوار بوخچەی لە کاڵای گرانبایی پێچاوە و لە وشترەی نا. ئینجا دەرگای دووکانی گاڵە دا. دوو درەمیشی دا بە نۆبەدارەکە. بەدوای وشترەوانەکەدا ڕۆیشت. لە نۆبەداریش وایە ئەوە خاوەنی دووکان بوو.

"کە ڕۆژ بووەوە، خاوەنی دووکان هات. نۆبەدار لەبەر دوو درەمەکە سپاسی کرد و دۆعای خێری بۆ کرد. خاوەنی دووکان پێی سەیر بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوە دەڵێ چی و باسی چی دەکا؟!' کە دووکانی کردەوە، سەیری کرد ئەوە دەفتەری حیسابەکەی لەسەر زەوییە و مۆمێکی سووتاو لەوێیە. ئینجا سەیری شتەکانی کرد، تەماشای کرد دووکان چی وای تێدا نەماوە. نۆبەداری بانگ کرد و لێی پرسی: 'ئەوە ئەمشەو لێرە چی ڕووی داوە؟' نۆبەدار ڕووداوەکەی شەوی هەموو بۆ گێڕاوە هەر لە سەرەتاوە هەتا هێنانی وشتر و بارکردنی بوخچەکان. خاوەنی دووکان پێی گوت: 'بچووە ئەو وشترەوانەی شەو هێنات بیهێنە ئێرە.' نۆبەدار چوو وشترەوانەکەی هێنا. خاوەنی دووکانەکە لێی پرسی: 'ئەو شتانەی شەو بارت کردن، بۆ کوێت بردن؟' وشترەوان گوتی: 'بردم بۆ فڵانە جێ لە قەراخ دیجلە و لە فڵانە گەمیەم خستن.' دووکاندار گوتی: 'ئەو شوێنەم پیشان بدە.' وشترەوان لەگەڵی چوو، بردی گەمیەکە و کابرای گەمیەوانی پیشان دا. دووکاندار بە گەمیەوانی گوت: 'دوێ شەو شتەکانی ئەو بازرگانەت هەتا کوێ برد؟' گەمیەوان گوتی: 'بردنمە فڵانە جێ و لەوێ وشترەوانێک هات و بازرگان شتەکانی لێ نا و ڕۆیشت.' دووکاندار گوتی: 'دا ئەو وشترەوانەم پیشان بدە.' گەمیەوان چوو وشترەوانەکەی هێنا. دووکاندارەکە لێی پرسی: 'ئەو شتانەی لەو گەمیە بارت کردن، بۆ کوێت بردن؟' کابرا گوتی: 'بۆ فڵانە جێم بردن.' خاوەن دووکان گوتی: 'ئەو شوێنەم پیشان دە'، کابرای وشترەوان بردی شوێنەکەی پیشان دا کە ماڵەکەی لێ دانابوو. دووکاندارەکە دەرگای ئەو دووکانەی کردەوە و تەواوی ماڵەکەی لەوێدا دیتەوە. دووکاندارەکە شتەکانی خۆی دا بە وشترەوانەکە و باریان کرد. کابرای دزە عەباکەی خۆی بەسەر شتەکاندا دابوو. دووکاندارەکە ئەویشی بە وشترەوانەکە دا و گوتی: 'هانێ ئەوەش با بۆ تۆ بێ.'

"که ماڵەکەیان بار کرد، ئیدی لێیان دا ڕۆیشتن. لەو جەنگەیەدا کابرای دزە چاوی پێیان کەوت و دوایان کەوت. هەتا گەیشتنە لای دیجلە و بارەکەیان لە گەمیە نا. ئینجا دزە چووە بەرەوە و بە لارەملییەوە بە دووکاندارەکەی گوت: 'کاکە، ئەوە تۆ شوکری خودا ماڵەکەت بە تەواوی وەگیر کەوتەوە، تکایە عەباکەمم بدەنەوە.' ئیدی عەباکەیان داوە و هەرکەسەی دوای کاری خۆی کەوت.

## چیرۆکی دابەشکردنی خەڵات

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە دەڵێن: هاڕوونەڕەشید شەوێک لە شەوان هەر نیگەرانی و دڵەڕاوکێی بوو. بە جەعفەری بەرمەکی وەزیری گوت: 'ئەمشەو هەر لە خۆڕا زۆر دڵم سوارە و نیگەرانم. خەوم لێ ناکەوێ. دڵم گیراوە. نازانم چ بکەم!' کە خەلیفە ئەو قسەیەی کرد، مەسرووریش کە لەوێ ڕاوەستابوو، پێکەنی. خەلیفە فەرمووی: 'ئەوە بە چی پێ دەکەنی؟ شێت بووی یان بەو قسەیەی من پێ دەکەنی؟' مەسروور گوتی: 'ناوەڵڵا.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

# که شەوی سێسەد و نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەسروور گوتی: 'ناوەڵڵا. حەددم چییە، خەلیفە! قەسەم بە سەییدی مورسەلین بە خۆم نەبوو کە پێکەنیم. دوێنێ لە کۆشک چووبوومە دەرێ دەگەڕام، سەیرم کرد، خەڵکێکی زۆر کۆ بوونەتەوە. منیش چوومە لایان، بینیم ئەوە دەوری کابرایەکیان داوە و ئەویش قسەی خۆشیان بۆ دەکا و ئەوانیش پێ دەکەنن. ناوی 'ئیبنولغارییبی' بوو. ئێستا کە قسەکانی ئەوم بیر هاتنەوە، بە خۆم نەبوو پێکەنینم هات. داوای لێ بووردن دەکەم.'

"خەلیفە گوتی: 'هەر ئێستا دەچی ئەو کابرایەم بۆ دێنی.' مەسروور خێرا دەرپەڕی و چوو ئیبنولغارییبی دیتەوە و پێی گوت: 'وەرە با بچین بۆ لای خەلیفە. بانگت دەکا.' گوتی: 'باشە بە چاوان.' مەسروور گوتی: 'بەڵام بە مەرجێک، کە هاتی و لەوێ خەلیفە خەڵاتی کردی، دەبێ چواریەکی هەڵگری بۆ خۆت و ئەوی دیکەی بدەی بە من.' ئیبنولغارییبی گوتی: 'ئەوەی خەلیفە دایمێ، لە نێوەڕاستەوە بەشی دەکەین. نیوەی بۆ تۆ و نیوەی بۆ خۆم.' مەسروور گوتی: 'شتی وا نابێ.' ئیبنولغارییبی گوتی: 'سێدووی بۆ تۆ و سێیەکیشی بۆ من.' مەسروور دوای مشتومڕێکی زۆر ڕازی بوو. ئینجا هەستان و گەڕانەوە بۆ لای خەلیفە.

"سڵاویان کرد و مەسروور بە خەلیفەی ڕاگەیاند: 'قوربان ئەوەش ئیبنولغارییبی.' خەلیفە گوتی: ' ئەگەر تۆ منت وە پێکەنین نەخست، ئەوە بەو هەنبانەیە سێ دانەت لێ ڕادەکێشم.' ئیدی ئیبنولغارییبی لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو هەنبانەیە خاڵییە و خۆ پێم وا نییە ئێشێکی وای هەبێ.' ئینجا دەستی کرد بە گێڕانەوە. قسەی واوای دەکرد، قەڵس و لاسارترین مرۆڤەکانیشی وە پێکەنین دەخست، کەچی ئەختوچاری کرد، خەلیفە بزەیەکیشی نەهاتێ. ئینجا بە ئیبنولغارییبی گوت: 'ئیدی حەقی خۆتە لێت دەم.'

"خەلیفە فەرمانی دا هەنبانەیەکیان لەنێو شانی دا. لەنێو هەنبانەکەشدا نزیک هەشتسەد مسقاڵی ئاسن تێدا بوو. هەر کە هەنبانەکەیان لە نێوشانی دا، مەمنا ئێشی زۆر پێ گەیشت، هاواری لێ هەستا و مەرجەکەی وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ مەسروور بەستبووی. هاواری کرد، خەلیفە: 'ڕێم بدە با دوو قسەی دیکە بکەم.' خەلیفە گوتی: 'بڵێ بزانم چییە.' ئیبنولغارییبی گوتی: 'خەلیفە، لەگەڵ مەسروور قەرارمان کردووە کە جەنابت هەر شتێکم بدەیتێ سێیەکی بۆ من بێ و سێدووی بۆ ئەو بێ. ئەو قەبووڵیشی نەدەکرد بە هەزار کێشە ڕازیم کردووە. ئێستا کە دیارییەکەی جەنابت بوو بە هەنبانەلێدان، من ئەوە یەک دانەم لێ دراوە. ئەو دووانەکەی دیکەش دەبێ لەو درێن و ئەوە لە خزمەتتاندا ڕاوەستاوە.'

"خەلیفە کە گوێی لەو قسـەیە بوو، ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو لەسـەر گازی پشـت بکەوێ. ئینجا مەسـروورریان هێنا پێشـێ و هەنبانەیەکیشـیان لەو دا. مەسـروور هاواری لێ هەستا و گوتی: 'خەلیفە من سێیەکم بەسە. ئەوەی دیکەش بدەن بەو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سێسەد و نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەسروور گوتی: 'ئەوەی دیکەش بدەن بەو.' خەلیفە زۆر پێکەنی و یەکی هەزار دیناری زێڕی دانێ. هەردووکیان بە خۆشی و کەیفسازی گەڕانەوە.

### بەسەرهاتی خەلیفەزادەی لەخوداترس

"دەگێڕنەوە هاروونەڕرەشید کوڕێکی شازدەساڵانەی هەبوو کە ڕێی خوداپەرستی گرتبووە بەر. دەچووە گۆڕستان قسەی لەگەڵ مردووەکان دەکرد و پێی دەگوتن: 'ئێوە دنیاتان بە کۆڵ هەگرت، بەڵام دنیا وەفای بۆ ئێوە نەبوو. ئێوەی پێ ڕزگار نەکرا. خۆزگە بمزانیبایە دوای ئەوەی ئێوە هاتنە ئێرە، ئیدی چییان پێ گوتوون و چۆنتان بۆ دەگوزەرێ؟' ئەو قسانەی دەکرد و دەگریا و ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە.:

خوایە بۆ خاتر دەریای ڕەحمەتت
نەکەومە داوی شەیتانی پەستت
بەرگە ناگرم دوور لە بەزەت بم
موحتاجی دەستی خوێڕییە کۆیلەت بم

"هەڵکەوت وا بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان بابی لەگەڵ وەزیر و گەورەکانی دەوڵەت و کۆیلە و دەستوپێوەندەکانی بە وێدا هاتن. سەیریان کرد ئەوە کوڕەکەی خەلیفە بە عەبا و سەرپێچێکی سادەوە لە وێیە. لە بەر خۆیانەوە دەیانگوت: 'ئەو کوڕە ئابڕووی خەلیفەی لەناو خەڵکدا بردووە. ئەگەر خەلیفە پێی بڵێ و سەرکۆنەی بکا، دەست لەو کارانە هەڵدەگرێ.' خەلیفە گوێی لەو قسانە بوو. بە کوڕەکەی خۆیی گوت: 'کوڕم، تۆ بەو کارانەت ئابڕووی منت بدووە، دەست هەڵگرە.' کوڕە هەر تەماشای بابی کرد و هیچی نەگوت. ئینجا چاوی لەو باڵندەیە کرد کە لەسەر گوێسوانەی کۆشک هەڵنیشتبوو. بە باڵندەکەی گوت: 'مەلەکە، بیکە بۆ خاتری ئەو خودایەی تۆی بەدی هێناوە هەستە وەرە لەسەر دەستم هەڵنیشە.' لەڕێوە مەلەکە هات و لەسەر دەستی هەڵنیشت. دوای ئەوە پێی گوت: 'هەستە بڕۆوە بۆ شوێنەکەی خۆت.' مەلەکە هەڵفڕی چووەوە جێگاکەی خۆی. ئەوجار پێی گوت: 'هەستە وەرە لەسەر دەستی خەلیفە هەڵنیشە.' مەلەکە نەچووە سەر دەستی خەلیفە. ئینجا کوڕەکەی پێی گوت: 'بابە، تۆ ئەوەندە هۆگری دنیایەی کە ئابڕووی منت بردووە. من ناچارم بڕۆم و تازە نایەمەوە بۆ لات مەگین لە ڕۆژی پەسڵان.' دوای ئەوە هەستا ڕۆیشت

بۆ بەسـره و لەوێ بە كرێكاری و قوڕەكاری دەیگوزەراند. ڕۆژێ بە دوو درەم كە یەكیانی دەكردە خێر و ئەوی دیش دەدا بە بژیوی ڕۆژانەی خۆی.

"ئەبووعامری بەســـــری گێڕاویێتەوە: 'دیواری ماڵەكەم ڕووخا و، چووم لە گۆڕەپانی كرێكاران كەســـێك بگرم كارم بۆ بكا. چاوم بە لاوێكی جوانچاك كەوت. چووم بۆ لای و ســـلاوم لێ كرد. پاشـــان پێم گوت: 'كار دەكەی؟' گوتی: 'بەڵێ.' ئیدی گوتم: 'لەگەڵم وەرە.' لاوەكـە گوتی: 'من چەنـد مەرجێكم هەن.' گوتم: 'مەرجەكـانـت چین؟' گوتی: 'درەمێک و دانگێك حەقدەســـــت وەردەگرم. بەڵام كاتێك بانگی دا، لێم گەڕێ بچم نوێژ بە جەماعەت بكەم.' من قەبووڵم كرد و لەگەڵ خۆم هێنامەوە ماڵێ. ئەو ڕۆژە كارێكی كرد كە تا ئێســـتا كەســـم نەدیبوو ئاوا بە دڵەوە كار بكا. پێم گوت: 'ئێســـتا قاوەڵتوونانەت بۆ دێنم.' گوتی: 'ناخۆم دەسـتت خۆش بێ.' زانیم كە ئەو بەڕۆژووە. كە بانگی دا، دەسـتی لە كار هەڵگرت، دەسـتوێژێكی هەڵگرت من تا ئێسـتا دەسـتوێژی هێندە ڕێكوپێكم نەدیبوو. دوای ئەوە چوو بۆ نوێژی جەماعەت. كە نوێژەكەی تەواو بوو، هاتەوە ســـەر كارەكەی. ئێوارە پێم گوت: 'كاتی كارەكەت تەواو بووە. كرێكار هەتا ئێوارە كار دەكەن؛ دەســـت هەڵگرە.' دەســـتی هەڵنەگرت و گوتی: 'من هەتا نوێژی شـــێوان كار دەكەم.' وا بوو كە بانگی شـــێوانی دا دەسـتی هەڵگرت. كە دەسـتی هەڵگرت، من دوو درەمم دایە. كەچی وەری نەگرت و گوتی: 'من قەرارم لەگەڵ كردووی، لەوەنـدەی قەرارم كردووە زیـاترم نـاوێ.' گوتم: 'ئەو دوو درەمە نیوەی هەقدەســـتی تۆش نییە.' ڕازی نەبوو و لە درەمێك زیاتری لێ وەرنەگرتم. بەیانی چوومە شـوێنی كرێكارەكان، كەچی ئەوم لەوێ نەدیت. پرسـیارم كرد، گوتیان: 'ئەو هەر شـــەممانە دێتە ئێرە.' بۆ شـــەممەی داهاتوو چوومە ئەو شـــوێنە، دیتم لەوێیە. گوتم: 'بیســـمیللا، فەرموو با بچین بۆ كار.' پێی گوتم: 'هەر بەو مەرجەی جاری پێشـــوو دێم.' منیش گوتم: 'باشە.' ئیدی لەگەڵ خۆم هێنامەوە ماڵێ. لە شوێنێكەوە ڕاوەستام و چاوم لێ دەكرد. ئەو منی لێ دیار نەبوو. ســـەیرم كرد مسـتێكی قوڕ هەڵگرت و لەســـەر دیوارەكەی دانا و بەردەكان یەك لەدوای یەك هەر بۆخۆیان دەهاتنە ســـەر دیوارەكە و ڕیز دەبوون. من لە دڵی خۆمدا گوت: 'ئەو لاوە پیاوی خودایە و لە پیاوچاكانە!' وا بوو ئەو ڕۆژە لە ڕۆژەكانی دیكەی زیاتر كار كرد. كە بوو بە شەو، هەقدەستەكەم دایە. ئەویش لێی وەرگرتم و ڕۆیشـــت. كە شـــەممە هاتەوە، چوومەوە شـــوێنی گۆڕەپانەكە ســـەیرم كرد لەوێ نییە. هەواڵیم پرسـی، گوتیان: 'نەخۆشـە و ئێسـتا لە فلانە كەپردایە. ئەو كەپرەش هی پیرێژنێكی پاك و باوەڕدارە كە لە پاكی و پەرواكاریدا بە ناوبانگە.' كەپرێكی لە قامیش درووســـت كردبوو. چووم بۆ لای. كە چوومە ژوورێ دیتم لەسەر زەوی درێژ بووە و خشتێكی لەبن سـەردایە. ڕوخسـاری لە ئەسـتێرە درەوشـاوەترە. سـلاوم لێ كرد و لە پەنای دانیشـتم. بە خۆم نەبوو، كەمێك بۆ منداڵی و هەناسەساردییەكەی گریام. دوای ئەوە لێم پرسی: 'كار و

شتت به من نییه.؟ گوتی: 'بەرێوەڵلا، من تا بەیانی دەمرم. سبەینێ وەرە بمشۆ و بمنێژە. با کەسـیش بەو کارە نەزانێ. هەر بەو باڵاپۆشـەش کفنم بکە. بەڵام لە پێشـدا گیرفانەکانم بگەڕێ، ئەوەی تێیدا بوو هەڵیگرە بۆ خۆت جگە لە یاقووتەکە. کە نوێژت لەسـەر کردم و ناشـتتم، بچووە بۆ بەغدا و کارێک بکە خەلیفە ببینی. سـڵاوی منی پێ بگەیەنە و یاقووتەکە بدە بەو. دوای ئەوە لاوەکە شـایەدومانی هێنا و زۆری پەسنی پەروەردگار کرد و ئەو ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەی سـەروەری گشـت کـائینـات هێنـدم نەمـاوە بێمە وێ
خـۆشـحـاڵـم پەردە دادڕێ و تـیشـکـی ڕەحـمەتـم بەر کەوێ
دووری و دابڕان دی بەسە، ژیـان پڕە لە دەلەسە
حەز دەکەم نـیزیکەوە بم، بەشم گەر زووخاو بێ لەوێ

" 'دوای ئەوە دەستی کرد بە پاڕاناوە و داوای لێ خۆش بوون.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سێسەد و نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، 'ئەو لاوە دەســتی کرد بە پاڕاناوە و داوای لێخۆش بوون و سـڵاواتناردن بۆ پێغەمبەری ئیسـلام. پاشـان چەند ئایەتی خوێندەوە، ئینجا ئەو شـێعرەی خوێندەوە:

یا ڕەســـــــــــــولەڵلا تکایە کەس شک نابەم لەو دنیایە
بـــــــــــــۆم بکە دۆعا و ڕەجایە هەر تۆم پەنا بی بەسمە
باری قورسم لە دووم نایە، پڕ لە گوناحـــــــــــــــی دنیایە
هیچ کەس وە فریـای من نـایە، بێتوو تۆم هەبی بەســـمە

"ئەبووعامیری بەسـری گێڕاویەتەوە: 'کاتێک ئەو لاوە وەسـیەتەکەی کرد. من هەسـتام و جێم هێشت. کە بۆ بەیانی چوومەوە کنی، دیتم گەڕاوەتەوە بۆ لای حەق. هێنام شـوشـتم و باڵاپۆشەکەیم کردەوە، یاقووتێکی تێدا بوو بایی سەدهەزار دینار بوو. دوای ئەوە ناشتم و بە خاکم سـپارد. ڕۆیشـتم بەرەو بەغدا. کە گەیشـتمە دارولخەلیفە، لە بەردەرگا چاوەڕێی خەلیفە هاروونەڕڕەشـید بووم. لەوێ دانیشـتبووم کە خەلیفە هاتە دەرێ. چوومە پێشـی سـڵاوم کرد و یاقووتەکەم دایە. کاتێک خەلیفە یاقووتەکەی ناسـییەوە، بێهۆش کەوت. خزمەتکارەکان منیـان گرت. کـاتێک خەلیفە هـاتەوە ســـەر خۆ، گوتی: 'بەڕێزەوە بیبەنە کۆشک.' دوای ئەوە کاتێک خەلیفە هاتەوە کۆشک، منی بانگ کردە لای خۆی و لێی پرسیم: 'خاوەنی ئەو یاقووتە چی بەســـەر هاتووە؟' منیش هەرچی لەو لاوەم دیتبوو، بۆم گێڕاوە. ئیدی دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: 'خۆش بە حاڵی ئەو کوڕە وا خۆشـبەخت بوو. خودا ڕەحم بە بابی بکا وا خافڵ بوو.' دوای ئەوە بانگی ژنێکی کرد، ژنە هات. هەرکە منی دیت، ویستی بگەڕێتەوە. خەلیفە بانگی کرد: 'وەرە قەیناکا.' ئیدی ئەو ژنە هاتە ژوورێ و سڵاوی کرد. خەلیفە یـاقووتەکەی بۆ هەڵدا. ژنە هەر کە یـاقووتەکەی دیت، بوورایەوە. کـاتێک بە هۆش هـاتەوە، گوتی: 'خەلیفە، ئەوە کوڕەکەم چی لێ هـاتووە؟' خەلیفە بە منی گوت: 'دا بۆی بگێڕەوە.' چیم دیبوو بۆ ئەویشـم گێڕاوە. ئەویش دەسـتی کرد بە گریان و هەر بەدەم گریـانەوە گوتی: 'ئاااای کوڕەکەم چەندە بە ئاواتی دیدارت بووم! خۆزگە لە پەنـات بـام و قومێ ئـاوم دابایتێ و چـاوم لێک نـابـای.' ئیدی هەر ڕۆندکی ڕشـــت و ئەو بەیتـانەی دەخوێندەوە:

ڕۆڵەی شـــــــــــــــیرینم بینایی چاوم
کـزەی بەنـــــــــدی دل، ڕەش بـوو هەنـاوم

تازە ناتبـــــــــــــــــینم، ئۆغرت خێر بێ
چــاوەیـلـی دایـکـت لە دووریـت کـوێـر بـێ

"دوای ئەوە گوتم: 'جەنابی خەلیفە، بۆ ئەو لاوە کوڕی تۆ بوو؟!' خەلیفە گوتی: 'بەڵێ، ئەوە پێش ئەوەی من ببم بە خەلیفە دەچوو بۆ ســـەردانی زانایان و چاکەکاران. کاتێک من بووم بە خەلیفە، لێم دوور کەوتەوە و ڕۆیشــت. بە دایکیم گوت: 'ئەو کوڕە تەرکەدنیا بووە بۆ ئەوەی ســـەختی ببینێ. تۆ ئەو یاقووتەی بدەرێ تا ئەگەر پێویســتی پێی بوو، بە کاری بێ.' دایکی یـاقووتەکەی بۆ برد و ســـوێندی دا ئەو یـاقووتە لە لای خۆی ڕاگرێ. ئەو داواکەی دایکی قەبووڵ کرد و یاقووتەکەی لێ وەرگرت. پاشـــان ســـەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشـــــت. خۆی لێ ون کردم. ئیدی هەر ون بوو هەتا بە پاکی چووەوە بۆ لای خودای خۆی.'

" 'دوای ئەوە خەلیفە گوتی: 'هەســتە با بچین گڵکۆکەیم پیشــان بدە.' هەســـتام لەگەڵی چووم گڵکۆکەیم پیشـــــان دا. خەلیفە هێندە گریا هەتا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە، لە خودا پاڕاوە لێی خۆش بێ و لەگەڵی بەمەیل بێ. زۆری دۆعا بۆ کرد. ئینجا داوای لێ کردم هاونیشـینی بم. منیش گوتم: 'خەلیفە، من زۆر شــت لەو کوڕەی تۆ فێر بووم و دەیکەم بە سەرمەشقی خۆم.' ئیدی ئەو شێعرەم خوێندەوە:

زۆر کەس بە ئـاکـاری جوانـی دەرســـێـک فـێـری مرۆ دەکـا
هەزاران ئـامـــــــــــــۆژگاری و پەند نیوەی ئەو کـارت تێ نـاکـا
هـــاوڕێـــی بـــاش چـــرایە بـــۆ ڕێ، ڕێـــگەی تـــاریـــکـــی ئەم ژیـــنە
ڕێی نووتەکی بۆم ڕوونـاک کرد، شـــــاییم نەمـاوە بەم ژینە

## چیرۆکی مامۆستای گەوج

"یەکی دیکە لەو چیرۆکـانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە یەکێـک لە بلیمەتەکـان گوتوویە: 'مامۆســتایەکم لە خوێندنگەیەکی منداڵاندا دیت، خاوێن و جوانچاک. چووم بۆ لای. لە بەرم هەستا و لە لای خۆی داینیشـاندم. پێکەوە باسی خوێندنەوە و شێعر و وشە و ڕێزمانمان کرد. تەماشـــام کرد لە هەموویان شـــارەزایە. ئیدی هەتا ماوەیەکی زۆر پێکەوە یەکترمان دەدیـت و هەر ڕۆژەی گەورەییەکیم بۆ دەردەکەوت. لە دڵی خۆمـدا گوتم: 'ئەو هەموو زاناییە لە مامۆستایەکی منداڵاندا سەیرە!' چونکە ئەوەندەی بیستبووم، دەگوترا مامۆستای منداڵان گەوج و کەمفامن. پاشان ماوەیەک لێک دوور کەوتینەوە. ڕۆژێک هەستام چووم بۆ لای. ســـەیرم کرد دەرگای خوێندنگە داخراوە. لە ماڵەکانی دەوروبەرم پرســـی: 'ئەوە چی

بووه؟ بۆ داخراوه؟' گوتیان: 'کەسێکی مردووه؟' له دڵی خۆمدا گوتم: 'دەبێ بچم سەرەخۆشی لێ بکەم.' ئیدی چووم بۆ ماڵەکەی و له دەرگام دا. کەنیزێک هات بردمییه ژووریٚ. تەماشام کرد دانیشتووه و پەڕۆیەکی له سەری بەستووه. پێم گوت: 'خودا خەمت سووک کا و پاداشتی چاکت داتەوه. ئەو ڕێگایه لەپێش هەمووماندایه. دەبێ بەسەر خۆتدا زاڵ بی.' لێم پرسی: 'ئەوه کێته مردووه؟' گوتی: 'ئەوه ئازیزترین کەسم بوو.' گوتم: 'باوکته؟' گوتی: 'ناوەڵڵا.' گوتم: 'دایکته؟' گوتی: 'ناوەڵڵا.' گوتم: 'براته؟' گوتی: 'ناوەڵڵا.' گوتم: 'خزم و کەستە؟' گوتی: 'ناوەڵڵا.' گوتم: 'ئەی چیت بوو؟' گوتی: 'گراوم بوو.' له دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەوه یەکەم نیشانەی گەوجێتییەتی.' ئینجا گوتم: 'جا چی زۆره ژن. لەویش ژیر و جوانتر پەیدا دەبێ.' گوتی: 'من هێشتا نەمدیتبوو تا بزانم کێ لەو جوان و دەلالتره.' له دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەوه دووەمین نیشانەی گەوجێتییەتی.' ئیدی لێم پرسی: 'ئەی چۆن تۆ کەسێکت نەدیوه و ئاوا هۆگری بووی؟' گوتی: 'کاکه گیان، ڕۆژێک له بەردەرگا دانیشتبووم. پیاوێک بەوێدا هات و ئەو شێعرەی خوێندەوه:

سیرەی ئەو چاو و برۆیەی کاری تیر و کەوان دەکا
ناز و عیشوه و خۆبادانی پیر و لاو پەرێشان دەکا
بەژنی، پێستی، قژی خاوی، وتەی، بزەی دەموچاوی
هەریەکەی بۆخۆی سیحرێکه کار له دڵ و له گیان دەکا

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

## که شەوی چوارسەدەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'ئەو کورە مامۆستایە گوتی: 'کە کابرا ڕێبوارەکە ئەو شێعرەی خوێندەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەگەر ئەو شۆخە هێندە جوان نەبێ، شاعیران ئاوا پێی هەڵنالێن.' ئیدی منیش ئاوا شەیدای بووم.' دوو ڕۆژ دوای ئەوە هەر ئەو پیاوە بە بەردەرگادا ڕابرد و ئەو چەند بەیتەی خوێندەوە:

جوانی جوانان، شۆخی شۆخان، باڵاسەلوم ڕۆ
چاوگەشی ئەبرۆ کەوانی لێوبەبزەم ڕۆ
جوانترین گوڵی دنیا لە باخی ژیانا
بۆچی هەڵوەری عەزیزم؟ تاجی سەرم ڕۆ

" ' 'ئیدی هەر لە ڕێوە زانیم ئەو ژنە جوانە مردووە. لە تاوان هێزی ئەژنۆم نەما و ئەوە سێ ڕۆژە ئەژنۆی خەمم لە ئامێز گرتووە.' جا کاتێک زانیم ئەوەندە گەوج و نەفامە، بە جێم هێشت و هاتمەوە ماڵەکەی خۆم.'

### چیرۆکی دەرکەوتنی گەوجێتی مامۆستایەک

"شتێکی دیکە لەسەر گەوجێتی مامۆستای منداڵان دەگێڕنەوە، دەڵێن، پیاوێک مامۆستای منداڵان بوو. پیاوێکی زانا و بلیمەت هاتە لای. سەیری کرد ئەوە لە باری زمان و وشە و شێعر و وێژەوە زۆر شارەزایە. پێی سەیر بوو، گوتی: 'خۆ بیستوومە مامۆستای منداڵان زۆر ژیر نین. ئەوە چۆنە ئەو کابرایە ئاوا تێگەیشتوو و تەواوە؟'

"کاتێک ویستی بەجێی بێڵێ و بگەڕێتەوە، مامۆستاکە نەیهێشت و گوتی: 'دەبێ ئەمشەو میوانم بی.' کابراش دڵی نەشکاند و لەگەڵی چووەوە ماڵەکەی. مامۆستاکە زۆری ڕێز لێ گرت و خواردنی بۆ دانا. نانەکەیان خوارد و هەتا دەرنگانێک پێکەوە قسەیان کرد و بیروڕایان گۆڕییەوە. دوای ئەوە مامۆستاکە جێی بۆ ئەو ڕاخست و بۆخۆی چوو بۆ دیوی ژنەکەی. کابرای میوان تازە خەوتبوو، هاوارێک لە دیوی ئەو ژن و مێردەوە هەستا. میوانەکە پرسیاری کرد: 'ئەوە چی بووە؟' ژنەکەی گوتی: 'کاکە بەڵایەکی گەورەمان بەسەر هات. ئەوە مێردەکەم دەمرێ.' چوومە سەری گوتم: 'ئەوە چی بوو؟' مامۆستاکە گوتی: 'کاتێک لە لای تۆ هاتمە دەرێ، دانیشتم و بیرم لە گەورەیی کاری خودا دەکردەوە. سەیرم کرد هەر شتێک خودا بە ئێمەی داوە، کار و قازانجێکی هەیە. بۆ وێنە دەست، ئەوە نانی پێ

دەخۆین و خۆمانی پێ خاوێن دەکەینەوە و پارێزگاری پێ لە خۆمان دەکەین. چاوە، ئەوە پێی دەبینین. بەو جۆرە هەر شتەی بە کاری شتێک دێ، جگە لەو جووتە گونە. ئەوەندەی بیرم کردەوە، دیتم زیادین. ئیدی بەو خەنجەرە بڕیمن و ئەوە گیانم دەر دەچێ.' ئیدی کابرای میوان گوتی: 'لە خۆڕا نەیانگوتووە: 'مامۆستای منداڵان هێندە زانا بن سەریان بچێتە حەوێقی[1] ئاسمان، هەر گەوجن.' '

## چیرۆکی مامۆستای نەزان

"دیسان دەگێڕنەوە: کابرایەک خوێندنەوە و نووسینی نەدەزانی، هەمیشە لەگەڵ خەڵک بە فێڵ و دەهۆ بوو. هەر لەو ڕێیەشەوە بژیویشی پەیدا دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان کەوتە بیر ئەوە کە فێرگەیەک دانێ و منداڵان پەروەردە بکا. ئیدی هێندێک نووسراوە و کاغەز و شتی کۆ کردنەوە و هەڵیواسین. جامانەکەشی گەورە کردەوە و لە بەردەرگای فێرگەکەی دانیشت. خەڵک کە بەوێدا تێدەپەڕین، سەرنجیان دەدا جامانە و نووسراوەی هەڵاوەسراو و شتەکانی، ئیدی پێیان وا بوو داخۆ ئەوە دەبێ چ زانایەک بێ! هەر بۆیە منداڵەکانیان دەنارده لای بۆ خوێندن. کابرای گۆڕین بە یەکێک لە منداڵەکان کە شتێکی دەزانی، دەگوت: 'شتێک بنووسە.' پاشان پێی دەگوت: 'بیخوێنەوە.' ئینجا هەر ئەوەی بە وانی دیکەش دەگوت. ئەوجار پێی دەگوتن: 'چاو لەو کەن. وەک ئەو بنووسن و بخوێننەوە.'

"ڕۆژێکی هەر وەک ڕۆژان لە بەردەرگای پۆلەکەی دانیشتبوو، چاوی لێ بوو ژنێک لەولاوە دێ و کاغەزێکیشی بە دەستەوەیە. هەر زوو زانی ئەوە نامەیە و هێناویە بۆی بخوێنێتەوە. گوتی: 'بە خودا پێوە بووم. خۆ من بۆم ناخوێندرێتەوە.' بە پەلە ویستی لەوێ بڕوا و خۆی ڕزگار بکا. بەڵام تا ئەو خۆی ساز کرد دەرباز بێ، ژنە گەیشتە سەری. گوتی: 'ئەوە دەچی بۆ کوێ؟' گوتی: 'دەڵێم بچم نوێژی نیوەڕۆ بکەم و بگەڕێمەوە.' ئەو ژنە گوتی: 'هێشتا نوێژی نیوەڕۆ نەبووە. جارێ ئەو نامەیەم بۆ بخوێنەوە.' کابرا نامەکەی لێ وەرگرت. نامەکەی سەرەوبن گرتبوو. جا لێی ورد بووەوە. نەیدەزانی چ بکا. جارێ جامانەی ڕاستەوپاستە دەکرد. جارێ کایەی بە برۆکانی دەکرد و هەر جارەی یەکیانی دەبردە سەرێ و ئەوی دیکەی دێنا خوارێ. خۆی ڕاست و چەپ دەکرد. نامەکەی دێنا پێشێ و دەیکشاندەوە. جارێ وا بوو خۆی تووڕە دەکرد. ئەو ژنە، مێردەکەی لە سەفەر بوو. ئەو نامەیە هی مێردەکەی بوو بۆی ناردبووەوە. ژنە کە دیتی ئەو ئاوا گیری کردووە، وای زانی مێردەکەی مردووە و کابرا نازانێ چۆنی پێ بڵێ. ئیدی ژنە لێی پرسی: 'گەورەم، ئەگەر مێردەکەم مردووە پێم بڵێ.' کابرا سەرێکی لەقاند و بێدەنگ بوو. ژنە گوتی:

---

١. حەوێق: بەرزایی (لەگەڵ ئاسماندا بەکار دێت)

'گەورەم، پێم بڵێ با یەخەی خۆم دادڕم.' کابرا گوتی: 'دایدڕە.' گوتی: 'با چەپۆک بە خۆمدا دەم.' گوتی: 'پێیدا دە.' ئیدی ژنە نامەکەی لێ وەرگرت و بە گریان گەڕاوە بۆ لای منداڵەکانی و دەستیان کرد بە شین و ڕۆڕۆ. کابرایەکی دراوسێیان هات و گوتی: 'ئەوە چی بووە، بۆ دەگرین؟' گوتیان: 'نامەیەک هاتووە نووسیویانە کە مێردی ئەو ژنە مردووە. لەبەر ئەوە دەگرین.' کابرای دراوسێیان گوتی: 'درۆیە کێ دەڵێ مردووە؟! تازە نامەیەکی بۆ من ناردووە، گوتوویە ساغ و سەلیمم و دە ڕۆژی دیکە دێمەوە.' ئیدی ئەو کابرایە چوو بۆ لای ژنەکە و گوتی: 'کوا ئەو نامەی تێیدا نووسراوە مێردەکەت مردووە؟' ژنە نامەکەی بۆ هێنا. کابرا نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. کەچی تێیدا نووسرابوو: 'لەپاش سڵاو، من ساغ و سلامەتم و دە ڕۆژی دیکە دێمەوە لاتان. ئەوە مەلافەیەک و پشتوێنێکیشم بۆ ناردوونەوە.'

"ژنە نامەکەی لێ وەرگرت و یەکسەر چوو بۆ لای کابرای مامۆستا و پێی گوت: 'ئەوە بۆ ئاوات لێ کردم؟ ئەو هەواڵە چی بوو دات بە من و ئەو دەردەت دامێ؟' ئیدی ژنە ئەوەی لە کابرای دراوسێیانی بیستبوو، کە مێردەکەی ساغ و سلامەتە و مەلافە و پشتێنی ناردووەتەوە و ... هەمووی بۆ گێڕاوە. ئەو کابرایە بە ژنەکەی گوت: 'بە ڕاستتە، دەبێ بمبەخشی لەو جەنگەیەدا من زۆر تووڕە و ناڕەحەت بووم. هۆشم لە جێگایەکی دیکە بوو. کاتێک پشتوێنەکەم دی لە مەلافەکە پێچرابوو، وام زانی ئەو مردووە و کفنیان کردووە. مەمنا ژنە ساویلەک بوو، بیانووەکەی لێ قەبووڵ کرد. نامەکەی لێ وەرگرت و گەڕاوە."

# که شەوی چوارسەد و یەکەم هاتەوە

## چیرۆکی کاریگەری کتێب

شــــەهرزاد گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دەگێڕنەوە، یەکێک لە پاشـــاکان هەســـتا جلوبەرگی مســـکێنانی لە بەر کرد و ڕۆیشـــت بۆ نێو خەڵک هەتا لە چۆنیەتی باردۆخی خەڵک ئاگادار بێ. گەیشـــتە گوندێکی گەورە. زۆری تینوو بوو. لە دەرکەی ماڵێک ڕاوەســـتا و داوای ئاوی کرد. ژنێکی شـۆخ و دەلال بە جەڕەیەک ئاو هاتە دەرێ و ئاوی دا بە پاشـا. پاشـا ئاوەکەی خواردەوە و سـەیری ژنەی کرد و هۆگری بوو، داوای لێ کرد. ژنە ئەوی دەناسـی. بردییە ژوورەوە لەوێ کتێبێکی پەند و ئامۆژگاری لەبەردەم دانا و گوتی: 'تۆ چاوێک لەو کتێبە بکە هەتا ئەمن دەســـتێک بە خۆمدا دێنم و خۆم ڕێکوپێک دەکەم و دێمەوە لات.' پاشـــا دەسـتی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە. لەو کتێبەدا سـەرکۆنەی زیناکار کرابوو، باسـی ئەو ئازار و ئەشکەنجانە کرابوون کە زیناکار لە ڕۆژی پەسـڵان تووشـی دەبێ. لە ترسـی خودا موچڕکی بە لەشـدا هات. لەجێوە هەسـتا و لەو ماڵە چووە دەرێ. مێردی ئەو ژنە لە ماڵ نەبوو. کە هاتەوە، ژنەکەی شتەکەی بۆ گێڕاوە. کابرا ترسـی ڕێ نیشت، نەکا پاشـا چاوی بەدوایەوە بێ، لە ترسـان نەیدەوێرا نزیکی ژنەکەی بێتەوە. ماوەیەکی زۆر ئاوا تێپەڕی. ژنە دەوروبەریانی لە پێوەندی نێوان خۆی و مێردەکەی ئاگادار کردەوە. خزمەکانی مێردەکەیان بردە لای پاشـا. بە پاشـایان گوت: 'خودا پاشـا ڕاوەسـتاو کا. قوربان ئەو کابرایە زەوییەکی لە ئێمە بە ئیجارە گرتووە و تووی تێدا چاندووە. ئێســـتا کار لەســـەر ئەو زەوییە ناکا. نە ئەوەیە بیداتەوە بە کەسـێکی دیکە کاری لەسـەر بکا، نە ئەوەیە کاری لەســەر بکا. ئێمە چ بکەین، قوربان؟ ئێمە نیگەرانی ئەوەین ئەگەر بێتوو ئەو زەوییە کاری لەسەر نەکرێ، خراپ ببێ، چونکە زەوی کاری لەسەر نەکرێ، لە کار دەکەوێ.'

"پاشا بەو پیاوەی گوت: 'بۆ کار لەسەر زەوییەکەت ناکەی؟' ئەو کابرایە گوتی: 'قوربان. گەورەی پاشایان، بیستوومە شێرێک هاتووەتە ناو ئەو زەوییەوە، من دەرەقەتی ئەو شێرە نایەم و هەر بۆیە ناوێرم خۆم لە قەرەی ئەو زەوییە بدەم.'

"پاشـــا زانی باســـی چی دەکا، گوتی: 'کاکە، شـــێر نەچووەتە ســـەر زەوییەکەت. زەوییەکەشـــت زۆر زەوی چاکە. بۆ خۆت کاری لەســـەر بکە و دڵنیا بە شـــێر دەســـتی لە زەوی تۆ نەداوە. هیوادارم زەویت پڕ پیت و بەرەکەت بێ.' دوایی پاشا خەڵاتێکی زۆری بۆ کابرا و ژنەکەی نارد.

**چیرۆکی عەبدوڵڵا مەغریبی**

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە، پیاوێکی خەڵکی مەغریب دەگەڕا و هاتوچۆی شار و دەریای دوور دووری دەکرد. قەزا و قەدەر ئەوی تووشی دوورگەیەک کرد و ماوەیەک لەو دوورگەیە ماوە. دوای ئەوە گەڕاوە بۆ شارەکەی خۆی. پەڕێکی بەچکە ڕووخی[1] کە تازە سەری لە هێلکە هێنابووە دەرێ لەگەڵ خۆی هێناوە. دەڵێن قامیشەکەی نۆ مەشکە ئاو دەبا و درێژاییەکەی هەزار زەرعە[2]. خەڵک سەریان لەو پەڕە سوور مابوو. ئەو کابرایە ناوی عەبدوڵڵا مەغریبی بوو. بەڵام خەڵک پێیان دەگوت: 'چینی،' چونکە ماوەیەکی زۆر لە چین مابووەوە و چیرۆکی سەیر سەیری لە بارەی چینەوە دەگێڕاوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. مەلێکی ئەفسانەییە وەک سیمورخ.

٢. زەرع : بەرابەری گەزێکە واتە میترێک و چوار سانتی میتر.

## که شەوی چوارسەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەبدوڵلا چینی چیرۆکی سەیر سەیری لەبارەی چینەوە دەگێڕاوە. یەکێک لەو چیرۆکانە ئەوە بوو دەیگوت: 'جارێکیان لەگەڵ چەند کەسێک لە دەریای چیندا دەڕۆیشتین. لە دوورەوە دوورگەیەکمان دیت. پاپۆڕەکەمان بەرەو دوورگەکە ڕادا. سەیرمان کرد دوورگەیەکی گەورەیە. خەڵکەکە لە پاپۆڕەکە دابەزین و بڵاو بوونەوە، شوێن ئاو و چرپی و شت کەوتن. تەشوێ و گوریسیشیان پێ بوو. ئینجا لە دوور چاویان بە گومبەزێکی سپی کەوت؛ لەسەر خانوویەک بوو. نزیکەی هەزار گەز درێژ بوو. هەر کە دیتیان، چوون بۆ لای. کە نزیک بوونەوە، سەیریان کرد ئەوە هێلکەی رووخە. بە بەرد و تەشوێ شکاندیان، دیتان بەچکەیەکی تێدایە بە قەد فیلێک دەبێ. تووک و پەڕەکانیان لێ کردەوە. بە هەزار زەحمەت کەوڵیان کرد. ئەوەندەی توانییان گۆشتیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ نێو پاپۆڕەکە. خێرا چارۆکەکانیان هەڵدا و ئەو شەوە تا بەیانی بێ ڕاوەستا ڕۆیشتن. وا بوو بە ڕێکەوت بای خوازراو هات و پاپۆڕەکەی تیژ ئاژۆت. لەپڕدا رووخەکە وەک هەورێکی گەورە لەسەر سەریان پەیدا بوو. بەردێکی گەورەی بە چنگەوە بوو، لە پاپۆڕەکە گەورەتر بوو. هەر ڕێک گەیشتە سەر پاپۆڕەکە، بەردەکەی بەرداوە. مەمنا پاپۆڕەکە توند دەڕۆیشت، بەردەکە بەر پاپۆڕەکە نەکەوت و کەوتە دەریاوە. کە بەردەکە کەوتە ئاوەکەوە، دانیشتووانی نێو پاپۆڕەکە زۆر لە شەپۆلی توندی دەریا ترسان، بەڵام باش بوو بە سلامەتی ڕزگاریان بوو. لە ڕێگە هەر لە گۆشتی ئەو جووچکە رووخەیان سوور کردەوە و خواردیان. لە پاپۆڕەکەدا هەندێک کەسی پیر و سەر و ریشسپی هەبوون. کە ڕۆژ بووەوە، سەیریان کرد هەموویان سەروڕدێنیان ڕەش بووەتەوە، هاتوونەتەوە تافی لاوی.'

"دەگێڕنەوە هەندێک پێیان وا بوو هۆکاری ئەو گەنجبوونەوەیە دارێک بوو کە پێیان دەگوت: 'داری لاوی.' دەڵێن بەو دارە لە هەرکەسیان دابایە، گەنج دەبووەوە. هەندێکی دیکەش دەیانگوت: 'هی گۆشتی ئەو جووچکە رووخە بووە.' ئەوە یەکێک لە سەیرترین چیرۆکەکانە."

### چیرۆکی عودەیی کوڕی زەید

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە، نوعمانی کوڕی مونزەر، کە پاشایەکی عەرەب بوو، کچێکی هەبوو ناوی هیند بوو. هیند جوانترین ژنی ڕۆژگاری خۆی بوو. لەو دەمەدا عودەیی کوڕی زەید لە لای کیسراوە دیاری بۆ نوعمان هێنابوو. ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت هیند لەگەڵ مارییەی قەرەواشیدا لە کڵێسای بەیزا بوو. عودەیی کوڕی زەیدیش هات بۆ

دیتنی کڵێساکە. عودەی لاوێکی جوانچاک و لەبەردڵان بوو. مارییەی کەنیز دڵی چووبووێ، بەڵام خۆ نەدەکرا شـــووی پێ بکا. کاتێک مارییە ئەوی دیت، بە هیندی گوت: 'چاو لەو گەنجە کە. بە خودا کەس ئەوەندە جوان نییە!' هیندی کچی نوعمان گوتی: 'ئەو لاوە کێیە؟' مارییە گوتی: 'ئەوە عودەی کوڕی زەیدە.' هیند گوتی: 'دەترسم ئەو بمناسێ.' مارییە گوتی: 'جا ئەو بۆ تۆ دەناسێ؟ خۆ قەت نەیدیوی!' ئیدی هیند لێی چووە پێشێ. عودەی لەگەڵ ئەو لاوانەی لەوێ بوون خەریکی کایە و جەفەنگ بوون. لە جوانی و گفتولفت و هەڵسوکەوتدا لەوان لە ســەرتر بوو. ئیدی هەر کە چاوی پێی کەوت، هۆگری بوو. خەریک بوو لە تاوی، دڵی ببوورێتەوە. عودەییش ئـاشـــقی بوو، بە دیتنی وە دڵەکوتە کەوت و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. بە سرتە بە یەکێک لەو گەنجانەی گوت: 'دوای کەوە. بزانە ماڵیان لە کوێیە.' کوڕە کەوتە شـــوێنیان. پاش ماوەیەک گەڕاوە و گوتی: 'ئەوە هیندە کچی نوعمانە.' ئیدی عودەی لە کڵێسا هاتە دەرەوە و لە تاوان نەیدەزانی چۆن بە ڕێدا دەڕوا. لە بەر خۆیەوە ئەو بەیتەی گوت:

هـات و وەکوو مـانگی چواردە ڕوونـاکی کرد شــەوی تـارم
بێـتوو دیســــــان نەیـبینـمەوە، چـۆن ڕادەبـرێ شــەوی زارم؟

"کاتێک گەڕاوە شوێنەکەی خۆی، شەو لەوێ ماوە، بەڵام هەرچییەکی کرد خەو نەچووە چاوییەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چواسەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عودەی کوڕی زەید خەو بە چاویدا نەهات. کە ڕۆژ بووەوە، مارییە هاتە لای. کە مارییە هاتە لای، بە ڕووی خۆشـــەوە دواندی و زۆری لەگەڵ بەســۆز بوو. کاتێک مارییە عودەی دیت ئاوا ســـەر و ڕووخۆش و بەکەیفە، پێی گوت: 'کارێکم پێتە.' عودەی گوتی: 'بڵێ بزانم چیت دەوێ؟ قەســـەم بە خودا هەر چییەکت بوێ دەتدەمێ.' ئیدی مارییە باسی ئەو خۆشەویستییەی کرد کە چەند وەختە شاردوویەتەوە. گوتی: 'حەز دەکەم دەســـتم لەگەڵ تێکەڵ کەی.' عودەیی کوڕی زەید گوتی: 'چی بڵێی لەگەڵت دەکەم، بەو مەرجەی کارێک بکەی من و هیند پێک بگەیەنی.' مارییە مەرجەکەی ئەوی پەســـەند کرد و عودەی کوڕی زەید ئەوی برد بۆ مەیخانە و لەوێ لەگەڵی دەستەملان بوو.

"دوای ئەوە مـارییە هـاتە دەرێ و چوو بۆ لای هینـد و پێی گوت: 'پێـت خۆش نییە عودەی کوڕی زەید ببینی؟' هیند گوتی: 'جا چۆن پێم خۆش نییە؟ شەوی ڕابردوو لە تاوان کەس نازانێ چۆن ڕۆژم لێ بووەوە.' ئینجا مارییە گوتی: 'ڕاوەســـتە، من شــوێنێک ســـاز دەکەم کە تۆ لە کۆشکەوە ئەوت لێ دیار بێ.' هیند گوتی: 'چیت پێ خۆشە بیکە.'

"مارییە شــوێنێکی وای دیتەوە کە لە یەکێک لە دیوەکانی کۆشــکەوە جوان دیار بوو. بە عودەیی گوت کە بچێتە ئەو شـــوێنە. عودەی چووە ئەوێ و هینـدیش لە کۆشـــکەوە ڕووبەڕووی ڕاوەســـتا و چاوی تێ بڕی. کە جوان تێی ڕاما، لە تاوان خەریک بوو بە لادا بێ و بکەوێتە ســـەر زەوی. ئینجا بە مارییەی گوت: 'ئەگەر بێتوو ئەمشـــەو ئەو لاوەم بۆ نەهێنی، دڵم دەتۆقێ.' ئەوەی گوت و لە ئاست خۆی بە لادا هات و بێهۆش بوو. کەنیزەکان لەوێ لایـان برد و بردیـانە شـــوێنێکی دیکە. مـارییەش هەڵات بۆ لای نوعمـان و گوتی: 'گەورەم، هیند ئاشـــقی عودەی کوڕی زەید بووە و ئەوە لە تاوان کەوتووە و نەخۆشـــە. ئەگەر کارێک نەکەی ئەوانە پێک بگەن، ئەوە هیند لە دەست دەچێ و دەمرێ. ئەو دەم لەنێو عەرەباندا ئابڕووت دەچێ. بیرێکی بۆ بکەوە و لێی مارە بکە.' نوعمان ســـەری داخســـت و ماوەیەک بیری لەو کارە کردەوە. دوای ئەوە بە مارییەی گوت: 'جا بیری چی بۆ بکەمەوە؟ خۆ من قەت نـاتوانم بۆ خۆم بچم ڕوو لە عودەی کوڕی زەید بنێم و بڵێم وەرە کچەکەم ئاشـــقت بووە با لێت مارە بکەم.' مارییە گوتی: 'گەورەم، عودەیی کوڕی زەید زۆر لە هیند گیرۆدەتر و شەیداترە. من کارێک دەکەم کە ئەو نەزانێ تۆ ئاگات لەو کارە هەیە.'

"دوای ئەوە مارییە چووەوە بۆ لای عودەی کوڕی زەید و شـــتەکەی بۆ گێڕاوە و پێی گوت: 'میوانییەک ساز کە و پاشاش بانگهێشت بکە. هەر کە پاروویەکی لە خواردنەکەی تۆ خوارد، خوازبێنی لێ بکە. دڵنیام ئەو داواکەی تۆ ڕەت ناکاتەوە.' عودەی کوڕی زەید گوتی:

'دەترسم پاشا بەو قسەیەم نارەحەت بێ، ناکۆکی و ناخۆشی بکەوێتە نێوانمانەوە.' مارییە گوتی: 'من لە پێشدا ڕێی هەموو شتێکم خۆش کردووە، خەمت نەبێ.'

"دوای ئەوە مارییە گەڕاوە بۆ لای نوعمان و پێی گوت: 'بە عودەی کوڕی زەید بڵێ بانگهێشتمان بکە.' نوعمان بە عودەی کوڕی زەیدی گوت: 'کاکە بۆ بانگهێشتێکمان ناکەی؟ ئەو ماڵە بۆ کەنگێ هەڵدەگری؟' عودەی کە لە خودای دەویست، گوتی: 'گەورەییە بۆ ئێمە لە خزمەتتدا بین.' خێرا چووەوە فەرمانی دا. خواردن ئامادە کرا و نوعمان چووە ماڵی عودەی کوڕی زەید. هەر کە دەست بە خواردن کرا، پاشا تازە پارووێەکی خواردبوو کە عودەی باسەکەی هێنا گۆڕێ و خوازبێنی کچەکەی کرد. نوعمانیش قسەکەی نەشکاند و کچەکەی دایە و ناردیان قازی و شایەدیان هێنا و کچەکەی لێ مارە کرد و دوای سێ ڕۆژان کیژەکەی بۆ نارد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عودەیی کوڕی زەید سێ ساڵان لەگەڵ کچی نوعمان بە خێر و خۆشی ڕایانبوارد. دوای ئەوە نوعمان ڕقی لە عودەی هەڵگرت و کوشتی. هیند لە تاوی عودەی تووشی خەم و پەژارەیەکی زۆر بوو. سەری خۆی هەڵگرت و چوو لە دەرەوەی شار گومبەزێکی دروست کرد و بۆخۆی لەوێدا دانیشت. پیشەی بوو بە شین و گریان هەتا لە تاوان دڵی تۆقی. ئێستا ئەو گومبەزە لە دەرەوەی شاری حیرە هەر ماوە.

### چیرۆکی دیعبەلی خوزاعی

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە کە دیعبەلی خوزاعی[1] گێڕاوییەتەوە: 'من لە دەروازەی کەرخ دانیشتبووم، لەپڕدا کیژێک بەوێدا ڕابرد کە من هەتا ئێستا کەسی ئەوەندە جوانم نەدیبوو. بە جۆرێک کە هەر بە لەنجەی ڕۆینەکەی دڵی ڕێبوارانی دەخستە داوەوە. منیش هەر کە چاوم پێی کەوت، دڵم وەکوو مەل خەریک بوو لە سینگم دەرفڕێ. ئیدی ئەو بەیتە شێعرەم گوت:

دێت و دەڕوا بە هێمنی ڕادەبری
خۆ نازانی لە دڵمدا چی دەگوزەری
بە خۆم نەبوو هەرام کردێ: خانم، خانم!
خێرا بڕۆ دڵی عاشقم گڕوو دەگری

" 'کچە لەجێوە ئاوڕی لێ دامەوە و ئەو بەیتەی گوت:

گەر دەزانی ئەو دڵەت هێندە لاسارە
بەرزەفڕە بۆی درووست بکە کۆلارە

" 'من کە ئەوم ئاوا زیرەک و حازرجواب و جوان هاتە بەرچاو، لە تاوان هۆشم لای خۆم نەما و ئەو بەیتەم خوێندەوە:

---

١. شاعیرێکی عەرەبە و خەڵکی کووفەیە (١٤٨-٢٤٦ک) والی خوراسان و ئەسوانی میسر بووە. لایەنگری شیعەگەرایی و هاوڕێی ئیمام ڕەزا بووە. بە شێعر خەلیفە عەباسییەکانی داشۆریوە و هەر بە دەستی عەباسییەکان کوژرا. (و. ک)

یـانـی تـۆ ڕازی گـوڵـی بەهـارم بـێ؟
دەرمـانـی دەردی بـێـدەرمـانـم بـێ؟

" 'کچەش لە وەڵامدا ئەو نیوەبەیتەی گوت:

بەڵـێ گەر بـێـتـوو تـۆش بـارانـم بـێ

" 'قەت قسـەی ئاوا ڕێکوپێک و جوانم نەبیسـتبوو. شـتی هێندە خوێنشـیرین و دەلالم نەدیتبوو. هەر بۆیە ئەو شیعرەشم بۆ گوتەوە:

بەڵـێ تـــــۆ گـوڵ بـێ، بـارانـت دەبـم
بـێـتـوو بەفـر بـێ زسـتـانـت دەبـم
ئەگەریـش مەل بـێ، ئەمـن شـابـاڵ و
لە بـۆ فـڕیـنـیـش ئـاسـمـانـت دەبـم

" 'بزەیەکی هاتێ. ئای لەو دم و لێو و ددانەی! باوەڕکەن قەت قەتم دەم و لێو و ددانی هێندە جوان و دڵڕفێنم نەدیتبوو. ئیدی لە وەڵامی مندا ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەویـنـێـک وا بە بەژنـی تـۆ بـڕابـێ
دەبـێ ئـاخـۆ ڕەگـی چـۆن داکـوتـابـێ؟
ئەوە دڵـم و ژیـانـم خـسـتـە بەر پـێـت
سـەرم سـەرگەردی بـاڵای جوانی تۆ بێ

" 'لەڕێوە هەسـتام دەسـتم ماچ کرد و پێم گوت: 'تۆ ئەو خودایە لەگەڵم وەرە! چون کەسـێکی وەک من شـایەنی ئەوەم یەکی وەک تۆ بەسـۆز و بەزەم لەگەڵ بێ.' ئەو کچە لەگەڵم هات. ئەو دەم من ماڵێکی وام نەبوو کە شـیاوی جوانێکی ئاوا بێ. بەلام لەگەڵ موسـلیمی کوڕی وەلید برادەر بووم، بردم بۆ ماڵی ئەوان. کە لە دەرگام دا، هاتە دەرێ و سـڵاوی لێ کردم. پێم گوت: 'هاوڕێ و برادەر بۆ ڕۆژێکی ئاوا دەبێ.' گوتی: 'وەرنە ژوورەوە.' ئێمە چووینە ژوورێ. زۆر نەدارم هاتە بەر چاو. پرێسـکەیەکی دامێ و گوتی: 'ئەوە بەرە لە بازاڕ بیفرۆشە و بیدە بە خواردەمەنی و شتی پێویست.' من پرێسکەکەم لێ وەرگرت و خێرا چووم بۆ بازاڕ و فرۆشـتم. شـتەکانم کڕی و خێرا گەڕامەوە. کە گەیشتمەوە، سەیرم کرد ئەوە موسیلم کوڕی وەلید لە سارداوەکەدا نیشتووەتە بەر کچە.

که هەســـتی کرد من هاتوومەوە هەســـتا و هات بۆ لام. گوتی: 'ئەبووعەلی وەک تۆ ئەو چاکەیەت لەگەڵ من کرد، خودا چاکەت بۆ بکا و لە ڕۆژی پەسڵاندا پاداشی خێرت بداتەوە.' ئیدی خواردەمەنی و شتەکەی لێ وەرگرتم و دەرگاکەی لەسەر من داخست. بەو قسەیەی ئەو زۆر ناڕەحەت بووم. نەمدەزانی چی بکەم. ئەویش لەوبەری دەرگاکەوە لە خۆشـــیان قاقای دەکێشـــا. کە زانی من ئەوەندە ناڕەحەتم، گوتی: 'ئەبووعەلی، گیانی من پێم بڵێ ئەو شێعرە هی کێیە؟

ڕێـــــــــــبواری تینوو کە دەگاتە بەرداو
قەت ناپـــــــــــرسێ لە پاکی و خاوێنی ئاو
دڕندەی برســـی گەر گۆشـــتی دەســـت کەوێ
ناڵێ گـــــــــــۆشتی مەڕ نەبێ من نامەوێ

" 'من ئەوەندەی دی ڕقم هەســـتا و جنێوم پێ دا. قاقایەکی دیکەی کێشـــا و گوتی: 'گەووادی نەفام، بۆ خۆت هاتوویتە ماڵەکەی من و پڕیسکەیەک شتت بردووە فرۆشتووتە و خواردمەنی و شتت پێ کڕیوە، ئێستا تۆ خۆت توورە دەکەی؟' گوتم: 'بە خودا تۆ ڕاست دەکەی، حەق بە تۆیە. بە دەستی خۆم وام لە خۆم کرد.' دوای ئەوە هاتمە دەرێ و بە خەم و کەسەرێکی زۆرەوە سەری خۆم هەڵگرت و ڕۆیشتم. ئێستاش کە ئێستایە، داخێکی گرانە لەسەر دڵم و ئەو کیژەم هەر نەدیتەوە.'

### چیرۆکی ئیسحاقی مووسڵی و مەغنییە

"یەکێکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی مووسڵی گێڕاویەتەوە: 'بە هەڵکەوت لە خزمەتکردنی ماڵی خەلیفە وەڕەز بووم. شەوەکی زوو سوار بووم و ڕووم کردە دەشـــت و بێروون. بە خزمەتکارەکانی خۆم گوت: 'ئەگەر خەلیفە یان کەسـێکی دیکە هات و پرسـیاری منی کرد، بڵێن ئیسحاق کازیوەی بەیانی چووەتە دەرێ و نازانین بۆ کام لا ڕۆیشـتووە.' ئەوەم پێ گوتن و بە تاقی تەنێ هاتمە دەرێ. لە ناوشـاردا گەڕام هەتا دنیا گەرم داهات. ئینجا لە شەقامێکدا کە شەقامی حەرەمیان پێ دەگوت، ڕاوەستام.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، ئیســـحەقی کوڕی ئیبراهیمی مووســـڵی گێڕاوییەتەوە: 'من لە شـەقامێکدا کە شـەقامی حەرەمیان پێ دەگوت، لە گەرمان ڕاوەسـتام و چووم کەمێک خۆم وە بەر سێبەر بدەم. هێشتا تەواو نەهاتبوومەوە سەر خۆم، غوڵامێکی ڕەش هات. کەرێکی وە پێش خۆی دابوو. کچێکی جوانی ڕێـکوپێـک لەســــەر گوێـدرێژەکە بوو. جلوبەرگی ئاوریشـــمی و شـــکۆداری لە بەردا بوو. یەکێک بەوێدا هات، لێم پرســـی: 'ئەو کچە کێیە؟' گوتیان: 'ئەوە مەغنییەیە.' وام وە بەر دڵ کەوت لەسەر ئەسپەکە خۆم پێ نەدەگیرا.

" 'ئەو کیژە جوانە هات و چووە ئەو ماڵەوە کە من لەبن دیوارەکەیان ڕاوەسـتابووم. لە بیری ئەوەدا بووم کە چۆن خۆم بگەیەنمە ئەو کیژە خـانومـانە کە دوو کوڕی قۆز و جوانچـاک مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان وەرگرت. کە زانیم دەچنە ژوورەوە، منیش لەگەڵ ئەوان خۆم تێ ڕاکرد. لە کوڕەکـان وایە من لە لایەن خـاوەنمـاڵەوە بـانـگ کراوم. لە خاوەنماڵیش وا بوو منیش هەر لەگەڵ ئەوانم.

" 'دوای ئەوەی ماوەیەک دانیشـــتین، خواردنیان هێنا. خواردن خورا و بادەیان هێنا دایاننا. دوایە کچە عوودی هێنا و دەســـتی کرد بە چڕین. ئێمەش دەســـتمان کرد بە خواردنەوە. تا وا بوو من کاری ئاودەستم هەبوو. هەستام چووم بۆ ئاودەست. خاوەنماڵ لەبارەی منەوە پرســـیاری لەو دوو لاوە کردبوو: 'ئەو پیاوە کێیە؟' ئەوانیش گوتبوویان: 'نایناســین.' خاوەنماڵ گوتبووی: 'کە وایە مشـــە خۆرە. قەیناکا گوناحە لێی گەڕێن پیاوێکی خوێنشیرینە.' ئیدی کاتێک هاتمەوە، کەنیزەکە بە دەنگێکی بەرز ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

بەهار و سەوزە و سرووشتی ڕەنـــــــــگین
خــــــــــۆشە بۆ گەنجان دەم بە پێکەنین
دەســـــت لەنـاو دەســــــتی یـاری ژیـکەڵە
تێر تێر هەڵپــەڕن لەناو ســـەوزەی شــــــین

" 'ئینجا بادە خوراوە و کچە عوودی لێدا. تەواو ئەو ئاوازانەی لێدەدا کە من دەمزانین و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

لاوان، ڕۆژتــــــــانە فەرشی زەرد و سوور
وا ڕاخراوە لە نـــــــــــــــیزیک و دوور
هەستن دەرفەتە ڕۆژی خــــــــــــــۆشییە

" 'ئینجا ئاوازی وای لێدا کە من نەمبیستبوون. لە کاتی گۆرانییەکەیدا ئاوازێکی دیکەی لێداوە کە تایبەتی من بوو. ئەو دوو بەیتەشی خوێندەوە:

کراسی سووری گوڵگوڵە
هەر دەڵێی ئاسکی سڵە
ڕەوت و ڕۆینەکەی ببینی
دەڵێی ئەوەم پڕ بە دڵە

" 'من گوتم: 'ئا ئەو ئاوازەی دوایی دیسان لێدەوە.' مەبەستی من ئەوە بوو کە درووستەکەی پێ بڵێم. ئەوجار یەکێک لەو دوو لاوە گوتی: 'مشەخۆری وەک تۆ بێچاوورووم نەدیوە.' من ئەوەندە تریق بوومەوە خەریک بوو دڵم بتۆقێ. سەرم داخست و هیچم نەگوت. هاوڕێکەی ئەو کوڕە دەنگی دا و لە منی کردەوە. دوای ئەوە هەستان بۆ نوێژ. من کەمێک ڕاوەستام و دوای ئەوان دەستم دا عوودەکە و تارەکانیم توونە کردنەوە و هەردووک سەریم چاک کرد. ئینجا هەستام نوێژم کرد. کە نوێژەکمان کرد، ئەو گەنجە دەستی کردەوە بە سەرکۆنەم و بە گژمدا هات. گوڕەگوڕی ساز کرد. منیش دەنگم لێ دەرنەدەهات. ئینجا کچە دەستی دا عوودەکە و چاوێکی لێ کرد. سەیری کرد تەواوی تاڵەکانی قورمیش کراوەتەوە. گوتی: 'ئەوە کێ ئەو عوودەی چاک کردووە؟' کەس متەقی لێ نەهات. ڕووی لە هەرکەس دەکرد، دەیگوت: 'دەستم لێ نەداوە.' کچە گوتی: 'هەرکەس ئەو عوودەی چاک کردووە، مامۆستای ئەو کارەیە.' ئیدی من گوتی: 'خانم، من چاکم کردووە.' گوتی: 'دا تۆخودا هانێ کەمێکمان بۆ بژەنە.' عوودەکەم لێ وەرگرت و ئاوازێکم بۆ ژەنین کە خەریک بوو گیانی زیندووەکان دەرچێ و مردووی قەبران زیندوو کاتەوە. ئەو دوو بەیتەشم گوت:

ئەویندار و بریندارم هەر بینا لە سوێی تۆ مردم
خۆشەویستیت دەرد و ژانە، دەرمانێکیشە بۆ دەردم
مەلێکی سەرلێشێواو و غەوارەم ڕووم لێرە کردووە
گەر بێتوو تۆ کەرەمت بێ، گەرم دادێ ژینی سەردم

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی مووسڵی گێڕاوییەتەوە: 'کە شیعرەکەم تەواو کرد، هەموویان هاتنە پێش و گوتیان: 'ئەی گەورەمان، تۆخودا ئاوازێکی دیکەشمان بۆ لێدە.' منیش لەسەر ئاوازێکی خۆشتر بۆم لێدان و ئەو شیعرەشم بۆ خوێندنەوە:

دڵم سەوداسەری شۆخێـــــــــــکە ئەستێرەی بەیانە
ئێوە بڵێن چۆنی بڵــــــــــــێم من بەو گفت و بەیانە؟!
نییە هاوتای و نەمدیـــــــــــوە ئەمن لە ڕووی جیهانا
بەژن و باڵا و شــــوخ و شـــەنگی ئەو کەنیشـــکە نەبانە

" 'کە شـیعرەکەم تەواو کرد، سـەیرم کرد لە خۆشـییان زاری تەواویان یەکی بسـتێک کرابووەوە و واقیان وڕ مابوو. عوودەکەم دانا. دەستیان کرد بە پاڕانەوە، گوتیان: 'تۆخودا دایمەنێ و جارێ چەند ئاوازی دیکەشـــمان بۆ لێدە.' گوتم: 'من دەتوانم دەیان ئاوازی دیکەتان بۆ لێدەم.' ئیدی خۆم پێ ناســـاندن و گوتم: 'من ئیســـحاقی کوڕی ئیبراهیمی مووســـڵیم. بە خودا کە خەلیفە داوا دەکا ئاوازێکی بۆ لێدەم، بە فیزەوە وەڵامی دەدەمەوە، کەچی ئەمڕۆ ئەو هەموو بێڕێزییە بە من کرا و قسەی ناخۆشم پێ گوترا. من هەر قسەش ناکەم هەتا ئەو کوڕە وەدەر نەنێن کە ئەو گوڕەگوڕەی بەســـەر مندا دەکرد.' ئیدی پیلی کوڕەیان گرت و لەو ماڵە وەدەریان نا. ئەوجار منیش دەستم دا عوودەکە و ئەو ئاوازانەی من، کە ئەو کچە لێیدەدان، هەموویانم بۆ لێدانەوە. دوای ئەوە بە ســـرتە بە خاوەنماڵەکەم گوت: 'من ئاشقی ئەو کچە بووم و لە تاوانی حەجمینم نییە. ئەو کابرایە گوتی: 'ئەوە دام بە تۆ، بەو مەرجەی مانگێک لە لای من بمێنیتەوە. ئەودەم بە زێڕ و زیوەوە دەیدەم بە تۆ.' گوتم: 'زۆر باشە. ئەوە قەبووڵم کرد.'

" 'ئیدی هەتا مانگێک لەو ماڵە مامەوە. کەس بە شـــوێن و جێگەی نەدەزانیم. پیاوەکانی خەلیفە هەموو جێیەک لێم گەڕابوون و هیچ هەواڵێکی منیان وەگیر نەکەوتبوو. کە مانگەکە تەواو بوو، خاوەنماڵەکە ئەو کچەی بە جلوبەرگی بەریەوە و بە زێڕ و زیوەوە دامێ و خزمەتکارێکیشـــی لەگەڵ داینێ. هێنامەوە ماڵی خۆم. هێندە دڵخۆش بووم دەتگوت تەواوی دنیایان داومێ. دوای ئەوە ســـوار بووم و چووم بۆ لای خەلیفە مەئموون. کە چوومە لای، گوتی: 'ئیســـحاق، لە کوێ بووی؟' چیرۆکەکەم بۆ گێڕاوە. پیاوەکانی خەلیفە چوون ئەو پیاوەیان هێنا. خەلیفە شـــتەکەی بەویش گێڕاوە. ئەویش ئەوەی من گوتبووم، گوتییەوە. خەلیفە گوتی: 'تۆ زۆر جوامێری. ئەو چـاکەی تۆ هی جوامێریتە.' ئیـدی فەرمـانی دا

ســـــەدهەزار درەمیان داین. بە منیشـــــی گوت: 'دا بچووە ئەو کەنیزە بێنە.' منیش چووم کەنیزەکەم هێنـا. کەنیزەکە گۆرانییەکی بۆ چڕی. کەیفی پێی ســـــاز بوو. دوای ئەوە بە کەنیزەکەی گوت: 'هەموو پێنجشەممەیەک وەرە لای من.' ئینجا پەنجاهەزار درەمیشی دا بە کەنیزەکە.'

### چیرۆکی یەکەمی ئەوینداران

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە عووتبا[1] گێڕاویەتەوە: 'ڕۆژێک لەگەڵ تاقمێک لە ئەدیبان دانیشـــتبووم، باســـی خەڵکی جۆراوجۆرمان دەکرد. وا بوو باس گەیشـــتە باســـی ئەوینداران. هەر کام لە ئێمە شـــتێکمان دەگێڕاوە و قســـەیەکمان دەکرد. لەنێو ئەو خەڵکەدا کابرایەک دانیشـــتبوو متەقی لێ نەدەهات. هەتا لە کۆتاییدا گوتی: 'ڕاوەســـتن، شـــتێکتان بۆ بگێڕمەوە کە قەت شـــتی وا خۆشـــتان نەبیســـتبێ.' گوتم: 'دەی بۆمان بگێڕەوە.' کابرا گوتی: 'کچێکم بوو، کوڕێکی خۆش دەویســـت و ئێمە نەمـاندەزانی. ئەو کوڕەش قونیەی کچی ئەبووعوبەیدەی خوزاعیی خۆش دەویست. قونیەش کچەکەی منی خۆش دەویست. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کۆڕێکدا بووم ئەو کوڕەش لەوێ بوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ڕەنگە ئەبوونەسر موحەممەد عوتبا (٤٢٧یا ٤٣١-٣٥٠ ک.) بێت کە مێژوونووسێکی سەردەمی سەلجووقی و غەزنەوییەکانە و نووسەری کتێبی "تاأريخ اليميني"یە. (و. ف)

## کە شەوی چوارسەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، ئەو پیاوە گێڕاویەتەوە: 'ئەو لاوەش لەو کۆڕەدا بوو. قونیە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

گەر ئەویـــنـــداری، بـــزانە یەکەم مەرجـــی ئەویـــن
دەســــــتهەڵگرتنە لە مـــاڵ و گیـــان و لە خۆشـــی ژین

"ئەو لاوە بە کیژەی گوت: 'خاتوون، ڕێم دەدەی بمرم؟' قونیە لەپشــت پەردەوە وەڵامی داوە، گەر ئەوینداری بمرە. ئەو گەنجە ســــەری وە باڵنجێک کرد و چاوی لێک نا. کاتێک سەرەی بادە گەیشتەوە، بزاوتیان هەستێ بادەکەی وەرگرێ، کەچی سەیریان کرد مردووە.

"ئیدی کۆڕی شـــادیمان شـێوا و بوو بە شـین و شـــەپۆڕ و لێمان تێک چوو. کاتێک بڵاوەمـان کرد و من چوومەوە مـاڵێ، لێیـان پرســـیم بۆ درەنگ چوومەوە. منیش ئەو ڕووداوەم بۆ گێڕانەوە. ئاگام لێ بوو کچەکەم هەستا چووە دەرێ، دوای ئیستێک بەدوایدا چووین سـەیرمان کرد، ڕێک وەک کوڕە سـەری وە باڵنجێک کردووە. کە شـانیمان بزاوت ویســـتمان بزانین بۆ وای کردووە، تەماشـــامان کرد کچەکەم گیانی دەرچووە. بەیانی تەرمەکەیمان برد و ناشـتمان. لە ڕێگە کە دەگەڕاینەوە، تووشـی تەرمێکی دیکە بووین. کە پرســـیارمان کرد، گوتیان: 'ئەوە تەرمی قونیەیە. کاتێک هەواڵی مەرگی ئەو کچەی تۆی بیســتووە، ئەویش لەوێ ســـەری وە باڵنجێک کردووە و گیانی دەرچووە. ئیدی ئەو ســێ تەرمەمان لە ڕۆژێکدا ناشت. ئەوە یەکێک لە سەیروسەمەرەترین چیرۆکە ئەوینداریەکانە.'

### چیرۆکی دووەمی ئەویندارن

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە ئەویش ئەوەیە، قاســـمی کوڕی عودەی لە زمان پیاوێکی تۆرەمەی تەمیمەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: 'ڕۆژێک هەســتام چوومە دەرێ لە شــتێک دەگەڕام، ڕۆیشــتم هەتا گەیشــتمە ئاوەکانی هۆزی تۆرەمەی تەی. لەوێ دوو بنەماڵەی لێ بوو لە یەک نیزیک بوون. ســـەرنجم دانێ، یەکێک لە بنەماڵەکان کوڕێکیان پێ بوو کز و لاواز و وشک هەڵگەابوو، خەریک بوو ئەوە شێعرەی دەگوتەوە:

ئازیزم دنیا ڕۆژێـــــــــــک و دووان بێ،
دەبێ تـا کەنـــــــگێ دڵ چـاوەڕوان بێ؟
ئـێســـــتـا هـیـلاکـم، گەر زوو نەگەیەی

" 'ئەو بنەماڵەیەی دیکەش کچێکیان لەگەڵ بوو. کچە کە گوێی لە دەنگی ئەو لاوە بوو، ئاوڕی لێ داوە و هەستا بچێ بۆ لای. کەچی خزم و کەسی پێشیان گرت و نەیانهێشت. کوڕە زانی کچە بە زۆر دەیهەوێ بێ بۆ لای، ئەمیش هەستا بچێ بۆ لای کچە. کەس‌وکارەکەی ئەمیش پێشیان گرت و نەیانهێشت بچێ. وا بوو لە هەردوو لا بوو بە بگرە و بەردە و خۆ ڕاپسکان. هەتا وا بوو بە هەر جۆرێک بوو توانییان خۆیان بەگەیەننە یەک. هەر کە گەیشتنە یەک، لە بەرچاوی بنەماڵەکانیان باوەشیان پێکدا گرت و هەر لەوێ بە لادا هاتن و گیانیان دەرچوو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو کچ و کورە لەجێوە مردن. ئینجا ڕیشسپییەک لەنێو خێوەتەکان هاتە دەرێ و چوو لە سەریان ڕاوەستا و دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'خودا لێتان خۆش بێ! هەرچەند لەم دنیایە پێک نەگەیشتن، بەڵام لە مردندا یەکتان گرتەوە.' ئیدی ئەو کابرایە فەرمانی دا شۆردیانن و کفنیان تێوە پێچان و هەردووکیانی لە گۆڕێکدا ناشت. تەواوی ژن و پیاوی ئەو دوو بنەماڵەیە لە خۆیان دەدا و شین و ڕۆیان بۆ دەکردن. لەو ڕیشسپییەم پرسی: 'ئەوانە کێن.' گوتی: 'ئەوەیان کچی منە و ئەوەش کوڕی برامە. نەمانزنی خۆشەویستییەکەیان گەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە تۆ دیتت.' گوتم: 'باشە ماڵ ئاوەدان، بۆ لێکت مارە نەدەکردن؟' کابرا گوتی: 'لەبەر ئابڕووچوون و قسەی خەڵک. ئەوە تووشی ئابڕووچوونێکی دیکە بووم.' '

## چیرۆکی سێیەمی ئەوینداران

"چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە، ئەبوولعەباس مووبەڕڕەد[1] گوتوویەتی: 'من لەگەڵ تاقمێک هەڵوێستمان گرت و بە 'دێری هەرقەل'دا ڕۆیشتین. لەوێ لامان دا و چووینە بن سێبەرەکەی. پیاوێک هاتە لامان و گوتی: 'ئەو دێرە شێتی تێدایە، لەنێو ئەو شێتانەدا پیاوێکی تێدایە زۆر ماقووڵانە قسە دەکا. ئەگەر تۆ ببینی، پێت سەیر دەبێ.' ئیدی ئێمە هەموومان هەستاین چووینە دێرەکەوە. پیاوەکەمان دیت دانیشتبوو سەری کردبووەوە. ئێمە سڵاومان لێ کرد و ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی داینەوە، بەڵام چاوی لێ نەکردین. ئەو کابرایە گوتی: 'شێعری بۆ بڵێن، چون بە بیستنی شێعر وە قسە دێ.' خێرا من ئەو بەیتەم خوێندەوە:

کەس نییە لە دنیادا لە دڵەی کڵۆڵم بگا
هەر دەڵێن حاڵی نابێ، شێتە جا کوا تێدەگا
شێتی فامینم ئەمن، هەڵڕێژە دەردی دڵت
دەبا هاواری خەمت بە گوێچکەی دڵم ڕاگا

"کە گوێی لەو شێعرەی من بوو، ئاوڕی لێ دامەوە و ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

---

١. شاعیر و نووسەری عەرەب (٢١٠-٢٨٥ ک.) و خەڵکی بەسرەیە. بە هۆی کتێبی "الكامل في اللغة"وە ناوبانگی پەیدا کردووە.

تۆش وەکوو من سەرگەردانی و دەراوێکی ڕوون شک نابەیت
نییە گوێیەک تێتبگات و سیلەی چاوێک بەدی ناکەیت
هەناوم پڕ لە زووخاوە و چی خۆشییە بەدی ناکەم
خۆری بەختم ئاوا بووە، بەو نووتەکە ڕوو لە کوێ کەم

" 'دوای ئەوە گوتی: 'ئەرێ پێتان چۆن بوو؟' ئێمە گوتمان: 'هەر بژییت. زۆر جوان بوو.' بەردێک لەوێ بوو، دەستی برد و هەڵیگرت. ئێمە پێمان وا بوو، لە ئێمەی هەڵدەکا. خێرا هەڵاتین. سەیرمان کرد بە بەردەکە لە سینگی خۆی دەدا و دەڵێ: 'لێم مەترسن و هەڵمەیەن. لێم وەرنە پێشێ و کەمێک گوێ لە شێعرەکانم بگرن.' ئێمە چووینەوە پێشێ. ئەو شێعرەی بۆ گوتین:

دڵم کەیلی جەفای قین و ڕق و قارە
بە دەست بەدکار و شۆفاران ژیان تارە
لە تاوی خۆشەویستانم نەماوم من
بە دەست ئەم ژینە تاڵ و پڕ لە ئازارە

"دوای ئەوە ڕووی لە من کرد و گوتی: 'ئەرێ تۆ دەزانی خۆشەویستان چییان لێ هات؟' گوتم: 'بەڵێ، ئەوان مردن و ڕەزگاریان بوو، حەسانەوە.' لە ڕێوە ڕەنگی گۆڕا و هەستایەوە و گوتی: 'ئەوە تۆ چۆنت زانی مردوون؟!' گوتم: 'ئەگەر ئەوان مابان، ئاوا پشتیان لە تۆ نەدەکرد و دەهاتن بە لاتەوە.' ئیدی ئەو شێتە گوتی: 'بە خودا تۆ ڕاست دەکەی. کە وایە منیش لەدوای ئەوان ناتوانم بژیم.' لەڕێوە سەرتاپا لەشی دەستی کرد بە لەرزین و کەوتە سەر زەوی. ئێمە خێرا گەیشتینە سەری و سەیرمان کرد مردووە. هەموو واقمان وڕ ما. زۆرمان خەم بوو. هیچ نەدەکرا، شۆردمان و کفنمان کرد و ناشتمان.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی چوارسەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مووبەرپەد گێڕاویەتەوە: 'دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ بەغدا و چوومە لای خەلیفە موتەوەککیل. بە چاومدا زانی گریاوم. گوتی: 'ئەوە بۆ ئاوای؟' منیش شتەکەم بۆ گێڕاوە. خەلیفە گوتی: 'تۆ بۆ ئەو کارەت کرد؟ بە خودا ئەگەر نەمدیتبایە ئاوا بۆی ناڕەحەتی، هەر ئێستا بە تۆڵەی ئەو دەمکوشتی.' "

### بەسەرهاتی ئەوینداری پاک

"بەسەرهاتێکی دیکە هەیە، ئەویش ئاوایە، دەگێڕنەوە ئەبووبەکری کوڕی محەممەدی ئەنباری گێڕاوییەتەوە: 'لە یەکێک لە گەشتەکانمدا لە ئەنبار چوومە دەرێ و بەرەو عەمووریە ڕۆیشتم. پێش ئەوەی بگەمە عەمووریە، لامان دا گوندێک و لە پەنا دێری ئەنوار خستمان. سەرقەشەی دێرەکە هات بۆ لام. ناوی عەبدولمەسیح بوو. منی بردە ژوورێ. تەماشام کرد چل دانە تەرکەدنیای لێ بوو. ئەو شەوە میوانداریەکی باشیان کردم. کە ڕۆژ بووەوە، هەستام بەجێم هێشتن.

" 'ئەو تەرکەدنیایانە ئەوەندە بە دڵەوە خودایان دەپەرست تا ئێستا شتی ئاوام نەدیتبوو. دوای ئەوە چووینە عەمووریە و کارەکەمان جێبەجێ کرد و گەڕاینەوە. بۆ ساڵی دوایی چووم بۆ سەردانی مەککە. لەو کاتەدا کە بە دەوری کەعبەدا دەسووڕاینەوە، عەبدولمەسیحم دیت لەگەڵ پێنج دانە هاوڕێی بوو. کاتێک تەواو ناسیمەوە کە ئەوە، چووم بۆ لای و لێم پرسی: 'ئەرێ تۆ عەبدولمەسیحی قەشە نیت؟' گوتی: 'ئێستا من عەبدوڵڵا ڕاغیبم.' ئیدی ڕیشیم ماچ کرد و دەستم کرد بە گریان. پاشان دەستیم گرت و هاتم بۆ لای حەرەم و پێم گوت: 'پێم بڵێ ئەوە چۆناوچۆن بوو، موسوڵمان بووی؟' گوتی: 'وەڵا هۆکاری موسوڵمانبوونم یەکێک لە شتە سەیروسەمەرەکانی ڕۆژگارە. ئەویش ئاوا بوو: 'تاقمێک پیاوچاک و موسوڵمان هاتنە ئەو دێیەی ئێمە کە دێرەکەی لێیە. کوڕێکیان ناردبوو هەندێک خواردەمەنی و شت بکڕێ. کوڕە لە بازاڕ کچێکی مەسیحی دەبینێ، نان دەفرۆشێ. ئەو کچە یەکێک لە باشترین ئافرەتەکانی ڕۆژگار بوو. کوڕە بە بینینی، دڵی لای خۆی نامێنێ و ئاشقی دەبێ. هەر لەوێ لە تاوانی دەکەوێ و بێهۆش دەبێ. پاش ئێستێک دێتەوە سەر خۆی، دەچێتەوە لای هاوڕێکانی و بۆیان دەگێڕێتەوە. پێشیان دەڵێ: 'ئێوە بڕۆن دوای کاری خۆتان کەون. من لێرە دەمێنمەوە و نایەمەوە.' هاوڕێکانی زۆریان سەرکۆنە کرد و مۆچیارییان کرد. بە گوێی نەکردن و هەستا ئەوانی لەوێ بەجێ هێشت و چوو بۆ نێو گوند و لە بەردەرگای ماڵی ئەو کچە دانیشت. کچە هات و لێی پرسی: 'پێویستیت بە چییە

و چیت دەوێ؟' لاوەکە گوتی: 'ئاشـــقی تۆم و تۆم دەوێ.' کچە ڕووی لێ وەرگێڕا و ڕۆیشـــت. ئەو گەنجە ســـێ ڕۆژان لەو بەردەرگایە دانیشـــت. نە هیچی خوارد و نە هیچی خواردەوە. هەر جارجارێک چاوێکی بەو کیژە دەکەوت. کچەی مەســـیحییەکە زانی لە کۆڵی نابێتەوە و هەڵناســـتێ بڕوا، خزم و کەســـی لێ ئاگادار کردەوە. ئەوانیش منداڵانیان لێ هان دا بەردبارانی بکەن. ئەوەندەیان لێ دا تەواوی گیانیان شـــکاندبوو. کوڕە هەر لە جێی خۆی نەبزووت. خەڵکی گوند بە تەما بوون بیکوژن. پیاوێکی ئەو گوندە هاتە لای من و لەو بابەتەی ئاگادار کردمەوە. من هاتمە دەرێ و چووم بۆ لای، ســـەیرم کرد لەســـەر زەوی کەوتووە و تەواوی لەشی خوێناوییە. خوێن و شتەکەیم سڕی و خاوێنم کردەوە. هەڵمگرت و بردمە دێر و برینەکانیم تیمار کرد. هەتا چواردە ڕۆژان لە لای من بوو. کاتێک کەمێک خۆی گرتەوە و برینەکانی ســـاڕێژ بوونەوە، هەســـتا لە دێرەکە چووە دەرێ و چووەوە لە بەردەرگای ماڵی کچە دانیشتەوە.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ' 'دوای ئەوەی کەمێک خۆی گرتەوە و برینەکانی ساڕێژ بوونەوە، هەستا لە دێرەکە چووە دەرێ و چووەوە لە بەردەرگای ماڵی کچە دانیشتەوە. کچە چاوی پێی کەوت، هەستا هات بۆ لای و پێی گوت: 'بە خودا بەزەیم پێتدا دێ. ئێستا ئەگەر بێتوو بێیتە سەر دینی ئێمە، ئەوە مێردت پێ دەکەم.' کوڕە گوتی: 'مەعازەڵلا، من لەسەر دینی خۆم لاچم و بێمە سەر دینی کافران!' کچەش گوتی: 'جا ئەگەر وایە هەستە دەستم لە کۆڵ کەوە و لێرە بڕۆ.' کوڕە گوتی: 'خۆ دڵم بە گوێی من ناکا.' ئیدی کچە پشتی تێ کرد و ڕۆیشت. منداڵان تێی ئاڵان و دیسان بەردبارانیان کرد. هەتا لەوێ کەوت. هەواڵیان بۆ هێنام. هەر کە بیستم، خۆم گەیاندێ و منداڵم هەڵبڕین و کوڕەم هەستاندەوە. سەیرم کرد ئەوە لە بەر خۆیەوە هەر دەڵێ: 'خودایە گیان! لە بەهەشت پێکمان بگەیەنە.' ئیدی هەڵمگرتەوە و بردمەوە بۆ دێر. پێش ئەوەی بگاتەوە دێر، گیانی دا. ئیدی بردم لە دەرەوەی گوند ناشتم. نیوەشەو کچە لە جێگاکەیدا دەست دەکا بە هاوار هاوار، بە جۆرێک تەواوی ئاوایی لێ کۆ دەبێتەوە و دەپرسن: 'چی بووە؟' کیژۆڵەکە دەڵێ: 'ئێستا خەوتبووم، ئەو کوڕە موسوڵمانە هات دەستی گرتم و بردمی بۆ بەهەشت. دەرکەوانی بەهەشت پێشی پێ گرتم و گوتی: 'بەهەشت بۆ کافران حەرامە.' ئیدی من لەسەر دەستی ئەو کوڕە موسوڵمان بووم و چوومە بەهەشتەوە. ئەوێ پڕپڕ بوو لە کۆشک و دارستانی وا کە نازانم چۆنتان بۆ بگێڕمەوە. دوای ئەوە کۆشکێکی نیشان دام لە زێڕ و یاقووت چێ کرابوو. گوتی: 'ئەو کۆشکە بۆ من و تۆ ساز کراوە. منیش بەبێ تۆ ناچمە ناویەوە. پێنج شەوی دیکە تۆ دێیە لای من.' ئینجا ئەو کوڕە دەستی کێشا و دوو سێوی لە دارێک کردنەوە و دای بە من و گوتی: 'یەکیان بخۆ و ئەوی دیکە ڕاگرە هەتا سەرقەشە دەیبینێ.' من یەکیانم خوارد. تا ئێستا شتی ئەوەندە خۆشم نەخواردبوو.' ' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ' 'ئەو کچە گوتی: 'من سێوێکیانم خوارد. تا ئێستا شتی ئەوەندە خۆشم نەخواردبوو. ئینجا ئەو کوڕە منی لە بەهەشت هێنا دەرێ و هێنامییەوە ماڵێ. سەیر لەوەدا بوو کە لە خەو ڕابووم، زارم بۆنی سێوی لێ دەهات و سێوەکەی دیکەشم بە دەستەوە بوو. ئەو سێوە لە تاریکیدا وەک ئەستێرە دەتروسکاوە.' دوای ئەوە خێرا کچەیان هێنا بۆ دێر بۆ لای من. کیژەکە خەونەکەی بۆ گێڕامەوە و سێوەکەی پیشان دام. سێوێک کە لە تەواوی دنیادا نموونەیم نەدیبوو. ئیدی دەستم دا چەقۆیەک و سێوەکەم بە ئەژماری هاوڕێکانم قاش کرد و یەکی قاشێکم دانێ. قەت سێوی ئەوەندە بە تام و بۆم لە تەمەنمدا نەخواردبوو. بە دڵمدا هات ڕەنگە شەیتان هاتبێتە خەونی ئەو کچەوە بۆ ئەوەی لە خشتەی بەرێ و لە دینی دەرکا. ئیدی کچەم لەوێ ڕاگرت. ئەو کچە هیچی نەدەخوارد و هیچیشی نەدەخواردەوە. هەتا شەوی پێنجەم داهات. شەوی پێنجەم هەستابوو چووبووە دەرێ بۆ سەر گڵکۆی کوڕەکە و خۆی بە سەر گڵکۆکەیدا دابوو و لەوێ مردبوو.

" ' 'هیچ کەس بەو کارەی نەزانیبوو، تەنانەت کەس و کارەکەشی. کە ڕۆژ بووەوە، دوو پیاوی سۆفیی موسوڵمان هاتنە گوند و دوو سۆفیی ژنیشیان لەگەڵ بوو. بە خەڵکی ئاواییەکەیان گوت: 'یەکێک لە خۆشەویستانی خودای مەزن کە موسوڵمانە و لە لای ئێوەیە، کۆچی دوایی کردووە. هاتووین بۆ ئەسپاردەکردنی.' خەڵک کەوتنە پێوشوێنی کچە. کەچی سەیریان کرد ئەوە خۆی بەسەر گۆڕێکدا کێشاوە و مردووە. گوتیان: 'ئەوە کچی خۆمانە و لەسەر دینی ئێمەیە. ئێمە بۆ خۆشمان بەپێی باوەڕ و داب و نەریتی خۆمان دەینێژین.'

" ' 'دوو سۆفییەکە گوتیان: 'نەوەڵا، ئەو بە موسوڵمانی مردووە و دەبێ ئێمە بەپێی داب و نەریتی شەرعی موسوڵمانەتی کفن و دفنی بکەین.' لێیان بووە کێشە و شەڕوهەڵا. ئینجا یەکێک لە سۆفییەکان گوتی: 'ئێمە لە خۆڕا وا ناڵێین. نیشانەکەی ئەوەیە کە ئێوە چل تەرکەدنیای خۆتان لە دێر هەیە و بچن بیانهێنن. ئەگەر توانییان ئەو کچە لەسەر ئەو کێلە هەڵپچڕن، ئەوە لە دینی خۆتانە. ئەگەر نەیانتوانن و ئێمە یەکمان هەڵمانگرتەوە، ئەوە لە ئێمەیە و موسوڵمانە.' خەڵکی ئاوایی بەوە ڕازی بوون. چوون چل تەرکەدنیاکانیان هێنا. زۆریان هەوڵ دا، بۆیان نەبزووت. ئینجا چوون گوریسیان هێنا و لەنێو قەدیان کرد و بە هەموویان کێشایان، دیسان بۆیان نەبزووت. خەڵکی ئاواییش هاتن بۆ یارمەتییان، دیسانیش بێئاکام بوو و لە جێی خۆی نەبزووت. هەموویان ماندوو و شەکت بوون و هیچیان پێ نەکرا.

" ' 'ئیدی بە دوو سۆفییە موسوڵمانەکەمان گوت: 'ئەگەر ڕاست دەکەن، ئێوە یەکتان

بچن هەڵیگرنەوە.' سـوفییەکیان چووە پێشـی و عەباکەی خۆی تێوە پێچا و هەڵیگرت. ئەشکەوتێک لەوێ بوو، بردییە ئەشکەوتەکەوە. دوو ژنە سۆفییەکەش چوون شۆردیان و کفنیان کرد. پاشـان دوو سـۆفییە پیاوەکەش هاتن، نوێژیان لەسـەر کرد و لە پەنا قەبری کوڕەکەوە ناشـتیان و گەڕانەوە. ئێمە هەمووماں بە چاوی خۆمان ئەو شـتەمان دی. دوای ئەوە بۆخۆمان دانیشتین و بیرمان لێ کردەوە و گوتمان: 'خۆ بەڵگە لەوە ڕوون و ئاشکراتر نابێ و دین لەوە پاکتر و ڕاسـتتر نابێ.' ئیدی من موسـوڵمـان بووم. دوای منیش تەرکەدنیاکانی دێر و پاشان تەواوی خەڵکی گوندەکە موسوڵمان بوون. ئەوجار کەسێکمان نارد بۆ لای خەڵکی دوورگە و داوامان کرد کەسێکی شـارەزای دینی ئیسـلاممان بۆ بنێرن هەتا ڕێوشـوێنی ئیسـلامەتیمان فێر بکا. پیاوێک هات و داب و نەریت و ڕێوشـوێنی ئیسلامییانەی فێر کردین و ئێستا سپاس بۆ خودا ئێمە لە چاکەکارانین.' ' "

### چیرۆکی ئەبووعیسا و قورڕەتولعەین

"یەکی دیکە لەو چیرۆکانە لە عەمری کوڕی مەسـعەدەوە دەگێڕنەوە: ئەبووعیسـا کوڕی ڕەشـیدی برای مەئموون ئاشـقی قورڕەتولعەینی کەنیزی هیشـام بوو. ئەو کەنیزەش ئاشـقی ئەو بوو. بەڵام ئەبووعیسـا ئەوینەکەی خۆی دەشـاردەوە و لای کەس نەیدەدرکاند. زۆریشـی هەوڵ دەدا ئەو کەنیزە لە خاوەنەکەی بکڕێ. لە زۆر ڕێوە بۆی چوو، بێ ئاکام بوو. کە زانی بە هیچ جۆرێک نایفرۆشـێ و خۆشـەویسـتییەکەی هەر سـەر دەکا و ئارامییەکەشی لە کەمیی دەدا، ڕۆژێکیان دوای ئەوەی مەئموون دەوری چۆڵ بوو و خەڵک بڵاوەیـان کرد، هەسـتـا چووە لای و پێی گوت: 'خەلیفە، ئەگەر دەتەوێ ئـازایەتی و دەسـتودڵبازیی ئەو خەڵکەی دەوروبەرت بۆ دەرکەوێ و تاقییان کەیتەوە، بەبێ ئەوەی ئاگاداریان کەیتەوە لێیان وەژوو کەوە و میوانیان بە. بەو جۆرە بۆت ڕوون دەبێتەوە کە کێ ئازایە و کێ خوێڕییە.' هەڵبەت ئەبووعیسا مەبەستی ئەوە بوو بەو کارە بەشکو خۆی بگەیەنێتە قورڕەتولعەین بە جۆرێـک بیسـتێنێ. مەئموون لە وەڵامی ئەو قسـەیەی ئەبووعیسـادا گوتی: 'وەڵا خۆ بیری چاکە. وا دەکەین.' ئیدی فەرمانی دا لۆتکەیەکیان هێنا. ئەو لۆتکەیە ناوی تەیار بوو. خەلیفە لەگەڵ کۆمەڵێک لە دەستوپێوەندەکانی سواری لۆتکەکە بوون. یەکەم ماڵ کە چوون، ماڵی حەمیدی تووسـی بوو. لە ناخافڵ لێی وەژوور کەوتن، سەیریان کرد دانیشتووە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی چوارسەد و دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سەیریان کرد، حەمیدی تووسی لەسەر حەسیرێک دانیشتووە. هێندێک دەنگخۆش و مۆسیقار ئامێری مۆسیقایان بە دەستەوەیە و لەپێشی دانیشتوون. ئیدی مەئموون ماوەیەک لە لای دانیشت. ئینجا خواردنیان هێنا. لەنێو خواردنەکاندا گۆشتی مەلی تێدا نەبوو. هەموو هەر گۆشتی مەڕ و بزن و ئاژەڵی گەورە بوون. مەئموون ئەو گۆشتانەی پێ خۆش نەبوو. ئەبووعیسا گوتی: 'گەورەم، ئێمە لە ناکاو هاتووین و خاوەنماڵ ئاگاداری هاتنی جەنابت نەبووە. هەستە با بچین بۆ ماڵێکی دیکە، بەشکو لەوێ شتی بە دڵی تۆیان هەبێ.' ئیدی خەلیفە و دەستوپێوەندەکانی هەستان و ڕوویان لە ماڵی عەلی کوڕی هیشام کرد. عەلی کوڕی هیشام بیستییەوە دەچن بۆ ماڵی ئەوان، بەرەوپیرییان هات و کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد و پاشان فەرمووی کردن. بردنییە خۆشترین دیوی. کۆڕێکی بۆ ڕازاندنەوە تا ئێستا کۆڕی لەوە ڕازاوەتر نەدیترابوو. عەرز و دیوارەکانی ئەو دیوە هەمووی بەردی مەڕمەڕ و ڕوخامی تێ گیرابوو. نەخش و وێنەی ڕۆمییان تێ خرابوو. فەرش و مافووری بەسرەیی و سندییەی تێدا ڕاخرابوو. دوای ئیستێک مەئموون گوتی: 'برسیمە.' عەلی کوڕی هیشام لەڕێوە فەرمانی دا چەند سفرەیان ڕاخست و لەسەر هەر سفرەیەکیش سەد جۆر خواردەمەنی جۆراوجۆر داندرا. کاتێک خەلیفە نانی خوارد، داوای خواردنەوەی کرد. عەلی فەرمانی دا شەربەتی مێوژ بێنن. ساقی جوان جوان کە هەر کام جلوبەرگێکی شکۆداریان لە بەردا بوو، بە جۆرێک پەراوێزی کراسەکان هەمووی بە داو و دەزووی زێڕ و زیو نەخشێنرابوون، لە دەفری زێڕین و زیویندا شەربەتیان گێڕا. مەئموون سەری سووڕ ما و گوتی: 'ئەبوولحەسەن،' عەلی کوڕی هیشام هەستا و کڕنۆشی برد و لەپێش خەلیفە ڕاوەستا و گوتی: 'بەڵێ خەلیفە، لە خزمەتتدام.' خەلیفە گوتی: 'کۆڕێکی گۆرانی و ئاوازی خۆشمان بۆ ساز کە.' عەلی کوڕی هێشام گوتی: 'بەسەر چاو.' ئیدی بە یەکێک لە پیاوەکانی گوت: 'بچووە کەنیزە مۆسیقار و ئاوازخوێنەکان بێنە.' ئەو کۆیلەیە ماوەیەک دیار نەما. کە هاتەوە، دە کۆیلەی لەگەڵ بوو. یەکی کورسییەکی زێڕیان پێ بوو لە سووچێکی دیوەکە دایاننا. دوای ئەوە دە دانە کەنیزی ژیکەڵە یەکی تاجێکی زێڕینیان بەسەرەوە بوو، هاتن و لەسەر ئەو کورسییانە دانیشتن. هەر یەکی بە دەنگ و ئاوازێکی تایبەت گورانیی خۆش خۆشیان گوت. مەئموون چاوی بە یەکێک لە کەنیزەکان کەوت و هاتە بەر دڵی و گیرۆدەی جوانی و دەلالییەکەی بوو. لێی پرسی: 'کیژەکە ناوت چییە؟' گوتی: 'گەورەم، ناوم شمشادە.' خەلیفە پێی گوت: 'شمشاد، دا سترانێکمان بۆ بچڕە.' ئیدی کەنیزەکە لەگەڵ ئاوازێکی خۆشدا ئەو شیعرەشی خوێندەوە:

بەهار خــــــــــۆشە بە گوڵەوە بە دیبای زەرد و سوورەوە
دەنگی مەل و هـاژەی ڕووبـار ببیســـتی لە دوور دوورەوە
خۆشـــەویســـتـت لەگەڵـدا بێ، گۆزەڵەت پڕ لە بـادە بێ
چاوکەژاڵان مەی بگـــــــــــێڕن بە ناز و بە غورووڕەوە

" 'مەئموون گوتی: 'ئافەرین، ئەو شـیعرەم زۆر بە دڵ بوو. ئەوە هی کێیە؟' گوتی: 'هی مەعبەدە.' مەئموون و ئەبووعیسـا و عەلی کوڕی هیشـام پیاڵەیان بەسـەرەوە نا. ئینجا ئەو کەنیزانە گەڕانەوە و دە کەنیزی دیکە هاتن کە هەموویان قوماشـــی یەمانییان لە بەردا بوو کە قەراغەکانیان بە داو و دەزووی زێڕ و زیو نەخشـــێنرابوون. لەســـەر کورســـییەکان دانیشـتن. هەریەکەی بە دەنگ و لەبزێکی خۆشـەوە سترانیان چڕی. مەئموون سـەیری کرد یەکێک لە کەنیزەکان وەک مامزی خوتەن دەچێ. لێی پرســـی: 'کەنیزە، ناوت چییە؟' گوتی: 'گەورەم خەلیفە، ناوم تەییبەیە.' خەلیفە گوتی: 'تەییبە، دا عوودەکەت هەڵگرە و بۆمان بڵێ.' تەییبە دەستی دا عوود و وەک مامز گەردنی هەڵێنا و تێی هەڵگرد و شێعرێکی خوێندەوە.

مەئموون گوتی: 'ئافەرین.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'خەلیفە گوتی: 'تەبیبە، ئەو ئاوازە هی کێیە؟' کەنیزە گوتی: 'ئەوە ئاوازی ئیبنی سەریجە. مەئموون پیاڵەی بەسەرییەوە نا و کەنیزەکان گەڕانەوە شوێنەکەی خۆیـان. دوایی دە کەنیزی دیکە کە کراســـی دیبـای ســـووری زێڕی ڕازاوە بە دوڕ و گەوهەریان لە بەردا بوو، سەریشیان ڕووت کردبوو، هاتن و لەسەر کورسییەکان ڕۆنیشتن و گۆرانی جۆراجۆری خۆشـــیان گوت. ئینجا خەلیفە ڕووی لە یەکێک لە کەنیزەکان کرد و گوتی: 'کەنیزۆکە، ناوت چییە؟' گوتی: 'گەورەم خەلیفە، ناوم فاتینە.' خەلیفە گوتی: 'فاتین، دا شتێکی خۆشمان بۆ بڵێ.' ئیدی فاتین لەگەڵ ئاوازی خۆش خۆش ئەو شێعرەی گوت:

ئاشـقان دێـــــــــــن لە دووڕڕا دیارن
ڕەنـــــــــــــگیان زەرد و لێوبەبارن
مەنـعـیـان مەکەن ســـاحـیـب یـارن
بە دەردی دڵ گرفتـــــــــــــــارن[1]

" 'خەلیفە گوتی: 'بژی فاتین. ئافەرین. ئەو گۆرانییە هی کێیە؟' کەنیزەکە گوتی: 'قوربان، ئەوە کەلەپوورە.' ئیدی مەئموون و ئەبووعیسا و عەلی کوڕی هشام پیاڵەیان بە سەریانەوە نا. کەنیزەکان هەسـتان ڕۆیشـتن. ئینجا دە دانە کەنیزی ڕووپاک و گەش وە ژوور کەوتن. کراسـی ئاوریشـمینیان لە بەردا بوو کە بە داو و دەزووی زێڕ دوورابوون. پەراوێزەکانیان بە گەوهەر ڕازابووەوە. هاتن و لەسەر کورسییەکان دانیشتن و بە دەنگێکی خۆش دەستیان کرد بە گورانیگوتن. مەئموون چاوی لە یەکێک لە کەنیزەکان کرد کە وەک داری ســـەلو وا بوو، گوتی: 'کەنیزە، ناوت چییە؟' گوتی: 'خەلیفە، ناوم ڕەشـــایە.' خەلیفە گوتی: 'ڕەشـــا، دا تێی چریکێنە و گۆرانییەکمان بۆ بڵێ.' ئەو کەنیزە ڕێک وەک ئاسـک چاوێکی لەوبەروبەری کرد و دەستی پێ کرد. ئەو شێعرەی بە گۆرانییەوە گوت:

دایمە لە شـــەپۆلاندایە ئاشـــقان دڵیـــــان وەک دەریـایە
هەســـت و ســـۆز قەراریـان دەبـا، دڵیان دایمە لە کوڵدایە
خـــــــــــــوایە ئارامییان پێ بدەی، سوکنایی بخەیە دڵیان
ئاشقــــــــــــی هەژار چی لێت دەوێ، لە بۆی بێنیتە ڕەدایە

١. لێرەدا منیش کەلەپووری کوردیم داناوە کە مامۆستا حەسەن زیرەک بە گۆرانی دەیڵێ.

" 'مەئموون پێی گوت: 'ئافەرین، بژیت. یەکی دیشمان بۆ بڵێ.' کەنیزە هەستا و کڕنۆشی برد و ئەو بەیتەشی گوت:

مردووی دەســـتی بێـدەســـەڵاتیم، ئەگینـا
هەرچی ئـاواتی ئـاشــقـان بوو وەدیم دێنـا

" 'مەئموون بەو بەیتە لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. کەنیزەکە کاتێک زانی خەلیفە زۆری کەیف پێ کرد. گەڕاوە سەر ئەو بەیتە. دوای ئەوە مەئموون گوتی: 'لۆتکەکە بێنن.' ویستی سوار بێ بگەڕێتەوە. عەلی کوڕی هیشام هەستا و گوتی: 'خەلیفە، کەنیزێکی دیکەم هەیە، بە دەهەزار دینارم کڕیوە. ئەمن ئەوم زۆر پێ جوانە. پێم خۆشە پیشانتی بدەم، ئەگەر بە دڵت بوو بە قەرەواشی قەبووڵی بفەرمووی.' خەلیفە فەرمووی: 'بیهێنن.' گورج کەنیزێکیان هێنا وەک خەڵفی سەلو، چاو مەست و برۆ کەوانی. تاجێکی بەسەرەوە بوو لە زێڕ و گەوهەر چێ کرابوو. لەژێر تاجەکەیەوە قوماشێکی پێوە بوو بە یاقووتی زەرد ئەو بەیتەی لەسەر نووسرابوو:

دەلال و شۆخ و شەنـــــــــگان بە چاوێ تر ببینە
قژی ڕەشـــی وەک میســـک و لەنجەی کۆتر ببینە
تـــــــــۆ نازانی چ تامە ماچی ئەو لێوە شیرنەی
گەر دەتەوێ بزانـــــــــــی، دەبێ گیانت فیدای کەی

" 'ئەو کەنیزە بە لەنجەولارێکەوە هات. وەک کەو دەڕۆیشت و دڵی پیر و لاوی گیرۆدە دەکرد. هات و لەسەر کورسییەکە دانیشت.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، ئەو 'کیژە بالا سـەلوە لەسـەر کورسـییەکە دانیشـت. کە مەئموون چاوی پێی کەوت، سـەری لەو هەموو جوانی و دەلالییەی سـوور ما. ئەبووعیسـا کەوتە دڵەکوتە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و حاڵی تێک چوو. خەلیفە بە ئەبووعیسـای گوت: 'ئەوە بۆ ئاوا ڕەنگت تێک چووە؟' ئەبووعیسـا گوتی: 'خەلیفە، نەخۆشـم؛ جارجار ئاوام لێ دەکا.' خەلیفە گوتی: 'مەگەر تۆ لە پێشـدا ئەو کەنیزەت دەناسـی؟' ئەبووعیسـا گوتی: 'بەڵێ، گەورەم. خەلیفە، کەس هەیە هەتاو نەناسـێ؟' مەئموون گوتی: 'کەنیزەکە، ناوت چییە؟' کەنیزە گوتی: 'ناوی من قوڕڕەتولعەینە.' خەلیفە گوتی: 'قوڕڕەتولعەین، دا گۆرانییەکمان بۆ بڵێ.' قوڕڕەتولعەین لەڕێوە ئەو شێعرەی بۆ گوت:

دەرویش و شـــــــێخ و مەلا چۆن نەچن بە لاڕێدا
کاتێک ببینن شـــــــــــۆخێک بە ناز دەڕوا بە ڕێدا
یا غەمزەی چاوەکانی دڵـــــــــی پەستیان سست دەکا
یا بۆنی میسـکی خاوی شـێخ و دەرویش مەسـت دەکا

" 'خەلیفە پێی گوت: 'حەک بژیی، ئافەرین. ئەو شێعرەت زۆر خۆش بوو.' کەنیزە گوتی: ئەبووعیسـا چاوی لە کەنیزە بڕیبوو و دەگریا. دانیشـتووان زۆریان پێ سـەیر بوو. ئیدی قوڕڕەتولعەین ڕووی لە خەلیفە کرد و گوتی: 'خەلیفە، ڕێم دەدەی گۆرانییەکی دیکەش بڵێم؟' خەلیفە گوتی: 'ئەوەندەی پێت خۆشە بیڵێ.' کەنیزە ئەو شێعرەی خوێندە:

ئەوەی ئەڤـ......ـیندار نەبووبێ کوا ئەڤین دەزانێ چییە؟!
ئەو چـ......ـووزانێ قەدری ئەڤین، کاتێکی نازانێ چییە؟!
من کە ئەڤینداری تۆ بووم، قەت دەسـت لە تۆ هەڵناگرم
تاکـوو هەم، دڵ بە دواتەوە، جاڕزبوون چووزانێ چییە

" 'کە کەنیزە شێعرەکەی تەواو کرد، ئەبوو عیسا گوتی: 'خەلیفە ...' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کاتێک قورڕەتولعەین شێعرەکەی تەواو کرد، ئەبووعیسا گوتی: 'خەلیفە، ئێمە تا حەیامان نەچێ ناحەسێینەوە. ڕێم دەدەی وڵامی ئەو کەنیزە بدەمەوە؟' خەلیفە گوتی: 'چیت پێخۆشە بیڵێ.' ئیدی ئەبووعیسا فرمێسکی هەڵوەراند و ئەو شێعرەی گوت:

دەزانی بە لەنجەو لارت چی دەکەی لە دەورووبەرت؟!
دەزانی تێکڕا حەز دەکەن بگێڕن سەریان لە سەرت
سەرم سەرسامی جوانیتە، دڵم گیرۆدەیی داوت
سەرم بەردەبازی عیشق و، دڵم سەرمەستە لە تاوت

" 'ئەوجار قورڕەتولعەین دەستی دا عوود و بە دەنگێکی هەستبزوێن ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەگەر جوانم، ئەگەر شۆخم، تاوانێکم نەکردووە
دڵی ئەڤینداری ئێوەم بە دەهۆ بەند نەکردووە

" 'ئەبووعیسا تێر گریا و پاشان سەری بەرەو قورڕەتولعەین وەرسووڕاند و ئاهێکی هەڵکێشا و ئەو چەند بەیتەشی گوت:

خودا هاوار بێئارامم، بۆ ئەو دڵەم ئارامییەک !
ئۆقرەی نەماوە ئەو دڵە پەرێشانەم ئارامییەک
تکەتکە دەتوێتەوە مۆمی جەستەم بە تینی عەشق
ماڵی عەشق بشێوێ وا کردمی دووکەڵ چووم بۆ تەشق

" 'کاتێک ئەبووعیسا شێعرەکەی تەواو کرد، عەلی کوڕی هیشام هەستا و دەستی ئەبووعیسای ڕامووسی و پێی گوت: 'گەورەم، خودای تەعالا دوعا و سکاڵای قەبووڵ کردی. تۆ ئەو کەنیزە بە تەواوی زێڕ و زیو و جلوبەرگییەوە بەرە بۆخۆت. بەو مەرجەی خەلیفە چاوی لە دووی نەبێ.' خەلیفە گوتی: 'ئەگەر ئێمە شتێکیشمان لە بابەت ئەو کەنیزە لە دڵدا بێ، دیسانیش هەر بۆ ئەبووعیسای بە پێویستر دەزانین و بە ماڵی ئەوی دەزانین.' ئیدی مەئموونەڕڕەشید هەستا سواری لۆتکەکە بوو. ئەبووعیساش قورڕەتولعەینی بە

قسمەت بوو. بە دڵێکی خۆش و کەیفی سازەوە گەڕاوە ماڵێ.[١]

### چیرۆکی ئەمین و کەنیزۆک

"یەکی دیکە لەو چیرۆکـانە، چیرۆکی ئەمین و کەنیزێکە. دەگێڕنەوە ئەمینی برای مەئموون دەچێ بۆ ماڵی مامی کە ئیبراهیمی کوڕی مەهدیە. لەوێ کەنیزێکی جوان دەبینێ عوود لێ دەدا. دڵی دەیگرێ و خۆی پێ ڕاناگیرێ و بە مامی دەڵێ. ئیبراهیمیش کەنیزەی بە جلوبەرگی گرانبایی و زێڕ و جەواهێراتێکی زۆرە بۆ دەنێرێتە ماڵێ. ئەمین کە کەنیزە دەبینێ، پێی وا دەبێ مامی ئەو کارەی لەگەڵ کردووە و لە بەرچاوی کەوتووە، بۆیە بۆی ناردووە. هەر بۆیە ئەو دیارییانەی لەگەڵی ناردبوو، گل داوە و کەنیزەی ناردەوە. ئەمین تێیگەیشت بۆ وای کردووە. کراسێکی ئاوریشمینی لە بەر کرد و بە زێڕی سوور لە داوێنی کچە ئەو دوو بەیتەی نووسی:

خەزێنەیەکی شەقڵ نەشـــــــــــکاوە
بە دڵێـــــــــــــکی پاک بۆ تۆم داناوە
ڕەش بێ ڕووم ئەگەر لەوە زیـاتر بێ
نـــــــــــــــاردم تا بڵێن پیاوەتی ماوە

"دیســـان ناردییەوە بۆ ئەمین. کاتێک کەنیزە چووەوە بۆ لای ئەمین، چاوێکی لێ کرد و ئەو نووسراوەیەی لەسەر داوێنی دیت و خوێندییەوە. خۆی پێ ڕانەگیرا ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

## که شەوی چوارسەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خۆی پێ ڕانەگیرا و بانگی کردە لای خۆی. کۆشکێکی تایبەتی بۆ چێ کرد. سپاسی چاکەی مامیشی کرد و دەسەلاتی ولاتی 'ڕەی'ی دا بە مامە ئیبراهیمی.

### چیرۆکی کاریگەری شێعر

"دەگێڕنەوە ئەو کاتەی مەتوەککیل نەخۆش بوو، خەڵک لە هەموو لایەکەوە دیاری و سەوقاتییان بۆ دەنارد. بەتحی کوڕی خاقان کەنیزێکی زۆر جوانی وەک دیاری بۆ نارد. لەگەڵ کەنیزەکەش دەفرێکی بلووری سووری مەیخواردنەوەی بۆ ناردبوو کە بە خەتێکی ڕەش ئەو دوو بەیتەی لەسەر نووسرابوو:

بخۆوە بادە، شەرم و سەرشۆڕی لا دەبا
هەڵیدە پیاڵە، فیز و لووتبەرزی لا دەبا
بیخۆوە بادە، دەرمانی هەزار دەردانە
خۆبەزۆرزانی و خەڵکبەکەمزانی لا دەبا

"لەو جەنگەیەدا کە کەنیزەیان هێنا لای خەلیفە، یوحەننای نۆژدار لە کن خەلیفە بوو. کە ئەو دوو بەیتەی دیت، بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'خەلیفە، بە خودا کوڕی خاقانە بۆ چاککردنەوەی تۆ لە من شارەزاترە. وا چاکە خەلیفە سەرپێچی قسەکەی نەکەی. بەپێی ناوەرۆکی بەیتەکان دەواکان بەکار بهێنە، لە ماوەیەکی کەمدا چاک دەبیتەوە.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و هەفدەیەم هاتەوە

### چیرۆکی پیرێژنی قاڕی[1]

"ئەبوو سوەید گێراوییەتەوە: 'ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت لەگەڵ هەندێک لە هاوڕێیانم چووینە باخێک میوە بکڕین. لە نێوەڕاستی باخەکە پیرێژنێکمان دیت زۆر خوێنشیرین و لەبەردڵان بوو. بەڵام سەری هەموو سپی ببوو. خەریک بوو بە شانەیەکی عاج دایدێنا. ئێمە لە لای ڕاوەستاین. کەچی ئەو سەری دانەپۆشی. من گوتم: 'قاڕی'[2]، ئەگەر تۆ سەرت ڕەنگ کەیەوە ڕەش دەبێتەوە و لە هەموو کچێک جوانتر دەبییەوە.' قاڕی سەری وەرسووڕاند و چاوێکی لێ کردم و ئەو بەیتەی بۆ گوتم:

زستانی پیریم لەسەر بوو، کۆچی کرد تافی لاویم
کاتی تۆبەیە و بەسەرچوو خۆشی و دەرفەتی لاویم

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١. قاڕی: پیرێژنێکی تەواو لە پەلوپۆ کەوتە و داماو.

٢. قاڕی: پیرەژن.

# کە شەوی چوارسەد و هەژدەیەم هاتەوە

## چیرۆکی موونسی کەنیز

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دەگێرنەوە کەنیزێکیـان بە نـاوی موونس هێنـا بۆ عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا کوڕی تاهیر تا بیکڕێ. عەلی کوڕی موحەممەد لێی پرســـی: 'کەنیزە، ناوت چییە؟' کەنیزە گوتی: 'خودا میرم ســەربەرز کا، ناوم موونســە.' عەلی کوڕی موحەممەد ماوەیەک سەری داخست و دوایی سەری هەڵێنا و ئەو بەیتەی خوێندەوە:

دڵێکی ناسکم هەیە دەیپارێزم وەکوو چـــــــــاوم
گەر بێتوو تۆش بیپـارێزی دەیدەم بە تۆ هەتـا مـاوم

"کەنیزەش گوتی: 'میرم:

ئەو دڵەی وا بەزە تـــــــــێیدا گوڵ دەکا
خۆشـــەویســـتیش لەناویا گەشـــە دەکا

"عەلی کوڕی موحەممەد هەڵسوکەوت و گەورەیی و زانایی ئەو کەنیزەی بە لاوە سەیر بوو. بە حەفتاهەزار درەم کڕی و منداڵێکیشـــی لێی بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەد خاوەنی کتێبی 'مەئاسیر' بوو.

## چیرۆکی وتوویێژی ژنان

گوتی: "خاوەنشـکۆ، ئەبوولعەینا گێڕاوییەتەوە: 'دوو ژن هاوســێمان بوون. یەکیان هەر پیاوانی خۆش نەدەویست و ئەوی دیکەشیان لەگەڵ پیاوان خەریکی دڵداری بوو. شـەوێک لە شـــەوان هاتبوونە ســـەربانی ماڵی یەکیان کە لە ماڵی ئێمە نزیک بوو. ئەوان نەیاندەزانی کە منیش لەســەر بانم و ئاگام لێیانە. پێکەوە دەسـتیان کرد بە قسـەکردن. ئەو ژنەی پیاوی خۆش نەدەویسـت گوتی: 'ئەرێ خوشـکێ پیاوان کە دەیانەوێ تۆ ماچ بکەن، سـمێڵیان بەر لێو و دموچاوت دەکەوێ، چۆن تاقەت دێنی ئەو زبری و تیژییەی قەبووڵ بکەی؟' ژنەکەی دیکەیان گوتی: 'ئاخر نەتبیســـتووە دەڵێن: 'جوانیی دار بە گەڵاکانیەوەیە.' ریشـــی پیاو لە جیاتی سـەروبسـکییەتی. خودا لە ئاسـمان مەلائیکەی درووسـت کردووە کە بەردەوام دەڵێ سپاس بۆ ئەو خودایەی کە پیاوی بە ڕدێنەوە و ژنی بە بسکەوە خوڵقاندووە. ئەگەر ڕدێنی

پیاوان له جێی سەروزولفی ژنان بایە، شتەکە ئاوا ڕێک دەرنەدەکەوت. هەر بۆیە یەک-دوو جارە و ئیتر خووی پێ دەگری و نەک هەر پێی وەڕەز نابی، کەیفیشی پێ دەکەی.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

١

## که شەوی چوارسەد و نۆزدەیەم هاتەوە

### چیرۆکی عەلی میسری

گوتی: "خاوەنشکۆ، چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە کە لە شاری میسر پیاوێکی بازرگان هەبوو، ماڵێکی زۆری هەر لە باخ و مەزرا و زێڕ و گەوهەر و ئاژەڵی یەکسم و دووسم هەبوو. پیان دەگوت حەسەنی گەوهەرفرۆشی بەغدایی. خودا کوڕێکی جوانچاکی دایە. ناویان نا عەلی میسری. قورئان و زانستەکانی دیکەی فێر کرد. لە زانستدا لە لووتکەدا بوو. لەژێر سێبەری باوکیدا دەستی کرد بە بازرگانی. باوکی نەخۆش کەوت. وا بوو نەخۆشییەکەی وای لێ پیس کرد، ترسی مردنی ڕێ نیشت. بانگی عەلی کوڕی کرد و پێی گوت: 'کوڕم، دنیا دەبڕێتەوە و دوارۆژ هەتاهەتاییە. هەموو کەس ئەو ڕێگەیەی لە بەرەو دەبێ ڕۆژێک بمرێ. ئێستا وا دیارە من کاتی مردنم هاتووە و دەمەوێ ئامۆژگارییەکت بکەم. ئەگەر بە قسەی من بکەی، ئەوە هەمیشە بەختەوەر و حەساوە دەبی. ئەگەر ئامۆژگارییەکەشم پشت گوێ بخەی، ئەوە تووشی سەختی و کوێرەوەری دەبی و قەتقەت ناحەسێیتەوە و تووشی پەشیمانی دەبی.' عەلی میسری گوتی: 'بابە، جا من چۆن بە قسەی تۆ ناکەم و ڕاسپاردەی تۆ بە جێ ناهێنم، لە کاتێکدا ئەوە لەسەر شانم فەرزە؟!' گەوهەرفرۆش گوتی: 'ڕۆڵە، من ماڵێکی زۆرم بۆ وەسەریەک ناوی. ئەگەر بتەوێ ڕۆژی پێنج‌سەد دیناریش خەرج بکەی، هێشتا کەم ناهێنی، بەڵام ڕۆڵە دووری لە خراپە بکە و ئەو شتانەی خودا لەسەر شانی فەرز کردووی بەجێیان بێنە. ئەوە خودا و پێغەمبەر مەکەیان لێ کردووە، دووری لێ بکە. شوێن کاری چاک بکەوە. لەگەڵ کەسانی باش هەڵسوکەوت بکە. لە هاونشینی و هاوڕێیەتی کەسانی شەڕەنگێز و فیتنەگێڕ دووری بکە. بە بەزەیی و مێهرەبانییەوە بڕوانە ئەو کەسانەی دەستت بەسەریاندا دەڕوا، وەک ژن و منداڵ و کەنیز و کۆیلە و ئەوانە، بە تایبەت ژنەکەت کە لە بنەماڵەیەکی بەڕێزە و ئێستا لێت دووگیانە— بەشکو خودا منداڵێکی چاکت بداتێ.'

"بە گشتی ئەو کابرایە بەردەوام ئامۆژگاری دەکرد و دەگریا و دەیگوت: 'لە خودا دەپاڕێمەوە کە لە هەر خراپەیەک بتپارێزێ و خێرت بێنێتە ڕێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، دوای ئەوە کوڕە زۆر گریا، گوتی: 'بابە، تۆخودا بەسە دڵم تۆقی. هەر دەڵێی بە تەمای مالاوایی و کۆچی.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'وایە کوڕم. من خۆم باشتر دەزانم. تەمەنێکی وام نەماوە و ڕاسپاردەکانم لە گوێ بگرە و لە بیریان مەکە.' دوای ئەوە دەستی کرد بە نزا و پاڕانەوە و تۆبە و شایەدومانهێنان تا کاتی مردنی هات. بانگی کوڕەکەی کرد و گوتی: 'ڕۆڵە، وەرە پێشێ.' کوڕەکەی چوو سەری بردە پێشێ. ماچی کرد و ئاهێکی هەڵکێشا و گیانی دەرچوو. لەو ماڵەدا بوو بە شین و ڕۆ. هاوڕێ و شتی کوڕەکەی لێی کۆ بوونەوە و باوکیان شۆرد و کفنیان کرد. عەلی خەرجێکی زۆری کرد. ئەوجار تەرمەکەیان بردە مزگەوت و نوێژیان لەسەر کرد. دوای ئەوە بە خاکیان سپارد و قورئانیان لەسەر خوێند. پاشان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

"عەلی گەوهەرفرۆش هەتا چل ڕۆژان ماتەمی ڕاگرت و شینگێڕیی بۆ کرد. هەموو ڕۆژێ نانی بۆ دەدا و لە ماڵەوە نەدەچووە دەرەوە و کۆڕی ماتەمینی بۆ وەڕێ دەخست. جگە لە ڕۆژانی هەینی کە بۆ نوێژی هەینی دەچووە دەرەوە و لەوێرا دەچوو سەری گۆڕی باوکی دەدا. هەمیشە خەریکی نوێژ و خوداپەرستی و پاڕانەوە بوو. ماوەیەکی زۆر ئاوا گوزەرا.

"ڕۆژێک کوڕە بازرگانەکانی هاوڕێی هاتن لە دەرگایان دا و لێی وە ژوور کەوتن و سلاویان لێ کرد. لێیان پرسی: 'ئەرێ ئەوە بە تەمای هەتا کەنگێ ئاوا لە ژوورەوە دانیشی و ماتەم بگێڕی؟! ئەگەر ئاوا لە هاوڕێ و هاوکارانت دابڕێی، لە کاری بازرگانییەکەشت دوور دەکەویتەوە!'

"بەو جۆرە ئەوان هەوڵیان دا بیبەنەوە بازار و ژیانی ئاسایی دەست پێ بکاتەوە. شەیتانی گڵاو یارمەتی دان هەتا چۆن پێیان خۆشە ڕێی بۆ بکێشن."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و بیست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کوڕە بازرگانەکان ئەویان بردە دەرێ و هانیان دا هاتوچۆی بازاڕ بکاتەوە. عەلی میسریش بە قسەی کردن و ڕەگەڵیان کەوت. گوتیان: 'سواری هێسترەکەت بە با بچینە فڵانە باخ لەوێ تۆزێک خەم و پەژارەت لەسەر سووک بێ.' عەلی میسری سواری هێسترەکەی بوو. کۆیلەکەشی لەگەڵ خۆی برد و لەگەڵیان چووە ئەو باخەی گوتیان. کە گەیشتنە باخەکە، یەکیان چوو سووکە خواردنێکی هێنا بۆ باخ. ئەوەیان خوارد و ئیدی هەتا شەو هەر خەریکی قسەوباس بوون. پاشان هەرکەسەی گەڕاوە ماڵی خۆی و شەو لە ماڵی خۆیان ڕۆژیان کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، برادەرەکانی هاتنەوە لەدوای و پێیان گوت: 'هەستە با بڕۆین بۆ فڵانە باخ کە زۆر لەوەی دوێنێ خۆشتر و دڵگرترە.' عەلی میسری سوار بوو لەگەڵیان چوو بۆ ئەو باخەش. کە گەیشتنە باخەکە، یەکیان چوو خواردن و شتی هێنا. بادەشی لەگەڵ هێنا. ئیدی خواردنەکەیان خوارد و پاشان بادەیان پێدا کرد. عەلی گوتی: 'ئەوە چییە؟' ئەوان گوتیان: 'ئەوە لابەری خەم و هێنەری شادییە.' ئەوەندەیان پەسنی بادە دا و پێیاندا هەڵگوت، هەتا نەرمیان کرد و لەگەڵ ئەوان بادەی خواردەوە. ئەو ڕۆژە هەتا شەو هەر خەریکی خواردنەوە و سەما و کەیف و ئاهەنگ بوون. دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان. بەڵام عەلی میسری بەو بادەیە جۆرێکی لێ هاتبوو.

"کاتێک عەلی ئاوا چووەوە لای خێزانی، ژنەکەی لێی پرسی: 'ئەوە چی بووە؟ بۆ ئاوای؟ تێک چووی!' عەلی میسری گوتی: 'ئەمڕۆ لەگەڵ هاوڕێکانم لە سەیران و خۆشی بووم. هێندێک لە کوڕەکان بادەیان هێنابوو، خواردمانەوە. ئیدی ئاوام لێ هات.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی چوارسەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، عەلی گوتی: 'بادەیان هێنابوو، خواردمانەوە و ئاوام لێ هات.' ژنەكەی گوتی: 'گەورەم، مەگەر ئامۆژگارییەكەی باوكت لە بیر چووەتە، وا ئەوەی پێی گوتی دووری لێ بكە، ڕووت تێ كردووە و چووی بادەت خواردووەتەوە و لەگەڵ هاوڕێی هەرزە گەڕاوی؟!' عەلی میســـری گوتی: 'ئەوانە كوڕە بازرگانن. من لەگەڵ ئەوان بگەڕێم زەرەر ناكەم.'

"كورتی كەینەوە، عەلی ماوەیەكی زۆر ئاوا لەگەڵ ئەو كوڕانە گەڕا و هەر ڕۆژەی دەچوونە شـوێنێك و لەوێ خەریكی ئەو بەزمانە دەبوون. هەتا ڕۆژێك گوتیان: 'ئیدی ئێمە نۆرەی خۆمان كرد و لەمەو بەدوا نۆرەی تۆیە میوانداریمان بكەیت.' عەلی میســری گوتی: 'بەسەر سەر و بەسەر چاو. بە گیان و دڵ لە خزمەتتاندام.'

"كە ڕۆژ بووەوە، كەلوپەلی میواندای هەر لە خواردن و خواردنەوە و پێداویسـتییەكانی ئامادە كرا. چێشـتلێنەر و پێشـخزمەت و شـت هەموو نێردران بۆ باخ. هەتا مانگێكی ڕەبەق لەوێ خەریكی كەیف و خۆشی و شادی و شایی بوون. كە مانگەكە تەواو بوو، حیساب و كتابی خۆی بەسـەر كردەوە سـەیری كرد ماڵێكی زۆری داناوە. شـەیتان فریوی دا و پێی گوت: 'دیســـان باشـــە. خۆ ئەگەر ئەوەندەی خەرجت كردووە هەر ئاوا بڕۆیتە پێشـــەوە ماڵەكەت زۆر كەم نابێتەوە. هەوڵ بدە چاوچنۆك مەبە و لە خەرج مەترسە.' عەلی میسری ئاوا بەردەوام هەتا ســێ ســـاڵان ئەو ماڵەی خۆی بە با دا و بە گوێی ژنەكەشـــی نەكرد. ڕاســـپاردەكەی باوكی لە بیر چووبووەوە. هەتا وای لێ هات زێڕ و زیوی لە ماڵدا نەما. ئەوجار گەوهەر و مرواری و هەرچی هەیبوو فرۆشـــتی و خەرجی كرد. ئینجا خانوو و كاروانســـەراكانی هەموو فرۆشـــت. جگە لەو ماڵەی تێیدا دەژیا. تەنانەت بەردی مەڕمەڕ و ڕوخامی حەوشـــە و شـــتەكەی دەرهێنا و فرۆشـــتی. دوایە وای لێ هات خانووەكەی تێیدا دەژیان ئەویشـــی فرۆشـــت و لەنێو شـــار خانوویەكی چكۆلەی گرت. لەســـەر ئەو هەمووە گەورەیی و بڕشـــتە ئاوای لێ هات. لە خانوویەكی ڕەق و تەقدا تەنانەت بۆ خواردنی ڕۆژانەش داما. بێ كۆیلە و كەنیز. ژنەكەی پێی گوت: 'من لە ڕۆژێكی ئاوا دەترســـام بۆیە هەر دەمگوت ئامۆژگارییەكەی باوكت لە بیر نەچێ و بە گوێی بكە. ئێســتا ئەو منداڵانە چی بخۆن؟ هەستە بچووە بۆ لای ئەو هاوڕێیانەت بەشكو بەشی ئەمشەومان خواردن بدەنێ.' عەلی هەستا چوو بۆ لایان و لە دەركی هەموویانی دا، وا بوو یارمەتییان نەدا هیچ، قسـەی ســووكیشــیان پێ گوت. شـــەو بە دەســـتی بەتاڵ هاتەوە. بە ژنەكەی گوت: 'یەك هاوڕێش یارمەتی نەدام.' ژنەكەی ناچار هەستا چوو بۆ لای دراوسێكانیان و داوای یارمەتی كرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ژنە چوو بۆ ماڵە هاوسێکانیان هەتا شتێکیان لێ وەرگرێ. ڕێی کەوتە ماڵی ژنێک، ئەوی دەناسی. ژنە کە ئەوی ئاوا دیت، هەستا دەستی گرت و دەستی کرد بە گریان. پاشان لێی پرسی: 'ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟' ژنی عەلی میسری تەواو بەسەرهاتەکەی خۆی و عەلی میسری بۆ گێڕاوە. ژنە گوتی: 'خۆت نارەحەت مەکە. تۆ هەر شتێکت بوێ، من دەتدەمێ.' ژنی عەلی میسری گوتی: 'خودا چاکت بۆ بکا.' ژنە دراوسێکەیان بژیوی مانگێکی دایە. ژنی عەلی میسری توێشکەی لێ وەرگرت و گەڕاوە. کاتێک مێردکەی ئەوەی دیت، دەستی کرد بە گریان و لێی پرسی: 'ئەوانەت لە کوێ هێناون؟' گوتی: 'ئەوانە فلانە ژن دایمێ و گوتیشی هەر شتێکت ویست دەنگ بکە دەتدەمێ.' عەلی میسری کە ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'جا کە وایە ئەو کەلێنە بۆ تۆ هەیە، من دەڕۆم بۆ جێیەکی دیکە بەشکو خودا لەو ڕۆژڕەشییە ڕزگارمان بکا و دەرووی ڕەحمەتمان بە ڕوودا بکاتەوە.' ئینجا دڵخۆشی ژنەکەی داوە و هەستا منداڵەکانی ماچ کردن و بە گریانەوە وەدەر کەوت. بۆ خۆشی نەیدەزانی دەبێ بچێ بۆ کوێ ڕوو لە کوێ دەکا. هەر وا بە نارەحەتی سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت هەتا گەیشتە شاری بوولاق. لەوێ سەیری کرد ئەوە کەشتییەک بەرەو شاری دیمیات دەڕوا. لەنێو کەشتییەکەدا پیاوێکی دیت لەگەڵ باوکی دۆستایەتی هەبوو. سڵاوی لێ کرد. کابرا لێی پرسی: 'بە تەمای بەرەو کوێ بچی؟' عەلی میسری گوتی: 'بە تەمام بچمە دیمیات و لەوێ چاوێکم بە هاوڕێکانم کەوێ و بگەڕێمەوە.' ئەو پیاوە عەلی میسری بردەوە ماڵی خۆیان و ڕێزێکی زۆری لێ گرت. توێشەی ڕێگای بۆ پێچاوە و چەند دیناری زێڕیشی دایە و هێنایەوە لای ئەو کەشتییەی کە دەڕۆیشت بۆ دیمیات. کاتێک کەشتییەکە گەیشتە دیمیات، عەلی میسری لە کەشتییەکە دابەزی. نەیدەزانی بۆ کوێ بچێ. هەر وا بە حەپەساوی ئەولا و ئەولای دەکرد. لەپڕدا یەکێک لە بازرگانەکان چاوی پێی کەوت. زگی پێی سووتا و لەگەڵ خۆی بردییەوە ماڵەکەی خۆی.

"عەلی ماوەیەک لەو ماڵە دانیشت. پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'هەتا کەی لێرە دانیشم؟' ئینجا ماڵاوایی کرد و لە ماڵی ئەو بازرگانە هاتە دەرێ و چاوی بە کەشتییەک کەوت، دەچووە شام. سواری ئەو کەشتییە بوو. کاتێک کەشتی گەیشتە کەنارەکانی شام، عەلی لە کەشتییەکە دابەزی و ڕۆیشت هەتا گەیشتە دیمشق. هەر وا سەرگەردان لە کۆڵانەکانی دیمشق دەخولاوە. پیاوچاکێک تووشی بوو، بردییەوە ماڵی خۆیان. عەلی میسری ماوەیەک لە لای ئەو ماوە و پاشان ئەوێشی بەجێ هێشت. تووشی کاروانێک بوو بەرەو بەغدا دەڕۆیشت. بە مێشکیدا هات بەرەو بەغدا بڕوا. لەگەڵیان ڕۆیشت. خودای گەورە خۆشەویستی ئەوی خستە دڵی یەکێک لە بازرگانەکانەوە و لەگەڵی زۆر دڵۆڤان بوو.

بەردەوام لەگەڵ ئەو بوو. کاروان هەر وا ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتە نزیک بەغدا. ماوەی ڕۆژەڕێیەکیان مابوو بۆ بەغدا، لەوێ کۆمەڵێک ڕێگر و چەتە هێرشـــیان کردنە ســـەر و ڕووتیان کردن و تەواوی ماڵەکەیان لێ ســـتاندن. چەند کەســـێکیان نەبێ، کەس ڕزگاری نەبوو. ئەویش هەریەکەی بۆ لایەک هەڵاتن."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، هەریەکەی بۆ لایەک تێی قووچاند. بەڵام عەلی میسری ڕێی کەوتە لای بەغدا و بۆ ڕۆژئاوابوون گەیشتێ. سەیری کرد ئەوە دەروازەوانان خەریکن دەروازەی شار دادەخەن. هەرای کردنێ: 'ڕێم بکەن با بێمە ناو شارەوە و ئەمشەو میوانتان بم.' دەروازەوانان لەسەری ڕاوەستان و هێشتیان بێتە ناو شارەوە. لێیان پرسی: 'لەکوێوە دێی و بە تەمای بۆ کوێ بچی؟' عەلی میسری گوتی: 'لە میسرەوە دێم. کاڵا و هێستر و کۆیلە و خزمەتکارێکی زۆرم لەگەڵە. من سواری هێسترێک بووم و ئەوانم بەجێ هێشت هەتا شوێنێک بۆ خۆمان دیاری بکەم. چەتە ڕێیان پێ گرتم و هێستر و شتەکانی پێم بوو، لێیان ستاندم.'

"ئیدی دەروازەوانەکان ڕێزیان لێ گرت و گوتیان: 'ئەمشەو لە لای ئێمە بمێنەوە. کە ڕۆژ بووەوە شوێنێکی شیاوت بۆ پەیدا دەکەین.' عەلی میسری دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و دینارێکی لەو دینارانەی کە بازرگانە بوولاقییەکە دابوویێ، دەرهێنا و دای بە یەکێک لە دەروازەوانەکان و پێی گوت: 'ئەوەم لێ وەرگرە و خواردنمان بۆ بێنە.' دەروازەوانەکە دینارەکەی لێ وەرگرت و چوو بۆ بازاڕ و خواردەمەنی کڕی و هاتەوە. عەلی میسری خواردنەکەی خوارد و لە لای ئەوان خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، یەکێک لە دەرکەوانەکان ئەوی برد و چوو بۆ لای یەکێک لە بازرگانەکان و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە. بازرگانەکە باوەڕی کرد و وای زانی کە عەلی میسری بازرگانە و ماڵ و سامانێکی هەیە. ئەوی بردە دووکانەکەی و ڕێزی لێ گرت. جلوبەرگی لەوانەی خۆی کردە بەری و بردی بۆ گەرماو.

"عەلی میسری گێڕاوییەتەوە کە: 'من لەگەڵ ئەو کابرا بازرگانە چوومە گەرماو. منی بردەوە ماڵی خۆی و خواردنی بۆ دانام. خواردنمان خوارد. ئینجا بە یەکێک لە کۆیلەکانی گوت: 'مەسعوود، لەگەڵ کاک عەلی بچووە بۆ فلان جێ ئەو دوو خانووەی پیشان بدە. هەر کامیانی پەسند کرد، کلیلی ئەوێی پێ بسپێرە.' من لەگەڵ ئەو کۆیلەیە ڕۆیشتم. گەیشتینە کۆڵانێک سێ خانووی لێ بوو و دەرگاکانیان داخرابوون. کۆیلەکە دەرکی یەکێک لەو خانووانەی کردەوە. چاوم لەو خانووە کرد و لەوێ هاتینە دەرێ و چووین سەیری خانووی دووەم بکەین. دەرگای ئەوێشی کردەوە. چاوم لێ کرد. پاشان گوتی: 'کامیانت بە دڵە؟' من لێم پرسی: 'ئەی ئەو خانووە گەورەیە هی کێیە؟' گوتی: 'ئەویش هەر هی خاوەنمە.' گوتم: 'دەرگای ئەوەش بکەوە تا چاوێکی لێ بکەم.' کۆیلەکە گوتی: 'تۆ کارت بەوە نەبێ. کەس نەبووە شەوێک لەوێ بێ و بەیانی نەمردبێ. هەر بۆیە خاوەنم ئێرەی چۆڵ کردووە و نایدا بە کەس.' گوتم: 'هەر دەبێ دەرگاکەم بۆ بکەیتەوە و چاوێکی لێ

بکەم.' لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئێرە ڕاست بۆ من چاکە؛ شەوێ لەوێ بم و بەیانی بمرم و لەو حاڵە ڕزگارم بێ.' ئیدی کۆیلەکە دەرگاکەی کردەوە. چوومە ژوورێ، ســـەیرم کرد ماڵێکی گەورەی وا من هەتا ئێســـتا خانووی ئاوام نەدیتبوو. بە کۆیلەکەم گوت: 'من لەو خانووە بەولاوە، هیچی دیکەم ناوێ و کلیلەکەم بدەیە.' غولامەکە گوتی: 'هەتا بە گەورەم نەڵێم، کلیلەکەت نادەمێ.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کۆیلەکە پێی گوتم: 'هەتا بە گەورەم نەڵێم، کلیلەکەت نادەمێ.' دوای ئەوە کۆیلەکە چوو بۆ لای خاوەنی و پێی گوت: 'ئەو بازرگانە میســرییە دەڵێ کە من جگە لەو خانووە گەورەیە، ناچمە هیچ خانوویەکەوە.' ' ئیدی ئەو کابرایە بۆخۆی هات بۆ لای عەلی میســری و پێی گوت: 'گەورەم، تۆ کارت بەو خانووەوە نەبێ.' عەلی میســری گوتی: 'بە خودا هەر پێم خۆشــە بچمە ئەو خانووەوە، لەو قســانە ناترســم.' بازرگانە بەغداییەکە گوتی: 'ئەگەر هەر بەگوێم ناکەی، با کاغەزێکمان لەنێواندا بێ هەتا ئەگەر هاتوو خودای نەکردە شتێکت لێ بەسەر هات، من بەرپرس نەبم.'

"عەلی میسری کاغەزێکی ڕەسمی لە لای قازی هێنا و بابەتەکەیان نووسی و بۆی واژۆ کرد و دای بە بــازرگــانە بەغــداییەکە و کلیلەکەی لێ وەرگرت. چووە خــانووەکەوە و بازرگانیش ڕاخەر و شتی بە کۆیلەیەکدا بۆ نارد. سەکۆیەک لەپشت دەرگاکە بوو، کۆیلەکە ئەوێی بۆ ڕاخست و بۆخۆی گەڕاوە.

"دوای ئەوە عەلی میسـری هەسـتا بە ماڵەکەدا گەڕا. لە لایەکی ماڵەکە چاڵاوێکی دیتەوە ســـەتڵێکی تێدا بوو. بە ســـەتڵەکە ئاوی هەڵێنجا. دەســـتنوێژی گرت و نوێژەکەی کرد. دانیشـتبوو کە کۆیلەکە لە ماڵی خاوەنەکەیەوە مۆم و مۆمدان و سـفرەی شـێوی بۆ هێنا و بۆخۆی گەڕاوە. عەلی میســـری هەســـتا مۆمەکەی هەڵکرد و نانەکەی خوارد و نوێژی خەوتنانی کرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر فەرشەکە هەڵگرم بیبەم لە یەکێک لەو ژوورانەدا بخەوم، باشترە.' لەڕێوە هەستا فەرشەکەی هەڵگرت و چووە کۆشکەکەوە. لەوێ ژوورێکی گەورەی دیت. میچەکەی لە زێڕ و تەختەکەی بە بەردی ڕوخام نەخشێندرابوو. فەرشەکەی لەوێ ڕاخست و یەک-دوو ئایەتی لە قورئانی پیرۆز خوێندەوە. لەپڕدا هەستی کرد کەسێک لە پێوارەوە بانگی دەکا و دەڵێ: 'عەلی کوڕی حەسەن، پێت خۆشە زێڕت بەسەردا بڕێژم؟' عەلی گوتی: 'زێڕت لە کوێ بوو تا بەســەر منیدا بڕێژی؟!' هێشـتا قســەکەی عەلی میســری تەواو نەببوو کە دەست کرا بە زێڕهەڵڕشتن و ئەوەندەی زێڕ بۆ هەڵڕشت ئەو شوێنەی لێ پڕ کرد. ئینجا ئەو دەنگە گوتی: 'عەلی، من ئەرکی خۆم ڕاپەڕاند. ئازادم کە بڕۆم وە دوای کاری خۆم کەوم.' عەلی میسری گوتی: 'بیکە بۆ خاتری خودا پێم بڵێ هۆی هەڵڕشتنی ئەو هەمووە زێڕە چییە؟!' ئەو کەســە گوتی: 'ئەو زێڕانە هەر لە زووەوە بە ناوی تۆوە تەلیسم کرابوون. هەرکەس دەهاتە ئەو خانووەوە، من دەهاتم بۆ لای و پێم دەگوت: 'عەلی کوڕی حەسـەن، زێڕت دەوێ هەتا بۆت هەڵڕێژم؟' ئەو لە قسـەکەی من دەترسا و دەیقیژاند. ئیدی من دەهاتمە خوارێ و ملم دەشــکاند. ئێســتا کە تۆ هاتیتە ئێرە و من زانیم ئەو زێڕانە هی

تۆن، منیش زێڕەکەم بۆ هەڵڕشتی. تۆ گەنجێکی دیکەشت لە وڵاتی یەمەن هەیە. ئەگەر بچی بۆ ئەوێ ئەو گەنجەش هەڵگری بیهێنیتە ئێرە، بۆ تۆ باشـــترە. بەڵام داوات لێ دەکەم من ئازاد بکە با بڕۆم بە لای کاری خۆمەوە.' عەلی میسری گوتی: 'بە خدا هەتا ئەو گەنجەشم لە وڵاتی یەمەنە بۆ نەهێنی، ئازادت ناکەم.' ئەو کەسە گوتی: 'ئەگەر ئەو گەنجەی یەمەنیشت بۆ بێنم، ئازادم دەکەی؟' عەلی میسـری گوتی: 'بەڵێن بێ، ئازادت دەکەم.' ئەو کەســە عەلی میسری سوێند دا و بەڵێنی لێ ستاند و ویستی بڕوا، عەلی میسری گوتی: 'کارێکی دیکەشم پێتە.' ئەو کەســە گوتی: 'کارەکەی دیکەت چییە؟' عەلی میسـری گوتی: 'ژن و منداڵەکانم لە میسـرن. لە فڵانە جێن. دەبێ ئەوانیشـم بەبێ هیچ سـەرئێشـەیەک بۆ بێنی.' ئەویش گوتی: 'ئەوانیشـــت لەگەڵ هەموو دارایی و ماڵ و ســـامانەکەی یەمەن بۆ دێنم.' ئینجا دەرفەتێکی سێ ڕۆژەی وەرگرت و ڕۆیشت.

"کە ڕۆژ بووەوە، عەلی میسـری هەسـتا لەو ماڵەدا گەڕا شـوێنێک ببینێتەوە ئەو زێڕەی تێدا بشـــارێتەوە. ســـەیری کرد بەردێکی زۆر لە تەختی حەوشـــەکە گیراوە. ســـەرنجی دا یەکیان لە چاو ئەوانی دیکە بەحاڵ لەق بوو. دەســـــتی دایە، دیتی جووڵەیەکی کرد. بە هەر جۆرێک بێ بەردەی دەرهێنا. کە بەردەکەی لا برد، لەژێریدا دەرکەیەکی بچووکی تێدا بوو. ئەویشی کردەوە، تاماشای کرد، ئەوە ڕێگای ساردواێکە و نێو ساردواوەکە پڕە لە هەنبانەی سـازکراو. ئیدی هەمبانەکانی هێنان و پڕی کردن لە زێڕ. سـەرەکەیانی بەسـت و بردنیەوە نێو ساردواوەکە. دەرک و بەرد و شتکەی وا دانا شوێنەواری دیار نەبێ. دوای ئەوە هەستا فەرش و شتەکەی بردەوە سەر سەکۆکە و لەوێ دانیشت. تازە دانیشتبوو کە لە دەرگایان دا. هەسـتا دەرگای کردەوە. تەماشـای کرد کۆیلەی خاوەنماڵەکەیە. کۆیلەکە هەر کە ئەوی دیت، تیژ هەڵاتەوە بۆ لای خاوەنماڵەکە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کۆیلەکە هەر کە ئەوی دیت، تیژ هەڵاتەوە بۆ لای خاوەنماڵەکە تا مزگێنیی داتێ. کە گەیشـــتەوە لای بازرگانە بەغدایییەکە، پێی گوت: 'گەورەم ئەو بازرگانەی شـــەو لەو خانووە بوو، زیندووە و ســـاغ و ســـەلیمە.' بازرگانەکە گورج هەســـتا و بە کەیفســـازی چوو بۆ خانووەکە. کاتێک چاوی بە عەلی میســـری کەوت، لە باوەشـــی گرت و هەنیەی ماچ کرد. لێی پرسی: 'خودای گەورە چی لەگەڵ کردی؟!' عەلی میسری گوتی: 'جگە لە چاکە، هیچم نەدی.' بازرگانە بەغدایییە لێی پرســـی: 'ئەی کەس هات بۆ لات، یان هیچت دی؟' عەلی میســـری گوتی: 'چەند ئایەتی قورئانم خوێندەوە و خەوتم. بەیانی زوو هەسـتام دەستنوێژم هەڵگرت و نوێژم کرد و هاتم لەسەر ئەو سەکۆیە دانیشتم. هەتا ئێستاش هیچم نەدیوە.' بازرگانەکە سپاسی خودای کرد کە هیچی لێ نەهاتووە. هەستا ڕۆیشت و کۆیلە و کەنیز و فەرشـــی بۆ نارد. ماڵەکەیان خاوێن کردەوە و فەرشـــە گرانبایییەکانیان ڕاخســـت. چوار کۆیلە و چوار کەنیز بۆ خزمەتکردنی مانەوە. ئەوانی دیکە گەڕانەوە ماڵی بازرگانە بەغدایییەکە.

"کاتێک بازرگانەکانی دیکە بارودۆخی عەلی میســـرییان بیســـتەوە، دیاری گرانبایییان بۆ نارد. بانگهێشـــتیان کرد و پێیان گوت: 'بارەکەی تۆ کەی دێ؟ عەلی میســـری گوتی: 'دوای ســـێ ڕۆژی دیکە بارەکەی من دێ.' کە ســـێ ڕۆژەکە تەواو بوو، ئەو کەســـەی زێڕەکەی بەســـەردا باراند، هاتەوە و بە عەلی میســـری گوت: 'هەســـتە لەگەڵم وەرە. ئەو گەنجەی لە یەمەنەوە بۆم هێناوی لەگەڵ ژن و منداڵەکانت، ئەوە لە شـــــار نزیک بوونەوە و خەریکە بگەن.'

"هێنانی ژن و منداڵەکانی عەلی میســـری ئاوا بوو: کاتێک ئەو کەســـە چوو بۆ میســـر و چاوی بە ژن و منداڵەکەی عەلی میســـری کەوت لەو ماوەیەدا ئاوا ڕووت و برســـی بوون، هەســـتا ئەوانی هەڵگرت و بردنی بۆ دەرەوەی میســـر. ســـواری تەختێکی ڕەوانی کردن. جلوبەرگی گرانبایی و بەشـــکۆی لەو گەنجەی لە یەمەنەوە هێنابووی، بۆ لە بەر کردن. ئەوجار هێنانی بۆ لای عەلی میســـری. ئەوانەی بۆ عەلی میســـری گێڕاوە. ئەویش چوو بە بازرگانەکانی گوت: 'هەســـتن با بڕۆین بۆ دەرەوەی شـــار، کاروانی ماڵ و ســـامانەکەی من ببینن. ژنەکانیشـــتان بێنن تا لەگەڵ ژنەکەم ئاشنا بن.' بازرگانەکان چوون ژنەکانیشـیان لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە. ئیتر ژن و پیاو هەموو پێکەوە لە شـــار وەدەر کەوتن. چوون لە باخێک دانیشـــتن و دەســـتیان کرد بە وتوو‌ێژ هەتا لەپڕدا تەپوتۆزێک لە دوور هەســـتا. کە تۆزەکە نیشتەوە و هاتنە بەرەوە، کاروان وەدەر کەوت و کاروانەکە بە گۆرانی گوتن هاتن،

هەتا گەیشـــتنە لای خەڵکەکە. وشـــترەوانەکان هـاتن بۆ لای عەلی کوڕی حەســـەنی گەوهەرفرۆش و دەسـتیان ماچ کرد و پیان گوت: 'گەورەم، هۆی درەنگکەوتنمان ئەوە بوو لەبەر چەتە و ڕێگران خۆمان لە زۆر شـوێن لا دەدا و لە زۆر شـوێن ڕادەوەسـتاین. تا وا بوو خودا لە بەڵای شەیتانی پاراستینی.' ئیدی بازرگانەکان هەستان لەگەڵ کاروانەکە بەرە و شـــار گەڕانەوە و ژنەکانیش لەگەڵ ژنەکەی عەلی میســـری بەدوای کاروانەکەدا هاتن. بازرگانەکان ســـەریان لەو هەموو بار و یەغدانانە ســـوور مابوو. ژنە بازرگانەکان کە جلوبەرگی ژن و منداڵی عەلی میســـرییان دیت، واقیان وڕ ما. دەیانگوت: 'خۆ بنەماڵەی پاشاش جلوبەرگی ئاوایان لە بەردا نییە!' بەو جۆرە بەرەو ماڵ هاتنەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، بازرگانەکانی بەغدا لەگەڵ عەلی میسری و ژنەکانیش لەگەڵ ژنەکەی ئەو بەرەو ماڵ هاتن. هەتا گەیشتنەوە ماڵەوە و بارەکانیان لە هێسترەکان داگرت و بردیاننە کۆگە و ئەنبارەکان. ژنەکانیش لەسەر مۆڵەتی عەلی میسری چوونە ناو ژوورەکان و هەتا نیوەڕۆ خەریکی شادی و خۆشی بوون. پاشان خواردنی جۆراجۆریان هێنا. ئەوانیش خواردنیان خوارد و شەربەتیان خواردەوە و گوڵاویان لە خۆیان دا. ئینجا ماڵاواییان لە عەلی میسری و ژنەکەی کرد و گەڕانەوە. بازرگانەکان دیاری جۆراجۆریان بۆ نارد.

"خاوەنماڵەکە هەر لە لای ئەو بوو. بەجێی نەدەهێشت. عەلی میسری کەسە پێوارەکە و هاوکارەکانی ئازاد کرد و پێی گوتن کە بڕۆن بە لای کاری خۆیانەوە. ئەوانیش چوونە دەرەوەی شار، کە شەو داهات هەڵفڕینە ئاسمان و ون بوون و چوونەوە شوێنی خۆیان. عەلی میسریش لەگەڵ خاوەنماڵ هەتا دەرنگانێکی شەو دانیشتن و پاشان بازرگانی خاوەنماڵ هەستا چووەوە بۆ ماڵی خۆی و عەلی میسریش چووە لای ژنەکەی. سڵاوی لێ کرد و لێی پرسی: 'ئەرێ دوای من چۆنتان بۆ گوزەرا و چیتان کرد؟' ژنەکەی باسی ئەو رووتی و برسییەتی و تاڵییەی بۆ کرد کە دوای ئەو بەسەریان هاتبوو. عەلی میسری گوتی: 'پێم بڵێن چۆن هاتن؟' ژنەکەی گوتی: 'پیاوەکە، سێ شەو لەوەو پێش لەگەڵ منداڵەکان خەوتبووم، ئەوەندەم زانی ئێمەیان هەڵگرت، یانی وە حەوایان خستین و بردینیان لە شوێنێکی دیکە دایاننایین. کە دایاننایین، سەیرم کرد ئەوە وشتر بە بارەوە ڕیز بوون و تەختێکی ڕەوانیش لەوێ بوو هێسترێکی گەورەی لە پەنا بوو. خزمەتکار و کۆیلەشی لێ بوو. من لێم پرسین: 'ئێوە کێن و ئەو بارانە چین و ئێرە کوێیە؟' گوتیان: 'ئێمە پیاوی عەلی میسری کوڕی حەسەنی گەوهەرفرۆشین. ناردوویانی هەتا ئێوە بەرینە بەغدا.' گوتم: 'ئێرە تا بەغدا دوورە یان نزیک؟' گوتیان: 'نزیکە.' دوای ئەوە ئێمەیان سواری تەختی ڕەوان کرد. کە ڕۆژ بووەوە، سەیرم کرد ئەوە گەیشتووینەتە لای تۆ بێ ئەوەی هیچ ماندوو و نارەحەت بووبین. عەلی میسری پێی گوت: 'کێ ئەو جلانەی دانێ؟' ژنە گوتی: 'سەرۆکی کاروان یەغدانێکی کردەوە و ئەو قوماشانەی دەرهێنا و داینێ. گوتی: 'لە بەریان کەن.' من و منداڵەکانی تۆش لە بەرمان کرد. دوای ئەوە دەرکی یەغدانەکەی داخست و کلیلەکەی دا بە من و گوتی: 'ئەوە لای خۆت ڕاگرە و بیدە بە مێردەکەت.' کلیلەکەش ئێستا بە منە. دەستی برد و کلیلەکەی دەرهێنا و دای بە عەلی میسری. عەلی میسری چوو دەرکی یەخدانەکەی کردەوە. سەیری کرد، پڕە لە جلوبەرگ و کلیلی یەخدانەکانی دیکەشی تێدایە. ئیدی دەرکی یەک‌یەکی یەخدانەکانی کردەوە و تەماشای ئەو گەوهەر و یاقووت و نقێمە

گرانبابیانەی کرد کە هیچ پاشایەک چاوی بە شتی وا نەکەوتبوو. ئیدی دەرکی یەخدانەکانی داخستەوە و لەگەڵ خێزانی گەڕانەوە. ئەوجار دەستی خێزانی گرت و بردی، ئەو گەنجەی کە لە ساردوەکەدا بوو، پیشانی دا. ژنە لێی پرسی: 'ئەوانەت چۆناوچۆن دەست کەوتووە؟' ئەویش بەرسـڤی داوە: 'ئەوانە هەموویان لە گەورەیی خوداوە بە من گەیون. من کە لە میسر هاتمە دەرێ ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و بیست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی میسری گوتی: 'کە من لە میسر هاتمە دەرێ، نەمدەزانی ڕوو لە کوێ کەم. هەر وا سەرگەردان ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە شارێک. لەوێ کەشتییەکم دی بەرەو شاری دیمیات دەچوو. کە گەیشتمە دیمیات، تووشی بازرگانێک بووم باوکمی دەناسی و زۆری ڕێز لێ گرتم. لێی پرسیم: 'بۆ کوێ دەچی؟' گوتم: 'قوربان، دەچم بۆ دیمەشق.' ئیدی ئاوا ئەویش بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. ژنەکەی گوتی: 'پیاوەکە، ئەوانە هەمووی هی دۆعای بەخێری باوکتن. لە بیرتە گوتی: 'لە خودا داوا دەکەم قەت تووشی کۆسپ و تووشیت نەکا. ئەگەر تووشیش بووی زوو ڕزگارت کا.' سپاس بۆ خودا وا زوو ڕزگاری کردی و زۆر لەوە زیاتری دایتەوە کە لە دەستت دابوو. بەڵام تکات لێ دەکەم تۆخودا لەگەڵ هاوڕێی نارەسەن مەگەڕێ. لە ڕواڵەت و دەروونتدا خۆت بپارێزە و ڕێگەی ڕاست بگرە بەر.' عەلی میسری گوتی: 'ئامۆژگارییەکەتم وەرگرت. بە چاوان لە خودا داوا دەکەم لە خراپە و پیسیمان دوور کات و یارمەتیم بدا لەسەر ڕاستەڕێی پێغەمبەر(د ـ س) لا نەدەم.'

"دوای ئەوە عەلی میسری و ژنەکەی دەستیان کرد بە عیش و نۆش و ڕابواردن. لە بازاڕ دووکانێکیان دانا و پڕیان کرد لە زێڕ و گەوهەر و یاقووت و شتی گرانبایی. لە شاری بەغدادا ئەو یەکێک لە گەورەترین بازرگانەکان بوو. کاتێک پاشای بەغدا ناوبانگی ئەوی بیستەوە، کەسێکی بەدوادا نارد. کاتێک ڕاسپاردەکە گەیشتە لای عەلی میسری، خێرا چوار مەجۆعمەی زێڕی سوور و گەوهەر کرد. کۆیلەکان مەجۆعمەکانیان هەڵگرت و ڕۆیشتن بۆ لای پاشا.

"کە گەیشتە لای پاشا، کڕنۆشی برد و داوای ڕاوەستاوی و تەمەندرێژیی بۆ پاشا کرد. پاشا گوتی: 'بازرگان، بە خێر بێی بۆ شاری ئێمە.' عەلی میسری سپاسی کرد و گوتی: 'پاشای جیهان، ئەم کۆیلە بچووکەتان دیارییەکی هێناوەتە خزمەتتان، ئەگەر گەورەیی بفەرموون قەبووڵی کەن.' ئیدی مەجۆعمەکانیان هێنا پێشێ و سەریان هەڵدانەوە. پاشا چاوی لێ کردن و دیتی شتی وا لە لای هیچ پاشایەکیش گیر ناکەوێ. نرخی یەک دانەیان بەرابەری تەواوی خەزێنەی پاشایەتییە. پاشا گوتی: 'بازرگان، ئەوە دیارییەکەتم قەبووڵ کرد و ئیشەڵڵا پاداشێکی باشت دەدەمەوە.' ئیدی عەلی میسری دەستی پاشای ماچ کرد و گەڕاوە.

"دوای ئەوە پاشا گەورە و دەستوپێوەندەکانی حوکوومەتی بانگ کرد و پێی گوتن: 'تا ئێستا زۆر لە پاشا و پاشایان هاتوونەتە خوازبێنی کچەکەم، بەڵام هیچ کام لەوان

نەیـانتوانیوە دیـاری ئـاوا لەگەڵ خۆیـان بێنن.' ئەوان گوتیـان: 'قوربـان، ئەوان لەو گەوهەرانەیان نییە.' پاشـــا گوتی: 'دەڵێم کچەکەی خۆم لەو بازرگانە مارە بکەم.' ئەوانیش گوتیان: 'قوربان، بیرێکی زۆر جوانە و جێی خۆیەتی.' دوایە پاشا فەرمانی دا مەجۆعمەکان بەرنە حەرەمسـەرا. بۆ خۆشـی بەدواياندا چووە حەرەمسـەرا. مەجۆعمەكانیان لە بەردەمی ژنی پاشا دانا. پاشاژن گوتی: 'ئەوە دیاری کام پاشایە؟ ڕەنگە هی ئەو پاشایانە بێ داوای کچەکەت دەکەن.' پاشـــا گوتی: 'ئەوە دیاری پیاوێکی بازرگانە کە لە میســـرەوە هاتووەتە ئێرە. من کە زانیم هاتووەتە ئێرە، بانگم کرد. ئەویش ئەو چوار مەجۆعمەی بە دیاری هێنا. زۆر جوانچاک و ژیرم هاتە بەر چاو. شـتێکی سـەیر نییە ئەو لە تورەمەی پاشـا و شـتی وا بێ. کە دیم، دڵم گرتی و دەڵێم کچەکەی خۆمی بـدەمێ و بیکەم بە زاوای خۆم. ئەو گەوهەرانەم پیشـــانی گەورە گەورە و دەســـتوپێوەندەكانی حوكوومەت دا و ڕاوێژم لەگەڵ کردن بۆ ئەو کارە. ئەوان پێیان کارێکی بەجێ بوو. ئێســـتاش هاتووم پرس بە تۆش بکەم. تۆ دەڵێی چی؟' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشاژن، گوتی: 'پاشای زەمان، دەسەڵات بە خۆتە.' پاشا گوتی: 'ئیشەڵلا کچەکەی خۆمی لێ مارە دەکەم.' ئیدی ئەو شەوەش ڕۆژیان کردەوە. بەیانی پاشا چوو لە دیوان دانیشت و عەلی میسری لەگەڵ گەورە و بازرگانانی بەغدا بانگهێشت کرد. هەموویان هاتنە هەنتەشی. پاشا فەرمووی کردن. کە هەموو دانیشتن، پاشا ناردی لە دوای قازی. بە قازی گوت: 'قازی، ئەو کچەی من لەو پیاوە واتە عەلی میسری بازرگان، مارە بکە.' عەلی میسری گوتی: 'ئەی پاشای زەمان، بازرگانێکی وەک من شیاوی بوونە زاوای جەنابتانی نییە.' پاشا گوتی: 'ئەوە پێگەی وەزارەتیشم دایتێ.' بەو جۆرە عەلی میسری هەر لەوێ کەوای وەزارەتی بە شانیدا دا و لەسەر تەختی وەزارەت دانیشت. ئینجا ڕووی کردە پاشا و گوتی: 'پاشای زەمان، ئێستا جەنابتان بە گەورەیی خۆتان چاکەتان لەگەڵ من کرد و لەژێر سێبەری خۆتاندا پلە و پایەتان بردمە سەرەوە، ئێستا ئەگەر ڕێم بدەن قسەیەکەم لە دڵ دایە تا عەرزتانی بکەم.' پاشا گوتی: 'قسەکەت بکە و نیگەران مەبە.' عەلی میسری گوتی: 'گەورەم، ئێستا کە ئێوە دەتانەوێ کەرەم بفەرموون و کچەکەتانم بدەنێ، تکایە کچەکە لە کوڕەکەم مارە بکەن و بیدەن بەو.' پاشا گوتی: 'بۆ تۆ کوڕیشت هەیە؟' گوتی: 'بەڵێ، خزمەتکارێکی جەنابتم هەیە.' پاشا فەرمانیدا هەر ئێستا بچن بیهێنن. عەلی میسری یەکێک لە کۆیلەکانی نارد کوڕەکەیان هێنایە هەنتەشی پاشا. کاتێک کوڕەکەی هاتە هەنتەشی پاشا، کڕنۆشی برد و بە ڕێزەوە ڕاوەستا. پاشا چاوێکی لێ کرد، سەیری کرد لە کچەکەی خۆی جوانچاکتر و لەبەردڵانترە. پاشا لێی پرسی: 'ناوت چییە؟' گوتی: 'پاشای جیهان، ناوم حەسەنی خزمەتکارتە.' ئەو کات ئەو چواردەساڵان بوو. ئیدی پاشا بە قازی گوت: 'حوسنولوجوودی کچم لە حەسەنی کوڕی عەلی میسری مارە بکە.' قازی کچەکەی پاشای لە حەسەنی کوڕی عەلی میسری مارە کرد. ئینجا هەموو پیرۆزباییان لێ کردن. خەڵکەکە بڵاوەیان کرد. کاتێک عەلی میسری چووەوە ماڵ، هەموو بازرگانەکان چوون و پیرۆزباییان لێ کرد.

"عەلی میسری چوو بۆ لای ژنەکەی. ژنەکەی سەیری کرد ئەوە کەوای وەزارەتی لە بەردایە. پێی سەیر بوو. لێی پرسی: 'ئەوە چۆناوچۆنە؟ عەلی میسری ڕووداوەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە و پێی گوت: 'پاشا کچەکەی لە حەسەن مارە کرد.' ژنەکەی بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر لە خۆشی و شاییدا بوون. کە ڕۆژ بووەوە، عەلی میسری هەستا چوو بۆ بارەگا و هەنتەشی پاشا. پاشا زۆری دڵخۆشی داوە و لاواندیەوە و لە پەنا خۆی داینیشاند. دوای ئەوە فەرمانی دا شار برازێننەوە و هەتا سێ ڕۆژان خواردن و خواردنەوە بە خەڵک درا و شایی و عەیش و نۆش بوو.

"که سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، حەسەنی کوڕی عەلی میسری و کچی پاشا چوونە پەردەوە و بوون بە ژن و مێرد. ژنی پاشا کە مێردی کچەکەی دی، زۆری خوش ویست. دوای ئەوە پاشا فەرمووی: 'کۆشکێکی گەورە بۆ حەسەنی کوڕی عەلی دروست بکەن.' زۆر زوو کۆشکێکی گەورەیان لە پەنا کۆشکی پاشا دروست کرد. کوڕی وەزیر چووە ئەو کۆشکەوە. دوای ئەوە پاشا فەرمووی کۆشکێکی دیکەش لە پەنا ئەوەی خۆی بۆ وەزیر دروست بکەن. وەزیریش چووە ئەو کۆشکەوە. ئەو سێ کۆشکە ڕێڕەویان بەسەر یەکەوە بوو. هەمیشە لە خۆشی و شادی تەواودا بوون. تا وا بوو پاشا نەخۆش کەوت ..."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و سییەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشا نەخۆش کەوت. نەخۆشییەکەی جار لەگەڵ جار لێی پیستر دەکرد. تەواوی گەورە گەورەکانی حوکومەتی کۆ کردنەوە و پێی گوتن: 'من زۆر نەخۆشم. شیمانەی ئەوە دەکرێ بمرم. ئێوەم بانگ کردووە پرس و ڕاوێژێکتان لەگەڵ بکەم.' ئەوانیش گوتیان: 'پاشا، ئێمە لە خزمەتتداین. فەرموو.' پاشا گوتی: 'من نیگەرانی وڵاتم کە دژمنانم هێرشی بکەنە سەر. دەڵێم هەتا ماوم لەسەر کەسێک ساغ بنەوە با بۆ خۆشم پشتی بگرم و ڕایسپێرم.'

"هەموویان پێکەوە یەکدەنگ گوتیان: 'ئێمە ڕازیین حەسەنی کوڕی عەلی میسری زاوات جێگەت بگرێتەوە، چونکە ئەو پیاوێکی لێهاتوو و ژیر و بەبیرە. ڕێزی گەورە و چکۆلەی لایە.' پاشا گوتی: 'یانی ئێوە هەمووتان ڕازین؟' هەموو گوتیان: 'بەڵێ، ڕازیین و پێکەوە ڕێک کەوتووین.' پاشا گوتی: 'نەکا لێرە لەبەر دڵی من وا بڵێن و لە دەرێ شتێکی دیکەتان لە دڵدا بێت. جوان بیری لێ بکەنەوە و لە ڕووی من دامەمێنن.' کە پاشا وای گوت، هەموویان سوێندیان خوارد: 'بە خودا ئەوە قسەی زار و دڵمانە.' پاشا فەرمووی: 'سبەینێ قازی شەرعی شەریف و پەردەداران و پارێزەران بانگ کەن هەتا کارەکان بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچن.' ئەوانیش گوتیان: 'بەسەر سەر و بەسەر چاو.'

"دوایی لە لای پاشا چوونە دەرێ و زانایان و میرانی شاریان لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، چوونەوە بۆ بارەگای پاشا. کاتێک هەموویان کۆ بوونەوە، پاشا دیسان لێی پرسینەوە: 'گەورە گەورەکانی بەغدا، دوای من بە پاشایەتی کێ ڕازین؟ بۆ ئەوەی هەتا ماوم خۆم دەسەڵاتی ڕادەست بکەم.' ئەوان هەموو گوتیان: 'بە دەسەڵاتداری حەسەنی کوڕی عەلی میسری ڕازیین و لەسەری کۆکین.' پاشا فەرمووی: 'جا کە وایە بچن بیهێننە ئێرە.' هەموویان هاتنە کۆشکی حەسەنی کوڕی عەلی وەزیر و ئاگاداری ڕووداوەکەیان کردەوە. حەسەن لەگەڵیان هات و پێچکەی کورسی دەسەڵاتی پاشای ماچ کرد. پاشا فەرمووی کرد دانیشێ و پێی گوت: 'حەسەن ڕۆڵە، تەواوی گەورە گەورەکانی شار لەسەر ئەوە کۆکن تۆ دوای من ببی بە پاشای ئەم وڵاتە. ئێستا دەمەوێ هەتا بۆ خۆم ماوم، تۆ بکەم بە جێنشینی خۆم.' لەڕێوە حەسەن هەستا و کڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، پاشا، لەنێو گەورە گەورەکانی حوکومەتدا زۆر لە من بە تەمەنتر و بەڕێزتری تێدایە کە شیاوی ئەو شوێنەن و من لە بیر بەرنەوە. تەواوی فەرماندەکان گوتیان: 'جگە لە تۆ ڕازی نین کەس ببێ بە پاشامان.' حەسەن گوتی: 'باوکم لە من چاکترە و ئێمەش هەر یەکین. نابێ بەسەر ئەودا من هەڵبژێن.' باوکیشی پێی گوت: 'ڕۆڵە، منیش جگە لە بڕیاری

برایان به هیچ شتێکی دیکه ڕازی نیم. تۆ سەرپێچی له فەرمانی پاشا مەکه.' ئیدی حەسەن له شەرمان سەری داخست. پاشا به هەنتەشییانی گوت: 'یانی هەمووتان به دەسەڵاتداری ئەو ڕازین؟' هەموو گوتیان: 'بەڵێ ڕازیین.' ئیدی حەوت ئەلحەمدیان خوێند و پاشا به قازی گوت: 'شـتێک بنووسـه که تەواوی میران لەسـەر ئەوه کۆکن که دوای من حەسـەن ببێته پاشـا.' قازی ڕێککەوتنامەکەی نووسی و لەپێش هەموویاندا پاشا پشتگیری خۆی ڕاگەیاند و واژۆی کرد. ئینجا ئەوانی دیکه داشداری[1] و پشتیوانیی خۆیان ڕاگەیاند. ئەوجار حەسەن لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت و ئەو ڕۆژه پاشایەتی کرد. زۆری خەڵات و دیاری دا به گەورەگەورەکانی وڵات. که کاتی کاری تەواو بوو. حەسـەن چووه لای پاشـای پێشـوو و دەستی ماچ کرد. پاشای پێشوو به حەسەنی گوت: 'حەسەن، لەنێو خەڵکدا دادپەروەر به.''

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

---

١. داشداری: لایەنگری.

## که شەوی چوارسەد و سێ و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، پاشای پێشوو پێی گوت: 'حەسەن، لەنێو خەڵکدا دادپەروەر بە و، ترسی خودات لە دڵدا بێ.' دوای ئەوە حەسەن هەستا و چووەوە کۆشکەکەی باوکی. لەوێ زۆریان شادی و خۆشی کرد و سپاسی خودایان کرد. باوکی زۆری باسی چاکبوون و بەبەزەییبوون لەگەڵ مسکێنان بۆ کرد. بەو جۆرە ئەو شەوەیان بە دڵێکی خۆشەوە بردە سەر و ڕۆژیان کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، حەسەنپاشا نوێژی کرد. ئینجا چووە دەرێ و لە بارەگا دانیشت. فەرماندە و میران و خاوەن پلەوپایەکان هاتنە هەنتەشی و ئەویش دەستوور و فەرمانی پێویستی پێ دان. ئیدی هەتا ئێوارە هەر سەرقاڵی ئەو کارانە بوو. هەتا کاتی بەڕێوەبردن تەواو بوو. ئینجا هەموو بەرپرسان بڵاوەیان کرد و چوونەوە ماڵ و شوێنی حەسانەوەیان. بۆ خۆشی هەستا چووە خزمەت پاشای پێشوو. سەیری کرد نەخۆشییەکەی سەخت بووە. پاشا چاوی هەڵێنا و گوتی: 'حەسەن، هیچی وام نەماوە بمرم. بەڵام ئامۆژگاری و ڕاسپاردەم بۆ تۆ و ژنەکەت ئەوەیە تا بۆتان دەکرێ چاک بن و خۆتان لە خراپە بپارێزن. لە دادگایی ڕۆژی پەسڵان بترسە و بزانە خودای تەعالا فەرمانی داوە ڕوو لە چاکە و دادپەروەری بکەی.' حەسەنپاشا گوتی: 'باشە بە چاوان.' دوای سێ ڕۆژ پاشای پێشوو کۆچی دوایی کرد. ئەویان شۆرد و کفنیان کرد و ناشتیان. هەتا چل ڕۆژ دابی ماتەمینییان بۆ ڕاگرت. ئینجا پاشا حەسەنی کوڕی وەزیر لە دەسەڵاتدا سەربەخۆ بوو. هەژاران لەژێر دەسەڵاتیدا حەسانەوە و باوکی سەرۆکی وەزیرانی ئەو بوو. ساڵانێکی زۆر لە بەغدا پاشایەتی کرد. خودا سێ کوڕی لە کچی پاشا پێ بەخشی. وا بوو کوڕەکانی دوای ئەو جێگایان گرتەوە و دەسەڵاتیان گرتە دەست. ژیانێکی زۆر خۆش و پڕ لە بەختەوەریان هەبوو هەتا تێکدەری خۆشی و شادی لەبەر یەک هەڵیوەشاندن و بڵاوەی کردن. پاکە ئەو خودایەی کە هەر ئەو هەتاهەتاییە.

### چیرۆکی پیرێژنی پارێزکار

"دەگێڕنەوە حاجییەکی پیاو لەسەر ڕێگایەک بۆ ماوەیەکی زۆر خەوت. کە وەخەبەر هات، یەک حاجیشی لەدەور نەمابوو. هەستا و بەدوایاندا ڕۆیشت. تا ڕێی لێ ون بوو. بەرەو دەرودەشت ڕۆیشت لە دوور تاوڵێکی دیت. کە چووە بەرەوە، سەیری کرد پیرێژنێک لەوێدا بوو. سەگێک لە لای ئەو پیرێژنە خەوتبوو. سڵاوی لە پیرێژنەکە کرد و داوای خواردنی لێ کرد. پیرێژنە گوتی: 'بڕۆ لەو دەشتە مار بگرە و بیهێنەوە، منیش بۆت دەبرژێنم.' ئەو پیاوە گوتی: 'من نەدەوێرم و نەبێژم دێ بیخۆم.' پیرێژنە گوتی: 'مەترسە،

بۆخۆم لەگەڵت دێم، بۆت دەگرم.' ئیدی پیرێژنە هەستا لەگەڵی چوو. سەگەکەشی بەدوایاندا ڕۆیشت. پیرێژنە بە قەدەر پێویستی خۆیان ماری گرت و بردیانەوە برژاندی. ئەو حاجییە گێڕاوییەتەوە جگە لە خواردنی ماری برژاو هیچ چارەی دیکەم نەبوو. لەو مارانە تێرم خوارد. دوایە تینووم بوو. داوای ئاوم لە پیرێژنە کرد. پیرێژنە گوتی: 'هەستە بڕۆ سەر ئەو کانییە ئاوەکەت بخۆرەوە.' هەستام چوومە سەر کانییەکە ئاوەکەی تاڵ بوو. بەڵام هێندەم تینوو بوو، چارەم نەبوو. دوای ئەوە هاتمەوە لای پیرێژنە و پێم گوت: 'پێم سەیرە تۆ لێرە دەژیت و ...' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو پیاوە گوتی: 'پێم ســـەیرە تۆ لێرە دەژیت و ئەوە خواردن و خواردنەوەتە.' پیرێژن گوتی: «بۆ وڵاتی ئێوە چۆنە؟» ئەو پیاوە گوتی: 'لە وڵاتی ئێمە ماڵی گەورە گەورە، میوەی خۆش و بەتام و ئاوی سازگار و فێنک، خواردەمەنی بەتام و خۆش و گۆشـتی ئاژەڵی قەڵەو قەڵەو و ئەوەی چاک و خۆشـە و لە بەهەشـت نەبێ لە هیچ کوێ نییە، لە وڵاتی ئێمە هەیە.' پیرێژنە گوتی: 'من ئەوانەم بیســـتووە. بەڵام دا پێم بڵێ، ئێوە سـوڵتانێکتان هەیە کە ئەگەر کەسـێک تووشی هەڵەیەک بێ، ماڵەکەی لێ بستێنێ و خۆشی بکوژێ؟ یان ئەگەر گەرەکی بێ کەســـێک لە ماڵەکەی دەرکا، کەس نەتوانێ بەری بگرێ؟' پیاوە گوتی: 'بەڵێ، شتی وا هەڵدەکەوێ.' پیرێژن گوتی: «بە خودا ئەگەر وا بێ ئەو خواردنە خۆش و ئاوە سـووک و شـیرین و میوە بە تامانە لەگەڵ ئەو زوڵم و داپڵۆسـینە وەک ئەوە وایە ژەهر و کانزای تواوە لە گەرووتـان بکەن. ئێمە کە خوومـان بەو دژەژارە گرتووە لە چاو ئێوە زۆر زۆر لە خێرین.» گەلۆ نەتبیســـتووە گەورەترین نیعمەت دوای ئیســـلام، سـلامەتی و ئاسـایشـە ئەوەش لە ژێر سـێبەری دەسـەڵاتی دادپەروەری سـوڵتانەوەیە. سلامەتی و ئاسایشی خەڵک بە هۆی ژیری و دڵسۆزی سوڵتانەوە دابین دەبێ. پاشایانی پێشوو پێیان خۆش بوو، سامێکی وایان هەبێ کە خەڵکی هەژار و مسکێن کە ئەوانی دیت لێیان بترسن. بەڵام پاشای ئێستا پێیان وایە دەبێ سیاسەت و گەورەیی و بە سامیان هەبێ لەبەر ئەوە خەڵکی ئێســـتـا وەک ئی قەدیم نین، هەموو دڵرەق و کەللڕەق و ســـمڕ و خەیانەتکارن. ئەگەر خودای نەکردە سـوڵتانی ئەوانە بێ دەسـەڵات بێ یان خاوەن سـام و شـکۆ نەبێ، قسـەی تێدا نییە کە وڵات تووشـی پاشـاگەردانی و تێکەولێکە دەبێ. پێشـینیان دەڵێن: «ئەگەر پاشـا سـەد سـاڵ خەڵک بچەوسـێنێتەوە، چاکترە لەوەی کە خەڵک ڕۆژێک بکەونە گیانی یەک. کاتێک خەڵک زۆڵم لە یەکتر بکەن و تووشـی سـەرکەشـی و سـەرپێچی بن، خودا سـوڵتانی زاڵم و مەلیک بە زیپک و زاکوونیان لە سـەر دەکا. هەروەک دەگێڕنەوە کە حەجاجی کوڕی یوسـف نووسـراوەیەکی داتاشـیبوو کە لە سـەری نووسـرابوو کە لە خودا بترسە و بەندەکانی خودا ئازار مەدە.

"کە حەجاج ئەو نووســـراوەی دیت، چووە ســـەر مینبەر. جا زمانێکی زۆر ڕەوان و پاراوی بوو. گوتی: 'خەڵکینە، خودای گەورە منی لەبەر ئاکاری خۆتان بەســـەرتاندا زاڵ کردووە ...' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'حەججاج وتی: 'خەڵکینە، خودای گەورە منی لەبەر ئاکاری خۆتان بەسەرتاندا زاڵ کردووە. ئەگەر منیش بمرم ئێوە بە هۆی ئەو ئاکارەی خۆتانەوە لە دەست زوڵم و ستەم ڕزگارتان نابێ. چونکە کەسێکی لە من چەوسێنەر و زاڵمتر دەبێتە سوڵتانی ئێوە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ڕێـــــــــگەی ڕاســـت و پاک بگریە بەر چاکە
لە خـــــــــــــودا نیزیک بی و دوور لە خراپە
ڕێـگەی ڕاســــت نەگـری، ڕێـگە ون دەکەی
پەشـــیمان دەبی و خـــــۆڵ وەســـەر دەکەی

### چیرۆکی کەنیزی بێ هاوتا

"دەگێڕنەوە، پیاوێک لە بەغدا هەبوو خاوەنی پلەوپایە. ماڵ و سامانێکی لە ڕادەبەردەری هەبوو. یەکێک بوو لە گەورەی بازرگانەکان و داهاتێکی زۆر و زەوەندی هەبوو. بەڵام ئەو کابرایە وەجاخکوێر بوو. منداڵ و شتی نەبوو. تەمەنی هەڵکشا بوو. پشـتی چەمابووەوە. خەم و پەژارە لەسـەر سیمای نیشتبوو. چونکە کەسی نەبوو، نیگەرانی ئەوە بوو، ئەو ماڵ و سـامانەی هەر وا بە فیڕۆ بڕوا و ناویشـی بۆ هەتاهەتایە لە دنیایە بسـڕێتەوە. هەر بۆیە دەسـتی کرد بە شـین و گریان و پاڕانەوە لە خودا. بە ڕۆژدا بە ڕۆژوو دەبوو. شـەوانەش هەتا بەیانی خەریکی خوداپەرستی و پاڕانەوە دەبوو. سـەردانی پیاوچاکانی دەکرد. وا بوو ماوەیەکی پێ چوو خودا نزایی قەبووڵ کرد و یەکێک لە ژنەکانی دووگیان بوو. کە مانگ و ڕۆژی خۆی هات، کوڕێکی کاکۆڵ زێڕینی بوو. شیرینی و شوکرانەکەی خێروخێرات کرا و فەقیر و هەژار و بێوەژن و هەتیوان تێر و پۆشـــتە کران. کە حەوتووی هاتەوە، ناویان نا ئەبوولحەســـەن. ئینجا بە دایەنیان ســـپارد هەتا تەواو هەڵی دا و گەورە بوو. قورئان و ڕێوشوێنی ئیسلامەتی و نووسین و شێعر و ژماردن و تیرهاوێژی و شتیان فێر کرد. وای لێ هات ئەو کوڕە بوو بە تاقانەی ڕۆژگاری خۆی و باشترین بوو. خوێنگەرم و زمانشیرین بوو. سپیکەڵانە و ناوقەد باریک، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ناوقەد باریـــــــــــک، شل و مل، ڕێک و شووش و لەباری
ســـیمـاگەش و خوێنشـــیرین، ڕێـک وەک گوڵی بەهـاری

"وا بوو ئەبوولحەســـەن ڕۆژێک لە ڕۆژان لە لای باوکی دانیشـــتبوو. باوکی پێی گوت: 'ڕۆڵە گیان، من کاتی مردنمە و جگە لە دیداری خودا هیچ ئاواتێکی دیکەم نییە. ئەوەندەشـم ماڵ بۆ بەجێ هێشـتووی کە بەشـی کوڕەکانیشـت بکا. بەڵام تۆ خودا لە بیر مەکە و دوای هەوا و هەوەس مەکەوە.' چەنـد ڕۆژ ڕابرد و کـابرای بـازرگـان نەخۆش کەوت و مرد. کوڕەکەی شـــۆردی و کفنی تێوە پێچا و ناشـــتی. هاتەوە ماڵێ و چۆکی خەم و ماتەمی لە ئامێز گرت. دوای ماوەیەک هاوڕێ و برادەرانی هاتن و پێیان گوت: 'کەســـێک کوڕی وەک تۆی بێ، نەمردووە. ئەو ماتەمین و چلەگرتنە کاری ژنان و کچانە.' بەردەام دەهاتن و ئەو قسانەیان لەبن گوێی دەکرد هەتا بردیان بۆ گەرماو و جلی تازیەبارییان لە بەر داکەند."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک ئەبوولحەسەن جلی ماتەمی داکەند، وەسیەتەکەی باوکی لە بیر چووەوە. ماڵی زۆر بەرچاوی گرت و لەخۆبایی بوو. دەستی کرد بە تەخشانوپەخشان و تا وای لێ هات پاش ماوەیەک هیچی نەما و مافنگی بوو. جگە لە کەنیزێک هیچی دیکەی بۆ نەماوە. ئەو کەنیزەش لە جوانی و دەلالیدا بە ڕادەیەک جوان بوو کە وێژەوانان لە پەسنیدا دادەمان. برۆی کەوانی و چاوی وەک چاوی ئاسک، گوڵڕوخسار و دەمنوقڵی هەر وەک شاعیر دەڵێ:

تاکـــی لەنێو جوانانا، قسەخۆش و خۆشڕەوت
کاتـێک کە هاتیتە دەر، مانگـیش لە برەو کەوت
کە تـــۆ دەڕۆی بە ڕێدا، کەو ئیرەییت پێ دەبا
عەقڵ نەما لە سـەرما کە چاو کەوت بە چاوت

"ڕووی مانگ و قەدی باریک و سمتی پانوپۆڕە، وەک شاعیر دەڵێ:

گـراوێـکـی لەبەردڵان، قەدبـاریـک و جەرگـبـڕە
باڵای سەلو و، ڕووی وەکوو مانگ تا دڵدەخوازی دلگرە
لە جوانیـدا هـاوتـای نییە وێردی زمـانی عـالەمە
لێوی ئـاڵە خونچەئـاسـا، لووتبـاریـک و کوڵمەخڕە

"کورتی کەینەوە، ئەو شۆخە بە لەشی بەفرین، لاجانگی سپی، چاوی خومار و قۆڵ و بازنی سپی و سۆڵەوە شێخ و دەروێش و سۆفیی دنیای لە خشتە بردبوو. دڵی پیر و لاوی بردبوو. شتی وا کەس نەیدیبوو. ئەو پەریزادە لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەشیدا زمانپاراو و وێژەرێکی باشیش بوو. کە کابرا تەواوی ماڵ و سامانەکەی دانا و مافنگی بوو، جگە لەو کەنیزە هیچی نەما. هەتا سێ ڕۆژان دەمی لە خواردن نەدا و خەو نەچووە چاوییەوە. کەنیزە کە ئەوی لەو حاڵەدا دیت، پێی گوت: 'گەورەم، من بەرە بۆ لای خەلیفە هاروونەڕەشید ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کەنیزە گوتی: 'من بەرە لای هارووونەڕەشـــید و دەهەزار دینار زێڕی ســـووری نرخی منی لێ بســـتێنە.' ئەگەر گوتی: 'بەو نرخە گرانە،' بڵێ: 'ئەوە من ناچارم، دەنا نرخی ئەو کەنیزە زۆر لەوە زیاترە. جا پێت خۆشە لە بابەت هەموو لێهاتوویی و لێزانییەک تاقی کەوە با نرەخەکەیت بێتە دەست، چونکە ئەو کەنیزە بە ڕاستی دەگمەن و بێهاوتایە و جگە لە خەلیفە شایانی کەس نییە.' ' دوای ئەوە دیسان گوتی: 'تکات لێ دەکەم، نەچی لەوەم هەرزانتر بدەی، چونکە ئەوە کەمترین نرخی منە.'

"ئەبوولحەسەن کەنیزەکەی هەڵگرت و بردی بۆ لای هارووونەڕەشید. ئەوەی کەنیزەکە فێری کردبوو، ڕاســـت ئەوەی بە خەلیفە گوت. خەلیفە لە کەنیزەی پرســـی: 'ناوت چییە؟' گوتی: 'ناوم تەوەدودە.' خەلیفە گوتی: 'تەوەدود، لە زانســـتەکان لە کامیاندا شـــارەزای؟' کەنیزە گوتی: 'گەورەم خەلیفە، ڕێزمان، شێعر، فیقهـــ و لێکدانەوەی قورئان، وشەکاری و موسیقا و ئەستێرەناسی و ژمێریاری و ڕووپێویش دەزانم. قورئانی پیرۆز بە هەر حەوت شـێوازی خوێندنەکەی، ئەژماری ســووڕە و ئایەت و پاژ و هەموو بەشـەکانییەوە دەزانم. ناســـخ و مەنســـووخ و هۆکاری هاتنەکەشـیان دەزانم. فەرموودەکانیش بە ســـەرچاوە و گێڕەرەوە و ڕادەی جێی باوەڕبوون و نەبوونەکانیانەوە دەزانم. زۆربەی زانســـتەکانی ســروشــت و ئەندازە و فەلســـەفە و مەنتق و حیکمەت و ماناســـازی لە مێشکمدا ماوە. لە موزیک و شـێعر و گورانیشـدا کارێک دەکەم ژن و پیاو مەسـت بن و لە هۆشـیان دەبەم. ئەگەر بەدەوری خۆمدا بێم و خۆم تیفتیفە دەم، پیر و لاو شـــەیدا دەکەم. لەو بارانەوەش ئەوەندە دەزانم مەگین هەر خودا بزانێ چەندە.'

"کاتێک خەلیفە ئەو قســـانەی بیســـت، ســـەری لە زمانپاراویی ئەو کەنیزە ســـووڕ ما و ڕووی لە خـاوەنەکەی کرد و گوتی: 'من زانـا و بلیمەت و حـاکمـان دێنم لە بـارەی ئەو بانگەشانەی دەیانکا بیدوێنن و لێی بپرسن. ئەگەر توانی وەڵامدەر بێ، ئەوە من ئەو نرخەی داوای دەکەی دەتدەمێ، ئەگەر نا ئەو شیاوی تۆ و تۆش شیاوی ئەوی.'

"خەلیفە نامەی بۆ نوێنەرەکەی لە بەســـرە نووســـی و ڕایســـپارد کە ئیبراهیمی کوڕی ســەییاری بۆ بنێرێ. ئیبراهیم لە دەمودووەد و شـێعر و وێژەدا یەکێک لە زانا و بلیمەتەکانی ســـەردەمی خۆی بوو. فەرمانی دا قورئانخوێنان، زایان، حەکیمان و ئەســـتێرەناســـان و فەیلســـوفان کۆ کەنەوە. لە ماوەیەکی کەمدا تەوایان بانگ کرانە دارولخەلافە و نەیاندەزانی بۆ بانگ کراون. خەلیفە بانگی کردنە دیوەکەی خۆی. ئینجا فەرمووی: 'تەوەدودی کەنیزیش بێنن.' تەوەدود لەژێر چارشـــێوێکەوە هـاتە ژوورێ. لەو ژێرەشـــەوە وەک ئەســـتێرە

دەدرەوشاوە. کورسییەکی زێڕیان بۆ دانا. ئینجا بە زمانێکی خۆش و ڕەوانەوە دەستی کرد بە قسە و گوتی: 'گەورەم خەلیفە، فەرمان بدە هەنتەشییان بۆم بخوێنن[١].' خەلیفە پێی گوتن: 'دەمەوێ گفتوگۆ و بناشتێکی زانستی لەگەڵ ئەو کەنیزە بکەن، بزانم چەندی لە باراندایە.' ئەوانیش گوتیان: 'فەرمانت لەسەر سەرە.'

"لەو جەنگەیەدا کەنیزەکە سەری هەڵێنا و ڕووی تێ کردن و گوتی: 'کامتان لە ڕێوشوێنی ئایینی و فەرموودە شارەزان، بێتە پێشێ؟' یەکیان هاتە پێشێ. کەنیزە پێی گوت: 'هەر پرسیارێکت هەیە بیکە.' ئەو مەلایە لە کەنیزەی پرسی: 'ئایا تۆ هەموو قورئانت خوێندووەتەوە؟ باش بیرت لە ئایەکانی کردووەتەوە؟ ناسخ و مەنسووخەکانی لێک دەکەیەوە یان نا؟' کەنیزە گوتی: 'بەڵێ، خوێندوومەتەوە و لێکیان دەکەمەوە.' گوتی: 'کەنیزە، پێم بڵێ خودای تۆ کێیە و پێغەمبەر و پێشەوای تۆ کێیە؟ قیبلەت کوێیە؟ برایانی دینیت کێن؟'

کەنیزە گوتی: 'ئافرێنەری جیهان، خودای منە، محەممەد(د . س) پێغەمبەری منە، قورئان پێشەوای منە. کەعبە قیبلەی منە و بڕواداران برایانی منن.' مەلاکە جوابەکەی ئەوی بە دڵ بوو. ئەوجار لێی پرسی: 'پێم بڵێ تۆ چۆنت خودا ناسی؟ بە چیدا ناسیت؟' گوتی: 'بە ئاوەز خودام ناسی.' لێی پرسی: 'ئاوەز چییە؟' وەڵامی داوە: 'دوو جۆرە ئاوەزمان هەیە: ئاوەزی خوداداو و ئاوەزی وەگیرخراو.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. بۆم بخوێنن: ملەم لەگەڵ بکەن. توانایی خۆیان وەدەرخەن لە بەرابەرمدا.

# که شەوی چوارسەد و سی و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزە بەرسفی داوە و گوتی: 'ئاوەزی خودادا و ئەو ئاوەزەیە کە خودا هەر لە کاتی بوونییەوە داویە بە مرۆڤی و ڕێگای ڕاست و چەپی خۆی پێ دەناسێ. بەڵام ئاوەزی وەگیرخراو ئەو ئاوەزەیە کە مرۆڤ بە ناسین و تێگەیشتنی خۆی و بە چالاکی بەدەستی بێنێ.' مەلا گوتی: 'زۆر زۆر باشە.' دوای ئەوە پرسی: 'ئاوەز لە کوێدایە؟' کەنیزە بەرسفی داوە: 'ئاوەز لە دڵی مرۆڤدایە و بەرەو مێشک هەڵدەکشێ و لەوێ جێ خۆش دەکا.' مەلا لێی پرسی: 'پێم بڵێ پێغەمبەر چۆن دەناسی؟ واتە بە چیدا دەیناسی؟' گوتی: 'بە کتێبی خودا و بەڵگە و پەرجووەکانیدا ناسیومە.' ئەوجار لێی پرسی: 'پێم بڵێ، شتە فەرزەکان چین و شتە سوننەتەکان چین؟'

"کەنیزە وەڵامی داوە: 'فەرزەکان پێنج دانەن: یەکەم، شایەدیدان بە تاکی و بێهاوتایی خودا و پێغەمبەری خودا حەزرەتی محەممەد(د ــ س). دووەم، پێنج فەرزەی نوێژ. سێیەم، دانی زەکات. چوارەم، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان. پێنجەم، حەج. بەڵام سوننەتەکان چوارن: ڕۆژ و شەو و مانگ و هەتاون کە بووژێنەوە و نوێکەرەوەی ژیانن و مرۆڤ بێئاگایە لەوەی کە کەی نوێی دەکاتەوە یان نا.' مەلا گوتی: 'ئافەرین زۆر باش. کەنیزە، نیشانەکانی باوەڕ چی و چین؟' گوتی: 'نیشانەکانی باوەڕ نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و جیهاد و دووری لە گوناهە.' ئەو مەلایە گوتی: 'بژی، زۆر باشە. ئێستا پێم بڵێ مەبەستت لە نوێژکردن چییە؟' کەنیزە گوتی: 'مەبەستم لە نوێژکردن سەلماندنی بەندایەتی خۆم و بێهاوتایی و گەورەیی خودایە.' مەلا گوتی: 'پێم بڵێ پێش ئەوەی نوێژ بکەی، دەبێ چەند شت لە بەرچاو بگری و لە سەرت فەرزن؟' گوتی: 'خاوێنی و داپۆشینی گیانت، خاوێنبوونی جلەکانت و ڕاوەستان لە شوێنێک کە داگیر نەکرابێ و ڕوو لە قیبلەکردن و نییەتهێنان و گوتنی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژدابەستن لە سەرمان فەرز کراون.' مەلا گوتی: 'پێم بڵێ بە چ مەبەستێک دەچی بۆ مزگەوت؟' گوتی: 'بە مەبەستی بەندایەتی.' ئەو کابرایە گوتی: 'بژی، زۆر باشە.' دیسان لێی پرسی: 'سەرەتای نوێژ و چوونەنێوی و کۆتاییپێهێنانی چییە و چۆنە؟' گوتی: 'دەستپێکی دەستنوێژە و چوونەنێوی ئەڵڵاهوئەکبەری نوێژدابەستنە و کۆتاییپێهێنانیشی سڵاودانەوەیە.' مەلا گوتی: 'سزای ئەوانەی تەرکی نوێژ دەکەن چییە؟' کەنیزەکە گوتی: 'لە فەرموودەی پشتڕاستکراوەدایە کە هەرکەس بە ئانقەست تەرکی نوێژ بکا، بەری بە ئیسلامەوە نییە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزەکە کە فەرموودەکەی بۆ خوێندەوە، مەلاکە گوتی: 'بارەکەڵڵا! کەنیزە، ئێستا پێم بڵێ نوێژ چ قازانجێکی هەیە؟' کەنیزەکە گوتی: 'نوێژ هۆکاری پێوەندیی مرۆڤە لەگەڵ خودای خۆیدا. نوێژ دە تایبەتمەندیی هەیە: دڵ ڕووناک دەکات و ڕوخسار گەش. لە بەڵات دوور دەکاتەوە و لە خودا نیزیک. شەیتان پێی ناڕەحەت دەبێ و خودا خۆشحاڵ. لە شەڕ و بەڵای دوژمنان دەتپارێزێ و دەتخاتە بەر ڕەحمەتی خودا. ڕقی خودا دادەمرکێنێ و سۆز و ڕەحمەتی دەبزوێنێ. نوێژ مرۆڤ لە کاری ناڕەوا و نەشیاو دوور دەخاتەوە و بەرەو ڕاستەڕێی دەبا. نوێژ لەسەر مرۆڤ واجبە و کۆڵەکەی دینە.'

"مەلا گوتی: 'زۆر زۆر باشە. ئینجا پێم بڵێ کلیلی نوێژ چییە؟' وەڵامی داوە: 'کلیلی نوێژ دەستنوێژە.' مەلا گوتی: 'کلیلی دەستنوێژ چییە؟' وەڵامی داوە: 'هێنانی ناوی خودا.' مەلا گوتی: 'کلیلی هێنانی ناوی خودا.' کەنیزە وڵامی داوە: 'یەقینە.' مەلا گوتی: 'کلیلی یەقین چییە؟' وەڵامی داوە: 'پشتبەستنە بە خودا.' مەلا گوتی: 'کلیلی پشتبەستن بە خودا چییە؟' وەڵامی داوە: 'هیواداربوونە.' مەلا گوتی: 'کلیلی هیواداربوون چییە؟' کەنیزە گوتی: 'گوێڕایەڵییە.' مەلا گوتی: 'کلیلی گوێڕایەڵی چییە؟' کەنیزە گوتی: 'داننان بە شەریکی خودایە.' مەلا گوتی: 'بارەکەڵڵا! زۆر زۆر باشە. پێم بڵێ لە دەستنوێژدا چی و چی واجبن؟' کەنیزە گوتی: 'لە مەزهەبی ئیمام شافعیدا شەش شتی واجب هەین: نییەتهێنان، شوشتنی دەموچاو و هەردووک دەست لە ئانیشکەوە و سڕینی بەشێک لە سەر. شوشتنی لاقەکان هەتا قاپوولە. شێوازی پێشخستنی ئەوان دە شتە: نێوی خودا هێنان و شوشتنی هەردووک دەست پێش ئەوەی دەستت لە ئاوەکە ڕاکەی، ئاو لە زار و لووت وەردان و سڕینی سەر و خاوێنکردنەوەی گوێیەکان و ئاوکردنە بنجی ڕدێن ئەگەر زۆر بێ. خاوێنکردنەوەی نێوان قامکەکان بە جۆرێک نێوانی قامکی ڕاست بە دەستی چەپ و نێوانی قامکی چەپ بە دەستی ڕاست خاوێن بکرێتەوە. شوشتنی سێ جاری هەر ئەندامێکی لەش. بەدوای یەک و بە پەلە شوشتن.' مەلا گوتی: 'زۆر زۆر باشە. کەنیزەکە، لە کاتی دەستنوێژگرتندا لە مەلائیکە و شەیتان کامیانی لە لا دەبێ؟' وەڵامی داوە: 'کاتێک بەندەی خودا دەیەوێ دەستنوێژ بگرێ، مەلائیکەش و شەیتانیشی لە لایە. مەلائیکە لە لای ڕاستییەوەن و شەیتان لە لای چەپییەوە. بەڵام کاتێک ناوی خودای هێنا، شەیتان ڕادەکا و سەری خۆی هەڵدەگرێ—مەلائیکە بەسەریدا زاڵ دەبێ. ئینجا خێوەتێک لەسەر ئەو بەندەیە هەڵدەدەن و بە چوار گوریس ڕایدەگرن. سەری هەر گوریسەی بە دەست مەلائیکەیەکەوە دەبێ. ئەگەر لە دەسپێکی دەستنوێژیشدا ناوی خودا نەهێنێ، ئەوە شەیتان بەسەر مەلائیکەدا زاڵ دەبێ و مەلائیکە لێی دوور دەکەونەوە. شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ و تووشی دڵەڕاوکێی دەکا و

دەسـنوێژەکەی لێ سـەقەت دەکا. پێغەمبەر فەرموویەتی: 'دەسـنوێژی درووسـت شـەیتان دوور دەخاتەوە و لە بەڵای زاڵمت دەپارێزێ.' دیسـان لە شـوێنێکی دیکەدا دەفەرمووێ: 'هەرکەس بێ دەسـنوێژ بێ، بەڵای بەسـەردا دەبارێ و جگە لە خۆی نابێ کەس سـەرکۆنە بکا.'

"مەلا گوتی: 'بارەکەڵڵا! زۆر جوان بوو. فەرز و سوننەتەکانی غوسڵدەرکردنم بۆ باس بکە.' کەنیزەکە گوتی: 'فەرزەکانی غوسـڵ نییەتهێنان و شـۆردنی تەواوی جەسـتەیە. بەڵام سـوننەتەکانی غوسـڵ: دەسـنوێژگرتنە پێش خۆشـۆردن و دەسـهێنان بە تەواوی لەشـدا و تەڕکردنی ئەو شوێنانەی ئاو باشیان ناگاتێ، وەک بنجی مووی سەر و ڕدێن و ئەو شتانە' مەلا گوتی: 'بژیت، زۆر زۆر باشە. کەنیزە، ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک کەنیزەکە باسی فەرز و سوننەتی غوسڵی بۆ مەلاکە بە جوانی شی کردەوە، مەلا گوتی: 'بژیت، زۆر زۆر باشە. کەنیزە، باسی تەیەممومم بۆ بکە.' کەنیزە گوتی: 'تەیەممومم لە حەوت حاڵەتدا پێویستە: یەک، ئاو دەست نەکەوێ. دوو، ترسان. سێ، تینوێتی. چوار، ئاو لە تێردا بێ و وڵاخەکە ون بووبێ. پێنج، نەخۆشی. شەش، برینداربوون. حەوت، نەخۆشی پێستی وەک زیپکە و شت. بەڵام فەرزەکانی تەیەممومم چوارن: یەک، نییەتە. دوو، جارێک بەری دەست لە گڵەکە دەدەی بۆ دەستماڵین بە دەموچاودا. سێ و چوار، دیسان بەری هەردووک دەست لە گڵەکە دەدەیتەوە و دەستی چەپ بە دەستی ڕاستدا دێنی و، دەستی ڕاست بە دەستی چەپدا دێنی. بەڵام سوننەتی تەیەممومم ناوی خودا هێنان و پێشخستنی دەستی ڕاستە بەسەر دەستی چەپدا.' مەلا گوتی: 'ئافەرین، زۆر باشە. ئەوجار باسی هەلومەرجی نوێژ و کۆڵەکەکانی و سوننەتەکەیم بۆ بکە.' کەنیزە گوتی: 'نوێژ پێنج مەرجی هەیە: خاوێنبوونی لەش و ئەندامەکانی، داپۆشینی ناوک هەتا سەر ئەژنۆ، وەستان ڕوو بە قیبلە و کاتی نوێژ بووبێ و ڕاوەستان لە شوێنی پاک. بەڵام کۆڵەکەکانی نوێژ: نییەتە، تەکبیرەتولحەرامە، هەستان بە هێزەوە، خوێندنەوەی سوورەی فاتحە، ڕکووع و وێستەیەک لە ڕکووعدا. ڕاستبوونەوە دوای ڕکووع و وێستەیەک. سوژدە و وێستەیەک لە سوژدەدا. دانیشتن لە نێوان دوو سوژدەدا و وێستەیەک و خوێندنی تەحیات و شادەوئیمان و سڵاوەت لێ دان و پاشان سڵاو دانەوە بۆ لای ڕاست و پاشان لای چەپ. دوای ئەوانیش نییەت هێنان و هاتنە دەر لە مزگەوت.

" 'بەڵام سوننەتەکانی نوێژ بریتین لە بانگ و قامەت و دەستهەڵێنان لە کاتی ئەڵلاهوئەکبەری نوێژدابەستندا، دۆعای ئیفتیتاح و خوێندنی سوورەیەک لە سوورەکانی قورئان و ئەڵلهوئەکبەر لە کاتی هەستانەوە و دانیشتن و گوتنی 'سەمیعەڵلاهو لیمەن حەمیدە.'[1] بەرز و نەویکردنی دەنگ لە کاتی خۆیدا و شادەوئیمانهێنان و دانیشتن لە کاتی شادەوئیمانهێناندا و سڵاوات لێدان لە دیداری پێغەمبەی ئیسلام.

"مەلا گوتی: 'ئەی بارەکەڵلا! کەنیزەکە، پێم بڵێ زەکات لە چیدا واجبە؟' کەنیزە گوتی: 'زەکات لە زێڕ و زیو، وشتر و مانگا، مەڕوماڵات، دانەوێڵە وەک گەنم و جۆ و هەرزن و لۆبیا و برنج و نۆک و مێوژ و خورما.' ئینجا پرسی: 'پێم بڵێ زێڕ ئەگەر چەندە بێ زەکاتی لێ دەکەوێ؟' وەڵامی داوە: 'ئەگەر زێڕ بگاتە بیست مسقاڵ، نیو مسقاڵ زەکاتی لێ دەکەوێ. هەر بەو پێیە ئەوەندی زێڕەکە زیاتر بێ، هەر بیست مسقاڵ و نیو مسقاڵ زەکاتی

---

١. واتە: "خودا گوێی لەو کەسە بوو کە ستایشی کرد."

لێ دەکەوەێ.' مەلا گوتی: 'ئەی زەکاتی زیو چۆناوچۆنە؟' وەلامی داوە: 'هەر دووسەد درەم زیو پێنج درەم زەکاتی لێ دەکەوێ. جا چەند دووسەد درەم بێ، ئەوەندە پێنج درەم زەکاتی لێ دەکەوێ.' مەلا دڵی بەو وەلامانە خۆش بوو. ئینجا لێی پرسی: 'ئەی زەکاتی وشتر چۆناوچۆنە؟' کەنیزە گوتی: 'بە پێنج وشتران مەڕێکیان زەکات دەکەوێ. ئەگەر وشترەکان بگەنە بیست و پێنج وشتر، ئەوە وشترێکیان زەکات لێ دەکەوێ. بەڵام مەڕ ئەگەر بگەنە چل دانە، مەڕێکیان زەکات لێ دەکەوێ.' مەلا گوتی: 'بژی، زۆر باشە. فەرزەکانی ڕۆژوو چین؟' کەنیزە گوتی: 'فەرزەکانی ڕۆژوو: نیەت، خۆپاراستن لە خواردن و خواردنەوە و جووتبوون و ڕشانەوە بە ئانقەست. ڕۆژوو بە دیتنی مانگی ڕەمەزان یان بە ڕاگەیاندنی کەسێکی جێی باوڕە و دادپەروەر واجب دەبێ. فەرزە شەو نیەت بێنی. بەلام سوننەتە کە دوای بانگی شێوان زوو نان بخۆی، پارشێو درەنگ نان بخوێ هەر وا بێ خواردنەکەت تەواو بوو، بانگی بەیانی بدا. قسە کەم بکەی و قورئان زۆر بخوێنی. بەڵام ڕۆنلەخۆدان و چاوڕشتن و شتێک لە قورگت بچێتە خوارەوە و قووتدانەوەی تف و شەیتانیبوون و چاو لە ژنان کردن و حیجامەتکردن ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە.' مەلا گوتی: 'بارەکەڵلا، درووستە. باسی نوێژی جەژنانم بۆ بکە.' کەنیزەکە گوتی: 'نوێژی جەژنەکان دوو ڕەکاتە و بانگ و ئیقامەی نییە. بەلام بە مەزهەبی ئیمام شافعی لە ڕەکاتی یەکەمدا حەوت جار 'سوبحانەڵلاهی وەلحەمدولیللاهی وەڵلهوئەکبەر' دەگوترێ و لە ڕەکاتی دووەمدا پێنج جار بێجگە لە ئەڵلاهوئەکبەری هەستانەوە و شادەوئیمان دەهێنرێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاونشـکۆ، کە کەنیزەکە چۆنییەتی نوێژی جەژنی شـی کردەوە. مەلاکە گوتی: 'دەسـت خۆش، ئەی نوێژی خۆرگیران و مانگگیران چۆنە؟' کەنیزەکە گوتی: 'دوو ڕەکاتی بەبێ بانگ و قامەت کە لە هەر ڕەکاتێکدا دوو چەل هەڵدەسـتێتەوە و دوو چەل دەچێتە ڕکووع و دوو چەلیش دەچێتە سـوژدە. دوای ئەوە تەحیات و سـڵاودانەوەیە.' مەلا گوتی: 'بژیت! باسـی نوێژی وەترم بۆ بکە.' وەڵامی داوە: 'نوێژی وەتر لە ڕەکاتێکەوە دەبێ هەتا یـازدە ڕەکـات.' مەلا گوتی: 'ئـافەرین. ئیعتیکـاف[1] چییە؟' کەنیزەکە گوتی: 'ئیعتیکـاف سـوننەتێکە کە نییەتی لێ دێنێ و لە مزگەوت دادەنیشـێ. بۆ کاری ئاودەسـت نەبێ لە مزگەوت ناچێتە دەرێ و لەگەڵ ژنان نزیکی ناکا. بە ڕۆژوو دەبێ و قسە و شت ناکا.' مەلا گوتی: 'زۆر زۆر چاکە، ئافەرین. ئێسـتا پێم بڵێ کەی حەج لەسـەر مرۆڤ واجب دەبێ؟' کەنیزەکە گوتی: 'کاتێک کەسێک موسوڵمان و پێگەیشتوو و تێگەیشتوو و دەستڕۆیشتوو بێ. لە تەواوی ژیانی جارێک حەجی لەسەر فەرز دەبێ.' مەلا گوتی: 'ئەو کارانەی لە حەجدا فەرزن و دەبێ بکرێن چی و چین؟' وەڵامی داوە: 'ئیحرام و وەستان لە عەرەفات، تەواف و سەعی و سەرتاشینە.' مەلا گوتی: 'ئەی داب و دەستووری عومرە کامانەن؟' گوتی: 'ئیحرام و تەواف و سـەعی.' مەلا گوتی: 'فەرزەکانی ئیحرام کامانەن؟' کەنیزە گوتی: 'ئیحرامی تەواف و لە خەوتن موزدەلیفە و مینا و، بەردبارانی شـەیتانە.' مەلا گوتی: 'سـوننەتەکانی حەج کـامـانەن؟' کەنیزەکە گوتی: 'گوتنی لەبەیـک، لەبەرکردنی قومـاشـی نەدووراو، بۆنلەخۆنەدان، سەرنەتاشین، نینۆکنەکردن. ڕاونەکرد و نزیکنەبوونەوە لە ژن.' مەلا گوتی: 'ئەی بژیت، باسـی جیهادمان بۆ بکە.' کەنیزەکە گوتی: 'مەرجی جیهاد هێرشـی کافرانە بۆ سەر موسوڵمانان، بوونی پێشەوا، ئامادەکردنی چەک، خۆڕاگری لە کاتی شەڕدا. سوننەتی جیهاد هاندانی خەڵک بۆ شەڕ و بەربەرەکانی هەر وەک خودای مەزن دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأنفال: ٦٥

واتـا: ﴿ئەی پێغەمبەر موسـوڵمـانـان هەڵنێ بۆ جەنگـانو دابینکردنی ئـامێری جەنـگ بەهەموو شـێوەکانیەوە، وایان لێ بکە هەمیشـە سـوور بن لەسـەر خەباتو تێکۆشـانو بەرخودانو بەرگری لەنیشـتمانو ئایینو ماڵو سـامان، واتە: دەبێ موسـوڵمانان بۆ خۆیان

---

١. ئیعتیکاف: دوورەپەرێزی بە مەبەستی خوداپەرستی.

ئەوپەڕی تواناو هێزی خۆیان بخەنە کار بۆ ڕێکخستنی سوپاو چەکدارکردنیو ئامادەکردنی بۆ جەنگ ئەمجار پشت بەخودا ببەستنو داوای سەرکەوتنو سەرفرازی لەخودا بکەن. جا ئەو کاتە ئەگەر بیســت جەنگاوەری موســوڵمانی خاوەن صــەبرو خۆگر تووشــیان بوو بەتووشـی دوو صـەد شـەڕکەری کافر دەبێ خۆیان ڕابگرنو جیهاد بکەن تا بەسـەریان دا زاڵ دەبن. واتە: ئەگەر بیســت موسـوڵمانی خاوەن صـەبر هەبوون بەهۆی لێزانیو ئیمانو خۆڕاگریانەوە سـەرکەوتوو دەبن بەسـەر دوو صـەد کافری وادا کە ئەو ڕەوشـتانەیان تێدا نەبن. ئەگەر لەئێوە سەد کەس هەبێ بەسەر هەزار کافردا زاڵ دەبن. بۆیە دوا بەدوای ئەوە فەمووی: واتە: هۆی تێشـــکانی کافرەکان ئەوەیە: ئەوان نەتەوەیەکی نەفامن وەکوو ئێوە لەحیکمەتی جەنگ نازانن. ئەوان کە شەڕ دەکەن تەنیا مەبەستیان سەرکەوتنو داگیر کردنە، ئێوە دەجەنگن بۆ بەرز کردنەوەی رســـتەی (لا اله الا الله محمد رسـول الله) بۆ راســـتکردنەوەی بیرو باوەڕ، بۆ خۆپاککردنەوە لەبتپەرســـتیو خۆئارایش دان بەرەوشـــتی بەرزو ئیڤهاری بەنـدایەتی کردن بۆ خوداو ئەنجـامـدانی نوێژو زەکـات دانو فەرمـان بەچـاکەو نەهی لەخراپە.﴾

مەلا گوتی: 'ئافەرین. دەی باسـی فەرز و سـوننەتی کڕین و فرۆشـتنم بۆ بکە.' کەنیزە گوتی: 'فەرزی کڕین و فرۆشـــتن ڕازیبوونی دوو لایەنەکە و، مەرجی بەتاڵبوونەوەشـــی بەپێی بڕیاری دیاریکراو لە ماوەی دیاریکراودا.' مەلا گوتی: 'بارەکەڵڵا! ئێســـتا پێم بڵێ ئەو شـتانە چین کە گۆڕینەوەیان ســـەربەســـەر ڕێی پێ نەدراوە؟' کەنیزەکە وەڵامی داوە: 'لەو بارەوە فەرموودەی درووستی پێغەمبەرم(د ـ س) لە بیرەکە دەفەرمووێ: 'دووری بکەن لە گۆڕینەوەی خورمای تازە بە خورمای وشک، هەنجیری تازە بە هەنجیری وشک، گۆشتی تازە بە گۆشتی وشککراو و کەرە لەگەڵ ڕۆن.'

"کاتێک مەلاکە ئەو کەنیزەی ئاوا دیت، زانی کە خاوەنی بیر و مێشـــک و ئاوەزێکی تایبەتە و لە داب و دەســـتووری ئایینیدا شـــارەزایەکی تەواوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەبێ کارێک بکەم لەو کوڕەدا بەسەریدا زاڵ بم.'

"ئیدی لێی پرسـی: 'کەنیزە، مانای وشـەی دەسـنوێژ چییە؟' کەنیزە گوتی: 'واتە پاک و خاوێن و بەری لە پیسـی.' مەلا پرسـی: 'مانای نوێژ چییە؟' کەنیزە گوتی: 'مانای وشـــەی نوێژ نزاکردنە.' مەلا گوتی: 'مانای غوسڵ چییە؟' وەڵامی داوە: 'غوسڵ بە مانای شۆردن و خاوێنکردنەوەیە.' مەلا پرسی: 'مانای ڕۆژوو چییە؟' وەڵامی داوە: 'خۆپاراستن لە خواردن.' مەلا پرسی: 'مانای زەکات چییە؟' کەنیزە گوتی: 'ئەوەی زیادییە.' مەلا پرسی: 'مانای حەج؟' وەڵامی داوە: 'ئامانج.' مەلا پرسـی: 'ئەی مانای جیهاد؟' وەڵامی داوە: 'لە بنچینەدا بە مانای

بەرگری دێت.' ئینجا مەلا قسەی پێ نەما."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە مەلا هیچی پێ نەما، هەستا و گوتی: 'گەورەم خەلیفە، تۆ شایەد بە کە ئەو کەنیزە لە من زانا و شارەزاترە.' ئیدی کەنیزەکە بە مەلای گوت: 'پرسیارێکت لێ دەکەم، وەڵامم بدەوە.' مەلا گوتی: 'بپرسە.' کەنیزەکە گوتی: 'بەشەکانی دین چی و چین؟' مەلا گوتی: 'بەشەکانی دین دە دانەن: شادەوئیمان، نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج، جیهاد، هاندان بۆ چاکە و بەرگری لە خراپە، هاتوچۆی خزم و نزیکان و دەیەمین دانە کەوتنە دوای زانیاری.' کەنیزە گوتی: 'زۆر باشە، پێم بڵێ بنەماکانی ئیسلام چەندن؟' مەلا گوتی: 'چوارن: پەیمان، ڕاستگۆیی، پاراستنی سنوورەکان و بەڵێنبردنەسەر.' کەنیزە گوتی: 'شتێکت لێ دەپرسم ئەگەر نەیزانی عەباکەت لە بەر دادەکەنم.' مەلا گوتی: 'بپرسە.' کەنیزەکە پرسی: 'لقەکانی ئیسلام چی و چین؟' مەلا ماوەیەک بێدەنگ بوو، هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو. کەنیزەکە گوتی: 'عەباکەت داکەنە با وەڵامەکەیت پێ بڵێ.' خەلیفە گوتی: 'تۆ بۆی شی کەوە، من عەباکەی پێ دادەکەنم.' کەنیزەکە گوتی: 'لقەکانی ئیسلام بیست و دوو دانەن: دەستگرتن بە کتێبی خوداوە، کەوتنە شوێن محەممەد(د ـ س) دوورخستنەوەی زیان لە موسڵمانان، خۆپاراستن لە شتی حەرام، گەڕاندنەوەی حەق بۆ حەقدار، تۆبەکردن، فێربوونی ڕێوشوێنی ئایینی، خۆشویستنی خۆشەویستان، پەیڕەویکردن لە قورئان و بە ڕاستدانانی پێغەمبەران، ئامادەبوون بۆ جیهاد، بەخشین لە کاتی دەسەڵاتداریدا، ئارامگرتن لە کاتی تەنگانەدا، ناسینی خودای بێهاوتا، ناسینی حوکمەکانی پێغەمبەر(د ـ س) دژایەتیکردنی شەیتانی گڵاو، بەربەرەکانی دنەی شەیتانی و پاکبوونی دڵت لەگەڵ خودای خۆت. کاتێک خەلیفە ئەوانەی بیست، بە مەلای گوت: 'ئەو عەبایە داکەنە.' ئیدی بە خەجاڵەتی لە کۆڕەکەی خەلیفە هاتە دەرێ.

"ئینجا پیاوێکی دیکە هەستا و گوتی: 'کەنیزەکە، وەڵامی پرسیارەکانی منیش بدەوە.' کەنیزە گوتی: 'بپرسە.' پیاوەکە گوتی: 'ڕاستی ملکەچبوون چییە؟' کەنیزە وەڵامی داوە: 'قەدەری دیار، ڕەگەزی دیار، ئەجەلی دیار.' ئەو پیاوە گوتی: 'فەرز و سوننەتی خواردن چییە؟' کەنیزە گوتی: 'فەرز و سوننەتی خواردن ئەوەیە کە باوەڕت بەوە بێ کە خودا بژیو دەنێرێ و بە ئەرکی بزانی سپاسگوزاری بی.' پیاوە پرسی: 'سپاسگوزاری چییە؟' کەنیزە گوتی: 'سپاسگوزاری ئەوەیە کە هەر شتێک خودا درووستی کردووە لە جێی خۆیدا بەکاری بهێنی.' پیاوە گوتی: 'سوننەتەکانی کاتی خواردن چین؟' کەنیزە گوتی: 'ناوی خودا بهێنی، دەستەکان بشۆی، لەسەر ڕانی چەپ دابنیشی و چۆکی ڕاست هەڵدەی. بە سێ گوست بخۆی و لەبەردەمتەوە چێشت بخۆی.' مەلاکە گوتی: 'ئافەرین. ئەی ئەو ئاکارانەی لە کاتی خواردندا دەبێ ڕەچاو کرێن؟' وەڵامی داوە: 'پارووی چکۆلە بکەی، لە کاتی

خواردندا چاو به خەڵکدا نەگێڕی.' کابرا گوتی: 'زۆر زۆر باشە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کاتێک کەنیزەکە داب و نەریتی خواردنی باس کرد، مەلاکە پێی گوت: 'باسـی باوەڕە دڵییەکان و پێویسـتییەکانیانم بۆ بکە.' کەنیزە بگوتی: 'باوەڕەکانی دڵ سێ و دژبەرەکانیشی سێن: یەکەم، پتەوبوونی باوەڕ و پێویستییەکەشی دوور کەوتنەوە لە کفر. دووهەم، باوەڕ بە سوننەت و پێویستییەکەشی خۆپاراستنە لە بیدعە. سێیەم، باوەڕ بە ملکەچی و پێویستییەکەشی خۆپاراستنە لە سەرپێچی.' مەلا گوتی: 'بژیت. باسی باوەڕم بۆ بکە.' کەنیزە گوتی: 'باوەڕ چەند جۆرە. باوەڕ بە پەرسـتراو، باوەڕ بە بەندایەتی خۆت، باوەڕ بە شتە تایبەتەکانی ئیسلام، باوەڕ بە ناسخ و باوەڕ بە مەنسووخ، باوەڕ بە خودا و مەلائیکە و نێردراو و باوەڕ بە قەزا و قەدەر و خێر و شـەڕ و خاس و خراو.' مەلا گوتی: 'بارەکەڵڵا! ئینجا باسـی سـێ شـتم بۆ بکە کە دەبنە ئاسـتەنگ لەبەردەم سێ شـتی دیکەدا.' کەنیزە گوتی: 'لە سوفیانی سەوری دەگێڕنەوە گوتوویە: سێ شت دەبنە لەمپەر لەهەمبەر سێ شتی تردا: بەکەمگرتنی پیاوچاکان، ئەو دنیات لەدەست دەدا. بەکەمگرتنی پاشایان، ئەم ژیانەت لەدەست دەدا. بەکەمگرتن و ناشوکری نیعمەت سەری ماڵ و سامانت دەخوا.' مەلا گوتی: 'کەنیزەکە، پێم بڵێ ئاسـمان چەند دەرگای هەیە و کلیلەکانی چین؟' کەنیزە وەڵامی داوە: 'خودای گەورە فەرموویەتی: 'و فَتحتِ السَّماءُ فكانت ابوابا.'[1] پێغەمبەریش(د ــ س) فەرموویەتی: 'من نازانم ئاسمان چەند دەرگای هەیە، بەڵام دەکرێ درووست کرێ، هەر مرۆڤێک لە ئاسـماندا دوو دەرگای هەیە. دەرگایەکیان بژێوی مرۆڤ لەوێوە دێ و دەرگایەکیشـیان کار و ئاکاری مرۆڤ لەوێوە هەڵدەکشـێ بەرەو ئاسـمان. هەتا مرۆڤ نەشمرێ، دەرگای بژێویشی نابەسترێ. دەرگای کار و ئاکاریشی نابەسترێ هەتا ڕووحی هەڵنەکشـێ.' ' مەلا گوتی: 'کەنیزەکە، پێم بڵێ شـت چییە و نیوەشـت چییە؟' کەنیزە گوتی: 'شـت ئیمانداره و نیوەشـتیش دووڕووە و ناشـتیش کافرە.' مەلا گوتی: 'باسـی دڵم بۆ بکە.' کەنیزەکە گوتی: 'دڵێک هەیە ساغ و سـەلیمە. دڵێک هەیە ڕەش و ڕەق و تاریکە. دڵێک هەیە هێور و خوداییە. دڵێک هەیە هەمیشـە وریا و ئاگادارت دەکاتەوە. دڵێک هەیە نوورانییە. دڵی ساغ و سەلیم دڵی دۆستانی خودایە. دڵی ڕەش و ڕەق و تاریک دڵی کافرانە. دڵی هێور و خودایی دڵی پەرواکاران و دڵی وریا و ئاگادارکەرەوە دڵی پێغەمبەرانە و دڵی نوورانی و گەش دڵی شوێنکەوتووانی ئەوانە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. واتە: "ئاسمان دەقەڵەشێ و هەر قەڵەشتێک دەرگایەکە."

## که شەوی چوارسەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، مەلا گوتی: 'زۆر زۆر باشـــە.' ئەوجار کەنیزەکە گوتی: 'گەورەم خەلیفە، ئەو مەلایە ئەوەندەی پرسیار لێ کردم بۆخۆی ماندوو بووە. منیش دوو پرسیاری لێ دەکەم، ئەگەر نەیزانی عەبـاکەی لە بەر دادەکەنم.' مەلا گوتی: 'کەنیزەکە، هەرچیم لێ دەپرسی بپرسە.' کەنیزە لێی پرسی: 'باوەڕ چییە؟' مەلا گوتی: 'باوەڕ ئەوەیە بە زمان دانی پێدا بنێی و بە گیان بیسـەلمێنی و کار بە بنەماکان بکەی. پێغەمبەر(د ـــ س) فەرموویەتی: 'باوەڕی مرۆڤ تەواو نابێ هەتا پێنج تایبەتمەندیی تەواو نەبێ: پشـــتبەســـتن بە خودا، سپاردنی کارەکان بە خودا، ڕازیبوون بە ڕەزای خودا و خۆشحاڵبوون بەو کارانەی ئەو بە ســـەرت دێنێ و بۆی دیاری کردووی. هەرچی دەیکەی هەر لە ڕێی خودا و بۆ ڕەزایەتی ئەو بێ، ئەودەم باوەڕی مرۆڤ تەواو دەبێ.' ' کەنیزە گوتی: 'واجبترین فەرز کامەیە؟ کام فەرزە لەپێش هەموو فەرزەکانەوەیە؟ کام فەرزە فەرزەکانی دیکە هەموو پێویستیان بەوە؟ کام فەرزە تەواوی فەرزکانی دیکەش دەگرێتەوە؟' مەلا بێدەنگ بوو، وەڵامی پێ نەدراوە. ئیدی خەلیفە بە کەنیزەکەی گوت: 'دا بۆی شـــی کەوە.' بە مەلاشـــی گوت: 'دایەی ئەو جلە مەلایانە داکەنە و بیدە بەو کەنیزە.' ئینجا کەنیزەکە گوتی: 'مەلا، واجبترین فەرز ناســـینی خودایە. ئەو فەرزەی لەپێش هەموو فەرزێکەوەیە 'أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمدا رسول الله'یە. فەرزێک کە هەموو فەرزەکان پێویستییان پێیەتی دەستنوێژە و ئەو فەرزەش کە هەموویان دەگرێتەوە غوسڵی لەشگرانییە.'

"کە کەنیزەکە شـیکردەنەوەکەی تەواو بوو. مەلا هەسـتا و گوتی: 'خەلیفە، تۆ شـایەد بە کە دانی پیـا دەنێم ئەو کەنیزە لە من زانـاترە.' ئینجا عەبـاکەی داکەنـد و بە دۆڕاوی لە کۆڕەکە چووە دەرێ. ئەوجار قورئانخوێن هەسـتا و ڕووبەڕووی کەنیزەکە دانیشـت و لێی پرسـی: 'ئەی قورئانت خوێندووە؟ شـارەزای ئایاتەکانی هەی؟ دەزانی ناسـخ و مەنسـووخ چییە؟ موحکەم و موتەشابیهـ مەککی و مەدەنی لێک جودا دەکەیتەوە؟' وەڵامی داوە: 'بەڵێ تێیدا شـــارەزام.' ئینجا قورئانخوێن گوتی: 'پێم بڵێ قورئان چەند ســـوورەی هەیە؟ چەند دەیییە؟ چەند ئایەتە و چەند پیتە؟ چەند ســـوجدەیە؟ ناوی چەند پێغەمبەری تێدا هاتووە؟ ســـوورەکانی قورئان چەندیان مەدەنین و چەندیان مەککین؟ لە قورئاندا ناوی چەند مەل و مێروو هاتووە؟' کەنیزەکە گوتی: 'گەورەم، ســـوورەکانی قورئان ســـەد و چواردە دانەن. حەفتایان مەککی و چلوچواردانەشیان مەدەنین. دەیییەکانی قورئانیش شەشسەد و بیست و یەک دانەن. ئایەتەکانی قورئانیش شەشهەزار و دووسەد و سی و شەش ئایەتن. قورئان حەفتا و نۆهەزار و چوارسەد و سی و نۆ وشەیە و پیتەکانی قورئانیش سێسەد و بیست و نۆهەزار و شـــەشســـەد و حەفتا پیتن. خوێنەری قورئان هەر پیتێکی بە دە چاکە بۆ

دەنووسن. سوجدەکانی قورئانیش چواردە دانەن.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دوای ئەوە کەنیزەکە درێژەی دا و گوتی: 'پێغەمبەرەکانیش کە ناویان لە قورئاندا هاتووە، بیســـت و پێنج پێغەمبەرن و ئەمانەن: ئادەم، نووح، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یووسف، ئیلیەسەع، یوونس، لووت، سالح، هوود، شوعەیب، داوود، سولەیمان، زولکیفل، ئیدریس، ئیلیاس، یەحیا، زەکەریان، ئەیووب، مووسا، هارِوون، عیسا و محەممەد(د ـ س).

" 'ئەو مێروو و باڵندانەی لە قورئاندا ناویان هاتووە نۆ دانەن: 'مێشـووله، هەنگ، مێش، مێرووله، پەپووسلێمانە، قەلەڕەش، کولله، پەڕەسێلکە، شەمشەمەکوێرەن.'

"قورئانخوێن گوتی: 'بارەکەڵڵا! کەنیزە، پێم بڵێ گەورەترین ســـووڕەی قورئان کامەیە؟' کەنیزە گوتی: 'ســـووڕەی بەقەرەیە.' پرســـی: 'کـام ئـایە گەورەترە؟' وەڵامی داوە: 'ئایەتەلکورسـی ئەو ئایەتەیە پەنجا وشـــەیە و هەر وشـــەیەکیش پەنجا جۆر خێر و فەڕی لەگەڵە.' قورئانخوێن پرســـی: 'کام ئایەتەیە کە نۆ نیشـــانەی تێدایە؟' وەڵامی داوە: 'خودای بەرز و بێهاوتان دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾
البقرة: ١٦٤

واتا: ﴿ بێگومان لە دروست کردنی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە، ئەو ئاسمانە فراوانو مانگو خۆرو ئەســتێرانە، ئەو جیهانە زانراوو نەزانراوە، ئەم ڕێکو پێکییەی کە لە تەوەرەی ئەســـتێرەکاندا هەیە، ئەو هاتوچۆو هەڵســـوڕانو خولانەوەی کە ئەنجامی دەدەن بەو شـێوە سـەرسوڕهێنەرە. هەروا گۆڕانی شـەو ڕۆژو هاتنی یەک بەدوای یەکیاندا، شـەو دێو ڕۆژ دەڕوا، ڕۆژدێو شـــەو دێتە شـــوێنی، ئەم ئاڵو گۆڕییەی تاریکیو ڕووناکی، خۆرهەڵاتنو تـاریکی داهـاتن، ســـپێدەی بەرەبەیـانو تـاریکی دوا خۆرئـاوابوون، ئەمـانە هەموویـان ســـەرســـوڕهێنەرو موعجیزەن، بەڵام دووبـارە بووونەوەیـان وای کردووە، ئادەمیزاد بەلایەوە شـتێکی ئاسـایی بێو لە ئاسـتیاندا سـەری سـوڕ نەمێنێ. ئەو کەشـتیو گەمییانەی لە دەریادا دێنو دەچن، ئەو هەموو شـــتومەکو کاڵایەیان پێ دەگوێزرێتەوەو ئادەمیزادەکان لێیان ســـودمەند دەبن. هەروەها ئەو ئاوی بارانەی کە خودا لە بەرزاییەوە

بۆ ئێوەی دەبارێنێ. بەو بارانە پەروەردگار زەوی مردوو ســـوتەمەڕۆی زیندوو کردەوە، گیـاو گژو رووەکی تێدا رواند، هەر بە هۆی ئەو بـارانەوە ئـادەمیزادو گیـانلەبەرانی تر دەتوانن درێژە بە ژیان بدەن لە ناو زەویدا لە هەموو جۆرە گیانلەبەرێکی بڵاو کردۆتەوە، هەر وڵاتێک بـارانی لێ نەبـارێ‌و چۆمو روبـاری بەنـاودا رەوان نەبێ نە گیـاو گژی تێدا دەڕوێ‌و نە گیـانلەبەری تێدا دەژی. هەروەهـا گۆڕانی (بـا) بەرەو خۆرهەڵاتو خۆرئـاوا بەرەو باکورو باشوور، جارێک گەرمو جارێک سارد، دەمێک بەهێزو کاتێک بێ هێز، تاوێک گێژەڵوکەو زریان، ماوەیەک شـــەماڵو نەســـیم، هەندێک جار تەلقیحو تۆم پڕژاندن ئەنجام دەدا کاتێکیش نەزۆکو بای وەشـــتی یە. ئەو هەورەی ملکەچ لە نێوان ئاســـمانو زەویدا وەســـتاوە بۆ ئەوەی بەفەرمانی خودا باران بەســـەر وڵاتاندا ببارێنێ، لەم شـــوێن بۆ ئەو شـــوێن (بـا) راپێچی دەکـا، پەروەردگـار چۆنی بوێ ئـاوا بـاران دەبـارێنێ، ئەم دیـاردە سروشتیانەی باس کران هەموویان نیشانەو بەڵگەن لەسەر هەبوونو بە توانایی خودایەکی بەدیهێنەرو زاناو کار دروســـت، هەموویان بەڵگەو رێ نیشـــاندەرن بۆ گەلو نەتەوەیەک خاوەنی عەقڵاو هۆش بن﴾.

قورئانخوێن گوتی: 'زۆر زۆر باشە، ئافەرین. ئەی کام ئایەتە دادگەرترە؟' کەنیزە گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ * إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ۝٩٠ ﴾ النحل: ٩٠

واتـا: ﴿پەروەردگـار لەم کتێبەدا کە بۆ تۆی نـازڵ کردوە ئەی پێغەمبەر! فەرمـان بەبەندەکانی دەکا: بەشێوەیەکی گشتی عەداڵەتکاری‌و ویژدان بەکار بێنن لەهەموو شتێکدا؛ لەمامەڵە کردنو دادگایی کردنو فرمانڕەوایی‌و هەڵسو کەوتی رۆژانەتاندا، لەبیرو باوەڕو خوداپەرستی‌و هەڵسو کەوتکردن لەگەڵ خۆتانو غەیری خۆتاندا! واتە: خودا فەرمان دەکا بەبەندەکانی کە یارمەتی خزم و کەسو کاریـان بدەنو مـاڵیان پێ ببەخشـــن. کەوابوو بەشێکی گرنگ لەئیحسان ئەوەیە چاکە لەگەڵ خزمو کەسوکار بکەی، جا چاکە کردنەکە بە هاتوچۆو دیدەنی کردنیان بێ، یان بە یارمەتیدانو ماڵبەخشـــین بێ پێیان. هەروەها نەهی دەکا لەداوێن پیسـی‌و کاری ناسـروشتی‌و سـتەمکاری. وشـەی (الفحشـاو) هەموو کارێکی ناشیرینو سنوور شکێنی دەگرێتەوە، وەلێ زوربەی کات تایبەت دەکرێ بەداوێن پیسییەوە بۆ دەست درێژ کردن بۆ سـەر ناموسـی خەڵک، بەکاردێندرێ! وشـەی (المنکر)یش هەموو کارێکی ناسروشتی‌و ناشیرین دەگرێتەوە، هەر شتێک سروشتی سەلیم بەناشیرینی بزانێ شـــەرعیش بەناشـــیرنی حلێب دەکا، وشـــەی (البغی) بەمانا ســـتەمکاری‌و لادان لەحەق‌و

عەداڵەتە. پەروەردگار ئامۆژگاریتان دەکا بەڵکوو بیر بکەنەوە تێبفکرن، بەخۆتاندا بچنەوە، بەگوێرەی سروشتی سەلیم هەڵسو کەوت بکەن، نەهێڵن فایرۆسی روخێنەر تووشی کۆمەڵگای ئادەمیزاد بێ﴾ .

ئینجا پرسی: 'کام ئایەتە باسی بەتەماعترین دەکا؟' کەنیزە گوتی: 'خودای گەورە دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ أَيَطْمَعُ كُلُّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ المعارج: ٣٨

واتا: ﴿ ئایا ئەو موشریکانە بەتەمان وێڕای ئەو هەڵوێست و بیرو باوەڕە ناپەسەندەیان و هەڵسەڵەمینەوە لە قورئان و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرو هەڵهاتن لەحەق. و راستی بەتەمان بچنە ناو بەهەشتەوە ؟! حاشا وە کەلَّلا؛ ئەوانە شوێنیان دۆزەخەو تورِ دەدرێنە ناوی بۆ هەتا هەتایە﴾.

قورئانخوێنەکە گوتی: 'کام ئایەتە هیوابەخشترە؟' کەنیزە وەڵامی داوە: 'خودای بەرز و مەزن دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر: ٥٣

واتا: ﴿ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: ئەی بەندەکانی خودا ئەوانەی زێدەڕەوییان کردووە لەتاوانکردن و سەرپێچیکاری فەرمانی خودا، هەرگیزاو هەرگیز لە رەحمەتی خودا نائومێد مەبن، ئەی تاوانباران لە لێخۆشبوونی خوا نائومێد مەبن. چونکە بێگومان خودا لە هەموو تاوانێک خۆش دەبێ. مەگەر هاوەڵدانان بۆ خوداو لێشی ژیوان نەبیتەوە﴾.

قورئانخوێنەکە گوتی: 'بژیبیت، زۆر زۆر باش بوو. پێم بڵێ تۆ بە شێوازی کێ قورئان دەخوێنیتەوە؟' لە بەرسڤدا گوتی: 'بە شێوازی بەهەشتییان کە زۆر کاریگەرە.' دیسان پرسی: 'لە کام ئایەتدا درۆ لەگەڵ پێغەمبەران کراوە؟' کەنیزە گوتی: 'خودا دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًاۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ يوسف: ١٨

واتا: ﴿هەر بۆ چەواشـەکاریو چەسـپاندنی فێڵەکەی خۆیان، ئاسـکێکیان سـەربڕیو بەدرۆ خوێنی ئاسکەکەیان لەکراسی یوسف هەڵسوو بەنارێکو پێکی کراسەکەیان خوێناوی کردو وایان نیشـان دا: کە ئەم کراسـە ئەوەیە: کە گورگەکە یوسـفی تێدا خواردووە، بەڵام ویستی خودا وابوو: کە دەبێ شوێندەستی تاوانەکەیان دەربکەوێ، فێڵەکەیان ئاشکرا ببێ، ئەوەیان لەبیر چوو کە هەندێک کراسەکە بشێوێنن، بیدڕێنن، بیهەنجنن، چونکە ئەگەر گورک بیخواردایە دەبوایە کراسـەکە بدڕایەو ونجڕ ونجڕ ببوایە: بەڵام مەیدانی درۆ کورتەو زۆر ناخایەنێ. یەعقوبی باوکیان پێی گوتن بەڵکوو ئەوە دڵ و دەروونی ناپاکتان ئەمەی پێ کردونو کارێکی وا ناپەسندی پێ ئەنجام داون، ئەوەی دەیڵێن لەراستییەوە دوورەو عەقڵ وەری ناگرێ! صـەبر دەگرم، صـەبری جوانو پەسـند بۆمان باشـەو ئەوە چەکی خاوەن باوەڕانەو ئارام دەگرم، پشـت بەخودا دەبەسـتم، چاوەڕوانی دەرووی رەحمەتم، خودا یارمەتیدەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەنو بۆمی دەگێڕنەوە لەم هەواڵە دڵتەزێنە﴾.

ئەوان براکانی یوسـف بوون.' مەلاکە گوتی: 'کام ئایەتەیە کافران تێیدا ڕاسـتیان گوتووە؟' کەنیزەکە گوتی: 'خودای مەزن دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ البقرة: ١١٣

واتا: ﴿جولەکە (وتیان) دەڵێن: نەصرانیەکان لەسەر ئاینی حەق نین ئەو ئاینەی ئەوان پەیڕەوی دەکەن بێ بناغەیەو هیچ سـەرچاوەیەکی نییە لەبەرامبەردا نەصـرانیەکان گوتیان: جولەکەکان لەسـەر هیچ ئاینێکی حەق نینو دینەکەیان بەتاڵە. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەوانە کتێب دەخوێننەوە؛ جولەکە تەورات دەخوێنن، لەوێدا موژدەی هاتنی حەزرەتی عیسـای تێدایە، گاورەکانیش ئینجیل دەخوێننەوە باسـی ئاینی جولەکەی تێدایە. عەرەبە خوانەناسو هاوبەش پەیداکەرەکانیش هەر ئاوایان گوتو هەمان بیرو بۆچونیان هەبوو، دەیانگوت: (محمد) ئاینەکەی بێ بنەماو سەرچاوەیە، قسە بۆشو بێ بناغەکەی جولەکەو گاورەکانیان دەجوێتەوە. پەروەردگار رۆژی قیامەت موحاکەمەی نێوانی جولەکەو گاورەکان دەکا، بیرو بۆچوونەکانیان دەربارەی ئاین یەکالا دەکاتەوەو سزای شیاویان بۆ دیاری دەکا﴾.

ئەوان هەردووکیان ڕاستیان دەگوت.' مەلا قورئانخوێنەکە گوتی: 'کام ئایەتەیە خودا بۆ خۆی گوتووە؟' کەنیزە وەڵامی داوە: 'خودای لەســەر دەفەرمووێ: 'وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون.'[١]' قورئانخوێنەکە پرسی: 'ئەی کام ئایەتە قسەی فریشتەکانە؟' کەنیزەکە گوتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٣٠﴾ البقرة: ٣٠

واتا: ﴿ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەســەر بێ) ســەر گورشــتەی دروســتکردنی ئادەمیزاد بۆ خەڵک باس بکە، کاتێ خودای تۆ بە فریشــتەکانی ڕاگەیاندو فەرمووی: من دەمەوێ لەسەر زەوی جێنشینێ دابنێم زەوی ئاوەدان بکەنەوە، لەجیاتی من لەناو مەردومدا دادپەروەرانە حوکم بکا فریشتەکان وتیان: خودایە! تۆ چ مەبەستێکت لە دروستکردنی ئەو جۆرە بەندانە هەیەو بۆچی کەســانێک دەخەیە ســەر زەوی کە ئاشــووبی تێدا بگێڕنو خوێنڕێژی تێدا پەیڕەو بکەن؟ ئەگەر مەبەســت لە دروســتکردنی ئەو جۆرە مەخلووقە پەرســتنی زاتی پیرۆزو بەرزتە: ئەوە ئێمە هەموو دەم ســەرگەرمی پەرســتنی تۆینو تەقدیست دەکەین هەرگیز سەرپێچی کردنو ئاشووب نانەوەو خوێن ڕشتنمان لێ ڕوو نادا. دەی کەوابێ بۆچی گرۆهی تر دروســت دەکەی؟ پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن. من دەزانم: کە بەرژەوەندیەکی باڵا هەیە لە دروســتکردنی ئەم جۆرە گرۆهەو ئەوە بەرژەوەندییەکی باڵاترە لەو ئاشــووبو تاوانانەی کە برێکیان بەرپای دەکەنو ئێوە دەیکەن بە پاســاوو لەمپەڕ بۆ ئەوەی من لەو کارە وازبێنم! من لەناو ئەو گرۆهەدا پێغەمبەرانو ڕاستگۆو شەهیدو خوداپەرستی ڕاستاڵ دروست دەکەم﴾.

مەلاکە گوتی: 'باسی 'أعوذ بالله من الشيطان الرجيم'ــم بۆ بکە و ئەو شتانەی تێیدایە، بۆم شی بکەوە.' کەنیزەکە گوتی: 'هـانـابردن بۆ خودای گەورە ئەرکە و فەرمـانی داوە لە کـاتی خوێندنەوەدا هانای بۆ بەرین. بەڵگەش خودی فەرمایشی خودای گەورەیە:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ۝٩٨﴾ النحل: ٩٨

واتا: ﴿هەر کاتێ ویستت ئەی پێغەمبەر! ئەی ئادەمیزادینە! هەر کاتێک ویستتان قورئان بخوێننەوە، پەنا بگرن بەخودا لەوەســوەســەو ختوکەی شــەیتانی نەفرین لێکراو، داوا بکە خودا بتانپارێزێ لەهەموو کارێک کە شەیتان پێی خۆش بێت﴾ .

---

١. واتە: " جنۆکە و مرۆمان بۆ پەرستن نەبێ، بۆ هیچی دی نەئافراندوون." ئایەتی ٥٦ی سوورەی زاریات.

مەلای قورئانخوێن گوتی: 'پێم بڵێ ئیستعازە کامەیە؟' کەنیزە گوتی: 'هێندێک گوتوویانە: 'أعوذ بالله القوي'ـــە. وا باشتریشە هەر ئەوەی قورئانی پیرۆز دەیڵێ و لە فەرموودەدا باسی کراوە کە هەر کاتێک پێغەمبەر(د ـــ س) قورئانی دەکردەوە تا بیخوێنێتەوە، دەیگوت: ' أعوذ بالله من الشـيطان الرجيم.' لە نافیع دەگێڕنەوە کە ئەویش لە زمانی باوکیەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر هەر کاتێک ڕادەوەستا بۆ نوێژ، دەیگوت: ' الله اكبر كبيراً و الحمد لله كثيراً و سبحان الله بكره و اصيلا.'[١] دوای ئەوە فەرمووی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾ النحل: ٩٨

لە ئیبنوعەبباس دەگێڕنەوە: یەکەم شــت جوبرەئیل بۆ پێغەمبەری هێنا، اســتعاذە بوو. واتە پەنابردنی فێر کرد و پێی گوت: 'محەممەد، بڵێ: ' اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم.'[٢] دوای ئەوە بڵێ: ' بسم الله ارحمن الرحيم.' جا دوای ئەوە:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق: ١

واتا: ﴿ئەی محمد! بخوێنە بەناوی خودای خۆت، ئەو خودایەی هەموو شــتێکی بەدی هێناوە، هەموو شتێکی دروست کردووە﴾.

کاتێک مەلا قسـەکانی کەنیزەکەی بیسـت، سـەری لەو هەموو زانایییە سـوور ما. دوای ئەوە گوتی: 'کەنیزەکە، لە بارەی بیسـمیللاوە چی دەڵێی؟ گەلۆ یەکێک لە ئایەتەکانی خودایە یان نا؟' کەنیزە گوتی: 'بەڵێ لە سـوورەی نەمل و لە ناوەڕاسـتی سـوورەتەکەدا ئایەتێکە لە قورئان و لەنێو زانایانی دیندا لەسـەر بیسـمیللا کێشـەیەکی زۆر هەیە.' مەلا قورئانخوێنەکە گوتی: 'زۆر باشە. کەنیزەکە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. واتە: "خودا لە گەورەییدا گەورەترینە و شــیاوی پەرســتنی زۆرە و هەموو بەیانی و ئێوارەیەک هەر بە پاکی دەزانم."

٢. واتە: "پەنا بۆ خودای زۆر بیسەر و زانا دەبەم."

# که شەوی چوارسەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، مەلاکە گوتی: 'زۆر باشـە. کەنیزەکە، ئێسـتا تۆ باسـی گەورەیی و خێر و بەرەکەتی 'بسم الله الرحمن الرحیم'ـم بۆ بکە.' کەنیزەکە گوتی: 'پێغەمبەر(د ــ س) فەرموویەتی: 'هەر کارێک بە 'بسم الله الرحمن الرحیم' دەست پێ بکەی، بە مسۆگەری خێر و بەرەکەتی بەدواوە دەبێ.' هەروەها دەفەرمووێ: 'خودا سـوێندی خواردووە کە هەر نەخۆشێک 'بسم الله الرحمن الرحیم'ـی بەسەردا بخوێنی، بە مسۆگەری چاک دەبێتەوە.' دەڵێن کاتێک خودا عەرشـی درووسـت کرد، ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر کەوتە عەرشـەوە. کە خودا 'بسم الله الرحمن الرحیم'ـی بەسەردا خوێند، دامرکایەوە. کاتێک 'بسم الله الرحمن الرحیم' بۆ پێغەمبەر هات، فەرمووی: 'سێ خەمم لە کۆڵ بووەوە. «خەسف» واتە ڕۆچوون و نغرۆ بوون بە زەویدا. «مەسـخ» واتە گۆڕانی بیچم و ڕواڵەت بە تایبەت چوونە بیچمی ئاژەڵەوە و نوقم بوون.' هەروەها خێر و فەڕێکی زۆری پێوەیە کە باسـکردنی لێرەدا زۆر دەگرێتەوە. لە پێغەمبەرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: 'ڕۆژی ڕەسـتاخێز پیاوێک دێننە دادگای خوایی و لێی دەپرسـنەوە. ئەویش دەڵێ: 'خودایە، بە ویژدانەوە لەگەڵم بجووڵێوە.' خودای تەعالا دەفەرمووێ: 'چۆن بە ویژدانەوە؟' ئەویش دەڵێ: 'ئەی بەدیهێنەری من، تۆی ناوی خۆت ناوە 'الرحمن و الرحیم' و منیش لە ئاوردا دەسـووتێنی؟' ئینجا خودای مەزن دەفەرمووێ: 'ئەو بەندەیەم ڕاسـت دەکا. من دەڵێم ڕەحمان و ڕەحیمم، کەوایە بیبەن بۆ بەهەشت، چونکە من 'الرحم الراحمین'یشم.' ' '

"کە قورئانخوێنەکە زانی کەنیزەکە هەموو شـتێک دەزانێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خودا دەبێ کارێک بکەم بەسـەریدا زاڵ بم.' هەر بۆیە گوتی: 'کەنیزەکە، پێم بڵێ خودا قورئانی لەسـەر یەک نارد یان پچڕپچڕ؟' کەنیزە گوتی: 'جوبرەئیلی دەسـتپاک قورئانی لە ماوەی بیسـت ساڵدا لە لای خودای ئاسمان و زەوییەوە هێنا بۆ حەزرەتی محەممەد —گەورەی پێغەمبەران.' مەلا گوتی: 'بژیت، زۆر باشـە. پێم بڵێ یەکەم سـوورە کە بۆ پێغەمبەر هاتە خوارەوە چ سـوورەیێک بوو؟' کەنیزەکە گوتی: 'بە قسـەی عەبباس سـوورەی عەلەقە و بە قسـەی جابر کوڕی عەبدوڵلاش سـوورەی موددەسـسیرە.' قورئانخوێن پرسـی: 'دوایین ئایەت کامەیە؟' کەنیزەکە گوتی: 'دوایین ئایەت کە بۆ پێغەمبەر(د ــ س) هاتە خوارێ ئایەتی سوو بوو. دەشڵێن:

قَالَ تَعَالَى:﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ ﴾ النصر: بووە.

واتا: ﴿ئەی محمد! هەرکاتێ بەسەر دوژمنە قورەیشییەکانتدا زاڵ بووی‌و یارمەتیدانی خودات بۆ دەستەبەر بوو، شاری مەککەت بۆ ڕزگار کراو باڵادەست بووی﴾.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كه شەوی چوارسەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشكۆ، كه كەنیزەكه وەڵامی دواپین پرسیاریشی داوە، قورئانخوێن گوتی: 'ئافەرین، زۆر زۆر باش بووی. دا دەی پێم بڵێ ئەو قورئانخوێنە پێشـــەنگانەی كه وەك سـەرچاوە و پێشـــەنگ چاویان لێ دەكرێ كێن؟' كەنیزەكه گوتی: 'ئەوانە چوار كەســـن: ئیبن‌ئەبی‌كەعب، مەعازی كوڕی جەبەل، ســـالمی كوڕی عەبدوڵلا و عەبدوڵلای كوڕی مەســـعوود.' قورئانخوێن گوتی: 'لە بابەت ئەو فەرمایشـــتەی خودای تەعالا دەڵێی چی كه دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة: ٣

واتا: ﴿ یاســـاغە لێتان خواردنی گۆشـــتی مردارەوە بوو، مردارەوە بوو: بریتیە لەو ئاژەڵەی بەبێ ســـەربڕینی شـــەرعی، یان نێچیر كردنی گیانی دەردەچێ، خواردنی گۆشـتی مردارەوە بوو حەرامە، چونكه پیسە، هەروەها چونكه هەندێ ماددەی زیانبەخش لە لاشەی مرداربووەكەدا دەمێنێتەوە، كه بەهۆی نەخۆشـــی ئاژەڵەكە، یان مانەوەی خوێن تێیدا پەیدا بووە، ئەگەر ســـەر ببڕێ بەهۆی ڕەوان بوونی خودێنەكە ئەو ماددە زیانبەخشـــە، نامێنێ، زیادلەوەش تەبیعەتی بەرزو خاوێن قیز لە خواردنی ئەو جۆرە گۆشـــتە مردارەوە بووە دەكاتەوە، تەبیاتی تێ ناچێ! هەروەها یاســـاغە لێتان خوێنی ڕەوان ئەو خوێنەی ڕوونەو دەڕژێ نەك خوێنی تۆپەڵ بوو (متجمد) وەكوو جەرگو ســپڵ، یان ئەو خوێنەی كه لەگەڵ گۆشـــتەكەدا دەمێنێتەوە؛ هەروەها حەرامە لێتان خواردنی پێســـتو گۆشـــتو پیوی بەراز، بۆیەش هەر ناوی گۆشـتەكەی هێناوە چونكه ئەو مەبەسـتی گرنگە! هەروەها حەرامە لێتان هەر سەربڕاوێك كه ناوی غەیری خوای لەسەر برابێ، لە كاتی سەربڕیندا ناوی شتی تری لەســـەر بەرز كرابێتەوە وەكوو ئەوەی ناوی پێغەمبەر، مەسـیح، شـێخی گەیلانی، مەولانا خالیدو كاك ئەحمەدی شێخو....... هتد لەسەر ببڕێ. یان وێڕای ناوی خودا ناوی كەسێكی تری لەسەر ببڕێ وەكوو ئەوە بڵێ (بەناوی خوداو پێغەمبەر ئەو ئاژەڵە سەردەبڕم!) بەڵام ئەگەر بڵێ بە ناوی خودا ئەم ئاژەڵە ســـەردەبڕم، (محمد پێغەمبەری خودایە) قەیناكا، واتە:

ئەگەر ناوی غەیری خودا بە عەگف بۆســـەر ناوی خودا یان پێش ناوی خودا خرا ئەوە حەرامی دەکا، ئەگەر بە شێوەی عەگف نەبوو حەرام نابێ بەڵام مەکروە دەبێ. هەر ئاژەڵێک بخنکێندرێ، جا خنکانەکەی بە ئەنقەست بێ یان بە سودفە بێ، بە هەر شێوەیەکو بەهۆی هەر شــتێکەوە بخنکێ گۆشــتەکەی حەرام دەبێ. ئەو حەیوانەی بە شــتێکی کوشــندە لێی دەدرێ تا گیانی دەردەچێ بەبێ سەربڕینی شەرعی، جا ئەو شتە پێی لێ دەدرێ قۆچەقانی بێ یان هەر داروبەردێکو شـــتێک بێ چوون یەکەو ئەو گیان دەرچووە مردارەوە بووەو خواردنی گۆشـــتەکەی حەرامە. هەر ئـاژەڵێک هەڵـدێرێو بەربیێتەوەو گیـانی دەرچێ گۆشـــتەکەی حەرام دەبێ! ئەگەر پێش گیان دەرچوونی فریا بکەوێ ســـەر ببڕدرێ ئەوە حەڵاڵە! هەرحەیوانێـک لە ئـاکـامی شـــەڕ کردن لەگەڵا حەیوانێکی تردا گیـانی دەربچێ مردارەوەبووەو خواردنی حەرامە، تەنانەت با شاخی بشکێ لوتی بپژێو خوێنیشی لێ بێ! هەر حەیوانێک دڕندە برینداری بکا یان هەندێکی لێ بخواو گیانی دەربچێ خواردنی گۆشتەکەی حەرامە هەرچەندە خوێنیشی لێ بڕوا. مەگەر ئەو جۆرە حەیوانانەی کە گوتران بە زیندوویی فریایان بکەونو سەریان ببڕن بە شێوەیەکی شـەرعی. بەڵام مردارەوە بوو، خوێنو گۆشتی بەراز بە هیچ شتێک حەڵاڵ نابن. مەگەر ناعیلاجی!؟ (نصب) چەند بەردێک بوون بە دەوری کەعبەوە ژمارەیان ســێ ســـەدو شـــەســـت بەرد بوون عەرەبەکان لە ســەردەمی نەزانیدا ئاژەڵیان لەســەر ســەردەبڕین بە مەبەســتی نزیک بوونەوە لە بتەکان کە دەیانپەرســتن. خوێنەکەیان لە دیواری کەعبە هەڵدەســوو، گۆشــتەکەیان بەســەر بەردەکان (نصـــب) هەڵدەخســـت ئەم بەردانە جوودا بوون لە بتەکانیان، بتەکانیان نەقشو نیگاریان لەســـەر بوو ئەم (نصـــب)و بەردانە لووسو پووس بوون. حەرامە لێتان بەخت گرتنەوەو رەمڵ هاویشــتن بە هۆی تیرەدارینەوە. بریتی بوو لەچەند دارێک لە شــێوەی تیر، بەڵام بێ ئەوەی سەرەتیری پێوە بێ، ئەم پارچە دارانە سێ پارچە بوون لەسەر یەکیان نووسرا بوو (أمرني ربي) لەسەر دووەمیان نووسرا بوو (نهاني ربي) سێیەمیش هیچی لەسەر نەنووسرا بوو. جا کە کەســـێک دەیویســـت ئیشـــێک بکا؛ بچێ بۆ ســـەفەرێک ئەم تیرە دارانەی دەجووڵاندنو دوایی یەکێکیانی رادەکێشا ئەگەر ئەوە بهاتایە دەستی، کە لەسەری نووسرا بوو (أمرني ربي) ئەوە ئیشـەکەی دەکردو پێی وا بوو بەخت هاوڕێیەتی ئەگەر ئەوە بهاتایە پێشـەوە کە لێی نووسـرا بوو (نهاني ربي) وازی لێ دەهێناو دەسـتی لێ هەڵدەگرت! ئەگەر ئەوە بهاتایە دەســـتی کە هیچی لەســـەر نەنووســـرا بووئەوە تاقی کردنەوەکەی دووبارە دەکردەوە. هەموو ئەو شـــتە حەرامانەی باســـکران پێویســـتە خۆیان لێ دوور بخەینەوە، چونکە دەرچوون لە ســـنووری خودا، ســـەرپێچی کردنی فەرمانەکانیەتی، هەڵسوکەوت کردنە بە شــێوەی نامەعقولو نا ســروشــتی. ئەمڕۆ کە ڕۆژی عەرەفەیەو ســاڵی دەیەمی کۆچییە رێکەوتی ڕۆژی جومعەیە، ئەو ڕۆژەی کە ئەم ئایەتەی تێدا هاتۆتە خوارێ، ئەمڕۆ کافرەکان ناهومێد بوون لە پووچەڵا کردنەوەی ئایینەکەتانو ناتوانن ئیتر بەســـەرتاندا زاڵا

ببن‌و بتانگێڕنه‌وه بۆ سـه‌ر بتپه‌رسـتی‌و ئایینی خۆیان، هه‌روه‌ها شـه‌یتان ناهومێد بوو که له ئاخی ئێوه‌دا به قسـه‌ی بکرێ! ئیبنو عه‌بباس ده‌ڵێ: واته: دانیشـتوانی مه‌ککه ناهومێد بوون له‌وه‌ی که ئێوه بگه‌ڕێنه‌وه بۆ سـه‌ر ئایینی ئه‌وان‌و بتپه‌رسـتی ده‌سـت پێ بکه‌نه‌وه. لێیان مه‌ترسێن، ترسی ئه‌وه‌تان نه‌بێ که سه‌رپێچییان بکه‌ن، زیانتان پێ بگه‌یه‌نن له من بترسێن، خۆتان بپارێزن له‌و شتانه‌ی ده‌بنه هۆی ناڕه‌زامه‌ندی من، ئه‌من یارمه‌تیتان ده‌ده‌م‌و سه‌رتان ده‌خه‌م، له دونیـاو له قیامه‌تدا ده‌تانخه‌ینه ژوور ئه‌وانه‌وه. ئه‌مڕۆ ئه‌حکامی ئـایینمـان بۆ چه‌سپاندن، حه‌ڵاڵ‌و حه‌رامان بۆ لێک جیا کردنه‌وه، هه‌موو حوکمێکی پێویستمان بۆ دیاری کردوون، هه‌موو شتێک ده‌رباره‌ی ئایین روون‌و ئاشکرایه‌و په‌رده پۆش نین. هه‌موو یاساو نیڤامیکمان بۆ داناون‌و که‌م‌و کوڕی تێدا نیه. منه‌ت‌و به‌خششی خۆمانمان به‌سه‌رتاندا ته‌واو کرد وڵات بۆ ئێوه قۆرخ کراوه، هیچ له موشـــریکه‌کان بۆی نیه هاوبه‌شـــیتان بکا له حه‌ج کردندا، مه‌ککه رزگار کرا، ئه‌و واده‌یه‌ی پێتان درابوو به‌جێ هێنرا، خه‌ڵکی کۆمه‌ڵا کۆمه‌ڵاو ده‌سته ده‌سته دێنه ژێر به‌یداخی ئیسلامه‌وه‌و سه‌رکه‌وتنتان به‌ده‌ست هێنا رازیم که ئیسلام ئایینتان بێ‌و بیکه‌نه به‌رنامه‌ی ژیانتان‌و رۆژی قیامه‌تیش به گوێره‌ی ئه‌م ئایینه دادگایی ده‌کرێن، جگه له ئیسلام نابێ هیچ ئایینێکی تر په‌یڕه‌و بکه‌ن﴾.

که‌نیزه گوتی: 'ئه‌و بتانه بۆیه له‌وێ چه‌قێنراون تا بیانپه‌رسـتن.' مه‌لاکه گوتی: 'له‌باره‌ی ئه‌و فه‌رمایشته‌ی خودای ته‌عالاوه که ده‌فه‌رموێ:

قَالَ تَعَالَىٰ:﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المائدة: ١١٦

واتا: ﴿ئه‌ی محمد! ئه‌و رۆژه بۆ گه‌له‌که‌ت باس بکه، که په‌روه‌ردگار پرسـیارێکی گرنگ له مه‌شـهه‌دێکی ترسـناکدا ئاڕاسـته‌ی عیسـا ده‌کاو ده‌فه‌رموێ: ئه‌ی عیسـای کوڕی مه‌ریه‌م ئه‌وه تۆ به ئـاده‌میزادانـت گوتووه من‌و دایکم به خودا بزانن‌و له جیـاتی خودا ئێمه بپه‌رسـتن؟؟ واته: له یه‌کتاپه‌رسـتییه‌وه ببنه موشـریک‌و هاوه‌ڵا په‌یداکه‌ر بۆ خوداو له ته‌ک خودادا خودایه‌کی تر، یـان چه‌ند خودایه‌ک قه‌رار بده‌ن، جـا پێیـان وابێ که ئه‌و هـاوه‌ڵه سوودو زیان ده‌گه‌یه‌نێ یان نا، بۆ خۆی سه‌ربه‌خۆ کاری پێ ئه‌نجام ده‌درێن یان پێویستی به ئیزنی خودا هه‌یه، چوون یه‌که‌و به موشـــریک حلێب ده‌کرێ. ده‌ڵێ: خوایه! تۆ پاک‌و بێ عه‌یبی، به‌رزو بێ هاوه‌ڵی، تاک‌و ته‌نیاو باڵاده‌سـت‌و په‌روه‌ردگاری، که‌ی به‌نده‌یه‌کی وه‌کوو من رایه‌ی ده‌که‌وێ ناماقووڵی وا بکا؟! من رایه‌م ناکه‌وێ‌و ناگونجێ بۆ من شـتێک بڵێم که

بۆ زاتی پاکت نەشێ، ناگونجێ بۆ من قســەیەک بکەم کە مافی کردنی ئەو قســەیەم نەبێ، چۆن بەندەیەکی وەکوو من ڕێ بە خۆی دەدا لافی خودایەتی لێ بدا؟! ئەمجار دەکەوێتە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارە نەبووەو هەرگیز بانگەوازی بۆ ئەوە نەکردووەو زاتی پەروەردگار دەکاتە شــایەد لەســەر بێ تاوانییو بەرائەتی لەو تاوانە گەورەو دەڵێ: پەروەردگارا! ئەمن هەرگیز شــتی وام نەگوتووە خۆ ئەگەر شــتی وام گوتبێ بێگومان تۆ زانیوتەو ئاگاداری، تۆ تاکو تەنیاو زاناو داناو پەروەردگاری تۆ هەموو ئاشــکراو نهێنیو پەنامەکی ناو دڵی من دەزانی بەڵام من ئەو شتانەی لە زانستی تایبەتی خۆت دەیشارییەوە بە هیچ جۆرێک پەی پێ نابەمو لێی بێ ئاگام، ئەوەی فێرم نەکەی نایزانم، وا دەبێ فێری دەبم لە بیرم دەچێتەوە بێگومان تۆی پەروەردگار هەموو نهێنیو پەنامەکییەکت ئاگا لێیەو دەزانی چی دەبێ چۆن بووەو چی لێ دێ! ئەمە وەڵامی عیســـا بوو، نەیگوت من ئەوەم گوتووە یان نەم گوتووە، بەڵکوو زانینی ئەوەی حەواڵەی زانیاری بەرفراوانو بێ سنووری خودا کرد کە هەموو شــتێکی لێ ئاشــکراو نومایانەو هیچی لێ ون نابێ، ئەوە بوو وتی: ئەگەر من ئەوەم گوتبێ ئەوە تۆ دەیزانیو ئــاگاداری پێی، ئەمەش ئەوپەڕی ڕێز گرتنو ئەدەب دەگەیەنێ، ئەوپەڕی زەلیلیو گەردنکەچی خۆی بۆ خودا دەردەبڕێ!!﴾.

دەڵێی چی؟' کەنیزەکە گوتی: 'یانی تۆ ئاگات لە ڕاســتی ئەو شــتە هەیە کە لە بوون و دەروونی مندایە، بەڵام من هیچ لە بارەی تووە نازانم.' مەلا گوتی: 'لەو فەرمایشتەی خودای بەرز و بێهاوتا کە دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة: ٨٧

واتا: ﴿ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! شت لەخۆتان حەرام مەکەنو خواردنی خۆشی حەڵاڵ و هەرشــتێک حەڵاڵ بێو لەززەتی تێدابێو بەبێ فەرمانی شــەرع لەخۆتانی قەدەغە مەکەن؛ بەم جۆرە بە مەبەستی خودا پەرستیو خودا لەخۆ رازی کردن ئەو شتە حەڵاڵانە لەخۆتان قەدەغە بکەن هەروەها زێدەڕەویش مەکەن لە بەکارهێنانی شــتی حەڵاڵ، تەجاوەزکاری مەکەن، بەم جۆرە حەڵاڵ حەرام بکەن، یان زێدەڕەوی بکەن لە بەکارهێنانی حەڵاڵ خودا کەســانێکی خۆش ناوێ کە ســنوور بەزێنی دەکەنو لە چوارچێوەی شــەریعەت دەردەچن، جا زێدەڕەوییو دەرچوونەکەیان بە نیازی خودا پەرستی بێت، یان بەنیازی تر بێ، هەروەها شت لەخۆ حەرام کردنەکەیان بە سوێندو فوتۆ بێ، یان بێ سوێندو نەزر بێ چوون یەکە﴾.

چ گوتەیەکت هەیە؟' کەنیزەکە گوتی: 'شێخ ڕەحمەتوڵلا گێڕاوییەتەوە کە عوسمانی کوڕی مەتعوون و کۆمەڵێکی دیکە گوتیان: 'ئێمە سیرەتی خۆمان دەبڕین و جلە کۆنێک بە خۆماندا دەدین و ڕێی خوداپەرستی دەگرینە بەر.' ئەو دەم ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.' مەلای قورئانخوێن گوتی: 'لەسەر ئەو فەرمایشتەی خودای تەعالا دەڵێی چی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ النساء: ١٢٥

واتا: ﴿ کێ ئایینو بیرو باوەڕی جوانترو راسترە؟ لەو کەسە کە بەتەواوی ڕووی لەخودابێ دڵو دەروونی جگە لە خۆشەویستی خوداو ئایینی خودا هیچی تری تێدانەبێ، جگە لەخودا داوای نزا لەکەسی تر نەکا، جگە لەخودا کەسی تر بەشیاوی خودایەتی نەزانێ، کردار چاکو گوفتار ڕاستو شیرین ڕەفتاربێ، لەخراپەو خراپەکاری دووربێ! ڕەفتارو ڕەوشتی قورئانی بێ پەیڕەوی ئایینی پاکو پیرۆزی ئیبراهیم (عليه السلام) بکا کە بناغەی ئایینی ئیسلامەو ئایینێکی میانڕەوو دوور لەهاوەڵ دیاریکردن بۆ خودایە پەروەردگار ئیبراهیمی هەڵبژاردووە ڕێزو پلەو پایەیەکی داوەتێ دەشوبهێ بە خۆشەویستی دۆست بۆ دۆست!! جا کەسێک ئەوەندە لای خودا ڕێزدار بێ، ئەوەندە نزیکو خۆشەویست بێ، خودا کردبێتی بە دۆستی خۆی شیاوی ئەوەیە کە ئایینەکەی پەیڕەو بکرێو شوێن ڕێبازی بکەون﴾.

کەنیزە گوتی: 'خەلیل بە مانای هەژار و داماو، یان بە مانای خۆشەویستی سەرڕاست بۆ خودا.' قورئانخوێن کە زانی کەنیزە بۆ هیچ وەڵامێک دانامێنێ هەستا و گوتی: 'خەلیفە، باوەڕ بفەرموو ئەو کەنیزە لە قورئان و لێکدانەوەیدا لە من زاناترە.' ئینجا کەنیزە گوتی: 'من پرسیارێکت لێ دەکەم، ئەگەر نەیزانی عەبای مەلایەتیت لە بەر دادەکەنین.' خەلیفە گوتی: 'کەنیزە لێی پرسە.' گوتی: 'مەلا، پێم بڵێ کام ئایەتەیە کە بیست و سێ کافی تێدایە؟ کام ئایەتەیە شازدە میمی تێدایە؟ کام ئایەتەیە کە سەد و چل عەینی تێدایە؟ کام حیزبەیە کە وشەی پیرۆزی 'الله'ی تێدا نییە؟' مەلای داماو وەڵامی هیچیانی نەزانی.

"کەنیزەکە گوتی: 'عەباکەت داکەنە.' مەلا لەڕێوە عەباکەی داکەند. کەنیزە گوتی: 'خەلیفە، ئەو ئایەتەی کە شازدە میمی تێدایە لە سوورەی 'هوود'دایە کە فەرموودەی خودای بانیسەرە:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ ﴾ هود: ٤٨

واته: ﴿بەزوبانی نیگاو سروش بەنووح گوترا: لەکەشتی رزگاریی دابەزە بۆ سەر زەوی، بەسەلامەتیو بێ وەیی، بەدڵنیاییو دڵخۆشی، دابەزە سەلامی خودات لەسەرو لەئەمانی خودادا دەبی. یان لەکێوی جودییەوە دابەزە بۆ پێدەشتو دەشتاییەکانی دەورو بەری. بەکورتی سەلامی ئێمەو رزقو رۆژیو خێرو بەرەکەتی ئێمە لەسەر تۆ بێ ئەی نووح! هەروەها لەسەر ئەو موسوڵمانانەش بێ کە لەگەڵ تۆ پەروەردە بوونو دەبن، جا لەوانەی لەگەڵ تۆدان گەلو نەتەوەیەک دێنە کۆڕی ژیانەوە، بێدینو خوانەناس دەبن لەززەتو خۆشی دونیا بەدەست دەهێننو پاشان لەقیامەتدا دەخزێندرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە﴾.

ئەو ئایەتەی کە بیست و سێ کافی تێدایە لە سوورەی بەقەرەدایە و ئایەتی دینە. ئەو ئایەیەی کە سەد و چل عەینی تێدایە لە سوورەی ئەعرافدایە کە خودا دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ سَبْعِينَ رَجُلًا لِّمِيقَٰتِنَا ۖ فَلَمَّآ أَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّٰىَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ ۖ إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ ۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا ۖ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ﴾ الأعراف: ١٥٥

واته: ﴿پەروەردگار نیگای بۆ مووسا کرد کە حەفتا کەس لەقەومەکەی هەڵبژێری بۆ میقات، ئەویش لەناو قەومەکەی دا حەفتا کەسی پیاو ماقووڵو رێزدار هەڵبژارد بۆ ئەو میقاتەی کە خودا بۆی دیاری کردبوو، هێنانی بۆ کێوی گوور، لەوێ حەزرەتی مووسا گفتوگۆی لەگەڵ خودا دا کرد، فەرمانی پێ کردن کە رۆژوو بگرن، خۆیان پاکو خاوێن رابگرن، پۆشاکیان خاوێن بێ! بەگوێرەی زنجیرەی ئایەتەکان وا پێ دەچێ هەڵبژاردنی ئەم ژمارەیەو چوونیان لەگەڵ حەزرەتی مووسا بۆ میقات لەو سەرو بەندانە دا بووە کە مووسا داوای بینینی پەروەردگاری کرد، واتە: پێش گوێرەکە پەرستنەکەیان بووە، بۆیەش لەگەڵ خۆی دا بردونی بۆ ئەوەی گوێیان لێ بێ کە مووسا لەگەڵ یەزدان دا ئاخاوتن دەکا، لێیان یەقینبێ کە مووسا راست دەکاو پێغەمبەرە، بیستنی ئاخاوتنەکە بەڵگەبێ لەسەر راستگۆیی حەزرەتی مووسا، کاتێ هاتن بۆ میقات وتیان: ئەی مووسا! ئێمە هەتا خودا بەچاوی خۆمان نەبینین بڕوات پێ ناکەینو ئیمانت پێناهێنین، ئەتۆ ئاخاوتنت لەگەڵ دا کرد، وە

پیشـــانمان بده! ئیتر زۆر پێکێشـــیان لێ کردو داوای بینینی پەروەردگاریان کرد، تا کێوەکە لەرزەی پێکەوتو رایتەکـانـدنو هەموویـان لە هۆش خۆیـان چوون! کە ئەو لەرزەو راتڵەقاندنەی کێوەکە گرتنیو هەموو لە هۆش خۆیان چونو لاڵ و پاڵ کەوتن، موسـا وتی: پەروەردگارا! ئاواتە خوازی ئەوەم: کە ئەگەر لەوەپێشو پێش هاتنیان لەگەڵ من دا ئیرادەو مەشیئەتت وای ویستوەو وات بریار داوە لەناویان بەری، ئەگەر خواستت بوایە ئەوانیشو منیشـــت لەناو دەبرد لە پێش ئەوەدا بێین بۆ میقاتو من گیرۆدەی ئەم ئەم ریســـوایە نەدەبووم، ئێسـتە من کەوتوومە حاڵەتێکی بە خۆداشـکانەوەو هەزار سـوێندیان بۆ بخۆمو قســـەیان بۆ بکەم گەلەکەم بروام پێ ناکەنو دەڵێن: مووســا فێڵی لێ کردینو بە پیلان ئەو حەفتاکەســـەی کە پیاو ماقوڵی نەتەوەکەمان بوون بردنی بۆ کێوی گورو لەناوی بردن. ئەمجار حەزرەتی مووسـا درێژەی بەتکاو پاڕانەوەو قسـەکانی داو وتی: پەروەردگارا! ئەتۆ بە هۆی کردەوەی نەفامەکانمـان ئێمە لە نـاومەبە. پاڕانەوەو داوا کردنەکە بە شــێوەی ئیســـتیفهام هێندراوە، بۆ ئەوەی زیاتر داوای لە ناونەبردنەکە جەخت بکاتەوە، واتە خودایە! لەرەحمەتو عەداڵەتکـاریی تۆ دوورە کە بەهۆی کردەوەی خراپی نەفـامەکـانمـان هەڵسو کەوتی بێ ئەدەبو ناشـــیرینیان ئێمە لەناو بەریی. ئەوکردەوەو هەڵوێســـتەی کە بوو بەهۆکـاری ئەم لەرزەو راتڵەقـانـدنو لەهۆش خۆچونی ئەم حەفتـا کەســــە هەڵبژێراوەی قەومەکەم، جگە لە تـاقیکردنەوەو ئیمتیحـانکردنی زاتی پـاکت بۆ ئەوان هیچی ترنیە. ئەم کارەساتە دەخولقێنێ بۆ ئەوەی بەندەکانت بەتاقی بکەیەوە، دەری بخەی کەتا چ ئەندازەیەک ئامادەباشـیان بۆ هیدایەتو گومڕایی تێدایە، چی لە دڵیان دا شـێرداوەتەوە، کامیان شـیاوی سـزاو تۆڵەیە، کامیان شـیاوی پاداشو بەخشـیشـە! ئەمانە هەموویان بەگوێرەی سـوننەتی خۆت لە بوونەوەر دا ئەنجام دەدرێن ئەم روداوانە دەخوڵقێنی بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانت. کەسێک بتەوێ گومڕای بکەی، گومڕای دەکەی، کەسێکیش بتەوێ رێنمونی بکەیو هیدایەتی بدەی هیـدایەتی دەدەی! چونکە تـاقیکردنەوەو میحنەتە خوداییەکە بۆیـان هۆکـاری گومڕا بوون، یان هیدایەتدانیانە. ئیتر بەشـــێوەی مەجاز گومڕا بوونو هیدایەتەکەی پاڵ خودا دا. پەروەردگـارا! ئەتۆ ســــەرپەرشــــتیـارو چـاودێری کـاروبـاری ئێمەی، ئـاگـاداری کردارو گوفتارمانی، دەزانی نەفسو دەرونمان چۆنەو چی تێدایە، خودایە! خۆشببە لەو تاوانەی لە ئاکامی کردارو گوفتارمان دێتە کایەوەو دەبێتە ســــەرپێچی کردنی ســــوننەتی تۆ لەگەڵ بەندەکانتدا، یان کەمتەرخەمی دەکەین لە ژیکرو سوپاسگوزاریو بەندایەتی بۆ کردنت﴾.

هەر پیاوێک دوو عەینی[1] هەیە دەبێتە ســەد و چل عەین. ئەو حیزبەی کە ناوی 'الله'ی

---

١. عین: چاو.

تێدا نییه سـووره‌کانی 'قه‌مه‌ر' و 'ڕه‌حمان' و 'واقیعه'ن.' ئیدی قورئانخوێن قسـه‌ی پێ نه‌ما و سه‌ری داخست و له کۆڕه‌که چووه ده‌رێ."

لێره‌دا بوو، مـاوه‌ی چیرۆکی ئه‌مشـــه‌ویش کۆتـایی پێ هـات و شـــه‌هرزاد درێژه‌ی چیرۆکه‌که‌ی هه‌ڵگرت بۆ شه‌وێکی دیکه.

# که شەوی چوارسەد و چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! کاتێک مەلای قورئانخوێن بە خەجاڵەتییەوە لە کۆڕەکە چووە دەرێ. ئەوجار تەبیب ڕووبەڕووی کەنیزەکە دانیشت و پێی گوت: «لە زانستی ئۆلییەکان بوویەوە و نۆرەی زانسـتە مرۆییەکانە، ئێسـتا وە خۆ وەرەوە و باسـی مرۆڤم بۆ بکە. چواچێوەکەی چۆنە؟ چەند ڕەگی لە جەستە دایە. لە کوێوە دەست پێ دەکەن؟ باسی پێشە و ئێسقانەکانیم بۆ بکە. پێم بڵێ وشـەی «ئادەم» لە کوێوە هاتووە؟ کەنیزە وەڵامی داوە کە چونکە مرۆڤ گەنم ڕەنگە ناویان ناوە ئادەم یان لەبەر ئەوەی بە قەولی عەرەبی «ادیم ارض»ە واتە لە سـەر زەوی بەدی هاتووە. ناویان ناوە ئادەم. کە سـینگی لە لە گڵی کابە و سـەری لە گڵی خۆرهەڵات و لاقەکانیشـی لە ڕۆژئاوا بەدی هاتووە. حەوت دەرگای لە سـەری کراوە، دوو گوێ و دوو چاو و دوو کونەلووت و دەمێک. دوو چاویان بۆ بینین، دوو گوێیان بۆ بیستن و دوو کونەلووت بۆ بۆن و هەناسـە و دەمیشـیان بۆ خواردن داناوە. بە زمانیش ئەوەی لە دڵ دایە دەگوترێ. خودای تەعالا مرۆڤی لە چوار پێکهاتە دروست کردووە: کە ئەوانیش ئاو و ئاگر و خۆڵ و بایە. کە بەڵغەم: سـرووشـتی ئاوە و سـارد و تەڕە. سـەفرا (زراو یان زراڤ): سـرووشـتی ئاگرە و گەرم و ویشـکە. سـەودا (گورگ نەخۆرە) سـرووشـتی خۆڵە، سارد و ویشـکە. خوێنیش سـرووشـتی بایە کە گەرم و تەڕە. سێسـەد و شەسـت ڕەگ لە جەستەی مرۆڤ دایە. دووسەد و چل دانە ئێسقانیشی لە جەستەدا هەیە. مرۆڤ سێ جۆرە ڕووحی هەیە: ڕووحی ئاژەڵی، ڕووحی نەفسـانی و ڕووحی سـرووشـتی. کە خودا بۆ هەر کامیان حوکمێکی بۆ دیاری کردووە. خودای بەدیهێنەر دڵ و جەرگ و سـیپەلک و ڕیخۆڵە و دوو گورچیلە و مێشـک و ئێسـک و پێست و پێنج هەستی: بینین و بیسـتن و تامکردن و بۆنکردن وێکەوتنی بە دیهێنا. دڵی لە لای چەپی سینگەوە و گەدەشـی ڕاسـت لە پەنا دڵ و جەرگیشی وەک باوەشێنی دڵ دانا و سییەشی لە لای ڕاستەوە ڕووبەڕووی دڵ دروست کرد.» تەبیب پرسی: «کەنیزە پێم بڵێ سەری مرۆڤ چەند قاتە؟» وەڵامی داوە: «سێ قاتە، کە پێنج هەسـتـە زاتییەکە لە خۆ دەگرێ. کە ئەوانن هەسـتـی هـاوبەش و خەیـاڵ و دەسـتبەسـەرداگیراو و ترش و لە بیر کردنە. تەبیب گوتی: «کەنیزە باسـی چوارچێوە ئێسکییەکەیم بۆ بکە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! تەبیب بە کەنیزەکەی گوت: «باســی چوار چێوە ئێســکییەکەیم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «جەستەی مرۆڤ لە دووسەد و چل ئێسک پێک هاتووە کە بە سێ بەش دابەش دەبن. سەر و لەش و شتە لاوەکییەکانی. سەریش دابەش دەبێ بە سەر کەللە و دەموچاودا. سەر لە هەشت دانە پێشە یا ئێسک پێک هاتووە چواری ناو گوێچکەکانیشی پێوە زیاد دەبێ. دموچاویش بە ســـەر دوو ئێســـکی ســـەرەکی دابەش دەبێ ئەوانیش شەویلکەی سەرێ شەویلکەی خوارێن. شەویلکەی سەرێ بۆخۆی یازدە دانە پێشە دەگرێتە خۆی. شـەویلکەی خوارێ خۆی یەک دانە پێشـەیە کە سی و دوو ددانی لەگەڵە. جەستەی مرۆڤیش بە سێ بەش دابەش دەبێ: ئێسکەکانی پشت و سینگ، کە ئێسکی پشت بیست و چوار دانەن و ئێسکی شینگیش بیست و چوار دانە بە جۆرێک کە هەر لایەی دوازدە گلەن، پشتیش هەر وا لایەی دوازە پێشەیە. قەراخەکانی جەستەش دوو بەشە، بەشی لای سەرێ و بەشی خوارێ کە ئی سەرێ دابەش دەبێ بەسەر شانەکان، لە شانەوە تا هەنیشک و لە هەنیشـکەوە تا جومگەی دەسـت کە هەر یەکی لە چوار ئێسـک پێک هاتووە. قامکەکان پێنج دانەن و یەکی لە سێ ئێسک دروست بوون، جگە لە قامکە گەورە یان ئەسپێ کوژە کە لە دوو ئێسـک پێک هاتووە. بەڵام دوو لینگی مرۆڤ هەر لینگی لە سێ بەشـی وەک یەک پێک هاتووە کە ئێسکی ڕان لە جووچکە سمتەوە دەست پێ دەکا هەتا دەچێتە ناو کەشکەشنۆ، لە ئەژنۆوە هەتا جومگەی قاچ دوو ئێسکی قامیشین کە یەکیان ئەستوور و یەکیان باریکە، جومگەی قاچ لە حەوت پێشە پێک هاتووە کە پێشەی پانێ لە هەموویان گەورەترە پەنجەی قاچ و قامکەکانیش وەک ئی پەنجەی دەسـت لە پێنج ئێســک و قامکەکانیش یەکی لێ ســێ ئێســک دروســت بوون. جگە لە قامکە گەورە کە دوو پێشـــەی تێدایە. نۆشـــدارەکە گوتی: «کەنیزە باســـی ڕەگ و دەمارەکانم بۆ بکە.» کەنیز گوتی: «ڕەگی ســەرەکی و بەندی دڵ شاڕەگی سوورە کە ڕەگەکانی دیکە هەموو لەو جیا دەبنەوە. ئەژمارەکەشیان جگە لە خودا کەس نازانێ. دەڵێن نیزیک سێسـەد و شـەسـت ڕەگ لە جەسـتەی مرۆڤ دایە.» نۆشـدار گوتی: «بە گشـتی باسـیان بکە.» کەنیزە گوتی: « خودا زمانی بۆ ئاخاوتن و دوو چاوی وەک چرا بۆ بینین و دوو کونە لووتی بۆ هەناسـە هەڵکێشـکان و دوو گوێی بۆ بیسـتن و دوو دەســـت لە جێی باڵە و بەزەیی لە جەرگدا و پێکەنینی لە ســـپڵدا بۆ مرۆڤ خوڵقاند. گەدەی وەک خەزێنە و دڵیشـــی کردە کۆڵەکەی لەش. ئەگەر دڵ باش و پتەو بێ تەواوی لەش باش و پتەو دەبێ و ئەگەر دڵ لار و خوار و لاواز بێ ئەوە جەســـتەی تەواو نابێ و تووشی نەقوستانی و سستی و پەستی دەبێ.»

نۆژدار گوتی: «باسی ئەو هێمان و نیشانانە بکە کە بەواندا دەزانین کەسێک ناساغە و

نەخۆشـییەكی هەیە.» كەنیزەكە گوتی كە ئەگەر نۆژدارەكە زانا بێ ئەوە بە دیتنەوەی ڕەگ و گرتنی شـواری و گەرم و سـاردی لەش و ڕادەی پندری و زگچوونی و جاری واشـە بە هێندێک شــتی تایبەت هەســت و ڕوح نەخۆشــییەكانی مرۆڤ دەبینێتەوە، بۆ وێنە زەردی چاوەكانی دیاردەی بوونی نەخۆشی زەردوویی و خوێنەمیزكەیە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـــەویش كۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

# کە شەوی چوارسەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک کەنیزە باسی دیاردەکانی نەخۆشی و شێوەی دیتنەوەیانی کرد، ئینجا نۆژدارەکە لێی پرسی: «ئەی نیشانەکانی ناوەوەی نەخۆشی چین؟» کەنیزەکە وڵامی داوە کە دیتنەوەی نەخۆشی لە رووی دیاردە هەناوییەکانەوە لە شەش رێگەوەیە: یەکەم، هەڵس‌وکەوت و کارەکانییەوەیە. دووەم، بەو شتانەدا کە لە هەناوییەوە دەری دەدا. جا چ رشانەوە بێ یان پاشەڕۆ و پیشاو. سێیەم، بە ئێش و ئازارەکانی. چوارەم، بە شوێنی کار و ئاکنجی بوونیدا. پێنجەم، بە ماسین و ئەستووربوونی جەستەیدا. شەشەم، بە ترس یان بێزاری و نارەحتبوون بە شتێک.

ئینجا نۆژدار پرسی ئەوجار پێم بڵێ، کام خواردن زیانی هەیە؟ کەنیزە گوتی: یەکەم، تێکەڵکردنی خواردنەکان. دووەم، زۆر خواردنە کە بووەتە قاتڵی مرۆڤەکان لە جیهاندا. هەرکەس دیهەوێ ساغ بێ و زۆر بژی بەیانیان نانی چاک بخوا و نانی شێوانیش نەخاتە دەرنگان. لەگەڵ ژنان زۆر نیزیکی نەکا و کەڵەشاخ زۆر نەگرێ. زگی بکاتە سێ بەشەوە یەک بۆ خوادن و یەک بۆ خواردنەوە و یەکیش بۆ هەناسە هەڵکێشان. مەمنا رێخۆڵەی مرۆڤ هەژدە بستە شەش بست بۆ خواردن و شەش بست بۆ خواردنەوە و شەش بست بۆ هەناسە هەڵکێشانە. ئەگەر مرۆڤ لەسەرخۆ بە رێیەدا برودا سلامەتترە.

نۆژدار پرسی: «کەنیزە پێم بڵێ، هێماکانی زەرداو چین؟» کەنیزە وڵامی داوە: «زەردهەڵگەڕانی کوڵمە، تاڵبوونی زار و چوونەسەری شوار یان لێدانی دڵ و رەگەکان. تەنانت کەسێک زەرداوی هەیە، رەنگە تووشی یاوی سووتێنەر، سەرئێشە و قسەپەڕاندن، بەزەک و برینی ناو گەدە و رێخۆڵەکان و ماسین و پشمینی زۆریش بێ.» نۆژدار پرسی: «دیاردەکانی خەمۆکی چین؟» کەنیزە جوابی داوە کە خەمۆکی دەبێتە هۆی زۆر بوونی ئیشتیای خواردن، دڵەکوتە و دڵەخورپەی زۆر هەمیشە مات و مەلوول بوون. پرسی: «کەنیزە پێم بڵێ ئەرکەکانی تەبیب چییە؟» کەنیزە وڵامی داوە: «یەکیان ئەوەیە لە جەستە و هەناوی نەخۆشان بفکرێ و دەردەکەیان ببینێتەوە و ئەوەی دیکە ئەوەیە کە چارەیان بکا و سلامەتیان بۆ بگەڕێنێتەوە.» تەبیب لێی پرسی: «کەنگێ دەرمان بخورێ باشە؟» کەنیزە جوابی داوە: «کاتێک دارەکان گەڵا دەرکەن و دەغڵ و دان فەریکە بێ.» نۆژدار پرسی: «لە چ دەفرێکدا ئاو بوخرێتەوە باشە؟» کەنیزە بەرسڤی داوە: «ئەگەر بکرێ لە دەفری تازەدا ئاو بخۆیەوە سلامەتترە تا ئی دیکە.» نۆژدار پرسی: «دوای نان خواردن دەبێ خێرا ئاو بخۆیەوە یان دەبێ ماوەیەک ڕاوەستی؟» کەنیزە وڵامی داوە: «دەبێ ماوەیەکی سەبر بکەیت.»

هەرکەس دەیهەوێ ساغ و مەسروور بێ
لە ئێش و ئۆف و مەینەت بە دوور بێ
ئاو نەخواتەوە لە دوای شت خواردن
بە پێی خۆی نەڕوا بەرەو پیر مردن

تەبیبەکە پرسی: «دە خواردنم پێ بڵێ کە نابنە هۆی نەخۆشی.» کەنیزە گوتی: «ئەو خواردنەی کە دوای برسی بوون بخورێ هەر وەک پێغەمبەر لەوبارەوە دەفەرمێ کە گەدە سەرچاوەی نەخۆشییە و ئەوەی کە بە گەدەی پڕەوە شت بخۆی دەبێتە هۆی نەخۆشی.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کە حەدیسەکەی پێغەمبەری گێڕاوە تەبیب لێی پرسی: «لە بابەت گەرماوەوە دەڵێی چی؟» کەنیزە گوتی: «بە تێری نابێ بچییە گەرماوەوە. پێغەمبەر (د ـ خ) دەفەرمێ گەرماو جێگەیەکی چاکە. لەش لێی خاوێن دەبێتەوە و ئاوری جەهەننەمت وەبیر دێنێتەوە.» نۆژدار گوتی: «چ گەرماوێک باشە؟» کەنیزە گوتی: «گەرماوێک کە گەورە بێ و هەوای زۆر بێ و ئاوەکەی شیرین بێ.» نۆژدار پرسی: «پێم بڵێ کام خواردن لە هەموویان باشترە؟» کەنیزە گوتی: «چێشتێک کە ژنان سازیان کردبێ و لە نێو ئەواویشدا چێشتێک کە تێی کوشرێ لە هەموان باشترە.» پێغەمبەر دەفەرمێ: «تێکوشین لە چاو خواردنی دیکە وەک ئایشێ وایە لە چاو ژنەکانی دیکە.» نۆژدار پرسی: «کام شۆرباو لە هەموو چێشتێک باشترە؟» کەنیزە جوابی داوە: «شۆرباو گۆشت.» پێغەمبەریش لەو بارەوە دەفەرمێ باشترین شۆرباو، شۆرباو گۆشتە، ئەویش گۆشتی مەڕ.» نۆژدار پرسی: «گۆشتی چ مەڕێک لە هەموویان باشترە؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «گۆشتی مەڕی سپی.» پرسی: «میوە چی؟ باسی میوەم بۆ بکە.» کەنیزە وەڵامی داوە: «دەبێ میوەی تازە پێ گەیشتوو بخورێ.» نۆژدارەکە لێی پرسی: «لە بابەت خواردنەوەی ئاوەوە دەڵێی چی؟» کەنیزە وەڵامی داوە کە ئاو زۆر باشە بەڵام لەو کاتانەدا نابێ بخورێتە چونکە باش نییە، کاتێک لە گەرماو دەێیە دەرێ، دوای نیزیکی و هەروەها دوای خواردنی تەعام. نۆژدارەکە لێی پرسی: «باسی خواردنەوەی شەرابم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «لە بارەی خواردنەوەی شەراب بۆ تۆ هەر ئەوەندە بەسە کە لە قورئاندا هاتووە کە دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ البقرة: ٢١٩

واتا: ﴿ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی خواردنەوەی عەرەقو قومار کردن؛ ئایا حەڵاڵن یان حەرامن؟؟ هەروەها کڕینو فرۆشتنو وەکالەت تێداکردنو ئەم جۆرە شتانە، وەڵامیان بدەرەوەو پێیان بڵێ: خواردنەوەی عەرەقو قومار کردن تاوانی گەورەن، چونکە زیانی گەورەی ماڵیو بەدەنیو کۆمەڵایەتییان تێدایە، عەرەق خواردنەوە زیان بە جەستەو عەقڵو هۆشو ماڵو دارایی دەگەیەنێ، پەیوەندی خزمایەتیو کۆمەڵایەتی تێک دەدا. تاوانەکەیان لەسوودەکەیان زیاترە. زانایانی ئیسلام لەمبارەیەوە قاعیدەیەکی زۆر تۆکمەو کەم وێنەیان دەرهێناوە کە دەڵێن: (لابردنی خراپەکان لەپێشترە لە دەستەبەر

کردنی بەرژەوەندییەکان). پرسیارت لێ دەکەن چ بەشێک لە ماڵو داراییان ببەخشنو چ بەشێکی بهێڵنەوە کە پێیان بگوترێ پابەندی فەرمانی خودان کە دەفەرموێ: تۆ ئەی پێغەمبەر! لە وەڵامدا پێیان بڵێ: ئەوەی لە خەرجیو گوزەرانی خۆتانو ماڵو منداڵتان زیاد بوو خەرجی کەن بۆ پەککەوتەو داماوانو بۆ بەرژەوەندی گشتی وەک دروست کردنی پردو قوتابخانەو خەستەخانە.... هتد. ئاوا بەوجۆرە پەروەردگار ئەحکامی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە، هەرپاساو نیڤامێک بەرژەوەندیی ئێوەی تێدابێو عەقڵ و هۆشتان بکاتەوە زەرەرو زیانتان پێ نیشانبدا، بۆتان شیدەکاتەوە، بۆچی؟﴾.

کە شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

کە ستاندوویە لە تۆ تاعەت و دینت
ئەو بادە تاڵە وەک تەمەنی شیرینت
قازانجی چییە بەرەو شەراب دەچی تۆ
شێری سەرەتا و رێوی لەڕی دوایی تۆ

بەڵام قازانجەکانی شەراب ئەوانەن: شەراب گەدە و سیستیمی هەرس بە گشتی بەهێز دەکا، خەمڕەوێنە، مرۆڤ دڵاوا دەکا، سلامەتی دێنێ و دەبێتە هۆی باشتر هەرسکردنی خواردن و ئێش و نەخۆشی جومگەکان باشتر دەکا، هەناوی مرۆڤ پاک دەکاتەوە و دڵخۆش و بەکەیفی دەکا. یارمەتی باری سرووشتی لەش دەدا. پێشگیری لە زوو پیربوون دەکا و ڕووخسار گەش و بەکەیف دەکا. ئەگەر بێت و خودا حەرامی نەکردبایە هیچشتێک جێگای شەرابی نەدەگرتەوە.» نۆژدار پرسی: «کام شەراب لە هەموویان باشترە؟» کەنیزە گوتی: «ئەو شەرابەی لە هەشتا ڕۆژ زیاتر مابێتەوە و لە ترێی زەرد گیرابێ.» تەبیب پرسی: «بۆ کەڵەشاخ دەڵێی چی؟» کەنیزە گوتی: «کەڵەشاخ بۆ کەسێک باشە کە پەستانی خوێنی لە سەرێ بێ و ئازاری بدا. واش باشە کە ئەوەی دەیهەوێ کەڵەشاخ بگرێ لە نیوی دووەمی مانگدا بیگرێ وابێ کە ڕۆژێکی هەورووهەڵا و باوباران نەبێ. حەڤدەی مانگ باشترین ڕۆژە بۆ کەڵەشاخ گرتن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و پەنجایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کەنیزە لە باسی قازانجەکانی کەڵەشاخدا گوتی کە کەڵەشاخ ئاوەز و توانایی بیرئانین زیاد دەکا و پێغەمبەر (د ـ خ) فەرموویەتی کە هەرکەس کە ئێشێک لە سەر و لاقیدا بێ کەڵەشاخ بگرێ. کە ئەوەشی کرد دوایە شتی سوێری و ترشی نەخوا.» تەبیب گوتی: «ئەی چ ڕۆژێک بۆ کەڵەشاخ گرتن باش نییە؟» کەنیزە گوتی: «ڕۆژانی سێشەممە و چوارشەممە کەڵەشاخ نەگرێ دەنا هەرکەس کەڵەشاخ بگرێ دوایی دەبێ هەر یەخەی خۆی بگرێ و لۆمەی کەس نەکا جگە لە خۆی. لە گەرما و سەرمای زۆردا نابێ کەڵەشاخ بگرن. باشترین وەرزیش بۆ ئەو کارە، وەرزی بەهارە.» نۆژدار پرسی: «باسی نیزیکیم بۆ بکە.» کە کەنیزە ئەوەی بیست سوور هەڵگەڕا و سەری داخست. دوای ئەوە گوتی: «خەلیفە وەڵامەکەی زۆر باش دەزانم بەڵام شەرم دەکەم، لە حوزووری تۆ دا» خەلیفە گوتی: «شەرم مەکە و وەڵامی دەوە.» کەنیزە وەڵامی داوە کە: نیزیکی لایەنی باشی یەکجار زۆرە بۆ وێنە بۆ خەمۆکی و ناڕەحەتی دەروونی زۆر باشە، تین و گڕی ئەڤین دادەمرکێنێ، خۆشەویستی دێنێ، ترس و دڵەڕاوکێ کەم دەکاتەوە و دڵی مرۆڤ شاد دەکا. نیزیکی لە هاوین و پاییزدا زۆر خراپە و زەرەری هەیە. تەبیب گوتی: «قازانجی نیزیکی چی و چین؟» کەنیزە گوتی: «نیزیکی خەم و کەسەر دەڕەوێنێ. حەز و ڕق دادەمرکێنێ، بۆ چابوونەوەی برین باشە. بەڵام هاوار، نەکا لەگەڵ پیرێژن نیزیکی بکەن، چونکە مەترسیدارە. حەزرەتی عەلی (ڕ ـ خ) فەرموویەتی کە چوار شت مرۆڤ پیر دەکا و دەیکوژێ: یەک، بە زگی تێر بچیتە گەرماو. دوو، شتی سوێر بخۆی. سێ، بە زگی تێرەوە نیزیکی بکەی. چوار، لەگەڵ پیرێژن و ژنی نەخۆش نیزیکی بکەی. پیرێژن ژەهرێکی کوشندەیە. هێندێک گوتوویانە، تکا و ڕەجایە لە زەماوەند لەگەڵ پیرێژن خۆ بپارێزن ئەگەر گەنجی قاروونیشی هەبێ.» نۆژدار پرسی: «ئەی باشترین نیزیکی و زەماوەند کامەیە؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «زەماوەند و نیزیکی لەگەڵ ژنی منداڵکار و جوان و دەلال و خوێنشیرین و مەمک هەناری لە بنەماڵەی خانەدان و ناسراو کە دەبێتە مایەی هێزی دڵ و سلامەتی هەروەک شاعیر گوتوویە:

بە سەری پیری کەسێک بۆی هەڵکەوێ بێنێ
خونچە کیژێک کە تازە مەمکی سەر دەردێنێ
لەو دونیا بە حەق، ئەو دەبێتە یاری نەبی
ڕیشەی وەسوەسەی شەیتانی لە بن دەردێنێ

نۆژدار گوتی: «پێم بڵێ چ کاتێک بۆ نیزیکی باشە؟» کەنیزە بەرسڤی داوە: «ئەگەر

شەو بێ دوای هەرسەکی خواردن و ئەگەر ڕۆژیش بێ دوای خواردنی بەیانی.» تەبیب لێی پرسی: «لە شتی بێستاندا چی لە هەموویان باشترە؟» جوابی داوە: «کوولەکە» پرسی: «لە گیا و گوڵدا؟» جوابی داوە: «گوڵ ئەویش گوڵی وەنەوشە.» نۆژدار پرسی: «شاوات لە کوێوە دێت؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «پیاو ڕەگێکی لە جەستەی دایە کە تەواوی ڕەگەکانی دیکە ئاو دەدا و ئاویش لە سێسەد و شەست ڕەگ کۆ دەکاتەوە و دەیڕێژێتە ناو باتووی چەپەوە، ئینجا دەبێ بە خوێنێکی سوور و بە گەرما و تێکەڵی هێندێک لیکاوی دەروونی سپی دبێتەوە و بۆنەکەشی وەک وەک بۆنی گوڵە خورما دەچێ. تەبیب پرسی: «پێم بڵێ چ باڵندەیەکە کە شاوات و سووڕی مانگانەی؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «شەمشەمەکوێرە.» پرسی: «پێم بڵێ چ شتێکە کە ئەگەر بەندی بکەن دەمێنێ بەڵام ئەگەر لە هەوای ئازاددا بێ دەمرێ؟» وەڵامی داوە: «ماسییە.» پرسی: «شتێکی نەترس و مەترسیدارم پێ بڵێ هێلکە بکا.» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئەژدیها»

ئیدی نۆژدارەکە ئەوەندەی پرسیار کردبوو ماندوو بوو. هەر بۆیە کۆتایی پێ هێنا و بێدەنگ بوو. کەنیزە گوتی: «خەلیفە، گەورەم، ئەوە ئەو ئەوەندەی پرسیار کرد ماندوو بوو. ئەگەر ڕێم بدەی منیش پرسیارێکی لێ دەکەم ئەگەر نەیتوانی وەڵامم داتەوە ئەوە جلی نۆشداری لێ دەستێنمەوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كه شەوی چوارسەد و پەنجا و یەكەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــكۆ! كەنیزە گوتی: «ئەگەر وەڵام نەداتەوە كەوای نۆشـــداری لە بەر دادەكەنم.» خەلیفە گوتی: «لێی پرسـە.» كەنیزە لێی پرسـی: «ئەوە چییە، وەک زەوی خڕە، زۆر جار لە چاو بزر دەبێ، بە نرخ و ڕێزە و دایمە بەســـتراوەتەوە، بەڵام نایهەوێ ڕاكا و دزیش ناكا كەچی هەمیشـە بە زنجیر دەیبەسـتنەوە. بریندارە بە شـیر و زەرگ و كەچی لە بەرەی شـــەڕیش نییە. دووگیـانە بەڵام بەچكەی لە زگدا نییە. داهـاتووەتەوە بەڵام خۆی نەخستووەتە سـەر هیچكوێ. سـیرەتی نییە و گانیش دەكا. هێزی نییە و زۆرەبانی دەگرێ. شەوانە لە خێزانی جوێ دەبێتەوە و بە ڕۆژدا لە ئامێزی دایە.

تەبیب بێدەنگ بوو هیچی نەگوت و ڕەنگی تێک چوو. ماوەیەک سـەری داخسـت. كەنیزە گوتی: «تەبیب یان لیباســـی نۆژداری دانێ یان شـــتێک بڵێ.» نۆژدار هەســـتا و گوتی: «خەلیفە، دانی پێدا دەنێم كە ئەو كەنیزە لە من زانـاترە.» ئیـدی جلەكـانی داكەنـد و بە خەجـاڵەتی لە كۆڕەكە چووە دەرێ. خەلیفە گوتی: «كەنیزە دا بۆخۆت وەڵامی ئەو پرسیارەی خۆت بدەوە بزانم چیی؟» كەنیزە گوتی: «قوربان ئەوە دوگمەی جلوبەرگە.»

ئیدی ڕووی لە دانیشتوان كرد و گوتی: «كامتان ئەستێرەناسن؟» لەجێوە ئەستێرەناس هەستا و هات ڕووبەڕووی دانیشت. كەنیزەكە كە چاوی پێی كەوت، پێكەنی و گوتی: «هەر پرسیارێكت هەیە بیكە.»

ئەستێرەناس پرسی: «باسی دەركەوتن و ئاوابوونم بۆ بكە.» كەنیزە گوتی: «هەتاو لە كانییەكەوە دەردەكەوێ و دەچێ لە كانییەكی ترەوە. ئەو شوێنەی لێیەوە هەڵدێ بەشێكە لە ڕۆژهەڵات و ئەو شـــوێنەی لێی ئاوا دەبێ بەشـــێكە لە ڕۆژئاوا. ئەوان بەیەكەوە ســـەد و هەشتا پاژن. خودای تەعالا دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ المعارج: ٤٠

واتا: ﴿ســـوێند دەخۆم بەخودای شـــوێن هەڵاتی خۆرو مانگ و ئەســـتێرەكان لە هەموو شـەوو ڕۆژێكی سـاڵ دا، ئێمە دەتوانین و زۆر لامان ئاسـانە: كە ئێوە لەناو بەرین و گەل و نەتەوەیەكی باشـــترو گوێڕایەڵ و ملكەچ بۆ فەرمان و جڵەوگیریەكانی خودا بێنینە كایەوە، هیچ شـتێک نیە بتوانێ ببێتە كۆسـپ و تەگەرەو نەتوانین ویسـتەكانمان بەدی بێنین، ئێمە لەئاست بەدیهێنانی ئەو جۆرە كارانەدا دەستەوسان نین﴾.

ئەســـتێرەناس گوتی: «پێم بڵێ كە دەبێت بە شـــەو ڕۆژ چی لێ دێت؟» كەنیزە گوتی:

«خودای تەعالا دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ لقمان: ٢٩

واتا: ﴿ئایا تۆ نابینی ئەی بینەر: کە خودای خاوەن قودرەتو دانا لەکاتەکانی شەو دەخاتە سەر کاتی رۆژو شەو کورت دەبێو رۆژ درێژ وەکوو لەوەرزی بەهارو هاویندا دەبینرێ، هەروا بەپێچەوانەوە لەکاتی رۆژ دەخاتە سەر شەو، شەو درێژ دەبێو رۆژ کورت، لەو دەگرێتەوەو دەیخاتە سەر ئەمو بەپێچەوانەشەوە. خۆرو مانگی ژێربار کردون، دروستی کردون بۆ سوود گەیاندن بۆ ئێوە، هەریەکێ لەخۆرو مانگ بەئاسماندا دێنو دەچنو ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدەن بەو شێوەیەی خودا بۆی دیاری کردون، لەجەمسەرو مەدارەی خۆیاندا تا رۆژی قیامەت بێ وچان لەگەڕدان، جگە لەخودا کەسی تر توانای ئەوەی نیە ئەم قەبارە زەبەللاحانە بەو شێوە رێکو پێکییە بێ وچان هەڵسوڕێنێو پەکیان نەکەوێ، هەر خودا ئەو شتانەی بەدی هێناونو هەر ئەویش دەزانێ تاکەی لەگەڕدا دەبن، پەروەردگار ئاگادارەو دەزانێ چی دەکەن لەخێرو لەشەڕ، هەر ئەو بەدیهێنەرو زاناو ئاگادارو هەڵسوڕێنەرە﴾.

ئەستێرەناس گوتی: «باسی شوێن و پێگەی مانگ بکە.» کەنیزە گوتی: «بیست و هەشت پێگەی هەیە: «شەرەتەین، بەتین، سورەییا، دەبەران، هەقعە، هەنعە، زێراع، ناسرە، جەبهە، زەبەرە، عەووا، سەمماک، عەفر، زووبانا، ئێکلیل، قەلب، شۆولە، نەعاییم، بەلەدە، سەعد زابێح، سەعد بۆلەع، سەعدولسوعوود، سەعدولئەخبییە، فەرەغولموقەددەم، فەرەغولموئەخێر، ڕێشا.» کە لەودا نەهێنییەکی شاراوەی تێدایە کە جگە لە خودا کەس پێی نازانێ. بەڵام پاژەکانی ئەو قۆناخانە لە سەر بورجە دوازدەوانەکان بەو جۆرەیە کە: لە هەر بورجێکدا دوو قۆناخ و یەک لە سەر سێ بەشی قۆناخێکی لەسەرە بە جۆرێک کە شەرەتەین و بەتین و لە سێ بەش بەشێکی سوورەییاش بۆ ڕاگوێستنی قۆناخە و دو لە سێی سوورەیا دەبەران و دوو لە سێی هەقعە پێگەی سەوڕ[1]ە ئەوانی دیکەش بەو جۆرەن.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. دووەم بورجە لە بورجە دوازدەوانەکانی سیمای ئاسمان.

## که شەوی چوارسەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! کاتێک کەنیزەکە قۆناخەکانی مانگ و پاژەکانی لەســـەر بورجە دوازدەوانەکان باس کرد. ئەستێرەناس گوتی: «باسی ئەستێرەکان و تایبەتمەندییەکانیان و ڕاوەستانیان لە بورج و سەعد و نەحس و شوێنی هەڵکشان و داکشانیانم بۆ بکە.» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئەســـتێرە گەڕۆکەکـان حەوتن: مـانـگ، زاف(عەتـارۆد)، نـاهیـد(زوهەرە)، پۆلوو(مێریخ)، خۆر و مشـتەری و ئەستێرەی ڕۆژ. خۆر ئەسـتێرەیەکی گەرم و ویشـکە و لێ نیزیک بوونەوەی باش نییە، هەر لە دوورەوە بەفەڕ و هاتە. لە هەر بورجێکدا سـی ڕۆژ ڕادەوەستێ. بەڵام مانگ سارد و فێنک و پیرۆزە لە هەر بورجێکدا دوو ڕۆژ و یەک لە سێ بەشـی ڕۆژێک ڕادەوەسـتێ. زاف لەگەڵ شـتە بە فەڕەکان بەفەڕ و لەگەڵ شـتە دزێوەکان دزێوە و لە هەر بورجێکدا حەوت ڕۆژ و دانێک دەمێنێتەوە. ناهیدیش لە هاوسـەنگی دایە و بەفەڕە، لە هەر بورجێکیشـدا بیسـت و پێنج ڕۆژ دەمێنێتەوە. پۆلوو (موریخ) شـوومە و دە مانگان لە بورجێکدا دەمێنێتەوە. مشـــتەری بەفەڕە و ســـاڵێک لە بورجێکدا دەمێنێتەوە. کاروانکوژەش سارد و ویشک و شوومە لە هەر بورجێک سێ مانگ دەمێنێتەوە. ماڵی هەتاو لە شـێر(اسـد)[1]لە بەرزترین ئاسـتیدا لە کاوڕ(حەمەل)[2] دایە و لە نەزمترین ئاسـتیدا لە دەلو(دلو)[3] دایە. پێگەی مانگ قرژاڵە و بەرزترین ئاسـتی لە تیشـک و نەزمترین ئاسـتی دووپشـکە و شـوومییەکەی لە قرژاڵ و شـێر دایە. شـوێنی مشـتەری کەوان(قەوس)[4] و ماسـی(حوت)[5] و ئاسـتی هەڵکشـانی لە قرژاڵ(سـرطان)[6]دایە و ئاسـتی دابەزینی بورجی جەدی[7] سەختییەکەشی لە جۆوزا[8] و شێر (ئەسەد) دایە. پێگەی زوهەرە (ناهید) لە سەوڕ دایە و بەرزترین ئاسـتی لە ماسـی (حوت) و نەزمترین ئاسـتیشـی لە تەرازوو (میزان)[9] سـەختییەکەشـی لە کاوڕ(حەمەل) و دووپشـک (عقرب)[10]دایە. پێگەی زراف جەوزا و گوڵەگەنمە نەزمترین ئاستی لە ماسییە(حوت) و سەختییەکەی لە سەوڕ دایە. پێگەی پۆلوو

---

١ . پێنجەمین بورجە لە بورجە دوازدەوانەکانی ئاسمان.

٢. یەکەم بورج لە بورجە دوازدەوانەکانە.

٣. یازدەهەمین بورجە لە بورجە دوازدەوانەکانە.

٤. نۆیەمین بورجە لە بورجە دوازدەوانەکانی ئاسمان.

٥. دوازدەیەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

٦. چوارەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

٧. دەیەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

٨. سێیەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

٩. حەوتەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

١٠. هەشتەمین بورجە لە بورجەکانی ئاسمان.

(مێریخ) کاوڕ و دووپشــکە و بەرزترین ئاســتی لە جوودەی دایە و نەزمترین ئاســتیشــی قرژاڵە. ســـەختییەکەشـــی لە تەرازوو دایە. کاتێک ئەســـتێرەناس زانســـتی ئەوی لە ئەستێرەناسیدا دیت، ویستی بە فێڵێک ئەو لە لای خەلیفە بشکێنێتەوە. گوتی: «کەنیزە لەو مانگەدا باران دەبارێ یان نا؟» کەنیزە ماوەیەک سەری داخست و چوو لە فکرەوە. خەلیفە پێی وابوو کە ناتوانێ وەڵام بداتەوە. ئەســـتێرەناس لێی پرســـی: «بۆ وەڵام نادەیتەوە؟» کەنیزە گوتی: «هەتـا خەلیفە فەرمـان نەدا هیچ نـاڵێم.» خەلیفە گوتی: «فەرمـانی منی بۆ چییە؟» کەنیز گوتی: «شـــیرێکم لە خەلیفە دەوێ هەتا ملی ئەو بێ دینەی پێ بپەڕێنم.» خەلیفە و دانیشتوان پێکەنین. دوای ئەوە گوتی: «ئەستێرەناس پێنج شتن کە جگە لە خودای بانیسەر کەس نایانزانێ. ئینجا ئەو ئایەیەی خوێندەوە:

قَالَ تَعَالَى:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان: ٣٤

واتا:﴿ زانیاری کاتی رابوونی قیامەت هەر لای خودایەو بەس، تەنیا پەروەردگار دەزانێ قیامەت کەی رادەبێ، تەنانەت فریشـــتەکانی نزیک بارەگای ئەقدەسو پێغەمبەرانیش لەم بارەوە چ زانیارێکیان نیە، هەر خودا دەتوانێ باران ببارێنێو هۆکارەکانی برەخســـێنێو ئەندازەکەی دیـاری بکـا، (زانینی کـاتی بـاران بەتەحدیدیو ئەنـدازەی بـارانەکەو چۆنیەتی بارینەکە هەر خودا دەزانێو بەس). لەوانەیە ئادەمیزاد بەهۆی زانیاریو تەجروبەو ئامێری کەشو هەواناسـیەوە کاتی بارینی باران بزانن بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن هۆکارەکانی بارینی باران برەخسێنن، هەموو دونیا کۆببێتەوە ناتوانن هەوری باراناوی دروست بکەنو بەویســـتی خۆیان لەو شـــوێنانەی مەبەســـتیانە باران ببارێنن دەقەکەش ئەوە دەگەیەنێو دەچەســـپێنێ: کە هەر خودا دەتوانێ باران ببارێنێ، چونکە هەر خودا دەتوانێ ئەســـبابە کەونییەکان برەخســـێنێ بۆ بارینی باران!! هەر خودا دەزانێ ئەوەی لەمنداڵدانی ئافرەتدایە چیە نێرە یان مێیەیەکە، یان زیاترە، رەوشتەکانی شێوەو روخساری چۆننو چۆن نین. هەر خودا بەیەقینیو بەتەواوی دەزانێ چی لەمنداڵدان‌دا هەیە، هەر لەســـەرەتای پەیدابوونی ئەو منداڵە لەمنداڵدان‌دا تا رۆژی هاتنە دونیای لەهەموو کاتو گهورێکیدا! هەر خودا دەزانێ شـێوەو روخســارو رەوشــتی، تایبەتمەندیو ئامادەباشــی چۆنەو چییەو تا چ ئاسـتێکەهیچ کەسێک نازانێ سبەینێ چی دەکاو چی بەسەر دێ، نازانێ ئەوەی بەیانی دەیکا خێرە شەڕە باشە خراپە، نازانێ بەیانی تووشی نەخۆشی دەبێ یان بەلەشساغی دەمێنێتەوە...هتد. هیچ ئادەمیزادێک نـازانێ لەکوێ دەمرێ، نـازانێ ئـایا لەوڵاتی خۆی دەمرێ یـان لەوڵاتێکی تر سەردەنێتەوە. بێگومان خودا زاناو ئاگادارە نەک هەر بەم پێنج شتانە بەڵکوو زانیارییەکەی هەموو شـــتێکی کۆنترۆڵا کردوەو ئاشـــکراو نهێنی هەموو شـــتێک بەئەوپەڕی زانینەوە

دەزانێو هیچ وردو درشتێکی لێ پەنهان نیە﴾.

ئەستێرەناس گوتی: «کەنیزە ئەمن هەر ویستم تاقیت کەمەوە دەنا مەبەستێکی تایبەتم نەبوو. ئیدی کەنیزە گوتی: «بۆ هەر ڕۆژێک ئەستێرەیەکی بۆ تەرخان کراوە کە ئەو ئەستێرەیە خاوەنی ئەو ڕۆژەیە. ئەگەر یەکەم ڕۆژی ساڵ یەکشەممە بێ ئەوە بەشی خۆر دەبێت و هێمای لەتم و زووڵمی دەسەڵاتدارانە و کەمی باران. خەڵک لەو ساڵەدا تووشی دڵەڕاوکێ و پەرۆشی دەبن. دەغڵ و دان زۆر دەبێ جگە لە نیسک. ترێ هەمووی خراپ دەبن. کەتان گران دەبێ. شەڕ لە نێو پاشاکان دێتە ئاراوە.» ئەستێرەناس گوتی: «ئەی گەر ساڵ بە دووشەممە دەست پێ بکا؟» کەنیزە گوتی: «خاوەنی ئەو ڕۆژە مانگە کە ئاماژەیە بە هەڵکردن و حەوانەوەی پاشا و دەسەڵاتدارەکان و باران بارینی زۆر و دەغڵ و دانی زۆر لەو ساڵەدا. جگە لە تۆوی کەتان کە خراپ دەبێ. تاعوون زۆر دەبێ و پاتاڵ و شت دەمرن و ترێ و هەنگوین و پەمۆ هەرزان دەبێ. خوداش بۆخۆی باشتر دەزانێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەستێرەناس گوتی: «ئەی سێشەممە چی؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «خاوەنی ئەو ڕۆژە ئەستێرەی پۆلوو (مێریخ)ە ئەویش ئاماژە بۆ مردنی گەورەکان و خوێنڕژان و قاتی و قڕی و ویشکەساڵی و کەم بوونی ماسی و نیسک و هەنگوین. لەو ساڵەدا جۆ هەرزان دەبێ. شەڕ و ناکۆکی لە نێوان پادشاکاندا پەرە دەستێنێ و کەر زۆر دەمرن. خوداش بۆخۆی باشتر دەزانێ.» ئەستێرەناس گوتی: «باسی دەستپێکی ساڵ بە چوارشەممەم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «خاوەنی ئەو ڕۆژە زاقە (عەتارۆد)ە، ئەگەر ساڵ بە چوارشەممە دەست پێ بکا لەو ساڵەدا خەڵک تووشی ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەبن. کێشە و ناکۆکی دەکەوێتە نێو خەڵکەوە. ڕێژەی باران مامناوەندی دەبێ. هێندێک لە زەوی و زارەکان بەرهەمەکانیان خەسار دەبێ و مەڕ و پاتاڵ و منداڵێکی زۆر لەو ساڵەدا دەمرن. توور و پیواز گران دەبێ. خەڵکێکی زۆر لە دەریادا بە هیلاک دەچن، گەنم گران دەبێ و هەموو دانەوێڵەیەکی دیکە هەرزان دەبێ. هەوروهەلا و بریسکە زۆر دەبێ. هەنگوین هەرزان دەبێ و کەتان و لۆکە و خورما زۆر دەبن. خوداش لە هەمووکەس باشتر دەزانێ.» ئەستێرەناس گوتی: «زۆر باشە، پێنجشەممە چی؟» کەنیزە گوتی: «خاوەنی ئەو ڕۆژە ئەستێرەی مشتەرییە ئەویش هێمای ئەوەیە کە وەزیران و دەسەڵاتداران ئەو ساڵە عادڵ دەبن، دادپەروەری باش دەبێ. هەژار و نەدار و ئیمانداران لە دۆخێکی باشدا دەبن. میوە و دانەوێڵە زۆر دەبێ. گرمەی هەور و هەورەتریشقە زۆر دەبێ. کەتان و لۆکە و هەنگوین و ترێ هەرزان دەبێ و خوداش لە هەموومان باشتر دەزانێ.

ئەستێرە ناس گوتی: «خاوەنی هەینی کامیانە و بارودۆخ چۆن دەبێ؟» کەنیزە گوتی: «خاوەنی هەینی، زوهرەیە و زوهرەش هێمایە بۆ ئەوەی کە لەو ساڵە دا درۆ و بوختان زۆر دەکرێت و وەرزی پاییز زۆر خۆش دەبێ و هەرزانی بەسەر وڵاتدا دێ. فەساد وڵاتی دادەگرێ. تۆوی کەتان و گەنم، و هەنگوین گران دەبن. ترێ و کاڵەک خراپ دەبن. ئەستێرەناس گوتی: «ئەوجار باسی شەممەم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «خاوەنی شەممە ئەستێرەی بەیانە(زوحەل) کە ئاماژەیەکە بۆ گرانی و قاتوقڕی. لەو ساڵەدا هەوروهەلا زۆر دەبێ. خەڵێکی زۆر دەمرن. خەڵکی میسر و شام بە دەست پادشا و دەسەڵاتدارەکانیانەوە وە گیان دێن. پیت و بەرەکەت لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵ نامێنێ و دانەوێڵە زۆری خەسار دەبن. دوای ئەوە ئەستێرەناس سەری داخست. ئینجا کەنیزە بە ئەستێرەناسی گوت: «ئەستێرەناس ئەمنیش پرسیارێکت لێ دەکەم ئەگەر نەیزانی دەبێ کەوای پیشەکەت داکەنی.» ئەستێرەناس گوتی: «پرسیارەکەت بکە.» کەنیزە پرسی: «ئەستێرەی بەیان (زوحەل) لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمانی حەوتەم.»

کەنیزە پرسی: «مشتەری لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمانی شەشەم.» کەنیزە پرسی: «پۆلوو (مێریخ) لە کوێیە؟» ئەستێرەناس گوتی: «لە ئاسمان پێنجەم.» کەنیزە پرسی: «خۆر لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمانی چوارەم.» کەنیزە پرسی: «زوهرە (ناهید) لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمانی سێیەم.» کەنیزە پرسی: «زاڤ (تیر) لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمنی دووەم.» کەنیزە پرسی: «مانگ لە کوێیە؟» ئەستێرەناس وەڵامی داوە: «لە ئاسمانی یەکەم.» کەنیزە گوتی: «پرسیارێکی دیکەم ماوە.» ئەستێرەناس گوتی: «پرسیارەکەت بکە.» کەنیزە گوتی: «پێم بڵێ، ئەستێرەکان بە چەند دەستە دابەش دەبن؟» ئەستێرەناس بێدەنگ بوو متەقی لێ نەهات و وەڵامی نەداوە. کەنیزە گوتی: «کەواکەت داکەنە.» ئەستێرەناس کەواکەی داکەند. ئینجا خەلیفە بە کەنیزەی گوت: «بۆخۆت بیڵێ.» کەنیزە گوتی: «خەلیفە، ئەستێرەکان چوار بەشن، بەشێکیان پێوەندیان بە ئەم دونیایەوە هەیە و زەوی ڕووناک دەکەن. بەشێکیش پێوەندیان بە شەیتانەکانەوە هەیە کە خودای تەعالا فەرموویەتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ۝ ﴾ الملك: ٥

واتا: ﴿ بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان بە ئەستێرە ڕازاندۆتەوە، ئاسمانی نزیک لەئێوەمان بەئەستێرەی جۆراو. جۆر ئارایشت داوە﴾.

بەشی سێیەم، پێوەندیان بە هەواوە هەیە و ئەویش دەریاکان و ناو دڵی دەریاکان ڕووناک دەکا. ئەستێرەناس گوتی: «بابەتێکی دیکە ماوە ئەگەر بیزانێ ئەو دان بە زانایی و شارەزایی ئەودا دەنێم.» کەنیزە گوتی: «لێم پرسە.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەستێرەناس گوتی: «چوار شتم پێ بڵێ کە لەگەڵ یەک ناکۆک و ناتەبان و چوار شتم پێ بڵێ، کۆک و تەبان.» کەنیزە گوتی: «گەرمی و ساردی و تەڕی و ویشکییە. کە خودای مەزن لە تین و گەرمی ئاوری دروست کرد و کە زاتێکی گەرم و ویشکی هەیە، لە ویشکی گڵی دروست کرد کە زاتێکی سارد و ویشکی هەیە. لە ساردی ئاوی ئافراند کە زاتێکی سارد و تەڕی هەیە. لە شێ و تەڕیش هەوای دروست کرد کە زاتێکی گەرم و تەڕی هەیە. دوای ئەوە خودا دوازدە بورجی ئافراند: کاوڕ(حەمەل)، گا (سەوڕ)، جۆزەردان(جەوزا)، قرژاڵ (سەرەتان)، شێر (ئەسەد)، گوڵەگەنم (سونبولە)، تەرازوو (میزان)، دووپشک (عەقرەب)، کەوان (قەوس)، کاریلە (جوودەی) و سەتڵ (دەلو) و ماسی (حووت). ئەو بورجانە چوار سرووشتیان هەیە. سێ بورجیان سرووشتێکی ئاورینن، سێ بورجیان گڵینن، سێ بورجیان بایین و سێ بورجیشیان ئاوین. کاوڕ(حەمەل) و کەوان (قەوس) و شێر (ئەسەد) ئاورینن. گا (سەوڕ) و گوڵەگەنم (سنبلە) و کاریلە (جوودەی) گڵینن. جۆزەردان(جەوزا) و تەرازوو (میزان) سەتڵ (دەلو) بایین و قرژاڵ (سەرەتان) دووپشک (عەقرەب) و ماسی (حووت)یش ئاوین. ئیدی ئەستێرەناس هەستا و گوتی: «ئێوە شایەد بن کە ئەو کەنیزە لە من زاناترە. ئیدی بە بەزیوی لە کۆڕەکە چووە دەرەوە.

خەلیفە ئەوجار پرسی: «حەکیمی فەیلسووف لە کوێیە؟:» پیاوێک هەستا و ڕووبەڕووی کەنیزەکە دانیشت و پێی گوت: «باسی ڕۆژگارم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «ڕۆژگار بە تەواوی ئەو کات و ساتانە دەگوترێ کە لە شەو و ڕۆژدا هەن. پێغەمبەر فەرموویە کە جوێن و قسەی ناحەز بە ڕۆژگار مەدەن، چونکە بە ڕاستی ڕۆژگار ناوی خوداشە جنێو بە دەم و کاتیش مەدەن: «و ان الساعة آتية لاريب فيها» (= چونکە «کات» واتە قیامەت یا پەسڵان دەگاتێ و دێت و هیچ گومان لەوەدا نییە. نابێ قسە بە زەویش بگوترێ و چونکە ئەو هێمایەکە لە هێماکانی خودا. هەر وەک لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾ طه: ٥٥

واتا: ﴿ئێوەمان لەزەوی دروست کردووە، هەموو جەستەی ئادەمیزاد لەزەوی دروست بووە، بژێوی زەوی دەخواو ئاوی زەوی دەخواتەوە، هەوای سەر زەوی هەڵدەمژێ، باوە ئادەمیشتان لەگڵی زەوی دروست کراوە، ئەو دڵۆپە تۆمەی ئێوەی لێ پەیدا بووە لەخۆراک پەیدا بووە، خۆراکیش لەزەوی فەراهەم هێندراوە. دووبارە دەتانگێڕینەوە بۆناو زەوی،

کەمردن لەناو زەویدا دەنێژرێن‌و جەســـتەتان دەرزێ‌و دەبنەوە خاک‌و خۆڵ. لەوە بەولاوە زیندوتان دەکەینەوە لەگۆڕەکانتان دەرتان دەهێنینە دەرێ‌و ڕاپێچی حیســاب‌و لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەرتان دەکەین﴾.

بیرمەندەکە گوتی: «کەنیزە پێنج شـــتم پێ بڵێ کە خواردیان و خواردیاننە و بەڵام لە پشــت نەهاتنە خوارێ و لە زگیش نەبوون.» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئادەم و شــمعوون و ئاروانە[1]کەی ســـالح و کاوڕەکەی لە جێی ئیســـماعیل کرا قوربانی و ئەو باڵندەیەی کە ئەبوبەکر لە ئەشـکەوتەکەدا دیتی.» بیرمەند پرسـی: «پێنج شـتم پێ بڵێ کە نە لە ڕەگەزی مرۆڤن و نە جندۆکەن و نە فریشـــتەن؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «گورگەکەی یەعقووب و سەگەکەی ئەسحابی کاف و کەرەکەی عەزیز و ئاروانەکەی ساڵح و دوڵدوڵی پێغەمبەر (د . س).» بیرمەند پرســـی: «ئەو پیاوە کێ بوو نوێژی کرد بەڵام نە لە ئاســـمان بوو نە لە زەوی؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئەو پیاوە حەزرەتی ســولەیمان بوو لە ســـەر قالیچەکەی نوێژی کرد کە لە سەر پشتی با دەڕۆیشت.» بیرمەندە پرسی: «ئەو کەسە کێ بوو نوێژی بەیانی کرد، چاوی لە کەنیزێک کرد کە بۆ ئەو حەرام بوو. بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئەو کەنیزە بوو بە حەڵاڵی. کە بوو بە عەسر هەر ئەو کەنیزە لێی حەرام بوو. کە ڕۆژ ئاوا بوو دیسان بۆی حەڵاڵ بووەوە. هەر دوای ئەوە کە کاتی نوێژی خەوتنان هات لێی حەرام بووەوە. بۆ نوێژی بەیانی دووبارە بۆی حەڵاڵ بووەوە؟» کەنیزە وەڵامی داوە:«ئەو پیاوە کە بەیانی ئەو کەنیزەی دیوە هیچی نەبووە و لێی حەرام بووە. بۆ نیوەڕۆ چووە کڕیویتی و بۆی حەڵاڵ بوو. لای ئێوارە ئـازادی کردووە و لێی حەرام بوو. دوایە مـارەی کردووە و بۆ نوێژی شێوان بۆی حەڵاڵ بووە. پاشان تەڵاقی داوە و بۆ نوێژی خەوتنان لێی حەرام بوو. بۆ بەیانی چووە هێناوییەتەوە و دیســـان بۆی حەڵاڵ بووە.» بیرمەندەکە پرســـی: «گەڵۆ گۆڕی کێ لەگەڵ خاوەنەکەی دەڕۆیشـــت؟» کەنیزە وەڵامی داوە ئەوە ئەو ماســـییە کە یۆنسی قوت دابوو لەگەڵ خۆی دەیگێڕا.» بیرمەندە پرسی: «ئەو ئەرزە کوێیە کە هەر تاقە جارێک تاو تێی کردووە و تازە هەتا هەتایە تێی ناکاتەوە؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئەوە بنی ئەو دەریایە کە کاتێک مووســـا بە گۆچانەکەی لێی دا شـــەق بوو تاو لە بنەکەی دا و ئیدی تازە هەتا هەتا تاو تێی ناکاتەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئاروانە: وشتری مێو.

## که شەوی چوارسەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بیرمەندی زانا دوای ئەوە لە کەنیزەی پرسی: «یەکەم داوێنێک کە لە عەرزی خشـا داوێنی کێ بوو؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «داوێنی حەزرەتی هاجەرە بوو. کە تەندوورەیەک بوو لە نێو قەدیانەوە دایدەپۆشـی هەتا سـەر ئەرزی و پاشـان بوو بە جلی سـوننەتی عەرەب.» بیرمەند گوتی: «شـتێکم پێ بڵێ کە هەیە، بەڵام رووحی نییە؟» کەنیزە وەڵامی داوە:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ ﴾ التكوير: ١٧ - ١٨

واتا: ﴿سوێندم بە شەو کاتێک بە تاریکی خۆی هێرش دێنێ، یان کاتێک پشت هەڵدەکاو بەرەو کۆتایی دەڕوا، (هەردوماناکە دەگونجێن) سـوێندم بە بەیانی کاتێک شـەبەق دەداو ئاسۆ روناک دەکاتەوەو بەدەم هەموو شتێکەوە پێ دەکەنێ﴾ .

بیرمەنـد گوتی: «هێنـدێک کۆتر لە سـەر دارێکن و هێنـدێکیـان لە خوار دارەکەن. کۆترەکانی سـەر دارەکە بە کۆترەکانی خوار دارەکەیان گوت ئەگەر ئێوە یەکتان بێنە لای ئێمە، ئێوە دەبنە یەک لە سێی ئێمە، ئەگەر یەکی ئێمە بێتە لای ئێوە، ئەوە بە قەد یەکمان لێ دێ؟» کەنیزە ولامی داوە: «کۆترەکان دوازدە دانە بوون. حەوت کۆتر لە سـەرێ و پێنج کۆتریش لە خوارێ بوون. ئەگەر لەو پێنجەی خوارێ یەکیـان چووبا سـەرێ، ئەوانەی سـەرێ دەبوونە هەشت و خوارێ چواری لێ دەماوە و دەبوو یەک لەسـەر سێی ئەوانەی سەرێ. ئەگەر لەوانەی سەرێ دەنکێک چووبا خوارێ ئەو سەرێ شەش کۆتری لێ دەماوە و خوارێش دەبوونە شـەش و بە قەد یەکیان لێ دەهات.» ئیدی بیرمەند کەوای تایبەتی زانایی داکەند و لە کۆڕەکە وەدەر کەوت.

بەڵام قسـەکردنی کەنیزەکە لەگەڵ هەڵبەسـتوان بەو جۆرە بوو کە دوای ئەوە بیرمەند وەدەر کەوت و ڕای کرد، کەنیزە ڕووی لە دانیشتوان کرد و گوتی: «لە نێو ئێوەدا کێ قسە زانی چاکە لە بابەت زانسـت و وێژەوە؟» نیزام هەسـتا بەرەو ڕووی هات و پێی گوت: «ئەمن وەک ئەوانی دی نیم و ئاوا نەڕوانییە من.» کەنیزە گوتی: «بەڵێ، ئەمن لە ئێسـتاوە دەزانم تۆ دۆڕاوی چونکە تۆ لە خۆبایی. خودا یەدم دەدا کەوای زاناییت لە بەر داکەنم. پێم وا بێ وا باشتر بوو، کەسێکت ناردبا کراسێکت بۆ بێنێ.» هەڵبەستوان گوتی: «بە خودای بێ هاوتا ئەمن بە سـەر تودا زاڵ دەبم و لە بەر چاوی ورد و درشـتی خەڵک سـووک و

چرووکت دەکەم.» کەنیزە پێی گوتەوە: «کەفارە[1]ی سوێندەکەت ئامادە بکە.» هەڵبەستوان گوتی: «پێنج شـــتم پێ بڵێ کە خودا لە پێش هەموو بەدیهاتووان، ئەوانی ئافراند؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئاو و گڵ و ڕووناکی و تاریکی و میوەگەل.» شاعیر پرسی: «شتگەلێکم پێ بڵێ خودا بە هێزی دەستی خۆی دروستی کردبێ.» کەنیزە وەڵامی داوە: «عەرش و داری بەهەشـت و ئادەم و بەهەشـت کە خودا ئەوانەی بە هێزی دەسـتی خۆی چێ کرد و ئیدی ئەو شــــتانەی دیکە هەر فەرمووی ببن و ئەوانیش بوون.» شـــاعیر گوتی: «پێم بڵێ لە ئیسـلامدا باوکی تۆ کێیە؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «محەممەد (د ــــ س).» شاعیر پرسـی: «ئەی باوکی محەممەد لە باوەڕدا کێیە؟» کەنیزە وەڵامی داوە: «ئیبراهیمی خەلیلە.» پرسی دینی ئیسلام چییە؟» کەنیزە بەرسڤی داوە: «دان نان بە بێ هاوتایی خودا و پێغەمبەر (د ـ س).» شاعیر گوتی: «باسی سەرەتا و سەرەنجامی خۆتم بۆ بکە.» کەنیزە گوتی: «بەرێم ئاوێکی لیخن و کۆتاییشـم کەلاکێکی بۆگەن.» لە سـەرەتاشـدا لە گڵ چێ کراوم هەر وەک شاعیر دەڵێ:

لــــە خۆڵی چێ کردی خــــودای بێ هــــاوتا
بــــەندەیــەکــی خــــــۆڵین بە لــە قــاپیدا

شاعیر گوتی: «شتێکم پێ بڵێ کە لە پێشدا لە چێو چێ کرابێ و لە خۆتاییدا بووبێ بە گیانلەبەر.» کەنیزە گوتی: «ئەوە گۆچانەکەی حەزرەتی مووســـایە کە کاتێک حەوای دا بە ئیزنی خودا بووبە هەژدیها. شاعیر گوتی: «باسی ئەو فەرموودەیەی خودای مەزنم بۆ بکە کە دەفەرمێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ ﴾ طه: ١٨

واتا: ﴿وتی: ئەوەعەصاکەمە، لەکاتی ڕۆیشتن دا خۆمی سەردەدەم، گەلای درەختەکانی پێ هەڵدەوەرێنم بۆ ئەوەی ئاژەڵەکانم بیخۆن. چەند مەبەســـتو بەرژەوەندی ترم تێدا هەیەو بۆزۆر شتی تر بەکاری دەهێنم﴾.

کەنیزە گوتی: «مووســـا (س ــــــ خ) ئەوی لە ئەرزی دەچەقاند، ئەو گۆچانە چرۆی

---

١. پارە یان ماڵێکە کە ئەگەر کەسێک سوێندی خوارد و قسەکەی بۆ نەچووە سەری لە جێی ئەو سوێند و بێ بەڵێنییەی دەبێ بی دا بە هەژارێک.

دەردەکرد و بەری دەدا. لک و پۆ و گەڵای دەردەکرد و لە گەرمادا سێبەری دەکرد. ئەگەر حەزرەتی مووسا لە شوێنێک دەماوە سواری دەبوو. کاتێک مووسا دەخەوت ئەو گۆچانە ئاگای لە مەڕەکان دەبوو.» شـــاعیر گوتی: «پێم بڵێ ئەو ژنە کێیە لە پیاو بوو، هەر وەها ئەو پیاوەی لە ژن بوو؟» کەنیزە گوتی: «حەوا لە ئادەم بووە و عیساش لە مریەم دروست بووە.» شاعیر گوتی: «پێم بڵێ ئاواڵە چییە و داخراو چییە؟» کەنیزە گوتی: «شاعیر، ئاواڵە سوننەتە و داخراویش فەرزە.» شاعیر گوتی: «مەبەستی شاعیر لەو شێعرە چییە؟»

ئەوە چییە ســــــــــــــــەری بتاشی چاترە
بە ســــــــــــــــەری تاشراوەوە ڕێزی زیاترە
تا ســــــــــــــــەری نەتاشی کاری پێ ناکرێ
ســــەری چاک بتاشـــی قســـەشـــی جوانتەرە

کەنیزە وەڵامی داوە: «شـــاعیر مەبەســـتی قەڵەمە.» شـــاعیر پرســـی: «ئەو شـــاعیرەیان مەبەستی چیی؟»

ئـــاڵای ڕۆژی بە دەســـــتەوە تـــاریکی خۆی لە بەر نـــاگرێ
ئەو گیـــانفیـــدای ڕوونـــاکییە و ئـــاڵای نـــاکەوێ تـــا دەمرێ

کەنیزە وەڵامی داوە: «شـــاعیر مەبەســـتی لە مۆمە». شـــاعیر پرســـی: «پێم بڵێ خودای میری مەزن چەند وشە لەگەڵ حەزرەتی مووسا دوا؟» کەنیزە بەرسڤی داوە: «دەگێڕنەوە پێغەمبەر (د ـــــ س) فەرمووویە خودای بێ هاوتا هەزار و پێنجســـەد و پازدە وتەی لەگەڵ حەزرەتی مووسا کردووە.» شاعیر گوتی: «چاردە شتم پێ بڵێ کە لەگەڵ خودای گەورەدا وتووێژی کردبێ؟» کەنیزە وەڵامی داوە حەوت ئاسمان و حەوت زەوی بوون کە گوتیان:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾ فصلت: ١١

واتا: واتە: ﴿پاش دروســـتکردنی زەوی، ڕووی کردە بەدیهێنانی ئاســـمانو ویســـتی بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی تەواوی بکاو بیهێنێتە ســـەر حاڵی ئاسـایی ئێســتای...لەو قۆناغەدا ئاســـمان بریتی بوو لە کێتلە گازێکی تاریکو شـــێوە دوکەڵ، یان هەڵمو (ســـەدیم) بوو، خودا فەرمانی پێ کرد، کەپێک بێو بێتە کایەوە، خۆرو مانگو ئەســـتێرەکانی بێنەدی،

وەکوو چۆن فەرمانی بە زەوی کرد، کەشــێوو دۆڵ و چۆمو کانیاوو گژوگیاو درەختو پێداویســتییەکانی تری ژیانی تێدا بێتە دی، بەتەواوی جوڵەو هاتەکایەوە، تیر ئاســمانو زەوی پێکەوە ملکەچو بەگوێرەی ویســتی خودا هاتنە دیو حاڵی ئاســایی ئێســتایان بەخۆیانەوە بینی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شه‌وی چوارسه‌د و په‌نجا و شه‌شه‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشكۆ! كاتێك كه‌نیزه وه‌ڵامی پرسیاره‌كانی شاعیری داوه، شاعیر گوتی: «پێم بڵێ خودا چۆن ئاده‌می دروست كرد؟» كه‌نیزه جوابی داوه: «خودای گه‌وره ئاده‌می له قوڕ و قوڕی له كه‌ف و كه‌فی له ده‌ریا و ده‌ریای له تاریكی و تاریكی له تیشك و ڕووناكی و تیشك و ڕووناكیشی له ماسی و ماسی له تاشه‌به‌رد و تاشه‌به‌ردی له یاقووت و یاقووتی له ئاو و ئاوی له هێز به‌دی هێنا. هه‌روه‌ك خودای ته‌عالا فه‌رموویه‌تی:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾ يس: ٨٢

شاعیره‌كه گوتی: «شاعیر له‌و شێعره‌دا مه‌به‌ستی چی بوو؟»

زه‌رد و ســـــــــــوور و نارنجییه ڕواڵه‌تی
ده‌تـــــــــــــوێته‌وه چی سه‌خته و له ناوێتی
خوای لێ قه‌ومـاوانی شـــــاخ و كێو بوو ئه‌و
چه‌كی به‌ره‌نگاری ســـــــــــه‌رما و سه‌خڵه‌تی

كه‌نیزه گوتی: «مه‌به‌ستی ئاگره.» شاعیر گوتی: «ئه‌وه‌یان مه‌به‌ستی چییه؟»

چییه جـــــــــــــوانه و وه‌ك ئاسمان كه‌وانی
له به‌ر دڵه، ئـــــــــــــــه‌وه‌نده‌ی تێی بڕوانی
ئـــــــــــــــه‌ستێره و مانگ له ناویا ده‌دره‌وشێ
كوچكی ڕه‌ســــــه‌ن بێ به هیشـــــتی نارووشـــــێ

كه‌نیزه گوتی: «نه‌قیمی ئه‌نگوستیله‌یه.» شاعیر گوتی: «مه‌به‌ستی ئه‌و شێعره‌شم پێ بڵێ.»

بـــــــۆشـــــه له خۆیدا و نییه‌تی بیچم و ڕه‌نگ و ئاكارێ
نییه كه‌س له‌گه‌ڵتـا وا ڕاســــت. نییه‌تی بۆت ئازارێ
له‌گه‌ڵ شینتانا شیـــــــــــــــــن و له سه‌مادا سه‌ما ده‌كا
به ڕۆژ ژین له باوه‌ش ده‌كا، شــــــــــــه‌وانه‌ش وچان ده‌دا

کەنیزە گوتی: «ئاوێنەیە.» شاعیر گوتی: «ئەو شێعرەیان مەبەستی چییە؟»

کێیە بە کــــــۆڵ دەریاوەیە و لێوەکانی ویشـــــک هەڵاتووە
کۆڵـــــــــــــــێک شتی بە کۆڵەوە لە ڕێی دوورەوە هاتووە
گەر بێـت و ئـاو بخواتەوە، بە ســــەدان ســــەر تێدا دەچێ
دەبـــــــــــــــێ تا ئەو ڕۆژەی هەیە بە تینوێتی بێت و بچێ

کەنیزە گوتی: «ئەوە کەشتییە.»

شاعیر گوتی: «باسی سیڕاتم بۆ بکە چییە و چەندە درێژە و چەندە پانە؟ کەنیزە گوتی: «ڕێگای سێ هەزار ساڵ دوور و درێژە، هەزار ساڵ دەبێ بە سەریدا هەڵکشێی و هەزار ساڵ داگەڕێیەوە. هەزاری ڕێک. لە دمی شیر تیژترە و لە موو باریکترە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کەنیزە کە تایبەتمەندییەکانی پردیَ سیراتی گوت، شاعیر لیّی پرسی: «پێغەمبەری ئێمە (د ـــــ س) بە چەند جۆر ئەرجۆ یان شـفاعەت دەکا؟» کەنیزە وەڵامی: «داوە سێ جۆر.» شاعیر پرسی: «گەلۆ ئەبووبەکر یەکەم کەس بوو کە ئیسلامی قەبوول کرد؟» کەنیزە جوابی داوە: «بەڵێ.» شـاعیر پرسـی: «عەلی دوای ئەبووبەکر موسـوڵمان بوو؟» کەنیزە ولامی داوە کە عەلی حەوت سـاڵان بوو لەگەڵ پێغەمبەر بوو ئەو هەر منداڵییەوە خودا ڕێی نیشـان دابوو قەتی بوت نەپەرسـت بوو.» شـاعیر پرسـی پێم بڵێ: «عەلی گەورەترین یان عەباس؟» شـاعیر دوای ئەوە گێراویتەوە کە بە فێڵ و دهۆ ئەو پرسـیارەم لێ کرد گوتم بەشـکوو راسـتییەکەی بڵێ و لە لای خەلیفە ڕەش بێ. دەڵێ: «کەنیزە ماوەیەک سەری داخست، و ڕەنگی هێنا و برد و پاشان گوتی: «جا بۆ دوو پیاوی ئاوا گەورە پێک دەگری کە هەر یەکی بۆخۆی گەورەیی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەتۆ وەرەوە سـەر باسـەکانی پێشـوومان. کاتێک خەلیفە ئەو قسـەیەی لە کەنیزە بیست هەسـتا و گوتی: «ئافەرین، بژی کەنیزە.» ئیدی دوای ئەوە ئیبراهیمی شـاعیر بە کەنیزەی گوت: «ئەو شاعیرە مەبەستی لەو شێعرە چ بووە؟»

چییە ئەو مارەی بەرەو سـینگی دووژمن دەڕوا
جەستە حەیزەران، کلک ئاسـن و سەر پۆلا

کەنیزە وەڵامی ئەوە: «ئەو ڕمبە.»

شاعیر گوتی وەڵامی ئەو پرسیارانەم بدەوە: «لە هەنگوین شیرینتر و لە شیر تیژتر و لە ژەهر کوشندەتر چین؟ هەر وەها چێژی دەم یا کات و چێژی سێ ڕۆژە چین؟ خۆشترین ڕۆژەکان و شـادی یەک حەوتوو لە چی دایە؟ ئەو مافەی خودا ناتوانی چاوپۆشـی لە پێشـێلکردنی بکا چییە؟ بەندیخانەی دڵ و شـادی دڵ لە چی دایە؟ فڕوفێڵی نەفس چییە؟ مردن لە ژیاندا و دەردێک کە دەرمانی نییە کامەیە؟ پەڵەیەک کە ناشـۆرێتەوە و گیاندارێک کە لە ئاوەدانیدا ناژی و زیاتر لە مەزرا و شـت دەژی و لە حەوت گیانلەبەریتر چێ بووە چییە؟»

کەنیزە وەڵامی داوە و گوتی: «جلەکانت دانێ هەتا ئەمن وەڵامی ئەو پرسـیارانەت بدەمەوە.» خەلیفە گوتی: «ئەتۆ وەڵامەکانیان بدەوە ئەو کەوا و دەسـرەوکڵاوەکەی دادەکەنێ.» کەنیزە ولامی داوە: «لە هەنگوین شـیرینتر خۆشـەویسـتی منداڵی مێهرەبان و دلۆڤانە. لە شـیر تیژتر و بە بڕشـتتر زمانە. لە ژەهر کوشـندەتر چاوای بەدخوازانە. چێژی

دەم و کات نیزیکی لەگەڵ ژنانە. شادی سێ ڕۆژە لەش هەڵگرتنی ژنان و خاوێنکردنەوەی گەندەموو. خۆشـــترین ڕۆژیش ئەو ڕۆژەیە لە دانوســـاندا قازانجت پێ بگا. شـــادی یەک حەوتوو زەماوەندە. مافێک کە خودا ناتوانێ چاوپۆشـــی لێ بکا مەرگە و بەندیخانەی دڵ کوڕی لاسارە و شادی دڵیش ژنێکە کە گوێڕایەڵی مێردەکەی بێ. فڕوفێڵی نەفس بەردەستی یاخی و ســـەربزێوە. مەرگی ژیان هەژارییە و ئەو دەردەی دەرمانی نییە نەقوســـتانی زکماکییە. ئەو پەڵە ڕەشـــەی پا ناکرێتەوە کچی ســـووک و چرووکە. ئەو گیانلەبەرەی لە ئاوەدانی نامێنێتەوە و دەچێتە کەلاوە و دەشـــت و دەران و لە حەوت گیانلەبەری دیکە دروســـت بووە، کوللەیە کە ســـەری وەک ئەســـپە و ملی وەک ملی مانگا و دوو باڵی هەیە وەک سیسارک و قاچەکانی وەک قاچی وشتر و کلکی وەک کلکی مار وایە. زگی وەک زگی دووپشک و شاخەکانی وەک شاخی ئاسکە.»

خەلیفە هاڕوونەڕرەشید سەری لە بلیمەتی و زانایی کەنیزەکە سووڕ ما و بە شاعیری گوت: «عەبا و عەمامەکەت دانێ.» لە جێوە شـــاعیر هەســـتا و گوتی: «بەڕێزان ئەمن دانی پێدا دەنێم کە ئەو کەنیزە لە من شارەزاتر و زاناترە. ئەوەی گوت و جلەکانی داکەند و دای بە کەنیزەکە و پێی گوت: «ها بیگرە خودا لێتی مەبارەکی کا.»

خەلیفە فەرمانیدا جلوبەرگی دیکەیان بۆ برایمی شـــاعیر هێنا و خەڵاتی کرد و بە کەنیزەکەشی گوت: «خۆشـەویست لەو هونەرانەی کە بانگەشـەت بۆ دەکرد، شتێکت ماوە بیسەلمێنی ئەویش شەترەنجە.» خەلیفە فەرمانی دا بانگی مامۆستا و ڕاهێنەری شەترەنج و یـاری پەڕ و تـاوڵە بـانگ بکەن. کە ڕاهێنەرەکە هـات، لەگەڵ کەنیزەکە دەســـتی کرد بە شەترەنج و مۆرەکانیان چنی. ڕاهێنەرەکە یاری کرد و مۆرەی بزاوت. کەنیزەش مۆرەیەکی بزاوت. ڕاهێنەرەکە تازە چەند مۆرەی بزاوتبوو کە لە پڕدا ســـەیری کرد کەنیزەکە کیشـــی داوە و شاکەی مات بووە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ڕاهێنەرەکە مات بوو. کە مات بوو گوتی: «ئەو جارە بە ئانقەست پێم دۆڕاندی هەتا وە تەماع کەوی و وابزانی کە شـــتێک دەزانی، ئەگەر ئازای داینێوە با پێت بڵێم شـــەترەنج چۆنە. کاتێک دیســـان مۆرەکانیان داناوە، ڕاهێنەرەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەبێ ئەو جار بە ســـەرنجەوە کایە بکەم، دەنا ئەو کەنیزە ئەوجارەش لێم دەباتەوە. هەر ئاوا بە دەم ئەو فکرەوە دەســـتی کرد بە یاری کردن. وردە وردە و بە سـڵەوە کایەی کرد هەتا لە پڕدا ســـەیری کرد مات بوو. ڕاهێنەرەکە کە ئەو هەمووە شـــارەزایی و لێزانییەی کەنیزەکەی دیت پەشـــۆکا و تاســـا. کەنیزە پێکەنی و پێی گوت: «مامۆســـتا من ئەوجار مەرجت لەگەڵ دەکەم کە وەزیر و قەڵای ڕاست و ئەسپی چەپیش لا دەبەم. ئەگەر تۆ منت بەزاند ئەوە جلەکانم لە بەر داکەنە ئەگەر ئەمن تۆم بەزاند ئەوە جلەکانت لە بەر دادەکەنم. مامۆستاکە گوتی باشە قەبووڵمە.»

دوای ئەوە مۆرەکانیان داناوە و کەنیزەکە وەزیر و قەڵا و ئەســـپەکەی هەڵگرت و بە ڕاهێنەرەکەی گوت: «کایە بکە، ڕاهێنەر مۆرەیەکی گواســـتەوە و لە دڵە خۆیدا گوتی: «ئەو کارەی ئەو کردی و وەزیر و قەڵا و ئەسپی هەڵگرت حەتمەن بە سەریدا زاڵ دەبم. هێشتا هەر چەند مۆرەیان گواســـتبووەوە کە پیادەیەکی کردە وەزیر و یەکی کردە قەڵا و یەکی کردە ئەسپ و دوای ئەوە ئەوەندەی پێ نەچوو کە شای مات کرد. ئەوجار بە مامۆستاکەی گوت: «کەوا و پاتۆلی ڕاهێنەری داکەنە.» مامۆســـتا گوتی: «کەواکەم دادەکەنم بەڵام تکات لێ دەکەم با پاتۆڵەکەم دانەکەنم. خودا پاداشی خێرت داتەوە» مامۆستا سوێندیشی خوارد هەتا لە وڵاتی بەغدادا بێ، قەت شـــەرترەنج نەدۆڕێنێ. دوای ئەوە کەواکەی داکەند و بە خەجاڵەتی لە کۆڕەکە چووە دەرێ.

ئەوجار مامۆستای تاوڵە هاتە پێشێ. کەنیزە پێی گوت: «ئەگەر ئەوڕۆ لێت بەرمەوە چم دەدەیەی؟» مامۆستا گوتی: «کراسی دیبای پەڕاوێزدار و چنراو بە سیم و داوی زێڕەوە و دە کراسی مەخمەر و هەزار دینارت دەدەمێ. بەڵام ئەگەر من لێم بردییەوە هیچم لێت ناوێ تەنیا بە دەســـتی خۆت نووســـراوەیەکم بۆ بنووســـە کە ئەمن یاری تاوڵم بە فڵانکەس دۆڕاند.» کەنیزە گوتی: «زۆر باشـــە ئەوە قەول و قەرارمان بێ.» دەســـتیان کرد بە کایەکردن ئەوەندەی پێ نەچوو کە مامۆســـتا هەستا و گوتی: «بە نیعمەتی خەلیفە قەســـەم ئەمن تاوڵەکەری وەک ئەو کەنیزەم لە تەواوی دونیادا نەدیوە.» دوای ئەوە بانگی خاوەنی ئامێرە مووزیکەکانیان کرد. کە هاتن، خەلیفە بە کەنیزەکەی گوت: «ئەگەر سەرت لە ئامێری مووزیک دەردەچێ کەمێکمان بۆ بژەنە.» کەنیزە گوتی: «بەڵێ شـــارەزام.» ئیدی خەلیفە

فەرمانی دا عوود بێنن. جانتایەکی ئەتڵەسی سووریان هێنا. کەنیزە جانتاکەی کردەوە و عوودەکەی دەرهێنا. لە سەری نووسرابوو:

ئێرەییم دێ بە جەستەی تۆ عوودەکە
سەر وە کۆشی نەرمی کە و شەرمێ مەکە

ئیدی عوودەکەی لە سەر ڕانی دانا و بە جۆرێکی ژەنی کە کوڕەکەی وە سەما هێنا و ئەو دوو بەیتەشی بۆ خوێندنەوە:

گەر کرابا شۆخی شۆخان جارێ منی ژەنی بایە
لە حەسرەتی ئەو شۆخەدا هەناوم ئاوا نەبایە
ئێستا جەستەم نەدەلەرزی وەکوو پەرەنگی گوارەکەی
نەدەبووم بە نۆتی خەم دڵگیر بکەم حەیرانەکەی

خەلیفە کەیفی ساز بوو گوتی: «بارەکەڵلا.» واتە خودا پاداشت داتەوە و لە مامۆستاکەشت خۆش بێ. لەپڕێەوە کەنیزە هەستا و کڕنۆشی بۆ خەلیفە برد. خەلیفە گوتی: «سەدهەزار دینار بدەن بە خاوەنەکەی.» بە کەنیزەشی گوت: «هەرچیت دەوێ داوا بکە.» کەنیزە گوتی: «تکا و داوام ئەوەیە کە بمدەیەوە بە خاوەنەکەی خۆم.» خەلیفە ئەوی داوە بە خاوەنەکەی و پێنج هەزار دیناریشی دا بە کەنیزەکە. خاوەنەکەشی کرد بە یار و هاودەمی خۆی.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! خەلیفە خاوەنی ئەوی کرد بە هاونشـــینی خۆی و مانگانە هەزار دیناری بۆ بڕییەوە. شەهرزاد کە چیرۆکەکەی گەیاندە ئێرە گوتی: «پاشا جا چاو لە زانایی و بلیمەتی ئەو کەنیزە کە و دلاوایی و گەورەیی خەلیفە کە چەندی ماڵ دا بە خاوەنەکەی و کردیشـی بە هاونشـینی خۆشـی گەورەیی ئاوا لە عەباسـییەکان نەبێ لە کێ دەوەشـێتەوە، خودا لە دلاوایان خۆش بێ.

## چیرۆکی ئیزڕائیل

### چیرۆکی یەکەم

گوتی: خاوەنشـــکۆ! یەکێ دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە پاشـــایەک لە پاشـــایانی زوو، ڕۆژێک ویســـتی لەگەڵ دەســـتوپێوەندەکانی ســـوار بێ و ســـەری خەزێنەی هەڵداتەوە و باشترین زێڕ و جەواهێراتەکەی پێشانی خەڵک بدا.

هەر بۆیە فەرمانی بە گەورەگەورەکانی دەوڵەت دا هەتا ســـاز بن بۆ چوونە دەر. بە خەزێنەدار و ئەنباردار و شتی گوت باشـترین جلوبەرگی شـایانە کە شـیاوی بێ بۆی بێنن. داوای باشـــترین ئەســـپی کرد کە لە ولاتەکەیدا بە ناو و دەنگ بوو. ئینجا جوانترین جلی پۆشـــی و ســـواری باشـــترین ئەســـپ بوو. پاشـــان لەگەڵ خەڵکێکی زۆر کە لە ڕکێفیدا دەڕۆیشتن چووە دەرێ و شانازی بەو هەموو هێز و دەسەلات و دەستڕۆیشتووەی خۆی دەکرد. لەو کاتەدا شـــەیتان هات لە کلێشـــەیەوە و دەســـتێکی بە تەویڵیدا هێنا و بای فیز و دەماری لە تفنگی کرد.

پاشا هەر دەخۆی فشی و لە دلی خۆیدا دەیگوت بلێی کەس لە دونیادا وەک من بێتەوە و کەس هێندەی من گەورە و بە دەســەلات و دەســتڕۆیشــتوو بێ؟ بە کورتی پاشـا هەر وا بای فیز و لەخۆباییبوونی لە لووتیدا دەگەڕا، تا کار گەیشتە جێیەک کە چاویشی لە خەڵکی نەدەکرد و بەردەمی خۆی نەدەدیت. وا بوو ڕۆژێک کابرایە کە جلوبەرگێکی کۆن و شڕۆڵی لە بەردا بوو هاتە لای پاشـا و سـلاوی کرد. پاشـا وەلامی سـلاوەکەی نەداوە، کابرا لغاوی ئەسـپەکەی گرت. پاشـــا وەدەنگ هات و گوتی: «دەســـتت لابە دەازنی دەســـتت بۆ لغاوی ئەسپی کێ بردووە؟» کابرا گوتی: «ئەخە من کارم بە جەنابتە.» پاشا گوتی: «ڕاوەستە با لە ئەسـپەکە بێمە خوارێ. ئەودەم قسـەکەت بکە.» کابرا گوتی: «قسـەکەی من نەهێنییە و هەر دەبێ بە سرتە بە گوێچکەتی بلێم.» پاشا سەری هێنا پێشێ و گوێی بۆ ڕاگرت.

ئەو کابرایە بە پاشـــای گوت: «ئەمن ئیزڕائیلم و ئێســـتا هاتووم گیانت بکێشـــم.» پاشـــا

گوتی: «ماوەیەکم مۆڵەت دە هەتا ماڵێ بچمەوە و ماڵاوایی لە منداڵ و دەوربەریانم بکەم.» ئیزرائیل گوتی: «ئەوە دووره تازه تۆ ناگەڕێیەوە بۆ لای ماڵ و منداڵت و تەمەنت گەیوەتە کۆتایی و عومرت تەواو بووه.

وا بوو ئیزرائیل گیانی پاشای کێشا و پاشا لە سەر ئەسپەڕا کەوتە خوارێ. ئیزرائیل لەوێ ڕۆیشت و دوور کەوتەوە تووشی کابرایەکی پیاوچاک بوو. سڵاوی لێ کرد. ئەویش جوابی سڵاوەکەی داوه. ئیزرائیل گوتی: «کاکی برا ئەمن کارێکی تایبەتم پێتە.» ئەو کابرا پیاوچاکە گوتی: «قسەکەتم پێ بڵێ.» ئیزرائیل گوتی: «ئەمن ئیزرائیلم.»

کابرای پیاوچاک گوتی: «بە خێر بێی، زۆر سپاس ئەمن دەمێک بوو چاوەڕێت بووم و تامەزرۆی دیدارت بووم.» ئیزائیل پێی گوت: «ئەگەر کارێکت هەیە بچووه بیکە.» ئەو کابرایەش گوتی: «کارم لەوە گرینگتر نییە بە دیداری خودا شاد بم.» ئیدی ئیزائیل لێی پرسی: «پێتخۆشە چۆن و لە کوێ گیانت بکێشم.» کابرای پیاوچاک گوتی: «دەرفەتم بدە بچم دەزنوێژ هەڵگرم و بچم لە مزگەوت نوێژ بکەم، ئینجا لە کاتی سووژدەدا گیانم بکێشە.» خودای بێ هاوتا فەرمانی پێ کردووم بە پێی ویستی تۆ بجووڵێمەوە.» ئەو کابرایە هەستا و دەزنوێژی گرت و چووە مزگەوت و دەستی کرد بە نوێژ کردن. هەر کە چووە سەر سووژدە، ئیزائیل گیانی کێشا و بەرەو شوێنی فەڕ و هاتی برد.

#### چیرۆکی دووەم

دیسان دەگێڕنەوە پاشایەک لە پاشاکان ماڵ و زێڕ و زیوەرێکی زۆر و بێ ئەژماری بوو. لە هەر شتێک کە خودا بەدی هێنابوو ئەو کۆی کردبووەوە. بۆ ئەوەی لە خۆشی و ئاسایشدا بژی. دوای ئەوە کۆشکێکی پتەو و قایمی وای چێ کرد کە شیاوی پاشا بێ. دوو دەرگای ڕێکوپێکی لە کۆشکەکە کرد و دەرکەوان لێ دانان. ڕۆژێک لە ڕۆژان بە چێشتلێنەرەکەی گوت: «خواردنێکی خۆش ئامادە بکا. ئینجا دەستوپێوەندەکانی لە خزمەتکار و کاربەدەست کۆ کردەوە، هەتا لەگەڵ ئەو نان بخۆن. بۆخۆی لە سەر تەختی دەسەلات دانیشت و پاڵی و پاڵپشتی شایانەوە دا و لە دڵە خۆیدا گوتی: «نەفسی گڵاو ئەمن تەواوی دونیام بۆ کۆ کردوویەوە. ئێستا بە ئاسوودەیی لەو هەموو نیعمەتە بخۆ و هەتا هەتایە کەڵکی لێ وەرگرە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــکۆ! هێشــتا پاشــا لەو وتووێژە دەروونییەی خۆی تەواو نەببوو، کە کابرایەک هاتە بەر دەرکی کۆشــک. جلوبەرگێکی شــڕۆڵی لە بەردا بوو. توورەکەیەکی بە ملیدا کردبوو. وەکوو ســـوالکەر دەچوو. لە دەرگای کۆشـــکی دا بەلام چ لە دەرگادانێک، خەریک بوو تای دەرگاکە لە ڕێســـمە بەرێ. کۆیلە و غولامەکان بەرەو دەرگای کۆشـــک ڕایان کرد و بە ســەر کابرایاندا قیژاند، کاکە ئەو چ لە دەرگادانێکە؟ ڕاوەســتە با پاشــا نان بخوا دوایە لە بەرماوەکەی پاشا بەشت دەدەین. کابرا بە غولامەکانی گوت: «بە پاشا بڵێن بێتە ئێرە، کارێکی پێویســتم پێیەتی.» کۆیلەکان گوتیان بڕۆ لاچۆ ئەتۆ کێی بە پاشــا دەڵێی بێتە دەرێ!؟ کابراکە گوتی: «ئێوە بچن قســەکەی من بە پاشــا بڵێن.» غولامەکان چوونەوە حزووری پاشــا و شــتەکەیان بۆ پاشــا گێڕاوە. پاشــا گوتی: «باشــە بۆ تێتانهەڵنەدەدا و وەدەرتان نەدەنا.»

لەو جەنگەیەدا زۆر لە جاری پێشــوو توندتر لە دەرگاکەی داوە. کۆیلەکان بە دار و تێلا هەلاتن بۆ لای دەروازەکە. چوون لێی دەن. ئەو پیــاوە هەرای کردنێ و گوتی: «لە جێی خۆتان نەبزوون چونکە من ئیزڕائیلم.» غولامەکان ترسیان ڕێنیشت و هۆشیان نەما. ئازای جەستەیان وە لەرزە کەوت و لە جێی خۆیان ویشک بوون. پاشا هەرای کردنێ بە ئیزڕائیل بڵێن گیانی یەکی دیکە لە جێی من بکێشێ. ئیزڕائیل گوتی: « شتی وا نابێ. من بەس لەبەر تۆ هاتوومە ئێرە. هەتا ئەتۆ و نیعمەتەکانت لێک دابڕم.» لەو جەنگەیەدا پاشـــا ئاخێکی هەڵکێشــا و دەســـتی کرد بە گریان و گوتی: «تف لەو ماڵەی وا منی لەخۆبایی کرد و لە بیری بردمەوە عیبــادەتی پەروەردگــارم بکەم. ئەمن پێم وا بوو بە کــارم دێ و لە بەری دەحەســێمەوە کەچی ئێســتا ســەیر دەکەم لە داخ و حەســەرەت زیاتر هیچی بۆ من نەبوو. ئێســتا ئەوە من بە دەســتی بەتاڵ دەڕۆم و ئەو هەموو ماڵەش بۆ دوژمنەکانم بەجێ دێڵم.» لەو کاتەدا بە ئیزنی خودا ماڵەکەی وەدەنگ هات و پێی گوت: «بۆ تف لە من دەکەی، تف لە خۆت بکە. خودای گەورە منیش و تۆشی لە گڵ دروست کرد. ئەمنی خستە بەر دەستی تۆ هەتا پاشەکەوتێک بۆ ئەو دونیات وە سـەر یەک بنێی و بە بەخشینی من بە هەژاران و نەداران و دروست کردنی مزگەوت و خانەقا ماڵی ئەو دونیاتی پێ ئاوەدان بکەیەوە. کەچی تۆ منت لە ئەنبار و خەزێنەکاندا وەســەریەک نا و لە ڕێی عەیش و نۆشــدا خەرجت کرد و شــوکری خوداشــت نەکرد. ئێســتا من بۆ دووژمنەکانت بەجێ دێڵی و بۆخۆشــت بە داخ و دیق و پەشیمانییەوە دەڕۆی. ئیدی خەتای من چییە وا قسەی سووکم پێ دەڵێی؟» ئەوجار ئیزڕائیل گیانی پاشــای لە کاتێکدا لەســـەر تەختەکەی دانیشــتبوو کێشــا و نەشــی هێشــت خواردنەکەشی بخوا. پاشا لە سەر تەختەکەیەوە بەربووەوە و خوای مەزن فەرمووی:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الأنعام: ٤٤

واتا: ﴿کاتێک روویان وەرگێڕا لەو هەڕەشــەو ترســاندنەی پیغەمبەرەکان ئاڕاســتەیان کردن، گوێیان بۆ موژدە پێدانی بەهەشــتیان نەگرتو لاســارییان نواند، ئامۆژگاری پیغەمبەرەکانیان لە بیر خۆ بردەوە، زانرا کە ئەوانە بە هیچ کلۆجێک ئیمان ناهێنن، ئەوەی کە لە عیلمی ئێمەدا چەســپاوە دەرحەق ئەوان هاتە دی ئێمەیش بۆزیاتر هەڵخەڵەتاندنیانو رۆچوونیان لە گومڕاییدا دەرگای رزقو رۆژیمان بۆ کردنەوە، هەرزانیو خێرو خۆشــی کاتی دونیاییمان بەسەردا رشتن، لەش ساغیو ئەمنو ئاسایشمان بۆ دابین کردن ئەوەندە ژیانو گوزەرانمان بۆ خۆشو ئاســان کردن، ماڵو منداڵی زۆرمان پێدانو تا کەیف خۆش بوون پێیو ئەوەندەی تر خۆیان لە خۆ گۆڕاو لوتبەرزییان نواند لە ناکاوێک گرتمانن، بە ســزای بە ئێش لە بیخمان دەرهێنانو ئاســەوارمان بڕینەوە کاتێک بە خۆیان زانی کە تازە رێگای رزگار بوونیان نیەو لە هەموو خێرو خۆشییەک بێ بەشنو سەرەنجامی سامناکو سزای سەختی جەهەننەم چاوەڕێیانە!﴾.

### چیرۆکی سێیەم

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە پاشــایەکی خاوەنشــکۆ و دەســەڵات لە پاشاکانی بنی ئیسرائیل لە سەر تەختی دەسەڵات دانیشتبوو. پیاوێکی دیت، هاتە کۆشکەوە ســەروچاوێکی ســامناک و ترســێنەر و ســەیری بوو. پاشــا کە چاوی پێی کەوت ترســی ڕێنیشــت و هەســتا لێی چووە پێشــێ و پێی گوت: «کاکە تۆ کێی و بۆ بێ ئیجازەی من هــاتوویە مــاڵە منەوە؟» پیــاوەکە گوتی: «خودا ئیجــازەی هــاتنە ژوورێی داوە بە من و پێویســتیم بە ئیجازەی ئێوە نییە. لە لەشــکری زۆر و هێز و جبەخانەتان ناترســم. ئەمن کەســێکم کە پاشــا خاوەن دەســەڵات و بەهێزەکان ناتوانن من بگرن. ئەمن تێکدەری چێژوخۆشی و هەڵتەکێنەری کۆڕ و کۆمەڵەکانم.»

پاشــا کاتێک گوێی لەو قســانە بوو، گیانی وە لەرزین کەوت و لە هۆش خۆی چوو. کە هاتەوە ســەرخۆ گوتی: «نەکا تۆ ئیزڕائیل بی؟» کابرا وەڵامی داوە: «بەڵێ هەوم.» پاشــا گوتی: «بیکە بۆ خاتری خودا ڕۆژێکم مۆڵەت بدە هەتا تۆبە لە گوناحەکانم بکەم. داوای لێ بوودن لە خودای خۆم بکەم. ئەو ماڵەی هەمە هەمووی بدەمەوە بە خاوەنەکانیان. چونکە تاقەتی ئەو هەموو ئازار و وەڵامدانەوەی حیســــاباتەم نییە.» ئیزڕائیل گوتی: «حەییەحەی تازە ئەو ئاواتانە نایەتە دی.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شه‌وی چوارسه‌د و شه‌ست و یه‌که‌م هاته‌وه

گوتی: خاوه‌نشـــکۆ! ئیزرائیل گوتی: «حه‌بیه‌یه‌ی ئه‌و ئاواته تازه ده‌به‌یته ژێر گڵ. من چۆن ده‌توانم ده‌رفه‌تت بده‌م له کاتێکدا هه‌موو حیساب و کتابێکت به‌ستراوه دوایین هه‌ناسه‌کانت ده‌ده‌ی و کاتی مه‌رگت نووســراوه.» پاشـا گوتی: «هه‌ر ئیســتێکم مۆڵه‌ت ده.» ئیزرائیل گوتی: «تازه هیچ ناکرێ و یه‌ک دوو هه‌ناســه‌ت ماوه.» پاشـا پرســی: «باشــه ئه‌گه‌ر له گۆڕه‌که‌یان خستم کێ له لام ده‌بێ؟» ئیزرائیل فه‌رمووی: «جگه له ئاکاری چاک که‌ست له لا نابێ.» پاشـا گوتی: «ئه‌من هیچ ئاکارێکی باشـم نییه.» ئیزرائیل وه‌ڵامی داوه جا که وایه جێگه‌ی تۆ دۆزه‌خه و ئارامگه‌که‌ت له نێو ئاوری تووڕه‌یی خودا دایه. ئیدی گیانی کێشـا و پاشا له سه‌ر ته‌خته‌که‌یرا به‌ر بووه‌وه. ده‌وروبه‌ریانی ده‌ستیان کرد بو شین و ڕۆڕۆ.

## چیرۆکی چواره‌م

یه‌کی دیکه له‌و چیرۆکانه ئه‌وه‌یه که ئه‌سـکه‌نده‌ر زوولقورنه‌ین له سـه‌فه‌رێکیدا تووشـی تاقمێک بوو که له دارایی دونیادا هیچیان نه‌بوو. هه‌ر که‌سه‌ی له به‌ر ده‌رکی ماڵه‌که‌ی خۆی گۆڕێکی هه‌ڵکه‌ندبوو. ڕۆژێ دوو ســـێ جار خاوێنیان ده‌کرده‌وه و دایمه خه‌ریکی نوێژ و ڕۆژوو بوون. ئه‌وانه جگه له گیا هیچ شـتێکیان نه‌بوو بیخۆن. ئه‌سـکه‌نده‌ر که‌سـێکی نارده لایان و ڕایسپارد پێیان بڵێ گه‌وره‌که‌یان بێته ئێره. که‌چی گه‌وره‌که‌یان جوابی ئه‌سکه‌نده‌ری نه‌داوه و گوتی: «پێی بڵێن ئه‌من هیچ کارێکم به‌و نییه، ئه‌گه‌ر ئه‌و کاری به منه بێته ئێره.» ئه‌سکه‌نده‌ر بۆخۆی هه‌ستا چوو بۆ لای ئه‌وان به گه‌وره‌که‌یانی گوت: «ئه‌و قه‌بره‌تان بۆ له ده‌رگای خۆتان هه‌ڵکه‌ندووه؟» کابرا وه‌ڵامی داوه: «بۆ ئه‌وه‌ی هه‌میشـه له به‌ر چاومان بێ و مردن و قیامه‌تمان قه‌ت له بیر نه‌چێته‌وه. بۆ ئه‌وه‌ی خۆشـــه‌ویســـتی دونیا له هه‌ناوماندا هێلانه نه‌کا و له عیباده‌ی خودا غافڵ نه‌بین.» ئه‌سـکه‌نده‌ر پرسـی: «بۆ گژ و گیا ده‌خۆن.» کابرا وه‌ڵامی داوه: «له‌به‌ر ئه‌وه‌ی نامانهه‌وێ هه‌ناوی خۆمان بکه‌ینه گۆڕســتانی گیاندارانی دیکه.» ئینجا کابرای گه‌وره‌ی ئه‌و هۆزه ده‌ســتی کێشـا و کاژه‌ڵه‌ســه‌رێکی هێنا و له پێش ئه‌ســکه‌نده‌ری دانا و لێی پرســـی: «ئه‌ســـکه‌نده‌ر ده‌زانی ئه‌و کاژه‌ڵه‌ســـه‌ره ئی کێیه؟» ئه‌سـکه‌نده‌ر گوتی: «ناوه‌ڵڵا.» ئه‌و پیاوه گوتی: «خاوه‌نی ئه‌و ســه‌ره یه‌کێک له پاشـاکانی زوو بوو، که زوڵم و سته‌می له مسکێن و ڕه‌عیه‌ته‌کانی خۆی ده‌کرد و دایمه خه‌ریکی ماڵ کۆ کردنه‌وه بوو. دوای ئه‌وه‌ی خودا گیانی کێشـا خســتییه ئاوری جه‌هه‌ننه‌مه‌وه. ئه‌وجار ده‌ستی کێشا و کاسه ســه‌رێکی دیکه‌ی هێنا و دیسان له ئه‌سکه‌نده‌ی پرسـی ئه‌ی خاوه‌نی ئه‌و ســـه‌ره‌یان ده‌ناســـی؟» ئه‌ســـکه‌نده‌ر وه‌ڵامی داوه: «ناوه‌ڵڵا» کابرا گوتی: «ئه‌وه‌ش

پاشـایەک بوو لە پاشـاکانی سـەر گۆی زەوی کە لەگەڵ مسـکێن و ڕەعیەتەکانی و خەڵکدا زۆر باشە بوو. کاتێک عومری تەواو بوو خودا گیانی ئەستاند بردییە بەهەشـتەوە و پلە و پایەی باشـی دایە. ئینجا پیاوە دەسـتی بۆ سـەری زوولقورنەین برد و لێی پرسـی ئەتۆ کامیەک لەو دوو سـەرە دەبی؟» زوولقورنەین دەسـتی کرد بە گریان و بەدەم گریانەوە کابرای لە ئامێز گرت و گوتی: «ئەگەر تۆ بە من ڕازی بی دەتکەم بە وەزیر و برابەشـی دەسـەڵاتەکەم.» کابرا گوتی: «ئەمن پێویسـتیم بەو جۆرە پلە و پایە و شـتە نییە.» ئەسکەندەر لێی پرسی: «لەبەر چی؟» پیاوە وەڵامی داوە: «لەبەر ئەوە تەواوی دونیا لەبەر ئەو ماڵە دوژمنی تۆیە، هەر لەبەر ئەوەی من ئەوەم نییە دۆست و هاوسۆزی منن. چونکە من لەو دونیایەدا هیچم نییە و هیچیشـم لە دونیا ناوێ و بە هەموو شـتێک ڕازیم.» ئیدی ئەسکەندەر هەنیەی ماچ کرد و گەڕاوە.

### چیرۆکی ئەنووشیروانی عادڵ

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە پاشـای عادڵ ئەنووشـیرەوان ڕۆژێک لە ڕۆژان خۆی نەخۆش کرد و وای نیشان دا کە نەخۆشـە. ئینجا بە دەستوپێوەندەکەی گوت فەرمان بدەن بگەڕێن لە شـوێنێک خشـتەیەکی کۆنم بۆ بێنن بۆ دەرمانم دەوێ. فهرمان درا گوند بە گوند و کون بە کونی وڵاتیان پشکنی خشـتە کۆنێکیان نەدیتەوە بۆ دەرمانی پاشـا. هاتنەوە لای پاشـا و گوتیان قوربان تەواوی وڵاتمان سـەنگ و سـووژن داوە خشـتە کۆنێکمان وەگیر نەکەوت. ئەنووشـیرەوان بەو هەواڵ دڵخۆش بوو تەواو گەشـاوە. ئینجا گوتی: «ئەمن ئەوەم دەویسـت. ویسـتم بزانم شـوێنێک لە وڵاتی مندا ماوە ئاوڕی لێ نەداربێتەوە و ئاوەدان نەکرابێتەوە. کەوایە حاڵی مسـکێنان باشـە و هەموو شـتێک لە جێی خۆیەتی.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەنووشیرەوان گوتی: «کەوایە بارودۆخی مسکێنان باشە و هەموو شتێک لە جێی خۆیەتی و ئاواییەکان لەوپەڕی باشی دان.»

کاتێک شەهرزاد چیرۆکەکەی بێرە گەیاند گوتی: «خاوەنشکۆ، پاشایانی پێشوو دوور بین بوون و گرینگیان دەدا بە ئاوەدان کردنەوەی گوند و لادێکان. چونکە دەیانزانی هەتا گوند و لادێکان ئاوەدانتر بێ خەڵک و مسکێن زیاتر دەبێ. ئەوشیان دەزانی ئەوەی زانایان گوتویانە هەمووی نەخشی بەردییە و ڕاستە. زانایان گوتوویانە کە دین تایبەتی دەسەڵاتدارانە، دەسەڵاتداران پێویستیان بە لەشکر هەیە و لەشکریش بە ماڵ پێک دێ. ماڵ لە لایەن گوند و ئاوەدانییەکانەوە دابین دەبێ. گوند و ئاوەدانییەکانیش بە عەدڵ و دادگەری ئاوەدان دەبنەوە. خاوەنشکۆ، ئەوەش بزانە پاشاکانی پێش و قەت قایل نەبوون کە لەشکر و دەست و پێوەندەکانیان لەتم و ستەم لە خەڵک و مسکێنان بکەن. چونکە دەیانزانی کە خەڵکی ڕەشۆک تاقەتی ئەو زوڵم و ستەمەی نییە و بەو شێوە گوند و ئاواییەکان لەبەریەک هەڵدەوەشێ و پەڕیوەی ئەولاوئەولا دەبن. وڵات تووشی بێ سەرەوبەرەیی دەبێ و خەزێنە خاڵی دەبێ. ئیدی کۆڵەکەکانی دەسەڵات تێک دەڕووخێ و بەرەو تێداچوون دەچێ و دووژمان تەماعی تێدەکەن و بەسەریدا زاڵ دەبن.

### چیرۆکی ژنە داوێنپاک و لە خوداترسەکە

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە هۆزی بنی ئیسرائیل قازییەکیان هەبوو کە ژنێکی جوان و دەلالی بوو. ڕۆژێک قازی چوو بۆ زیارەتی بەیتولموقەددەس. کورسی دادگری و خێزانی بە براکەی سپارد. براکەی دڵی چووبووە براژنەکەی. کاتێک براکەی ڕۆیشت براکەی هەستا چووە لای ژنەکەی و داوای لێ کرد دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکا. ژنی قازی لەبەر پاکی و بە ئابڕووی جوابی نەداوە. هێوەرەکەی پێداگری کرد. ئەویش هەر ملی نەدا و گوێی نەدایە هەتا وای لێ هات، وەڕەز بوو دەستی لێ هەڵگرت. بەڵام نیگەرانیش بوو کاتێک براکەی بێتەوە بۆی بگێڕێتەوە. هەر بۆیە شایەدێکی درۆزنی دیتەوە و هێنای بە شایەدی گرت کە براژنەکەی زینای کردووە. ئینجا لە لایەن پادشای شارەوە فەرمانی بەربارانی دا. وا بوو لە شوێنێکدا قوڵکەیەکیان بۆ هەڵکەند و تا نێوقەدی لە ئەرزیان گرت. ئینجا ئەوەندەیان بەرد پێدادا هەتا لە بن بەرددا ون بوو، کەڵەکێکی لە سەر ساز بوو. پادشا گوتی لێی گەڕێن با ئەوە گۆڕەکەشی بێ. هەر لەوێ بەجێیان هێشت هەتا بوو بە شەو. ژنە نەمردبوو، لە بەر خۆیە هەر دەیناڵاند. کابرایەک بەوێدا هات، گوێی لە دەنگی بوو. خێرا

بەردەکانی لە ســـەر لادا و دەری هێناوە. بردییەوە ماڵە خۆی لای ژنەکەی و بە ژنەکەی گوت تیماری بکە تا چاک دەبێتەوە.

ژنە هەموو ڕۆژێ دەرمـانی دەکرد هەتـا چـاک بووەوە. ئەو ژنەش کوڕێکی بوو، کوڕەکەی دا بە ژنی قـازی. قـازیژن ئەو کوڕەی پەروەردە دەکرد و دووبەدوو لە مـاڵێکدا بوون. ناپیاوێک تەماعی تێ کرد. لێی ڕاسپارد و ئەویش ملکەچی نەبوو. ئەو بەڕەڵایە شەو ویســتی بچێ بی کووژێ کە چوو خەوتبوو. وا بوو لە جێی ژنە منداڵەکەی کوشــتبوو، کە زانی بە پەڕتاو ڕای کردە دەرێ و هەڵات. لەوێدا خودا ئەو ژنەی ڕزگار بوو.

کە ڕۆژ بووەوە ســەیریان کرد منداڵە کوژراوە. دایکی منداڵە زۆری لە قاژیژن دا. هەتا مێردەکەی هات و قازیژنی لە بەر دەســتی هێنا دەرێ. ئیدی قازیژن لەو ماڵە هاتە دەرێ و سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت. نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکا. لەو شارە ڕۆیشت و ڕووی لە دەشت و دەر کرد. ڕۆیشت هەتا گەیشتە گوندێک سەیری کرد ئەوە خەریکن کەسێک لە دار دەدەن. هێشــتا کابرا نەمردبوو. پرســیاری لێ کردن گوتی: «ئەو کابرایە چ گوناحێکی کردووە؟» گوتیان ئەوە گوناحێکی کردووە کە یان دەبێ بکوژرێتەوە یان ئەوەندە درەمە بدا. کەمێکی دەرم پێ دەری هێنا و درەمی ئازاد بوونەکەی دا. کابراش لە سەر دەستی ئەو تۆبەی کرد و بەڵێنیشـی دا هەتا مابێ لە خزمەت قازیژندا بێ. ئیدی ئەو کابرایە خانەقایەکی بۆ قازیژن دروست کرد. دەچوو دار و چرپی و سووتەمەنی بۆ دێنا. بژیوی بۆ پەیدا دەکرد و بۆی دێنـا. ئیدی قـازیژن هەر لەوێدا خەریکی نوێژ و ڕۆژ و پاڕانەوە بوو. نەخۆش و شــتیان دێنا لای و دۆعای بە ســەردا دەخوێند و خودا بە دەســتییەوەی دەدا و نەخۆشــە چاک دەبووەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! قازیژن لەو خانەقایەدا دەستی کرد بە عیبادەت و بووە جێگەی ئومێد و نەزەرگەی ژن و پیاو. ڕێکەوت وا بوو برای قازی [کە دەبێتە هێورەکەی] بەڵایەکی بە سەر هات و نەخۆشییەکی پیسی گرت. ئەو ژنەی لێی دا پێستی گیانی بەڵەک بوو. ناپیاوەکەش ئازارێکی گرت توانایی هەستانی نەبوو. لەو جەنگەیەشدا قازی مێردی ئەو ژنەش هاتەوە. هەواڵی خێزانی پرسی. براکەی گوتی: «مرد.» ئیدی قازی لە تاوی ژنەکەی زۆر ناڕەحەت بوو. چۆکی خەمی لە ئامێز گرت.

ئەوەندەی پێ نەچوو لە تەواوی وڵات دەنگی داوە کە ژنێک لە فڵانە خانەقایە و نەخۆش نییە چاکی نەکاتەوە. هەر بۆیە لە هەموو لایەکەوە خەڵک ڕوویان تێ دەکرد. وا بوو قازی بە براکەی گوت: «باشە بۆ نەتبەینە لای ئەو ژنە پاکە بەشکوو لە فەڕی ئەوەوە خودا چاکت کاتەوە؟» براکەی گوتی: «دەی باشە بمبەن بۆ لای.»

مێردی ئەو ژنەی کە پێستی بەڵەک ببوو، ناوبانگی گیرایی دۆعای قازیژنی بیستەوە و خێزانی برد بۆ لای. کەس و کاری پیاوە بەڕەڵاکەش ئەو قسەیان بیستەوە و بردیان بۆ خانەقا. هەموویان لە بەر دەرکی خانەقا دانیشتبوون و چاوەڕێ بوون. هەتا مجێوری خانەقاکە هات. ئەوانیش ئیجازەیان وەرگرت و چوونە ژوورێ. ئەو ژنە داوێنپاک و لە خوداترسە ڕووبەندێکی بە سەریدا دابوو. لە پشت پەردەوە دانیشتبوو. مێردەکەی دیت کە لەگەڵ براکەی هاتبوو. پیاوە خوێڕییەکە و ژنە بەڵەکبووەکەشی دیت کە لە بەر دەرگاکە دانیشتبوو. ئەوانی ناسییەوە و پێی گوتن: «ئێوە قەت چاک نابنەوە هەتا دان بە گوناحەکانتاندا نەنێن. چونکە ئەگەر بێتو بەندە دان بە گوناحی خۆیدا بنێ و نەچێتەوە سەری خودا لێی خۆش دەبێ و لەگەڵی بە ڕەحم و بەزەیی دەبێ.» قازی بە براکەی گوت: «براگیان دان بە گوناحتدا بنێ و تۆبە بکە و بگەڕێوە بۆ لای خودا بەشکوو ڕەحمت پێ بکا و لەو کەنەفتییە ڕزگات بێ.»

ئێستا کاتێتی پاکانەیەک بکە
وەکوو نەفسی خراپ قوڕوقەب مەکە
ڕۆندکی پەشیمانی هەڵبڕێژە
زمانیش لە زارتا تۆبەیەک بێژە
ئاو کە هەتا ناو قەدت هەڵکشاوە
پێش ئەوەی بخنکێی دەرچووە لەو ئاوە

لەو جەنگەیەدا برای قازی گوتی: «ڕاستییەکەی دەڵێم: ئەمن لەگەڵ ژنەکەی تۆدا ئاوا و ئاوام کرد و گوناهی من ئەوەیە. ژنە بەڵەکبووەکەش گوتی کە ژنێک لە ماڵی ئێمە بوو کوڕانی منداڵەکەم خستە ملی و زۆرم ئازار دا. ئەوەیە گواهی من. خوێڕییە پیاویش گوتی: ئەمن داوام لە ژنێک کرد لەگەڵم ڕێک کەوێ و یەکێکم داتێ، ئەو ملی نەدا و منیش شەو چووم بیکووژم کەچی بە هەڵە منداڵێکی لە پەنا بوو ئەوم کوشت. گوناهی منیش ئەوەیە. قازیژن کە ڕووبەندی پێوە بوو، دەستی هەڵێنا و لەبەر خودا پاڕاوە و گوتی خودایە ئەتۆ کە ئاوا ئەو خراپە و خیانەتانەت بەوان نواند تکات لێ دەکەم لێیانخۆش بەو شفایان بدە. لەجێوە هەموویان چاک بوونەوە. قازی بە وردی سەیری ژنەی دەکرد. ژنە پرسی: «ئەوە بۆ ئاوا سەیرم دەکەی؟» قازی گوتی: «ئەمن ژنێکم هەبوو ئەگەر ئەو نەمردبایە دەمگوت ئەو دەنگە دەنگی ئەوە.» ئیدی ژنە ڕووبەندی لا دا و خۆی پێ ناساند و ژن و مێرد یەکتریان لە باوەش گرت و شوکری خودایان کرد. ئەوجار هێوەرەکەی و ژنە بەڵەکبووەکە و کابرا بەڕەڵاکە داوای لێ بووردنیان لە قازیژن کرد. ژنی قازیش لە هەموویان خۆش بوو. ئەوجار ئەوانیش لە سەر دەستی قازیژن تۆبەیان کرد و لە خانەقادا دەستیان کرد بە عیبادەت. هەتا کاتی مردنیان هات.

### چیرۆکی مەزنی خودا

یەکی دیکە لە چیرۆکانە ئەوە بوو کە یەکێک لە گەورەکان گێڕاوییەتەوە لە شەوێکی تاریکدا تەوافی ماڵی خودام دەکرد. لە نێو تاریکییەکەدا گوێم لە ناڵەیەک بوو کە دەیگوت: «ئەی کەریم کەرەمی تۆ لە مێژینەیە و منیش لە سەر گفت و بەڵێنی خۆمم. ئەمن بەو دەنگە تەواو شڵەژام، بە جۆرێک خەریک بوو گیانم دەرچێ. هەستام بەرە و دەنگەکە چووم. خاوەن دەنگەکەم دی. سەیرم کرد ژنێکە هەر تەواف دەکا و دەناڵێنێ و دەکرووزێتەوە. سڵاوم لێ کرد و وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە. لێم پرسی گوتم: «تۆ ئەو خودا گەورەیە پێم بڵێ ئەو گفت و بەڵێنەی داوتە چییە؟» ئەو ژنە گوتی: «بە خودا ئەگەر سوێندت نەدابایەم قەتم پێ نەدەگوتی. ئێستا چاو لێرە بکە، کە چاوم لێ کرد، منداڵێکم دیت لە پێشی خەوتبوو. ژنە گوتی: «ئەمن ئەو منداڵەم لە زگی دابوو و دەچووم بۆ حەج، کە سواری کەشتی بووم، بای نەخوازراو هات و کەشتییەکەی ئێمەی تێک شکاند. ئەمن بە تەختەیەک خۆم گرتەوە و لە سەری گیرسامەوە . هەر لە ڕێدا لە سەر تەختەکە ئەو منداڵەم بوو. ئیدی ئەو منداڵەم هەر لە پەنا بوو کە شەپۆل بردینی...

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو ژنە گوتی: «هەر ئاوا بە دەم شەپۆلەکانەوە دەڕۆیشتین هەتا وا بوو، یەکێک لە مەلەوانەکان گەیشتە سەرمان و پێی گوتم: «ئەمن هەر لە سەرەتاوە کە هاتیتە ناو کەشتییەکەوە خۆشم ویستی و چووی لە دڵمەوە باش بوو، تۆم گرتەوە ئێستا دەبێ لەگەڵم جووت بی دەنا دەتخەمە ناو ئەو دەریایەوە. ئەمن پێم گوت: « بەدبەخت مەگەر ئەو بەلا و ڕەشەبایە ترسی خودای لە دڵت دا چێ نەکردووە و ئەزموونت لێ وەرنەگرت. پیاوەکە گوتی: «ئەمن زۆرم لەوانە بەسەر هاتووە و بە سەلامەتی ڕزگارم بووە. ئەمن لەوانە ناترسم. منیش پێم گوت: «ئێمە ئێستا لە مەترسی و ئاریشە داین و پێویستیمان بە عیبادەت و پاڕانەوەیە نەک بە گوناە.» ئەو پیاوە هەر پێداگری کرد. ئەمن لێی ترسام و ویستم فێڵی لێ بکەم. گوتم: «مۆڵەتم بدە با ئەو ساوایە بخەوێ.» کەچی لە ڕێوە پڕی دا منداڵە و لە سەر کۆشی من هەڵیگرت و دەریای هاویشت. من کە ئەوم دیت ئاوا بێ بەزەییانە و لە بەر چاوی من ئەو منداڵەی لە دەریا هاویشت. زۆری لێ ترسام و خەریک بوو دڵم بتۆقێ. دەستم هەڵێنا و ڕووم لە ئاسمان کرد و گوتم:

قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال: ٢٤

واتا: ﴿ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەحەق کردوەو گەردنکەچی بوون بەدڵسۆزیو لێبڕاوانەوە وەلامی بانگەوازی خودا بدەنەوە، چیتان فەرمان پێ دەکا ئەنجامی بدەنو پابەندی بن. هەروەها وەلامی بانگەوازی پێغەمبەریش بدەنەوە، ئەوەی لەخوداوە فەرمانتان پێ دەکا جێبەجێی بکەن! هەرکاتی بانگی کردن بۆ بەرنامەو ئایینێک کە ژیانێکی بەختەوەریو هەتاهەتاییتان پێ دەبەخشێ، کامەڕانی دونیاو قیامەتتان بۆ دەستەبەر دەکا، هەموو خۆشیو سەرفرازیو خێرو بێرێکتان تێی دا دەست دەکەوێ. بزانن کە خودای خاوەن دەسەلات دەتوانێ بەزۆر بتانخاتە سەر ڕێگای ڕاستو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، دەتوانێ بکەوێتە نێوان مرۆڤو دڵەکەیەوە، دڵەکە لەمرۆڤ داگیر دەکاو چۆنی بوێ ئاوا هەڵیدەسووڕێنێو، خاوەنەکەی هیچ دەسەلاتێکی بەسەر دا نیە. پەلە بکەن لەچاکە کردنو تێشوو ئامادە بکەن بۆ ڕۆژی قیامەت، چونکە ئێوە دڵتان لەنێو پەنجەی خودا دایە، پاشانیش گەڕانەوەو کۆبونەوەتان لای پەروەردگارە، پاداشو سزای کردەوەکانتان دەداتەوە. چارتان ناچارە هەربۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە دەراوی ڕوونی ترتان نیە﴾.

ببە لەمپەر لە نێوان من و ئەو بەڵایەدا. قەسەم بە خودا هێشتا من دۆعاکەم تەواو نەبوو کە گیانلەبەرێک لە دەریا هاتە دەرێ و پڕی دا ئەو پیاوە و بردی.

بەو جۆرە ڕزگارم بوو. ئیدی من هەر ئاوا بیرم لە منداڵەکەم دەکردەوە و لەبەر خۆمەوە دەگریام و پێم هەڵدەگوت و ئەو شێعرەم دەخوێندەوە:

کـوڕەکەی ژیـکەڵەم لە کـوێـی دایە گـیـان
لەگەڵ کام ماسـی بوویتە دەسـەملان
تۆ کە فریشـتەی لە بن دەریـاش بی
حەتـمەن دەتـدوێـنـن وردە مـاسـی جـوان

ئیدی ئەمن شـەو و ڕۆژێک ئەوە حاڵم بوو. کە ڕۆژ بووەوە لە دوورەوە چارۆکەی کەشـتییەکم دیت. وا بوو بەردەوام شـەپۆل پاڵی پێوەدەنام و با ڕایدەدام هەتا گەیشـتمە کەشتییەکە. خەڵکی ناو کەشتییەکە یارمەتیان دام و خستیانمە ناو کەشتییەکە. کە سەیرم کرد کوڕەکەی خۆم لەوێدا دیت. گوتم: «خەڵکینە ئەوە منداڵی منە! ئەوە چۆنە گەیوەتە ئێرە؟» گوتیان: «ئێمە هەر وا لە دەریادا دەڕۆیشتین کە لە پڕدا کەشتییەکەمان ڕاوەستا. لە نەکاو کیانلەبەرێکی زەبەلاح لە دەریا دێتە دەرێ ئەو منداڵەی بە کۆڵەوە بوو کە خەریک بوو قامی دەمژت. ئێمەش چووین و منداڵەمان لە سـەر پشـتی هەڵگرت و هێنامانە لای خۆمان.» ئەو ژنە گوتی: «کاتێک کە ئەو قسەیەم لەوان بیست، منیش بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە. ئیدی شـوکری خودام کرد و لە دڵە خۆمدا بەڵێنم دا کە قەت لە ماڵی خودا دوور نەکەومەوە و لە خزمەتی خافڵ نەبم. دوای ئەوە ئیدی قەت هیچم لە خودا نەویسـت مادام کە ئەو کوڕەی داوە بە من.

دەستم بۆ هەنبانەکەم برد شتێکی بدەمێ کە ئەو ژنە پێی گوتم: «لاچووە بڕۆ خوێڕی. چۆن ئەمن باسی گەورەیی و دلۆڤانی خودا بکەم و شت لە ئیدیکە وەرگرم. ئەمن گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم و ئەو بەیتەم خوێندەوە:

ئەوەی لە تۆ نیزکە چ بـێ نیازە خودایە
لەوپەڕی برسـییەتیدا دەڵێی دونیای لە زگ دایە

### چیرۆکی کۆیلەی گوڵەجەرگە

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە مالیکی کوڕی دینار گێڕاوییەتەوە کە سـاڵێک لە بەسـرە باران نەباری و ویشـکەسـاڵی بوو، خەڵک چەند جار بۆ نوێژەبارانە

چووینه دەرێ. بەڵام دۆعا و پاڕانەوەکانمان قەبووڵ نەدەبوو. وا بوو ڕۆژێک من و سابتی بەنان و نەجی بەکار و محەممەد کوڕی واسێع و ئەییوب سەجێستانی و حەبیب پارسی و حێسانی کوڕی ئەبی‌سنان و عەتای غوڵام و ساڵحی موزنی چووینه دەرێ، منداڵانیش له فێرگەکان هاتنه دەرێ و هەموو پێکەوە چووینه دەرەوەی شاری و نوێژەبارانەمان کرد، هەتا لای نیوەڕۆ لەوێ بووین هیچ خەبەرێک نەبوو. خەڵکەکە گەڕانەوە. من و سابتی بەنانی لەو شوێنه ماینەوە. هەتا تاریکان داهات، سەیرمان کرد، کۆیلەیەکی ڕەشی خوێنشیرین و قاچ و قول باریک و ورگن بەرەو ئەو نوێژگەیه دێ. کراسێکی کۆنی له بەردا بوو. هات و دەسنوێژی هەڵگرت و دوو ڕەکاتی نوێژ کرد. که نوێژەکەی تەواو بوو سەری هەڵێنا و دەستی کرد به پاڕانەوە. هێشتا تەواو له پاڕانەوەکەی نەببووەوە که گەواڵ گەواڵ هەور هاتن و ئاسمانیان داگرت و بارانێکی به خوڕ دایدا. ئێمه هەر لەوێ بووین که گۆلاو پڕبوون له ئاو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# که شەوی چوارسەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! مالیک گوتی: «ئاو، قوڵکە و گۆلاوی پڕ کردن. ئێمە سەرمان لە کاری ئەو قولەڕەشــە ســووڕ ما.» مالیکی کوڕی دینار گێڕاوییەتەوە و گوتوویە: هەســتام چووم لای کۆیلە ڕەشەکە و پێم گوت: «ڕەشە ئەوە پێت عەیب نەبوو ئاوات لەگەڵ خودا قسە کرد دەتگوت لەگەڵ من قســـە دەکەی؟ لە کاتێکدا کە نازانی ئەو تۆی خۆش دەوێ یان نا؟» کۆیلەکە گوتی: «برۆ لە کۆڵم بەوە ئەتۆ لە خۆتەوە دەڕوانی. خودای تەعالا لە منی ویســت بەس لە ســـەر باوەڕ بە تاک و بێ هاوتا بوونی خودا پێداگر بم. تۆ لە کوێ بووی کە ئەو، ڕۆحی منی پڕ کرد لە ڕوونـاکی و زانیـاری. ئەوانەش هەمووی ئی ئەوەن کە ئەو، منی خۆش دەوێ.»

گوتم: «کەمێکم لە لا بمێنەوە.» گوتی: «ئەمن کارم هەیە و دەبێ لە خزمەت خاوەنکەمدا بم، چونکە خزمەتی ئەو بۆ من فەرزە. ناتوانم ڕاوەســـتم.» ئەو ڕۆیشـــت. ئێمەش دوور و نیزیک بە دوایدا ڕۆیشـتین. هەتا کۆیلەکە گەیشـتەوە بەر دەرگای کۆیلەفرۆشـییەکە. شـەو نیوە ببوو. تـازە نیوەکەی دیکەش هەر لە بەر دەرگـای گۆیلەفرۆشـــەکە مـاینەوە و لە سووچێک هەڵکورماین.

کە ڕۆژ بووەوە. کۆیلەفرۆشـەکە لە ماڵ هاتە دەرێ. چووم پێم گوت: «کۆیلەیەکت هەیە پێمـان بفرۆشـــی؟» گوتی: «ئەمن ســـەد کۆیلەم زیـاتریش هەیە کە هەمووم بۆ فرۆش داناون.» مالیکی کوڕی دینار گێڕاوییەتەوە کە: «کۆیلەفرۆش نیزیک ســـەد دانە کۆیلەی پێشـان داین. بەڵام هاوڕێکەی دوێشـەویان لە نێودا نەبوو. ئیدی ئێمە ویستمان بێینە دەرێ کە ســـەیرم کرد ئەوە لە دیوە کونێکدایە بە تەنیا ڕاوەســـتاوە. گوتم بە خودای کابە ئەوە ڕاست بۆخۆیەتی و ئەو کۆیلەیەیە. گەڕامەوە بۆ لای کۆیلەفرۆش و گوتم ئەو کۆیلەیەم پێ بفرۆشە. گوتی: «باوکی یەحیا، ئەو کۆیلەیە بە کاری تۆ نایە و شەوانە هەر خەریکی گریان و بە ڕۆژیشـــدا مات و مەلوول لە کونجێکدا دادەنیشـــێ و هیچ ناکا.» گوتم: «قەیناکا ئەمن دەمهەوێ.» کابرا بانگی کۆیلەکەی کرد. ئەویش هات. کۆیلەفرۆش گوتی: «ئەوەش کۆیلە چەندیشـــم دەدەیەی بمدەیە. بەڵام لە بیرت بێ من بەو عەیبانەوە دەتدەمێ.» مالیک کوڕی دینار دەڵێ ئەمن بە بیست دینار کۆیلەکەم لێ کڕی و لێم پرسی نێوت چییە؟ گوتی: «نێوم مەیموونە.» ئەمن دەستم گرت و بردمەوە ماڵی خۆم. لە ماڵێ کۆیلەکە لێی پرسیم خاوەنی گچکەم ئەتۆ بۆ منت کڕی خۆ بە خودا ئەمن شیاوی ئەوە نیم کە بەباشی لە خزمەتی ئێوە بکەم. ئەمن پێم گوت: «ئەتۆم بۆیە کڕیوە کە بۆخۆم خزمەتی تۆ بکەم.» کۆیلەکە لێی پرســـیم: «لەبەر چی ئەوەندە لەگەڵم دلۆڤانی؟» منیش گوتم: «مەگەر تۆ هەر هاوڕێکەی

دوێنشـــەو نی کە لە نوێژگەکە بوویت؟» کۆیلەکە گوتی: «مەگەر تۆ بە کار و نهێنی منت زانیوە!؟» گوتم: «ئەوە من بووم دوێنێ شەو ئیرادم لە قسەکانت گرت. مالیکی کوڕی دینار گێڕاویێتەوە کە ئەو لەگەڵم هات هەتا گەیشــتینە مزگەوت. کۆیلەکە دوو ڕەکاتی نوێژ کرد و دەســـتی کرد بە پاڕانەوە و گوتی: «خودای من لە نێوانی ئێمەدا ڕاز و نهێنییەک هەبوو کە تازە خەڵک پێی زانیم و لێم ئاشـکرا بوو. ئەمن ڕووڕەشــی دەرکی تۆم. هەر بۆیە تکات لێ دەکەم بیکە بۆ خاتری گەورەیی و شـکۆی خۆت گیانی بکێشـە تازە من شـیاوی ئەو ژیانە نیم.» ئەوەی گوت و چووە سـەر سـووژدە. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بووم هەسـتێتەوە و تەواو بێ. بەڵام ئەو سەری هەڵنەهێنا. چووم دەستێکم لە شانی دا و جووڵاندمەوە سەیرم کرد بە ڕەحمەتی خودا چووە. هەر لەوێ درێژم کرد و دەست و لاقیم ڕێک کرد. تەماشـام کرد بزەیەکی لە سـەر لێوە و ڕەنگیشـــی ســـپی بووەتەوە و ڕوخســـاری وەک مانگ دەتروســـکاوە. ئەمن هەر وا لەوێ حەبەســـابووم کە لاوێک وەژوور کەوت و گوتی: «ســـەلامۆنعەلەیکم، خودای گەورە ئارامی بخاتە دڵی ئێمەش و ئێوەش بۆ لە دەســت دانی براکەمان مەیموون. ئەو کفنەم لێ وەرگرە و کفنی بکە. پاشان دوو دەست لیباسی درواوی ئامادەی دامێ کە تا ئێستا کفنی ئاوام قەت نەدیتبوو. ئیدی جوان شـوتم و ئەو دوو دەست لیباسەم لەبەر کرد و ناشتمان. ئێستا گڵکۆی ئەو کۆیلەیە ناسراو و بەناوبانگە. دەچنە سەر گڵکۆکەی لەبەر خودا دەپاڕێنەوە بۆ باران و نیازی دڵیان. لەو بارەوە شاعیر دەڵێ:

پیاوانــــــــــــــی مەزنی دونیا بە هێند نەگرتوو، لە دەرکی مەیخانن  
وا بـــــــــێ منەت بە تاج و تەختی شایی دانوستان دەکەن، ئەوانەن  
بێ منەتن سەریان لە سەر بەردی ڕەق و پێیان لە سەر کەللەی ڕەقە  
بـــــــــۆیە دەڵێن گەورەیی بە هیممەتە نەک بە ماڵ و چەکمەی ڕەقە

### چیرۆکی پیاوی بەناموس

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە نێو هۆزی بنی ئیســـرائیلدا پیاوێکی تێدا بوو کە دایمە خەری عیبـادەت و خودا پەرســـتی بوو. زۆری گرینکی بە دونیـا و خەڵکەکەی نەدەدا و لە خەڵـک دابڕابوو. ژنێکی هەبوو، خزمەت بە مێردەکەی بە ئەرکی خۆی دەزانی و دایمە پێکەوە خەریکی عیبادەت بوون. ئەو دووانە بە یەکەوە لە لک و پۆپی خورما باوەشـێن و سـفرە و شـتیان دەچنی و دەیانفرۆشـت و بژیوی ژیانیان پێ دابین دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو کابرایە دەستی دا هێندێک لەو باوەشێن و سفرانە و ویستی بچێ بیانفرۆشـــێ. لە ڕێگادا بە بەر دەرکی ماڵی دوڵەمەندێکدا تێپەڕی. ژنی خاوەنماڵەکە چاوی پێی کەوت. مەمنا ئەو کابرایە پیاوێکی لەبەر دڵ و خاوەن قەڵافەتێکی جوان بوو، کەوتە بەر دڵی ژنە و ئۆگری بوو. مێردەکەشـــی لە ماڵ نەبوو بە خزمەتکارەکەی گوت:

«دەمەوێ بە هەر فێڵێک بێ ئەو کابرایەم بۆ بانگکەیە ژووری. خزمەتکارە چووە دەرێ و بانگی کابرای کرد و پێی گوت: «خانمەکەم دەیهەوێ لەو باوەشێن و سفرەیەی تۆ بکڕێ. کابرا گەڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کابرایە نەیزانی چ باسە و وایزانی بە ڕاستییەتی، لەگەڵی چووە ژووریٚ. هەرکە وەژوو کەوت کەنیزە دەرگاکەی پێوەدا و دایخست. خانمیش لە دیوەکەی هاتە دەریٚ و نێوقەدی گرت و بردییە دیوەکەی خۆی و پێی گوت: «ئەمن تۆم بە ئاوات دەخواست و لە تاوی تۆ حەجمینم نەبوو. ئێستا ئەوە من ئامادە و ماڵ چۆڵوهۆڵ خواردن حازرە خاوەنماڵیش نییە لە ماڵ. ئەوە من خۆم دەخەمە بەر دەستی تۆ هەرچەند زۆریەک لە پاشاکانیش داخوازم بوون بەڵام من پێملیان نەبووم و بە هیچم نەزانیون. زۆری لەو قسە قۆڕانە کرد. بەڵام ئەو کابرایە لە شەرمی خودای گەورە سەری هەڵنەدێنا. هەروەک شاعیر دەڵیٚ:

ڕادەژا داربی ئاسا لە سوێی ئیمانی
وا کەوتبووە بەر ڕەشەبای بێئیمانی

کابرای گۆرین هەرچەندی حەولی دا کە خۆی لە دەست ئەو ژنە ڕزگار بکا بیٚ ئاکام بوو. هەر بۆیە گوتی ئاوێکی خاوێنم دەویٚ هەتا بچم ئاوێک بەخۆمدا بکەم ئاوا ناتوانم لێت نیزیک بمەوە. دەمەویٚ دەست بە ئاویش بگەیەنم. ژنە گوتی جا ئەو ماڵە گەورەیە چی زۆر پەنا و پەسیو ئاویش زۆرە. کابرا گوتی پێمخۆشە بچمە بەرزترین شوێنی ئەو ماڵەش. ژنە بە خزمەتکارەکەی گوت لەگەڵی بچووە ئاوی بۆ بەرە و ڕێنوێنی بکە. کەنیزە شوێنی ئاودەستی نیشان دا و ئاوی بۆ برد و بەرزترین شوێنی ئەو ماڵەشی پێشان دا. پیاوە کارەکەی کرد و دەسنوێژی گرت و چووە بەرزترین شوێنی ماڵەکە. لەوێڕا سەیری خوارێ کرد ویستی خۆی بەرداتەوە. دیتی زۆر بەرزە و ترسی ڕێنیشت. دوایە کەمێک بیری لە بیٚ ئەمری خودای تەعالا و عەزابی ڕۆژی پەسڵان کردەوە و مردنەکەی کەمێک لە بەر چاوی خۆی ئاسانتر کردەوە. ئیدی گوتی: «خودایە ئەوە بۆخۆت ئاگات لە هەموو شتێکە و بزانە کە هیچ ڕێگایەکی دیکەم نییە. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هاوار خودای گەورە و بەرزە ناوم
لە زەلکاوی گوناحدا خنکاوم
گەر بێت و ژیانیشم تێدا چیٚ
چش دەبا شتی وەک من هەر لاچیٚ

دوای ئەوە کابرا لەو سەرەڕا خۆی هەڵداشتە خواریٚ. دەسبەجیٚ خودای تەعالا

فریشتەیەکی بۆ نارد هەتا باڵی وەبەر بدا نەهێڵێ بکەوێتە ئەرزی.

کاتێک ئەو پیاوە گەیشتە ئەرزی. سپاسی خودای کرد و بە دەستی بەتاڵ گەڕاوە ماڵێ. ژنەکەی لێی پرسی ئەوە بۆ وا دەرنگ هاتووەتەوە. ئەی شتەکانی بردبووی بیانفرۆشێ فرۆشتوونی یان نا و بۆ بە دەستی خاڵی هاتووەتەوە؟ کابراش تەواوی ڕووداوەکەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. ئەوەی کە لەو سەربانەڕا خۆی فڕێ داوەتە خوارێ و هیچیشی لێ نەهاتووە. ژنەکەی گوتی: «سپاس بۆ خودا کە هیچت لێ نەهاتووە و لەو بەڵایە بە سلامەتی ڕزگارت بووە. ژنە گوتی پیاوەکە چونکە ئێمە هەموو ڕۆژێ تەندوورمان هەڵکردووە و نانمان کردووە ئەگەر ئەورۆ تەندوورەکە هەڵنەکەین دەزانن کە ئارد و شتمان نییە. چونکە شاردنەوەی ئەو جۆرە کارانەش لای خودا پاداشی هەیە دەڵێم با تەندوورەکە هەڵکەین و تازە خۆمان ڕادەگرین بزانین تا سبەینێ خودا چمان بە قسمەت دەکا.» ئیدی ئەو ژنە هەستا چرپی‌وچاڵی هێنا و تەندووری داخست و لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەگەر بێتوو بە دەستی خۆم ببخورێنم
دەبێ حەتمەن پشتی لە بۆ بچەمێنم
هەمبێ هیممەت نەختێک خورروو شتێک نییە
هەتا پشتم لە ئاست پەنجەم دانەوێنم

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! ئەو ژنە کە تەندوورەکەی هەڵکرد و ئاوردووی تێ خســـت، لەگەڵ مێردەکەی هەســـتان چوون دەســـوێژیان هەڵگرت و خەریکی نوێژکردن بوون. کە یەکێک لە جیزانەکانیان هـات بۆ ئـاور. ئەوان فەرموویـان کرد. ژنە هـاتە ژووریٚ هـاواری لێ بەرز بووەوە کە فلانی خێرانەکەی نانەکانت هەموو دەســـــووتێن. ژنە بە پیاوەکەی گوت ئەوە گوتی چی؟ کابرا گوتی هەســـــتە چاوێکی لێ بکە بزانە چییە؟ ژنە هەســـــتا و هات بە لای تەندوورەکەوە، سەیری کرد پڕە لە نانی سپی و برژاوە.

ئیدی ژنە نانەکانی لێ کردەوە و بەدەم شـــوکر و ســـپاســـی خوداوە هێنای بۆ لای مێردەکەی. دوای ئەوە ژنە گوتی: «ئەریٚ پیاوەکە بۆ نایەی دەست بکەین بە شین و گریان و لە بەر خودا بپاڕێینەوە، بەشـکوو خودا ڕزقکمان زۆر کا و لەو دەســـتتەنگییە ڕزگارمان بکا. جا بۆخۆمان بە ئاســـوودەیی هەر خەریکی نوێژ و ڕۆژوو و عیبادەت بین؟» پیاوەکە قســـەی ژنەکەی پەســـند کرد. ئینجا پیاوە دەســـتی کرد بە هاوار و لیللا و پاڕانەوە لە بەر خودا و ژنە یاریدەی دەدا و ئامیینی بۆ دەگوت، هەتا لە پڕ میچەکەیان درزی دا و یاقووتێک بەربووەوە. کە یاقووتەکە بەربووەوە دیوەکە بە تیشـــکی ئەو یاقووتە ڕووناک بوو. ئیدی ژن و مێردەکە خۆشحاڵ بوون و دەستیان کرد بە نوێژ و ڕۆژوو بە جێ گەیاندنی شوکری خودا. هەتا لای بەیانی نوێژیان کرد و خەوتن. ژنە خەوی بینی کە چووەتە بەهەشـــت و سەیری کرد بەهەشت پڕ بوو لە کەت و کورسی: «پرسی ئەوە کێ خاوەنی ئەو کورسی و کەت و شتەیە؟» وەڵامیان داوە گوتیان: «ئەو کەتانە ئی پێغەمبرانە و ئەو کورسییانەش ئی چاکەکاران و پاکانن.» پرســـی: «ئەی کورســـی مێردەکەی من لە کوێیە؟» یەکێک لە کورســـییەکانیان پێشـــان دا و گوتیان: «کورســـی مێردەکەی تۆ ئەوەیە.» چاوێکی لە کورسییەکە کرد سەیری کردە لایەکی کەمێک شکاوە! پرسی: «ئەوە بۆ شکاوە؟» گوتیان: «ئەوە جێگـای ئەو یـاقووتەیە کە لە میچەکەوە بەربووەوە.» ئیدی ژنە ئەوەنـدەی خەمی کورســـییەکەی مێردەکەی بوو کە عەیبدار بوو بەدەم و گریان و هەنیســـکەوە وە خەبەر هـات. بۆ مێردەکەی گێڕاوە و پێی گوت: «لە بەر خودا بپـاڕێوە کە هەتا ئەو یـاقووتەی بەرێتەوە جێگاکەی خۆی. ئێمە چەند ڕۆژێک کە لەو دونیایەن برســـی بین چاترە لەوەی کە هەتا هەتایە کورسـییەکەی تۆ لە چاو کورسـی پیاوچاکانی دیکە عەیبدار بێ. ئیدی هەر ئەو ژنە دەپاڕاوە و ژنەش ئاممینی بۆ دەگوت. هەتا وابوو یاقووتەکە بەرە و ئاسمان هەڵکشاوە. ئیدی ئەوان هەتا هەتا بە هەژاری و مەینەتبەشی ژیانیان بردەسەر؛ بەڵام بەردەوام خەریکی عیبادەت و یادی خودا بوون هەتا بە پاکی چوونەوە بۆ لا خودا.

**چیرۆکی کەرەمی حەق**

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە حەججاجی کوڕی یوسف سەقەفی داوای یەکێک لە گەورەکانی کرد. کە چوون هێنایان. حەججاج گوتی: «بیبەنە بەندیخانە و کۆت و زنجیری بکەن. مەهێڵن کەسیس بچێ سەردانی بکا.» پیاوەکانی حەججاج چوون ئاسنگەریان هێنا و دەســـت و پێیان کۆت و زنجیر کرد و قایم بەســـتیانەوە. دوای ئەوەی جوان بەســـتیانەوە بەندیوانەکەیان لە سووچێک دانیشت بە لایەوە. ئەو کابرایە سەری بەرەو ئاسمان هەڵێنا و گوتی:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف: ٥٤

واتـا: ﴿بێگومـان پەروەردگـاری ئێوە ئەی ئـادەمیزادینە! کە نـاوی (اللـه)یە خودایەکی ئەوتۆیە کە ئاسمانەکانو زەوی لە شـەش ڕۆژدا بەدی هێناون، ئەمجار کۆنترۆڵی عەرشی کردو کاروباری بوونەوەری لێوە هەڵدەسوڕێنێ، کەوابوو پێویستی سـەرشانی ئێوەیە کە بەتەنها هەر ئەو بپەرســـتن، چونکە جگە لە زاتی پاکی ئەو هیچ خودایەکی تر نین شـــیاوی پەرستن بن. پەروەردگار بەتاریکایی شەو ڕووناکی خۆر دادەپۆشێ، واتە: تاریکی دەکەوێتە شوێنی ڕووناکیو بەسەریا دەکشێو دایدەپۆشێ، هەر شوێنێک تاریکی شەوی گەیشتبێتێ ڕووناکی خۆری لێ نامێنێ، بەپێچەوانەشـــەوە هەر شـــوێنێک ڕووناکی خۆری گەیشـــتێ تاریکی شـــەوی لێ نامێنێ! هەریەکەیان بەشـــوێن ئەوی تریانەوە ڕاوی دەنێو ڕەدووی کەوتووە! بە بســـت بواری نادا، ئەمڕۆ کە زانســـتی تازە لەبارە ماددییەکاندا پێشـــکەوتنی بەدەسـت هێناوەو زانسـت هێلکەیی زەوی زیاتر چەسپاندو بووتە شـتێکی بەڵگە نەویسـت، ئەم ڕاونانو شـوێن کەوتنە خێرایەی شـەوو ڕۆژ بۆ یەکتری زیاتر ڕوون دەبێتەوە، چونکە هەموو کـاتێ نیوەی زەوی ڕوونـاکەو نیوەکەی تری تـاریکە، هەموو کـاتێ لە ئەنجـامی هەڵخولانی زەوی لەتەوەرەی خۆیدا بەدەوری خۆردا تاریکایی لە شوێنێک دەڕواو ڕووناکی دێتە شـــوێنی، لە شـــوێنێکی تریش ڕووناکایی دەڕواو تاریکایی دێتە شـــوێنی، ئەگەر لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســـت ڕۆژ بێو دونیا ڕووناک بێ، ئەوە لە ئەمریکای باشـــوورو یابانو دەوروبەریان دونیا شـــەوەو تاریکایی هەیە، زۆربەی زانایانی ئیســـلام وەکوو غەزالیو ڕازییو ئیبنو تەیمییەو ئیبنولقەیم (ألجوزیە) ئـامـاژەیـان بۆ ئەم ڕاســـتییە کردووە لە نووســـینەکانیاندا وەکوو حەقیقەتێکی زانســـتی چەســـپاندوویانە. خۆرو مانگو ئەســـتێرەو هەسارەو کاکەشانە زەبەللاحەکانی بەدی هێناونو هەموویان بە گوێرەی ویستو ئیرادەی

ئەو دینو دەچن، هەموویان ملکەچو پابەندی فەرمانی زاتی پاکی کردگارن، چۆنی بوێ وا هەڵدەسوڕێن، ملیۆنەها ساڵە ئەم گەردوونە لە هاتووچۆدایە، ئەم قەبارە گەورەو زەبەللاحانە بەبێ وچان هەڵدەسوڕێن، نە لەکار دەکەونو نە بەنزینو گازیان پێویستەو نە لێیان دەبڕێ، نە بورغویان سلاک دەبنو دەسوێن، هەریەکەیان لە تەوەری خۆی بەخێراییەکی دیاری کراوو تایبەت هەڵدەسوڕێنو هیچیان لە هیچیان ناخشێنو ڕێگە لەیەکتر ناگرنو پێکەوە دەعم ناکەن. هۆشیار ببنەوە! هەر بۆ پەروەردگارە بەدی هێنانو دروستکردن، کارگێڕیی‌و هەڵسوڕاندن هەر بەدەست ئەوە، هەر خودا خاوەنی بوونەورە، هەر ئەو کارگێڕو هەڵسوڕێنەرە خودای بوونەوەر پاکو بێ گەردە، بەرزو بێ وێنەو هاوتایە، هەر ئەو خوداو پەروەردگارە، هەرچی خێرو بێری بوونەوەر هەیە، هەمووی لە خوداوەیە، پێویستە بەندەکانی سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتو خێرو خۆشییەی بۆ ئادەمیزادانی دابین کردووە، جگە لەخودا کەسی تر شایانی خودایەتی‌و پەروەردگاریەتی نیە، کەسی تر خودایەتی پێ ناکرێ، کەس رایەی ناکەوێ لافی خودایەتی لێ بدا. ماوەتەوە ئەوە بگوترێ: کە ئەمرو ئیرادە لێک جیاوازن، چونکە پەروەردگار جاری واهەیە ئەمر دەکا بەشتێک نایەوێ ئەنجام بدرێ! ئەی ئەوە نیە فەرمانی کرد ئیبراهیم کە کوڕەکەی سەرببڕێ! ئیرادەی سەبرینەکەشی نەکردبوو، فەرمانی بە پیغەمبەر کرد کە پەنجا نوێژ بکاو هەر ئیرادەی پێنج نوێژیشی کردبوو، ئیرادەی شەهید بوونی حەمزەی کردبوو نەهی لە کافرەکانیش کردبوو کە بیکوژن﴾.

ئینجا کابرا ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

شک نابەم دەرکێ جگە لە دەرکی ئاواڵای تۆ
گەر سەد جاریش دەرکرێم دێمەوە ژێر ئاڵای تۆ
کوێر بم و قەت ئەو ڕۆژە ڕەشە نەبینم خوایە
هەڵوەدا و بێبەشکرێم لە کانگەی دڵاوای تۆ

کە بوو بە شەو بەندیوان نۆبەداری بۆ دانا و بۆخۆی چووەوە ماڵەکەی خۆی. بەیانی زوو بەندیوانەکەی کە هاتەوە سەیری کرد ئەوە کۆت و زنجیری لە خۆی داماڵیوە و دەرباز بووە و هیچ ئاسەواری نەماوە. بەندیوانەکە لە ترسان دەستی لە هەموو شتێک شوت و مەرگی خۆی هاتە بەر چاو. یەکسەر بۆ ماڵاوایی و گەردنئازایی چووە لای ژن و منداڵەکەی. دەسنوێژی شوت و کفن و کافووری لەگەڵ خۆی برد و چوو بۆ لای حەججاج . کە لە حزووری حەججاج ڕاوەستا. حەججاج بۆنی کافوورەکەی بۆ هات. گوتی: «ئەرێ

ئەو بۆنەوە لە کوێوە دێت؟» بەندیوانەکە گوتی: «گەورەم، ئەمن پێمە.» حەجاج گوتی: «جا ئەتۆ کافوورت بۆ هێناوە؟» بەندیوانەکە هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک بەندیوانەکە بەسەرهاتی ئەو کابرایەی گێڕاوە، حەججاج لە بەندیوانەکەی پرسی کە: «دوێنێ هیچی نەگوت؟» بەندیوانەکە گوتی: «بەڵێ دوێنێ کاتێک ئاسنگرەکە کۆت و زنجیری دەکرد سەری هەڵێنا و ڕوو بە ئاسمان گوتی:

« أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ». حەججاج گوتی: «مەگەر نەتبیستووە کە دەڵێن لە لای تۆ بانگی دەگا کە تۆ لەوێ نەبووی هاتووەتە لای.

دەستی یارت بەر مەدە، گەر دونیات قەستەسەر بێ
دژەژارە یارەکەت، ژەهری ماری حەوت سەر بێ

### چیرۆکی دۆعای لە دڵەوە

دەگێڕنەوە کە یەکێک لە پیاوچاکان بیستبوویەوە کە لە فلانە شار ئاسنگەرێکی لێیە کە دەست لە کوورەی ئاسنگەری ڕۆ دەکا و بە دەستی ڕووتی ئاسنی قاڵبووەوە هەڵدەگرێ و هیچیشی لێ نایە. بەو بۆنەوە هەستا چوو بۆ ئەو شارە و پرسیاری وەستای ئاسنگەرەکەی کرد. ئاسنگەرەیان پیشان دا.

کە جوان سەیری کرد، دیتی ئەوە بە دەستی ڕووت ئاسنی سوورەبوو دەگرێ. ئیدی لەوێ دانیشت هەتا وەستا کارەکەی تەواو بوو و دەستی لە کارەکەی هەڵگرت. ئینجا لە کابرا چووە پێشێ و سڵاوی لێ کرد. پێی گوت ئەو شەو میوانی تۆ دەبم. ئاسنگەرەکە گوتی: «زۆرم پێ خۆشە و میوان خۆشەویستی خودایە.»

ئاسنگەرە کابرای بردەوە ماڵی خۆی و شێویان کرد و پێکەوە خەوتن. ئەو شەوە نەیدیت عیبادەت و شت بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕەنگە لە منی بشارێتەوە.» شەوی دووەم و سێیەمیش لە وێ خەوت. تەماشای کرد کاکی ئاسنگر جگە لە فەرزەکان عیبادەتی دیکە ناکا و شەونوێژ و شت ناکا. ئەوجار لە ئاسنگەرەی پرسی: «براکەم ئەمن ئەو کەراماتەی کە لە تۆدا هەیە بیستبووم و بە چاوی خۆشم دیتم. بەڵام ئەوە چەند ڕۆژە چ عیبادەت و شەونوێژی وام لێ نەدیتی کە شیاوی ئەو کەراماتەت بێ. ئێستا پێم بڵێ کە ئەوە چۆناوچۆنە تۆ ئەو کەراماتەت هەیە؟» کابرای ئاسنگەر گوتی: «هۆکارەکەیت بۆ دەگێڕمەوە، ئەویش ئەوەیە کە من حەزم لە ژنێک دەکرد و لە تاوانی حەجمینم نەبوو، دوو سێ جارم پێ گوت. بەڵام ئەو هێندە ژنێکی حەیابەخۆ و داوێنپاک بوو جوابی نەدامەوە و دەستم پێی ڕانەگەیشت. ساڵێکیان قاتیوقڕی بوو، هیچ شتێک وەگیر نەدەکەوت. پارێک

نان چووبووه پشـتی شـێران. ڕۆژێک من له ماڵه خۆمان ڕاوەسـتابووم که له دەرگایان دا. چووم دەرگام کردەوه که سـەیرم کرد ئەو ژنەم بینی له بەر دەرگا وێسـتاوه. که منی دیت گوتی: «کاکه گیان برسـییەتی گوشـاری بۆ هێناوین و ئێسـتا پەنام بۆ هێناوی. له ڕێی خودادا یارمەتییەکمان بکه.» ئەمنیش گوتم: «له بیرت چووەتەوه که له تاوی تۆ چم لێ هات و چ دەردێکم دی و ئەتۆش چۆنت جواب دامەوه؟ به خودا هەتا تۆش دەسـتم لەگەڵ تێکەڵ نەکەی یارمەتیت نادەم.» ژنه گوتی: «کەوایه مردن زۆر لەوه باشـتره که بێ ئەمری خودا بکەم. ئیـدی گەڕاوه. ڕۆژێکی دیکه هـاتەوه و هەر ئەو داوایەی کردەوه و بردمه ژووریَ له برسـان دەلەرزی خواردنم له پێش دانا، فرمێسـکەکانی هاتنه خواریَ و گوتی: «تۆ ئەو خودایه هەر له ڕێی خودادا شـتێکم دەیه.» منیش گوتم: «نه به خودا هەتـا سـوکنایيم پێ نەبەخشـی و لەگەڵم جووت نەبی هیچت نادەمێ.» ئیدی هەسـتا و خواردنەکەشی بەجێ هشت و ڕۆیشت. دیسان گوتی: «کەوایه مردن زۆر لەوه باشتره که بێ ئەمری خودا بکەم.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# کە شەوی چوارسەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەوژنە بێ ئەوەی دم لە هیشتێک بدا هەستا و لەو ماڵەوە وەدەر کەوت و لە بەر خۆیەوە ئەو دوو بەیتەی گوت:

خوایە بەهێزم کە خــــــــــــــۆڕاگرم
تۆم لە پشت نەبـــــــــی قەت خۆ ناگرم
ئـــــــــــــــاوری برسێتی من دامرکێنە
لای بەنــدەی خوێڕی تێکم مەشـــکێنە

ئیدی ئەو ژنە دوو ڕۆژ دیار نەبوو. دوای دوو ڕۆژ دیســـان هاتەوە و لە دەرگای دا. کەچی دیتم لە برسان خەریکە دەمرێ و هێزی قسەکردنیشی نییە. کاکە برسییەتی خەریکە لە پێم دەخا و جگە لە تۆش ناتوانم ڕوو لە کەس نێم. ئەتۆش لە ڕێی خودادا پاروێ نانێکم دەیە. گوتم: «بە خودا نانت نادەمێ هەتا ئیشـتیام دانەمرکێنی. ناچار بوو بێتە ژووری. لەو جەنگەیەدا خودا ڕوحمی پێ کردم و بە دڵمدا هـات کە: چارەڕەش ئەوە لەکنەخۆی ژنە و عەقڵ و دینی تەواو نییە هێشتا لە ترسی خودا بەو حاڵە ئەوڕۆ و سبەینێ دەکا و خۆی لە گوناە دەپارێزێ کەچی تۆ خۆت داوەتە دەست نەفسی شەیتانی؟

ئیدی تۆبەم کرد و هەســـتام چووم خواردنم بۆ هێنا و لە پێشـــم دانا و پێم گوت بخۆ ئەوە هەر لە ڕێی خودادایە. ژنە لەڕێوە دەســـتی هەڵێنا و پاڕاوە و گوتی: «خودایە ئەگەر ئەو پیاوە بە ڕاستییەتی لە ئاوری دونیا و قیامەتی بپارێزی. ئەو پیاوە گێڕاوییەتەوە کە ئەو ژنەم بەجێ هێشت نانەکەی بخوا و بۆخۆم چووم ئاورەکە لە کوورەکە بێنمە دەرێ. گڕێک ڕووی لە دەســتم کرد. کەچی بە حوکمی خودا یەک زەڕڕە ئێش بە دەســتم نەگەیشـت. لە دڵی خۆمدا گوتم. ڕەنگە دوعای ئەو ژنە کاریکەر بووبێ. ئیدی بە سڵەوە بە دەستی ڕووتی پۆلوویەکم هەڵگرت. ئەویش نەیســـووتاندم. ئەوجار هاتمەوە لای ژنەکە و گوتم، پیرۆزە وا خودای گەورە دۆعاکەتی قەبووڵ کرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: خاوەنشكۆ! ئەو ژنە كە ئەو قسەیەی بیست پارووەكەی لە دەستی كەوتە خوارێ و گوتی: «خودایە هەر وەک دۆعاكەمت بۆ ئەو كابرایە قەبووڵ كرد خودایە بە ڕوحم و ڕەحمەتی خۆت گیانم بكێشە. چونكە تۆ هەموو كارێكت لە دەست دێت. خودای گەورە هەر لەو ساتەدا گیانی كێشا.

## چیرۆكی پاشای عابید

دیسان دەگێڕنەوە كە لە هۆزی بەنی ئیسرائیلدا پیاوێک هەبوو كە لە عیبادەت و خودا پەرستیدا بە ناوبانگ بوو، سۆفییەكی پاک و تەركەدونیا و بە نوێژ و ڕۆژوو بوو. بە جۆرێک كە دەگێڕنەوە هەر دۆعایەكی كردبا خودا لێی قەبووڵ دەكرد. ئەو كابرایە لە چیاكان دەژیا و خودا هەورێكی بۆ تەرخان كردبوو، بۆ هەر كوێ دەچوو بە سەرییەوە دەبوو. ئاوێكی زوڵاڵ و خۆشیشی بۆ دادەباراند. تا وای لێ هات وەک جاران تاقەتی نوێژ و ڕۆژووی زۆر و عیبادەتی نەما. خوداش هەورەكەی لێ ئەستاندەوە و دۆعاكانی لێ قەبووڵ نەدەكرد. كابرا وای لێ هات خەم و پەژارە دەوریان دا و هەمیشە بیری لە ڕۆژانی ڕابردووی دەكردەوە و ئاخ و داخی بۆ هەڵدەكێشان. شەوێک لە شەوان خەوتبوو. لە خەودا پێیان گوت ئەگەر دەتهەوێ خودا وەک و جارانت لێ بكاتەوە و هەور لە سەرت بگەڕێ و دۆعات گیرا بێ، دەبێ بچی پاشای فڵانە وڵات زیارەت بكەی و داوای لێ بكەی دۆعات بۆ بكا. ئەو شێعرەشیان بۆ خوێندەوە:

هەركەسێک نییەت پاک بێت و دڵپاک
دۆعای بڕ دەكا تا لا خودای تاک
دۆعای ئەو شێخە وەک زۆر كەس نییە
ویستی خودایە دەنا شێخ چییە
هەر چەندە شێخیش لە سەر ڕێی ڕاستە
ویستی خودایە چی كاری ڕاستە

دوای ئەو خەونە كابرا هەستا بەرەو ئەو شارەی لە خەونەكەیدا پێیان گوتبوو وەڕێ كەوت و سۆراخی پاشای كرد. كۆشكی شایان نیشان دا. كە چوو پیاوێكی زەلامی دیت لەبەر دەرگای كۆشت دانیشتبوو. سڵاوی لێ كرد و ئەویش جوابی سڵاوەكەی داوە و

گوتی: «چیت دەوێ؟» عابید گوتی: «کەسێکی زوڵم لێ کراوم و دەمەوێ سکاڵا بەرمە خزمەت پاشا. دەرکەوانەکە گوتی: «ئەورۆ ناتوانی بچییە ژووری. پاشا تەنیا ڕۆژێکی بۆ چاوپێکەوتنی خەڵک داناوە. ئەویش فلان ڕۆژە. ڕاوەستە تا ئەو ڕۆژە.» عابید ئەو کارەی پاشای بە لاوە جوان نەبوو گوتی جا بۆ دەبێ ئاوا خۆ لە خەڵکی بشارێتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «شتی ئاوا چۆن دەکرێ پیاوی خودا بێ؟» ئیدی عابید لە دەرکی کۆشک دوور کەوتەوە و چوو چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بوو کە دەرکەوانەکە گوتبووی. کە ئەو ڕۆژە هات عابید بەرە و دەرکی کۆشک چوو. کە گەیشتێ سەیری کرد ئەوە خەڵکێکی زۆر لەوێ چاوەڕێی کرانەوەی دەرگان بچنە هەنتەشی پاشا. عابید گێڕاوییەتەوە کە دەرگا کراوە ئەمنیش لەگەڵ خەڵکەکە چوومە ژووری. سەیرم کرد پاشا دانیشتووە و گەورەگەورەکانی دەسەڵاتیش هەر کەسەی لە شوێن و پێگەی خۆی وێستاوە. وەزیر هات و یەکیەک ئەوانەی کاریان بوو دەیبردنە لای پاشا. هەتا نۆرەی من هات. پاشا چاوێکی لێ کردم و گوتی: «خاوەنی هەور ئەتۆ دانیشە با ئەمن بحەسێمەوە.» ئەمن بە بیستنی ئەو قسەیەی ئەو واقم وڕ ما و گەورەیی ئەوم بۆ دەرکەوت. لەوێ دانیشتم هەتا کارەکانی تەواو کرد. گەورەکانی دەوڵەت هەرکەسەی چووە و ماڵ و حاڵی خۆی. ئینجا پاشا دەستی منی گرت و بە نێو کۆشکدا ڕۆیشتین. هەر ئاوا بە نێو کۆشکدا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە دەرگایەکی دیکە. پاشا دەرگاکەی کردەوە. چووینە ناو کەلاوەیەکەوە. لە ناو کەلاوەکەدا خانەقایەکی لێ بوو. لەو خانەقایەدا حەسیرێکی تیدا ڕاخرابوو. مەسینەیەکیشی لێ بوو بۆ دەسنوێژگرتن. پاشا جلی شایانەی داکەند و عەبالایەکی شڕی مەرەزی لەبەر کرد و دانیشت و فەرمووی منیشی کرد. قاوی ژنەکەی کرد گوتی: «فلانی.» ژنەکەی وەلامی داوە گوتی: «بەڵێ.» پاشا گوتی: «دەزانی ئەورۆ کێمان لێ میوانە؟» شاژن گوتی: «بەڵێ دەزانم. ئەو خاوەن هەورە.» پاشا گوتی: «وەرە ئێرە ئەو خۆمانەیە و جێی مەترسی نییە.» لەڕێوە شاژن وەدەر کەوت. ڕوخساری دەتگوت مانگە بەلام جەستەی لەڕ و لاواز بوو. کۆچکە و عەبای لەبەردا بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! شاژن عەبا و کۆچکەی لە بەردا بوو. ئەوجار ڕووی لە من کرد و گوتی: «براکەم پێتخۆشە سەرت لە کاری ئێمە دەرچێ. یان هاتووی دۆعات بۆ بکەم و بگەڕێیەوە ماڵی خۆت؟» حەز دەکەم بە کاری ئێوە بزانم چونکە قازانجی بۆم زیاتر دەبێ. پاشا گوتی: «پشتاوپشتی ئێمە پاشا بوون و بە میرات بۆیان بەجێ ماوە.

کاتێک ئەوان مردن و کار و باری دەسەڵاتیان بۆ من بەجێ هێشت. خودای تەعالا منی خستە بەر تیغی ئەزموونی خۆی. ئەمن حەزم دەکرد لە سەر گۆی زەوی گەشت و گوزار بکەم و کاروباری خەڵک بە خۆیان بسپێرم. دوایە ترسام گوتم نەکا ببێتە پاشاگەردانی و کەس‌بەکەس و مافی هێندێک پێ شێل بێ. زوڵم و زۆری باڵ بە سەر وڵاتدا بکێشێ و شەریعەتیش بکەوێتە مەترسییەوە و کۆڕ و کۆمەڵی ئایینی نەمێنێ. هەر بۆیە نەمتوانی لغاوی دەسەلات بەردەم و جلوبەرگی شایانەم لە بەر کرد. لە ترسی بەدکاران و بۆ پاراستنی سنوور کۆیلە و خزمەتکار و سپام لە دەوری خۆم کۆ کردەوە. حەوتووی ڕۆژێک دەچم وەلامی پرسیار و داخوازی خەڵک دەدەمەوە و ئەوەی دیکەی دێمە ئەو کەلاوەیە و ئەو جلانە دەکەمە بەرم. ئەو ژنە ئامۆزای خۆمە. بۆ مەسەلەی عیبادەت و تەرکەدونیایی هاوڕامە. بە ڕۆژدا بە ڕۆژوو دەبین و بە شووڵ و لقوپۆپی خورما خەریکی چنینی شت دەبین و دەیفرۆشین. دەیدەین بە شتی خواردن و بەربانگ دەیخۆین. ئەوە چل ساڵە ئێمە ئاوای ڕادەبوێرین. ئەتۆ ئەوشەو لە لای ئێمە بە. شتێک دەفرۆشین و خواردنی شێوی پێ دەکڕین. دوای ئەوەش بگەڕێوە بە لای کاری خۆتەوە. عابید گێڕاویەتەوە کە ڕۆژ درەنگ بوو کوڕێژگەیەکی دە دوازدە ساڵان پەیدا بوو ئەو شتانەی لە لقوپۆپی خورما دروستیان کردبوو وەری گرت و بردی بۆ بازاڕ. زۆری پێ نەچوو فرۆشتبوونی و دابووی بە نان و سرکە هێنایەوە. ئەمن لەگەڵیان دانیشتم شێوم خوارد و شەویش هەر لە لای ئەوان خەوتم. کە بوو بە نیوەشەو ژن و مێردە لە خەو ڕابوون و دەستیان کرد بە نوێژ و پاڕانەوە و گریان. هەتا کازیوەی بەیانی ئەوە کاریان بوو. کە ڕۆژ بووەوە پاشا گوتی: «خودایە ئەوە بەندەی تۆیە و داوات لێ دەکا هەورەکەی بنێرییەوە سەری. عابید گێڕاوییەتەوە کە عابید پاڕاوە و خێزانیشی گوتی، ئامین. لە پڕدا سەیرم کرد هەورەکەم دیت لە ئاسمان وەدەر کەوت. پاشا بە قامک هەورەکەی پێشان دام کە بە ئاسمانەوە بوو.

ئیدی من ماڵاواییم لێ کردن و گەڕامەوە، هەورەکەش هەر وەک جاران بۆ هەرکوێ دەچووم هەر بە سەر سەرمەوە بوو. دوای ئەوە کە ئەو ئاواتەی وەدی هێنام ئیدی هیچ داوایەکی دیکەم لە خودا نەکرد. هەر ئەو شێعرم دەخوێندەوە.

بێتوو بەندە سەربەرزی لای خـــــــودا بێ
مردووی بەر چـاو و زینـدووی لای خودا بێ
نابێ ڕێـــــــگەی ڕێناسی ڕێی دین بەر دا
ئەگەر مەبەستی چـــــــوونی لای خودا بێ

**چیرۆکی نەترسی لە خوداترس**

دیســـان دەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی خەتاب لە بەرابەر دوژمندا لەشـــکرێکی لە موســـوڵمانان کۆ کردبووە و قەڵایەک لە قەڵا قایمەکانی هۆزێکی گەمارۆ دابوو. لە نێو لەشکری موسوڵماناندا دوو برایان تێدا بوو کە خودا هەر چی چالاکی و نەترسی بوو پێی دابوون. فەرماندەکانی قەڵا بە ســـەربازە ئازاکانی خۆیان دەگوت:«ئەو موســـوڵمانانە دوو کەســـیان لەگەڵە کە ئەگەر بێت و ئەو دوانە بۆتان بێن ئیدی ئەوان پێویســـتییان بە کەســـی دیکە نابێ.» هەر بۆیە کافرەکان هەمیشــە خەریکی فێڵ و کەڵەک بوون بۆ ئەوەی ئەو دوو برایە بخەنە داوەوە. هەتا وای لێ هات یەکێک لە براکانیان بە دیل گرت و ئەوی دیکەش شەهید بوو. برا بە دیل گیراوەکەیان برد بۆ لای فەرماندەی قەڵاکە. فەرماندەی قەڵا کە ئەو لاوەی دیت گوتی: «ئەو گەنجە کوشتنی سەختە و بەردانیشی لەو سەختترە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی چوارسەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـکۆ! فەرماندەی قەڵا گوتی: «ئەمن پێم خۆشـە کە ئەو بێتە سـەر دینی نیسـاری و ببێ بە پاڵپشـت و هاوڕێی ئێمە. یەکێک لە سـەرهەنگەکان گوتی: «ئەمن کارێک دەکەم بێتە سـەر دینی ئێمە، عەرەب زۆر ئاشـقە ژنن و ئەگەر ژنێکی جوان ببینن، ئیدی ئیختیاریان بە دەسـت خۆیان نامێنێ. منیش کچێکی زۆر جوانم هەیە دەزانم بێتوو چاوی پێی بکەوێ تازە ئۆگری دەبێ.» ئەمیر گوتی: «جا کەوایە ئەوە من ئەوم بە تۆ سـپارد.» سەرهەنگەکە موسوڵمانە دیلەکەی بردە شوێنێک و خواردن و شتی لە پێش دانا. کچەکەشی وەک گوڵ ڕازاندەوە و ناردییە خزمەتی و وەک خزمەتکار لە پێشی ڕاوەستا.

کاتێک موسوڵمانەکە ئەوی دیت، لە بەر خودا پاڕاوە یارمەتی بدا بە سەر خۆیدا زاڵ بێ. سـەری داخسـت و خەریکی نوێژ و عیبادەت و قورئان خوێندنەوەی خۆی بوو. دەنگێکی زۆر خۆشیشی بوو. کچە نەسرانییەکە کە گوێی لە دەنگی بوو. ئۆگری بوو، خۆشەویستی کوڕە کاری لە دڵی کرد. هەتا حەوت ڕۆژ ئاوا تێپەڕی. ئەڤین و خۆشەویستی کچە گەیشتە ئاسـتێک کە گوتی: «خۆزگە ئەو کوڕە داوام لێ بکا موسـوڵمان بم. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

ئەو سـەلوە ڕێکەی کە دەڵـێن شێوەی باڵای تۆ دەدا  
دڵنیام قەت ناتـوانێ بێ و شان لە شانی تۆ بدا  
هەڵوەدای تۆ بوون ئەزیـزم خـۆ بە دەستی خۆم نییە  
غەمزەی چاوت ڕامدەکـێشێ دەسەلاتی خۆم نییە  
هەر دڵێ پێکراوی تیری خـۆشەویستیی تۆ ببێ  
دەسـت دەشـوا لە گشـت شـتـێ حەتتا ئەگەر دینیشـی بێ

کچە کە تاقەتی بڕا و زانی ناتوانێ لەوە زیاتر خۆی ڕاگرێ. خۆی بە سـەر لاقیدا دا و گوتی: «تۆ و دینی ئیسلام گوێم لێ ڕاگرە.» موسوڵمانە پرسی: «دەڵێی چی؟» کچە گوتی: «ڕێوشـوێنی ئیسـلامەتیم فێر بکە.» ئیدی کوڕە موسـوڵمانەکە ڕێوشـوێنی ئیسـلامەتی پێ گوت و فێری کرد چۆن دەسنوێژ بشوا و نوێژ بکا. دوای ئەوە کچە گوتی: «لاوی جوانچاک مەبەسـتی من لەو موسـوڵمان بوونە ئەوە بوو لە تۆ نیزیک بمەوە. لاوەکە گوتی: «لە ئیسـلامدا مارە نابڕدرێ هەتا دوو شـاهیدی عادڵ و گەورەی کچەی لێ نەبێ و مارەیی دیاری نەکرابێ. کچە گوتی: «جا ئێسـتا نە دوو شـاهیدی عادڵم وەگیر دەکەوێ و نە گەورەکەشـم ڕازی دەبێ.» کوڕە گوتی: «جا ئەگەر کارێک بکەی کە من لێرە ڕزگار بکەی

من بەڵێنیت پێ دەدەم کە چووینەوە وڵاتی خۆم لەوێ جگە لە تۆ لەگەڵ هیچ کچێکدا زەماوەند نەکەم. کچە گوتی: «هەوڵ دەدەم کارێک بکەم.» ئیدی کچە چوو بۆ لای دایک و بابی و پێی گوتن: «دڵی ئەو کوڕەم نەرم کردووە و ئۆگری خۆم کردووە. دەڵێ دێمە سەر دینت بەڵام من ناتوانم لە شارێک کە براکەمی تێدا کوژراوە بێمە سەر دینت و زەماوەندت لەگەڵ بکەم. دەچین لە شارێکی دیکە چۆنت پێ خۆشە وا دەکەم. ئێستا ئێوە ڕێم بدەن با لەگەڵی بچمە شارێکی دیکە ئەمن زەمانەتی دەکەم کە ویستی ئێوە جێبەجێ بکەم. ئینجا باوکی کچە چوو بۆ لای فەرماندەی قەڵا و شتەکەی بۆ گێڕاوە. فەرماندە بەو هەواڵە خۆشحاڵ بوو و گوتی: «ئەو کچە لەگەڵ ئەو کوڕە بنێرە فلانە دێ و با هەتا ئێوارە لە وێ بێ. کە شەو باڵی بە سەر وڵاتدا کێشا، خۆیان ساز کرد بۆ سەفەر.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! موسوڵمانە دیلەکە و کچە وەڕێ کەوتن. ئەو لاوە لەگەڵ کچە سواری ئەسپێک بوون و ئەو شەوە هەتا بەری بەیانی یەک تەکان ڕۆیشتن. کە ڕووناک بوو لە ڕێگا لایان دا و لە ئەسپەکە دابەزین. دەسنوێژیان شوت و نوێژی بەیانیان کرد. لەو جەنگەیەدا دەنگە دەنگی پیاوان و دەنگی سمی ئەسپ هات. کوڕە بە کچەی گوت: «ئەوە لەشکری گاوران گەیشتنە سەرمان. چیت بە زەین دەگا و چۆنیان فریو دەین؟» کچە گوتی: «ئەوە دەترسی؟» کوڕە گوتی: «کەمێک دەترسم.» کچە وەڵامی داوە: «ئەی ئەو هەمۆت باسی هێز و دەسەڵاتی خودا دەکرد و باسی یارمەتی دانی ئەوت دەکرد، بوو بە چی؟» وەرە با لەبەری بپاڕێینەوە داوای یارمەتی لێ بکەین، بەشکوو فریامان کەوێ و بە ڕوحم و بەزەیی خۆی ڕزگارمان بکا. بەو جۆرە هەرکیان دەستیان کرد بە گریان و پاڕانەوە و ئەو شێعرەیان خوێندەوە:

تۆ کە خـــوت فەرمووت وەپاڕێن من کە هەم
هیچ مەترسێن نەوبێ خۆف و دەرد و خەم
ئێمە وا ڕوومـــــــــان لە دەرکی تۆیە تۆ
خـــــــــۆت بمانپارێزە لە لەتم و ستەم

لەو جەنگەیەدا کە کوڕە دۆعای دەکرد کچەش دەیگوت ئامین. لاوەکە گوێی لە دەنگی برا شەهیدەکەی بوو کە دەیگوت: «براکەم خەم مەخۆن و ترس و نەبێ ئەوە لەشکری خودایە، ئەوانە مەلائیکەن و خودا ناردوونی بۆ شایەدی زەماوەندەکەی ئێوە. خودای تەعالا بەو شاهیدییە مەلائیکەکانیش سەربڵیند دەکا. خودا پاداشی شەهیدانی دانێ و گۆی زەوی بۆ وێکهێنان. ئێوە هەتا تاوهەڵاتی بەیانی لە کێوەکانی «مەدینە» دەبن. کە گەیشتنە لای عومەری کوڕی خەتاب سلاوی منی پێ بگەیەنە. لەو جەنگەیەدا مەلائیکە لە بەر دەمیان قوت بوونەوە و سلاویان کرد و گوتیان خودای تەعالا هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئادەم دروست بکا ئەو کچەی لە تۆ مارە کردبوو. ئیدی ئەوان دڵیان ئەرخەیان بوو کە خودا لە مەترسی و هێرشی لەشکری کافران ڕزگاری کردوون. باوەڕیان پتەوتر بوو. ئەو شەوەیان بە خێر و خۆشی و کەیف و شادی بردە سەر کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە نوێژیان کرد. عومەر عادەتی وا بوو هێشتا ڕووناک نەدەبوو نوێژەکەی دەکرد. زۆر جاری وا بوو دەچووە میحراب و لە دوو کەس زیاتری لەگەڵ نەدەبوو. عومەر بە سوورەی ئەنعام یان سوورەی نیسا دەستی پێ دەکرد. هەتا ئەوانەی کە وەخەبەر نەهاتبوون هەڵدەستان و

ئەوانەی دەسـنوێژیان دەگرت، تەواو دەبوون و ئەوانەی دوور بوون دەگەیشـتن. هێشـتا ڕەکاتی یەکەم تەواو نەدەبوو کە مزگەوت پڕ دەبوو. ئینجا ڕەکاتی دووەمی بە ڕەکاتێکی کورت تەواو دەکرد. بەڵام ئەو ڕۆژە عومەر کە دەسـتی کرد بە نوێژ ڕەکاتی ئەووەڵی بە سـوورەیەکی کورت تەواو کرد و ڕەکاتەکەی دیکەش بە سـوورەیەکی کورتتر و بە هاوڕێکانی گوت: «هەستن با بچین بۆ دیمانەتی بووک و زاوا. هاوڕێکانی پێیان سەیر بوو و لە قسەکەی حاڵی نەبوون.

عومەر لە پێشـەوە و هاوڕێکانی بە دوایدا لە دەروازەی مەدینە چوونە دەرێ. لەو جەنگەیەدا لاوەکە و خێزانی گەیشـتنە بەر دەکی دەروازەی مەدینە. چاویان بە عومەر و موسوڵمانەکانی دیکە کەوت. کە چوونە ناو مەدینەوە عومەر فەرمانی دا نان و چێشت ساز کرێ. بەو جۆرە موسـوڵمانانیان نان دا. دوای ئەوە لاوەکە و کچە پێکەوە چوونە پەردەوە و خودای گەورە لەو کچە چەندین منداڵی بە قیسمەت کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! خودای تەعالا لەو کیژە چەندین منداڵی دایە کە لە ڕێی خودا جەهادیان دەکرد و ڕەسەنایەتی خۆیان دەپاراست. شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

دڵی هەرکەس ڕووناک کا تیشکی باوەڕ و یەقین
ئەرخەیان بێ لە ترس و نیگەرانی ڕق و قین
بە باوەڕی پتەوی، پشت بە خودا ببەستێ
دڵنیا بێ لەوەی کە شتێک نییە پێی بەوەستێ

بەو جۆرە بەردەوام خەریکی نوێژ و ڕۆژوو و عیبادەتی خودا بوون و ژیانیان بە خێر و خۆشی و کەیفسازی تێپەڕاند هەتا مەرگ بارگە و بنەکەی پێ پێچانەوە.

### چیرۆکی کیژی داوێنپاک

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە ئیبراهیم کوڕی خەوواس گێڕاوییەتەوە: «جاری وابوو حەزم دەکرد بچم بۆ وڵاتی کافران. هەر بۆخۆشم خۆم سەرکۆنە دەکرد و پەشیمان دەبوومەوە. لەو بێنەوبەرەدا ئاخری وای لێهات خۆم پێ نەگیرا و هەستام بەرەو وڵاتی ئەوان کەوتمە ڕێ. لەوێ هەر ئاوا لە نێو ئەواندا دەسووڕماوە. سەیر لەوەدا بووم هەر کەسم دەدیت ڕووی لێ وەردەگێڕام و لێم دوور دەکەوتەوە. هەتا وا بوو ڕێم کەوتە شارێک. لە بەر دەروازەکە کۆمەڵێک کۆیلەم دیت کە شیریان بە لاقەد و گورزیان بە دەستەوە بوو. کە منیان دیت لە بەرم هەستان و لێیان پرسیم: «گەلۆ تۆ نۆژداری؟» گوتم: «بەڵێ.» گوتیان: «پادشا بانگت دەکا.» ئیدی منیان برد بۆ لای پادشا. پادشا چاوێکی لێ کردم و لێی پرسیم: «تۆ نۆژداری؟» گوتم: «بەڵێ.» پاداش گوتی: «ئەو نۆژدارە بەرنە لای کچەکەم. بەڵام پێش ئەوەی بیبەن مەرجەکانی پێ ڕاگەیەنن.» لەوڕێوە کۆیلەکان منیان بردە دەرێ و پێیان گوتم کە پادشا کچێکی هەیە و تووشی نەخۆشی زۆر تووش هاتووە و تەبیب و نۆژدارەکان داماون لە دەرمانکردنی. هەر نۆژدارێک چووە بۆ چارەی و نەیتوانیوە کارێک بکا بە فەرمانی پاشا کوژراوە. ئێستا تۆ دەڵێی چی؟» ئەمن قەبووڵم کرد و گوتم: «ئەمن بەرن بۆ لای شازادە خانم. منیان برد بۆ لای کچە و لە بەر دەرگای ئەو دیوەی کە کچەی تێدا بوو ڕایان گرتم لە دەرگایان دا. لە ڕێوە کیژەکە دەنگی هات گوتی ڕێی ئەو نۆژدارە بکەن کە نهێنی زۆرم بۆ دەردەخا. ئەو شێعرەشی گوت:

مـــــــــــــــــوژدەم بدەیە دڵ ودمێکی عیسایی دێ
لە هەناسەی خـــــــــــۆشی ئەو، بۆنی خودایی دێ
لە دەست خەمـــــــــــــی دڵ، هاتوهاوار مەکە دوێنشەو
فالـــــــێکـم گرتـــــــــــەوە، چاوەڕێ بوو دوایی دێ
یار گـــــــــــــــەر لە نەخۆشی خەمی، دەپرسێ ئاخۆ
بلـــــــــێن بـــــێ باشە نەک هەناسەی کۆتایی دێ

ئیبراهیم گێڕاوییەتەوە: «پیـاوێکی پیر بە لەز دەرگـای کردەوە و پێی گوتم وەرە ژووری.» ئەمن چوومە ژووری. ســـەیرم کرد گوڵ و گیـای جۆراوجۆر لەولا و لەملا داندراوە و پەردەیەک لە سووچێک هەڵاوەسراوە. لە پشت پەردەکە بە حال گوێم لە دەنگی ناڵەیەک بوو. لە پێش پەردەکە دانیشتم ویستم سڵاو بکەم. ئەو قسـەیەی پێغەمبەرم وەبیر هاتەوە کە فەرموویە، ئێوە لە پێشدا سڵاو لە گاور و جوولەکە مەکەن. ئیدی سڵاوم نەکرد. وا بوو، دەنگی کچەکە هات لە پشـت پەردەکەوە گوتی: «ئەی هەڵبژاردەی ئیسـلام و کوڕی خەوواس، ئەوە چۆنە سـڵاوت نەکرد؟» ئەمن سـەرم سـوور ما و لە دڵی خۆمدا گوتم ئەوە ئەو کچە لە کوێوە منی ناسـی؟ ئینجا کچە گوتی: «ئەگەر دڵەکان لەگەڵ یەکدا سـاف و پاک بن ئەوە زمان نهێنییەکانی هەناو ئاشـکرا دەکا. ئەمن دوێنشـــەو داوایەکم لە خودای گەورە کرد یەکێک لە ئەولیا و پیاوچاکانی خۆیم بۆ بنێرێ کە چاکبوونەوەم بە دەسـت ئەو بێ. لە هەموو کەلێن و قوژبنێکی ئەو مـاڵەوە پێیـان دەگوتم، نـاڕەحەت مەبە، ئیبراهیمی کوڕی خەوواست بۆ دەنێرین.»

ئەوجار بە کچەکەم گوت: «پێم بڵێ چ بووە.» کچە گوتی: «چوار ســـاڵە من حەق و ڕاسـتیم بۆ دەرکەوتووە و بووە بە بەشـێک لە ژیانم و هەمیشـە لەگەڵمن. بەڵام هۆزەکەم باوەڕەم پێ ناکەن و لێم لە شـک دان. وادەزانن شـێت بووم و شـێتە شـێتەیان وە دوا داوم. هەر تەبیب و نۆژدارێک دێتە سەرم ئەوەندەی دیش دەردەکەم لێ گران دەکەن.» ئەمن پێم گوت: «کێ تۆی بەرەو حەق و ڕاســـتی ڕێنوێنی کرد؟» کچە وڵامی دامەوە: «هۆکـار و نیشـــانەکانە ئاشـــکار و بەرچاوەکانی ئەو.» ئیبراهیم گێڕاوییەتەوە کە کاتێک من و ئەو قســـەمان دەکرد،ئەو کەســـەی داندرابوو کە چاوەدێری ئەو بکا هات و پێی گوت: «نۆژدار چی لێ کردی؟» کچە گوتی: «تەبیب دەردەکەمی دیتەوە و دەرمانکەشم دەزانێ.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کچە گوتی: «نۆژدار هۆکار و دەرمانی نەخۆشییەکەمی دیتەوە. ئیدی ئەو کابرایە بە ڕوویەکی کراوەوە پیرۆزبایی و دەستخۆشـی لێ کردم و گەڕاوە بۆ لای پادشا. هەواڵەکەی بە پادشا ڕاگەیاند. پادشا ئەوی ڕاسپارد میوانداریم لێ بکات و قەدرم بگرێ. هەتا حەوت ڕۆژان ئەمن هاتوچۆی ئەو کیژەم دەکرد. هەتا ڕۆژێک لێی پرسی: «ئەبووئیسحەق کەی دەڕۆین بۆ وڵاتی موسوڵمانان؟» ئەمن گوتم: «ئەتۆ چۆن دەتوانی وەدەر کەوی و کێ دەوێری یارمەتیت بدا؟» گوتی: «ئەو کەسەی تۆی هێناوەتە لای من هەر ئەو فریامان دەکەوێ.»

وا بوو هەر ڕۆژبووەوە لە دەروازەی شار چووینە دەرێ و بە ویستی خودای بەرز و توانا لە چاوی خەڵک نادیار و ون بووین. ئیبراهیم گێڕاوییەتەوە: «ئەمن کەسم نەدیوە ئەوەندە ئۆگری نوێژ و ڕۆژوو و عیبادەت بێ. ئەو حەوت ساڵان لە گونجێکی ماڵی خودادا خەریکی عیبادەت بوو. دوای ئەوە بە ڕەحمەتی خودا چوو. لە کاتی ئاویلکەدانی ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کاتی وەی هاتۆ ئەمن ڕووت ببمەوە  
لەش بەجێ بێڵم و کەمێ شووت ببمەوە  
مردن بە دەست منەوە عاسێ بووە  
ئیشقی ژینی دیم لە دڵدا چێ بووە  
هێندە دیل بووم لەو کەلاوە کۆنەدا  
ڕووح لە بۆ ئازادی باوێشک دەدا

### چیرۆکی پاداشی ئاکار

چیرۆکێکی دیکە دەگێڕنەوە کە یەکێک لە پێغەمبەرەکان لە کێوێکی بەرز عیبادەتی دەکرد. لە داوێنی کێوەکەش کانیاوێکی خۆشی لێ بوو. ئەو پێغەمبەرە بە ڕۆژ لە شوێنێک دادەنیشت لە سەر کێوەکە کە خەڵک ئەویان دەدیت و ئەویش یادی خودای دەکردەوە و چاوی لەو خەڵکە دەکرد کە دەهاتنە سەر کانییەکە. ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو پێغەمبەرە دانیشتبوو چاوی لەو کانییە دەکرد. سەیری کرد سوارێک هاتە سەر کانییەکە، هەنبانەیەکی زێڕ پێ بوو. هەنبانەکەی لە پەنا کانییەکە دانا و بۆخۆی بە ئیشتیا چوو ئاو بخواتەوە. دوای ئەوە سوار بوو ڕۆیشت و هەنبانەکەی بەجێ هێشت. دوای ئەو پیاوێک هاتە سەر کانییەکە، دەستی دا هەنبانەکە و ئاوەکەی خواردەوە و بە خۆشییەوە گەڕاوە. کە ئەو

گەڕاوە کابرایەکی دیکە بە کۆڵێک چرپیوچاڵەوە هاتە سـەر کانییەکە و ئاوی خواردەوە. لەو جەنگەیەدا سـوارە بە هەڵەداوان و پشـووسـواری گەڕاوە و بە کۆڵبەرەکەی گوت: «هەنبانەیەک لێرە بوو کوا؟» کابرا گوتی: «ئەمن هەنبانەم نەدیوە.» لە ڕێوە سوارە شیری هەڵکێشا و کابرای کوشت و لەویّ بە جێی هێشت و ڕۆیشت. ئینجا پێغەمبەر گوتی:

خودایە، ڕاسـتـت دەویّ چی فیتنەیە لە بن سـەری خۆت دایە
ناوێـــــــــرم باسی ئەو ڕاستییە بکەم لە دڵم دایە، خودایە

ئەخە چ حیکمەتێک لەوە دایە یەکێک هەزار دیناری زێڕی بە قسمەت دەبیّ و یەکی دیکە سـتەمی لیّ دەکریّ و دەکوژریّ؟! لە لایەن خوداوە وەحی بۆ هات و پێیان گوت ئەتۆ خەریکی عیبادەتی خۆت بە، بەڕێوەبردنی ئەو دونیایە کاری تۆ نییە. ئەوە باوکی ئەو سـوارە هەزار دیناری لەو پیاوە دزیبوو. ئەمن ئەوە مافەکەی خۆیم بۆ وەرگرتەوە. دڕووهەڵکەنەکەش باوکی ئەو سـوارەی کوشـتبوو. ئەوە ئەمن دڵی کوڕەکەیم بە کوشـتنی ئەو ئەهوەن کردەوە. ئینجا پێغەمبەرەکە گوتی: «لاالەالانت سـبحانک انت علام الغیوب» (= کەس جگە لە تۆ نییە، پاکی هەر بۆ تۆیە کە ئاگات لە نهێنی دڵەکانیشە.)

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پیّ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! پێغەمبەر گوتی: «لاالەالانت سـبحانک انت علام الغیوب» کە شاعیریش لەو بارەوە گوتوویە:

بەری جـۆ جـۆ دەبـێ و بەری گەنـم گەنـم
بەری ئاکارت لە بیـــــــــــر بێ، دەغیلت بم

**چیرۆکی میراتی کابرا پیرە**

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە کابرایەکی پیاوچاک گێڕاوییەتەوە کە: «من لە دەریـای نیلـدا گەمیڤـان بووم و لە ڕۆژهەڵاتی نیلەوە بەرە و ڕۆژئـاوای نیـل دەڕۆیشتم کابرایەکی سیماپاک کە ڕووخساری وەک مانگ دەدرەوشاوە هات سڵاوی کرد و پێی گوتم: «لە ڕێی خودادا سـواری گەمییەکەتم دەکەی؟» گوتم: «بەڵێ.» سـوار بوو. ئەوم بردە ئەوبەری چۆمەکە. عەبایەک و هەنبانەیەک و گۆچانێکی پێ بوو. کاتێک ویسـتی لە گەمییەکە دابەزێ گوتی: «ئەگەرسبەینێ بێیەوە ئێرە، ئەمن بە مردوویی دەبینی کە لە بن ئەو دارەم. بمشـۆ و بەو کفنەی لە بن سـەرم دەبێ کفن بکە. نوێژم لە سـەر بخوێنە و لەو خیزەڵانکە بمنێژە. ئەو عەبا و هەنبانە و گۆچانەش لەگەڵ خۆت بەرە. ئەگەر هات و کەسێک هات، داوای لێ کردی ئەوانەی بدەیە.» ئەو کابرایە گوتوویە کە سـەرم لەو قسـانە سـووڕ ما. ئەو شەوە خەوتم.

کە ڕۆژ بووەوە، چاوەڕێ بووم کەسێک بارێک بێ بیبەڕێنمەوە. لای نیوەڕۆ وەسێتەکەی ئەوم لە بیر چووبووەوە. لای ئێوارە لە پڕدا بە دڵمدا هات. خێرا خۆم گەیاندەوە بن دارەکە سـەیرم کرد کابرا لە بن دارەکە مردووە. کفنێکی تازە لە بن سـەریەتی کە بۆنێکی خۆشـی لێ دەهات. ئیدی من شوتم و کفنم کرد و نوێژم لە سەر کرد و ناشتم. دوای ئەوە ڕۆیشتم و لۆتکەکەم بەرە و ڕۆژئـاوا ئـاژووت. عەبـا و هەنبـانە و گۆچـانەکەشـــم پێ بوو. بۆ بەیانییەکەی کە دەروازەم کردەوە. کوڕێکم دی لەو کوڕە مووزیکژەن و گۆرانی بێژانە کە جلوبەرگێکی جوان و خاوێنی لە بەردا بوو. بۆنی خەنەی لێ دەهات و دەگریا. کە نیزیک بوومەوە پێی گوتم: «تۆ فلان کەســـی؟» گوتم: «بەڵێ.» گوتی: «ئەمانەتەکەم بۆ بێنە.» گوتم: «کام ئەمانەت؟» وەڵامی دامەوە گوتی: «عەبا و هەنبانە و گۆچانەکەی کە بە تۆیان سـپاردبوو.» گوتم: «ئەتۆ چ کارێکت بەوانەیە؟» گوتی: «ئاگای لە هیچ شـتێک نییە جگە لەوەی دوێشـــەو لە بەزم و ئاهەنگ فلانکەس بووم و هەتا بەیانی هەر مووزیکم ژەنیوە و گۆرانیم گوتووە. لای بەیانی زۆر ماندوو بووم کەمێک خەوتم بحەسێمەوە. کەچی کەسێک

پێی گوتم: «خودا ڕووحی فلانە وەلی و پیاوچاکی کێشـــاوە و تۆی لە جێی ئەو داناوە. ئێستا هەستە بچووە بۆ لای فلان گەمیڤان و عەبا و گۆچان و هەنبانەکەی لێ وەرگرە کە ئەو پیاوچاکە ئەوانەی بۆ لە لای ئەو داناوی.» گەمیڤان گێڕاویتەوە کە ئەمن شتەکانم دایە. لەڕێوە جلەکانی خۆی داکەند و ئەوانەی کردە بەری. مالاوایی لە من کرد و ڕۆیشت. ئەمن کە ئەو کەرامەتەم لە دەست چووبوو دەستم کرد بە گریان هەتا بوو بە شەو. شەو خەوتم. خەونم بە خودای مەزنەوە دیت کە پێی گوتم: «بەندە و عەبدی من گەلۆ تۆ پێت ناخۆش بوو ئەوم گێڕاوە بۆ لای خۆم؟ ئەوەندە بزانە کە ئەو نیعمەتانە ئی گەورەیی منە. لە دەستم دێ بیدەم بە کێ و نەیدەم بە کێ.» لەو جەنگەیەدا ئەمن ئەو شێعرەم خوێندەوە:

کەمـــــــــــــترین دیاری ئەو ژینی جیهانە
چی بڵێم کاتـــــــــــــــێ ئاگای لە نیهانە
ئەو کەســـەی بەخشـــیوییە چاو و لووت و گوێ
بێ ئەوانە بەردێکی کەوتـــــــــــووی لە وێ
سەت هـــــــــــــەزارت پێ ببەخشێ هیچ نییە
لە چـــــــــــاو دەریای بەخششی ئەو جا چییە

### چیرۆکی بزربوان

دیسان دەگێڕنەوە کە پیاوچاکێک لە هۆزی بنی ئیسرائیل ماڵێکی زۆر و کوڕێکی باشی هەبوو. پیاوچاکە لە حاڵی خۆیدا بوو. کوڕەکەی لە پشـت سـەری دانیشـتبوو گوتی: «بابە هەر ڕاسـپاردە و وەسـیتێکت هەیە بیفەرموو.» کابرا گوتی: «ڕۆڵە گیان، هیچ کەسـێک بە نێوی خودای گەورە سـوێند مەدە، جا چ چاکەکار بێ یان خراپەکار. وا بوو کابرا مرد و کوڕەکەی جێگای بابی گرتەوە.

خراپەکارانی ئیسـرائیل بیسـتیانەوە کابرا مردووە. یەکەیەکە دەهاتن و دەیانگوت ئێمە ماڵمان لە لای بابتە ئەگەر باوەڕمان پێ دەکەی بماندەوە دەنا سـوێندت بۆ دەخۆین. کوڕە وەسـیتەکەی بابی وەبیر هاتەوە و سـوێندی نەدەدان. هەر کەس دەهات دیگوت پارە یان ماڵمان لە لای بابت بووە، خێرا دەیدانەوە. بەو جۆرە خراپەکارانی بنی ئیسـرائیل ئەوە کاریان بوو. تا وای لێ هات ئەو کوڕە ماڵەکەی لە دەسـت بووەوە و هیچی نەما. زۆر نارەحەت بوو. ژنێکی باش و لە خوداترس و چاکەکاری بوو. لەو ژنە دوو منداڵی هەبوو. بە ژنەکەی گوت: «ژنەکە ماڵەکەمان هەموو ئاوا بلاو بووەوە و ئێسـتا چی وامان نەماوە بیدەینەوە بە خەڵک. ئاوا بچێتە پێش ژیانمان لێ تاڵ دەکەن. وا چاکە لێرە بڕۆین و بچینە شوێنێکی دیکە و خۆمان لەو بەڵایە ڕزگار کەین. بچینە شوێنێک کەس نەمانناسی و لەوێ

ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەین. ئیدی چوون سواری کەشتی بوون و نەشیان دەزانی ڕوو لە کوێ بکەن و بچن بۆ کام لا.

ڕێکەوت وا بوو، هەڵی کردە ڕەشەبا و تۆفان و کەشتییەکەیان شکا. کابرا و ژنەکەی و دوو منداڵەکەی هەر یەکەی خۆیان بە تەختەیەک هەڵواسی و لە سەری گیرسانەوە. شەپۆلی دەریا هەر یەکەی بۆ لایەکی ڕادان. ژنە ڕێی کەوتە شارێک و یەکێک لە منداڵەکان ڕێی کەوتە شارێکی دی. منداڵەکەی دیکەیان کەشتی دیکە لە دەریادا ڕزگاریان کرد و لەگەڵ خۆیان بردیان. بەڵام کابرا شەپۆل بردییە قەراخ دورگەیەکی زۆر دوورکەوتە و لاپەڕ. کابرا لە دەریا هاتە دەرێ و دەسنوێژی شوشت و بانگی دا و نوێژی کرد.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کابرایە کە چووە ناو دورگەکەوە و دەسنوێژی شوشت و بانگی دا و نوێژەکەی کرد. لە پڕدا کەسـانێکی جۆراوجۆر لە دەریـا هـاتنە دەرێ و لەگەڵی ڕاوەسـتان و نوێژەکەیان لەگەڵ کرد. هەرکە نوێژەکە کرا کەسـەکان چوونەوە ناو دەریا و کابرا چوو بۆ لای دارێک کە لەو دورگەیەدا بوو. هەتا تێر بوو میوەی خوارد. دوای ئەوە گەڕا و کانییەکی دیتەوە و ئاوی خواردەوە. شـوکر و سپاسـی خودای کرد و سـێ ڕۆژان لەوێ مـاوە. هەر کـاتێک نوێژی دەکرد، ئەو تـاقمە جۆراجۆرە لە دەریـا دەهـاتنە دەرێ و نوێژەکەیان لەگەڵ دەکرد. دوای ئەوەی سـێ ڕۆژە تەواو بوو. دەنگێک لە غەیبەوە هاتە گوێی کە گوتی: «تۆ کە پیاوچاکیت و وەسـیەتەکەی بابت بە جێ گەیاند و باوەڕت بە گەورەیی خودایە خەمت نەبێ. خودای مەزن تۆڵەی تەواوی ئەو ماڵەت بۆ دەکاتەوە. ئەو دورگەیە پڕە لە گەنج و جەواهێرات کە خودای میری مەزن بۆ تۆی تەرخـان کردووە و گەنج و زێڕ و جەواهێراتەکەش لە فڵانە جێیە. ئەتۆ بچووە زێڕ و جەواهێراتەکە بێنە دەرێ ئێمە کەشـتییەکان بەرە و لای تۆ دەنێرین. بەس تۆ لەگەڵ خەڵک باش بە و چاکەیان لەگەڵ بکە و سـەرنجیان بۆ لای خۆت ڕابکێشـە. بە جۆرێک کە هانیان بدەی بێنە ئێرە ئاکنجی بن.»

کابرا چووە ئەوە شـوێنەی دەنگە غەیبییەکە ئاماژەی پێ کردبوو. گەنج و خەزێنەیەکی زۆر و بێ ئەژمار. کەشـتی دەهاتنە ئەو دورگەیە و دادەبەزین بۆ حەسـانەوە و سـەیران. کابرا پێشـوازی لێ دەکردن و لەو گەنجە بەشـی دەدان و دەسـتی دەگرتن. بەو جۆرە خەڵکێکی زۆر ئۆگری ئەو دورگەیە و ئەو کـابرایە بوون. ئەویش پێی دەگوتن بە خەڵکی دیش بڵێن بێنە ئێرە و لێرە هەموو شـت زۆرە. با بێن لێرە ئاکنجی بن. بەو جۆرە خەڵێکی زۆر لە دوور و نیزیکەوە دەهاتنە ئەوێ. وا دە ساڵی تەواوی پێ نەچووبوو کە ئەو شوێنە ببووە شارێکی ئاوەدان و ئەو کابرایەش ببوو بە پاشا و دەسەڵاتداری ئەو شارە. هەرکەس هاتبا ئەو شارە پاشا ماڵ و سامانی دەدایە و دەستی دەگرت. تا وای لێ هات ناوبانگی ئەو کابرایە لە دونیادا دەنگی داوە.

کوڕە گەورەکەی کابرایەک بردبووی گەورەی کردبوو لە سـەر ڕەوشـت و زانیاری پەروەردەی کردبوو. کوڕە چکۆڵەکەشـی هەر وا کابرایەکی دیکە بردبوویە لای خۆی و فێری پیشـەی بازرگانی کرابوو. ژنەکەی تووشـی پیاوێکی بازرگان ببوو، ئەو بازرگانە ئەوی کردبوو ئەمین و چاوەدێری ماڵەکەی و پەیمانی لەگەڵ بەسـتبوو کە خەیانەتی پێ نەکا. بە کەشتی چوو با بۆ هەر کوێیەک ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد و حیسـابی ماڵەکەی بۆ

ڕادەگرت.

کوڕە گەورەکەی ئەو کابرایە ناوبانگی ئەو شـارەی بیسـتەوە. هەڵوێسـتی گرت بچێتە ئەوێ. هەرچەند نەشـی دەزانی پاشـای ئەو وڵاتە کێیە. کە گەیشـتە ئەو شـارە و چووە لای پاشـای ئەو شـارە، کردی بە بنووسـی خۆی. کوڕەکەی دیکەشـی ناوبانگی پیاوچاکی و دادپەروەری ئەو پاشایەی بیست ئەویش هەستا هات بۆ لای. پاشا ئەویشی کردە پارێزەر و چاوەدێری کاروباری خۆی. ماوەیەکی زۆر ئەو دوو برایە لە خزمەت ئەو پاشـایەدا ژیانیان بردەسـەر و هیچکام لەو دووانە ئەوی دیکەی نەدەناسـی بەڵام ڕوحمێکی تایبەتیان بۆ یەک هەبوو. ماوەیەک دوای ئەوە، ئەو بازرگانەی کە ژنەکەی کابرای لە لا بوو، ناوبانگی پیاوچاکی و دادپەروەری کابرای پیاوچاک و چاکەکاری بیسـتەوە. هێنای کاڵای ئاڵاووالای و شتی بە قیمەت گران و بە وەزن سووکی لە شاران کۆ کردەوە و لە کەشتی دا. ژنەشی لەگەڵ بوو بەرەو ئەو شارە وەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە قەراخی ئەو دوڕگەیە. وا بوو لە کەشتییەکە دابەزین و چوون بۆ لای پاشـا و دیارییەکانیشـیان بۆ برد. پاشـا کە دیارییەکانی دیت زۆری پێ خۆش بوو دەسـتخۆشـانەیەکی شـایانی بۆ ڕاسـپارد. لە نێو دیارییەکاندا دەرمانیشـی تێدا بوو، پاشـا ویسـتی بازرگانەکە ناوی دەرمانەکانی پێ بڵێ و پێشـی بڵێ چ قازانجێکییان هەیە و بۆ چی باشـن. بە بازرگانەکەی گوت ئەو شـەو لە لامان بمێنەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چوارسەد و حەفتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــكۆ! كە پاشـــا بە بازرگانی گوت ئەو شـــەو لە لامان بمێنەوە، بازرگان گوتی: «ئەمن ئەمانەتێكم لەگەڵە كە بەڵێنم پێ داوە كە كارەكانی ئەو جگە لە خۆم بە كەسی دیكە نەســـپێرم. ئەویش ژنێكی داوێنپاك و چاكەكارە كە هەرچی من هەمە هەمووی ئی دۆعای بە خێری ئەوە.» پاشـــا گوتی: «دەڵێی كەســـێك ئەمین و دەســـپاك بنێرم لە لای شتەكانی بخەوێ و پارێزگاریان بكا. بازرگان ڕازی بوو لە لای پاشا ماوە. پاشا بنووس و پارێزەرەكەی نارد بۆ لای ژنە و پێی گوتن: «بچن ئاگاتان لە كەشـــتی ئەو بازرگانە بێ و بیپارێزن. ئەو دوو برایە چوونە ناو كەشـتییەكەوە یەكی لە لایەكی كەشـتییەكە دانیشـتن لە زەینی خۆیاندا دەســـتیان كرد بە یادی خودا. ماوەیەكی پێ چوو یەكێك لە براكان بەوی دیكەی گوت: «ئەرێ فلانی ئێمە دەبێ تا بەیانی نەخەوین و پارێزەی لەو كەشـــتییە بكەین. دەڵێی چی بۆ ئەوەی خەو بە ســـەرماندا زاڵ نەبێ. بیرەوەری و شـت بۆ یەك بگێڕینەوە؟» ئەوەی دیكەش گوتی زۆر باشە من پێم خۆشە هەر بۆخۆت دەست پێ بكە.

كوڕەكەی ئەوەڵێ گوتی: «كاكە، با باس و بەســـەرهاتی ژیانی خۆمت بۆ بكەم، ئێمە چوار كەس بووین دایك و بابم و برایەكیشـم بوو، كە لەگەڵ تۆ هاونێو بوو. لە فلانە شـار سواری كەشتی بووین وابوو شانسی ئێمە بای نەخوازراو هەڵی كرد و كەشتییەكەی ئێمە تێك شكا. خودای تەعالا كارێكی كرد كەس نازانێ چمان بەسەر هات ئەمن بە تەختەیەكەوە گیرسامەوە و ڕزگارم بوو، جا نازانم دایكم و بابم و براكەم چیان لێ ...» هێشتا قسەكەی تەواو نەببوو كوڕەكەی دیكە كە ئەو قسانەی بیست لێی پرسی: «دایكی تۆ نێوی چ بوو؟» وەڵامی داوە: «نێوی دایكی من فلانی بوو.» دیســـان پرســـی: «نێوی بابت چ بوو؟» وەڵام داوە: «نێوی بابیشـم فلان بوو.» هەر كە ئەو وەڵامانەی بیسـت لەڕێوە خۆی لە باوەشـی براكەی هاویشت و گوتی: «قەسەم بە خودا تۆ برای منی.»

ئیـدی ئەو دوو برایە ئەوەی بە ســـەریـان هـاتبوو هەموویـان بۆ یەكتر گێڕاوە و دایكەكەشیان گوێی لە قسەكانی ئەوان بوو، بەڵام هەر چونێك بوو بە سەرخۆیدا زاڵ ببوو، خۆی ڕاگرتبوو. كە ڕۆژ بووەوە یەكێك لە براكان بەوی دیكەی گوت: «كاكە وەرە دەچینە ماڵی ئێمە درێژەی بەســـەرهاتەكەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. ئیدی ئەوان ڕۆیشـــتن كابرای بازرگان كە هاتەوە هەسـتی كرد، ژنە ناڕەحەت و پەڕۆشـە. لێی پرسـی: «ئەوە چ بووە بۆ وا مات و ناڕەحەتی؟» گوتی: «ئەو شـــەو تۆ كەســـانێك ناردبووە لای من كە ویســـتیان خەیـانەتم پێ بكەن. ئیـدی من بۆیە زۆر نـاڕەحەت بووم.» بـازرگانەكە توورە بوو خێرا گەڕاوە بۆ لای پاشا و شتەكەی بۆ گێڕاوە. پاشا خێرا ناردی بە دوایاندا. هەر چەند هێندەی

پاکی و ســەرراســتی لەوان دیتبوو لە ڕادە بەدەر باوەڕی پێیان بوو، خۆشــی دەویســتن. دوای ئەوە فەرمانی دا ژنەش بێنن. با ڕووبەڕووی ئەو دوو ئەمینە قســـەکانی بکا. لەڕێوە ژنەیان هێنا. پاشــا بە ژنەکەی گوت: «خانم چ شــکایەتێکت لەو دوو ئەمینە هەیە؟» ژنە گوتی: «پاشــا، بیکە بۆ خاتری گەورەیی خودا پێیان بڵێ کە قســـەکانی دوێنێ شـــەویان بکەنەوە.» پاشــان گوتی: «ئەوەی دوێشـــەو گوتووتانە بیلێنەوە بێ زیاد و کەم. ئەوانیش قســەکانی شــەوی ڕابردوویان هەموو گێڕاوە. لە پڕدا پاشــا لە ســەر تەختەکەی هەســتا و هەردووک منداڵەکانی لە ئامێز گرت و گوتی: «ڕۆڵە بە خودا ئێوە منداڵی خۆمن.» ئەوجار ژنەش ڕووپۆشەکەی لە سەر سەری لادا و گوتی: «قەسەم بە خودا منیش دایکی ئەوانم.» ئیدی هەموویان لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و ژیانێکی تازە و پڕ لە خێر و بێریان تێپەڕاند. هەتا یەکەیەکە مەرگ بەرۆکی گرتن. دیارە نەمری هەر بۆ خودایە.

### چیرۆکی ئەبولحەسەنی دەرراج

یەکێکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە ئەبولحەســـەنی دەرراج گێڕاویەتەوە کە: «ئەمن هەموو ساڵێ دەچووم بۆ مەککە و دەهاتمەوە. ساڵێکیان ویستم تەوافیماڵی خودا بکەم و زیارەتی قەبری پێغەمبەریش بکەم (د ـــ س). لە دڵە خۆمدا گوتم: «ئەمن تەواوی ڕێگاکان شــارەزام و ئەوجار بە تەنیا دەچم. ئیدی وەڕێ کەوتم. ڕۆیشــتم هەتا گەیشــتمە قادســییە. چوومە مزگەوت. لەوێ کابرایەکی گولم دیت لە میحرابەکە دانیشـــتبوو. کە منی دیت پێی گوتم: «ئەبولحەســـەن منیش لەگەڵ تۆ دێم بۆ مەککە.» ئەمن لە دڵی خۆمدا گوتم: «ئەمن ئەوە لە دەســت هاوڕێ هەڵاتووم ئێســتا چۆن لەگەڵ گولێک هاوســەفەر دەبم.» ئیدی پێم گوت: «وەڵا ئەمن پێم خۆشە بە تەنیا بچم.» ئەو کابرایە هیچی نەگوت و مات بوو.

کەڕەی بەیانی بە تەنیا وەڕێ کەوتم. ڕۆیشتم ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە عەقەبە و لەوێ چوومە مزگەوت. ســەیرم کرد ئەوە هەر ئەو پیاو گولە لەوێ لە میحرابەکە دانیشــتووە. لە دڵەخۆمدا گوتم سوبحانەڵڵا ئەوە چۆن لە پێش مندا گەیوەتە ئێرە. ئیدی ئەو کابرایە سەری هەڵێنا و بزەیەکی هاتێ. ئەمن ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر حەبەسابووم. کە ڕۆژ بووەوە بە تەنیا ڕۆیشـــتم. کە گەیشـــتمە عەرەفات و چوومە مزگەوت هەر ئەو پیاوە لە میحرابی مزگەوت دانیشـــتبوو. خۆم بەســـەر لاقیدا دا و داوام لێ کرد هاوڕێیەتیم بکا. گوتی: «من کاری وا ناکەم. ئیدی ئەمن لە تاوان دەســتم کرد بە گریان و لالانەوە. پێی گوتم: «مەگری، بە گریان کەس بە هاوارتەوە نایە.»

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ئەو کابرایە پێی گوت: «مەگری تازە بە گریان کەس بە هاوارتەوە نایە. دوای ئەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

چاو دەبێ لەیزان و پاشا ناس بێت
کەس لە ناکەس کاتەوە چاناس بێت
کەس خۆیایە چرای ناو کوڕانە
مانگە و شەبەقی ناو ئەستێرانە
سولەیمان بێ مێرویەک ناهێنێ
باشە کوێر بێ چاوێک کەس نەبینێ

دوای ئەوە گەڕامەوە. دەگەیشتمە هەر کوێ لە پێش منەوە بوو. کە گەیشتمە ناو شاری ئاسەواری نەما. چوومە لای بایزیدی بوستامی و ئەبووبەکری شەعبی و تاقمێکی دیکە لە شێخ و مشایخان و بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ گێڕانەوە. ئەوان گوتیان تۆ لەمە بە دوا قسەکانی ئەوت بۆ دەردەکەوێ. ئەو ئەبووجەعفەری گولە کە لە فەڕ و بەرەکەتی ئەوە دۆعاکان قەبووڵ دەبن و لەبەر ڕێز و گەورەیی ئەوە باران دەبارێ. کە ئەو قسەیەم بیست ئەوەندەی دی تامەزرۆی دیداری بووم و لە خودا پاڕامەوە دڵی نەرم بێ و لێم خۆش بێ و بە هاوڕێی خۆیم قەبووڵ بکا. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە عەرەفات ڕاوەستابووم کە لە ناکاو سەیرم کرد کەسێک لە پشتەوە کراسەکەم دەکێشێ. کە ئاوڕم داوە دیتم هەر ئەو پیاوە گولەکەیە. یەک بە خۆم قیژاندم و بێ هۆش بووم. کە وە هۆش هاتمەوە لەوێ نەمابوو. هەر بۆیە ئەوەندەی دی تامەزرۆی دیداری بووم و لە بەر خودا پاڕامەوە کە بمکاتە هاوڕێ و هاونشینی ئەو. ئەوەندەی پێ نەچوو تەماشام کرد دیسان کەسێک کراسەکەم دەکێشێ، ئاوڕم داوە، پێی گوتم: «تۆ ئەو خودایە وەرە بزانم چیت دەوێ.» ئەمن داوام لێ کرد سێ دۆعام بۆ بکا. یەکیان ئەوەی کە لە خودای بوێ خۆشەویستی هەژاران و نەداران لە دڵمدا جێ کاتەوە. دووەم ئەوەی کە بە بژیوێکی دیاری کراو شەو و ڕۆژ نەکەمەوە. سێیەم دڵاوایی خۆیم پێ بسەلمێنێ. ئیدی داوای ئەو شتەی بۆ من کرد و لێم بزر بوو. بەڵام خودا دۆعا و داواکانی کە بۆ منی کرد لێی قەبووڵ کرد. لە پێش هەموو شتێکدا خۆشەویستی فەقیر و هەژارانی لە دڵمدا چێ کرد بە جۆرێک کە ئێستا هیچ شتێک لە لای من بە قەد هەژاران و نەداران خۆشەویست نییە. بەڵام دۆعای دووەم: ئەو یەک ساڵە کە من هیچ ڕزق و بژیوێکی دیاری کراوم نییە بۆ بەیانی کەچی هێشتا پەکیشم نەکەوتووە. هیوادارم دۆعای

سێیەمیشم بێتە دی و بە ئاوات بگەم.

گەر وەدی بێنی ئاواتم باشترە<br>وەدیشی نەهێنی خۆی زاناترە

**چیرۆکی حاسێب کەریمەددین**

یەکی دیکە لەو چیرۆکانە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە زەمانی زوو حەکیمێک بوو لە حەکیمەکانی یونان کە دانیالیان پێ دەگوت. حەکیمەکانی دیکەی یونان ڕێزێکی زۆری بۆ قایل بوون و باوەڕیان پێی بوو. لە قسەی دەرنەدەچوون بەلام مندالی نێرینەی نەبوو. شەوێک لە شەوان هەر وا بیری لە داهاتووی خۆی دەکردەوە و مات و خەمبار بوو. لەبەر ئەوەی کوڕێکی نەبوو ئەو هەموو زانست و زانیارییەی بۆ بەجێ بلێ، وای لێ هات دەستی کرد بە گریان. وەبیری هاتە کە هەرکەس بە گریان و شیوەنەوە شتێکی لە خودا بوێ و ئاواتێکی بێ بۆی وەدی دێنێ، دەستی کرد بە شین و گریانێک نەبێتەوە لە بەر خودا پاڕاوە و داوای کوڕێکی لێ کرد کە میراتگری ئەو زانست و زانیاریانەی بێ. دوای ئەوە گەڕاوە مالێ و لەگەل خێزانی تێ خزا و نیزیکیان کرد. هەر ئەو شەوە ژنەکەی دوو گیان بوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەلگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! ژنی حەکیم هەر ئەو شەوە دووگیان بوو. دوای چەند ڕۆژ حەکیم سواری کەشتی بوو بچێ بۆ شوێنێک. وا بوو بای نەخوازراو هاتوو کەشتییەکەی شکا و کتێب و شتەکەی هەموو لێ لە دەریا کەوت. باش بوو خۆی بە تەختەیەکی کەشتییەکەی گرتەوە و چەند پەڕی کتێبێکیشی بۆ دەرچوو. شەپۆل ڕایدا و هێنایەوە قەراخ دەریا. ناچار چەند پەڕە کاغەزەکەی هێناوە ماڵێ و لە مجرییەکی ناو. قفڵێکی لە درەگاکەی دا. زگی ژنەکەی تەواو بەرچاو ببوو، دیاری دابوو. بە ژنەکەی گوت: «ژنەکە ئەگەری زۆری هەیە بەو زووانە من بمرم و لەو ماڵە کاتییە بڕۆم. ئەتۆ دووگیانی و ڕەنگیشە منداڵێکی نێرینەشت ببێ. نێوی بنێ حاسیب کەریمەددین و جوان پەروەردەی بکە. ئەگەر هاتوو گەورەش بوو گوتی بابی من چی لێ بەسەر هاتووە؟ ئەتۆ ئەو پێنج پەڕە کاغەزەی پێشان بدە. ئەگەر بێتوو کارێک بکا مانای ئەو پێنج پەڕە بزانێ ئەوە زاناترینی زانایانی ڕۆژگاری خۆی دەبێ.» حەکیم ئەوەی گوت و نەخۆش کەوت. دوای چەند ڕۆژ لە نەخۆشییەکەی گیانی دەرچوو. خزم و کەس هاتنە دەوری و بۆی گریان پاشان شوشتیان و کفنیان کرد و ناشتیان. ماوەیەک دوای مردنی حەکیم خێزانی کوڕێکی جوانکیلەی بوو. هەر وەک بابی وەسیتی کردبوو، ناویان نا حاسیب کەریمەددین. ئینجا ئەستێرەناسانیان کۆ کردەوە و هەتا چاوێک بە چارەنووسیدا بگێڕن. چاویان لێ کرد و گوتیان کە ئەو کوڕە تەمەنێکی زۆری دەبێ. لە سەرەتای لاوێتییدا تووشی کێشە و گیروگرفتێکی زۆر دەبێ بەڵام کە کاتێک لەو سەختی و تووشییە ڕزگاری بوو، زانست و حیکمەتێکی زۆر پێ دەگا.

دایکی دەستی کرد بە پەروەردەکردنی و دووساڵی تەواو شیری دایە. کە بوو بە پێنج ساڵ ناردییە فێرگە بۆ شت فێر بێ. هیچ فێر نەبوو. لە فێرگە گێڕایەوە و ناردی لای سەنعەتکار بۆ ئەوەی فێری پیشەیەک بێ. لەوێش هیچ فێر نەبوو. دایکی دەستی کرد بە گریان. خەڵک بەو ژنەیان گوت: «ژنێکی بۆ بێنە بەشکوو ئەگەر ژنی بێ ناچار بێ ملی کارێک بگرێ. دایکی ژنیشی بۆ هێنا و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ژنە بوو بەڵام وە دوای هیچ کارێک نەکەوت. یەک دوو جیرانیان هەبوو دەچوون لە کێوی چرپیوچاڵ و دروویان دێنا هاتنە لای بە ژنەیان گوت کەر و تەشوێ و گوریسی بۆ بکڕە بەشکوو لەگەڵ ئێمە بێ بارە دروو و سووتەمەنی دێنین و دەیفرۆشین و پارەکەی بەش دەکەین. بەشەکەی ئەو دەدەین بە تۆ.

دایکە کە گوێی لەو پێشنیارە بوو زۆر خۆشحاڵ بوو. خێرا چوو کەر و تەشوێ و گوریسی بۆ کوڕەکەی کڕی و بردی بە جیرانەکانی سپارد. ئەوانیش لەگەڵ خۆیان بردیان

بۆ کێوی. کوڵەکەیان کرد و لە کەرەکانیان نا و گەڕانەوە ناو شـــار. بردیان بارەکانیان فرۆشـــت و ئەوەی وە دەســـتیان هێنا. لە نێوان خۆیاندا دابەشـــیان کرد. ڕۆژی دووەم و سێیەمیش هەر بەو شێوەیە. ئیدی هەر ئاوا کاریان کرد تا ماوەیەکی پێ چوو.

وا بوو بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ ســـووتەمەنی چوونەوە دەشـــت و دەر کەچی بارانەیەکی بە خوڕڕەمی دادا. ئەوانیش هەڵاتنە نێو ئەشـــکەوتێکەوە بۆ ئەوەی تەڕ نەبن. حاســـێب کەریمەددین لە نێو ئەشـــکەوتەکە چووبوو لەو لاوە دانیشـــتبوو هەر ئاوا بە تەشـوێکەی ورد ورد لە عەرزەکەی دەدا کە لە پڕدا هەستی کرد ئەو شـوێنەی بە تەشـوێ لێی دەدا بنەکەی بۆشـــە. کە هەســـتی بەوە کرد ماوەیەک ئەو شـــوێنەی داوە. کەچی تەختەیەکی دارینی دیتەوە کە ئاســـنێکی پێوە بوو. کە ئەوەی دیتەوە خۆشـــحاڵ بوو بانگی هاوڕێکانی کرد.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! هاوڕێ چرپیفرۆشـــەکانی بانگ کرد. چرپی فرۆشـــەکان هاتن و تەختەکەیان دیت بە لەز دەوری تەختەکەیان داوەوە و دەریان هێنا. کە ســـەیریان کرد لە ژێر ئەو تەختەیە درگایەکی تێدایە. درگاکەیـان کردەوە دیتیـان چـاڵێکە پڕ لە هەنگوین. خۆبەخۆ گوتیان ئەوە چاڵێکە پڕ لە هەنگوین. ئێمە دەبێ بچینەوە خیگە و شـــت بێنین و بە خیگە ئەو هەنگوینە بەرینە بازاڕ بیفرۆشـــین و پارەکەی لە نێوان خۆماندا دابەش بکەین. یەکمان لێرە بمێنێتەوە و ئاگای لەو هەنگوینە بێ. حاســـێب گوتی: «ئەمن لێرە دەمێنمەوە و پارێزگاری لێ دەکەم. وا بوو ئەوان حاســـێب کەریمەددینیان لەوێ لە لای هەنگوینە بەجێ هێشت و بۆخۆیان چوونەوە بۆ شار دەفر و خیگە و شتی وا بێنن. دەفر و خیگە و شتیان هێنا پڕیان کردن لە هەنگوین و لە کەرەکانیان نا و گەڕانەوە بۆ شـــار. هەنگوینەکەیان فرۆشت و دووبارە گەڕانەوە بۆ لای چاڵەکە... بەو شێوەیە کێشەوەیان دەکرد و حاسێبیش هەر لە لای چاڵەکە دانیشتبوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان تاقمێک لە چرپیکێشەکان گوتیان: «یەکەم کەس کە ئەو چاڵەی دیتەوە حاســـێب کەریمەددین بوو. بڵێی دواڕۆژ نەڵێ ئەو چاڵە من دیتوومەتەوە و تەواوی پارەکەیم دەوێتەوە، خۆ بە خودا قســـەکەی بۆ دەچێتە ســـەرێ و ڕزگارمان نابێ لە دەســـتی. وا باشـە بە بۆنەی کۆ کردنەوەی پاشـماوەی هەنگوینەکە ڕۆی هێلینە نێو چاڵەکە و ئیدی نەیهێنینەوە دەرێ، ســـەری لێ بنێینەوە با بۆخۆی لەوێدا گیانی دەرچێ و کەسـیش پێی نازانێ. بەوجۆرە هەموو چرپیکێشـەکان لەسـەر ئەوە کۆک بوون. ئیدی ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنەوە سـەر چاڵەکە. حاسـێب کەریمەددینیان شـۆڕکردەوە ناو چاڵەکە دوای ئەوەی پاشـــماوەی هەنگوینەکەی لە چاڵەکەدا کۆ کردەوە هەرای لێ کردن هەڵیکێشـــنەوە هیچ هەنگوینی تێدا نەمـاوە. کەس وەڵامی نەداوە. تێکڕا کەرەکـانیـان بـار کردبوو گەڕابوونە بۆ شـــار و ئەویان بە تەنیا لە چاڵەکەدا بەجێ هێشـــتبوو. ئەویش هەر دەگریا و دەلالاوە و لە بەر خودا دەپاڕاوە و لەو چاڵەدا دەســـتی بە هیچ ڕانەدەگەیشـــت. جارێ با حاسێب کەریمەددین لەوێدا بێ.

چرپیفرۆشـەکانیش چوون لە شـار هەنگوینەکەیان فرۆشـت و پارەکەیان وەرگرت و بە گریـانەوە گەڕانەوە بۆ لای دایکی حـاســـێب و پێیـان گوت: «بۆخۆت خۆش بی و خودا ئەهوەنت کاتەوە.» دایکی حاسـێب دەســـتی کرد بە شـین و گریان و گوتی: «کوڕەکەم بە چی مرد؟» چرپیفرۆشـەکان گوتیان: ئێمە چووینە سـەر کێوێک، بارانێکی توند دایدا ئێمەش چووینە ئەشـکەوتێکەوە. لە پڕ گوێدرێژەکەی حاسـێب ڕای کرد. حاسـێب کەوتە شـوێنی بیگێڕێتەوە. لەو دەشتە گورگێکی لێ بوو، حاسێب و کەرەکەشی خوارد. دایکی حاسێب کە ئەو قسـەیەی بیسـت بە چەپۆک لە سـەر و گوێلاکی خۆی بەربوو. خۆڵی وەسـەر کرد و

ماتەمی گرت. ئەوە دایکی حاسێب.

چرپیکێشـــەکان بە پارەی هەنگوینەکە دووکانیان دانا و دەســـتیان کرد بە بازرگانی و تیجارەت و کڕین و فرۆش و عەیش و نۆش و ڕابواردن.

حاسێب کەریمەددینیش لە نێو چاڵەکەدا هەر خەریکی شیوەن و گریان و پاڕانەوە بوو. هەر بیری لەو چارەنووسەی خۆی دەکردە. وا بوو ڕۆژێک لە پڕدا دووپشکێکی گەورە بەر بووەوە بەر پێی. خێرا هەســتا و دووپشــکەکەی کوشــت. ئینجا لە دڵە خۆیدا گوتی: «ئەو چاڵە پڕ بوو لە هەنگوین ئەو دووپشـــکە لە کوێوە هاتووە؟ هەســـتا لەو شـــوێنەی کە دووپشـکەکەی لێ بەر بووەوە ورد بووەوە. ڕووناکاییەکی لێ وەدیار کەوت. وێردێکی[1] پێ بوو، دەری هێنا و درزەکەی پێ گەورە کردەوە. تا وای لێ کرد. بۆخۆی تێوە بچێ. ئیدی بەو کونەدا چووە ئەو دیو. ســـەیری کرد داڵانێکی گەورەیە. بەو داڵانەدا ڕۆیشـــت هەتا گەیشـتە دەرگایەک کە لە ئاسـنی ڕەش چێ کرابوو. قفڵێکی زێویشـی لێ درابوو. ئەو قفڵە کلیلێکی زێڕی تێدا بوو. چووە بەرەوە و لە درزی دەرگـاکەوە چـاوێکی لە ژووری کرد. ڕووناکاییەکی زۆری دیت. لە ڕێوە دەرگاکەی کردەوە و چووە ژووری. ماوەیەک ڕۆیشـت گەیشـتە گۆلێکی گەورە. لە ناو گۆلە ئاوەکەدا شـتێکی دیت کە وەک شـەپۆل دەچوو. کاتێک چووە پێشـــێ تەماشـــای کرد، تەپکێکی یاقووتی شـــینە کە تەختێکی زێڕینی ڕازاوە بە جەوهێراتی جۆراوجۆر لە سەر دابەستراوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. وێرد: چەقۆیەکە کە دەمەکەی نانوشتێتەوە وەک: خەنجەر، وێردی میوەخواردن، کێرد.

## که شەوی چوارسەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! کاتێک حاسێب کەریمەددین تەختی زێڕین و ڕازاوە بە هەموو جۆرە جەواهێراتێکی دیت و ئەو هەموو کورسییە زێڕین و زێوینەی دی لە دەوری ئەو کورسییە بوو. واقی وڕ ما و چوو بۆ لای کورسییەکان و بژاردنی دووهەزار دانە بوون. ئینجا چوو لە سەر ئەو تەختە دانیشت کە لە نێوەڕاستی کورسییەکان بوو. لە سەری دانیشت. هەر ئاوا بە حەبەساوی سەیری ئەو تەپکە یاقووت و تەخت و کورسیانەی دەکرد هەتا خەو بە سەریدا زاڵ بوو. ماوەیەک خەوت. لە پڕدا گوێی لە دەنگی هاشوهووشێکی زۆر بوو. چاوی هەڵێنا و هەستا دانیشت. لە سەر کورسییەکان مارگەلێکی دیت کە درێژاییان سەد گەز دەبوو. ئەوەندە ترسا تف لە زایدا نەما و دەستی لە ژیان شوت. چاوی مارەکان لە بەر چاوی وەک ئەستێرە دەدرەوشانەوە. چاوێکی لە ناو گۆلەکە کرد تەماشای کرد تا چاو هەتەر دەکا هەر بێچووە مارە و تێک دەگلێن و خودا نەبێ کەس نازانێ ئەژماریان چەندەیە. ماوەیەکی پێ چوو مارێک بەرەوڕووی هات بە قەد یەسترێک کە مەجۆعمەیەکی زێڕینی لە سەر پشتی بوو. لە ناو مەجۆعمەکەش مارێکی لێ بوو، وەک بلوور دەترووسکاوە و سەروچاوی لە بیچمی مرۆڤ بوو. بە زمانێکی پاراو قسەی دەکرد. کە لە حاسێب کریمەددین نیزیک بووەوە سڵاوی کرد. ئینجا مارێک لەو مارانەی لە سەر کورسییەکان بوو هەستا و چوو بۆ لای ئەو مارەی لە سەر مەجۆعمەکە بوو. هەڵی گرت و هێنای لە سەر کورسییەکە داینا. ئەوجار ئەو مارە سپییە بلوورییە بە زمانی خۆیان لەگەڵ مارەکاندا دوا. لە ڕێوە تەواوی ئەو مارانەی لە سەر کورسییەکان بوون خزینە خوارێ و دەستیان کرد بە دۆعا بۆ ئەو مارە سپییە. دوای ئەوە مارە سپییەکە ئیجازەی دان بچنەوە سەر جێگاکەی خۆیان و دانیشن. مارەکان دانیشتن. ئەوجار ئەو مارە بە حاسێب کەریمەددینی گوت: «گەنجۆ، ترست لە من نەبێ ئەمن شاژنی مارانم. کە حاسێب کەریمەددین ئەو قسەیەی لە ماری سپی بیست دڵی ئارام بووەوە. ئیدی شاژنی ماران بە هێندێک لە مارەکانی گوت بچن خواردەمەنی بێنن. ئەوان هەستان سێو و ترێ و فستق و گوێز و بادامیان هێنا و لە پێش حاسێب کەریمەددینیان دانا. شاژنی ماران بە حاسێبی گوت، لەو میوانە بخۆ چونکە لای ئێمە هەر ئەوانەی لێیە و ترست لە ئێمەش نەبێ. کاتێک حاسێب ئەو قسانەی لە شاژنی ماران بیست، ئەهوەن بووەوە و میوەی خوارد و سپاسی خودای کرد. میوە و شتەکەیان لا برد و شاژنی ماران پێی گوت: «حاسێب، پێم بڵێ ئەوە چۆناوچۆنە ڕێت لێرە کەوتووە و لە کوێوە هاتووی؟ حاسێب لە پێشدا بەسەرهاتەکەی بابی گێڕاوە. دوای ئەوە باسی دایکی کرد کە چۆنی گەورە کردووە و لە پێنجساڵیدا ناردوویەتە فێرگە و هیچ فێر نەبووە و دوای ئەوە ناردوویەتە لا سەنعەتکار دیسان هیچ فێر نەبووە. ئینجا

کەرێکیان بۆ کڕیوە خەریکی چرپی کێشانەوە و فرۆشتنی بووە. بۆ شازنی مارانی گێڕاوە کە چۆن لە ئەشکەوتەکەدا چاڵی هەنگوینیان دیوەتەوە و هاوڕێ چرپی کێشەکانی خەیانەتیان پێ کردووە. باسی دووپشکەکەی کرد کە چۆن بەربووەوە ئەویش چاوی لەو جێگەیە کردووە کە دووپشکەکەی لێ بەربووەتەوە. لەو درزەوە چاوی لە دەرێ کردووە و ڕووناکاییێکی دیوە و ئەو درزەی گەورە کردووەتەوە هاتووەتە دالانێک و گەیوەتە دەرگایەکی ئاسن. دەرگای کردووەتەوە و هاتووەتە ئەو شوێنە و لەوێ خەوتووە. هەتا گەیوەتە شازنی ماران. دوای ئەوە بە شازنی گوت: «ئەوە بەسەرهاتی من بوو لە سەرەتاوە هەتا ئێرە لەمەش بە دوا خودا دەزانێ چم بە سەر دێ.

شازنی ماران کە بەسەرهاتەکەی حاسیبی لە ئەشکەوتەکەوە تا ئەوێ بیست پێی گوت: «خەمت نەبێ هەر خێر و خۆشیت بۆ دێتە ڕێ.»

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چوارسەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: خاوەشکۆ، شاژنی ماران بە حاسیبی گوت: «داوات لێ دەکەم ماوەیەکی زۆر لە لای من بمێنەوە تا بەسەرهاتی خۆمت بۆ باس بکەم، ئەو شتە سەیرانەی دیومن بۆ تۆشی بگێڕمەوە. حاسیب کەریمەددین گوتی: «بە گیان و دڵ.»

### چیرۆکی بەلوقیا

شاژن گوتی: «لە شارێکی میسر پاشایەک هەبوو لە هۆزی بنی ئیسرائیل. کوڕێکی بوو بە ناوی بەلوقیا. ئەو پاشـــایە زۆر زانا و چاکەکار و لە خوداترس بوو. زۆریش تینووی کتێبخوێندنەوە بوو. کاتێک ئەو پاشـــایە نەخۆش کەوت و لە مردن نیزیک بووەوە. گەورەگەورەکانی دەوڵەت هاتنە هەنتەشی و سڵاویان کرد و دانیشتن. پاشا لێی پرسین: «گەورە و دڵسۆز و بەرپرسانی دەوڵەت ئەمن چی وام نەماوە بمرم و هیشتێکیشم نییە بۆتان بە جێ بێڵم جگە لە کوڕەکەم بەلوقیا کە ئەو بە ئێوە دەسپێرم. دوای ئەوە مرخەیەکی لێ هات و گیانی دەرچوو. بەو جۆرە ماڵاوایی لە ژیان کرد. گەورە گەورەکانی دەوڵەت ئەویان شوت و بە خاکیان سپارد. ماڵێکی زۆریشیان بۆ خەرج کرد. بەلوقیای کوڕیان لە سـەر تەختی دەسـەڵات دانا. بەلوقیا لەگەڵ خەڵک زۆر دادپەروەر بوو، لە دەورەی ئەودا خەڵک لە ئاسـایشـدا بوون. بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان بەلوقیا دەرکی خەزێنەی بابی کردەوە و چاوی پێدا دەگێڕان. کە بە نێو خەزێنەکەدا دەگەڕا دەرگایەکی هاتە بەر چاو چوو دەرگـاکەی کردەوە. کە کردییەوە دیوێکی چکۆڵە بوو. کە کۆڵەکەیەکی لە بەردی ڕوخامی سـپی تێدا بوو. لە سـەر ئەو کۆڵەکەیەی مجرییەکی لێ بوو لە ئاونووس چێ کرابوو. بەلوقیا مجرییەکەی کردەوە، مجرییەکی زێڕی لە نێودا بوو. ئەویشـی کردەوە کتێبێکی تێدا بوو. ئەو کتێبەی کردەوە و خوێندییەوە. لەو کتێبەدا باسـی تایبەتمەندی محەممەد (د ـــ س)ی تێدا کرابوو کە لە کۆتایی زەماندا دەنێردرێتەوە. ئەماژەی بەوەش کردبوو کە ئەو سـەروەری هەر دووک دنیایە. کاتێک بەلوقیا ئەو کتێبەی خوێندەوە و تایبەتمەندییەکانی گەورەی ئەم دونیا و ئەو دونیای محەممەد (د ـــ س)ی بۆ دەرکەوت. تەواو ئۆگری بوو. دوای ئەوە گەورەگەورەکانی بنی ئیسـرائیلی کۆ کردەوە و ئەو کتێبەی پێ ناساندن و بۆی خوێندنەوە و پێشی گوتن ئەرێ خەڵکینە ئێستا باوکم شیاوی ئەوە نییە لە گۆڕەکەی بێنمەوە دەرێ و ئاگری دەم؟ هۆزەکەی پرسـیاری هۆکارەکەیان کرد. بەلوقیا گوتی: «لەبەر ئەوەی ئەو کتێبەی لێ شـاردوومەوە و نەیهێشـتووە کەس پێی بزانێ.» گەورەکانی هۆزی بنی ئیسـرائیل گوتیان: «شـازادە ئێسـتا باوکت مردووە و کاروباری

کەوتووەتە دەست خودا. ئەتۆ کاری وا مەکە و دەری مەهێنەوە.» بەلوقیا کە ئەو قسەیەی لە گەورەکانی بنی ئیسرائیل بیست زانی کە ئەوانە ناهێڵن کە ئەو باوکی دەربێنێتەوە. ئیدی ئەوانی لەوێ بەجێ هێشت و چوو بۆ لای دایکی و پێی گوت: «ئەمن لە خەزێنەکەی بابمدا کتێبێکم دیتەوە و تایبەتمەندییەکانی محەممەد (د ـ س)م لەوێدا دیت. بۆم دەرکەوت کە ئەو پێغەمبەرێکە کە لە ئاخر زەمانـدا دیســـان دەنێردرێتەوە. ئەمن ئۆگری ئەو بووم و خۆشەویستی ئەو هاتووەتە دڵمەوە دەڕۆم وڵاتان دەگەڕێم هەتا نەیبینمەوە ڕاناوەستم. ئەگەر بێتوو نەیبینمەوە دڵم دەتۆقێ.» ئیدی جلی پاشایی داکەند و عەبایەکی لە بەر کرد و بە دایکی گوت: «دایە لە دۆعای بە خێر بێ بەشـم مەکە. دایکی زۆر گریا و گوتی: «ڕۆڵە دوای تۆ دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێ؟» بەلوقیا گوتی: «لەوە زیاتر ناتوانم ڕاوەسـتم کاری خۆشم و ئێوەش بە خودای گەورە دەسپێرم.» ئیدی لە ماڵ هاتە دەرێ و بەرەو شام کەوتە ڕێ. کەس لە هۆزی خۆیان بەو کارەیان نەزانی بوو. هەر ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەراخ دەریا. لەوێ کەشتی لێ بوو چوو دانیشت. لەگەڵ ڕێبوارەکانی ناو کەشتییەکە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دورگەیەک. ڕێبوارەکانی ناو کەشتییەکە هەموو دابەزین و چوونە ناو دورگەکە. بەلوقیاش لە کەشتییەکە هاتە دەرێ و چوو بە نێو دورگەکەدا بگەڕێ لەوان هەڵبڕا. هەر ئاوا کە دەگەڕا لە بن دارێک دانیشت بحەسێتەوە کەچی خەو دڵی گرت و خەوی لێ کەوت. ماوەیەک خەوت کە خەبەری بووەوە هەسـتا چووەوە بۆ لای کەشتییەکە کەچی کەشتی لەوێ نەمابوو. لەو دورگەیە ماری دی بە قەد وشترێک دەبوون و بە قەد دارخورمایەک درێژ کە هەموویان زیکری خودایان دەکرد و سـڵاوەتیان بۆ دیداری محەممەد (د ـ س) دەنارد. گۆرانی و ئاوازەکانیان هەمووی هەر تەکبیر و سڵاوت بوو. کاتێک بەلوقیا ئاوای دیت جۆرێکی لێ هات و حاڵی تێک چوو.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بەلوقیا سەری تا ئەوپەڕی سوورمان سوور ما. مارەکان کە ئاوایان دیت هاتن تێی ئاڵان و لە دەوری کۆ بوونەوە. یەکێک لە مارەکان لێی پرسی: «ئەتۆ کێی و لە کوێوە هاتووی و بەرەو کوێ دەچی؟» بەلوقیا گوتی: «ئەمن ناوم بەلوقیایە و لە هۆزی بنی ئیسرائیلم. خۆشەویستی و گەورەیی محەممەد (د ـــ س) منی هەڵوەدای ئێرە کردووە. ئێوە پێم بڵێن کێن؟» مارەکان گوتیان ئێمە خەڵکی دۆزەخین و خودای گەورە ئێمەی بۆ ئازاردانی خەڵکی دۆزەخ دروست کردووە.» بەلوقیا پرسی: «هۆی هاتنتان بۆ ئێرە چییە؟» گوتیان: «بەلوقیا، خەبەرت بێ دۆزەخ ساڵێ دوو جار هەناسە هەڵدەکێشێ. کە هەناسە دەردەدا ئێمە فڕێ دەداتە دەرێ. کاتێکیش کە هەناسە دەداتەوە ژووری ئێمەش لەگەڵ خۆیدا دەباتەوە ژووری. بەلوقیا گوتی: «گەلۆ لە دۆزەخدا ماری لە ئێوەی گەورەتر تێدایە؟» مارەکان گوتیان ئێمە لە هەناسە دانی جەهەننەم هاتووینە دەرێ لەبەر ئەوەی ئێمە لە وردەکانین. جەهەننەم مای وای تێدایە کە ئەگەر ئێمە لە کونە لووتەکانیان ڕاکەن هەستی پێ ناکەن. هێندە گەورەن. بەلوقیا بەوانی گوت: «ئاگام لێیە ئێوەش زیکری خودا دەکەن و سڵاو لە دیداری محەممەد لێ دەدەن. پێم بڵێن ئێوە محەممەد لە کوێوە دەناسن؟» مارەکان گوتیان: «بەلوقیا نێوی محەممەد (د ـــ س) لە سەر دەرگای بەهەشت نووسراوە. ئەگەر محەممەد نەبا خودای تەعالا هیچ ئافرێنراوێکی نەدەئافراند و بەهەشت و دۆزەخ و ئاسمانیشی نەدەخوڵقاند. چونکە خودا تەواوی کائیناتی لە خۆشەویستی محەممەد خوڵقاندووە. خودا نێوی ئەوی لە هەموو جێیەک لە نیزیک نێوی خۆی هێناوە هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمە ئەومان خۆش دەوێ.»

بەلوقیا کە ئەو قسانەی لەو مارانە بیست خۆشەویستی محەممەد لە دەروونیدا چەند هێندە زیادی کرد و ئۆگری بۆ محەممد ئەوەندەی دی پەرەی ئەستاند. ئیدی بەلوقیا ماڵاوایی لەوان کرد و ڕۆیشت هەتا گەیشتە قەراخ دەریا. کەشتییەکی دیت کە لەوێ لە پەنا وێستگەکە ڕایانگرتبوو. چوو سوار بوو و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دورگەیەکی دیکە. بەلوقیا لەو دورگەیە دابەزیبوو دەگەڕا. لەوێش ئەوەندەی مار لێ بوو کە ئەژماریان جگە لە خودای تەعالا کەسی دیکە نازانێ چەند بوون. لە نێو ئەو مارانەدا مارێکی تێدا بوو سپی دەتگوت مروارییە و لە بلوور سپیتر بوو. ئەو مارە سپییە لە سەر مەجۆعمەیەک پاپۆکەی خواردبوو کە مەجۆعمەکەش لە سەر پشتی مارێک بوو، وەک فیل. ئەو مارە سپییە شاژنی ماران بوو. حاسێب ئەو مارە منم. حاسێب کەریمەددین لە شاژنی پرسی: «ئەی لەگەڵ بەلوقیا چیت کرد؟» شاژن گوتی: «حاسێب ئەمن چاوێکم لە بەلوقیا کرد و سڵاوم لێ کرد. ئەویش وەڵامی سڵاوەکەمی داوە. ئەمن لێم پرسی: «ئەتۆ کێی و چ کارەی؟ لە کوێوە دێی و دەچی

بۆ کوێ؟ نێوت چییە؟» گوتی: «ئەمن لە هۆزی بنی ئیســـرائیلم و نێوی من بەلوقیایە و وەدوای محەممەد (د ـــــ س) کەوتووم. چونکە من تاریفی ئەوم لە کتێبە ئاســـمانییەکاندا خوێندووەتەوە.» دوای ئەوە بەلوقیا بە منی گوت: «ئەتۆ کێی و چکارەی؟ ئەو مارانەت بۆ ملەوەیە؟» ئەمنیش وەڵامم داوە: «بەلوقیا، من شاژنی مارانم. کاتێک تۆ محەممەدت دیتەوە سڵاوی منی پێ بگەیەنە. دوای ئەوە بەلوقیا ماڵاوایی لێ کردم و چوو سوای کەشتی بوو. ڕۆیشت هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە بەیتولموقەددەس. کابرایەکیش بوو نێوی عەففان بوو. زانستی هێندەسە و حیساب و زانستی ئەستێرەناسی باش دەزانی و تەورات و ئینجیل و ســـوحوفی خوێندبووەوە و لە کتێبێکدا دیتبووی کە هەرکەس ئەنگوســـتیلەکەی حەزرەتی ســـولەیمان لە قامک بکا، جن و کێوی و مەل و باڵندەی دنیا دێنە ژێر فەرمانی ئەوەوە و گوێڕایەڵی دەبن. لە کتێبێکی دیکەشدا دیتبووی کە کاتێک حەزرەتی سولەیمان مرد ئەویان خســتە دارمەیتێکەوە و لە حەوت دەریایان تێپەڕاند. ئەنگوستیلەیەکی لە قامکدا بوو لە جن و ئینس کەس ئەو تواناییەی نەبوو ئەو ئەنگوستیلەیە لە قامکی دەربێنێ. هیچ کەشتییەکیش ناتوانێ بگاتە ئەوێ.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتایی پێ هات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که ئەوی چوارسەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! عەففانیش لە کتێبەکاندا دیتبوویەوە کە گیایەک هەیە لە نێو گیایەکاندا. هەر کەس ئەو گیایە ببینێتەوە و بیگوشێ و ئاوەکەی لە بەری پێی دا. دەتوانێ بە سەر تەواوی ئەو دەریایانەدا بڕوا کە خودای تەعالا دروستی کردوون. بێ ئەوەی قاچی تەڕ بێ. بەڵام کەس ناتوانێ ئەو گیان بدۆزێتەوە مەگین شاژنی مارانی لەگەڵ دا بێ. دوای ئەوە بەلوقیا هات بۆ بەیتولموقەددەس. لەوێ لە شوێنێک دانیشت و دەستی کرد بە عیبادەت و خوداپەرستی، تا وا بوو عەففان هات بۆ لای و سەیری کرد ئەوە تەورات دەخوێنێتەوە و خەریکی خوداپەرستییە. ئینجا چوو بۆ لای و لێی پرسی: «ئەتۆ ناوت چییە و لە کوێوە هاتووی و بۆ کوێ دەچی؟» گوتی: «ناوی من بەلوقیایە و لە وڵاتی میسرەوە هاتووم و ئەودالّی محەممەدم(ﷺ) و بە دوای ئەودا دەگەڕێم. عەففان ئەوی بانگهێشت کرد میوانی بێ. بەلوقیاش قەبووڵی کرد. ئینجا عەففان دەستی بەلوقیای گرت و بردی بۆماڵی خۆیان و رێزێکی زۆری لێ گرت. دوای ئەوە پێی گوت: «ئەتۆ لە کوێوە محەممەدت(ﷺ) ناسی و چۆناوچۆن بوو ئاوا ئوگر و شەیدای بووی تا ئەو جێیەی ئاوا سەری خۆت هەڵگری و ئەودالّی بێ؟ ئەی کێ پێی گوتی بێیە ئێرە؟»

بەلوقیا بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە. کاتێک عەففان گوێی لە بەسەرهاتەکەی بەلوقیا بوو. گوتی: «ئەتۆ شاژنی مارانم پێشان بدە هەتا منیش تۆ لەگەڵ محەممەد(ﷺ) ئاشنا بکەم. هەرچەند جارێ زۆری ماوە بۆ ناردنی محەممەد(ﷺ). ئەگەر شاژنی ماران بگرین ئەوە لە قەفەسێکی دەخەین و دەبەین بۆ دەشتودەر و جا بە لای هەر گیایەکدا بڕۆین گیایەکە بۆخۆی وە زمان دێ و قازانج و زەرە و تایبەتمەندییەکانی خۆیمان پێ دەڵێ. چونکە من لە نێو کتێباندا خوێندوومەتەوە کە گیایەک هەیە، کە ئەگەر بیکوتی‌و ئاوەکەی بگری و ئەو ئاوە لە بنی پێت هەڵسووی، بە سەر هەر دەریایەکدا بڕۆی تەنانەت بەری پێشت تەڕ نابێ. ئەگەر ئێمە شاژنی ماران بگرین و ئەویش ئەو گیایەمان پێ بڵێ دوایە مارەکە ئازاد دەکەین. ئاوی گیایەکە دەگرین و لە بەری پێمانی دەدەین. لە حەوت دەریا تێدەپەڕین و دەچینە سەر گۆڕی حەزرەتی سولەیمان. کلکەوانەکەی لە قامکی دەردێنین. وەک سولەیمان ئێمەش دەسەلاتداری دەکەین و بە ئاواتی خۆمان دەگەین. دوای ئەوە ڕۆدەچینە ناو دەریای ڕەشەوە و ئاوی حەیات دەخۆینە. ئیدی خودای مەزن ژیانی هەتا هەتاییمان پێ دەبەخشێ و ئەودەم لەگەڵ محەممەد(ﷺ) پێک دەگەین. کاتێک بەلوقیا ئەو قسەیەی لە عەففان بیست پێی گوت: «عەففان من ئەتۆ لەگەڵ شاژنی ماران ئاشنا دەکەم و شوێنەکەیت پێ دەڵێم. عەففان لەڕێوە هەستا، قەفەسێکی ئاسنی دروست کرد،

دوو دەفری هێنا یەکی پڕ کرد لە شیر و یەکی پڕ کرد شەراب و لەگەڵ خۆی هێنانی. ماوەی چەند شەو و ڕۆژان لەگەڵ بەلوقیا ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو دوورگەیەی شاژنی مارانی لێ بوو. لە ناو دوورگەکەدا گەڕان. دوای ئەوە عەففان هێنای قەفەسەکەی لە شوێنێک دانا و ئەو دوو دەفرەی کە پڕ بوون لە شیر و شەراب لە نێو قەفەسەکەدا داینا. ئیدی بۆخۆیان دوور کەوتنەوە و چوون لە بۆسەوە. ئینجا شاژنی ماران هات بۆ لای قەفەسەکە و لەو دوو دەفرە چووە پێشێ. ماوەیەک هەر تێیان ڕاما. هەر کە بۆنی شیرەکەی بۆ هات لە قەڵاندۆشی ئەو مارەی هەڵی گرتبوو هاتە خوارێ و چوونە ناو قەفەسەکەوە. کەمێکی بۆن پێوە کردن و دمی لە جامی شەرابەکە ناو هەمووی خواردەوە. ئیدی سەری لە کێژەوە هات و هەر لەوێ خەوی لێ کەوت. کاتێ عەففان بەوەی زانی خێرا گەیشتە سەری و دەرکی قەفەسەکەی لە سەر داخست. ئەوجار قەفەسەیان هەڵگرت و لێیاندا ڕۆیشت.

کاتێک شاژنی ماران وە خۆ هاتەوە سەیری کرد ئەوە لە ناو قەفەسێکی ئاسنین دایە و لە سەر سەری کەسێکە دەیبا و بەلوقیاش لە پەنایان دەڕوا. شاژنی ماران بانگی بەلوقیای کرد و گوتی: «ئەوە هەرکەس چاکە لەگەڵ مرۆڤ بکا و ئازاری نەدا ئەوەیە پاداشەکەی؟» بەلوقیا وەڵامی داوە و گوتی: «شاژنی ماران، نیگەران مەبە و مەترسێ ئێمە قەت تۆ ئازار نادەین. بەس تەنیا دەمانهەوێ گیایەکمان پێشان بدەی کە ئەگەر ئاوەکەی بگرین و لە بەری پێمانی بدەین تەڕ نەبین و بە بێ ترس هەر دەریایەک کە پێمان خۆش بێ بە سەریدا بڕۆین و قوم نەبین. ئێمە کە ئەو گیایەمان دیتەوە تۆ دەبەینەوە شوێنەکەی خۆت و ئازادت دەکەین. بەوجۆرە عەففان و بەلوقیا شاژنی مارانیان بردە داوێنی کێوێک کە پڕ بوو لە گژوگیانی جۆراجۆر. لەگەڵ هەر گیایەک قسەی دەکرد بە ئیزنی خودا تەواو قازانج و زەرەر و تایبەتمەندییەکانی خۆی دەگوت. لەو نێوەدا گیان وە قسە هات و گوتی: «ئەمن ئەو گیایەم کە ئەگەر هەرکەس من ورد بکوتێ و ئاوەکەم بگرێ و لە ژێر پێی خۆیم دا ئەوە دەتوانێ بە سەر هەموو دەریاکاندا بڕوا و قاچی تەڕ نەبێ. عەففان کە گوێی لەو قسەیە بوو خێرا قەفەسەکەی دانا و بە قەرا پێویستی لەو گیان هەڵکەند و هەر لەوێ لە سەر بەردێک کوتایی و ئاوەکەی لە شتێک کرد. دوای ئەوە عەففان و بەلوقیا قەفەسەیان هەڵگرت و ڕۆیشتنەوە بۆ ئەو دوورگەیەی مارەکەیان لێ گرت. عەففان قەفەسەکەی دانا و دەرگاکەی کردەوە. شاژن لە قەفەسەکە هاتە دەرێ و پێی گوتن: «چی لەو ئاوە دەکەن؟» گوتیان بە تەمایین ئەو ئاوە لە بەری پێمانی بدەین و لە حەوت دەریا تێپەڕین و بچینە سەر گۆڕی حەزرەتی سولەیمان و کلکەوانەکەی لە قامکی دەربێنین. شاژنی ماران پێی گوتن: «ئێوە دەستتان بەو ئەنگوستیلەیە ڕاناگا.» ئەوان گوتیان: «بۆ ناتوانین ئەو ئەنگوستیلەیە بێنین؟» شاژن گوتی: «چونکە خودای گەورە کەرەمی کردووە ئەو کلکەوانەیەی بە تایبەتی داوە بە حەزرەتی سولەیمان و تاز ناشیدا بە کەسێکی دیکە. ئێوە چ کارێکتان بەو

قامکەوانەیە؟ هێشـــتا ئێوە ئاوی ئەو گیایەتان گرتبا کە هەرکەس بیخوا هەتا ڕۆژی قیامەت نەمرێ هێشـــتا بۆ ئێوە باشـــتر بوو. بەڵام ئێوە بەو ئاوە بە ئامانج ناگەن.» ئەوان کە ئەو قسەیان بیست زۆر زۆر پەشیمان بوونەوە.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی چوارسەد و هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ! بەلوقیا و عەففان زۆر پەشـــیمان بوونەوە. با ئەوان لێرە بەدەم پەشیمانییەوە داخ و ڕۆیان بێ.

شـاژنی مارانیش گەڕاوە لای لەشکرەکەی خۆی. سـەیری کرد ئەو تووشـی شکست و نەهامەتی هاتوون و بەهێزەکانیان بێ هێز و بێ هێزەکانیشـــیان مردوون. کە مارەکان شـاژنیان دیت لە خۆشـیان شـاگەشـکە بوون و هەموو هاتن لە دەوی کۆ بوونەوە. لێیان پرسـی: «ئەوە تۆ چووبووی بۆ کوێ و چیت لێ بەسـەر هات؟» شـاژن بەسـەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە. دوای ئەوە لەشـــکرەکەی خۆی کۆ کردەوە و بەرەو کێوی قافی بردن. چونکە زسـتانان دەچوونە کێوی قاف دەژیان و هاوینان دەهاتنەوە ئەو شـوێنەی حاسـێب کەریمەددین هاتە لایان. ئینجا شـــاژن گوتی: «حاســـێب، ئەوە بوو بەســـەرهات و سەربوهوردەی من.

حاسێب سەری لەو بەسەرهاتەی مارەکە سووڕ ما و پێی گوت: «ئەمن ئەو داوایەم لە تۆ هەیە کە بە یەکێک لە هاوکارەکانت بڵێی ئەمن لێرە بەرێتەوە دەرێ و بمباتەوە ســـەر زەوی لای کەس و کارەکەم. شـاژنی ماران گوتی: «حاسێب ئەتۆ بەجێمان مەهێڵە و مەڕۆ. ڕاوەسـتە با زسـتان بگاتێ دەچینەوە کێوی قاف. لەوێ بۆخۆت لە نێو ئەو کێو و دەشـت و دەرە کەیف بکە. لە نێو ئەو دارســـتانە پڕ لە باڵندە و شـــتەدا بگەڕێ و ســـەیر بکە چۆن هەموویان خەریکی زیکری خودان. لەوێ ئەوەندە دێو و درنج و شت دەبینی کە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ ژمارەیان چەندەیە.

کاتێک حاسـێب کەریمەددین گوێی لەو قسـانەی مار بوو، مات بوو. پێی گوت: «پێم بڵێ ئاخری بەســـەرهاتی عەففان و بەلوقیا بە کوێ گەیشـت. گەلۆ لە حەوت دەریا تێپەڕین یان نا؟ گەیشـتنە سـەر گلکۆی حەزرەتی سـولەیمان یان نا؟ شـاژنی ماران گوتی: «حاسـێب، عەففان و بەلوقیا دوای ئەوەی لە من هەڵبڕان، چوون لەو ئاوە لە بەری پێیان دا و بەســـەر دەریادا دەڕۆیشتن و کەیف و سەیرانیان دەکرد و هەر لەو دەریا دەچوونە دەریاکەی دیکە. هەتا لە حەوت دەریاکان تێپەڕین. لەوێ کێوێکی بەرزیان دیت کە یەکســـەر یاقووتی ســـەوز بوو. گڵەکەی میسـک بوو. کاتێک گەیشـتنە ئەوێ لە دوور ئەشـکەوتێکیان لێ وەدیار کەوت کە لە ســـەر ئەشـــکەوتەکە گومبەزێکی گەورەی لێ بوو لە دوور دەدرەوشـــاوە. کە ئەشکەوتەکەیان دیت بەرەو رووی چوون و چوونە ژوورێ. لەوێ تەختێکی زێڕی لێ بوو، کە بە مرواری و یاقووت و جەواهێرات ڕازابووەوە. لە دەوری ئەو تەختە کورســـیگەلێکی زۆری لێ بوو. کە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ ژمارەیان چەند بوو. حەزرەتی سـولەیمان لە

نێو ئەو تەختەدا خەوتبوو. قوماشـــێکی حەریری ســـەوز کە قەراخەکانیان بە داوی زێڕ و جەواهێراتی گرانبایی ڕازاندبووەوە پێیان دادابوو. دەســـتی لە ســـەر ســـینگی بوو کە ئەنگوستیلەکەی تێدا بوو. ترووسکەی ئەو ئەنگوستیلەیە لە ترووسکە تەواوی ئەو یاقووت و جەواهێراتە زیاتر بوو. دوای ئەوە عەففان بەلوقیای فێری زۆر وێرد و چاچوول کرد و پێی گوت: «ئەتۆ ئەو وێرد و دۆعایانە بخوێنە هەتا من ئەنگوســتیلەکەی لە قامکی دەردێنم. بەڵام ڕانەوەستی.

عەففان لە تەختەکە چووە پێشــێ. لە ناکاو مارێکی گەورە لە ژێر تەختەکە هاتە دەرێ و وای فشـــاند کە تەواوی وڵاتی لەرزاندەوە و گڕ و بڵێســـە لە زاری هاتەدەرێ. دوای ئەوە مارە بە عەففانی گوت: «بێتوو دەست هەڵنەگرن تێدا دەچن. عەففان دەستی کرد بە وێرد و دۆعا و لە مارەکە نەترســـا. لە پڕدا مارەکە هوویەکی کرد خەریک بوو تەواوی وڵات ئاور بگرێ، گوتی: «عەففان حاڵی بە، ئەگەر دەســـت هەڵنەگری ئاورت دەدەم. بەلوقیا کە ئەو قسـەیەی لە مارەکە بیسـت لە ئەشـکەوتەکە هاتە دەرێ. بەڵام عەففان لە مارەکە نەترسـا و گوێی نەدایە. دیسـان لە حەزرەتی سولەیمان چووە پێشێ و دەسـتی بۆ ئەنگوسـتیلەکە برد و ویسـتی لە قامکی سولەیمانی پێغەمبەر دەرێنێ. کە مارە تینێکی ئاراستە کرد و کردی بە خەڵووز. چارەنووسی عەففان ئاوای لێ هات و بەلوقیاش بێهۆش بوو.

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی چوارسەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشــــكۆ! بەلوقیا كاتێك دیتی عەففان ســــووتا و بوو بە خۆڵەمێش، لەوێ بێهۆش بوو. ئینجا خودای تەعـالا بە جوبرەئیلی فەرموو كە پێش ئەوەی مـارەكە گڕی ئاراستەی بەلوقیا بكا فریای كەوە.

جوبرەئیل بە لەز خۆی گەیاندە زەوی، ســــەیری كرد بەلوقیا بێ هۆش كەوتووە و عەففانیش بووە بە خەڵووز. ئیدی جوبرەئیل بەلوقیای لەگەڵ خۆی هێنا و پێی گوت: «ئەوە چۆن هاتوویتە ئەو شوێنە؟» بەلوقیا بەسەرهاتەكەی لە سەرەتاوە تا كۆتایی بۆ باس كرد. ئەمن هەر لەبەر حەزرەتی محەممەد هاتوومە ئێرە چونكە عەففان بە منی گوت كە محەممەد تا كۆتایی دونیا نایە و كەس ناتوانێ بیبینێ مەگین تەمەنی هەتاهەتایی بێ و تا كۆتایی دونیا نەمرێ. كەســــیش ناتوانێ بمێنێ و نەمرێ مەگین ئاوی ژیان بخواتەوە. ئاوی ژیانیشــــی دەست ناكەوێ تا حەزرەتی سولەیمان نەبینێتەوە. هەر بۆیە من لەگەڵی بووم بە هاوڕێ و هاتینە ئێرە. ئەوە ئاوای لێ بەســــەر هات. ئێســــتاش ئەمن تكام لە تۆ ئەوەیە كە پێم بڵێی حەزرەتی محەممەد لە كوێیە؟ جوبرەئیل گوتی: «بەلوقیا برۆ بە لای كاری خۆتەوە چونكە زۆری ماوە محەممەد بێ.

دوای ئەوە جوبرەئیل هەڵكشاوە بۆ ئاسمان. بەلوقیا بەو قسەیە زۆر نارەحەت بوو زۆر گریا ئەگەر بیستی كە شـاژنی ماران گوتی: «كەس دەسـتی بە ئەنگوسـتیلەی سـولەیمان ڕاناگا.» ئیدی بەلوقیا ئەوداڵ و سەرگەردان بە گریانەوە لە كێوەكە هاتە خوارێ و ڕۆیشت هەتا گەیشــــتە قەراخ دەریا. مـاوەیەكی زۆر لەوێ دانیشــــت. بیری لەو كێو و دەریـا و دوڕگەگەلە دەكردەوە و واقی وڕمابوو. ئەو شــــەوە تا بەیانی لەوێ ماوە. كە ڕۆژ بووەوە لەو ئاوەی كە لە گیایەكەی گرتبوو كەمێكی لە بەری پێی هەڵســـوو. پاشـــان لە دەریای دا. چەند شەو و ڕۆژ بە سەر دەریادا ڕۆیشت و بەو هەموو شتە جوان و سەرسووڕهێنەرەی كە لە دەریادا دەی دیت سەرسام بوو. هەر ئاوا بەردەوام كە دەڕۆیشت گەیشتە دوڕگەیەك كە گڵەكەی زەعفەران و خیزەكەی یـاقووت و جەواهێراتەكەی گرانبـایی و دارەكـانی لە باشــــترین دارەكان و گژوگیاكانی باشــــترین گژوگیا بوو. ئەو دوڕگەیە كانیاوی زوڵاڵ و خۆش و دار و چێوی عوودی قومـاری و عوودی قـاقێلی و دەوراندەوری ئەو دوڕگەیە گوڵی نێرگس و مێخەك و ســـوێســـنە و وەنەوشـــە بوو. بەلوقیا بە دیتنی جوانییەكانی ئەو دوڕگەیە حەبەســـا بوو. زانی كە ئەو ڕێگای پێیدا هاتبوو ئەو نییە و لێی تێك چوو. ئیدی تا كاتی شێوان لەوێ خولاوە و چاوی گێڕا و كەیفی كرد.

كە بوو بە شـەو چووە سـەر دارێكی بەرز لەوێ بخەوێ. لە ناكاو گیانلەبەرێكی گەورە

لە دەریا هاتە دەرێ و یەکبەخۆی هۆڕاندی. بە جۆرێک کە تەواوی ئاژەڵەکانی ناو ئەو دوڕگەیە نەترەیان چوو. بەلوقیا لە سەر دارەکە دانیشتبوو. چاوێکی لە دەریا کرد گیانلەبەرەکەی دیت زۆر گەورە بوو. چاوی لێ بوو بە دوای ئەو ئاژەڵە گەورەیەدا ئاژەڵێکی کێوی زۆر بە دوایدا هاتن. یەکی گەوهەرێکیان بە دەستەوە بوو کە وەکوو چرا دایسا. ئەو دوڕگەیان وەک ڕۆژ ڕووناک کردبوو. دوای ماوەیەک کێوییەکی زۆری دیکە کە هەر خودا دەزانێ ژمارەیان چەندە دەبوون بەرەوڕووی کێوییەکانی دی بوونەوە. بەلوقیاش ئەوە لێی دیارن. کێوییەکانی ناو دوڕگەکە لە پڵینگ دڕندە و شتی وا بوون. ڕووبەڕووی ئەوان چوون هەتا لە قەراخ دەریا گەیشتنە کێوییەکانی دەریا. ئەو دوو دەستە کێوییەی دەریا و ویشکی هەتا بەیانی پێکەوە خەریکی قسە و باس بوون. کە بوو بە ڕۆژ هەرکەسەی گەڕاوە بۆ شوێنی خۆی. کاتێک بەلوقیا ئەوەی دیت لە ترسان لەرزی و لەسەر دارەکەڕا کەوتە خوارێ و خێرا هەستا چوو بۆ قەرخ دەریا و بەری قاچی بە ئاوی گیایەکەی تەڕ کرد و لە دەریای دووەمی دا. شەو ڕۆژ بە سەر ئاوەکەدا دەڕۆیشت هەتا گەیشتە کێوێکی گەورە کە داوێنی کێوەکە ساکەدەشتێکی پان و بەرین بوو کە کوچکەکانی ئەو ساکەدەشتە کارەبایی (میگناتیسی) بوون. ئاژەڵەکانی ئەو دەشتە کەورێشک و پڵینگ و شتی وا بوون.

بەلوقیا چووە سەر کێوەکە و لەوێ هەر ئەملا و ئەولای کرد هەتا بوو بە شەو. کە هاتەوە خوارێ لە پەنایەک دانیشتبوو کە لە پڕدا لە دوور پڵینگێکی گەورە دی بە پەڕتاو دەهات هەڵیدڕێ، ئەویش خێرا بە ئاوی گیایەکە بن لاقی تەڕ کرد و لە دەریای سێیەمی دا. بەو شەوە بە سەر دەریادا ڕۆیشت. شەوێکی تاریک و تنۆک بوو. بایەکی توندی دەهات. بەلوقیا بەردەوام ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوڕگەیەک کە پڕ بوو لە داری میوەی جۆراجۆر. لەو میوانە تێری خوارد و سپاسی خودای تەعالای کرد. ئیدی تا شەو لەو دوڕگەیەدا سووڕاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارسەد و هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشکۆ! بەلوقیا لەو دوورگەیەدا هەتا بوو بە شەو سووڕاوە. شەو تا بەیانی لەو دوورگەیەدا لە پەنایەکدا خەوت. کە ڕۆژ بووەوە و تاو هەڵات هەستا و لە دوورگەدا دەستی کرد بە گەڕان و هەتا دە ڕۆژ ئەوە کاری بوو. دوای ئەوە چووە قەراخ دەریای چوارەم. دیسان لە ئاوی گیایەکە لە بەری پێی دا و بە سەر دەریای چوارەمدا کەوتە ڕێ. شەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوورگەیەک. ئەو دوورگەیە ئەرزەکەی لمێکی سپی و نەرم بوو. کە دار و گژوگیای لێ نەبوو. ماوەیەک لەوێ بوو دیتی هەڵۆ و باز لە سەر ئەو لمە هێلانەیان کردبوو. لەوێ زۆر نەماوە و هەر زوو ئاوەکەی لە بنی پێی دا و بە سەر دەریای پێنجەمدا کەوتە ڕێ. لە سەر ئەو دەریایەشیان بەردەوام شەو ڕۆژ ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوورگەیەکی دیکە کە شاخ و کێو و زەوییەکانی ئەو دوورگەیە وەکوو بلوور وابوو. لەوێ دار و دەرختی واوای دەدیت کە لە تەواوی ئەو سەفەرەیدا نەیدیتبوو. گوڵی ئەو دارانە وەک زێڕ دەدرەوشانەوە و زێڕین بوون. بەلوقیا هەتا شەوێ لەو دوورگەیەدا سووڕاوە و سەیری وڵاتی کرد. کە وڵات تاریک بوو سەیری کرد گوڵی ئەو دارانە لە شەودا وەک گوڵئەستێرە دەتروسکێنەوە. بەلوقیا بە دیتنی ئەو شتانەی ئەو دوورگەیەی حەبەسابوو. دەڵێن گوڵی ئەو دارانە ئەگەر تاو لێیان دا ویشک دەبن و دەوەرن. با ئەوانە ڕادەداتە بن بەرد و شت. پاش ماوەیەک دەبن بە ئێکسیر. گەڕۆکەکان دێن کۆی دەکەنەوە و دەیبەنەوە زێڕی پێ دروست دەکەن.

کورتی کەینەوە، بەلوقیا هەتا تاوهەڵاتی بەیانی خەوت. کە ڕۆژ هەڵات لە ئاوەکەی لە بەری پێی هەڵسوو. لە دەریای شەشەمی دا. ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا گەیشتە دوورگەیەک، لەوێ لای دا و ماوەیەک تێپەڕی. دوو کێوی دیت. ئەو کێوانە دارێکی زۆریان بە داوێن و لاقەدەوە بوو. میوەی ئەو دارانە مەل و باڵندەی سەوز بوو کە سەرەونخوون بوون. وەک ئەوەی بە لاقیان هەڵاوەسرابن. داری دیکەی لێ بوو میوەکانی سەری مرۆڤ بوون کە بە قژیان هەڵاوەسرابوون. هەر لەو دوورگەیە داری دیکەی دیت کە ئاگرئاسا داییسا. بەری ئەو دارانە تاڵ بوو. وەک دانبەخۆداگرتن. ئەگەر لە بەری ئەو دارە دڵۆپێک بە سەر دارەکەدا تکابا دارە ئاوری دەگرت. لەو دوورگەیەدا میوەی وای دیت دەگریا و میوەی دیت پێدەکەنین. بەلوقیا لەو دوورگەیەدا شتی زۆر سەیر سەیری دیت. دوای ئەوە چووە قەراخ دەریا، لە بن دارێک دانیشت. کاتێک شەو باڵی بە سەر وڵاتدا کێشا. چووە سەر ئەو دارە و بیری لە کاری خودا دەکردەوە کە لە پڕدا کچانی دەریایی لە دەریا هاتنە دەرێ کە هەر کام لەوان بۆخۆی دوڕێکی درەوشاوە بوو. ئەو کچانە هاتن هاتن هەتا گەیشتنە بن ئەو دارە و لەوێ دانیشتن. پاشان لەوێ کردیانە بەزمی هەڵپەڕکێ. بەلوقیاش چاوی لێ دەکردن.

که ڕۆژ بووەوە کچەکان چوونەوە ناو دەریا. بەلوقیا بە دیتنیان سەرسام ببوو. لە دارەکە هاتە خوارێ و ئاوی گیای لە ژێر قاچی دا و لە دەریای حەوتەمی دا. ئیدی هەتا دوو مانگ لە سەر ئەو دەریایە ڕۆیشت. نە کێوێکی دەدیت و نە دوورگەیەک و نە دەگەیشتە قەراخیش. تا وای لێ هات لە برسان هێزی نەمابوو. لە تاوان ماسی لە دەریادا دەگرت و دەیخوارد. بەو شێوەیە تا گەیشتە دوورگەیەک. پڕ بو لە داری میوە و کانیاوی خۆش خۆش. لای دا ئەو دوورگەیە و لەوێدا دەستی کرد بە گەڕان و سەیر و سەیاحەت. لای نیوەڕۆ بوو، گەیشتە لای دارسێوێک. دەستی کێشا سێوێک لێ کاتەوە و بیخوا. کوتوپڕ لە سەر دارەکەوە دەنگێک دەنگی داو گوتی: «هۆی وریابە ئەگەر دەست بۆ ئەو دارە بێنی و سێو لێ کەیەوە دوو لەتت دەکەم. بەلوقیا چاوێکی لێ کرد. درێژییەکەی لە بەر چاوی چل گەز دەبوو. بە گەزی خەڵکی ئەو سەردەم. بەلوقیا زۆری لێ ترسا و دەستی کێشاوە و بەو کەسەی گوت: «ئەوە بۆ نەتهێشت من لە میوەی ئەو دارە لێکەمەوە؟» ئەو کەسە جوابی داوە: «لەبەر ئەوەی تۆ ئادەمیزادی و باوکی ئێوە ئادەم گفت و بەڵێنی خۆی لەگەڵ خودا لە بیر کرد و بێ ئەمری خودای کرد و لە بەری ئەو دارەی کە نەهی کرابوو خواردی.» بەلوقیا لێی پرسی: «ئەتۆ کێی؟ ئەو دار و دوورگەیە ئی کێیە؟ ناوی تۆ چییە؟» ئەو کابرایە گوتی: «ناوی من شەراحیایە و ئەو دوورگەیە، دوورگەی سەخرپاشایە و من لە دەستوپێوەندەکانی ئەوم و منی لێرە داناوە. دوای ئەوە شەراحیا لە بەلوقیای پرسی: «ئەتۆ کێی و لە کوێوە هاتوویە ئێرە؟» بەلوقیا بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بۆ گێڕاوە. شەراحیا پێی گوت: «ترست لە هیچ نەبێ و نیگەرانی هیچ مەبە.» دوای ئەوە خواردەمەنی بۆ هێنا. بەلوقیا ئەوەندە بوی خورا خواردی و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشت. ماوەی دە ڕۆژان بە نێو دەشت و دەر و شاخ و کێودا ڕۆیشت هەتا گەیشتە چۆڵەدەشتێکی بەرین کە ئەوسەرەوسەرییەکەی ڕێگای دوو مانگەڕێ بوو. لەوێ تووشی تاقمێک بوو کە بە سواری شەڕیان دەکرد و خوێن لە بەینیاندا وەک جۆگەلە دەڕۆیشت. وەک هەور دەیان گرماند و بە زەرگ و شیر و ڕمب و تیر لە یەکیان دەدا. بەلوقیا زۆر ترسا.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.